# تەفسیری قورئانی پیرۆز

لێکدانەوەی

ماموستا مەلا عثمان عبدالعزیز

بەرگی حەوتەم

چاپی دووەم

٢٠١٠

بیروت - لبنان

# تەفسیری قورئانی پیرۆز

لێکدانەوەی

ماموستا مەلا عثمان عبد العزیز

بەرگی حەوتەم

چاپی دووەم

٢٠١٠

بیروت – لبنان

وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا ۗ لَقَدِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ
وَعَتَوْ عُتُوًّا كَبِيرًا ﴿٢١﴾ يَوْمَ يَرَوْنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ لَا بُشْرَىٰ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ وَيَقُولُونَ حِجْرًا مَّحْجُورًا ﴿٢٢﴾
وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُوا۟ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾

---

**ئینجا باسی هەندێ تر ئەکات لە بر و بیانووی بێ جێ و ڕەخنە و دەم درێژی بێ بڕواکان ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا﴾ ئەوانەی کە بە ئومێد و چاوەڕوانی گەیشتن بە خێر و چاکەی ئێمە نین بۆ ڕۆژی دوایی، یان ناترسن لە گەیشتن بە سزای ئێمە لەو ڕۆژەدا. لەبەر ئەوە بڕوایان بە زیندوو بوونەوە و ئەو ڕۆژە نییە، ئەو بێ بڕوایانە وتیان و ئەڵێن: ﴿لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا﴾ با مەلائیکە بنێررایەتە خوارەوە بۆ سەر ئێمە و هەواڵیان پێبداینایە و شایەتی یان بدایە کە محمد ڕاستە و پێغەمبەری خوایە،یان خوامان بدیایە تا فەرمانی بە باوەڕ هێنان پێ بداینە بە محمد و شوێن کەوتنی. ئەو نەفامە نەزانانە- وەکو چەند جارێك باس کرا- بە دووریان ئەزانی کە پێغەمبەر ئادەمی بێت و بۆ ئەمەی باوەڕ بێننبەم ئایینەی کە پێغەمبەر بانگیان بۆ ئەکات داوای یەکێ لەو دوو شتە نەگونجاوەیان ئەکرد...بە ڕاستی دەم درێژی یەکەیان ئێجگار نەفامانە و بێ شەرمانەیە. ئایا ئەوانە چین و چی یان تیا بەسەرە تا پەڵپی ئاوا بگرن؟ ئەوان لە کوێ و خوای گەورە لە کوێ؟ ئەوان چین و کێن کە لە چاو ئەو بوونەوەرەدا وەکو پەلکە یوشێك چاو نادەن و هیچ نرخێکیان نییە، مەگەر لە ڕێگای ئیمان و باوەڕ و گوێ ڕایەڵییەوە پەیوەندی بکەن لەگەڵ خوادا و نرخێك بۆ خۆیان فەراهەم بێنن... ئەوانە خۆیان لێ گۆڕاوە و خۆیان نەناسیوە ئەگینا زاتیان نە ئەبوو شتی وا بە دەمیان دا بێت، وەکو لەم فەرموودەیشەوە ڕوون ئەبێتەوە: ﴿لَقَدِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ وَعَتَوْ عُتُوًّا كَبِيرًا﴾ واتە سوێند بە خوا ڕادە و پلەی خۆیان بەرز ز بڵند بوو لە پێش چاوی خۆیان و لە دەروونی خۆیان بە هۆی ئەوەوە خۆیان بە گەورە زانی، و لە جەور و ستەم دا تێپەڕین بە تێپەڕینێکی زۆر گەورە.هەست و باوەڕیان بە خۆیان بە خۆیان زۆر بەهێز بوو، بە هۆی ئەوەوە نەیان ئەزانی نرخدار و بێ نرخ کامەیە، لە پێش چاوی خۆیان**

خۆیان لا گەورە بوو بە چەشنێ هەر خۆیان ئەبینی و لایان وا بوو شایانی ئەوەن خوا خۆیان پیشان بدات بۆئەمەی باوەڕ بێنن!! بێگومان لە خۆ گۆران و خۆ نەناسین دەردێکی ئێجگار سەخت و کاریگەرە و هەر کەس بە راستی خۆی بناسێ خوای خۆی ئەناسێ، خوا بە بەزەیی خۆی ئاشنامان بکات بە خۆمان و بە خوای خۆمان-امین-.

ئینجا بە شێوەی لاقرتی و بێ ئابرو کردن هەواڵ ئەدات کە ئەوانە مەلائیکە ئەبینن، بەلام نەک لەم جیهانەدا بۆ بەدی هێنانی پەلپ و مەبەستی ئەوان، بەلکو لەرۆژیی دوایداوبۆسزادانیان. ئەوانە لەو رۆژە سامناکەدا مەلائیکە ئەبینن کەرۆی سزادان و سوتاندنیانە و هەرگیز قوتاربوون و رزگاربوونیان نیە لێی.ئەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَرَوْنَ الْمَلَائِكَةَ لَا بُشْرَىٰ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ﴾ رۆژێ کە ئەوانە مەلائیکە ئەبینن هیچ موژدەیەک نی یە لەو رۆژە دا بۆ ئەو تاوانبارانە، و پەنا ئەگرن بەخوا رزگاریان بکات لەدەست ئەو مەلائیکانە، چونکە ملائیکەی سزادانن، پەنا ئگرن بەشێوە و وشەیەککە لەم جیهانەدا باو بووە لەناو عەرەبدا لە کاتی تەنگانە و تووشبوونی دوژمنی چار نە کراو و رووداوی زۆر خراپ دا، پەنایان پێ ئەگرت دوای رزگاری یان پێ ئەکرد و ﴿وَيَقُولُونَ﴾ ئەیان وت: ﴿حِجْرًا مَّحْجُورًا﴾ خوایە پەنا ئەگرین و داوات لێ ئەکەین کە دوورمانخەیتەوە لەمانە قەدەغەو بەرگری ی کراو بێت لێمان، ﴿وَقَدِمْنَا إِلَىٰ مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ﴾ ئێمە لەو رۆژە دا بڕیاری خۆمان دەر ئەکەین کە هەر کردەوە یەکی گەورە و چاکیان کردبێ لەم جیهانە ئەیسڕینەوە و بێ سوودی ئەکەین ﴿فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَّنثُورًا﴾بەم رەنگە ئەیکەین بە تۆز و غوبارێکی پرژ و بلاو کراوە، ئەو تۆزو غوبارەی کە ئەبینریج لەناو تیشکی خۆردا کاتێک کو لە کون و تاقێکەوە بیچتە ناو هۆدەیەک. واتە ئەو کردەوانە بێ نرخ و بێ سوود و بێ بەرهەم ئەکەین بە وێنەی بێ سوودی و بێ نرخی بێ بەرهەمی ئەو تۆزو غوبارە، ئەو کردەوانە بێ نرخ و بێ بەرهەمن، چونکە لەسەر بنەرەتی ئیمان و باوەر دانەمەزراون، کەواتە لەبەر خوا نەکراون و پەیوەندی بە خواوە نی یە، کەواتە نرخ و پاداشتیان نی یە لای خوا. ئینجا بەرامبەر ئەم کۆمەڵە بەد بەختە چارە رەشە لایەک ئەکاتەوە بۆلای کۆمەڵی بەختەوەری خوا پێداو بەشێوەیەکی کورت نازو رێزیان دەر ئەخات،

ئەفەرموێ: ﴿أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ يَوۡمَئِذٍ خَيۡرٞ مُّسۡتَقَرّٗا وَأَحۡسَنُ مَقِيلٗا﴾ یە هەشتی یەکان لەو رۆژەدا زۆر باشن لە بارەی نیشتەجێ و جێگای ئارام گرتنەوە، و زۆر شیرین و جوانن لە بارەی جێگا و شوێنی ئیسراحەت و رابواردن لەگەڵ هاوسەر و خێزاندا، کەواتە ئەوان هەمیشە ولن لە رابواردن و سێبەر و سەهەند و ئارام و ناز و رێزدا بە بێ هیچ جۆرە مەترسی و داخ و دوویەك، لە لوتف و بەزەیی خوا بە زیاد بێت. ئەو کافر و بێ بروایانە داوا و پەلپێکیان ئەمە بوو کە خوا بێت بۆ لایان لە ناو چەند(تەبەقێ) لە هەوردا و لەگەڵ کۆمەڵێ لە مەلائیکەدا، رەنگە ئەمەیان وەرگرتبێت لە قسەو پڕ و پووچی نووسراوی ئیسرالی یەکان خوایان وا دا ئەنا کە خۆیان پیشان ئەدات لە ناو هەوردا یان لە ناو ئاگرێکی گەورەدا، جا لێرەدا ئەگەرێتەوە سەر ئەوەو بێ بروایانە شێوەیەکی تریان پیشان ئەدات لە رۆژێك دا کە هاتنە خوارەوەی مەلائیکە بە دی دێت، بەڵام نەك بە گوێرەی پەلپەکەی ئەوان، بەڵکو بە فەرمانی خوا دێنە خوارەوە بە هۆی هەڵسانیان بە کار وفرمانێ کە پێ یان ئەسپێررێت لەو رۆژەدا کە رۆژێکی ئێجگار تەنگە لەسەر کلفرەکان. ئەفەرموێ: ﴿وَيَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلۡغَمَٰمِ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی رۆژێ بکە کە ئاسمان لەت لەت ئەبێ بە هۆی تەم و هەورێك کە لێی دەردێت. یان لەت ئەبێت لە کاتێك دا کە هەور و تەمی لەگەڵ دایە، یان لەت ئەبێ و لا ئەچێت و هەور و تەم لە شوێنی دا پەیدا ئەبێت، ئیتر مەبەست بەوە هەورێکی تایبەتی بێت کە خوا خۆی ئەزانێت، یان مەبەست ئەو هەموو تۆز و هەڵم و غوبارە بێت کە پێك دێت لە ئەنجامی تەقینەوەی ئەو هەموو ئەستێرە و مانگ و رۆژەوە، بە هەر جۆرێك بێت ئەم ئایەتە و چەند ئایەتی تری زۆر و زەبەندە لە چەند سورەتێکی تردا بۆمان روون ئەکەنەوە کە ئەم جیهانی ئێمە دوایی دێت، و ئەم رژێمی ئێستا تێك ئەچێت و ئەم زەوی و ئاسمانەی کە ئێمەی تێدا ئەژین گۆرانێکی ئێجگار سامناکی بەسەردا دێت لە هەموو بار و روویەکی یەوە، بەڵام نەك بۆ پێك هێنانی پەلپ و داوای بێ براواکان، بەڵکو بۆ هەڵسان بە هەر کار و فرمانێك کە پێ یان ئەسپێررێت لەورۆژەسەختەسامناکەدا کەکاروفرمانەکانیان بەزیان سزای ئەو بێ بروایانە تەواو ئەبێت،

وَنُزِّلَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ﴿٢٥﴾ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّ لِلرَّحۡمَٰنِۚ وَكَانَ يَوۡمًا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ عَسِيرًا ﴿٢٦﴾ وَيَوۡمَ
يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيۡلَتَىٰ لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ فُلَانًا
خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدۡ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكۡرِ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَنِيۗ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِلۡإِنسَٰنِ خَذُولًا ﴿٢٩﴾
وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوۡمِي ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورًا ﴿٣٠﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿وَنُزِّلَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا﴾ چین چین مەلائیکە ئەهێنرێتە خوارەوە بە هێنانە خوارەوەیەکی نایابی کەس نەدیو. ﴿ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّ لِلرَّحۡمَٰنِۚ﴾ پادشایەتی و دەسەڵات لەو رۆژەدا کە راستەقینەو دامەزراوە تەنها بۆ خوایە کە خاوەنی بەزەیی زۆلار و فراوانە. هەرچەندە بەزەیی خوا بێ سنوورە و لەم جیهانەدا هەموو کەس ئەگرێتەوە بەڵام لەو جیهان کافر و بێ بروا نا ئومێد و بێ بەشە لەو بەزەیییە بێ سنوورە وەکو لە کۆتایی ئەم ئایەتی هەرەشەدا روونی ئەکاتەوە: ﴿وَكَانَ يَوۡمًا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ عَسِيرًا﴾ ئەو رۆژە رۆژێەك زۆر بەتین و سەختە لەسەر کافرەکان. ئینجا شێوەیەکی تر پیشان ئەدات لە شێوە زۆر سامنلکەکانی ئەو رۆژە سەختە. شێوەی پەشیمانی ستەمکارە ون بووەکان کاتێك ئەگەن بەو رۆژە سەختە و هیچ رێگای بەر و دوایان نامێنێت: ﴿وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی رۆژێك بکە کە کافر و بێ بروا لە داخ و مەراق و پەشیمانی دا قەپ لئەکات بە هەردوو دەستیدا ﴿يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا﴾ ئەلێت: ئای کاشکێ و خۆزگە رێگای رزگاریم بگرتایە و بم دایەتە بەر لەگەڵ پێغەمبەردا، ﴿يَٰوَيۡلَتَىٰ لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ فُلَانًا خَلِيلًا﴾ ئای مەرگ بۆ من، ئای مەرگ وەرە دابارێ بەسەر مندا کە چیم بەسەر خۆم هێنا کاشکێ فلأن کەسێکم نەکردایە بە دۆست و خۆشەویستی خۆم -واتە شەیتان یان هەر کەسێکی تر کە لەم جیهەنەدا هاورێی بووە و بووەتە هۆی گومرا کردنی- ﴿لَّقَدۡ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكۡرِ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَنِيۗ﴾ چونکە سوێند بەخوا ئەو منی گومرا کرد و لایدام و بێ ئاگای کردم لە ئاین و کتێبی خوا، لەپاش ئەوەی بۆم هات و پێم گەیشت و تێ گەیشتم، ﴿وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِلۡإِنسَٰنِ خَذُولًا﴾ شەیتان - کە بەو شێوە خەڵکی لە رێگای راست ئەترازێنێ -ئێجگار بێ یارمەتی و بێ کۆمەکی یە بۆ ئادەمی لە کاتی پێویستی و تەنگانەدا. ئا بەم جۆرە قورئان دڵ و دەروون رائەوەشێنێت بە خستنە پێش

چاوی ئەم هەموو وێنەو شێوە سامناکانە بۆ ئەمەی تەمێ وەربگرن و فریای خۆیان بکەون لەم هەلی ژیانەی کە خوا پێی داون لەم جیهانەدا، فبێگومان هەر دڵێك تەرایی تێدا بێت قورئان کاغری لێ ئەکات و عەقیدە و باوەری تێدا ئەروێنێت، ئەو دڵەیش کە مردووە و تەرایی تێدا نییە و وەکو هەندێ زەوی وایە کە گیانی رواندنی تێدا نییە، ئەو جۆرە دڵانە دەردیان کارییە و خوا چارەسەری بۆ دانەناون،خاو پەنامان بدات.. ئەگێرنەوە کە ئەم ئایتانە بە بۆنەی عوقبەی کوری ئەبو موعەیتەوە هاتە خوارەوە کە ویستی موسڵمان ببێ و بەڵام ئوبەیی کوری خەلەف کە دۆستی و خۆشەویستی بوو وازی لێ نەهێنا و بە تانە و تەشەر لێی نەگەرا هەتا پەشیمانی کردەوە و لەو نیازە پاکە ترازاندی، بەڵام شێوە و رووالەتی ئایەتەکان گشتییە و تایبەتی ناکرێت بەو دووانە تایبەتییەوە بە بێ هۆ و بەڵگەیەکی بەهێز کە دیارە لێرەدا ئەو هۆ و بەڵگەیەش نییە، هەروەها هەموو شێوەیەکی تر وەکو کراوە بە یاسایەکی دامەزراو لە یاساکانی عیلمی اصولْ کە هیچ ئایەتێکی گشتی تایبەتی ناکرێت بە رووداو و هۆی هاتنە خوارەوەیەوە.بەس ئەوە هەیە کە ئەو هۆ و رووداوە بەری ئەو بریارە گشتییە ئەکەوێ. بۆ وێنە لێرەدا عوقبەی کوری ئەبو موعەیت بە یەکێك ئەبێت لەوانە کە لە رۆژی دواییدا ئەو پەشیمانییەیان بەسەر دێت و ئەوە ئەڵێن کە ئایەتەکان بۆی باس کردین.

لە چەند شوێنێکدا باسی زیانی فراوانی هاوڕێی خراپ کراوە، کەواتە پێویست نییە لێرە باس کردنی. ئینجا نزا و شکاتی پێغەمبەر(ﷺ) ئەگێرێتەوە کەکردیە لای خوای خۆی دەربارەی ئەو بێ بڕوایانەی کەباوەڕی پێ ناهێنن و شوێنی قورئانەکەی ناکەون و هەموو بڕوبیانوو دەم درێژیی یە ئەکەن لەبارەی قورئانەکەیەوە.[1] ئەفەرمووێ:﴿وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَـٰرَبِّ إِنَّ قَوۡمِى ٱتَّخَذُواْ هَـٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورًا﴾ پێغەمبەر نزاو شکاتی کردەلای خوای خۆی و ووتی: ئەی خوایە بەڕاستی گەلەکەم ئەم قورئانەیان گێڕاوە بە شتێکی واز لێ هێنراوگوێ پێنەدراوە. واتە: باوەڕی پێ ناهێنن و ترسیان نیە لە هەڕەشەکانی و بەتەواوی پشتیانلێکردوە، ئینجا خوایش دڵخۆشی ئەداتەوە و دڵنەوایی ئەکات،

---

[1] هەندێك ئەفەرمون: ئەم نزا و شکاتە لە رۆژی دوایی دا ئەیکات. لەو کاتە سامناکەدا کە بێ بڕواکان دەستی خۆیان ئەکرۆژن ئەم شکاتەیان لێ ئەکات – پەنا بەخوا –. بەپێی ئەم رایە ئەم ئایەتە بەسراوە بە ئایەتەکانی پێشیەوە و سەربەخۆ نی یە. ئەمەش ئەگونجێ.

وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ ٱلْمُجْرِمِينَ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا ﴿٣١﴾

ئەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ هەروەها بۆ هەموو پێغەمبەرێك دوژمنمان داناوە و بڕیار داوە لەتاقمی خراپەکاران و تاوانباران، واتە ئەوە تەنها بەسەر تۆ نەهاتوە، بڵکو باو و ڕەوشتی ئێمە لەناو هەموو پێغەمبەران وابووە کەبۆ هەموو پێغەمبەرێك چەند دوژمنمان سازاندوە کەبەربەرەکانێ یان کردووە و پشتیان کردووەتە ئەو ڕێنموونی و ئاینەی کەپێی ڕەوانەکراون، و بەرگری خەڵکیان لێ کردووە. بەڵام خوا ڕێگای‌سەرکەوتنی پیشانی پێغمبەرانی داوە، کەواتە دڵگران و غەمبار مەبە، بێگومان خوا چارەسەری کار و فرمانت ئەکات و سەرت ئەخات بەسەر دوژمنی ئاینەکەت دا، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا﴾ بەسەر پەروەدگارت بۆتۆ بەڕێگا پیشاندەر و یارمەتی دەر و زاڵ کەرت بەسەر دوژمنانت دا. بێگومان خوا لێزان و کار دروستە و بەرژەوەندی هەموو کەس و هەموو شتێ ئەزانێ لەخۆڕای ڕێگای بڵاوکردنەوەی ئایینی بەو شێوەیە سەخت و گران نەکردووە. بێگومان بەرگری و بەربەرەکانێ ی دوژمنانی پێغمبەر و ئاینەکەیان ئەبو بەهۆی ئوەی کە بانگ کردن و بانگەوازەکیان بەتوند تر بکرن و سوور ترین لەسەری و بەگرنگ تر خەریك بێن بۆ چەسپاندنی و بەتین تر شان بدەنە ژێر ئەرکی، بەو تێکۆشان و دووچار بوونی زیان و سزا و کوێ نەدان و خۆگرتنەوە لەلایەن پیچغمبەران و بانگ کەرانەوە ڕوون ئەبێتەوە حەق و ناهەق، و جوێ ئەبێتەوە بانگ کردن و بانگەوازی ڕاستەقینە لە پڕو پووچفێڵ و تەڵەکە خەڵەتاندن، هەروەها ئەبێتە هۆی پاڵفتە بوون و پاك و خاوێنی ئەوانەی کە هەڵئەستن بەو کارە گرنگە و ئەو ئەرکە قورسە ئەگرنە سەرشان تەنها لەبەر خوا،ئەبیچتە هۆی دەرچوون و دەرکەوتنی ئەو کەسانەی کەنیازی تریان هەیە بێجگە لەڕەزامەندی خوا، کەواتە کەسانێك ئەمێننەوە کەڕاستن و تەنها بۆ خوا لێ بڕون بەبێ هیچ نیازێکی تر کە ئەوەش هۆی یارمەتی دانی خوایە و سە رکەوتنا بەپێ ی بەڵێنی نەگۆڕاوی خوای گەورە بێ گومان تەنها ئەو

جۆرەکەسانە شایەنن بۆ هەڵگرتنی سپاردەی خواو بەرز کردنەوەی ئاڵای ئاینی خوا، تەنها ئەوانە نەخەڵتاون لەهەموو کاتێك دا و تەنها ئەوانە ڕێز و نرخی ئەو ئاینە ئەزانن، کەئو هەموو قوربانی و فیداکاری یەیان کردووە لەپێناویدا، تەنها ئەوانە لەکاتی سەرکوتن و زاڵ بوونی و کاربەدەستی دا خۆگرن و لەڕێگای ڕستی خوا لانادەن ن کواتە ڕوون بووەوە کە ڕاست و پڕ لە بەرژەوەندی یە کە خوای گەورە ئەو هەموو دوژمن و تاوانارانەی داناوە بەرامبەر پێغەمبەران و شوێن کەوتووەکانیان- دروودی خوایان لێ بێت- هەموو هەڵسان و پەلاماردانی ستەمکارن و تاوانباران و ڕێگاگرنتیان لە ئاینی خوا-بەتایبەتی لە دواترین شێوەی دا کە پێغەمبەران هێنای(ﷺ) شتێکی شرووشتیە و ئەبێ هەر بێت، چونکە ئایینی خوا لەهەر کاتێکدا هاتبێت بۆ بەرگری کردن و نەهێشتنی هەموو لاری و دەست درێژی و ناله باریەك هاتووە، بۆ چارە سەرکردنی هەموو خراپە و فەسادێك بووە کەڕووی داوە لەناو کۆمەڵی ئادەمیدا و هاتووە بۆ دانان و چەسپاندنی یاساو ڕژێم و بەرنامەی خوا لەجێگای هەموو بەرنامە و یاساو ڕژێمی تردا، ئاشکرایە کەئەو بەرگری و چارەسەرو گۆڕانە بەبێ تێکۆشان و قوربانی دان و فیداکاری بەدی نایەت، چونکە ستەمکار و تاوانباران کە داهێنەر و بڵاوکەرەوەی جەور و خراپەو تاوانەکانن، سوودی بەرژەوەندی خۆیانی تێدا ئەبینن، ئەوانە هەروا بە سووك و ئاسان دەست لە کاری خۆیان هەڵناگرن، بەڵکو بە هەموو توانا شەری سەر و ماڵی لەسەر ئەکەن، بەلاّم هەروەها سەرکەوتنی پێغەمبەران و شوێن کەوتووەکانیان شتێکی سرووشتییە و ئبێ هەر بوویێت و هەر ببێت و مسۆگەرە، چونکە ڕێگاکەیان ڕێگای ڕاستی ژیانەو بۆ کەنارەی هەرەبەرزی ئادەمێتی ئەروا و خواش بەڵێنی ڕاستی براوەی خۆی پێ داون، کەواتە ئەبێت ئەو سەرکەوتنەی بەدیهاتبێت و بەدی بێت، ئیتر زۆری پێچووبێ و پێ بچێ یان کەم ئەوەش بە گوێرەی خواهیش و لێزانین و کاردوستی خوایە. ئینجا ڕەخنەو برو بیانوویەکی تری ناراستی تاوانبارەکان پیشان ئەدات و بەپەرچیشی ئەداتەوە،

**ئەفەرموێ:** ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ **ئەوانەی کە کافرەن وتیان و ئەڵێن:** ﴿لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً﴾ **با قورئانی بهێنرایەتە سەر بە یەك جار بە کۆو کۆمەڵێ نەك بەرەبەرە و پچر پچر. هەرچۆنێ تەورات و زەبوور بە یەك جار هاتن. بێگومان ئەم رەخنەیە هەر لە یەکەم جارەوە زۆر پرو پووچ و بێ سوودە بۆ ئەوان، چونکە هەرچۆنێ ئێستا موعجیزەیە و هەموو کەس لە ئاستیب کەمترین سورەتیش داماو و دەستە پاچەو پەك کەوتوون و هەروەها بە یەك جاریش بهاتەیە هەر موعجیزە ئەبوو، بەڵکو ئاشکرایە ئەو کاتە موعجیزەیەکی بەهێزتر ئەبوو، چونکە بە پێی باوی ئێمە هێنانی لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا زۆر زۆر بێ ئەرك و ئاسانترە لەوەی بە یەك جار بێت، کەواتێە بە دی هاتنی پەڵپ و بیانوەکەیان زیانی زۆر زیاتر ئەبوو، بێجگە لەوەش ئەو نەفامانە نەزان و بێ ئاگا بوون لە مەبەست لەهاتنی قورئان بە هۆی ئەوەوە ئەو پەڵپە نارەوایەیان ئەگرت. ئەم قورئانە هاتووە بۆ ئەممەی(ئوممەتێ) پەروەردە بکات و پێی بگەیەنێ، وگەل و کۆمەڵێ فەراهەم بێنێ و یاسا و رژێم راست بکاتەوە و پێگەیاندن و پەروەردە کردن کتوپر ناکرێ، بەڵکو پیویستی بە ماوە و کاتێك هەیە. پێویستە لە یەکەم جارەوە باوەڕ لە دەروندا پچەسپێنرێ و ئینجا ئەو بەرنامە و باوەرە لە کردەوەدا دەرکەوێ و دەرونی ئادەمیش بە یەك جار ناگۆڕرێ و بە خوێندنەوەی کتێبێکی وا کە بەرنامەیەکی تازەی تێدا بێت لە هەموو بار و روویەکییەوە، بەڵکو کاتێك ئەگۆررێت کە هەوڵی لەگەڵ بدرێت رۆژ بە رۆژ و بەرە بەرە رام ئەبێ و دەقی پێوە ئەگرێت. ئەم قورئانەهات و رێگەو بەرنامەی تێر و تەواوی هێنا بۆ ژیان لە هەموو بارو روویەکیەوە، لە هەمان کاتدا بەرنامەیەکیشی هێنا کە شیاوو گونجاوە لەگەڵ سروشتی ئادەمیدا- بۆ پەروەردە کردن و پێگەیاندنی بەندەیانی خوا لەسەر بەرنامەکەی – کواتەئەبێ بەرە بەرە بێ و وردە وردە بێت**

بە پێی پێویستی موسوڵمانان، بە گوێرەی ئامادەیی و لێهاتنیان، کە بەرە بەرە بەهێز ئەبێ و پەرە ئەسێنێ لە ژێر سایەی بەرنامەی پێگەیاندن و پەروەردەکردنەکەی خوا. ئەم قورئانە هات بۆ ئەمەی بەرنامەی پێگەیاندن و پەروەردە کردن بێت و ڕێگای ڕاستی ڕوونی ژیان بێت، نەك ئەمەی ببێت بۆ کتێبێکی زانین و ڕۆشنبیری بخوێنرێتەوە تەنها بۆ خۆشی یان بۆ ناسین و زانینی ڕووت.هات بۆ ئەمەی بەدی بهێنرێت جێبەجێبکرێت پیت بە پیت و وشە بە وشە و فەرمان بە فەرمان. هات بۆ ئەمەی ئایەتەکان ببن بە بڕیار و فەرمانی ڕۆژانە کە موسوڵمانەکان لە کاتی پێگەیشتنیدا دەست بەجێ وەریگرن و ڕەفتاری پێ بکەن، هەرچۆنێ سەربازێکی ڕاست لە مۆڵگەی خۆی یان لە مەیداندا هەر فەرمانێکی پێ گەیشت کتوپڕ وەری ئەگرێت و جێ بە جێی ئەکات و مەبەستەکەی بە دی ئەهێنێت. جا لەبەر ئەمانە هەموو و چەند هۆیەکی تر کە لە شوێنی تردا باس ئەکرێت، ئەم قورئانە بەرەو بەرەو بەش بەش هاتە خوارەوە [1] لە یەکەم جارەوە بەرنامەکەی خۆی دەرئەخات بۆ دڵی پێغەمبەر(ﷺ) و دامەزراوی ئەکات لەسەر ڕێگاکەی، ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ﴾ ئەم قورئانەمان هێنا و ئەیهێنینە خوارەوە بۆ سەر تۆ بەو جۆر وشێوەیە:بە بەرە بەرەو بەش بەش کە بێ باوەران ئەیکەن بە ڕەخنە ﴿لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ﴾بۆ ئەمەی ئەی پێغەمبەر بە هۆی ئەوەوە دڵی تۆ دامەزراو و بەهێز بکەین﴿وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا﴾بەو جۆر و شێوەیە هێنامانە خوارەوە، بەش و پارچەکانیمان جوێ کردەوە ئایەت لە دوای ئایەت بە جوێ کردنەوەیەکی گرنگ و نایاب، یان بەو جۆرە خوێندنمانەوە بە سەرتدا لەسەر زمانی جوبرەئیل بە مۆڵەت و لەسەر خۆ. ئەوتا هاتە خوارەوە لە ماوەی بیست یان بیست و سێ ساڵدا. بێگومان بە هاتنە خوارەوەی بەمك جۆر و شێوەیە دڵی بە فەری پێغەمبەر(ﷺ) بەهێز و دامەزراو ئەبوو لە چەند ڕویەکەوە:

---

[1] ئەم ڕەخنە و پەڵپە لە چەند شوێنی ترا باس کراوە یەکێ لەوانە سورەتی – الإسراء – ە، لەو شوێنانەدا زۆر هۆی تر باس کراوە. کەواتە پێویست نی یە بە باسیان لێرەدا. بۆ ئێرە ئەم ئەندازەیە بەسە.

١- بەهێز ودامەزراو ئەبوو لەسەر وەرگرتن و لەبەرکردن و تێگەیشتنی مەبەستەکانی.

٢- بەهێزو دامەزراو ئەبوو بەهۆی هاتنە خوارەوەی جوبرەئیل و بینینی هەموو جارێ لەگەڵ هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەدا.

٣- بەهێز و دامەزراو ئەبوو بە بۆنەی تازە بوونەوەی دەرکەوتنی موعجیزەی قورئانەوە کە هەرجارێ بە ئەندازەی کەمترین سوورەت ئەهاتە خوارەوە بێ باوەرانیش پەك کەوتوو دەستە پاچە بوون لەمەی وێنەی بڵێن، ئەو تازە بوونەوەیەش ئێجگار ئەبوو بە هۆی ئەوەی کە دڵی بەهێزتر و دامەزراوتر ببێ، ئەو جوێ کردنەوە و بە دواهێنانی ئەو ئایاتانە بە پێی بەرژەوەندی و پێویستی موسوڵمانان بوو، ئەوەش بەگوێرەی زانین و لێزانی و کار دروستی خوا.

شتێکی روون و ئاشکرایە کە ئەم قورئانە بەو بەرنامە تایبەتیی خۆیە لە بارەی پەروەردەکردن و پێگەیاندن و گۆراندنی دڵی خەڵکییەوە کارێکی کەس نەدیوی کرد کە لە هەموو مێژوو و تەمەنی ئادەمیدا موعجیزەیەکی گەورە بوو. ئینجا کاتێك باری موسوڵمانان گۆرا لەگەڵ قورئانەکەیان و بێ ئاگا بوون لەمەبەست لە هاتنە خوارەوەی و نەیان گێرا بە بەرنامەی ژیانیان، بەڵکو کردیان بە کتێبێکی زانست و خوێندەواری، و کتێبێ کە بخوێنرێتەوە تەنها بۆ عیبادەت کردن و خواپەرستی، کاتێ موسوڵمانان بەو جۆرەیان لێ هات بێ بەش بوون لەو هەموو پیت و فەری دەستکەوتی قورئانە کە لە کاتی خۆیدا جیهان و وڵاتی پر کرد. چونکە ئەمانەی کە بێ بەش بوون لایاندا لە رێگا و بەرنامەکەی قورئان کە خوا بۆی نەخشە کێشان.ئینجا هەمیتر پێغەمبەر(ﷺ) دڵ ئارام و دڵخۆش ئەکات بەمەی کە هەر کات بێ برواکان هەر پەڵپ و رەخنەیەك بگرن خوا یارمەتی ئەدات، بەڵگەو رابەری بەهێز بۆ دەم کوت کردن و بەرپەرچ دانەوەی ئەو بێ بروایانە.

**ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا﴾ هیچ پرسیار و پەڵپ و رەخنەیەکی سەرسورهێنەر ناهێنن بۆ تۆ بە نیازی لەکەدار کردنی تۆو ئایین و قورئانەکەت، هیچ شتێ لەوانە ناهێنن بۆت لە هیچ کاتێکدا مەگەر لەکاتێکدا کە ئێمە بەرامبەر ئەوان هەق وە راستت بۆ ئەهێنین کە بیکەیت بە وەڵام و بەرپەرچ دانەوەی ئەوان و لە ریشە هێنانی هەموو قسە و باسێکی پر و پووچی ئەوان، شتێکت بۆ ئەهێنین کە زۆر جوان و شیرینە لە بارەی روونکردنەوە و دەرخستنی هەق و راستیدا، یان شتێکت بۆ ئەهێنین کەماناو مەبەستی ئەو پرە لە راستی و روونی و رەوانیدا. ئەو بێ بڕوایانە دەمبازی و چەنەبازی ئەکەن بە شتی تاڵ و پڕو پووچ و خوایش بەرامبەریان هەق و ڕاست ئەهێنێ و بەوە پڕو پووچەکان لەناو ئەبا و نایهێڵێ. ئامانج و مەبەستێ کە قورئان ئەیەوێ جێگیر و دامەزراوی بکات بریتییە لە هەق و راستی، نەك تەنها زاڵ بوونی خۆی و پەك کەوتنی تاوانبارەکان، چونکە هەق کە هات و جێگیر بوو ئیتر هیچی پێویست نییە خۆی بەهێز و روون و ئاشکرایە و بەتاڵ و ناهق ئەتوێتەوە لە ئاستیدا و ئەبێ بڕوا. ئینجا باسە کە دوایی ئەهێنێ بە خستنە پێش چاوی شێوەیەك لە شێوە سامناکەکانی ئەو تاوانبارانە لە رۆژی دوایی دا، ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ﴾ [1] ئەوانەی کە ئەوانەی کە کۆ ئەکرێنەوە و بەسەر روودا ئەڕۆن بۆ دۆزەخ.**

---

[1] ئەم ئایەتە بە چەند جۆرێ ترکیب کراوە و بە چەند جۆرێ تر تەفسیر کراوەتەوە، هەموو ئەگونجێن و دەست ئەدەن. لەم کاتەدا ئەمەم بەلاوە باش بوو کە لە تەفسیرەکەدا نووسیم.

أُوْلَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٣٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَا مَعَهُۥٓ أَخَاهُ هَٰرُونَ وَزِيرًا ﴿٣٥﴾

﴿أُوْلَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا﴾ ئەوانە خراپترن لەبارەی جیٚ و شوێنەوە، و گومرا و هەڵە ترن لەبارەی رێگا و باوەڕیٚ کە وان لەسەری. جیٚ و شوێنیان ئاگری دۆزەخە کە بەو شێوەیە ریسوایی و سامناکییە بۆی ئەرۆن و باوەر و رێگەکەشیان دوژکنایەتی پێغەمبەرە و بەرگری کردنی ئایینی خوا. جا چ جێگا و شوێنیٚ ئەگاتە ئاگری دۆزەخ؟ چ هەڵەیی و شەر شێوانی بەتینەبە وێنەی دوچەمنایەتی و بەرگری ئەوانە؟ خوا پەنامان بدات بە بەزەیی خۆی. رۆیشتنی ئەوانە بەسەر رووداا بۆ دۆزەخ ئایا بە هەڵگەرانەوەیان بێت، سەر بۆ لای زەوی و قاچ بۆ لای ژوور و بە دەم و چاویان برۆن؟ وەکو لە حەدیسێکدا ئەفەرمویٚ کە تیرمیزی ئەیهێنیٚ لە ئەبو هورەیرەوە کە خەڵکی لە رۆژی دواییدا بە سیٚ تاقم حەشر ئەکرێن: تاقمیٚ بە سواری و تاقمیٚ بە پیادە بەسەر دەم و رووداا. بێژرا ئەی پێغەمبەر خوا چۆن بەسەر رووداا ئەرۆن؟ لە وەڵامدا فەرموی: کەسیٚ کە لەم جیهانەدا بردوونی بەرێوە بەسەر قاچیاندا توانایە بیانبات بەرێوە بەسەر رووداا بیٚ گومان بن کە بەدەم و روویان لە هەموو چاڵ و چۆڵی و درکیٚ خۆیان ئەپارێزن. یان مەبەست ئەوە بێت کە بەسەر داخستنەوە ئەرۆن؟ یان مەبەست ئەوە بێت کە مەلائیکە زنجیریان ئەکەن و بەسەر رووداا رایان ئەکێشن؟ بە هەرکام مەبەست بێت ئەوپەری بیٚ ئابرووی و ریسواییان دەربارە ئەکریٚ سەرە رای سزای سووتاندنیان بە ئاگر. ئەوەش بەرامبەر مل هووری و سەرکێشی و لوت بەرزییە کە بەکاریان ئەهێنا بەرامبەر پێغەمبەری خوا و ئایینی خوا. و پیشاندانی ئەو شێوەیە ئەو پەری دڵخۆش کردن و دڵنەوایی تیایە بۆ پێغەمبەر ئازیز(ﷺ)هەرچۆنیٚ ترساندنێکی بەهێزە بۆ ئەو تاوانبارانە.

ئینجا بۆ زیادە دڵخۆشی دانەوە و دڵنیا کردن لەسەر بەدیهێنانی بەڵێنی یارمەتی دان و زاڵ کردن چەند وێنەیەك بە کورتی لە بەسەر هاتی کۆمەڵیٚ لە پێغەمبەران و بیٚ بروایان ئەگێرێتەوە. ئەفەرمویٚ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ﴾ سوێند بە خوا بەخشیمان بە موسا و پێماندا کتێبیٚ کە تەوراتە ﴿وَجَعَلْنَا مَعَهُۥٓ أَخَاهُ هَٰرُونَ وَزِيرًا﴾ لەگەڵ موسادا گێرامان هارونی برای بە کۆمەك و قۆڵگیری بۆی.

فَقُلْنَا ٱذْهَبَآ إِلَى ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا فَدَمَّرْنَٰهُمْ تَدْمِيرًا ﴿٣٦﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ لَّمَّا كَذَّبُوا۟
ٱلرُّسُلَ أَغْرَقْنَٰهُمْ وَجَعَلْنَٰهُمْ لِلنَّاسِ ءَايَةً ۖ وَأَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٣٧﴾ وَعَادًا وَثَمُودَا۟
وَأَصْحَٰبَ ٱلرَّسِّ

﴿فَقُلْنَا ٱذْهَبَآ إِلَى ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ ئینجا وتمان پێیان بڕۆن بۆ لای گەل و کۆمەڵی- واتە فیرعەون و گەلەکەی – کە بڕوایان نەهێناوە بەئایەتەکانی ئێمە و بەدرۆیان ئەزانن، واتە برشوایان نیيە بەو هەموو بەڵگە نیشانە ڕونانە کەڕێنمونی سروشت و ژیریان بۆ کراوە. یان برشوایان نەهێنا بە ئایەتی پێغەمبەرەکانی ڕابردوو،ئەوانیش ڕۆیشتن بۆ سەریان و فەرمانی خۆیان پێ ڕگەیاندن و ئەوانیش باوەڕیان پێ نەهێنان و بەدرۆزنیان دانان ﴿فَدَمَّرْنَٰهُمْ تَدْمِيرًا﴾ بەهۆی ئەوە شکاندمانن و ڕوخاندمانن بەشکاندن و ڕوخاندنێکی سەر سوڕهێنەر، بەربادمان کردن و لەڕیشەمان هێنان ﴿وَقَوْمَ نُوحٍ لَّمَّا كَذَّبُوا۟ ٱلرُّسُلَ أَغْرَقْنَٰهُمْ﴾ گەلەکەی نوحمان خنکاند و نقوممان کردن لەناو ئاودا کاتێ کەباوەڕیان نەهێنا بە پیچغەمبەران، ئەو گەلە تەنها نوح یان بەدرۆزن داناو باوەڕیان پێ نەهێنا، بەلاچم نوح عەقیدە و باوەڕێکی بۆ هەموو پێغەمبەران پیچ ڕشوان کراوە –دروودی خوایان لێبێت–کەواتە باوەڕشیان بە هەموو نەهێنا ﴿وَجَعَلْنَٰهُمْ لِلنَّاسِ ءَايَةً﴾ گێڕامانن بەنیشانەیەکی ڕوون بۆخەڵکی. واتە ئەو خنکاندن و بەسەرهاتی ئەوانەمان گێڕشا بەبەڵگە و نیشانەیەکی ڕوونی گەورە بۆ خەڵکی کە عیبرەت و تەمێ ی لێ وەرگرن ئەوەتلا دەنگ و باسی ئەو تۆفانە هەرگیز لەبیر ناچێ و هەرکەس دڵ مردوو نەبیچ بەبیر لێ کردنەوەی تەمێ خوار ئەبێ و سام و ترسی خوا لە دڵی دا جێگیر و بەتین ئەبێ. ﴿وَأَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ئامادەمان کردووە بۆ ئەو گەلە ستەمکارە یان بۆ ئەوان و هەموو وێنەی ئەوان بە شێوەیەکی گشتی سزایەکی ئازاردەری سەخت لەڕشۆژی دوایدا، سەرباقی سزای ئەم جیهانەیان. ﴿وَعَادًا وَثَمُودَا۟ وَأَصْحَٰبَ ٱلرَّسِّ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی تائیفەی عاد بکە کە هود پێغمبەریان بوو، باسی سموود بکە کە ساڵح پێغەمەریان بوو، باسی گەلێ بکە کەخاوەنی بیرێ بوون کەسەنگ چن و دیوار بەدوری دا نەکرابوو، پێغەمبەرەکەیان شعیب بووبێ یان حنظلە،

وَقُرُونًۢا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا ﴿٣٨﴾ وَكُلًّا ضَرَبْنَا لَهُ ٱلْأَمْثَٰلَ وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ أَتَوْا۟ عَلَى
ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِىٓ أُمْطِرَتْ مَطَرَ ٱلسَّوْءِ ۚ أَفَلَمْ يَكُونُوا۟ يَرَوْنَهَا ۚ بَلْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ نُشُورًا ﴿٤٠﴾

---

**یان هەرکەسی تر ﴿وَقُرُونًۢا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا﴾ باسی چەند گەل و کۆمەڵێ تری زۆر بکە کە هاتن و تێپەڕیان کرد لەنێوان ئەو سێ تائیفەیەی کە باس کران. ﴿وَكُلًّا ضَرَبْنَا لَهُ ٱلْأَمْثَٰلَ﴾ تەمێ و مۆچیاری هەموو یەکێ لەو گەلانەمان کرد لەسەر زمانی پێغەمبەرەکانیان، ڕێگای ڕاستی خۆمانمان بۆ ڕشوون کردنەوە و چەند پەند و باسی ڕوون و نایابمان بۆ کردن کە هیچ بڕو بیانوویەکیان نەما، بەڵام ئەوان هەر سوور بوون لەسەر کوفر و بێ باوەڕی و تاوانی خۆیان و کۆتایی یان نەهێنا تا ئێمەش سزامان دان و لەڕیشەمان هێنان وەکو ئەفەرمێ: ﴿وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا﴾ هەموو یەکێچلەوانە ورد و هان کرد، واتە بەربادمان کردن و لەناو مان بردنبەشێوەیکی ناهەموار. ئینجا دوای باسەکە ئەهێنێ بەباسی گەلەکەی لوگ پێغەمبەر علیەالسلامکە قوڕەیش هەموو جارێ ئەچوون بۆ شام و ڕا ئەبوردوون بەلای جێ و شوێنەواری ولاتە وێران کراوەکەیان دا، ئەفەرمێ ﴿وَلَقَدْ أَتَوْا۟ عَلَى ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِىٓ أُمْطِرَتْ مَطَرَ ٱلسَّوْءِ﴾ سوێند بەخوا بێ بڕواکانی قورشەیشن بەلای شارێك دا کە بارانی خراپی بەسەردا بارێنرا، واتە ژێراو ژوور کرا و بەرد باران کرا، ﴿أَفَلَمْ يَكُونُوا۟ يَرَوْنَهَا﴾ دەی ئایا ئەوانە هەموو جارێ ئەو شارە وێرانەیان نەدیوە، واتە با هەموو جارێ ئەی بینن، کەواتە عارە بۆ ئەوانە کە بەوە تەمێ خوار نابن، هۆی بیرنەکرنەوە و تەمێ خوار نەبوونیان ئەمەیە کەباوەڕیان نی یە کە بەسەرهات و سزای ئەو شارە بەهۆی گونهو بێ باوەڕی بووە، چونکە باوەڕیان بەڕۆژی دوای نیە وەکو لەم فەرمووەدیەدا ڕوون ئەبێتەوە! ﴿بَلْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ نُشُورًا﴾ [١] واز بێنە لە باسی پێشوو. هۆی تەمێ وەرنەگرتن و بیر نەکردنەوەیان کە ئوانە بەتەما نین و چاوەڕوانی زیندوو بوونەوە ناکەن. لەپاش باسی پاشەڕۆژی سەخت و بەد بەختی ئەو گەل و کۆمەڵە ڕابردووانە ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆسەر بێ باوەڕەکانی قورەیش هەندێکی تر لەدەم درێژیی و بێ شەرمیان ئەهێنێ و ئینجا دەم کوتیان ئەکات بە هەڕەشە و ڕسوا و ڕەزیل کردنیان.**

---

[١] وشەی(بل) بە گوێرەی تەفسیرەکە بۆ وازهێنانە وەکو باس کرا، هەڵئەگرێ بۆ گواستنەوە بێت لە تەشەر لێ دانیان بە بیرکردنەوەبۆ تەشەرلێ دان بە گوناهێکی گەورەی تر کە بریتی یە لە بێ بڕوایی بە هاتنی ڕۆژی دوایی. بە هەردوو ڕێکە.

﴿وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا ﴿٤١﴾ إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا لَوْلَآ أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا﴾ کاتێ ئەو بتپەرستانە تۆ ئەبینن ئەتکەن بەجێگای گاڵتە و لاقرتێ و کەسێکی لاقرتێ پێ کراو، جگەلەوە ئیتر هیچ جۆرە ڕێز و نرخێکت بۆدانانێن و بەلاقرتیەوە دەڵێن: ﴿أَهَٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا﴾ ئایا ئەم کەم نرخەیە ئەوەی کە خوا ڕەوانەی کردووە بە پێغەمبەریی؟ بێ گومان پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)پێش پێغەمبەرێتی خاوەن ڕێز و شان و شەرەف بوو لەناو قورەیش دا لەبارەی نەژاد و نەسەبەوە، چونکە لەپۆپەی بەرەی هاشم بوو کەئەویش پۆپەی قورەیش بوو، هەروەها بەرز و خاوەن ڕێز بوو لەبابەت کردەوە و ڕەوشتی بەرزەوە،ئەوە بوو نازناوکرا بە(الأمین) و کرابە حەکەم لەدانانی(حجر الاسود) دا کە گرنگ ترین ڕداوبووە لەناو قورەیشدا، لە هیچ بار و ڕویەکەوە هیچ جۆرە بەد گومانی یە کیان نەبوو دەربارەی، بەڵام پاش ئەوەی کرا بەپێغەمبەر و ئەم قورئانە گەورەی بۆ هێنان و دەستیان کرد بەو چەنەبازیی و دەم درێژیەی کەهەموو دانا و زانایە لەئاستی دا دڵی ئەگیرێ.... بێگومان وەکو لەچەند شوێنی تردا باسمان کرد ئەوانەی کە ئەم فاك و فیك و پڕ و پاگەندەیان ئەکرد لەدەروونی خۆیاندا باش ئەیان زانی کەدرۆ ئەکەن و دەلەسە ئەکەن بۆ دوورخستنەوەی کۆڕ و جەماوەر لەم ئایینە تازەیە کەئەو سەرۆکانە مەترسی بەتینیان لێ ئەکرد و دڵە لەرزەیان بوو لەئاستی، چونکە ئەیان زانی کە ئەو ئایینە دەستیان ئەبەستێ لە هەموو جەورو ستەمێك و ماوەیان نادات خوێنی هەژاران و بێ دەستان بمژن، کەواتە پلەی کۆمەڵایەتی و ئابووری یان بەجارێ کەوتبووە خەتەرێکی گەورە. بەهۆی ئەوەوە بێ وچان خەریکی پیلان گێڕی بوون لە هەموو بار و ڕوویەکەوە کە لە دەستیان بهاتایە. لەو بارەیەوە چەند کۆنگرەیان ئەگرت و کۆبوونەوەیان ئەکرد.(ئیبن و ئیسحاق) ئەڵێ: کۆمەڵێ لە قورەیش کۆبوونەوە لای وەلیدی کوڕی موغەیرە کە لە گەورە پیاو ماقوڵانی قورەیش بوو – کاتەکانی کاتی حەج بوو – ئینجا ئەویش پێ ی وتن: ئەی

گەلی قورەیش ئەوا کاتی حەج هات و لە هەموو لایەکەوە لەتیرەی عەرەبەکان دێن، هەواڵی محەمەدیان بیستووە، کەواتە هەمووتان ڕێ خۆتان کۆبکەنەوە، یەك قسە بن نەك هەر یەکێ قسەیەك بکەن یەکتر بخەنەوە بەدرۆوە، ئەوانیش وتیان: دەی تۆ شتێ بڵێ با ئێمەش ئەوە بڵێین: ئەویش وتی نەخێر بڵێن و من گوێ ئەگرم. با هەموومان بڵێین محەمەد کاهینە. وەلید وتی نەوە الله کاهین نی یە، وتیان با بڵێن شاعیرە،وەلید وتی: ئێمە هەموو شارەزای هەموو بابەتی شیعرین، ئەمەی محمد ئەیڵێ لە بابەتی شیعر نییە. وتیان دەی بڵێین جادوبازە. وەلید وتی: جاد و بازیش نییە ئێمە جادوگەرانمان دیوە و ئەزانی جادو چۆنە؟ هەرشتێ لەمانە بڵێین بەراستی درۆیە و خەڵکی ئەزانن دەلەسە ئەکەین. بەڵام نزیك ترین شت ئەمەیە بڵێن جادوبازە و بە جادوێتی بەری داوینەتە یەکتری و کردوینی بە دوژمنی یەك... لەسەر ئەم بریارە هەڵسان و بڵاوەیان لێ کرد و لە ڕێگای وەفدەکاندا دانیشتن، هەرکەسیان بدیایە پێیان ئەت خۆت بە ئەو پیاوە بە جادو نەت خەڵەتێنێ. ئەمە نموونە و وێنەیەك بوو لەو پیلان و پروپاگەندەیە کە هەڵئەسان پێ ی بۆ بەرگری پێغەمبەر و ئایینەکەی، بێ گومان هەر لە قسە و باسی خۆینەوە روونە کە لە دەروونی خۆیاندا زانیویانە کە شتێکی گەورە و گرنگی چار نەکراوی هێناوە و بەرگرییان پێ ناکرێ و ئەوپەری ئەوەی لە دەستیان بێت ئەوەیە خۆیان بگرن نەترازێنرێن لە بیر و باوەرەکەی خۆیان، وەکو روون ئەبێتەوە هەر لە قسەی خۆیانەوە کە ئەیان وت: ﴿ إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا لَوْلَآ أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا ﴾ بەراستی نزیك بوو کە محمد گومرامان بکات و لامان بدات لە پەرستنی بتەکانمان ئەگەر دانمان بە خۆمان دا نەگرتایە و دامەزراو نەبووینایە لەسەر پەرستنیان، واتە ئەوەی محمد پێی رائەگەیاندین ئەوەندە بەهێز بوو خەریك بوو بە تەواوی کارمان لێ بکات، بەڵام ب هۆی خۆگریمانەوە توانیمان نەترازێین و گیانمان بەوە بوو. ئەو سەر لێ تێك چووانە لەگەڵ ئەوجا بۆیان نەئەشارایەوە کە قورئان ئەوەندە بەهێزە لەرزەی خستووەتە ناو دڵ و دەرونیان کەچی رێنمونی و ئامۆژگاری یەکەی پێغەمبەریان ناو ئەبرد بە گومڕا کردن و ئەیان وت: نزیك بوو گومرامان بکات،

وَسَوْفَ يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ أَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ﴿٤٣﴾

---

کەواتە با بدرێ لە دەماخیان بەم هەڕەشە سامناکە کە ئاراستەیان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَسَوْفَ يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيلًا﴾ لەمە و پاش کاتێ کە سزای خۆیان ئەبینن ئەزانن کە کێ گومرا تر و هەڵە تر لە بارەی ڕێگا و بیر و باوەڕەوە، باش باش لە کاتی بینینی ئەوسزادا ئەزانن کە خۆیان هەڵە و سەر لێ تێك چوو بوون، بەڵام کە لەم جیهانەدا دووچاری ئەبن و بە کافری تیا ئەچن یان وەکو سزای ڕۆژی(بەدر) کە دووچاری یەکەم چین بوو بەو جۆرە بە ریسوایی و کافری لە ناوی بردن، یان مەبەستی سزای ڕۆژی دوایی بێت – خوا پەنامان بدات لە هەردووکیان-. ئینجاڕووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ)ودڵ نەوایی ئەکات لەسەر ئەو سەرکێشی و دەم درێژی و باوەڕ نەهێنانی ئەو کۆمەڵە، چونکە بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) هیچ جۆرە کەم و کوڕی نیە لە پەیام و ئایینەکەی دا لە هیچ بار و ڕوویەکەوە، هەروەها پێغەمبەر شایەنی ئەوە نیە کە بێ ڕێز و دەم درێژی دەربارە بکرێ، کەواتە هۆی بێ شەرمی و دەم درێژی ئەوان و باوەڕ نەهێنانیان بێ باوەڕەکان خۆیانن کەئارەزووی ناڕەوایی نەفسی خۆیانیان کردوە بە پێشەوای خۆیان و ئەیپەرستن، ناگەڕێنەوە بەهیچ بەڵگەو نیشانەیەك کە ژێریی باوەڕی پێ ی هەیە. کەواتە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) چی بکات و چۆن چارەسەری بکات کە ئارەزوی نەفسی خۆیان گێڕاوە بەخواو پەرستراوی خۆیان؟ ئەفەرموێ: ﴿أَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ﴾ ئایا سەرنجی کەسێکت داوە کە ئارەزوی نەفسی خۆی کردووە بە خواو پەرستراوی خۆی، بەم ڕەنگ گوێ ڕایەڵە بۆی و ئایین و بیر و بڕوای خۆی لەسەر دامەزراندووە و ئیتر گوێ شل ناکات بۆ هیچ ڕابەرو بەڵگەیەك، سەرنجی هیچ شتی تر نادات؟ واتە بەسەر سوڕمانەوە سەرنجی ئەو کەسە بدە کە چۆن سەری لێ شێواوە؟ ﴿أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا﴾ دەی ئایا تۆ ئەبی بە پارێزەر بۆ سەر ئەو کەسە، بەرگری بکەیت و بیپارێزی لە کوفر و تاوان ئەو شوێن کەوتنە ناڕوایە، واتە نەخێر کەسێك کەیشتە ئەو ڕەدەیە دەست نادات بۆ چارەسەر کردن و تۆ ناتوانی بەرگریبکەیت و بیخەیتە سەر ڕێگای ڕاست، کەسێ وابێ شایەنی ئەوە نیە گوێ ی پێ بدەی... ئینجا هەنگاوی تر ئەنێ لە ڕوون کردنەوەی بێ نرخی ئەو جۆرە کەسانەدا،

أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ۚ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ ۖ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٤﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا

**ئەفەرموێ: ﴿أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ﴾ بەڵكو ئایا تۆ وا ئەزانی كەزۆریەی ئەوانە ئەبیستن و یان تێ ئەگەن و ژیرن؟ واتە گومانی وا نەبەیت و وانەزانی، كەواتە ئایەت و بەڵگەو نیشانە هیچ سوودێ بەوانە تا تۆ هەوڵ و تێكۆشان بكەیت و چاوەڕوانی باوەڕش هێنان یان بیت﴿إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ﴾ ئەوانە بەوێنەی هیچ نین جگە لە وڵاخ و ئاژەڵ، لەم بارەوە كە هیچ سوودێ وەر ناگرن بە بیستن و بینینی هیچ بەڵگەو ڕابەرو نیشانەیەكی ڕوون، بێگومان ئەو شتە گرنگەی كە ئادەمی جیا بكاتەوە لە وڵاخ و چوار پێ بریتی یە لە تێگەیشتن و هۆش و بیر كردنەوەو ڕفتاركردن بەو پێ یە، دەی كاتێ هەر ئادەمی یەك ئەو سیفەتە جیاكەرەوەی تیا نەبوو ئەو كاتە بەوێنەی وڵاخ و ئاژەڵ وایە ﴿بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا﴾ بەڵكو ئەوانە هەڵە ترو ڕێگا لێ تێكچوو ترن، چونكە ئادەمی دروستكراو ببێ بەجێنشین لەم زەویەدا و كاروباری جیهان و ژیانبگرێتە ژێر دەست، دەی كاتێ ئەتوانێ هەڵسێ بەم كارە گرنگەی كەپێ ی سپێرراوە كە خاوەنی ئەو سیفەت و بەهرایانە بێت كە پێیان جوێ بووەتەوە، بە بێ ئەوانە لەكار و فرمانی خۆی ئەكەوێ و نایشتوانێ هەڵسێ بەكارو فرمانی وڵاخ و ئاژەڵ، بەڵام وڵاخ و ئاژەڵ ئەتوانن هەڵستن بە كارو فرمانی خۆیان، كەواتە ئەو جۆرە ئادەمیانە گومرشاو تر و هەڵە ترن. ئا بەم جۆرە خوا دەم كوتی ئەوانەی كردوە كەدەم درێژی یان ئەكرد دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ) بەو هەموو ڕەخنە ناڕەواییانەوە لا قرتیان پێ ئەكرد، دەم كوتی كردن بە ڕسوا كردن و بەبێ نرخی تا كۆتای هێنا بەمەی لە چوارچێوەی ئادەمی دەری كردن و نزم و پەست تری كردن لەوڵاخ و ئاژەڵ، ئەوە دەردیان بێت قورئان هەتا هەتایە جاڕی ئەوەیان لێ ئەدات، واز ئەهێنێ لەباسی دەم درێژیی و دەم بازی بت پەرستەكان ودەست پێئەكات لە گەردش پێكردنی دڵ و دەروونی بەندەكانی و چاو پیا گێڕانیان بە چەند بەش لەم پێشانگا گرنگەی بونەوەردا كەسەرنج ڕائەكێشێ بۆ ئەم جۆرە شتانە كە ئاشكران و وان بەپێش چاوەوە و دڵ و ژیریی ڕائەكێشێ و ئەیبەستێ پێیانەوەو ژیری و هەستیان بێدار ئەكاتەوە بۆ چنینەوەی ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕونانە كە پرژو بڵاو بوونەتەوە لەم بونەوەرە پان و**

فراوانەدا، هەموو یەکێ لەوانە وەکو ئەستێرەی بەرە بەیان ئەدرەو شێتەوە و هەر کەس پەردەی ئەستوور نەنرابێ بەسەر چاویدا و سیالای نەهاتبێ بەسەر چاوو دڵ و ژیری دا، بێگومان ئەو بەڵگەو نیشانانە ئەبینێ و ئینجا هەست ئەکات بەو دەستە قودرەتەی کە ئەو پێشەنکا گرنگەی ڕزاندۆتەوە، تا ئەگاتە ئەو ڕەدەیەی سەرنجی هەر شتێکی دا لەپێشەوە هەست بە خوای پەروەردکار ئەکات و چاوی دڵی لە پێشەوە ئەو ئەبینێ... لێرەدا سەرنج ڕائەکێشێ و دەست نیشان ئەکات بۆ پێنج شتی سەر سوڕ هێنەر، بەڵام وەکو هەموو شتەکانی تر بەهۆی ئولفەت و دەق گرتن پێ یانەوە دڵ و دەروون بێ ئاگا ئەبێت لە گرنگی و نایابیەکەیان، کەواتە با زۆر بەدڵ گوێ شل بکەین بۆ قورئان و بژین بژین لەو میهرەجانەی کە خوای پەروەردگار فەراهەمی هێناوە بۆمان: لە یەکەم جارەوە ڕووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ﴾ ئایا سەرنجت نەداوەتەوە بۆ لای کرداری پەروەدگارت کەچۆن بە ئاهیستە سێبەری داهێناوەو ڕای خستووە و درێژەی پێداوەو بۆ هەموو سێبەر داریێ لە خۆر هەڵاتەوە تا ئاوا بوون، ئینجا ئادەمیش لەژێریانەوە ئەحەوێتەوە بەرگری گەرمیی بڵێسەی خۆریان پێ ئەکات. هەموو کەس ئەزانێ هەر شتێ بەرگری گەرمایی خۆر بکات و خۆر لە پێش چاو داشاریێ ئەو شتە سێبەری هەیە، ڕووناکی خۆر بدات لە هەر لایەکی سێبەر ئەکەویچتە ئەو لایەی کە بەرامبەرە. ئەوەتا لای بەیانی کە خۆر هەڵ دێ و بدا لە هەر شتێ لای خۆر ئاوا ئەبێ بە سێبەر، و لای ئێوارە بە پێچەوانەی بەیانی یە، ئینجا ئەبینین لای بیانی کە خۆر هەڵدێ لە یەکەم جارەوە ئەگاتە ئەو پەڕی ڕەدەی خۆی بەرەو خۆر ئاوا، ئینجا ئەو سێبەرە وەستانی نیەو هەموو کات جووڵان و بزووتنەوەیەکی هەیە بەڵام شاراوەیەو کەم تر هەستی پێ دەکرێ، بزووتنەوەی هەیە بەپێ ی بزووتنەوەی زەوی بەرامبەر بە خۆر ﴿وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا﴾ ئەگەر خوا بیویستایە ئەیگێڕا بە وەستاو ئەی وەستان... دروست کردنو پێك هاتنی ئەم بوونەوەرە لەسەر ئەم بارەی کە هەیە، داڕشتن و هۆنینەوەی کۆمەڵەی خۆری بەم شێوەیەوکە لەسەریەتی، ئەوەیە هۆی نەوەستانی سێبەر و جولان و بزووتنەوەی بەو ڕادە ئاهیستەیەو لەسەر خۆ، ئەگەر هەر جۆرە گۆڕان و جیاوازی یەك ببووایە سێبەریش ئەوەستا بەبێ گۆڕان و کەمو کورتی، ئەگەر زەوی چەسپان تر یان سست تر بوایە سێبەریش بەگوێرەی ئەو ئەبوو، خوا سێبەری بەو جۆرە فەراهەم هێنا،

ئینجا ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَا ٱلشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا﴾ ئینجا خۆرمان کردووه به ڕابەر و نیشانه لەسەر دەرکەوتن و ئاشکرا بوونی لەپێش چاو و هەست پێ کردنی خۆی و ئەندازەی و بە بڵاو بوونەوەو پەرەسەندن و گەڕانەوەو کەم کردنی، ئەوەتا هەر شتێکی سێبە دار کاتێ لە سێبەر دا بێت ئەو شتە بە خۆی ی هەر ڕەنگێکی هەبێ دەر دەکەون هیچی تر، بەڵام کاتێ خۆر هەڵهات و تیشکی کەوتە سەری ئەو کاتە دەرئەکەوێ کە شتێ ترە جیاوازە لەو شتە و ڕنگەکەی. ﴿ثُمَّ قَبَضْنَٰهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا﴾ ئینجا ئەو سێبەرە ئەگەڕێنەوەو ڕای ئەکێشنەوە بۆلای خۆمان کەم کەم و بەرەبەرە، ئەوەش بەپێی بەرز بوونەوەی خۆر، واتە کاتێ خۆر هەڵهات و یەکەم جار تیشکی کەوت لە هەر شتێکی سێبەردار سێبەری بۆ فەراهەم دێنێ بەرەو ڕۆژ ئاوا تا ئەگاتە ئەو پەڕی ڕدەی ئەندازەی تایبەتی، ئینجا بەرەبەرەو کەم کەم ئەو سێبەرە ئەسڕێنەوە و نایهێڵن تیشکی خۆر دێتە جێگای تا خۆر دەگاتە ناوەڕاستی ئاسمان، ئینجا لەوێداکەم بوونەوەی دوای دێت دەست ئەکاتەوە بە زیاد بوون و پەرە سەندن بەرەو ڕۆژ هەڵات. فەرموێ: ڕای ئەکێشینەوە بۆلای خۆمان، تا بێ ئاگا بێدار بێتەوە و بە چاوی دڵ ئەو دەستە قودرەتە ئەبینێ کە سێبەری فەراهەم هێنا بۆ سێبەر دار، ئینجا بەبێ وەستان و وچان هەمیشە بە ئاهیستە لە سەر خۆ جووڵان و بزووتنەوە ئەکات بەو سێبەرە... بەڕستی شێوە و وێنەی سێبەر کە لەپێش چاوە سەر لەبەیانی بەرەو ڕۆژ ئاوایە و بەرەبەرە کەم ئەبێتەوە ئینجا زیاد ئەکات و پەرە ئەسێنێ بەرەو ڕۆژ هەڵات، ئینجا لەکاتێکدا ئەبینرێ کە هیچی نامێنێ و لە پێش چاو ون ئەبێ بەخۆر ئاوا بوونی خۆر، بەڕاستی ئەو وێنە و شێوە کە ساڵ دوانزەی مانگ وابە پێش چاوەوە، ئێجگار شتێکی نایابە و جێگای سەر سوڕمانە. بەڵام بەداخەوە زۆر بەدەگمەن خەڵك بیری لێ ئەکەنەوە، چونکە بەهۆی ئولفەت و دەق گرتنەوە هێزی هەست و ژیری لە ئاستی کوژراوەتەوە، لە بەر ئەوە قورئان سەرنجمان ڕائەکێشێ و دڵ و هەستمان ڕئەوەشێنێ تا بکەونەوە ئیش و وریا ببنەوە.

وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِبَاسًا وَٱلنَّوۡمَ سُبَاتًا وَجَعَلَ ٱلنَّهَارَ نُشُورًا ﴿٤٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ ٱلرِّيَٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَىۡ رَحۡمَتِهِۦ

دووەم لەو پێنج بەڵگەو نیشانە ڕوونانە کەلێرەدا ئەی خاتە پێش چاو ئەمەیە کە لەم ئایەتـەدا ئەفـەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِبَاسًا﴾ خـوا کەسـێکە کـە لەبـەر سـوود و بەرژەوەندی ئێوە شەوی گێڕاوە بە داشار دەرتان بەتاریکی یەکەی بەوێنەو پۆشاك و جل و بەرگێ کە بکرێ بەبەردا وایە، ئەو شاردنەوەی هەرچۆنێ بۆ تەندروستی بەکار و پرسوودە، هـەروەها چـەند سـوودی گشتیی و تایبـەتیی تیایـە، ﴿وَٱلنَّوۡمَ سُبَاتًا﴾ خـەوی گێـڕاوە بەوێنـەی مـردن لەمـەدا کە هەست و هۆش ناهێڵێ و هێز و وزەکـان لـە کـار ئـەخات و پـەکی خـەوتوو ئـەخات و لـە کار و فرمانـەکانی ﴿وَجَعَلَ ٱلنَّهَارَ نُشُورًا﴾ [1] ڕۆژی گێـڕاوە بەکاتی زیندووبوونـەوە لەو مردنە بچکۆلەیە، بێگومان ئەو مردنە بچکۆلەیە – واتە خەوتن- هۆی ئارام و ئاسایش و تەندرووستیە و بـەبێ ئەوە گیلەبـەرانی ئـەم زەویـە ژیـانی نـابێ، هـەروەها هەڵسان لەخـەو و خەبەر بوونەوەش پێویستە و بەبێ ئەوە گوزەران نابکرێ، کەواتە پێویستە باش بیرکەینـەوە لەم دوو بەهرە و چاکەی خوا کەبەبێ ئەرك و دەسەڵاتی خۆمـان خـوا بۆمـان فەراهـەم دەهـێنێ سـاڵ دوانـزە مـانگ، پێویـستە سوپاسـی خـوا بکـەین و چـاولەبەری خۆمـان دەربـبڕین بـۆی، بێگومان ئەم دوو بەسەر هاتە بەڵگە و ڕابەرێکی زۆر ڕوون و ئاشکران لەسەر زیندوو بوونەوە لەپاش مردنیی گەورە، پێویستە ئێمە بەبێ هۆش و بێ ئاگایی تێنەپەڕین بەلایی ئەم دوو بەسـەر هاتـەدا کـە لـە هـەموو خولانـەوە و چـەرخەیەکی زەوی دا هەمیـشە خوامـان پێـشان ئەدات، ئای چەند شیرینی فەرمو لوقمان بەکوڕەکەی-درودی خوایان لەسـەر بێـت:(کما تنـام فتوقظ تموت فتحشر) واتە چۆن ئەخەویت و خەبەر ئەکرێیتـەوە هـەروەها ئـەمریت و زینـدوو ئەکرێیتـەوە، بەڕاسـتی وشـەو ڕسـتەیەکی کـورت و پـڕ تـام و مەزەیـە. سـێ یـەم لـەو بەڵگـە ڕوونانـە کـە ئەیخاتـە پـێش چـاومان لـەم پێـشانگای بوونـەوەردا ئەمەیـە کەلـەم ئایاتـەدا ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ ٱلرِّيَٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَىۡ رَحۡمَتِهِۦ﴾ خوا کەسێ کە بای ناردووە و ئەینێرێ بەموژدەدەرلەپێش دەم ڕەحمەتی خۆیەوەواتەئەوبارانەی کەبەرهەمیی ڕەحم وبەزەیی خوایە وسەراسەر پیت و فەڕی پێ یەو جیهان و ژیان بەبێ ئەو بارانی ڕەحمەتە نابێ ناگونجێ،

---

[1] هەندێ لە زانایان وشەی(سبات) ئەبڕن بەسەر ئارام و ڕەحەتی دا، یان بەجۆرێ لە بێ هۆشی کە روو ئەکاتە گیان لەبەری ئەم زەوی یە، و وشەی(نشور) ئەبڕن بەسەر بزووتنەوە و بڵاو بوونەوە بە زەوی دا بۆ ئیش و کار و ڕۆزی پەیدا کردن.هەرچەندبەم جۆرەش ئەگونجێ، بەڵام ئەوەی لەتەفسیرەکەدایەبەهێزترو پڕ سوود ترە، و خوا خۆی باش ئەزانێ.

﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا﴾ هێناومانەتە خوارەوە لە لای ئاسمان و لای سەرەوە ئاوێکی زۆر پاك کە پاکەوەکەریشە ﴿لِّنُحْـِۧىَ بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا﴾ بۆ ئەمەی زیندوو بکەینەوە بەو ئاوە خاك و وڵاتێکی مردوو، واتە خاك و وڵاتێکی وشك و برین و بێ سەوزە زیندوو بکەینەوە بەو هەموو جۆرە سەوزە و درخت و گوڵ و گوڵزارە، ﴿وَنُسْقِيَهُۥ مِمَّا خَلَقْنَآ أَنْعَٰمًا وَأَنَاسِىَّ كَثِيرًا﴾ بۆ ئەمەی لە نێوان ئەو گیانلەبەرانەی کە دروستمان کردوون ئەو ئاوە دەرخواردی چەند جۆری لە حوشتر و وڵاخ و ماڵات و ئادەمیەکی زۆر بدەین و تێر ئاویان بکەین پێ ی. واتە ئەوانەی کە کۆچەر و دانیشتووی دەشت و بیابانن کەکارێز وکانی و چەشمەیان نییە و ژیانیان لەرێوە لەسەر بارانە کە دۆڵ و شیوەکانی پێ هەڵئەسێ و کۆ ئەبێتەوە بۆیان لە حەوز و جێگای چاڵ و نزماییدا و ئەوانیش لە ئاو ئەخۆنەوە و بەوە گوزەران ئەکەن. نەك وەك دانیشتوانی شار و دێهاتەکان کە خواردنەوەی ئاویان لە کانی و کارێز و جۆگە و رووبارەکانە. بێگومان ژیان لەسەر زەویدا لەسەر ئاوی بارانە ئیتر هەر لەرێوە وەکو ژیانی کۆچەر و دانیشتووی چۆڵ و بیابانەکان، یان لە پاش ئەمەی چوو بە ناو ناخی زەویدا و ئینجا بوو بە کانی و جۆگە و رووبار، بەڵام ئەوانەی کە لەرێوە ژیانیان لەسەر بارانە ئەوانەباش هەست ئەکەن بە نرخ و بە زۆر گرنگی باران، ئەوانە چاوەروانی ئەکەن بە جۆرێ هەست ئەکەن کە گیان و ژیانیان بەستراوە پێیەوە، چاوەروانی ئەو بایە ئەکەن کە ناسراوە بە لایەنەوە بە پێشرەوی باران، کاتێك ئەو بایە هەڵی کرد مژدە ئەبەخشن، وە هەست ئەکەن بە رەحم و بەزەیی خوا تیایدا، ئەگەر لەوانە بن کە خوا بەشداری کردبن لە بەهرە و بەخششی ئیمان و باوەڕدا. جا بەهۆی ئەوەوە بە تایبەتی باسی تێراو کردنی ئەو جۆرە ئادەمیانەی کرد کە خۆیان و وڵاخ و ماڵاتیان لەو ئاوە ئەخۆنەوە و لەرێوە ژیانیان لەسەر بارانە. لە پاش پیشاندانی ئەم چەند پێشانگا بوونەوەریانە، لە پاش باسی هاتنە خوارەوەی باران لە لای ئاسمانەوە کە وڵات و ئادەمی زیندوو ئەکاتەوەبۆ لای ئەوە قورئانەی کە لە ئاسمانەوە هاتە خوارەوە بۆ زیندوو کردنەوە و پاك و خاوێن کردنی دڵ و دەروون و گیان. ئەو قورئانەی کە ژیانی پاك و خاوێنی هەردوو جیهان و پێوە بەستراوە کەچی زۆر لە ئادەمی مژدە بەخش ئەبن بە باران و بەڵام مژدە بەخش نابن بەم قورئانە گەورەیە.

وَلَقَدْ صَرَّفْنَٰهُ بَيْنَهُمْ لِيَذَّكَّرُوا۟ فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٥٠﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا فِى كُلِّ قَرْيَةٍ نَّذِيرًا ﴿٥١﴾

ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَٰهُ بَيْنَهُمْ﴾[1] سوێند بە خوا مەبەستەکانی قورئان و نیشانە و رابەرەکانی ئیمان گۆڕی لە نێواتن خەڵکدا و بە چەند جۆر و شێوەیەك کە ئاراستەمان کردن و دامان بە گوێچکەیاندا، وە بەچەند شێوەیەك سەرنجمان ڕاکێشان و دواین لەگەڵ هەست و هۆش و دەروون و ژیریان دا لە هەموو کون و کەلەبەرێکەوە چووینە ناو دەروونیان و بە هەموو هۆیەك کە خەریك بووین بۆ ئەمەی دەروونیان بێتە جۆش و پەرۆش ﴿لِيَذَّكَّرُوا۟﴾ بۆ ئەمەی بیر بکەنەوەو تەمێ و ڕێنموونی وەرگرن... ﴿فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورًا﴾ کەچی زۆربەی ئادەمی سەرکێش و ملکەچی یان کردو و هیچیان نەکرد بەرامبەر ئەو بەهرەو چاکەی ئێمە جگە لە گوێ پێنەدان و دان پیا نەنان و. هەرچەند کار و فرمانی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەو ئەرکەی خرایە سەر شانی ئێجگار گەورە و گران بوو، بەڵام خوا منەتی ئەنێ بەسەردا، چونکە نیازی خێری پێ ی بووە لەو کارە گەورەیەدا، ویستوویەتی کەبگات بەپلەی هەرە بەرز لە هەردوو جیهان دا گەورەترو بەڕێز تر پاداشت وەرگرێت، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا فِى كُلِّ قَرْيَةٍ نَّذِيرًا﴾ ئەگەر بمان ویستایە لەهەموو شارێك دا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە ئەکرد ترسێنەریان بێت، ئەوکاتە ئەرکی سەرشانی تۆ سووك ئەبوو،بەڵام بەو جۆرەمان نەکردوو تۆمان بەتەنیا کرد بە پێغمبەر بۆ سەر هەموو ئادەمی و جیهان بۆ ئەمەی شایان بێت بۆ ئەو ڕێز و پلەی بەرز و پاداشتە زۆر گەورە بەهۆی هەڵساند بەو کارە زۆر گەورەیە. کەواتە ئەو ئەرکەی خراوەتە سەرشانی گەورەترین بەهرەو چاکەی خوایە بەسەر یەوەو پێویستە لەسەری سوپاسی خوا بکات و هەڵسێ بەمافی ئەو بەخشش و بەهرەیە، ئەوەش بەتێکۆشان و بەربەرەکانێ لەڕێگای بڵاوکردنەوەو چەسپاندنی ئەو پەیامەو ئاینەی کەپێی ڕوانە کراوە.

[1] زۆر لە زانایانی تەفسیر ئەفەرمون: مەبەست بە راناوی(ە) بارانە لەبەر ئەوە نزیك ترین شتە، و قورئان لەم شوێنەدا باس نەکراوە، بەم جۆرەش زۆر جوانە. بەڵام لەم کاتەدا دڵ بە ئارام و بەهێزتر بوو لەگەڵ ئەو رایە کە ئەڵێ: ئەگەڕێتەوە بۆ قورئان لەبەر ئەوە بەو جۆرە تەفسیرم کردەوە، خوا خۆی باشتر ئەزانێ.

وەكو ئەفەرموێ: ﴿ فَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ كەواتە بەگوێ ی كافرەكان مەكە لەوەی داوای ئەكەن لێت و ئەیانەوێت یەك كەوی لەگەڵیان. خۆگربە و دژیان ڕاوەستە ﴿وَجَٰهِدْهُم بِهِۦ جِهَادًا كَبِيرًا ﴾ تێكۆشان و بەربەرەكانێ یان بكە بەو قورئانە و بەتێكۆشان و بەربەرەكانێ یەكی زۆر گەورە. واتە ئەوان بەهەموو هێز و توانایەك تێكۆشان ئەكەن بۆ بەرگری و بەرهەڵستی ئەو ئاینەی تۆ. تۆش بەرامبەر ئەوان بوەستە و بەرگری ئەوان و پیلانەكەیان بكە بە ڕفتر كردن بەقورئان و خوێندنەوەی قورئان بەسەریان دا كە ئەو هەموو تێخوڕین و ترساندن و داچڵەكاندن و پەند و ئامۆژگاریی و بەڵگەو ڕیەری ڕوون و ئاشكرای تیا هەیە، هەروەها گێڕانەوەی سەرگوشتە و بەسەر هاتی بەد بەختی و دوا ڕۆژی ڕەشی بێ باوەڕەكانی گەلە ڕابردووەكانی تێدایە، ئەم بەربەرەكانێ وتێكۆشانە شتێكی زۆر گەورە بوو، چونكە هەوڵ دان لەگەڵ نەزانان و نەفاماندا ئەركی گران ترە لە شەرە شمشێر لە گەڵیان. بێجگە لەوەش لەو كات و چەرخی مەككەدا كەژمارەی ئیمان داران زۆر كەمو لاواز بوو، كافرەكان لەو پەڕی دەسەڵات و بافیشی خۆیان دا بوون، لەو كاتەدا بەربەرەكانێ ی چلان و بەرچەلانی ئێجگار سەخت و گران بووە و كەسێكی دڵ گەورەی بەهێزی وەك پێغمبەر(ﷺ) نەبێ هیچ كەس بەرگەی ئەوە ناگرێ، بەڵام بێگومان ئەو چەكە كە خوای گەورە دابوویە دەستی ئێجگار بەكار و چار نەكراو بوو، دڵ ڕەروونی هەمووی هێنابوونە لەرزەو بوو بوو بە بومەلەرزە لەناو دڵیان دا و نەیان ئەزانی چ هۆیەك بەكار بهێنن بۆ بەرگری كردنی. تەنانەت گەیشتە ڕادەیەك گەورەو سەرۆكانیان ئەیان وت بە جەماوەری خەڵكی ﴿لَا تَسْمَعُوا۟ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْا۟ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴾ واتە گوێمەگرن لەم قورئانە و لە كاتی خوێندنیدا بیكەن بە هەرا و بەزم و هۆسە و چەپڵە لێدان بەڵكو زاڵ بن بە سەری دا. ئەم وتەی ئەوانە نیشانەیەكی ڕوون بوو لەسەر ئەو بیم و ترسەی كە لێیان نیشتبوو بەرامبەر بەم قورئانە و كاركردنی لەسەر

دەروونی خەڵکیدا، ئەو سەرۆکانە کە بەو جۆرە خەمی خەڵکیان لێ هاتبوو مەترسی خۆشیان بوو کە قورئان کاریان لێ بکات و رایان بکێشێت بۆ لای خۆی.(ئیبن و ئیسحاق) ئەگێڕێتەوە لە زەمری یەوە کە ئەبو سوفیان و ئەبو جەهل و ئەخنەس کوڕی شورەیق هەر کام شەوێك لە ماڵی خۆی دەرچو بە بێ زانینی ئەوانی تر کە بچێ گوێ بگرێت لە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك قورئان ئەخوێنێ بە دەنگی بەرز لە شەو نوێژدا، هەر کام لەو سیانە لە لایەکەوە دائەنیشێ بۆ گوێ گرتن بە بێ ئەمەی بە یەکتر بزانن، ئەمێننەوە تا بەیانی گوێ ئەگرن، ئینجا کاتێ بڵاوەی لێ ئەکەن و ئەگەڕێنەوە هەر کەس بۆ ماڵی خۆی لە ڕێگەدا ئەکەن بە یەك، و کاتێ کە بە حاڵی یەکتر ئەزانن دەست بە مەنع و لۆمەی یەکتر ئەڵێن: جارێ تر کاری وا نەکەن، ئەگەر نەفام و هەرزە بە شتی وا بزانن ئێوە ئەبن بە هۆی سەرتێك دان و دڵ گۆڕانیان. ئینجا شەوی دووەم هیچیان خۆیان پێ ناگیرێ و هەر وەك شەوی یەکەم لە ماڵ دەر ئەچن و تا بەیانی گوێ ئەگرن و لە پاش گەرانەوە لە ڕێگادا بە یەکتر ئەزانن و هەروەك یەکەم شەو مەنع و لۆمەی یەك ئەکەن و بریار ئەدەن ئیتر کاری وا ناکەن، بۆ شەوی سێ یەم عەینی شت روو ئەداتەوە و ئینجا کە ئەگەن بە یەك چەیمان ئەدەن بە یەکتر کە ئیتر شتی وا روونادات لێیانەوە، ئیجا بڵاوەی لێ ئەکەن، ئینجا لە رۆژدا ئەخنەس داردەستەکەی ئەگرێ بە دەستەوە و ئەچێ بۆ ماڵی ئەب سوفیان و پێی ئەڵێ ئەبو حەنزە هەواڵم بدەرێ لە راو باوەڕی خۆت دەربارەی ئەوەی لە محمدت بیست، ئەویش ئەڵێ: ئەبو سەعلەبە، سوێند بە خوا شتێکم بیست ئەمزانی و تێی ئەگەیشتم و ئەمزانی مەبەست چییە پێ یان، ئەخنەسیش ئەڵێ: منیش هەروا بووم سوێند بەوەی کە سوێندت پێ خوارد: ئینجا لای ئەو هەڵ ئەسێ و ئەچێ بۆ ماڵی ئەبو جەهل و ئەوەی کە وتی بە ئەبو سوفیان بە ئەویش ئەڵێ: ئەبو جەهلیش لە وەڵامدا ئەڵێ: چیت بیستووە لە محمد؟ ئێمە و تاقمی بەنی عەبجو مەناف هەمیشە ئاژاوە و بەربەرێکانێمان بووە لەسەر هۆی شەرەف و بەرزی، ئەوان نانیان داوە بە خەڵکی ئێمەش نانمان داوە، ئەوان وڵاخی سواریانلا داوە بە خەڵکی و خەڵاتی خەڵکیان کردووە ئێمەش

کردوومانە، هەتا لە هەموو شتێکدا یەکسان بووین و ڕێکیان وەستاین، ئینجا ئێستا ئەوەان ئەڵێن: پێغەمبەرێکمان لێ پەیدا بووە کە لە ئاسمانەوە سروشی بۆ دێ، جا ئێمە لە کوێ بگەینە ئەوە؟ سوێند بە خوا هەرگیز باوەڕی پێ ناهێنین و بڕوای پێ ناکەین!! ئینجا ئەخنەس هەڵ ئەسێ و بە جێی ئەهێڵێ.

ئا بەو جۆرە زۆرە زماییان ئەکرد لەگەڵ خۆیاندا نەك سۆز و مەیلێ پەیدا بکەن لەگەڵ قورئاندا و داگیریان بکات!! بێگومان لەم قورئانەدا ئەوەندە شتی ڕاستی سروشتی بێ گرێ و سووك و ئاسان هەیە کە دڵ و دەروون ئەگەیەنێ بە سەرچاوەی حەق و حەقیقەت، کەواتە ملە جەڕێ ناکرێ لەئاستی - مەگەر ئەبوجەهلێتی بەکار بهێنرێ - و هەروەها ئەوەندە شتی نایاب و سامناك و سەرسوڕ هێنەری تیایە لەوهەموو سەر گوزەشتە و شێوەی مژدە بەخش و ترسێنەری ڕۆژی دوایی و شێوەی شیرین و دڵ ڕفێنی پێشانگای ئەم بوونەوەرە. لەو بابەتانە ئەوەندە شتی تیایە کە دڵ و هەست ئەهێنێتە جۆش و لەرزە و خۆی بۆ ناگیرێ بەرامبەر ئەم قورئانە گەورە و بەفەڕە. مەگەر ئەو دڵانەی کە سمەسایان لێ بڕاوە و بەهیچ ڕەنگ ڕوناکیان تیانیە. لەهەندێ کات دا ڕێك ئەکەوێ تەنیا سورەتێ، بەڵکو تەنیا ئایەتی ئایەتێ بەجارێ دڵ و دەروونی ئادەمی ئەهێنێتە هەشۆکە و داگیری ئەکات و چوار دەوری لێ ئەگرێ بەوێنەی لەشکرێکی زۆری بەهێز!! کەواتە نابێ سەرسوڕ بمێنێ لەوەی کەوا فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە بەم قورئانە تێکۆشان و بەربەرەکانێ بکات لەگەڵ کافرەکان دا کە ئەو کە ئەو هەموو مل هوڕ و سەرکێشانەیان تیا بوو، چونکە بەهێز و چەکێ بەربەرەکانێ ی ئەکرد کەچار نەکراوە و ئەبێ هەر سەرکەوێ زاڵ ببێ. مەرجی ئەو سەرکەوتن و زاڵ بوونە ئەوە نیە کە ئەبێ تەنیا بەدەست پێغەمبەرەوە(ﷺ) بێت و بەکار هێنەری ئەوبێت، بەڵکو هەرکەسێ تریش لەهەر چەرخێکدا و لەهەر لایەك و بەرامبەر هەر دوژمینێ بەکار بهێنرێ هەرپاشەڕۆژی زاڵ بوون و سەرکەوتن مسۆگەرە بە مەرجێ بەڕێکی بەیرەوی پێغەمبەر بکرێ لەبەکار هێنانیدا.

۞ وَهُوَ ٱلَّذِى مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا ﴿٥٣﴾
وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾

---

**چوارەم لەو بەڵگەو نیشانە ڕوونانەی ئەم پێشانگایەی بوونەوەرە کە لێرەدا ئەیخاتە پێش چاو ئەمەیە کەلەم ئایاتەدا ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ﴾ خوا کەسێکە کەدوو جۆر ئاوی زۆر و فراوانی دروست کردووە و فەراهەمی هێناون کە ئەو دووجۆرەش جیاوازن بەم شێوەیە: ﴿هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ﴾ ئەمەیان ئاوێکی شیرینی خۆش گەورەی تینوو شکێنە. ﴿وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾ ئەمەیان ئاوێکی تفتی تاڵە، کە مەبەست بە یەکەم ئاوی ئەو هەموو ڕووبارە گەورە گەورانەن کەهەمیشە دێن و دەڕۆن و پێك هاتوون لە ئاوی چەشمە و کانی و کارێزەکان و کاتێ ئەوانە گەورە بوون پێیان ئەوترێ: دەریا، مەبەست بەدووەم ئاوی ئەو هەموو دەریا لووشەیە کە ڕووبارەکان ئەڕێژنە ناویان. ئەو دووجۆرە ئاوە فراوانە لەوەتەی خوا دروستی کردوون هەر لەسەر بار و سروشتی خۆیان ماونەتەوە و هیچ کام ناگۆڕێن بەوی تر و هیچ کام زاڵ نابن بەسەر یەکتردا بێن بە تەنیا جۆرێك ﴿وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا﴾ بەرگر و بەرهەڵستێکی گەورەی فەراهەم هێناوە لە نێوان ئەو دوو دەریادا ماوەیان نادات لە زاڵ بوونی هیچ کام بەسەر ئەوی تردا. ﴿وَحِجْرًا مَّحْجُورًا﴾ هەروەها لە نێوان ئەو دوانەدا دژایەتی و بێزاری لە یەکتری فەراهەم هێناوە بە وێنەی دوو کەس کە زۆر دژ و بێزار بن لە یەکتر کە بە پێ ی باوی عەرەب بە وشەی ﴿حجرا محجورا﴾ بێزاریەکیان دەر ئەبڕن و داوای دوور کەوتنەوە ئەکەن و هەرگیز یەك ناگرن، واتە ئەو دوو جۆرە ئاوە فراوانە هەر کام لە جێگا و شوێنی خۆیاندا نووسراون بە بار و سیفەتی تایبەتی خۆیانەوە و هەرگیز لێی جوێ نابنەوە، ئیتر با جێگا و شوێنیان نزیك لە یەکترەوە، با بگەن بە یەك و ئاوی شیرین لە شوێن و جێگای خۆیدا هەر شیرینە و خوا هێشتویەتیەوە بۆ ژیانی ئادەمیو گیانلەبەرانی و وشك و گیاو درەخت و کشتوکاڵ، هەلاوەها ئاوی سوێر و تاڵیشی هێشتوەتەوە بەو شێوە لە جێگا و شوێنی خۆیدا لەبەر چەند سوودو بەرژەوەندیەکی کە زۆری لە شوێنی تایبەتدا باس کراوە، کەواتە دروست کردن و هێشتنەوەی ئەم دوو جۆرە ئاوە هەر چۆنێ چاکە و بەهرەیەکی زۆر گەورە و گرنگن، هەروەها نیشانە و بەڵگەیەکی ڕوونن بەسەر ئەو دەستە قودرەتە لێزانە کە فەراهەمی هێنان و لەسەر باری خۆیان هێشتنیەوە و بەرهەڵستێکی بەتینی خستە نێوان بۆ بەرگریان یان لەسەر**

کێش و زاڵ بوونی هیچ کام بەسەر ئەوی تردا، ئیتر ئەو بەرهەڵستە بریتی یبێت لەو ئەندازە زەوی و وشکییە ی کە خستوویەتیە نێوان رووبار و دەریاکان یان بریتی بێت لە بەرزی و نزمی جێگا و شوێنەکانیان کە زۆرتر جێگای رووبارەکان بەرزترە لە جێگا و شوێنی دەریاکان، یان ئەو بەرهەڵستە بریتی بێت لە هەلر شتێ تریش، بە کورتی: هەرچەند ئاو بە پێی سروشتی خۆی – بلاو کەر و داپۆشەرە، کەواتە ئەبوایە بەو پێیە دەریاکان بە تایبەتی دەریا لوشەکان کە ئێجگار گەورە و فراوانن و دەوری هەموو وشکی ولاتیان داوە – ئەبوایە هەموو ولات و وشکی ببوایە بە ژێرەوە و هیچ شتێ بە دەرەوە نەمایە،بەلام خوا کارێکی بۆ وای کردووە کە ئەو دەریا و دەریا لوشانە سەرکێشی ناکەن و رووبارەکان داگیر ناکەن تەنانەت لە کاتی مەد و جەزریشدا کە بە هۆی هێزی راکێشەری مانگەوە پەیدا ئەبێ، چونکە ئەو مەد و جەزرەش لە رادەیەکی میانە و تایبەتیدایە بە گوێرەی دووری مانگ کە لە رادەیەکی تایبەتی گونجاو و شیاودایە. وەکو بە روونی باس کراوە لە کتێبی(العلم یدعو للإیمان) دا. [1]

لە پاش باسی ئاوی ئاسمان و رووبار و دەیا ئینجا دێتە سەر باسی ئاوی(نوتفە) کە پێنجەمی ئەو پێنج نیشانە و بەڵگە روونانەیە کە لێرەدا سەرنج را ئەکێشێ بۆیان، ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا﴾ خوا کەسێکە کە ئادەمی دروست کردووە لەو ئاوە تایبەتی یە ناسراوە کە پێ ی ئەوترێ(نوتفە) ﴿فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا﴾ ئینجا کردوویەتی بە دووبەش: نێرینە کە نەسەب و نەژاد بە هۆی ئەو پەیدا ئەبێ و بەو ئەناسرێ مێیینە کە خزماییەتی ژن و ژن خوازی بە هۆی ئەوەوە بەو ئەناسرێ. ﴿وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا﴾ خوای تۆ هەمیشە بەتواناو دەسەلاتە، ئەوەتا لەیەك کەرەسەو یەك مادده و یەك شت ئەو ئادەمەی درووست کردووە بەو هەموو ئەندام و هێز و وزەی جیاواز و ئەو هەموو کۆئەندامی سەر سوڕهێنەر ئەو هەموو شتە جیا جیانە کە زۆربەیان دوور و جیاوازو دژی یەکترن. بەڵێ بەرستی ئادەمی زۆر شتێکی نایابی سەر سوڕهێنەرە، پەیدابوونی ئەم گیان لەبەرە لەو ئاوە

---

[1] ئەم ئایەتە بە دوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، جۆرێکیان زۆر دوورە لە زیربی یەوە، کەواتە باسی ناکەین چاکە، ئەو جۆرەکەی تریان ئەمەیە: مەبەست بە دەریای شیرین رووبارە گەورەکانە بە وێنەی دجلە و فورات، یان نیل ئەڕژێنە ناو دەریای گەورە و چەند میلێ ئەڕۆن لەناوی دا و لەتی ئەکەن و بەبێ ئەمەی تێکەڵی یەکتر بن و تام و رەنگی رووبارەکان بگۆڕێ و لەگەڵ ئەوەدا بە سروشت ئەبوایە بە گورجی تێکەڵ ببونایە، ئەم جۆرەش هەرچەند راستە و شتەکە بەو جۆرەیە، بەلام ئەوە بەڵگەیەکی بەهێز نی یە تا خوا سەرنجی بەندەکانی بۆ راکێشێ.

تایبەتی یە زۆر نایاب تر و گرنگترە لەپەیدابوونی ئەو هەموو سەزە و درەخت و کشتوکاڵە لەئاوی باران، چونکە لەناو دەیان سەدان سێڵ – کەشاراونەتەوە لەتەنیا نوختەیەك لە ئاوی پیاو– تەنیا سێڵێکی تۆوی پیاو یەك ئەگرێ لەگەڵ تەنیا سێڵیکی گەرای ئافرەت لەمنداڵ دان دا، لەو دوانە ئەم ئادەمی یە پێك دێت کە نایاب ترینی هەموو گیان لەبەرانە!! لەو هەموو سێڵانەو لەو هەموو گرایانە کە وێنەی یەکن ئەو هەموو نێرو مێ یانە پەیدا ئەبن لەو ڕێگەی تایبەتی یەی خۆیانەوە کە هەتا بیری لێبکرێتەوە هەر کەمە، هیچ کەس لەو نهێنیە تێناگات، زانینی هیچ ئادەمی یەك پەی بەوە نابات و هۆی ئەوە نازانێ. چونکە بە هیچ ڕنگ هەست ناکرێ بەهیچ جۆرە جیاوازییەك لەنێوان ئەو تۆ و گەرایانە و ئەو کەرەسانە لەتاقمێکیان نێر پەیدا ئەبێ و لەتاقمێکیان مێ، بەڕاستی هەرکەس دانا بێت هیچ شتێ ناڵێ جگە لەوەی کە خوا ئەفەرموێ: ﴿وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا﴾ ئەگەر یەکێ بیەوێ بە وردی تێفکرێ و بیر بکاتەوە لەو تۆزە ئاوە کە ئەم ئادەمی یەی لێدروست ئەکرێ سەرگەردان ئەبێت و سەرە سوڕی توش ئەبێت لەو لێزانی وردەکارییەی بەکار هێنراوە لەو هەموو ئەندام و کۆ ئەندامانەی ئادەمە دا، لەجێ کردنەوەی ئەو هەمووە و داشاردنی لە ناو ئەو سێڵی تۆ و گەرادا کە هەڵگری هەموو هێز و وزەو دروشم و شێوەی دایك و باوك و خێزانن، لەپاش جێ گرتنەوە و داشاردنی ئەو هەموو شتە لەو دوو سێلەدا، ئینجا ئەو هەموو کەرەسەیە پەرەی سەند و کەرەسەی هەموو شتێ هەرئەو شتەی لێ فەراهەم هات و نەگۆڕا و تێکەڵیکەرەسەی شتی تر نەبوو، بۆ وێنە: کەرەسەی چاو چاوی لێ فەراهەم هات لەشوێنی تایبەتی خۆی دا، هەروەها هەموو کەرەسەی هەموو ئەندامەکانی تر!! هەرکەس ئەیەوێ بەدرێژ تر بدوێ لەم بارەیەوە با سەرنجی کتێبی ﴿الأنسان لا يقوم وحده﴾ بدات [1] لەم کاتەدا ئەم بەڵگە و نیشانە پیشان دا کە هەرکام لەوانە بەسە بۆ هەر کەس چاوی دڵی کوێر نەبێ و هەرکام لەوانە شایەتێکی بەهێزە لەسەر ئەوە کە تەنها خوا خوایە و هەموو کارو بارێ بەدەست ئەوە و هیچ کەسێ و هیچ شتێ تر لەڕستی دا هیچ بەدەست نییە. لەم کاتەداباوەڕوکردەوەی ناڕەواوناڕستی بت پەرستەکان پیشان ئەدات،

---

[1] بە پێی تەفسیرەکە مەبەست لە وشەی(بشرا) تیرەی ئادەمی یە و بە نادیاریی فەرموی بۆ گەیاندنی ڕێز و گرنگی ئەو دروست کراوە، رایەکی تر هەیە کە مەبەست پێی ئادەمە و مەبەست بەو ئاوە ئاوێکە کە قوڕەکەی ئادەمی پێ شێلرا، یان مەبەست تیرەیەکە کە ئادەم و هەموو ئەولادەکانیش ئەگرێتەوە، لەم کاتەدا وشەی(من) بۆ دەست پێ کردنە.

وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُهُمۡ وَلَا يَضُرُّهُمۡۗ وَكَانَ ٱلۡكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِۦ ظَهِيرٗا ﴿٥٥﴾

ئەفەرموێ: ﴿وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُهُمۡ وَلَا يَضُرُّهُمۡۗ﴾ ئەوانە تێپەر ئەکەن لەخواو جگە لەخوا شتێ ئەپەرستن کەسوودیان پێ ناگەیەنێ کاتێ ئەی پەرستن و هیچ زیانێکیان پێ ناگەیەنێ ئەگەر نەی پەرستن، واتە ئەو بت پەرستانە تا ئەو ڕەدەیە نەفام و نەزانن و بەد کردارن خوا ناپەرستن کە هەموو سوود و زیانییان هەموو شتیان بەدەست ئەوە و شتی تر ئەپەرستن کە هیچی بەدەست نی یە. ﴿وَكَانَ ٱلۡكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِۦ ظَهِيرٗا﴾ کافر- هەموو کافرێ- کە ئەو بت پەرستانە بەشێکن لێ ی هەمیشە کۆمەکی کەرە لەسەر دوژمنایەتی و جەنگ و سەرکێشی لە خوای پەروەردگاری خۆی. کۆمەکی کەرە بۆ شەیتان بەهۆی گوێ ڕایەڵی و شوێن کوەوتنی شەیتان و لادانی لەبەندەی و شوێن کەوتنی خوای خۆی. ئەم کافرە بەد بەختە دژی خوا هەڵئەستێ و جەنگی لەگەڵ ئەکات بەم ڕنگە دژی ئایینی خوایە و دژی ئەو بەرنامەیەیە کە خوا دایناوە بۆ ژیانی ئادەمی، کەواتە هەر کات دژی پێغەمبەر و پەیامەکەی بێت و ئەو کاتە دژی خوایەو وەکو لەگەڵ خودا بجەنگێ وایە و خوا ئەبێتە خوات ئەبێتە خاوەنی ئەو جەنگ و ئاژاوە. ئینجا پێغەمبەرەکەی دڵ ئەوای ئەکات(ﷺ) و ئەرکی سەرشانی سوك ئەکات، ئاگاداری ئەکاتکە هەرکات هەڵئەستێ بە پێویستی سەر شانی خۆی کەبریتی یە لە موژدە دان و ترساندن و تێکۆشان لەگەڵ خەڵك دا بەو قورئانەی بۆی نێرراوە، هەرکات هەڵ ئەستێ بەم پێویستی یە ئیتر هیچی لێ داوا ناکەین و هیچ گوێ ی نەبێ لە دوژمنایەتی و سەرکێشی کافرەکان. چونکە ئەو کاتە خوا خاوەنی کارەکەیە، کەواتە هەر پشت بە خوا خۆی ببەستێ، خوا ئاگادارە بە گوناهو تاوانی بەندەکانی،

ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا﴾ تۆمان ڕوانە نەکردووە مەگەر بە موژدە دەر و ترسێنەر. واتە هیچی ترت لەسەر نی یە تەنها بۆ ئەوە ڕوانە کراوی. ئەم ئایەتە مەکەیی یە و لەو چەرخەدا فرمان نەدرا بەجەنگ و کوشتار لەگەڵ دوژمنان دا. ئەوەش لەبەر چەند هۆیك بوو خوا خوا خۆی باش ئەزانێ، بەڵام چەند هۆیەك بوو خوا خۆی باش ئەزانێ، بەڵام چەند هۆیەك ئاشکران بۆ ئێمەش: یەکێ لەو هۆیانە ئەمە بوو کە لە چەرخی مککەدا گرنگ تر و پێویست تر ئامادەکردن و زۆر کردنی چەند کەسێ بوو کە ئەو ئایین و باوەرە تازە جێگیر ببێ لە دەروونی دا و دەرکەوێ لە ڕوشت و کردەوەی دا بە جۆرێ ببن بە نوێنەر و ئاوێنەیەکی بێگەرد بۆ ئەو ئایین و عەقیدە تازەیە، تا ئەوانە ببن بە بنەرت و پایە بۆ دروست کردنی گەلی بێ لەکەی موسوڵمان و ئیسلام کاربەدەست و بەرێوەبەر و چاودێری بێت. یەکێ تر لەم هۆیانە ئەمە بوو: با لەیەکەم جارەوە موسوڵمان نەکەونە ئاژاوە و خوێن ڕێژیی لەگەڵ قورەیش دا بەهۆی ئەوەوە بەتەواوی بتارێن لەئیسلام و دڵیان داخورێ قوفڵ بدرێ لەئاستی ز یەکێ تر لەم هۆیانە ئەمە بوو بڕیاری خوا لەسەر ئەوە بوو کە زۆر بەی قورەیش دێنە ژێر سایەی ئیسلام ئیتر پێش کۆچ کردن بۆ مەدینە، یان پاش کۆچ کردن تا ڕۆژی فەتح کە بەتەواوی ئاڵای ئیسلام لەسەر مەکە هەڵ کرا. کەواتە نە ئەبوو کوشتار ڕوو بدات ئەوانە کەسیان لێ بوکوژرێ. کەواتە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ)لە مککە تەنیا موژدەدان و ترساندن بوو، بێجگە لەوە لە مەدینەش و هەموو کات دا فرمانی پێغەمبەر و ناوکەو ناوەڕۆکی پەیامەکەی تەنها بریتی بوو لەموژدەدان و ترساندنە. بۆ پاراستنی باوەڕداران تازۆریان لێ نەکرێ و سزا نەدرێن لە سەر ئەو ئاینە کە گرتیانە گەردن، کەواتە بڕیاری ئەو ئایەتە مەککەیی یە بۆ چەرخی مەدینەش بوو.

﴿قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴾[1] ئەی پێغەمبەر بڵێ: من داوای هیچ پارەو پول و کرێ یەکتان لێ ناکەم لەسەر ڕگەیاندنی ئەوەی کە پێم سپێراوە لەلایەن خواوە مگەر کرێ یەکەم ئەوە بێت هەریەکێ ویستبێتی ڕێگا بداتە بەر بۆلای خوای خۆی و خۆی نزیك بکاتەوە لە خوا بە باوەڕ هێنان و گوێ ڕایەڵی بۆ ئەو ئایینەی پێ ی ڕەوانە کراوم، واتە من تەنها داوای ئەوە ئەکەم لەخەڵکی. ئەو کردەوەیەی بەشێوەی کرێ پیشدان دا لەم ڕوەوە کە زۆر مەبەست و ئامانجی یەتی، بێگومان پێغەمبەر.(ﷺ) بەشدارە لە ئەجری ئیمان و چاکەی ئومەتدا بەبێ ئەمەی هیچ کەم و کوڕیەك ڕوبکاتە ئەجرو پاداشتی ئەوان. ئەم فەرمودەیە ئەمانەی خوارەوە پیشان ئەدات:

١- دڵنیا کردن لەسەر پاك وخاوێنی بانگ کردن و ڕگەیاندنەکەی لە نیازی هیچ جۆرە دەست کەوت و مەبەستێکی ئەم جیهانە و دور خستنەوەی ئەو گومانە.

٢- دەرخستنی ئەو پەڕی سۆزو بەزەی بە خەڵکی دا. ئەوەتا سوود و قازانجی خۆی بەوە دانا کە خەڵکی بگن بە ئەجر و پاداشتی خوا و ڕزگاربین لە تۆڵە و سزای.

٣- ئەبێ ئەوانەی بەڕێبازی پێغەمبەردا(ﷺ) ئەڕۆن و خەڵکی بانگ ئەکەن بۆلای خوا نابێ هیچ سوود و ئامانجێکی ئەم دنیایەیان مەبەست بێت و نابێ بەدوای دەسکەوتێك و کۆکردنەوەیدارایی و سامان دا بگەڕێن.

ئەم ئایینە پاکەو بەو جۆرە سوك و ئاسان و بێ ئەرکە، ئەوکەسەی دێتە ژێر سایەی، داوای هیچ کرێ و باجێکی لێ ناکرێ، هیچ دخولیە و مانگانەی لەسەر دانانرێت، هیچ نەزر و قوربانییەکی لەسەر نی یە پێشکەشی بکات لەسەر وەرگرتنی لەڕێزی گەل و کۆمەڵ دا، بەبێ ئەمەی هیچ کەس خۆی بکات بەکاهینی وواسیتەوکرێ وەرگرێ. بەڵکو خوا خوای هەموانە ئاین وبەرنامەی ناردووە بۆهەمووکە خۆیان بەخۆیان بەئازادی و سەربەستی بیگرنە گەردن.

---

[1] بەپێی تەفسیرەکە ئیستسنای موتەسیلە و زۆر لە زانایان ئەیکەن بە مونقەطیع، واتە بەلام هەرکەس ئەیەوێ ماڵ و سامان بەخت بکات لە ڕێگای ڕەزامەندی خوادا بۆ ئەمەی بگات بە ئەجرو پاداشتی خۆی لای خوا، هەرکەس خۆی ئەوەی ئەوێ دەی با بیکات. بەم جۆرەش ڕێك و جوانە، بەلام ئەویان بەهێز تر و لەدڵ دا جێگیر ترە، خوا خۆی باش ئەزانێ.

وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡحَيِّ ٱلَّذِي لَا يَمُوتُ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِهِۦۚ وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ

---

**﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡحَيِّ ٱلَّذِي لَا يَمُوتُ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِهِۦۚ﴾ ئەی پێغەمبەر پشت ببەستە بەزیندوویەك کەنامرێ بە پاك و خاوێنی ڕایگرە لە هەر شتێ کەنیشانەی کەم و کوڕیە و شایەنی خوایەتی نی یە لەکاتێك دا سوپاس و وەسف و سەنای بکە بەهەموو سیفەت و نیشانەی گەورەیی و تێر و تەواوی یەوە کە شایەنی خوای تاك و تەنیایە، بێگومان بێجگە لەخوا ئیتر هەر زیندوویەك مردووە، چونکە بەرەو مردن ئەڕوات، کەواتە مانەوە نی یە بۆ هیچ زیندوویەك جگە لەو تاکە زیندووەی کە مردنی نی یە و هورگیز مردن ڕوی تێ ناکات، بێگومان پشت بەستن بە زیندوویەك کەڕۆژێك لەڕۆژان ئەمرێت و بیچ گیان ئەبێ پاڵ دان و پشت بەستنە بەشتێ کە ئەڕوخێ خۆخستنە سایە و سێبەری ئەڕەوا و نامێنێ. واتە ئەی پێغەمبەر واز بێنە لەوانەیکەمژدە و ترساندن کاریان لێ ناکات و لێ یان گەڕێ بۆ زیندوویەك کەنامرێ و ئاگادارە بەگوناهو تاوانی ئەوانە و هیچ شتێکیان شاراوە نیە لێ ی ﴿وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا﴾ بەسە کە ئەو خوا زیندووە ئاگادارە بۆ هەموو گوناهی بەندەکانی ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ﴾ ئەو زیندووە کەسێکە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی وا لەنێوانیان دا دروستی کردن لە شەش ڕۆژدا. بێگومان ئەم شەو و ڕۆژانی ئێمە لەپاش دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی پەیدا بوون، کەواتە ئاشکرایە کە ئەم ڕۆژانە مەبەست نین، لەبەر ئەوە زۆر لەزانایان ئەفەرمون: مەبەست چەند ماوە و کاتێکە بەئەندازەی شەش ڕۆژ لەم ڕۆژانی ئێمە، بەڵام باشتر ئەمەیە بڵێین: مەبەست بەمانە ڕۆژەکانی تری خوان کە خۆی ئەزانێ چۆنن و ماوە و ئەندازەیان چەندێکە. هەرچۆن مەبەست بێت وا پیشان ئەدات کە ئەم بونەوەرە بەیەك جار نەگەیشتوەتە ئەم بارەو شێوەی ئێستا، بەڵکو چەند تەور وبارێکی بەسەردا هاتووە و چەند قۆناغێکی پێ بڕیوە ئەوەش لەبەر هۆو پەیوەندیەك کە خۆی ئەزانێ، ئەگینا بۆ خوا هیچی تێ نەئەچوو، هیچی پێویست نەبوو جگە لەوە مەیل و خوا هیش ڕوی تێ بکردایە و بیفەرموایە ببە، ئیتر دەست بەجێ بەبێ دواو بەر پەیدا ئەبوو،**

ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۚ ٱلرَّحۡمَٰنُ فَسۡـَٔلۡ بِهِۦ خَبِيرٗا ﴿٥٩﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسۡجُدُواْۤ لِلرَّحۡمَٰنِ قَالُواْ وَمَا ٱلرَّحۡمَٰنُ أَنَسۡجُدُ لِمَا تَأۡمُرُنَا وَزَادَهُمۡ نُفُورٗا ۩ ﴿٦٠﴾

---

﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۚ﴾ وشەی ﴿عرش﴾ لوزمانی عەرەب دا بریتی یە لە تەختی پادشا و لەزمانی شەرعدا بریتی یە لەدروست کراوێکی کە گەورەتر و فراوانە بۆ هەموو ئاسمانەکان وو زەوی، فرمان و بڕیاری هەموو کاروباری بونەوەر لەوێوە دەرئەچێ، هەروەها وشەی ﴿استوی﴾ لەزمانی عەرەب دا بریتی یە لەدامەزراو، جێگیر بوو ئارامی گرت. دیارە بەم جۆرە بەهیچ ڕنگ بەکار ناهێنرێ بۆ خوا بەلای هەموو موسوڵمانانەوە، بەڵکو شتێ تر مەبەستە، جای لەبارەی ئەو مەبەستەوە دوو ڕ هەیە لەناو موسوڵمانان دا لەم ئایەتە و لەنێو هەموو ئایەت و حەدیسی تر کەپێیان ئەوترێ ﴿متشبهات﴾ بەگوێرەی دیمەن و ڕواڵەتەکەیان بۆ خوا دەست نادەن، وەکو ﴿وجه، ید، قدم، عین،... هتد﴾ لەبارەی ئەمانەوە ڕای یەکەم کە بڕیاری چین وتاقمی پێشوی ئەم نەتەوەی لەسەرە -السلف- ئەمەیە دیاری کردنی مەبەستەکەیان حەواڵەی خوا ئەکرێ و ئەبێ باوەڕ ببێ پێ یان بەو جۆرەی خوا ئەیەوێ. ڕای دووەم کەبڕیاری تاقم و چینی پاش تاقمی یەکەمی لەسەرە -خاف- ئەمەیە: هەرکام لەمانە مەبەستێکی شایانیان بۆ باس کراوە. جا لەسەر ئەم ڕایە مەبەست بەم ڕستە یە ڕوون کردنەوەی ئەو پەڕی دەسەڵات و بڵندی و زاڵی خوایە بەسەر هەموو شتێکدا و تەواوبوونی هەموو کار و باری ئەم زەوی و ئاسمانەیە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾ [1] واتە ئەو خوا زیندووەی کەئاسمانەکان و زەوی دروست کرد و زاڵ و بەدەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێك دا، ئەو خوایە زۆر بەزەی دارە ﴿فَسۡـَٔلۡ بِهِۦ خَبِيرٗا﴾ ئینجا بەو خوایە و بەهۆی ئەوەوە پرسیار بکات کەزاناو ئاگاداریێ. واتە ئەو خوایەی کەئاسمانەکان و زەوی دروست کرد زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا

---

[1] بەپێی تەفسیرەکە وشەی ﴿ الرحمن ﴾ خەبەرە بۆ مبتدایەکی لابراو، رستەکە بۆ مەدح و سەنایە و سیفەتی تری شیرینی پیشان ئەدات. بە(٥ – ٦) جۆری تریش ترکیب کراوە، بەلآم هەموو هەر یەك مەبەست ئەگرێتەوە.

و بەزەیی‌فراوانە، ئەگەر پرسیار بکەیت لێ ی بێگومان پرسیار ئەکەیت لە زانایەك کە ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا هیچ شتێکی لێ شاراوە نی یە، نە لەزەوی و نە لە ئاسمان، کەواتە هەرچۆنێك بەدەسەڵات و بەزەیی دارە، هەروەها ئاگاداریشە و هەر ئەو شایانە پشتی پێ ببەسترێ [1] لەگەڵ ئەوە دا کە ئەو خوایە بەو جۆرە کەچی مل هوڕ و دەم درێژی کەران بەرامبەر بانگ کردنیان بۆ پەرستنی ئەو خوایە بێزاری دەر ئەبڕن و بە شتێکی بێ نرخی سەیر ئەکەن و ڕێزی ئەو خوایەیان بەلاوە نی یە وەکو ئەم فەرمودەیەش ڕونی ئەکاتەوە: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسْجُدُوا۟ لِلرَّحْمَٰنِ﴾ کاتێ بوترێ بەوانە سوژدە بەرن بۆ ئەو خوایەی بەزەیدارە ﴿قَالُوا۟ وَمَا ٱلرَّحْمَٰنُ﴾ ئەڵێن: ﴿رحمن﴾ چی یە؟ واتە ئێمە شتی وا ناناسین، چونکە ئەو ناوە بەفەرەیان بەکار نە ئەهێنا بۆ خوا، یان لایان وابوو مەبەست پێ ی خوا نیە، لە بەر ئەوە ئەیان وت بە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا﴾ ئایا ئێمە سوژدە ئەبەین بۆ شتێ کە تۆ فرمانمان پێ ئەدەیت؟ واتە نەخێر شتی وا ناکەین﴿وَزَادَهُمْ نُفُورًا﴾ ئەو فرمانە بێزاری و دور کەوتنەوەو تاربونیانی لەباوەڕ هێنان و گوێڕیەڵی پتر کردن. ئەبوایە ئەو نەفامانە بەهۆی ئەو ناوە شیرینەوە: ﴿الرحمن﴾ نزیك کەوتنایەتەوە دڵ نەرم بوونایە، بەڵام دڵ و ژیریان نەخۆش بوون و لەکار کەوت بوون بەهۆی ئەوەوە هەست و فامیان شێوا بوو، بەدڕ و پێچ وانەی ڕست و حەقیقەت شتیان وەر ئەگرت، ئەوانە ئەم پەندەیان بۆ ڕێك و ڕاست بوو، ﴿طبع ناسازی جعل رابوی کل دردی سرست﴾ خوای گەورە بەرپەرچ و دەم کوتیان ئەکات بەسوپاس و سەنایەکی زۆر شیرین، وەبەسەرنج ڕکێشان بۆ چەند بەڵگە و نیشانەیەکی زۆر ڕوون و ڕوان لەم بوونەوەرەدا کە شایەتێکی ڕست و باوەڕ پێکراون لەلایەن هەموو خاوەن فام و هۆشێکەوە، بەسەر خوایەتی خوای تاك و تەنیا،

---

[1] بە پێی تەفسیرەکە مەبەست بە ڕاناوی(بە) وشەی ﴿ خبیرا ﴾ خوایە و پیتی ڕاکێشەر بۆ سەبەب و تجریدە. بێجگە لەوە(٥ – ٦) جۆری تریش ئەو ڕستەیە تەفسیر کراوەتەوە لەسەر هیچ کام مەبەست بە ڕاناوەکە خوا نی یە و هەروەها بە پێی چەند تەفسیرێکیان مەبەست بە وشەی ﴿ خبیرا ﴾ خوا نی یە، بەڵام بەڕاستی ئەوەی لە تەفسیرەکەدا وتراوە زۆر دڵ گیرە.

تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴿٦١﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلَّيْلَ
وَٱلنَّهَارَ خِلْفَةً لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا ﴿٦٢﴾ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ
عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا
وَقِيَٰمًا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ

---

ئەفەرموێ: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا ﴾ پاك و بێگەردە لەهەموو لەكەیەك كەسێ كە لەئاسمان دا چەند كەل و شوێن و خولگەیەكی دروست كردووە و فەراهەم هێناوە بۆ ئەستێرە گەڕۆكەكان. ئەم كلوویانە دوانزەن وناوی تایبەتی خۆیان هەیە:﴿حمل، ثور، جوزا، سرطان، أسد، سنبلة، میزان، عقرب، قوس، جدی، دلو، حوت﴾ شەشە پێشوەكەیان كەوتونەتە لای سەروی هێڵی -ئیستیواء- ئەو شەشەكەی تریان كەوتونەتە لای خواروی، لەساڵێك دا- وەك دێتە بەر چاو - خۆر بە هەر دوانزە كەلوەكەدا ئەڕوات، هەر وەرزی بەسیانیان دا تێپەڕ ئەكات بەم شێوەیە: ﴿حمل و ثور و جوزاء﴾ لە بەهاردا، ﴿سرطان و أسد و سنبلة﴾ لەهاویندا،﴿میزان و عقرب و قوس﴾ لە پایزدا، ﴿جدی و دلو و حوت﴾ لە زستاندا. ئەم كەلووانە بەم ناوانە ناوبراون، چونكە هەر یەكێ پێك هاتوە لەكۆبوونەوەی چەند ئەستێرەیەك كەوێنەی یەكێ لەو شتانەی پێشوو نیشان ئەدات، ئەم كەلووانە لە زمانی عەرەب دا ناوبراون بە(برج) كە بە كۆشكی بەرز و بڵند ئەڵێن،چونكە ئەوانە بۆ ئەستێرە گەڕۆكەكان بەوێنەی كۆشكن بۆ خاوەن و دانیشتوانی.﴿وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا﴾ گێڕاویەتی لە ئاسماندا چرایەك كەبریتیە لەخۆر، مانگێ كەڕووناكی دەداتەوە. ئینجا شێوەی شەو و ڕۆژ و هاتنیان بەدوایی یەك دا پیشان ئەدات كە دوو بەڵگەی ڕوون و ئاشكران و هەمیشە تازە ئەبنەوە لەپێش چاو و ئەوەنەش گرنگن ژیان بەبێ ئەمانە ناگونجێ لەسەر ئەم زەوی یەدا، ئەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ خِلْفَةً ﴾ ئەو خوایە كەسێكە كە شەو و ڕۆژی فەراهەم هێناوە بە جۆرێ دێن بەجۆرێ دێن بەدوای یەكدا و دێنە شوێنی

یەکتر، ئەویش بۆ کێ و لەبەر کێ کردوویەتی؟ ﴿لِمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا﴾ کردوویەتی بۆ هەرکەسێ کەبیەوێ بیر بکاتەوە لەچاکەو بەهرەکانی خوا تێفرکێ لەم کردارە نایابانە، تا بەهۆی ئەوەوە بزانێ کەپێویست و ناچاری هەیە بەخوایەك کە زانا و لێزان و توانا و کار دروستە، یان بۆ کەسێ بیەوێ سوپاسی خوا بکات و چاو لەبەری خۆی پێشکش بکات لەسەر ئەو هەموو چاکەو بەهرە و بەخشایشی خوا، یان ئەو دوو کاتەی گێراوە بۆ ئەوانە بۆ ئەوەی لە هەر کامیان کەم و کوڕی یان ببێ لەوی ترا سەری بگرێتەوە و قەرە بووی بکاتەوە.

لەم دەرسی ڕابردووەدا باسی نەفامی و بێ شەرمیی و بێزاری بت پەرستەکانی کرد دەربارەی ئەم ناوە شیرینە بەفەڕەی خوا ﴿الرحمن﴾ ئینجا ئەوا لێرە دا باسی تاقمێ ئەکات کە خوا خۆیان ئەناسن و ئەو ناوە پیرۆزە ئەناسن، باسی چەند سیفەت و چەند ڕوشت و کردەوەیەکی تایبەتی ئەو تاقمە ئەکات کە بەهۆی ئەو ڕوشت و کردەوە پەسەندانەوە بوون بەتاقمێکی جیاواز لەناو کۆمەڵێ ئادەمی دا و شایەنی ئەوە بوون ئەو نازناوە بەنرخەیان بەکار بهێنرێ: ﴿عباد الرحمن﴾ بەندە تایبەتیەکانی خوای زۆر بەزەیی دار، یان بەندە خوا پەرستەکان ﴿رحمن﴾ لێرەدا نۆ سیفەت و نۆ نیشانەیان بۆ باس ئەکات، جا با چاك گوێ شل بکەین بۆیان و باش دڵیان بدەینێ، بەڵکو وەریان گرین و خۆمانی پێ بڕازێنینەوە بەیارمەتی خوای گەورە:

١- ئەفەرموێ: ﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَٰنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا﴾ بەندە تایبەتیەکانی خوای بەخشندە و زۆر بەبەزەیی کەسانێکن کە ئەگەڕێن بەسەر زەویدا بە گەڕانێکی سوك و ئاسان و ڕێك و پێك بەبێ لارە و لەنجە و کەشخە و لووت بەرزیی و بافیش لە خۆنان، بەویقار و دامەزراوی بەبێ چرپە چرپ و بێشەرمیی. مەبەست ئەوە نی یە کابرا سەری دداخات و خۆی فش و فۆڵ بکات، بەلارە ملی و لەسەرخۆ بە ئارام بڕوا وەك پێ بەمێلکەدا بنێ، وەکو زۆر کەس ئەو شێوەیە بەسەر خۆیان ئەهێنن و ئەیانەوێ وای دەربڕن کە لە خوا ترسن و هیچ پەیوەندیان بەم دنیایەوە نی یە، ئەو کەسانە زۆر هەژارن و شەیتان فێڵیان لێ ئەکات، کەواتە با ئاگامان لەخۆمان بێت و ئەو هەڵمان پێ

نەکات. باوەڕی ڕستەقینە بەهۆی شانازی و دڵخشی بەباوەڕەکەیەوە هەموو کاتشێوەی چالاکی و لێ هاتووی هەیە، ئێمە ئەبێ لە هەموو شتێکدا پەیڕوی پێغەمبەری ئازیزمان بکەین(ﷺ) و شێوەی ڕۆیشتنی ئەو لەکتێبە ڕستەکاندا بلأوبۆتەوە، خەلیفی چوارەم – علیکوڕی ئەبو گالب– خوالێ ی ڕازی بێت ئەفەرموێ:﴿کان رسول الله(ﷺ) إذا مشی تکفأ تکفیاً کأنما یخط من صبب﴾ جارێ تر ئەفەرموێ: ﴿إذا تقع﴾ ئەبو هورەیرە ئەفەرموێ: ﴿ما رایت شیئا احسن من رسول الله(ﷺ) کأن الشمس تجري فی و جهه، وما رایت احدا اسرع فی مشیته من رسول الله(ﷺ) کانما الأرض تطوی له، و انا لنجهد انفسنا و إنه لغیر مکترث﴾ ئەو گەڕانە ڕێك و پێکە کە لەم ئایەتەدا پیشانی دا ڕێك و ڕاستی ی دڵ و دەروونی خاوەنەکەیەتی و بەڵگەیە لەسەر ئەوە کەپیاوەتی و برایەتی ئەژی لەناو گەلدا، ئەوەش کە لە مەبەستە گرنگەکانی ئیسلامە و ئەیەوێ ئەندام و ڕۆڵککانی بەو جۆرە پەروەردە بکات.

٢- ﴿وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ﴾ کاتێ نەزان و نەفام و بێ شەرمەکان و تەی پیس و چەپەڵیان ئاڕاستە بکەن بەنافی لەگەڵیان بدوێننەوان ﴿قَالُواْ سَلَٰمٗا﴾ ئەڵێن: ئێمە ئێمە چاك ئەڵێین پێتان بەرامبەر خراپ دوێنی ئێوە و شتێ ناڵێین کە پێتان ناخۆش بێت، ئەوەش نەك لەبەر بێهێزی و سەر شۆڕی یان، بەڵکو لەبەر ئەوەی خۆیان نەکەن بەهاو دەمی نەفامان، لەبەر ئەوە کات و تەمەنی خۆیان زایە نەکەن لەشتی پڕو پووچ دا، مەبەستیان چاو پۆشی یەو دەمە دەمێ نەکردن. ئەم بڕیارەی کە لەم ئایەتەوە وەر ئەگیرێ نەسڕاوەتەوە بە ئایەتەکانی جەنگ و کوشتار دژی ئەو ئایەتانە نین، بەڵکو ئەم چاو پۆشی یەو گوفتاری یە سیفەت و ڕوشتێکی هەمیشەیی ئەو تاقمە بەرزەیە، ئەو تاقمە ئەگەڕێن بەناو خەڵك دا بەڕۆژدا بەو شێوە و جۆرە ناسکە و شیرینە و لەشەویش دا لەگەڵ خوا خۆیان بەم جۆرەش کە کردی بەسێیەم سیفەت.

٣- ﴿وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا﴾ کەسانێکن کە لەشەودا سوژدە بەرن و وەستاون بەپێوە بۆ خوای پەروەردگاریان، واتە شەو نوێژ ئەکەن ئیتر زۆر یان کەم، بەلأم باسی

تەنیا سەژدە و وەستانەکەیان ئەکات، بۆ ئەوەی شێوە و جوڵان و بزوتنەوەی شەوانیان بخاتە پێش چاو، لەتاریکی شەودا لەکاتێك دا کە خەڵکی خەوتوون، لەو کاتانەدا ئەوان ڕوی دڵیان کردۆتە تەنیا کردۆتعە خوای خۆیان و تەنهای لەبەر ئەوە وەستاون، سەژدەئەبەن، ئەوانە کۆمەڵێکن وازیان هێناوە لەخەوی گەرم و گوڕی خۆش و ئارام دەر، خەریکن بەشتێکەوە کە خۆشتر و ئارامدەر ترە بۆ گیانیان، خەریکن بە ڕوو کردنە خواو بەستنەوەی دڵ و هەست و گیانیان بەخواوە کە ئەوە لە هەموو شت خۆشترە بۆ ئەوانەی کە دڵیان ڕووناك بۆتەوە بە یادی خوا. ئەوانە لەو کاتەدا کە خەویان لێ شومە و خەریکن بە خودا پەرستی یەوە هیچ خۆیان لێ ناگۆڕێ و بیێ باك نابن وەکو هەندێ سەر لێ تێك چوو کە شەیتان ئەیان خەڵتێنێ و بافیشیانتێ ئەکات، بەڵکو ئەوانە خوا ناسن و پڕی دڵیانە لە سام و هەیبەتی خوا و ترسان لە ئاگری دۆزەخ، لەبەر ئەوە پاڕو لاڵە ئەکەن و ئەم نزایە ئەکەن کەلێرە دا کردوویەتی بەسیفەت و نیشانەی چوارەمیان.

٤- ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ﴾ کەسانێکن کە ئەڵێن: ئەی پەروەردگارمان سزای دۆزەخمان لێ لابە، ئەوانە هێشتا دۆزەخیان نەدیوە، بەڵام بڕوایان هەیەپێی، شێوەکەی هاتووە تە پێش چاویان بە هۆی ئەو هەواڵە ڕاستەی کەپێیان گەیشتووە لە قورئان و لە فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ)، کەواتە ئەو سام و ترسەیان بەرهەمی ئیمان و باوەڕە بەهێزەکەیانە، بەهۆی ئەوەوەهەر کردەوەیەکی چاکیان هەیە بە کەم و کوڕ سەیری ئەکەن و دڵ ئارام نابن پێی ئەگەر چاوپۆشی و لێ بوردن و بەزەیی خوا نەبێ و فریایان نەکەوێ بۆ لادانی ئەو سزایە. شێوەی نزا و لاڵە کەیان وا پیشان ئەدات وەکو ئێستا دۆزەخ هاتبێ و ڕووی کردبێتە هەموو کەس و دەمی داپچری بێت و بیەوێ بیەوێ هەمووی هەڵ لوشێ دەستی درێژ کردبێ بۆ نزیك و دوور ئەو کۆمەڵە بەختیارەش سام و ترس دای گرتوون و پارە و لاڵە ئەکەن و ئەم کە خا ئەم شتەنا هەموارەیان لێ لاداتو ڕزگاریان بکات لێی،

إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟
وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ
ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ

---

هەروەها بیم و ترسی زۆر و دڵە لەرزەیان وەرئەگیرێ لێیانەوە کەمۆی پارە و لاڵەکەیان باسی ئەکەن و ئەڵێن: ﴿إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا﴾ بەڕاستی لەزانینی خوادا تێپەڕی کردووە کە سزاکەی ئەنووسێ بە سزا دراوەکەی بە نووسانێکی وا دەرچوونیان نابێ لێی هەرگیز تا هەرگیز، ئەگەر سزا دراو کافر بێت. بە ڕاستی لە زانینی خوادا تێپەڕی کردووە کەسزای ئەنووسێ بەسزا دراوەکە بەنووسانێکی وا دەرچوونیان نابێ لێی هەرگیز تا هەرگیز، ئەگەر سزادراوەکە کافر بێت. بەنووسانێ کەدەرچوون و ڕزگار بوون ئەبێ لێی ئەگەر باواڕدارێکی تاوانبـاری چاپۆشـی لێنـەکراوبێت.﴿ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴾ بـە راسـتی دۆزەخ جـێ و شوێنێکی خراپە بۆ نیشتەجێ و مانەوە. پەنا بە خوا ئایا لە ئاگری دۆزەنخ خراپتر هەیە کە ببێتە جێگای مانەوە؟! نیشتەجێ یی لە کوێ و ئاگری دۆزەخ لە کوێ؟ مانەوە و جێگیر بوون لە کوێو ئەم دیو و ئەو دیو کردن لە کوێ بە هەمیشەیی لە ناو ئاگری دۆزەخدا؟ ئەو کۆمەڵە بەختیارە لـە بـارەی ژیـان و گـوزەرانی خۆیانـەوە بـەم جـۆرەن کە لـەم نیـشانەو سـیفەتی پێنجەمدا ئەفەرموێ:

٥- ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟﴾ کەسانێکن کاتێ کە سامان و دارایی بەخت بکەن لـە ڕێگـای ژیـان و گوزەراندا ﴿لَمْ يُسْرِفُوا۟ ﴾ زیادە ڕەوی ناکەن و ماڵ بە فیڕۆ و بێ جێ سـەرف ناکـەن ﴿وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ ﴾ بەرچاو تـەنگ و چنگ گوشراو نین کە دەست بگرنـەوە لـە شـتی پێویـست تـا خۆیـان خێزانیـان تەنگە تـاو بکـەن ﴿وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا﴾ مـاڵ بـەخت کردنیـان لـە نێوان ئەو دوو بارەدایە،میانە و ناوەڕاست. کە تەنها ئەوەش ڕاست و ڕەوایە. ئەم باری

ناوەراست گرتن و خۆپارێزی لەو دووبارە لارەکەی تر رەوشت و کردەوەی ئیسلامە کە پێکی ئەهێنێ لە ژیانی گەل و خەمووئەندامی گەلدا، لە هەموو یاسا و رژێم و بەرنامەکانیدا، کۆشکی بەرزی شەریعەتە جیانییەکەی لەسەر راستە داڕشتووە.

هەرچەند ئیسلام دائەنێ بە موڵکایەتی ئەندامی گەلدا لە سنوورێکی راست و رەوادا، بەڵام خەڵکی ئازاد و بەرەلاّ نەکردوویە کە بە ئارەزوی خۆیان بجوڵێنەوە لەو سامان و داراییەی کە هەیانە و چۆنی دەست تێ بخەن بیخەن، وەکو باوە لە رژێمی سەرمایەداریدا و لەلای ئەو گەلانەی کە یاسای خوا کاربەدەستی ژیانیان نییە لە هەموو بار و روویەکەوە.بەڵکو ئیسلام وەکو دان ئەنێ بەو موڵکایەتیەدا هەروەها دەستی خاوەنەکەش ئەبەستێ کە ئەو موڵك و سامانە بەکار بێنێ بە هەر کامێ لەو دوو کارە نارەوا، زیادە رەوی، چنگ گوشین کە هەردوو زیانی هەیە، چونکە زیادە رەوی و فیزۆو زیان دارە بۆ دەروون و سامان و گەل بە جارێ، ئەو بارەکەی تریش سامان و دارایی بەند و بەرگری ئەکات لەمەی خاوەن ودۆمەڵی دەوروبەری سوودی لێ وەرگرن، سامان و ماڵیش ئەبێ چەکێ بێت بەکار بهێنرێ بۆ خزمەتی گەل و ئەندامی گەل، بەڵام باری میانە و ناوەراست تێبینی گەل و ئەندامی گەلیشی تێدایە پێکەوە.

نیشانەیەکی تر لە نیشانەکانی ئەو کۆمەڵە ئەمەی کە لێرەدا کراوە بە شەشەم ئەمەیە:

٦- ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾ کەسانێکن کە لەگەڵ خوا هیچ پەرستراوی تر ناپەرستن. واتە خوا ئەپەرستن بە تاك و تەنیا و بێ هیچ هاوبەش و وێنەیەك،﴿وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ﴾ هیچ کەس ناکوژن کە خوا کوشتنی قەدەغە کردووە بە هیچ رەنگ و هۆیەك مەگەر بە هەقیانەت و جۆرێ کە خوا رەوای کردووە، ئەم بارە رەوایەش لەبەر چەند هۆیەکە کە لە کتێبی فیقهدا روون کراوەتەوە. ﴿وَلَا يَزۡنُونَ﴾ زینا و شەروالّ پیسی ناکەن. بێگومان پەرستنی خوا بە تاك و تەنیا بنەرەتی ئەو باوەر و ئایینەیە کە

پێغەرمبەرمان هێنای، هەروەها بنەرەتی هەموو باوەر و بەرنامەکانی تریشە کە هەموو پێغەمبەران هێنایان -صلی الله علیهم اجمعین- دوو ڕێگانەو شوێنی جیابونەوە دوو ڕێگایە: ڕێگای روون و راست و ئاسان کە ڕێگای خوا پەرستییە بە تاك و تەنیا، ڕێگای تاریك و چەوت و کۆسپ و گرێ کە بریتییە لە هەر ڕێگایەکی تر کە هیچ رژێم و بەرنامەیەکی لەسەر دانەمەزرێ کە دەست بدات بۆ ژیانی کامەرانی و ئادەمێتی. خۆ پاراستن لە کوشتنی نارەوا و ناهەق دوو ڕێگان و شوێنی جیابونەوەی دوو ڕێگایە: ڕێگای ژیانی کۆمەڵایەتی بێ باك و بێ ترس و بە ئارام کە ڕێزی ژیانی ئادەمیانەی تێدا هەیە و نرخی بۆ دا ئەنرێ، ڕێگای ژیانی ئەشکەوت و چرستان و چۆڵ و بیابان کە هیچ تیایدا بێ ترس و بە ئارام نییە و ژیان بەسەر ئەبرێ بە ترس و دڵە لەرزەوە و هیچ کەس پەرۆشی کردەوەی چاك و ئاوەدان کردنەوەی وڵات نییە. خۆ پارێزی لە زینا و داوێن پیسی دوو ڕێگانە و جیابونەوەی دوو ڕێگایە: ڕێگای ژیانی پاك و خاوێن کە ئادەمی بەرز و بڵند ئەکاتەوە لە ژیان و هەستێکی ئاژەڵی و کەر و گایی، هەستی پێ پەیدا ئەکات بەمەی کە مەبەست لە یەك کەوتن یەککگرتنی نێرو مێ گەیشتنە نبە ئامانج و ئاواتێکی بەرزتر لە تەنیا تێر کردنی ئارەزووی گۆشت و خوێن، ڕێگای ژیانی پەستی پەستی چەپەڵ کە نێر و مێ تیایدا هیچ نیاز و مەبەست و ئامانجێکیان نییە جگە لە تێر کردن و کوژاندنەوەی ئەو ئارەزووە کە هەرکات بەرەڵا کرا سەری لە جۆرێ لە شێتییەوە دەرئەچێ و تا بێت بڵێسە ئەسێنێ. جا لەبەر ئەوە ئەم سێ تاوانە دەردێکی کاریگەری کوشندەن و ژیانی ئادەمێتی لە ڕیشە ئەهێنن... خوای گەورە بە تایبەتی باسی فەرموون خۆ پارێزی لێ یان کرد بە نیشانەیەك بە نیشانەیەك لە نیشانەکانی بەندە تایبەتیەکانی خۆی کە بەرزترینی دروستکراوەکانی خوان و بەرێزترینن بە لایەوە.

وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامٗا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلٗا صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ

---

لەبەر ئەوە خوای گەورە باسی کردن و ئەم هەرەشە زۆر بە تینەشی بە دوادا هێنان ﴿وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامٗا﴾ هەر کەس ئەوەی باس کرا بکات دووچاری تۆڵەیەك ئەبێت کە زۆر سەخت و گەورەیە وەکو روونی ئەکاتەوە بەم فەرموودەیە:﴿يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ سزای بۆ چەند بارە ئەکرێتەوە لە رۆژی دواییدا، چونکە بێ باوەر هەر چۆنێ سزا ئەدرێ لەسەر کوفر و بێ بروایی هەروەها لە باتی گوناهو تاوانی تریشدا سزا ئەدرێ. -خوا پەنامان بدات-. سزای ئەوانە تەنها بەوە ناوەستێ بەڵکو ئەمەیشە: ﴿وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا﴾ ئەمێنێتەوە هەتا هەتایە بە بێ برانەوە لەو سزادا بە سەرشۆر کراوی و ئابروو براوی. کەواتە هەرچۆنێ لەشیان لەو سزا سەختەدایە هەروەها سزای تایبەتی ئەدرێن کە ئەوەش بەتینتر و سەختترین سزایە، خوا بە بەزەیی خۆی پەنامان بدات لەو سزا سەختانە و هەموو سزایەکی تریش. ئینجا قاپی تۆبە و گەرانەوە ئەکاتەوەیە لەو تاوان بارانەی کە ئەیانەوێ خۆیان رزگار بکەن لەو بەدبەختی و عاقیبەت شەری یە، ئەفەرموێ: ﴿مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلٗا صَٰلِحٗا﴾[1] واتە هەر کەس ئەو تاوانانە بکات کە باس کران تۆڵە و سزایان ئەوەی جگە لە هەر کەسێ تۆبەی کردبێ و گەرابێتەوە لە کردنی تاوان و باوەری هێنا بێ و کردەوەی چاکی کردبێ، ئەمانە پاداشتیان تەنها ئەوەندە نییە کە ئەو سزا سەختەهەمیشەییە یان نەبێ و تەنها ئەمەی نییە کە هەر سزا نەدرێن و بەس، بەڵکو سەرباقی لێ بوردن و سرینەوەی هەموو تاوانیان هەموو تاوانەکانی پێشویان ئەگۆرێ بە چاکە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ﴾ ئەوانەخوا خراپەکانیان ئەگۆرێ بە چاکە، ئەوەش و فەیز و بەخششێکی رووتە بە بێ ئەمەی هیچ هۆیەکی ببێت لە لایەن بەندەوە جگە لەوەی کۆتایی هێناوە لە خراپە و گەراوەتەوە بۆ لای سایە و پەنای خوا لە پاش یاخی بوون و سەرکێشی و سەرگەردانی، ئەو فەیز و بەخششەیش هیچ جێگای سەر سورمان نییە،

---

[1] ئەم ئیستیسنایە هەندێ بە مونقەتیع تەفسیری ئەکەنەوە و بێگومان بەو جۆرەش زۆر رێك و راستە، بەڵکو لە بارێکەوە ئەوە باشترە،چونکە هیچ پێچەوانەی مەبەست نیشان نادات، بەڵام بە موتەسیلی بەهۆی ئەم رستەی دوایی یە نەبێ وا نیشان ئەدات کە ئەم تۆبە کەرانەتەنیائەوسزابەتینەیان نییە و ئیترهیچی تر، ئینجارای زانایان جیاوازەلەبارەی مەبەست لەگۆرینی خراپەکەیان بەچاکە،بەڵام ئەوەی کەلەتەفسیرەکەدایەرێکەلەگەڵ چەندحەدیسێك دا. زانینی راست لای خوایە.

چونکه وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ خوا هەمیشە داشاردەر و سڕەرەوەی گوناهو تاوانە و بەزەیی دارە، بێ گومان هەموو سیفەتەکانی بەرهەمیان هەیە، بەرهەمی ئەم دوو سیفەتە شیرینە ئەبێ ئەو هەموو پیت و فەر و چاکە بێت کە ئەیرژێ بەسەر بەندەکانیدا.قاپی تۆبە و گەڕانەوە لەسەر پشتە و داناخرێ لە رووی هیچ پەناهێنەرێکدا تا ناگاتە کاتی نا ئومێدی لە ژیان ئەو کاتەدا ئەخرێ، چونکە گەڕانەوە کە راست نییە و ناچارییە هەروەها لە پاش هەڵهاتنی خۆر لە لای رۆژ ئاواوەکە ئەو کاتە نزیکی هاتنی رۆژی دواییە، لەو کاتەشدا قاپی گەڕانەوە دائەخرێ و هیچ کەس رێگا نادرێ گەڕانەوەی لێ وەرناگیرێ ئیتر بێجگە لەو کاتە ئەو قاپییە بە فەرە کراوە و لەسەر پشتە بۆ هەموو کەس هەرچەندە تاوان و خراپەکاری کردبێ.(طبرانی) ئەگێڕێتەوە لە ئەبو فەروە کە هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وتی: هەواڵم بدەرێ ئایا پیاوێ هەموو گوناهێکی کردبێ و بەسەر هیچ خراپەیەکدا تێپەری نەکردبێ ئایا تۆبە و گەڕانەوەی بۆ هەیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: موسوڵمان بویت و باوەرت هێناوە؟ ئەویش عەرزی کرد بەڵێ. ئەویش فەرموێ: کەواتەکردەوە چاکەکان بکە و واز بێنە لە خراپەکان، خوا هەموو خراپەکانیشت بۆ ئەگێڕێ بە چاکە ئینجا پرسیار کەر وتی: ئایا هەموو غەدر و کردەوە خراپەکانیشم؟ ئەویش فەرموێ: بەڵێ. ئینجا خاوەن پرسیار دەستی کرد بە الله اکبر و نەیبریەوە هەتا لە چاو گوم بوو. ئینجا یاسا مەرجی تۆبە و گەڕانەوە بە شێوەی گشتی باسی ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَمَن تَابَ﴾ هەرکەسێ بگەڕێتەوە لەو گوناهانەی کردویەتی پەشیمان بوونەوە و دەرهاتن و دوور کەوتنەوەی لێیان و بریار دان بە دڵۆ لەسەر نەگارانەوە سەریان ﴿وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ کردەوەی چاکی کردبێ، بەم رەنگە ئەوەی لەسەریەتی بەسەری بگرێتەوە.

فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴿٧١﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغْوِ مَرُّواْ كِرَامًا ﴿٧٢﴾
وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّواْ عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴿٧٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ
لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾

---

هەرکەس بەو جۆرە بکات﴿فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا﴾ ئەو کەسە بێ گومان ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوا بە گەڕانەوەیەکی زۆر گەورە و گرنگ ککە جێگای ڕەزامەندی خوایە و تۆڵە هەو سزا لابەرە و هۆی پاداشتی خایە ئەوەیە گەڕانەوەی ڕاستەقینە، کەواتە تۆبە لە گەڕانەوە و دەرچوون و کۆتایی هێنان لە گوناهەوە دەست پێ ئەکات و دوایی دێت بە کردەوەی چاك و کە نیشانەی ڕاستی تۆبەکەیە. گوناهو کردەوە و بزوتنەوەیە، هەر کات وازی لێ هێنرا پێویستە جێگاکەی پڕ بکرێتەوە بە کردەوە و بزوتنەوەیەکی دژ و پێچەوانە ئەگەر نایاد و سۆزی کردەوەکانی پێشوو دڵ و دەروونی داگیر ئەکات و بای ئەداتەوە بۆ ئەو بارە پێشووەی کە لەسەری بووە. لە پاش ئەو باسە بەیانە ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ لای نیشانە و سیفەتەکانی بەندە تایبەتییەکانی خوای بەزەییدار:

٧- ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ﴾ ئەو بەندە تایبەتیانە کەسانێکن کە شایەتی درۆ نادەن، یان ئامادە و حازری جێگا و شوێنی درۆ و دەلەسە نابن ﴿وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغْوِ﴾ کاتێ گوزەرە بکەن و تێپەڕن بە لای شتی بێ سوود و بێ نرخدا ئیتر گوناه بێت یان نا ﴿مَرُّواْ كِرَامًا﴾ تێپەڕ ئەکەن بە ڕێزگیری خۆیان لە گوێ بۆ گرتن و وەستان بە لایەوە و خەریك بوونتن پێیەوە، بەڵکو بە پشت تێ کردن و ڕوو لێ وەرگێران، چونکە ئەو بەندە تایبەتیانە کارو فرمانی گرنگیان هەیە و نایانەوێت کاتی بە نرخی خۆیان بە فیڕۆ و بێ سوود بەخت بکەن لە شتی بێ نرخ و بێ سوووددا، ئەوانە بەرزترن لەوەی خەریك بن خۆیان چەپەڵ بکەن و بەو جۆرە شتە بێ فەرانەوە.

٨- ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ﴾کەسانێکن کاتێ ئامۆژگاری بکرێن بە ئایەتەکانی پەروەدگاری خۆیان، یان بخوێنرێتەوە بە سەریاندا ﴿لَمْ يَخِرُّواْ عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا﴾ ناکەون بەسەریاندا و بە دیاریانەوە نامێننەوە بە کەڕی و کوێری واتە بە بێ فام و تێگەیشتن بەڵکو بە تێگەیشتنەوە گوێ ی بۆ ئەگرن و سەرنجیان ئەدەن،واتە ئەوانە بە وێنەی بت

پەرستەکان و هەموو خاوەن بیر و باوەرە لارو چەوتەکان نین کە وەکو کەڕ و کوێر و بێ تێگەیشتن و بیر کردنەوە ئەبەسترێنەوە دیاری بت و بیر و باوەرە پووچەکانیانەوە ئیتر چاو هەڵناخەن بۆ هیچ رێنموونی و رووناکیەك. ئەم بەندە تایبەتیانە کە بەم هەموو نیشانە و سیفەتە گرنگانە خۆیان رازاندوەتەوە تەنیا بە خۆیانەوە ناوەستن، بەڵکو داوا ئەکەن و ئومێجەوارن هاوسەر و رۆڵە و ناوەشێن خوا چەن کەسێکیاتن بداتێ کە ببنە هۆی ئارامی دڵ و چاو رون بونەوەیان، داوا ئەکەن کە خۆیان و ئەوان بکات بە پێشەوایەکی پاك و خاوێن بۆ خەڵکی وەکو ئەفەرموێ و کردوویەتی بە نۆهەم نیشانە و سیفەت و دواترین لێرەدا،

٩- ﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ﴾ ئەو بەندە تایبەتیانە کەسانێك ئەڵێن: ﴿رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّـٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ﴾ ئەی پەروەدگارمان ببەخشە پێکان لە لایەن هاوسەرو رۆڵە و نەوەکانمانەوە هۆی خۆش و شادمانی و هۆی ئارامی دڵ، ئەوەش بەم رێنمونیان بکات و کۆمەکیان بێت لەسەر گوێ رایەڵی و خوا پەرستی، چونکە باوەردار کاتێ رۆڵەو خێزانی هاوبەشیان کرد بە خوا پەرستی و گوێرایەڵیدا دڵخۆش و کامەران ئەبێت بەوە، چونکە ئەبن بە کۆمەك و یارمەتیدەری لە ئایینەکەیدا کی ئەبێ بە نرختر و خۆشەویست ترین شت بێت لە لای. چاوەروانیش ئەکات لە رۆژی دواییشدا پێکەوە بن لە بەهەشتدا،جگە لەوەش باوەرداری راستەقینە هەمیشە بەرزترین ئاوات وئامانجی ئەوە بێت کە ژمارەی باوەرداران زۆرتر بێت، لە یەکەم جارەوە ئاوات و ئامانجەکەی بۆ رۆڵە و نەوە و کەسوکاریەتی، چونککە نزیکترن لێیەوە یەکەم سپاردە پەرسیاری ئەو نزیکانەی لێ ئەکرێ. دوای یەکەمیان لێرەدا ئەوە بوو، دووەم ئەمەی ئەڵێن:﴿وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ بمانگێرە بە پێشەوا بۆ لە خوا ترسەکان پەیرەویمان بکەن لە کار و باری ئاییندا. واتە بە جۆرێکمان لێ بکا کە خەڵکی چاومان لێ بکات و ببینە رینمونیکەر بۆ خەڵکی و بە هۆی ئێمەوە خەڵکی بکەوێتە سەر رێگای راست، کەواتە مەبەستیان خود پەسەندی و خۆپەرستی و داوای بەرزی نییە بەسەر خەڵکدا، چونکە هەموو بۆ لای خوا ئەرۆن بە رێگای خوادا ئەرۆن، ئینجا بە کورتی پاداشتی ئەو بەندە تایبەتیانەمان بۆ روون ئەکاتەوە،

أُوْلَٰٓئِكَ يُجۡزَوۡنَ ٱلۡغُرۡفَةَ بِمَا صَبَرُواْ وَيُلَقَّوۡنَ فِيهَا تَحِيَّةٗ وَسَلَٰمًا ﴿٧٥﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ
حَسُنَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ﴿٧٦﴾ قُلۡ مَا يَعۡبَؤُاْ بِكُمۡ رَبِّي لَوۡلَا دُعَآؤُكُمۡۖ

ئەفەرمویٚ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُجۡزَوۡنَ ٱلۡغُرۡفَةَ بِمَا صَبَرُواْ﴾ ئەوانەی کە ئەو سیفەت و نیشانەیان هەیە پاداشت ئەدرینەوە بە کۆشك و بە بەرزترین جێگا و شوێنەکانی بەهەشت بە هۆی خۆ گریان لەسەر گوێڕایەڵی سیفەت و نیشانانەی کە بۆیان باسکرا ﴿وَيُلَقَّوۡنَ فِيهَا تَحِيَّةٗ وَسَلَٰمًا﴾ لەو جێگا و شوێنەدا بە زۆری پێشوازیان لیٚ ئەکریٚ بە ڕێز گرتن و تەحیە و سەلام و نزای تەمەن درێژی و ساغ و یەلامەتی لە لایەن مەلائیکەوە تووشی ئەو دێن،یان ڕێز و قەدریان ئەگیریٚ لە لایەن مەلائیکەوە و سەلامیان لیٚ ئەکریٚ لە لایەن خواوە ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾ واتە پاداشت ئەدرێنەوە بەو جۆرە پاداشتە بە شێوەیەك لە جێگا و شوێنی خۆشی خۆیانەد و ئەمێننەوە بیٚ دوا هاتن و برانەوە و بە بیٚ مردن و دەرکردن ﴿حَسُنَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا﴾ واتە ئەو جێگاو شوێنانە زۆر جوان و شیرینن لە بارەی نیشتەجیٚ ی مانەوە. لە پاش ئەوە شێوەی بەندە تایبەتیەکانی خوای کێشا و ڕوونی کردنەوە، ئینجا کۆتایی بە سورەتەکە ئەهێنیٚ بە باسی بیٚ نرخی و ریسوایی ئادەمی ئەگەر ئەو کۆمەڵە خوا پەرستە نەبووایە، بە باسی سزایەکەی حەتمی بۆ بیٚ بڕواکان کە ئەبی هەر ببیٚ. لەم ئایەتە دوا دواییەدا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە ڕووی فەرموودەی بکاتە تیرەی ئادەمی یەکسەر و بدویٚ و لەگەڵی بە پێی چاکەکانی و بە پێی خراپە و تاوانی تاوانبار و خراپەکانی، لە بارەی یەکەمەوە ئەفەرمویٚ ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵیٚ بە تیرەی ئادەمی: ﴿مَا يَعۡبَؤُاْ بِكُمۡ رَبِّي لَوۡلَا دُعَآؤُكُمۡۖ﴾ ئایا بە چ جۆریٚ گویٚ پێدانە خوای من گویٚ ی ببیٚ لە ئێوە ئەگەر خواپەرستی و گویٚ ڕایەڵی ئێوە نەبوایە؟واتە خوای من بە هیچ ڕەنگ گویٚ ی نییە لە ئێوە و هیچ نرخێکتان نییە لای خوای من ئەگەر لەبەر خوا پەرستی تاقمیٚ لە ئێوە نەبوایە، چونکە ڕێز و نرخی ئادەمی بە هۆی خواناسی و گویٚ ڕایەڵی بۆ خوا ئەگەر نا لای خوا هەموو گیانلەبەریٚ پیستر و بیٚ نرخترە.

لە بارەی تاقمی دووەمەوە ئەفەرمویٚ پێیان بڵێ: ﴿فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا﴾واتە کاتیٚ بریارو حوکمی خواتان پیٚ راگەیەنرا و ئینجا بێگومان ئێوە بڕواتان نە هێنا و دژ و پێچەوانەی بریار و فەرمانی خوا بوون، کەواتە تۆڵە و بەرهەمی بیٚ بڕواییەکەتان پێوە ئەنوسیٚ و لێتان جویٚ نابێتەوە.[1] دوا دوایی یەکی زۆر بە نرخ و رێکە لەگەڵ هەموو مەبەستی سورەتەکەدا دڵ نەواییەکی بەهێزە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) وە دڵ خۆشی کردنیەتی لەو هەموو سەرکێشی و دەم درێژیەی کە دووچاری ئەبوو لە لایەن ئەو تاقم و گەلە بیٚ بڕوایەوە، لە کاتێکدا باش ئەیان ناسی و زۆربەیان ئەیانزانی کە راستە و ئایینی راستی بۆ هێناون، بەڵام ئەو هەموو تەقەلەیان بۆ هێشتنەوەی ئەو بلرە چەوتە و ئەو رێگا لارە بوو کە لەسەری بوون... بەڵام ئایا ئەو گەلانە چی بوون؟ هەموو ئادەمیزاد چین وچیان تیا بەسەرە، ئەگەر لەبەر ئەو کۆمەڵە کەمە نەبوایە کە خوا پەرست و گوێرایەڵە بۆ پەروەدگار و بۆ پەروەدگاری خۆی و ئاوات و ئامانجی ئەوەیە کە وەرگیریٚ لە ریزی بەندە تایبەتیەکانی خودا و بهۆنرێتەوە لە رشتەی ئەو کۆمەڵە بەختەوەرەی کە ئەو ناو و نازناوەی شیرینەی بەفەرەی بۆ بەکار ئەهێنریٚ:﴿عباد الرحمن﴾.

ئایا ئادەمی هەموو چین؟ لە کاتێکدا کە هەموو ئەو زەویەی کە تیایدا ئەژین زەرەیەکی زۆر بچووکە لە بۆشایی ئەوبوونەوەرە گرنگەدا، هەموو ئادەمی تیرەیەکە لەو هەموو گیانلەبەرانەی کە نایەنە ژمارە بۆ ئێمە و تەنها خوا ژمارەیاتن ئەزانیٚ ئەم ئادەمیەی کە نەبوون و نەمانەوە و نەژیان و نەمردنی بەدەست خۆیەتی لەگەڵ ئەوەدا بافیش ئەکاتە خۆی و خۆی لیٚ ئەگۆریٚ و لووت ئەکات بە کەڵە شاخ و دەم درێژی ئەکات نەک تەنها بەسەر

[1] بەپێی تەفسیرەکە وشەی(ما) بۆ پرسیارێکە کە مەبەست پێی نەفیە، و دروستە لە رێوە(ما) بۆ نەفی بێت وەکو زۆر لە زانایانی تەفسیر ئەفەرمون. ئینجا لەسەر هەردوویار چەند جۆریٚ تریش ئایەتەکە تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام دڵ بەوەی کە لە تەفسیرەکەدایە بڕوای بەهێزترە و بە ئارام ترە و زانینی راستی لای خوایە.

خەڵکدا بەڵکو بەسەر پەروەدگاریشدا خوا پەنامان بدات لە بێ شەرمی و بێ شەرمەفیدا ئەو ئادەمیە سووك و ریسوا و بێ نرخە بە لای خواوە مەگەر لە کاتێکدا کە پەیوەندی بکات بە خوای خۆیەوە و هێز و رێنمونی لەو داوا بکات، تەنیا لەو کاتەدا نرخدار ئەبێت و لە تەرازووی خوادا کێشانی هەیە، لەوانەیە لە تەرازوی خوادا بەرزتر بێ لە فریشتەی خوا، ئەوەش زیادە لوتف و بەهرەیەکە کە خوای میهرەبان رشتوویەتی بەسەر ئەم جۆرە گیانلەبەرەدا ئا بەم جۆرە سوورەتەکە دوایی هات، داوا کارین لە خوای گەورە دڵمان روناك بکاتەوە لە نوور و رووناکی قورئانەکەی.

و صلى الله و سلم على خاتم أنبيائة سيدنا و مولانا محمد و على الة و صحبة أجمعين.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ أَلَّا يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾

## سورەتی الشعراء
## مەککەیی یە و(٢٢٧) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

مەبەستی سەرەکی لەم سورەتەدا عەقیدە و بیرو باوەڕی ئیسلامە... کە کورتەکەی باوەڕ بە تاك و تەنیایی خوا و ترسان لە ڕۆژی دوایی و باوەڕ بە سروشتیٚ کە هاتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ)، ئینجا ترساندن لە تۆڵە و پاشەرۆژی بیٚ بڕوایی، ئیتر بە سزای لە ڕیشە هێنان و وێران کەریی ئەم جیهان، یان سزای سووتان بە ئاگری دۆزەخ لەو جیهان. ئەوانە هەموو لەگەڵ دڵ خۆشی دانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی بڕوا نەهێنانی بت پەرستەکان بەخۆی و بە قورئانەکەی. لەم سورەتەدا بەکورتی ئەدویٚ لە حەوت بەسەرهات و سەرگوزەشتەی گەلە ڕابوردووەکان کە بەهۆی بیٚ بڕوایی یانەوە دووچاری سزای سەختی ئەم جیهان بوون پێش گەیشتنیان بە سزای هەرە گەورەی ئەو جیهان، مەبەست لە گێڕانەوەی ئەم سەرگوزەشتانە دڵنیا کردن و دڵ خۆشی دانەوەی پێغەمبەرە(ﷺ) لەگەڵ ترساندن و تەمیٚ دادانی بت پەرستە بیٚ بڕواکانی ئەم نەتەوەیەدا، بەڵکو بیر بکەنەوە و خۆیان دووچاری بەد بەختی و شەرمەزاری هەردوو جیهان نەکەن، جا لەبەر ئەوە زۆربەی سەرگوزەشتەکان بریتی یە لە باسی تاوان و دەم درێژیی بیٚ بڕواکان و ئەو تۆڵە سەختەی دووچاری بوون، کەواتە شێوەی گشتی سورەتەکە هەڕەشە و ترساندنە، ئینجا با گویٚ شل

کەین بۆ سورەتە بەفەڕەکە ئەو مەبەستە گرنگانەمان بدا بە گوێچکەدا: خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ *طسٓمٓ﴾ لەبارەی ئەم جۆرە پیتانەوە لە چەند سورەتێکی تردا دواین بە کورتی و ئەندازەیە بە درێژیش، کەواتە با لەم بارەوە هیچ نەڵێین.

﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ﴾ ئایەتەکانی ئەم سورەتە گرنگ و پایە بەرزە ئایەتی کتێبە روون و ئاشکراکەن، واتە ئایەتی قورئانێکن کە تەنها ئەو شایانە ناوی ببرێ بە کتێب. ئایەتی قورئانێکن کە روون و رەوانە لەبارەی مەبەست و ئامانجەکانی یەوە، روون کەرەوەی راست و ناڕاست و حەق و ناهەقە، روون و ئاشکرایشە کە موعجیزەیەکە هەموو کەس لە ئاستی دەستە پاچە و پەك کەوتووە. ئینجا رووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) کە دڵی بەفەڕی داگیر بوو بەو بت پەرستانەوە، سەرکێشی و بڕوا نەهێنانیان دڵ تەنگ و غەمباری کردبوو، رووی فەرمودەی تێ ئەکات و دڵ خۆشی ئەداتەوەو کاری ئەو مل هوڕانەی لە پێش چاو سووك و ئاسان ئەکات، ئەو هەموو داخ و مەراقەی کە دڵی داگیر کردووە لەبارەی ئەو بێ بڕوایانەوە شتێکی زیادە و پێویست بەوە ناکات، ئەفەرموێ: ﴿لَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفْسَكَ﴾ بەزەییت بێتەوە بە خۆت دا و خۆت مەکوژە لە داخ و مەراق دا ﴿أَلَّا يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ﴾ لەبەر ئەوەی ئەوانە باوەڕ دار نین و باوەڕ ناهێنن. ئەم فەرمودەیە گلەیی پیشان ئەدات و بۆنی بێزاریی لێ دێ لەو هەموو داخ و مەراق و تەنگەتاوی و بێ ئارامی یەی کە رووی کردبووە دڵی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بەهۆی باوەڕ نەهێنانی ئەو تاقمەوە. هەرچەند داخ و تەنگەتاوی یەکەی لە رێگای ئایینی خوادا بوو و بەهۆی ئەوەوە بوو بەزەیی ئەهاتەوە بەو خەڵکەدا کە بە دەستی خۆیان خەریکن خۆیان ئەخەنە ناوی ئاگری دۆزەخ. بەڵام لە هەمان کات دا پەلە پەل و بێ ئارامی نیشان ئەدات کە شایانی پایەی پێغەمبەر(ﷺ) نی یە،

إِن نَّشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةً فَظَلَّتْ أَعْنَـٰقُهُمْ لَهَا خَـٰضِعِينَ ﴿٤﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّنَ ٱلرَّحْمَـٰنِ مُحْدَثٍ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهُ مُعْرِضِينَ ﴿٥﴾

لەبەر ئەوە ئەو فەرمودەی بەو شێوەیە ئاراستە کرد و بەرگری کرد لەو خۆ تەنگەتاو کردنە و هۆکەشی بۆ روون کردەوە بەم فەرمودەیە: ﴿إِن نَّشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةً فَظَلَّتْ أَعْنَـٰقُهُمْ لَهَا خَـٰضِعِينَ﴾ ئێمە ئەگەر بمانەوێ باوەڕ هێنانی ئەوانە و ناچار کردنیان ئەنێرینە خوارەوە بۆ سەر ئەوانە لە ئاسمانەوە رابەر و بەڵگەیەك کە ببێ بە موعجیزەیەك ناچاریان بکات و بەهۆی ئەوەوە بگەڕێن بە مل کەچ و گەردنیان شۆڕ ببێ بۆی هەمیشە، واتە توانای سەرکێشی و دەم بازیی و دەم درێژیی یان نەمێنێ و بە ناچاری باوەڕ بهێنن وەکو شاخەکەی هەڵکەند و بە لاسەری بەنی ئیسرائیلی یەکانەوە راگیری کرد تا بە ناچاری گوێ رایەڵ بوون. بەڵام خوا نەیویست لەگەڵ ئەم پەیامە دوایی یە و ئەم دواترین شەریعەتەدا شتی وا بکات بە رابەر و موعجیزەی، بەڵکو ویستی کە بەڵگە و رابەرەکەی بگێڕێ بەم قورئانە بەفەڕە کە هەتا هەتایە بخوێنرێتەوە و بەرنامەی ژیان بێت و موعجیزەیەکی ئامادە بێت لە چەند بارو روویەکەوە بۆ هەموو ئادەمی لە هەموو چەرخ و چینێك دا... موعجیزە بێت لە هۆنینەوە و رێك و پێکی و راستی وشە و وتەکانی دا... موعجیزە بێت لەبارەی یاسا و رژێم و بەرنامەی ژیانەوە، بەم رەنگە بۆ هەموو ناوچەکانی ژیان دەستوور و چەند یاسایەکی گشتی ناردووە کە دەست نادەن بۆ دەست تێخستن و بژارە و گۆڕان و چارەسەری هەموو گرێ و قورتی ژیانی کردووە.. موعجیزە بێت لەبارەی کار کردنی لە دڵ و دەروون و هەڵگیرساندنی سۆز و گوێ رایەڵیی، لەبارەی تەڕ و تازەیی و کۆن نەبوونی لە دەروون دا لەگەڵ ئەوەدا بە هەزارەها جار ئەبینرێ و ئەوترێتەوە، هەرگیز نایابی دوایی نایەت، خوای گەورە ویستی کە ئەم قورئانە بکات بە رابەر و موعجیزەی ئەم پەیامە دوایی یە، نەیویست کە رابەرێکی ماددی ناچار کەر بێت کە بە زۆر مل پێچ دەر و سەر شۆڕ و ناچار کەر بێت. ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە ئەم شەریعەت و پەیامە دوایی یە بۆ هەموو نەتەوە و گەلەکانی جیهانە، لە هەموو چەرخ و چینێك دا، تایبەتی نی یە بە هیچ گەلێك و بە هیچ چەرخێکەوە، کەواتە ئەبێ رابەرو موعجیزەکەیشی شتێکی کراوەی نەبڕاوە بێت بۆ دوور و نزیك، بۆ هەموو گەل و نەتەوە و بۆ هەموو چەرخێ، ئەو رابەر و موعجیزە ماددیی یە ناچار کەرانە تەنها ئەو کەسانە ناچار

ئەکات کە بە چاوی خۆیان ئەبینن، ئیتر لەپاش ئەوانە ئەمێنێتەوە بە هەواڵ و بەسەرهاتێ کە ئەگێڕڕێتەوە، نەك شتێ بێت حازرو ئامادە... بەڵام قورئان ئا ئەمەیە کە لەپاش چواردە چەرخ کتێبێکی کراوە و بەرنامەیەکی نەخشە کێشراوە، گەل و چینی ئەم چەرخە شتێکی لێ وەرئەگرن کە رەوڕەوەی ژیانیانی بە رێکی پێ ئەڕوات بە بێ تاسە و لەنگەرە، ئەگەر بە راستی بیکەن بە پێشەوا و سەرچاوەی ژیانیان، هەموو پێویستی یان بە تێرو تەواوی بۆ بەجێ ئەهێنێ. لەپاش ئەوە دەستیان ئەگرێ و رایان ئەکێشێ بۆ جیهان و عالەمێکی چاکتر و بەرزتر و بۆ دوا رۆژ و چارەنووسێکی راست تر و رێك تر، ئەو چین و گەل و کۆمەڵەی پاش ئێمە دێت و پەیدا ئەبن لەم قورئانە شتێ وەرئەگرن کە ئێمە وەرمان نەگرتووە، هەروەها چین لەدوای چین تا دونیا دنیایە ئەم قورئانە ئەچێ بەدەم هەموو چین و تاقمێکەوە و چارەسەری هەموو گرێ و پێویستی یەکیان ئەکات، ئەوەش بەهۆی ئەوەیە کە بەشی هەموو داماو و داواکاریێ ئەدات بە پێی پێویستی خۆی و زەخیرە و کانی پیت و فەڕەکەی هەرگیز دوایی نایەت، وەکو پێغەمبەر(ﷺ) لە وەسف و سەنای دا ئەفەرموێ: ﴿لا تنقضی عجائبە و لایشبع منە العلماء﴾[1] ئەم قورئانە بەفەڕە بەم جۆرەیە، بەڵام ئەو تاقمە سەرکێشە کە لە یەکەم جارەوە ئەم قورئانەی چوو بە گوێ دا نەفام و تێنەگەیشتوو بوون و رێز و نرخی ئەم قورئانەیان نەئەزانی بەهۆی ئەوەوە دەربارەی ئەم قورئانە بەم شێوە بوون، لێرەدا ئەفەرموێ:

﴿وَمَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّنَ الرَّحْمَٰنِ مُحْدَثٍ إِلَّا كَانُوا عَنْهُ مُعْرِضِينَ﴾ هیچ پەند و ئامۆژگاری و هیچ بەش و پارچەیەکیان لە قورئان بۆ نایەت لەلایەن خوای بەزەیی دارەوە کە بەرە بەرە و تازە نێراوە و ناردنی تازە ئەکرێتەوە، هیچ پەند و ئامۆژگاریی وایان بۆ نایەت مەگەر ئەوانە هەمیشە پشت تێکەر و روو وەرگێڕن لێ ی، واتە بەرە بەرە ئایەتەکانی قورئان لەلایەن خواوە دێت بۆ تازە کردنەوەی مۆچیاری و رێنموونی ئەوان کەچی ئەو سەرکێشانە بە هیچ رەنگ بیریان ناکەنەوە و گوێچکەکانی بۆ شل ناکەن. فەرموی: لەلایەن خوای بەزەیی دارەوە بۆیان دێت تا بزانرێ کە ناردنی ئەم قورئانە چاکە و منەتێکی گەورەی خوایە بەسەر ئادەمی یەوە، ناردنەکەشی بەس بەهۆی بەزەیی خواوەیە، کەواتە دەرئەکەوێ پشت تێ کردنی ئێجگار تاوانێکی گەورە و ناشیرین و بێزراوە. ئینجا ئەم هەڕەشە سامناکە ئەهێنێ لەسەر پشت تێ کردن و روو وەرگێڕانەکەیان.

---

[1] ئەمە بەشێکە لە حەدیسێکی درێژ کە تاج الأصول(ج ١) ئەیهێنێ لە ترمزی یەوە، هەروەها لە چەند کتێبی تری باوەڕ پێکراودا هەیە.

**ئەفەرمویٚ: ﴿فَقَدْ كَذَّبُوا۟ فَسَيَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ بە پشت تیٚ کردن و روو وەرگیٚران کۆتایی یان نەهیٚنا، بەڵکو بڕوایان نەکرد بەو پەند و مۆچیاری یە و بە درۆیان دایە قەڵەم و گاڵتە و لاقرتی یان پیٚ ئەکرد بەهۆی ئەوەوە بیٚگومان بۆیان دیٚت و پیٚ یان ئەگات دەنگ و باس و هەواڵەکانی ئەوەی کە لاقرتی یان پیٚ ئەکرد کە ئایا ئەوەی بڕوایان پیٚی نەبوو و لاقرتی یان پیٚ ئەکرد حەق و راست بوو یان شتیٚکی درۆ و بەتاڵ بوو؟ ئایا شایان بوو بۆ ئەوەی بڕوای پیٚ بکریٚ و ریٚز بگیریٚ یان بڕوای پیٚ نەکریٚ و بە سووك و بیٚ نرخ سەیر بکریٚ؟ یان مەبەست بەو هەواڵانە کە بۆیان دیٚت ئەو هەموو سزا و تۆڵە سەختەیە کە دیٚتە سەریان و دووچاری ئەبن لەهەردوو جیهان دا، بەڵام بە شیٚوەی لاقرتی بە هەواڵی ناو ئەبات، ئەوەش لە باتی لاقرتی کردنەکەی ئەوان.**

**لەپاش باسی روو وەرگیٚران و پشت تیٚ کردنی ئایەتەکانی قورئان ئینجا باسی روو وەرگیٚرانی بیٚ بڕوایان ئەکات بە بەڵگە و ئایەتەکانی بوونەوەری. بیٚجگە لەوەش ئەو بیٚ بڕوایانە بیریان نەئەکردەوە لەو هەموو بەڵگە و رابەرە بەهیٚزانە کە قورئان ئەیخستە پیٚش چاویان و سەرنجی بۆ رائەکیٚشان، لەبەر ئەوە گەلیٚ جار پەڵپیان ئەگرت و داوای رابەرو بەڵگەی ماددیان ئەکرد کە پیٚچەوانەی عادەت و باوی ئیٚمەیە وەکو ویٚنەی ئەو موعجیزانەی کە خوا لەسەر دەستی پیٚغەمبەرە پیٚشووەکان دا – درودی خوایان لیٚ بیٚت – دەری خستن. جا ئەوا قورئان سەرنجیان رائەکیٚشیٚ بۆ ئەم بەڵگە و نیشانە روونانەی بوونەوەری یە کە ئەوەی ئەوان داوای ئەکەن هیچ لەمانە نایاب تر و روون تر نی یە، ئەفەرمویٚ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلْأَرْضِ﴾ ئایا ئەوانە هەر سوورن و دان ئەگرن بەسەر ئەو بیٚ بڕوایی یەی کە وان لەسەری و بیریٚ ناکەنەوە و سەرنجیان نەداوە و سەرنجیٚ راناکیٚشن بۆلای زەوی ئەو هەموو شتە نایابە سەرسوڕهیٚنەرانەی کە جیاوازن لە سروشت و شیٚوە و بەرهەم دا و خوا دروستی کردوون لەم زەوی یەدا کە بە رواڵەت یەك شتە و یەك سروشتە کە ئەوەش نیشانە و بەڵگەیەکی ئیٚجگار روون و رەوانە لەسەر زانین و توانا و لیٚزانینی خوای پەروەردگار؟ واتە با بڕین و سەرنجی بدەن،**

﴿كَمۡ أَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ﴾ كە زۆرمان رواندووە لە زەوی دا لە هەموو بابەت و جۆرێکی چاکی بەنرخی بەپڕێزی بەسوود. بە راستی سەیر تر لە هەموو شت ئەمەیە کە ئەو هەموو جۆرەش نێرو مێن، ئیتر نێری بە جیاو مێینە بە جیا وەکو دار خورما و گەلێ شتی تر کە بەو جۆرەن، یان پێکەوە و بە تێکەڵی وەکو زۆربەی سەوزە و رووەکان کە ئەندام و کەرەسەی نێرو مێ ی کۆئەبنەوە لە تەنیا درەخت و رووەکێك دا و پێوەن ئەبن پێکەوە!! بە هەر جۆر بەهەر بار رواندن و دەرهێنانی ئەو هەموو شتە جیاوازە کە هەریەکە تام و بۆن و رەنگ و شێوە و بەر و بەرهەمێکی جیاوازی تایبەتی هەیە. دەرهێنانی ئەو هەمووە لە زەوی کە بە رواڵەت یەك سروشت و بە یەك ئاو ئەژی و رابەر و بەڵگەیەکی زۆر روونە و موعجیزەیەکی تێرو تەواوە کە بە هەمیشەیی ئەبینرێ و دووبارە ئەبێتەوە و جگە لە تەماشا کردن و سەرنج دانیش پێویست بە هیچی تر ناکات، بەڵام بە مەرجێ دڵ زیندوو بێت و ژیریی لەکار نەکەوتبێت. بەرنامە و رێگای قورئان لە پێگەیاندن و تێگەیاندن دا سووك و ئاسان ترو روون ترین بەرنامە و رێگایە، ئەوەتا سەرنج رائەکێشێ بۆ ئەو هەموو شتە بینراو و هەست پێ کراوە، کە ئادەمی لە نێوانیان دا ئەژی و هەرگیز لێ یان جیا نابێتەوە بەهەر لایەك دا بڕوا و سەرنجی هەر شتێ بدات، سەرنجی رائەکێشێ بۆ ئەمەی بیر بکاتەوە لە ناپایی ئەو هەموو دروست کراوانی خوا، ئەو کاتە ئەگەر خاوەن هۆش و فام بێت چاوی بە هەرشتێ کەوت دەست بەجێ چاوی دڵی خوا ئەبینێ و هەمیشە بە یادی خوای پەروەردگارەوە ئەژی کە ئەوەش بنەڕەت و پایەی خۆش بەختی و ئارامە لەم جیهانەدا و هۆی دەست کەوتی نازو رێزی رۆژی دوایی و رەزامەندی خوایە. خوای گەورە سەرنجی راکێشان بۆ ئەو هەموو رابەرە بەهێزە و ئینجا ئەیش فەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ﴾ بەڕاستی لە رواندنی ئەو هەموو رووەکەدا نیشانە و بەڵگەیەکی روون هەیە لەسەر ئەوە کە خوای روێنەریان توانا و دەسەڵات دارە و لێزان و کاردروستە و خاوەن چاکە و بەزەیی یە بە بەندەکانی. بەڵگە و نیشانەیەکی روون هەیە بۆ بڕوا هێنانی بێ بڕواکان،

وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩﴾ وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئْتِ
ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ قَوْمَ فِرْعَوْنَ ۚ أَلَا يَتَّقُونَ ﴿١١﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿١٢﴾ وَيَضِيقُ صَدْرِى
وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِى فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَٰرُونَ ﴿١٣﴾

---

﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾ زۆربەی ئەوانە بڕوادار نین، لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە و نیشانە روونانەدا. ئینجا پێشەکی سورەتەکە دوایی ئەهێنێ بە دوو رستە و بە رستەیەکی تر کە لەم سورەتەدا ئەیان فەرموێتەوە لەپاش نیشان دان و خستنە پێش چاوی هەموو بەڵگەیەکی روون، ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بێگومان خوای تۆ بەڕاستی تەنها ئەو زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و بەزەیی دارە، کەواتە زاڵە بەسەر تۆڵە و سزادانی بێ بڕواکان و بەزەیی دارە کە رێنموونی ئەکات بۆ رێگای راست و مۆڵەت ئەدات، یان بەزەیی دارە دەربارەی ئەوانەی کە باوەڕ ئەهێنن و ئەگەڕێنەوە بۆلای خوا.

لەسەرەتاوە وتمان لەم سورەتەدا بە کورتی حەوت بەسەرهات و سەرگوزەشتە ئەگێڕێتەوە، ئەوا لێرەدا دەستیان پێ ئەکات و یەکەمیان باسی موسا و هارونە – درودی خوایان لێ بێت – کە خوا رەوانەی کردن بۆ سەر فیرعەون و گەلەکەی. لێرەدا زنجیرەیەك لەو بەسەرهاتە باس ئەکات کە رێك و پێکە لەگەڵ مەبەستی سورەتەکەدا، هەروەها لەگەڵ چەند شتی تر کە بە شێوەی گشتی وەرئەگیرێ لەم سورەتە کە ئەوانەش بریتین لە دوو شت:

١- روون کردنەوەی عاقیبەت شەڕی و پاشە رۆژی خراپی ئەوانەی بڕوایان بە پێغەمبەر و پێغەمبەرێتی نەبووە.

٢- دڵ ئارام کردنی پێغەمبەرمان(ﷺ) و دڵ خۆشی دانەوەی لەو هەموو سزا و ناخۆشی یەی کە دووچاری ئەبوو لەلایەن بت پەرست و بێ بڕواکانەوە، لە چاودێریی و یارمەتی دانی خوا بۆ بانگ و بانگەوازەکەی خۆی و ئەوانەی باوەڕیان پێ هێنان، هەرچەند بێ هێز و لاواز بووبن و دوژمنیان بەهێز و بە دەسەڵات و زۆردار بووبن لە وڵات دا. چەند زنجیرەیەك لە بەسەرهاتی موسا(علیه السلام) لە چەند سورەتێکی تردا لەمەو بەر هەیە: ﴿البقرة، المائدة، الأعراف، الإسراء، کهف، طه﴾ جگە لە دەست نیشان کردن بۆ ئەو بەسەرهاتە لە چەند سورەتێکی تردا، هەموو ئەو زنجیرە و دەست نیشانانەیشی

ڕێك و پێکن لەگەڵ مەبەستی سورەتەکان دا، یان لەگەڵ مەبەستی ئەو شوێنانەی کە ئەو دەست نیشانەی تیا هاتوون، لە هەموو سورەت و لە هەموو شوێنێك دا بار و شێوەی زنجیرە و باسەکان بە جۆرێ وتراون و داڕێژراون جیاوازن لە یەکتر، بە کورتی بەسەرهاتی موسا هەرچەند لە زۆر سورەت و لە زۆر شوێن دا باس کراوە، بەڵام تیکرار و دووبارە کردنەوە نی یە لە پیشان دان و گێڕانەوەی بەسەرهات و سەرگوزەشتەکەدا، هەروەها هەموو بەسەرهات و سەر گوزەشتەکانی تریش لە قورئان دا هەموو تەڕ و تازەن لە پێش چاوی مەردوم دا، چونکە هەموو جارێ بارو جۆر و شێوەیەکی تایبەتی جیاوازی هەیە وەکو روون ئەبێتەوە لە بەراورد کردن و سەرنج دانی شێوەی باسەکان دا، ئەو زنجیرەی کە لەم سورەتەدا نیشان ئەدات بریتی یە لە باسی رەوانە کردن و پێغەمبەرێتی موسا و هارون و بڕوا نەهێنانی فیرعەون و کۆمەڵەکەی و ئینجا خنکاندنیان لە تۆڵەی ئەو بێ بڕوایی و هەموو تاوانەیان. رزگار بوونی موسا و بەنی ئیسرائیلی یەکان، ئینجا با گوێ بگرین لە قورئانی بەفەڕ و باش دڵی بدەینێ، بەڵکو بە رووناکی مەبەستەکانی تاریکی لە هەست و دەروونمان دا بڕوا، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئەو کاتە بکە کە خوای تۆ بانگی کردە موسا کە بە پێغەمبەریی بڕۆ بۆلای ئەو گەلە ستەمکارە. بەڵێ بەڕاستی ستەمکار بوون، جەورو ستەمیان لە خۆیان کرد بە کوفر و بێ بڕوایی و گومڕایی، جەور و ستەمیان کرد لە بەنی ئیسرائیلی یەکان بە سەربڕینی کوڕەکانیان و هێشتنەوەی کچەکانیان بۆ سەرشۆڕیی و کارەکەریی، بە سزادانیان بە بێگار و خزمەتکاری و هەموو جۆرێکی تری ناشیرین، لەبەر ئەوە لە پێشەوە باسی ئەو سیفەت و نیشانەی کرد و ئینجا دیاریی کردن، فەرموی: ﴿قَوْمَ فِرْعَوْنَ﴾ گەلەکەی فیرعەون، ئینجا موسا و هەموو کەسێکیان لێ سەرسام ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿أَلَا يَتَّقُونَ﴾ ئایا ئەوانە ناترسن لەخوای خۆیان؟ ئایا ناترسن لەبەر هەموو پاشە رۆژی ئەو جەور و ستەمەیان؟ ئایا ناگەڕێنەوە لە گومڕایی یەکەیان؟ ئاگادارین کە ئەوانە زۆر سەیر و سەر سوڕهێنەرن و شایانی ئەوەن کە خەڵکی سەری سوڕ بمێنێ لێ یان! هەروەها هەموو کەس و هەموو تاقمێ بە وێنەی ئەوان بن. بێگومان مەبەست لەناردنی موسا(علیه السلام) لە یەکەم جارەوە و یەکەم کەس بۆ سەر فیرعەون بووە، چونکە ئەو هۆی کوفرو بێ بڕوایی گەلەکەی بوو، ئەو پێشەوایان بوو لە هەموو جەورو ستەمێك دا، بەڵام ناونەبرا، چونکە کاری ئەو

ئاشكرایه و بەناوبانگە، بێجگە لەوەش لە شوێنێكی تردا باسی كراوە بە تەنیا، یان لەگەڵ گەلەكەی دا، كەواتە پێویست نەبوو ناوبردنی لێرەدا. فیرعەون و گەلە ستەمكارەكەی ناسراو بوون لای موسا(علیه السلام) كەواتە باش ئەیزانی كە ئەم ئەركەی خراوەتە سەرشانی زۆر گەورە و گرنگ و گرانە، لەبەر ئەوە هاواری لاوازی و بێ دەسەلاّتی خۆی بردە لای خوا نەك بۆ ئەمەی خۆی لە كارەكە بكێشێتەوە و بەهانە بێنێتەوە، بەڵكو داوای كۆمەك و یارمەتی كرد لە بەجێ هێنانی و هەڵسانی بەو ئەركە گرانە: ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿رَبِّ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ﴾ ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من مەترسی ئەكەم كە ئەوانە بڕوام پێ نەكەن و بە درۆزنم دابنێن. ﴿وَيَضِيقُ صَدۡرِي﴾ دڵم تەنگ ببێ ﴿وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِي﴾ زمانم بەرەلاّ نابێ لەو گیرو گرفتەی هەیەتی و ئەبەستری لەوەی پەیامەكەم بە ڕێكی بگەیەنم و بەرپەرچی ئەوان بدەمەوە ﴿فَأَرۡسِلۡ إِلَىٰ هَٰرُونَ﴾ كەواتە بنێرە لای هارون بیكە بە پێغەمبەر لەگەڵم دا، لە گێڕانەوەی فەرمودەكەیەوە وا وەرئەگیرێ كە مەترسی یەكەی تەنها لە بڕوا نەهێنان نەبووە، بەڵكو لەوەی كە ئەو بڕوا نەهێنان و بە درۆخستنەوە لە كاتێك دایە كە دڵی تەنگەتاو ببێ و زمانی بەرەلاّ نەبێ، كەواتە ناتوانێ بە ڕوونی پەیامەكەی ڕاگەیەنێ و بكۆڵێتەوە لەگەڵیان و بەرپەرچیان بداتەوە، چونكە لە زمانی دا گرێ و گیرو گرفتێك هەبووە، ئەوەش ئەبێتە هۆی دڵ تەنگی كاتێ كە نەتوانێ ئەوەی لە دڵیایەتی ڕایگەیەنێ و داخ و مەراقی ئەركات بە بەرپەرچ دانەوە و لێكۆڵینەوە، تا گران تر بێت دڵ تەنگی یەكەی بەتین تر ئەبێت، جا بەهۆی ئەوەوە مەترسی كرد كە ئەو حاڵەتە ڕووی تێ بكات لە كاتێك دا كە ڕوو بە ڕووی ستەمكارێكی وەكو فیرعەون بوەستێ، لەبەر ئەوە هاواری بردە لای خوای خۆی و داوای لێ كرد كە هارونی برایشی بكات بە پێغەمبەر و بیكات بە هاوبەشی لەو پێغەمبەرێتی یەدا بۆ ئەمەی ئەو ئەركەی خراوەتە سەر شانی بەجێ بێت، هارون زمان بەرەلاّ و گفت و گۆی ڕێك و ڕەوان بوو كەواتە هەركات موسا گیرو گرفت ڕووی تێ كرد هارونی برای ڕانەپەڕی لەباتی ئەو ڕاگەیاندنەكە ئەبا بەڕێوە، موسا هەرچەند داوای كرد كە خوا ئەو گیرو گرفتە لە زمانی دا لابا و نزاكەیشی وەرگرت و داواكەی بۆ جێ بەجێ كرد، بەلاّم بۆ احتیاط و كار قایمی ئەم داوایەشی كرد، ئەو داوای موسا(علیه السلام) لە بارێ تریشەوە كار قایمی تیا بوو، ئەوەش ئەمەیە ئەگەر كوژرا با هارون لە جێ یدا ئامادە بێت بۆ گەیاندنی فرمانەكە،

وَلَهُمۡ عَلَيَّ ذَنۢبٞ فَأَخَافُ أَن يَقۡتُلُونِ ﴿١٤﴾ قَالَ كَلَّاۖ فَٱذۡهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآۖ إِنَّا مَعَكُم مُّسۡتَمِعُونَ ﴿١٥﴾ فَأۡتِيَا
فِرۡعَوۡنَ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ أَنۡ أَرۡسِلۡ مَعَنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿١٧﴾

**وەکو لەم فەرمودەیەوە وەرئەگیرێ: ﴿وَلَهُمۡ عَلَيَّ ذَنۢبٞ﴾ بۆ گەلی فیرعەون هەیە بەسەر منەوە تۆڵەی تاوانێ کە کاتی خۆی کردم بەرامبەریان، ئەوەش ئەوە بوو کە لە سورەتی ﴿القصص﴾ دا ئەگێرێتەوە کە پیاوێ لەوان پەلاماری یەکێکی لە ئیسرائیلی یەکانی دا موساش(علیه السلام) لێ ی داو کوشتی، جامەبەستی ئەوەیە کە فەرموی: ﴿فَأَخَافُ أَن يَقۡتُلُونِ﴾ کەواتە مەترسی ئەکەم کە بم کوژن لەباتی ئەو پیاوەدا، کەواتە ئەو کاتە با بانگەوازەکەی خوا نەوەستێ و هارونی برای هەڵسێ پێ ی، ئینجا کاتێ کە خوا ئەزانێ موسا راست ئەکات و ئەوەندە سورە لەسەر فرمانەکەی نزاکەی وەرگرت، دڵ ئارامی کرد لەوەی مەترسی لێ ئەکرد، لێرەدا قورئان باسەکە کورت ئەکاتەوە و بێ دەنگ ئەبێ لە چەند قۆناغێك لە نێوان ئەم داوا و وەرگرتن و بەدی هێنانی دا، وان نیشان دا کە هاروون لەوکاتەدا حازر بووە و پێکەوە فەرمان وەرئەگرن لە خوا، کەچی لەپاش ئەو داوایە و وەرگرتنی ئینجا خوا سروشی کردە لای هارون و موسایش لەپاش ئەوە لەکێوی(طور) ەوە گەڕایەوە بۆ میسرو ئینجا لەگەڵ هارون یەکیان گرت و ئاشکرا بوون لەیەك.**

**خوای گەورە داواکانی موسای وەرگرت وەکو لەم فەرمودەیەوە روونە: ﴿قَالَ كَلَّاۖ﴾ واتە خوا فەرموی بە موسا: نەخێر دڵت تەنگ نابێ و زمانت ناگیرێ و ئەوانە تۆ ناکوژن و دەسەلاتیان بەسەر کوشتنی تۆدا نابێ و واز بێنە لەو مەترسی یە کە دێت بە دڵت دا، ﴿فَٱذۡهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآۖ﴾ کەواتە هەردووکتان بڕۆن بۆ سەر فیرعەون بە موعجیزەکانی ئێمەوە کە موسا لەو یەکەم جارەوە دوانیانی بینی، کە یەکێکیان دار دەستەکەی بوو کە بە پێش چاوی یەوە بوو بە ئەژدیهایەك و ئینجا وەکو خۆی لێ هاتەوە، ئەوی تریان دەستی راستی بوو کە ئەیخستە ژێر باڵی چەپی و بە سپێتی و رووناکی و بریقەوە ئەهاتە دەرەوە، ﴿إِنَّا مَعَكُم**

مُّسْتَمِعُونَ ﴾ بڕۆن و ترستان نەبێ، چونکە بەڕاستی ئێمە بە یارمەتی و چاودێریی لە گەڵتانین و بیسەرین بۆ هەر شتێ ئێوە ئەیڵێن و پێتان ئەوترێ و هەموو وت و وێژێکتان ئەبیستن و وەکو گوێ گر واین بە دیاریانەوە، بۆ یارمەتی دان، بڕۆن ﴿فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ﴾ ئینجا بچنە لای فیرعەون، بە بێ ترس و دەمە پێچە ئیش و فرمانی خۆتانی پێ ڕاگەیەنن: ﴿فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ ئینجا بڵێن: هەرکام لە ئێمە نێرراو و پێغەمبەری پەروەردگاری هەموو جیهانین ﴿أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ نێرراوین کە تۆ بەنی ئیسرائیل بەرەڵا کەیت و وازیان لێ بێنی لەگەڵ ئێمە بن، بۆ ئەمەی خوای خۆیان بپەرستن بە ئارەزووی خۆیان، یان لێ یان گەڕێ با لەگەڵ ئێمە بن بڕۆین بۆ وڵاتی فەلەستین کە لە کۆنەوە جێگای خواپەرستی بووە و جێگای باو باپیرە گەورەکانمانە، ئەو تائیفە لە باپیرە گەورەیانەوە هاتوون بە دین داری، کاتی خۆی لە وڵاتی شام دا بوون بەهۆی یوسف پێغەمبەرەوە(علیه السلام) چوونە وڵاتی میسر، لەپاشان پادشا ستەمکارەکان زاڵ بوون بەسەریان دا و کران بە بەندە و ژێر دەست و خزمەتکار ماوەی چوار سەد ساڵێ و لەم کاتەدا موسا و هارون کران بە پێغەمبەر – سەلامی خوایان لێ بێت – چەرخی دواترین فیرعەونی میسر بوو، خوای گەورە ئەم دووانەی کرد بە پێغەمبەر و ناردنی بۆ رزگار کردنیان لە دەست فیرعەونی ستەمکار بۆ خواپەرستی و سەربەستی یان و لە گێڕانەوەی سەرگوزەشتەی موسا لێرە و لە وێنەی ئێرەدا وا دەرئەکەوێ کە مەبەستی سەرەکی لە پێغەمبەرێتی و رەوانە کردنیان بۆلای فیرعەون بۆ رزگار کردنی ئەو تائیفە بووە، نەك بۆ بانگ کردنی فیرعەون و کۆمەڵەکەی بۆ خواپەرستی، چونکە پێغەمبەرێتی یەکەیان تایبەتی بووە بەو تائیفەوە. بێگومان موسا گەڕایەوە بۆ میسر و یەکیان گرت لەگەڵ هارونی برای – سەلامی خوایان لێ بێ – و بە پێی فرمانی خوا چوون بۆلای فیرعەون و ئەوەی پێ یان سپێررا رایان گەیاند، ئینجا با گوێ بگرین بزانین هەڵوێستی فیرعەونی سەرکێش چۆن بووە؟ شتێکی ئاشکرایە کە خێر لە ناوچاوی ستەمکاری وادا نی یە، کەواتە ئەبێ وەڵام و هەڵوێستی ناپیاوانەبێت، لەبەر ئەوە بە سەرسوڕمانەوە سەرنجی داو بە لاقرتی پێ کردنەوە،

قَالَ أَلَمۡ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدٗا وَلَبِثۡتَ فِينَا مِنۡ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ وَفَعَلۡتَ فَعۡلَتَكَ ٱلَّتِي فَعَلۡتَ وَأَنتَ مِنَ
ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ قَالَ فَعَلۡتُهَآ إِذٗا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٢٠﴾ فَفَرَرۡتُ مِنكُمۡ لَمَّا خِفۡتُكُمۡ فَوَهَبَ لِي رَبِّي حُكۡمٗا
وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٢١﴾ وَتِلۡكَ نِعۡمَةٞ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنۡ عَبَّدتَّ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾ قَالَ فِرۡعَوۡنُ وَمَا رَبُّ
ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَآ

---

**﴿قَالَ﴾ وتی بە موسا لەپاش ئەوەی ناسی یەوە: ﴿أَلَمۡ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدٗا﴾ ئایا ئێمە پێمان نەگەیاندی و پەروەردەمان نەکردی لە شوێن و جێگای خۆمان و لەناو خۆمان دا بە منداڵی و بە تازە لە دایك بوویی؟ واتە ئایا ئەمەیە پاداشتی ئەو هەموو چاکەیە کە ئێمە لەگەڵ تۆ کردمان؟ پاداشتەکەت ئەمەیە دژو پێچەوانەی ئەو ئایینی ئێمە هەڵسی؟ دژی پادشایەك هەڵسی کە لە ماڵی ئەودا پێگەیشتووی، و بانگی بکەیت بۆلای خوایەکی تر؟ ﴿وَلَبِثۡتَ فِينَا مِنۡ عُمُرِكَ سِنِينَ﴾ تۆ مایتەوە لەناو ئێمەدا چەند ساڵێك لە تەمەنت هیچ ئەم قسە و باسەت نەبوو، هیچت لێ دەرنەئەکەوت کە ئەمەی لێ بوەشێتەوە، ئینجا ڕووداوی کوشتنی کابرای قیبتی بیر خستەوە بە شێوەیەکی سامناك و ترسێنەر، وتی: ﴿وَفَعَلۡتَ فَعۡلَتَكَ ٱلَّتِي فَعَلۡتَ﴾ کردت ئەو کردەوە زۆر خراپەی خۆتە کە کردت، واتە ئەوەندە کردەوەکەت خراپە دەم ناهێنێ و شایانی ئەوە نی یە بە ڕێکی ناوی ببرێ! ئەو کردەوە خراپەت کرد، ﴿وَأَنتَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ لەکاتێك دا کە تۆ یەکێ بوویت لەوانەی کە کافر و بێ بڕوا بوون بەو پەروەردگاری هەموو جیهانەی کە ئەمڕۆ ئەیڵێیت و ناوی ئەبەیت، چونکە تۆ لەو کاتەدا هیچ ناوی ئەمەت نەئەبرد کە ئێستا ناوی ئەبەیت، یان مەبەستی ئەوەبوو کە چاکەی منت لە پێش چاو نەبوو، لەوانە بوویت کە بەد نەمەکن و ددان نانێن بە چاکە و پیاوەتی یەك دا کە دەربارەیان بکرێ. ئا بەم جۆرە فیرعەون ئەوەی زانی لەبارەی موساوە وتی و لای وابوو کە موسای پەك خستووە و توانای وەڵام دانەوە و بەر بەرەکانێ ی نەماوە، بە تایبەتی بەرامبەر باسی کوشتنەکە کە لە وتەکەیەوە هەڕەشەی لێ وەرئەگیرا بە تۆڵە لێ سەندن بەڵام موسا(علیە السلام) کە خوا داوا و نزاکەی وەرگرت و گیرو گرفتی زمانەکەی نەهێشت وەڵامی دایەوە و ﴿قَالَ﴾ وتی بە فیرعەون: ﴿فَعَلۡتُهَآ إِذٗا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ﴾ ئەو کردەوەم کرد لەو کاتەدا من لە کۆمەڵی نەزانان بووم، واتە بە دەست قەست نەبووە و نیازی کوشتنم نەکرد و نەم زانی بەوە ئەمرێ، یان نەزان بووم بە فەرمان و شەریعەتی خوا، یان نەزان بووم ڕاپەڕینم بەهۆی نەتەوایەتی و ڕەگەزایەتی بوو نەك لەبەر عەقیدە و باوەڕێ کە ئەمڕۆ هەمە و ئەیزانم ﴿فَفَرَرۡتُ مِنكُمۡ لَمَّا خِفۡتُكُمۡ﴾ ئینجا پەروەردگارم زانین و لێزانی و کاردروستی پێ بەخشیم، یان پێغەمبەرێتی پێ دام ﴿فَوَهَبَ لِي**

رَبِّي حُكْمًا وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ گێڕامی له ریزی ئەوانەی کە رەوانە کراون بە پێغەمبەرێتی بۆ سەر خەڵکی. ئینجا بەرامبەر لاقرتی یە ناڕەواکەی فیرعەون وەلامێکی ئەداتەوە بە شێوەی لاقرتی، بەلام لاقرتی یەکەی ئەم شایان و رەوایە، فەرموی: ﴿وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَىَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾[1] ئەو پێگەیاندن و پەروەردە کردنەم نیعمەت و چاکەیەکە کە منەتی پیّ ئەنێیت بەسەر من دا، ئەوەش ئەوەیە تۆ بەنی ئیسرائیلی یەکانت سەر شۆڕ و ژێر بار کرد و گێڕانت بە بەندە بۆ خۆت، واتە پەروەردە کردنی من بەهۆی ئەوەوە بوو کە تۆ بەنی ئیسرائیلیت کرد بە بەندە و کوڕەکانت ئەکوشتن، بەهۆی ئەوەوە دایکم ویستی کە من لەماڵی خۆی دا نەهێڵیّ نەك پێم بزانن و سەرم ببڕن، تا ناچار بوو بم خاتە ناو سندوقێك و بم خاتە ناو دەریا تا ئاو لای دامە ماڵی ئێوە، بەهۆی ئەوەوە لەماڵی ئێوەدا پەروەردە کرام نەك لە ماڵی باوك و دایکم دا، دەی ئایا ئەوەیە ئەیکەیت بە منەت بەسەرمەوە؟ ئەمەیە پیاوەتی و چاکەکەت؟ ئینجا لەوێدا فیرعەون لایدا لەو باسە و پرسیاری کرد لە ناوەڕۆکی بانگ و بانگەوازەکەی، بەلام لە شێوەی خۆ نابەڵەد کردن و لاقرتی و بیّ شەرمیی و بیّ ئەدەبیی لەبارەی خواوە وەکو بۆمان باس ئەکات و ئەفەرمویّ: ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ ﴾ فیرعەون وتی: ﴿وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ ئەو پەروەردگاری هەموو جیهانە کە تۆ ئەڵێیت رەوانە کراوی ئەوم چی یە و لە چ تیرەیەکە؟ ئەو نەفرین لیّ کراوە بەو شێوە ناڕەوا و بە لاقرتی و سەرسوڕمانەوە ئەو پرسیارەی کرد. موسایش(علیە السلام) وەلامی دایەوە بە سیفەتی پەروەردگاریی بۆ ئەم بوونەوەرە کەوا بە پێش چاوەوە، ﴿قَالَ ﴾ موسا فەرموی: ﴿رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ﴾ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی یە و هەرچی وا لە نێوانیان دا. وەلامەکەی بەرپەرچێکی چاك بوو بۆ نەفامی و خۆ نابەڵەد کردنەکەی فیرعەون و دای بەسەری دا و دای پۆشی... واتە ئەوەی کە منی ناردووە پەروەردگاری ئەم بوونەوەرە گرنگەیە کە نە دەسەلاتی تۆ و نە زانینی تۆ پیّ ی ئەگات، ئەوپەڕی ئەوەی فیرعەون دەم درێژیی پیّ ئەکرد ئەمە بوو کە خوای ئەو گەلەیە و ئەو پارچە زەوی یە لە خاك و شیوی رووباری نیل کە ئەوەش دیارە بە هیچ رەنگ چاو نادات لەناو ئەم بوونەوەرەدا،هەروەها وەلامەکەی بیّ نرخیی و پڕوپووچی ئیدیعاکەی فیرعەون نیشان ئەدات بەیەکجار، سەرنجی رائەکێشیّ بۆئەم بوونەوەرە گرنگەوبیرکردنەوەی لەکەسیّ کەخوایە،

---

[1] ئەم ئایەتە بە چەند جۆر و شێوەیەك ترکیب کراوە، و بە گوێرەی ئەو ترکیبانە تەفسیرەکەی جیاوازە، بەلام مەبەست لە هەموو هەر یەك شت ئەگرێتەوە، و ئەوەی لە تەفسیرەکەدایە بیّ ئەرك تر و جوانترە و دڵ باوەڕی بەهێز ترە پیّ ی، خوا خۆی باش ئەزانیّ.

إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾ قَالَ
إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴿٢٧﴾ قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ

**بە دوای وەڵام و تەمێ یەکەدا ئەفەرموێ: ﴿إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە باوەڕداری راستەقینەن، بە دڵێکی پڕ لە ئارامەوە ئەوەی من پێم راگەیاندن لە هەموو شت شایان تر و بەجێ ترە بۆ بڕوا پێ کردن، چونکە زۆر ئاشکرایە و ژیریی و سروشت جگە لەوەی بەلاوە راست نی یە، چونکە زەوی و ئاسمان و ئەوەی وا لە نێوانیان دا بەم هەموو نایابی و رژێمە تێرو تەواوەیانەوە ئەبێ چۆن پەیدا بووبن؟ ئایا خۆیان خۆیانیان دروست کردووە؟ ئایا بە رێکەوت پەیدا بوون؟!! بێگومان هەرکەس رێزی خۆی و ژیریی خۆی بەلاوە بێت هیچ کام لەم دوو بارە نالێت و شەرم ئەکات شتی وا بڵێ، کەواتە تەنیا بارێ مایەوە کە ئەبێ یەکێ دروستی کردبن و پەروەردگاریان بێت کە زیندوو و زانا و توانا و لێزان و کاردروست بێت و خۆی بە خۆی بووبێ بە بێ سەرەتا و دواهاتن بۆ بوونی، ﴿قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ﴾ فیرعەون وتی بەوانەی بە دەوری دا بوون لە پیاو ماقوڵان و پیاوە تایبەتی یەکانی: ئایا گوێ ناگرن لە وەڵامەکەی چەندە نارێکە لەگەڵ پرسیارەکەدا؟ واتە ئێمە پرسیاری تیرە و حەقیقەتی لێ ئەکەین، ئەو بە نیشانە و کردەوە وەڵام ئەداتەوە و شتێ ئەڵێ کە ئێمە تا ئێستا نەمان بیستووە و نەناسراوە لامان، رەنگە مەبەستی ئەو پیسە ئەوە بووبێ کۆمەڵەکە خەریک بکات و بیکات بە چاو و راو لێ یان نەك بیر بکەنەوە لەوەی موسا وتی و قسەکەی کاریان لێ بکات، ئەوەش بە پێی باوی ستەمکاران کە هەموو کات مەترسی ئەکەن لەوەی قسەی راست بوترێ و خەڵکی وەری گرن و ببێتە هۆی راپەڕینیان لە نارەوایی و شتە پڕوپووچەکانی ئەوان، ئینجا موسا نەوەستا و سیفەت و نیشانەیەکی تری خوای ئاراستە کردن: ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ ئەو خوایە کە منی ناردووە پەروەردگاری ئێوەیە و پەروەردگاری باوك و باپیرە پێشووەکانتانە. موسا(علیه السلام) گواستی یەوە بۆ ئەم وەڵامە،**

چونکە ئەمە ئاشکرا ترە و کەمتر ڕێگا هەیە ملە جەڕێ و دەم بازی تێدا بکرێ، لەبارێ ترەوە باشتر و باشتر ئەدا لە فیرعەون و داواکەی، ئەوەتا بێ پێچ و پەنا پێ ی وت: پەروەردگاری تۆیە، کەواتە فیرعەون هیچ نی یە جگە لەوە بەندەیەکە لە بەندەکانی خوا نەك خوا بێ وەکو خۆی ئەڵێت و دەم بازی پێ ئەکات لەناو گەلەکەی دا، خوا پەروەردگاری گەلەکەی فیرعەونیشە، کەواتە فیرعەون درۆی ئەکرد کە خۆی دائەنا بەخوای ئەو گەلە!! هەروەها خوای باوك و باپیرە پێشووەکانیشیانە، کەواتە ئەو خوایەتی یەی کە فیرعەون دای ئەنا بە کەلەپوور هەر لە کۆنەوە و ئەیکرد بە بنەڕەت بۆ خوایەتی یەکەی خۆی، ئەو خوایەتی یە شتێکی پڕو پووچ و ناڕەوا بوو. بەڵێ بەڕاستی وەڵامەکەی پشت شکێنی فیرعەون بوو، بەهۆی ئەوەوە نەیتوانی بێ دەنگ بێت لە کاتێك دا کە کۆمەڵی پیاو ماقوڵان بە دەوری دا بوون، بەهۆی ئەوەوە بە لاقرتی پێ کردنەوە موسای لەکەدار کرد بە شێتی و ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرۡسِلَ إِلَيۡكُمۡ لَمَجۡنُونٌ﴾ بەڕاستی پێغەمبەرەکەتان کە رەوانە کراوە بۆ لاتان بێگومان شێتە، بە لاقرتی و گاڵتە پێ کردن ئەوەی وت بۆ ئەمەی وا نیشان بدات کە پێغەمبەرێتی لە خۆی دا شتێکیراست نی یە، کەواتە باوەڕی پێ نەکرێ و بە شت سەیر نەکرێ، موسایشی لەکەدار کرد بە شێتی تا قسەکانی کار نەکات لێ یان، بەڵام ئەو لاقرتی و چەنەبازی یە کار ناکات لە موسا و بەرگری ناکات لە ڕۆیشتنی بە ڕێگا راستەکەی خۆی دا، لەبەر ئەوە لەسەر قسەی خۆی ڕۆیی و ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿رَبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ وَمَا بَيۡنَهُمَآ﴾ خوای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە و هەرچی وا لە نێوانیان دا، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دوو پێشانگای گرنگن هەموو ڕۆژێ ئەکەونە پێش چاو و هەڵاتن و ئاوابوونی خۆر دوو رووداوی ئێجگار گەورەن، نە فیرعەون و نە هیچ ستەمکارێکی تر ناتوانن بڵێن بە هیچ رەنگ دەسەڵاتیان تیای دا هەیە، کەواتە هیچ چارە نی یە بۆ هەرکەس ژیریی هەبێ ئەبێ بڵێ: خوای پەروەردگاری ئەم بوونەوەرە ئەو دوو رووداوە گرنگە فەراهەم ئەهێنێ بێ گۆڕان و وەستان و پەك کەوتن و دوا و بەر،

بەڵکو بەو یاسا و رژێمە سەر سوڕهێنەرە و هەرکەس خاوەنی ژیریی بێت ئەبێ هەر ئەو قسە و بڕیارە راستە بدات وەکو ئەفەرمویێ: ﴿إِن كُنتُمۡ تَعۡقِلُونَ﴾ ئەگەر ئێوە ژیرن ئەزانن کە کارەکە بەو جۆرەیە کە وترا، ئەزانن کە ئەمە وەڵامێکی رێك و راستە بۆ ئەو پرسیارەی فیرعەون کردی، واتە هەرکەس وا نەزانێ ئەو کەسە بێ بەشە لە ژیریی بە پێی بڕیار و شایەتی قورئان. زۆر دارە ستەمکارەکان مەترسی یان لە هیچ شتێ نی یە بەو رادەی مەترسی ئەکەن لە بێدار بوونەوەی گەل، هۆش کردنەوەی دڵی گەل، رق و کینەیان لە هیچ کەس نی یە بە ئەندازەی رق و کینەیان لەوانەی کە بانگی خەڵکی ئەکەن بۆ تێگەیشتن و وریا بوونەوە و دەروونە بێ هۆش و بێ ئاگاکان رائەوەشێنن لە خەوی بێ ئاگایی هەڵیان ئەسێنن، جا لەبەر ئەوە فیرعەون هەڵپەڕی لە موسا(علیه السلام) کاتێ کە بینی ئەوا خەڵکی وریا کردەوە و خەریکە هۆشیان پێ ئەکاتەوە، بەهۆی ئەوەوە لێکۆڵینەوەی واز لێ هێنا، و کۆتایی پێ هێنا بە هەڕەشەیەکی رەق و بێ پێچ و پەنا کە ئەوەیش باوی هەموو سەرکێشە مل هوڕەکانە کاتێ کە پەکیان کەوت و هیچ شتێکیان بە دەستەوە نەما و مل هوڕی و سەرکێشی یەکەیان کەوتە مەترسی و خەتەرەوە، ئەو نەفرین لێ کراوە بە بێ شەرمانە رووی کردە موسای پێغەمبەر(علیه السلام)، ﴿قَالَ﴾ وتی پێی: ﴿لَئِنِ ٱتَّخَذۡتَ إِلَٰهًا غَيۡرِي لَأَجۡعَلَنَّكَ مِنَ ٱلۡمَسۡجُونِينَ﴾ سوێندم وا بێ ئەگەر تۆ هیچ پەرستراوی تر بڕیار بدەیت بێجگە لە من بێگومان من تۆ ئەگێڕم بە یەکێ لە بەند کراوەکان و بەندت ئەکەم، کە بەند کردنی ئەو بەناوبانگ بووە و لە کوشتنی خراپ تر بووە، ئەگێڕنەوە هەرکەسی بەند کردبێ بەرەڵای نەکردووە هەتا بە سزاوە مردووە، بەتەنیا ئەیخستە ژێر زەمینێکی قوڵی تاریك هیچ شتێکی نەئەبینی و گوێی بە دەنگی کەسەوە نەئەبوو. ئەو هەڕەشەیە نیشانەی دەستە پاچەیی بووە بەرامبەر ئەوەی موسا(علیه السلام) رایگەیاند، بەڵگەیە لەسەر لاوازی بەتاڵ لە ئاستی راستی دا، لە کۆن و تازەوە زۆردار و سەرکێشەکان باویان هەر وا بووە کە هیچ یان بەدەستەوە نەما هەڕەشە و ئاسن و ئاگر و کوشتن و بڕین بەکار ئەهێنن. بەڵام هەڕەشە و تاپاڵی فیرعەون هیچ کاری نەکرد لە موسای پێغەمبەر(علیه السلام) هەرچۆنێ هەڕەشەی هیچ سەرکێشێ تریش کاری نەکرد و نایشی کات لەوانە کە خواناسی راستەقینەن،

قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَيْءٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾ قَالَ فَأْتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿٣٢﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّـٰظِرِينَ ﴿٣٣﴾

لەبەر ئەوە لەبارێ ترموە خەریك بوو لەگەڵ فیرعەون و ﴿قَالَ﴾ پێی فەرمو: ﴿أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَيْءٍ مُّبِينٍ﴾ ئایا ئەوەم هەر دەربارە ئەکەیت ئەگەر شتێکی روونت بۆ بهێنم، واتە یا موعجیزەیەکی روونت بۆ بهێنم کە رابەرو بەڵگەیەکی ئاشکرا بێت لەسەر پێغەمبەرێتی یەکەم، تۆ هەر بەندم ئەکەیت؟ بەم فەرمودەیە فیرعەونی تەنگەتاو کرد لە پێش چاوی ئەو گەل و کۆمەڵەی کە بە دیارەوە بوون، ئەگەر گوێی نەدایە بە قسەکەی دەرئەکەوت کە بیم و ترس هەیە لەو بەڵگەو نیشانەیە، موسایش وا پیشان ئەدات کە شێتە، کەواتە ناچار بوو کە داوای ئەو موعجیزە و بەڵگەیەی لێ بکات، لەبەر ئەوە: ﴿قَالَ﴾ وتی بە موسا: ﴿فَأْتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ﴾ دەی ئەو شتە بێنە ئەگەر تۆ لە راست گۆیانی، واتە ئەگەر راست ئەکەیت لەو داوای پێغەمبەرێتی یە کە ئەیکەیت، یان راست ئەکەیت کە رابەرو بەڵگەی روونت هەیە، ئەو ئەفرین لێ کراوە بەهەموو جۆر هەر پلار ئەوەشێنێ، ئەوەتا هەر گومان و دوو دڵی دەرئەبڕێ لێرەیش دا و ئەی وت: ئەگەر راست ئەکەیت، ئەوەك بەڵگە و موعجیزەکەی بە گرنگ بگرن و کاریان لێ بکات. ئینجا لێرەدا موسا دوو موعجیزەی نیشان دا، دوای خست تا ئەو کاتەی فیرعەون بگاتە ئەوپەڕی ملەجەڕێ و سەرکێشی: ﴿فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ﴾ ئینجا موسا دار دەستەکەی فڕێ دا کەچی دەست بەجێ بوو بە ئەژدیهایەکی روون و ئاشکرا، نەك بە شتێکی خەیاڵی وەکو کردەوەی جادووگەران، چاوبەس ئەکەن و بێ ئەمەی شتێکی راستەقینە بێت. ﴿وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّـٰظِرِينَ﴾ دەستی کرد بە ژێر باڵی دا و دەری هێنا ئیتر دەست بەجێ بوو بە دەستێکی سپی شوعلە و بریقە دار بۆ تەماشا کەرانی، ئەگێڕنەوە لە ئیبن و عەباسەوە – خوایان لێ رازی بێت – کە ئەفەرموێ: موسا دەستی لە ژێر باڵی دەرهێنا و کوت و پڕ بریقەی ئەدایەوە بۆ تەماشاکەران، تیشك و رووناکی یەکی بوو بە وێنەی خۆر نزیك بوو ئاو و رووناکی چاو ببا، و کەنارەی ئاسمانی پڕ کرد. هەرکەس باوەڕی دامەزراو بێ بە خوایەتی خوا و ژێر بێت

هەرگیز سەرناکاتەوە لەو جۆرە موعجیزانە، چونکە خوا کە توانا و دەسەلاتی بێ سنوورە و ئەم زەوی و ئاسمانەی دروست کردووە و دای هێناوە و لە هیچ و بێ ئەمەی هیچ بووبن ئیتر بۆ ئەبێ سەر بکرێتەوە لەوە کە دارێکی وشك بکات بە مارێکی گیاندار؟ هەموو کەس ئەزانێ کە ئەم هەموو گیان لەبەرە لە بنەڕەت دا بێ گیان بووە و خوا گیانی کرد بەبەردا، هەرچی گیان لەبەری ئەم زەوی یە هەیە لە پێشەوە خاکێکی وشکی بێ گیان بووە، کەواتە بۆ ئەبێ سەر بکرێتەوە لەوە دار دەستێکی وشك ببێ بە گیاندار؟ ئەم هەموو شتی رووناکە لە بنەڕەت دا رووناکی نەبوو خوا رووناکی تێدا دروست کردووە، دەی بۆ ئەبێ سەر سوڕ بمێنێ لەوەی خوا رووناکی دروست بکات لە دەستی موسادا؟ ئەم هەموو تیشك و رووناکی یە بەهێزە خوا بەهۆی باتری یەوە دروستی ئەکات کە هەموو کەرەسەکانی لەم خاکە تاریکە دروست کراون، کەواتە بۆ ئەبێ سەر سوڕ بمێنێ لەوە خوا لە دەستی موسادا ئەو رووناکی یە دروست بکات. لەشی هەموو ئادەمی بەشێ لە کارەبای تیایە تا ئەگاتە ئەو رادەیە گلۆپێکی(٤٠) واتی پێ دابگیرسێ، کەواتە بۆچی سەر سوڕ بمێنێ لەوەی ئەو رووناکی یە دەرکەوێ لە دەستی موسادا، ئەو هەموو موعجیزە ماددیانەی کە دراون بە پێغەمبەران – درودی خوایان لێ بێت – هەروەها هەر جۆرە موعجیزەیەك کە بێ بڕواکان پەلپیان پێ گرتووە لە پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ) هیچ کام لەوانە نایاب تر نین لەم هەموو دروست کراوانەی کە وان بە پێش چاومانەوە و لە چوار چێوەی ئەمانە دەرنەچوون کە خوا ئەو هەموو هێزو وزەی دروست کردووە و کەرەسەکانی فەراهەم هێناوە، بەلاَم لەسەر لە هیچ شتێ لەمانە ناکرێتەوە بەهۆی ئەوەوە کە ئولفەت و دەقیان پێوە گیراوە و فەراهەم هاتنەکەیشیان لەسەر پەلپ و داوای خەلکی نی یە، مەبەست پێ یان دەم کوت کردن و پەك خستن و روون کردنەوەی دەستە پاچەیی خەلکی نین، کەواتە سەر لەم هەموو دروست کراوانە ناکرێتەوە، بەلاَم موعجیزەکان شتێك بوون تازە پەیدا بوون بە پێش چاوی مەردومەوە و دەق پێوە نەگیراو بوون و مەبەست پێ یان دەم کوت کردن و دەرخستنی دەستەپاچەیی خەلکی بووە بەهۆی ئەوەوە جێگای سەر سوڕمان و سەر لێ کردنەوەن و کاریگەرن. بۆ وێنە ئەو دوو موعجیزەی کە موسا دای بەناوچاوی فیرعەون دا کاری لێ کرد و هەستی کرد بەوە کە زۆر گرنگ و بەهێزن،

قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا
تَأْمُرُونَ ﴿٣٥﴾ قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٣٦﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ
﴿٣٧﴾ فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ لِمِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٣٨﴾ وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ ﴿٣٩﴾ لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ
إِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤٠﴾

---

**لەبەر ئەوە چەسپانی کرد بۆ بەرگریی کردنیان لە سێ ڕێگاوە:**

**١.﴿قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ﴾ وتی بەو کۆمەڵە پیاو ماقوڵەی کە بە دەوری دا بوون ﴿إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ﴾ بەڕاستی و بێگومان ئەمە جادوگەرێکی زۆر زانایە، واتە ئەمەی کە پێی هەڵسا و کردی جادووە و بە جادوبازی کردی وەکو ئەو هەموو جادو بازانە، لەو ڕێگایەوە نی یە کە خۆی ئەیڵێت و ئیدیعای ئەکات.**

**٢.هان و هونی دان و غیرەتی هێنانە جۆش بەمەی کە موسا نیازی خراپە لەگەڵیان، بۆ ئەمەی سەرکێشی بەکار بێنن و گوێ یان نەبێ لە موعجیزەکانی، وتی پێ یان: ﴿يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ﴾ ئەیەوێ دەرتان کات لە خاکەکەی خۆتان بە جادوبازیی خۆی.**

**٣.دڵی کۆمەڵەکەی ڕائەکێشا بۆلای خۆی بە بەکار هێنانی نەرمی لەگەڵیان و مەراییی بۆ کردنیان، بەم جۆرە راوێژو پرس و رای لێ وەرئەگرتن و پێی ئەوتن: ﴿فَمَاذَا تَأْمُرُونَ﴾ کەواتە ئایا چ فەرمانێکم پێ ئەسپێرن و پێم بڵێن چی بکەم و راتان لەسەر چی یە رایگەیەنن پێم؟ گرنگی و گەورەیی موعجیزەکان داگیری کرد تا رادەیەك لە داوای خوایەتی هێنایە خوارەوە بۆ ئەمەی فەرمان و پرس و را لەو گەلە وەربگرێ کە چەند ساڵ بوو بەناوی خوایەتی ئەیخوڕی بە ملیان دا و ئەوانیش ژێر بار و مل کەچ بوون و کڕنووشیان بۆ ئەبرد و خاوەنی خۆیشیان نەبوون لە ئاستی!!**

**باوی زۆرداره مل هوڕە داگیر کەرەکان هەر وا بووە و هەر وایە: کاتێ کە هەستیان کردبێ بەمەی خەریکە جێگایان پێ لەق ببێ دەست ئەکەن بە قسەی نەرم و شیرین لەپاش ئەوەی**

توندو تیژ و قسە رەق بوون، و پەنا ئەهێنن بە گەل و زێر دەستە، لەپاش ئەوەی پێشێل و زێر پێ یان ئەکردن، بە روالّەت لە کار و فرمان دا پرس و رایان لێ وەرئەگرن کە لەوەو پێش جگە لە ئارەزوو و رای خۆیان هیچ کەس لە هیچ شوێنێکەوە دەرنەئەکەوت و ئەوەش هەموو تا ئەو کاتەیە بیم و ترسیان نامێنێ، ئینجا دوای ئەوە ئەگەڕێنەوە سەر تاوان و دەست درێژیی و ستەمکاری خۆیان، بەو فڕو فێڵە کۆمەڵەکەی هەڵخەڵەتاند لەوەی گوێ بدەن بەو موعجیزانە و لە ئایین و ڕێگاکەی لابدەن، ئەوانە هەرچۆنێ هاوبەشی فیرعەون بوون لەو ئایینە پڕو پووچەدا، هەروەها بەرژەوەندی خۆیان لەوەدا ئەبینی کە فیرعەون هەر فیرعەون بێت و ئەوانیش پیاو ماقوڵی دەرو بەری بن، مەترسیان ئەکرد کە موسا و بەنی ئیسرائیل کۆمەك و دەستە بەستەیان زۆر ببێ و بەهۆی ئەوەوە ولاّتەکەیان لێ داگیر بکەن.

رای خۆیان لەسەر ئەمە دەربڕی کە بەرگری جادوی موسا بکات بە جادویەکی وێنەی جادوەکەی خۆی،﴿قَالُوٓاْ ﴾ وتیان بە فیرعەون: ﴿أَرۡجِهۡ وَأَخَاهُ وَٱبۡعَثۡ فِي ٱلۡمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴾ مۆڵەتی موسا و براکەی بدە و کاریان دوا بخە و بنێرە بەناو شارەکان دا چەند پیاوێ کە کۆکەرەوە بن بۆ جادووگەرەکان ﴿يَأۡتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٖ ﴾ ئەگەر ئەوەت کرد هەموو جادوبازێکی لێ هاتووی زۆر زانات بۆ ئەهێنن، فیرعەون راکەی وەرگرتن و ناردی بە شارەکان دا بۆ کۆکردنەوەیان، ﴿فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ لِمِيقَٰتِ يَوۡمٖ مَّعۡلُومٖ ﴾ ئینجا ئەو جادوبازانە کۆکرانەوە لە کات و ساتی رۆژی زانراوی دیاریی کراودا، کە کاتی چێشتەنگاو بوو لە رۆژی جەژنێکیان دا ﴿وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلۡ أَنتُم مُّجۡتَمِعُونَ ﴾[1] بێژرا بە خەڵك ئایا ئێوە کۆن، واتە بێ دواکەوتن و بە چەسپانی کۆببنەوە، ﴿لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُواْ هُمُ ٱلۡغَٰلِبِينَ ﴾ واتە بە ئومێد و چاوەڕوانی زاڵ بوونی جادووبازەکان و ئێمەش شوێنی ئەوان بکەوین لە ئایینەکەیان دا ئەگەر هەر ئەوان زاڵ بوون، مەبەستیان بەوە شوێن نەکەوتنی موسا بوو، بەلاّم بەو جۆرەیانوت لەبەر هاندانی جادوبازەکان کە زۆر کۆشش بکەن و کارەکەیان زۆر بە گرنگ بگرن.

---

[1] مەبەست لەم پرسیارە هاندانە لەسەر کۆبوونەوە بە چەسپانی بە بێ سستی بەکار هێنان.

فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالُوا۟ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤١﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٤٣﴾

**﴿ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ﴾ ئینجا كاتێ جادووبازەكان هاتن ﴿ قَالُوا۟ لِفِرْعَوْنَ﴾ وتیان بە فیرعەون ﴿ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ﴾ ئایا بێگومان بۆ ئێمە ئەجرو پاداشت هەیە ئەگەر ئێمە زاڵ ببین ﴿ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ﴾ لە وەڵامیان دا فیرعەون وتی: بەڵێ ئەجرو پاداشتتان هەیە، و سەرباقی ئەوە ئەو كاتە ئێوە لە ڕیزی ئەوانەن كە نزیك خراونەتەوە لە ئێمە. ئا بەو جۆرە هەڵوێستی كۆمەڵێكی بەكرێ گیراو ڕوون ئەكاتەوە كە فیرعەونی ستەمكار بەكاری ئەهێنان بۆ مەبەستی ناڕەوای خۆی، هەموو لێ هاتن و لێ زانینی خۆیان بەخت بكەن لە پێناوی پول و پاداشت كە چاوەڕوانی ئەكەن، ئیتر هیچ پەیوەندی یان نی یە بە عەقیدە و باوەڕ و مەسەلەكەوە، هیچ شتێكیان نی یە جگە لە كرێ و بەرژەوەندی خۆیان، وێنەی ئەوانەن كە زۆردارو ستەمكارەكان بەكاریان ئەهێنن بۆ خزمەتی خۆیان لەهەموو چەرخ و لە هەموو وڵاتێك دا هەر بوون و هەر هەن، ئینجا دێتە سەر نیشانی دانی شێوەی - مسابقة - و گۆڵ كۆڵێنەكەی ئەم دوو تاقمە: وەكو لە شوێنی تردا باسی ئەفەرموێ: لە یەكەم جارەوە جادووگەرەكان وتیان بە موسا پێغەمبەر(علیە السلام) یان تۆ لە پێشەوە ئەوەی ئەتەوێ بەكاری بێنی بەكاری بێنە، یان ئێمە لە پێشەوە بەكاری ئەهێنین ﴿ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ﴾ موسا فەرمووی پێ یان: ﴿أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ﴾ ئەوەی ئەتانەوێ فڕێ ی دەن و بەكاری بێنن ئێوە لە پێشەوە بیكەن و فڕێ ی دەن، مەبەستی موسا فەرماندان و ڕەزامەندی نی یە لە جادووگەریی، چونكە جادووگەریی قەدەغەیە و گوناهو تاوانێكی زۆر گەورەیە بەلای خواوە، بەڵكو مەبەستی ئیزن دان و ڕەزامەندی یە بە پێش خستنی كردەوە و جادووبازی یەكەیان، كەواتە فەرمودەكەی موسا هیچ ڕەخنەیەكی لەسەر نی یە،**

فَأَلْقَوْاْ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُواْ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ
تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿٤٥﴾

---

**﴿ فَأَلْقَوْاْ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ ﴾ ئینجا جادووگەرەکان گوریس و حەبل و دار دەستەکانی خۆیانیان فڕێ داو ﴿وَقَالُواْ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾ وتیان: سوێند بە هێزو دەسەڵاتی فیرعەون بێگومان هەر ئێمە زاڵ و سەرکەوتوین، بەو جۆرە سوێندیان خوارد لەسەر زاڵ بوونیان لەبەر ئەوە جادووەکەیان ئێجگار گەورە و سەر سوڕهێنەر بوو، ئەگێڕنەوە کە شیو و دۆڵێکیان پڕ کردبوو لە گوریس و حەبل و دار دەست کە هەموویان هەنووی بە جیوە، داردەستەکان کلۆر بوون و ناوەکەیان پڕ کردبوو لە جیوە، ئینجا کاتێ گەرمی خۆریان لێ کەوت بە جارێ هەموو کەوتنە جوڵان و بزووتنەوە لە پێش چاو وەکو مارو ئەژدیها لە هەموو لایەکەوە ئەکشان. بەڵام شتی ناڕاست و بەتاڵ بۆش و پووچە، هەرچەندە گف بکاتە خۆی و بە رواڵەت قەڵەو و قەبارەی گەورە بێت، ئەوەتا ئەو هەموو چاو بەس و فڕو فێڵی ئەوانە بەجارێ لەناوچوو، دروشمیشی نەما، وەکو بەم فەرمودەیە نیشانمان ئەدات: ﴿ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴾، ئینجا موسا دار دەستەکەی فڕێ دا ئیتر دەست بەجێ ئەوەی ئەوان بە فێڵ و تەڵەکە وەریان گێڕا بوو و لەپێش چاو وێنەی مارو ئەژدیهای بەسەردا هاتبوو، ئەو دار دەستە بە جارێ هەموو ئەوانەی هەڵ لووشی. شتێکی ئێجگار گەورە ڕووی دا کە هەموو جادوگەرەکانی سەرسام کرد و هەرگیز چاوەڕوان نەبوون بۆی و بە دڵیان دا گوزەری نەئەکرد، چونکە ئەوان بەلای خۆیانەوە هیچیان نەهێشتووەتەوە و شتێکیان فەراهەم هێناوە کە تا ئێستا هیچ جادوگەرێك نەیکردووە. ئەوانە کۆمەڵێکی زۆرن کۆکراونەتەوە لە هەموو لایەکی وڵاتەوە، موسا تەنیا خۆیەتی و دار دەستەکەی، ئینجا بە پێش چاویانەوە ئەو گۆچانە بوو بەو ئەژدیها گەورە و ئەوەی کردی کە کردی، ئەوان تا ئێستا جادویان وا دیوە چاوبەس و شتێکی خەیاڵی یە، بەڵام ئەمەی لەم دار دەستە دی یان شتێکی ڕاست و حەقیقەت بوو، ئەوەتا نە حەبل و گوریسەکان مان و نە دار دەستەکانیان، ئەگەر ئەوەی موسا کردی جادوبازی بوایە ئەبوایە هەر هیچ نەبێ حەبل و دار دەستەکانیان بمایەتەوە، ئینجا کە شتەکەیان بۆ ڕوون بوویەوە هیچ خۆیان پێ نەگیرا و مل کەچ بوون بۆ خوا و سوژدەیان بۆ برد،**

فَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿٤٦﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿٤٨﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ

---

وەكو ئەفەرمویٚ: ﴿ فَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ﴾ ئینجا جادوگەرەکان کەوتن بە روودا بە سوژدە بردنەوە بە هۆی ئەو موعجیزە گەورەی کە خۆیان پیٚ نەگیرا وەکو بە زۆر ناچار کرابن و خرابن بە روودا لە کاتیٚک دا ﴿قَالُوٓاْ﴾ وتیان: ﴿ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ ئەوا باوەڕمان هیٚنا بە پەروەردگاری هەموو جیهان. ﴿رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ﴾ کە پەروەردگاری موسا و هارونە، واتە ئەو موسا و هارونەی کە بانگی خەڵکی ئەکەن بۆلای پەروەردگار ئەوا بەهۆی ئەو موعجیزەی ئەوانەوە ئیٚمە باوەڕمان هیٚنا. ئەو جادوگەرانە تا ئەو کاتە بەکریٚ گیراوی فیرعەون و چاوەڕوانی پاداشتیان لەو ئەکرد، خاوەن عەقیدە و باوەڕ نەبوون، بەڵام هیٚزو رووناکی راستی دای لە دڵیان و بەجاریٚ گۆڕینی و رەشی و تاریکی کوفرو جادوگەریی لەسەر لابردن و خستنی بە روودا بە سوژدە بردن و وشەی بەفەڕی باوەڕی بەدەما هیٚنان بە روون و رەوانی. ئا بەو جۆرە ئەو کۆمەڵە گەورەیە کە جادوگەر و بەکریٚ گیرا بوون بە جاریٚ گۆڕان و بوون بە کۆمەڵیٚ لە هەڵبژیٚرراوی باوەڕداران، بە پیٚش چاوی ئەو جەماوەرە گەورەیەوە، بە پیٚش چاوی فیرعەون و هەموو پیاو ماقوڵەکانی یەوە، بیریان نەکردەوە لە دوا رۆژی خراپی ئەو باوەڕەی کە ئاشکرایان کرد و وەکو تیریٚکی ژاراوی گرتیانە ناوچاوی فیرعەون و کۆمەڵەکەی. هیچ گویٚ یان نەبوو لەوەی چی ئەکات و چی ئەڵیٚ. بیٚگومان ئەو گۆڕان و ئینقلابی ئەوانە هەورە تریشقەیە بوو بۆ سەر فیرعەون و کۆمەڵەکەی، چونکە ئەو هەموو خەڵك و جەماوەرە کۆکراوەتەوە بەناوی ئەمەوە کە موسای ئیسرائیلی کە تا ئیٚستا گەلەکەی ژیٚر دەستە و خزمەتکار بووە، ئەیەویٚ بە جادوبازی ببیٚ بە کاربەدەست و خاوەنی وڵات و ئەوان دەرکات، ئەم جادوگەرانە کۆکراونەتەوە بۆ ئەمەی یەکی موسا بخەن لە جادوبازی، بیٚگومان بوون کە ئەمان زاڵ ئەبن بەسەر موسادا، کەچی لە پڕیٚك دا هەموو مل کەچ بوون و باوەڕیان هیٚنا و شویٚنی موسا کەوتن، ئاشکرایە کە ئەو رووداوە تەخت و کۆشکی فیرعەون ئەهیٚنیٚتە لەرزە، چونکە لە ریٚوە ئەدا لەو ئەفسانە ئایینی یەی کە ئەو تەختەی لەسەر دامەزراو راگیر بوو، ئەفسانەی خوایەتی، جادوبازیی زۆر گرنگ و بەریٚزە لە دەروونی خەڵك

دا، کاروباری ئەو ئایینە پڕو پووچە و ئەو عیبادەت خانانە بە دەست جادوگەرەکان بوو، کەواتە ئەو ئایینە پڕو پووچە و پەرستنی فیرعەونەکان لەسەر شانی ئەو جادو گەرانە راگیرە، دەی کاتێ کە جادوگەرەکان هەڵگەڕانەوە لەو ئایینە پڕو پووچە و بوون بە خواپەرست و پەرستنی فیرعەونیان لە خۆیان داڕنی ئیتر ئەبێ چی بمێنێتەوە بۆ پاڵپشتی تەختی فیرعەون جگە لە هێز و زۆر؟ هێزو زۆریش بە تەنیا بە بێ عەقیدە و باوەڕ هیچ عەرش و تەختێ راگیر ناکات و هیچ حوکمێ پارێزگاریی ناکات، جا لەبەر ئەوە فیرعەون هاتە جۆش و هەڵگیرسا، کەواتە ئەبێ ناچار ببێ بەم هەڕەشە بەتینە لەپاش ئەوە ویستی کە لەکەداریان بکات بەمەی کە لەگەڵ موسادا یەک کەوتوون لەسەر پیلان گێڕیی دەربارەی فیرعەون و گەلەکەی، ﴿قَالَ﴾ فیرعەون وتی بە جادوگەرەکان: ﴿ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ﴾ ئایا مل کەچ بوون بۆ موسا و باوەڕتان پێ هێنا پێش ئەمەی من ئیزنتان بدەم؟ واتە ئەبوایە بە بێ پرس و ئیزنی من شتی واتان نەکردایە، چونکە تەنیا من کاربەدەست و بڕیار دەرم بۆ ئێوە و ئەبێ گوێ رایەڵ بن بۆ من. لەپاش ئەو تەشەرەی لێ ی دان ئینجا وا نیشان ئەدات کە بە پیلان ئەو باوەڕەیان هێنا و وتی: ﴿إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ﴾ بەڕاستی موسا مامۆستا گەورەکەتانە کە فێری جادوی کردن، کەواتە ئەو باوەڕ هێنانە بە فێڵ و پیلانێ بوو کە لە نێوان خۆتان دا یەک کەوتن لەسەری، مەبەستی ئەوەبوو بەو پڕو پاگەندەیە سەر تێک بدات لەو خەڵکە، با نەزانن کە باوەڕ هێنانی جادوبازەکان لە رووی زانین و تێگەیشتنەوە بوو، بەهۆی ئەوەوە بوو کە ئایینی راستیان بۆ دەرکەوت، بەڵام بەڕاستی پڕوپاگەندەکەی فیرعەون زۆر بێ سەر وپێ و بێ جێ بوو، چونکە شتێکی ئاشکرا بو کە ئەو جادوبازانە لە پێش ئەو رۆژەدا کۆنەبوونەتەوە لەگەڵ موسادا، بە دوژمنایەتی و نیازی بەرگری موسا لەماڵی خۆیان هاتن، موسا بە رواڵەت هیچ زۆر و دەسەڵاتێکی لە دەست دا نەبوو، بەڵکو زۆر و دەسەڵات لەو رۆژەدا تەنیا لای فیرعەون ئەبینرا، کەواتە ئەبێ بە چ هۆیەک ئەوانە دەست لە فیرعەون هەڵگرن بۆ موسا و لایەنگری ئەو بن؟!! بەڵێ هەڵنەگرێ کە هەندێ لەو جادوگەرانە موسایان دیبێ کاتێ کە لەماڵی فیرعەون دا بوو و بە کوڕی ئەو دائەنرا، تەمێ و پەروەردەی موسا درابێتە دەستی ئەوان و ئەوان پێ یان گەیاندبێ، جا فیرعەون ئەوەی گرتبێ بە دەستەوە و بەڵام بارەکەی گۆڕی بێ بەم رەنگە لەباتی بڵێ: موسا قوتابیانە وتی مامۆستا و گەورەتانە بۆ چاو و راو کردن لەو جەماوەرە و چەسپاندنی مەبەستەکەی خۆی.

فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ۚ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَافٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٩﴾ قَالُوا لَا ضَيْرَ ۖ إِنَّا إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿٥٠﴾

---

**ئینجا دەستی کرد بە هەڕەشە ناڕەواکەی وتی: ﴿فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ بێگومان لەمەوپاش ئەزانن چیتان بەسەر دێت و ئەزانن تۆڵەی کردەوەکەتان چی ئەبێ؟ لە پێشەوە بە نادیاریی وتی، ئینجا روونی کردەوەو وتی: ﴿لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَافٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ بێگومان دەستی راستی هەموو یەکێکتان ئەبڕم لەگەڵ قاچی چەپی دا، هەمووتان هەڵئەواسم. وشە و بڕیاری هەموو زاڵمێکی ستەمکار بەم جۆرەیە کاتێ هەستی کرد بەمە تەختەکەی کەوتووەتە لەرزە و بیمی پەیدا کرد لە پادشایەتی یەکەی، شتی ئاوا ئەڵێت و ئەیکات، بە بێ ویژدان و بەزەیی... بە پێی ئەو باو و یاسایە فیرعەون ئەو وشە و بڕیارەی دەرکرد کە هەرچی بکوتایە توانا بوو بەدی بێنێ... ئینجا با بزانین وشە و بڕیاری ئەو تاقمە چۆن بوو و چی بوو کە دڵ و دەروونیان رووناکی باوەڕیان وەرگرت!! بێگومان وشە و بڕیاری ئەمان لە دڵ و دەروونێکەوە هەڵئەقوڵێ کە خوای خۆی ناسیوە و دەستی کەوتووە، کەواتە لەپاش ئەوە گوێی لە هیچی تر نی یە. لە دڵ و دەروونێکەوە دێت کە بە تەمای گەیشتنە بە ناز و رێزی نەبڕاوەی رۆژی دوایی، کەواتە چ باکی هەیە لە دەست دەرچوونی هەموو ئەم جیهانە، ﴿قَالُوا لَا ضَيْرَ﴾ وتیان هیچ زیانێك نی یە بۆ ئێمە، هیچ زیانێك نی یە لە بڕینی راست و چەپمان دا، هیچ زیانێ نییە لەهەڵواسین و سزادانمان، هیچ زیانێ نی یە لە کوشتن و شەهید بوونمان دا، ﴿إِنَّا إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ﴾ چونکە بەراستی ئێمە ئەگەڕێینەوە بۆلای پەروەردگارمان، کەواتە هەرچیمان بەسەر بێنێ بە خێرو چاکە دەرئەچێ، چونکە ئەبێتە هۆی رەزامەندی خوا و پاداشتی گەورەی خوا، یان مەبەست ئەوەیە: کە بەهەر جۆر ببێ پاشە رۆژ و چارەنووسمان مردنە، کەواتە باکمان نی یە چی ئەکەیت بیکە، لەم جیهان و زەوی یەدا چی ئەبێ با ببێ،**

﴿إِنَّا نَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە ئومێد و چاوەڕوانی ئەکەین کە خوای ئێمە گوناهو تاوانەکانمان بسڕێتەوە و ببورێ لێمان، لەبەر ئەوەی ئێمە لەم چەرخەدا بوین بە یەکەمی باوەڕداران و پێش کەوتین لە هەموو تاقمی بێ بڕوایان. ئای هاوار بۆ خوا لە گەورەیی و شیرینی باوەڕ کاتێ کە ڕووناکی خستە ناو هەست و دەروون و پێت و فەڕی ڕشت بەسەر ڕۆح و گیان دا و ئارامی و هێمنی خستە دڵ، کاتێ کە ئەم ئادەمی یە کە لە خۆڵ دروست کراوە بەو جۆرە پاکی بکاتەوەو بیگەیەنێ بە پۆپەی هەرە بەرز لە هەموو بەرزێ بەرزتر، کاتێ کە هەموو گیانی باوەڕدار پڕ بکات لە دەوڵەمەندی و فراوانی و چاوتێری، بەجۆرێ هەرچی وا لەم جیهانەدا کەم و کوڕ و بێ نرخ ئەبێ لە پێش چاوی. ئینجا لەپاش ئەوە موسا و هارون و بەنی ئیسرائیلی ژیان لە میسرا ماوەیەکی درێژ هەر لە بەر بەرەکانێ دا بوون لەگەڵ فیرعەون و گەلەکەی دا، چەند موعجیزەو نیشانەیەکی روونی تر رووی دا لەسەر دەستی موسادا وەکو لە سورەتی ﴿الأعراف﴾ دا باسی فەرموو، بەڵام لێرەدا باسی ئەوانە ناکات و ئەمانە هەموو ئەپێچێتەوە و ئەگات بەوەی کە لێرەدا مەبەستە کە ئەوەش بریتی یە لە زاڵ کردنی ئاینی خوا و باوەڕ داران و لەناو بردن و سەرە و ژێر کردنەوەی کوفر و کافران. خوای گەورە سروشی کردە لای موسا(علیه السلام) کە خۆی و باوەڕ داران بە شەو دەرچن لەو وڵاتە و بەرە و قەراخی دەریا بڕۆن — کە وا گومان ئەبرێ ئەوەش بریتی بووە لە شوێنی تێك ڕژانی کەنداوی سوێس لەگەڵ ناوچەی دەریا بچووکەکان دا —. هەواڵی دایە کە فیرعەون و لەشکرەکەی دوایان ئەکەون بۆ دەست گیر کردن و ژێر دەست کردنیان، جا فەرمانی دا بە شەو دەرچن تا دوور بکەونەوە و بەیانی فیرعەون و لەشکرەکەی پێ یان زانین و هاتن بەدوایان دا پێ یان ناگەن تا خوا ئەمان لە دەریاکە ئەپەڕێنێتەوە و ئینجا فیرعەون و لەشکرەکەی نوقم بکات لەو دەریادا وەکو لە چەند شوێنی تردا باس کراوە و بەناوبانگە،

وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَسۡرِ بِعِبَادِيٓ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٥٢﴾ فَأَرۡسَلَ فِرۡعَوۡنُ فِي ٱلۡمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ
هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرۡذِمَةٞ قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمۡ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ ﴿٥٦﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَسۡرِ بِعِبَادِيٓ﴾ سروشمان کردە لای موسا کە شەو ڕەوی بکە بە بەندە باوەڕ دارەکانم و بە شەو دەریان بکە ﴿إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ﴾ چونکە فیرعەون و کۆمەڵەکەی دێن بە دواتان دا، بە پێی فەرمانی خوا موسا(علیه السلام) بەشەو دەرچوون و کاتێ ڕۆژ بووەوە و فیرعەون زانی بە دەرچوونیان فەرمانی دا بە کۆکردنەوەی لەشکر بە شێوەیەك کە پێی ئەوترێ:(نفیر عام) وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَأَرۡسَلَ فِرۡعَوۡنُ فِي ٱلۡمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ﴾ ئینجا فیرعەون چەند کەسێکی کۆکەرەوەی نارد بە شارەکان دا بۆ کۆکردنەوەی لەشکر، ئەو لەشکرە گەورەیان کۆ کردەوە، بەڵام کۆکردنەوەی ئەو کۆمەڵە گەورەیە وا نیشان ئەدات کە موسا و کۆمەڵەکەی زۆر بەهێزن، فیرعەون بێ ئارامە و ترس و بیم داگیری کردووە، کەواتە ئەبێ دڵی لەشکرەکەی بەهێز بکات و ئەو گومانە لە دڵیان دەرکات و هۆی ئەم بە دوادا هاتن و بە گرنگ گرتنەیان ڕوون بکاتەوە لەبەر ئەوە ئەم چەند ڕستەیەی ئاراستە کردن:**

١- **وتی: ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرۡذِمَةٞ قَلِيلُونَ﴾ بەڕاستی ئەوانە – موسا و کۆمەڵەکەی – تائیفە و کۆمەڵێکی بێ نرخی کەمن.**

٢- **﴿وَإِنَّهُمۡ لَنَا لَغَآئِظُونَ﴾ بەڕاستی ئەوانە ڕق هەڵسێنەرن بۆ ئێمە، واتە خاوەن وتارو کردارێکن کە هۆی خەشم و ڕق هەڵسانی ئێمەیە.**

٣- **﴿وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ﴾ بێگومان ئێمە وەکو کۆمەڵێکین بێدارو وریا بە پیلان و نیازە خراپەکانیان، دوور بینی ئەکەین و ئەمانەوێ جڵەوی کاروبار لەژێر دەستمان دەرنەچێ، کەواتە مافی خۆمانە بیم و مەترسی بکەین و خۆمان بپارێزین لە پاشەڕۆژی ئەمانە پێش ئەمەی کار لە کارەگا بترازێ.**

فَأَخۡرَجۡنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ (٥٧) وَكُنُوزٖ وَمَقَامٖ كَرِيمٖ (٥٨) كَذَٰلِكَ وَأَوۡرَثۡنَٰهَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ (٥٩) فَأَتۡبَعُوهُم مُّشۡرِقِينَ (٦٠)

ئینجا پێش ئەمەی سەرگوزەشتەکە دوایی بێنێ و دواترین شێوەی بەسەرهاتی ئەم دوو کۆمەڵە روون بکاتەوە، پێشەکی دەست نیشان ئەکات بە چارەنووس و دواترین پاشە رۆژی هەردوو کۆمەڵەکە ئەخاتە پێش چاو ئەفەرموێ: ﴿ فَأَخۡرَجۡنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ * وَكُنُوزٖ وَمَقَامٖ كَرِيمٖ ﴾ ئینجا فیرعەون و کۆمەڵەکەیمان دەرهێنا و دەرمان کردن لەو هەموو باخات و کانیاو و سەرچەشمەیانەی کە تیای دا ئەژیان بە کامەرانی و لە هەموو گەنج و غەزنە و کۆشك و جێ و شوێنی بەرز و بەرێزە، دەرمان کردن لەوە بۆ خنکان و ئاگری دۆزەخ، ﴿ كَذَٰلِكَ ﴾ کار بەو جۆرە بوو کە وتمان و باسمان کرد. ﴿ وَأَوۡرَثۡنَٰهَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴾ بە میرات و کەلەپوور ئەوانەمان دا بە ئیسرائیلی یەکان. بەڵێ فیرعەون و لەشکرەکەی دەرچوون و شوێنی موسا و گەلەکەی کەوتن، ئەو دەرچوونەیان دواترین دەرچوون بوو و سەریان نەهێنایەوە دواوە و نەگەڕانەوە بۆ ئەو هەموو نازو نیعمەتەی کە بە لێشاو باری بوو بەسەریان دا، ئەو هەموو نازو رێزە درا بە ئیسرائیلی یەکان، ئیتر بەم رەنگە گەڕانەوە بۆ میسر لەپاش خنکانی فیرعەون و شاد بوون بە جێ و شوێنەکەیان وەکو(حسن) و چەند کەسێکی تر ئەفەرمون، یان نەگەڕابنەوە و مەبەست ئەوەیە وێنەی ئەوانەی کە بۆ فیرعەون و کۆمەڵەکەی بوو پێ یان درا لە وڵاتی شام دا وەکو زۆربەی زانایان ئەفەرمون[1].

ئینجا دێتە سەر باسی دواترین بەسەرهاتی بەر بەرەکانێ ی ئەو دوو کۆمەڵە، ئەفەرموێ: ﴿ فَأَتۡبَعُوهُم مُّشۡرِقِينَ ﴾ ئینجا فیرعەون و لەشکرەکەی لە میسر دەرچوون و شوێنی موسا و گەلەکەی کەوتن و نزیکیان کەوتنەوە لە کاتێك دا خۆریان لێ هەڵهات،

[1] هەندێ ئەڵێن: لە پاش خنکانی فیرعەون و کۆمەڵەکەی تاقمێ لە ئیسرائیلی گەڕانەوە بۆ میسر ئەم تاقمە شاد بوون بە جێگاو شوێنەکەیان، جگە لەم تاقمە لەگەڵ موسا رۆیشتن بۆ شام.

فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ كَلَّآۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ﴿٦٢﴾

﴿فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ﴾ ئینجا کاتێ هەردوو کۆمەڵەکە کەوتنە بەرامبەری یەکتر بە جۆرێ یەکتریان بینی، لەوێدا ئیسرائیلی یەکان بیم و ترس داگیری کردن و ئومێدی قوتار بوونیان نەما، چونکە لە پێش دەمیانەوە دەریایە و هۆی گوزەر کردنیان نی یە لێ ی، کۆمەڵێکی بێ چەکی کەمن لەچاو کۆمەڵی زۆر گەورەی بەهێزی پڕ چەکی فیرعەون دا، لەبەر ئەوە: ﴿قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ﴾ هاوەڵەکانی موسا وتیان: بێگومان ئێمە گیراوین و دەرچوونمان نی یە و فیرعەون و کۆمەڵەکەی پێمان ئەگەن. بەڵام موسا پێغەمبەر(علیه السلام) کە لەسەر فەرمانی خوا دەرچوو لە میسر دڵنیا بوو لە رزگار بوون، هەرچەند لەو کاتەدا زانا نەبوو بە چۆنی یەتی رزگار بوونەکەیان، لەبەر ئەوە بە هەموو باوەڕ و هێزی دڵەوە تێ ی خوڕین و ﴿قَالَ﴾ فەرموی: ﴿كَلَّآۖ﴾ نەخێر هەرگیز پێتان ناگەن و ئەوەی ئێوە بیمی لێ ئەکەن روونادات. ﴿إِنَّ مَعِيَ رَبِّي﴾ بێگومان لەگەڵمە پەروەردگارم بە پارێزگاری و یارمەتی و زاڵ کردنم ﴿سَيَهۡدِينِ﴾ بەم نزیکانە رێنموونیم ئەکات بۆ رێگای رزگار بوون. موسا(علیه السلام) فەرموی: لەگەڵمە خوای خۆم و نەی فەرمو لەگەڵمانە، ئەوەش یان لەبەر ئەوە ئەوان داوای چارەسەریان ئەکرد لە موسا ئەویش بەگوێرەی داواکەی ئەوان وەڵامی دانەوە کە تەگبیر و چارەکەم لای خوایە و رێنموونیم ئەکات بۆی، یان بەهۆی ئەوەیە کە موسا هۆی رزگاری یە و ئەوانە لە پەنای موسا و لەبەر خاتری موسا رزگار ئەکرێن، یان لەبەر ئەوەی ئەوان نائومێد بوون و بێ ئارامیی یان بەکار هێنا و سەریان کردەوە لە فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەیان و باوەڕداری راستەقینەش ئەبێ دڵنیا و پڕ لە ئارام بێت بەرامبەر فەرمانی خوا و پێغەمبەرو و هیچ سەری لێ نەکاتەوە، بە کورتی ئەوانە شایان نەبوون وشەی لەگەڵ بوونی خوایان بۆ بەکار بهێنرێ، کەواتە لەمەوە روون ئەبێتەوە پایە و پلەی بەرزی یاری غار ئەبوبەکر – خوا لێ ی رازی بێت – ئەوەتا چونکە شایان بوو دەربارەی وترا: ﴿لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَاۖ﴾ غەمبار مەبە بێگومان خوا لەگەڵمانە، لەو کاتە تەنگەدا کە ترس و نائومێدی وەکو شەوی رەش و تاریك هەست و دەروونی داگیر کردن، خوای بەزەیی دار دەرووی کردەوە و رێگای رزگار بوونی نیشان دا لە لایەکەوە کە بە دڵیان دا گوزەری نەئەکرد،

﴿فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ وَأَزۡلَفۡنَا ثَمَّ ٱلۡأٓخَرِينَ ﴿٦٤﴾ وَأَنجَيۡنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجۡمَعِينَ ﴿٦٥﴾ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ ﴿٦٦﴾﴾

---

وەكو بۆمان روون ئەكاتەوە كە ئەفەرموێ: ﴿فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَ﴾ ئینجا سروشمان كرد بۆلای موسا كە بە گۆچانەكەت بدە لە دەریاكە، موساش لێ ی داو ﴿فَٱنفَلَقَ﴾ بەهۆی ئەوەوە دەریاكە لەت بوو، دوانزە شەقامی لێ پەیدا بوو بە ژمارەی دوانزە بەرەو نەوەكانی ئیسرائیل كە هەر بەرە و نەوەیەك بە شەقامێك دا گوزەر بكات، بێگومان ئەو دەریا دەریای سووری ئێستا بووبێ، یان نیل یان هەر دەریایەكی تر زۆر قوڵ بووە و هەموو لە تەكانی لە بێخەوە تا سەر جیا بوونەتەوە لە یەكتر ﴿فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ كەواتە هەموو لەتێ لەو لەتانە وەكو شاخ و چیایەكی زۆر گەورە وا بووە، بێگومان ئەو موعجیزە گەورەیە رووی دا كە نەفام و نەزان بە لایانەوە شتێكی نەگونجاوە، چونكە پێچەوانەی باوێكە كە ئەوان ئەیبینن، بیر لەوە ناكەنەوە كە ئەو خوایەی كە ئەم باو و رەوشتانەی داهێنا توانایە كە بە گوێرەی خواست و مەیلی خۆی بیان گۆڕێ و بیان بات بەرێوە، ئایا كە لە نەبوون دایهێنا بۆ ئەبێ نەتوانێ بیگۆڕێ؟!! خوا پەنامان بدات لە نەفامی و نەزانی یەك كە سەرمان لێ تێك ئەدات. ئینجا موسا و هاوەڵەكانی چوونە ناو شەقامەكانی خۆیان و دەستیان كرد بە رۆیشتن و گوزەر كردن ﴿وَأَزۡلَفۡنَا ثَمَّ ٱلۡأٓخَرِينَ﴾ ئێمەش ئەو كۆمەڵەكەی ترمان نزیك كردەوە لەوێدا كە موسا و كەلەكەی هەتا چوون بە شەقامەكانی ئەوان دا ﴿وَأَنجَيۡنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجۡمَعِينَ﴾ موسا و ئەوانەی لەگەڵی بوون رزگارمان كردن هەموو پێكەوە ﴿ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ﴾ ئینجا ئەوانی ترمان خنكاند لە دەریاكەدا، بەم رەنگە ئاوەكەی بردەوە سەر بارو سروشتی خۆی و جاران،

إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٦٧﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿٦٨﴾ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ
إِبْرَاهِيمَ ﴿٦٩﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا نَعْبُدُ أَصْنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَاكِفِينَ ﴿٧١﴾ قَالَ
هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ ﴿٧٢﴾ أَوْ يَنفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ ﴿٧٣﴾ قَالُوا بَلْ وَجَدْنَا آبَاءَنَا كَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٧٤﴾

---

**﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً﴾ بەڕاستی لەوەی کە باس کرا لەم سەرگوزەشتەیەدا بەڵگەیەکی روونی هەیە لەسەر توانای بێ سنووری خوا، لەسەر پێغەمبەرێتی موسا(علیه السلام) ﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾ زۆربەی ئەوان نەبوون بە ئیمان و باوەڕدار و باوەڕیان نەهێنا، چونکە ئەو موعجیزانە کە دژو پێچەوانەی باون هەموو کات نابن بەهۆی باوەڕ هێنان، هەرچەند بە ناچاری خەڵکی مل کەچ ئەبن بۆی، بەڵکو باوەڕ و رێنموونی وەرگرتن و رووناکی یەکە لەدڵ دا کاتێ پەیدا بوو ئەوا ئەبێ و کە پەیداش نەبوو بە هیچ کلۆج دڵەکە چار ناکرێ، ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ بەڕاستی تەنها خوای تۆ زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و هیچ شتێك ناتوانێ مل پێچی بکات لێ ی، کەواتە تۆڵە سێنەرە لە دوژمنەکانی و تەنها خوای تۆ بەزەیی دارە بە دۆستەکانی.**

**سەرگوزەشتەی موسا(علیه السلام) و تێکۆشانی لەگەڵ فیرعەون و کۆمەڵەکەی دا تێپەڕی کرد و دوایی هات بەو جۆرەی کە بیستمان، ئەو موژدە گەورەیەی تیا بوو بۆ ئەو کۆمەڵە کەمە سزا دراوە چەوساوەی باوەڕدارانە، ئەوانە گەیشتن بەو پاشە رۆژە بەرزە، کەواتە با کۆمەڵە کەمە سزا دراوەکەی مەککە دڵخۆش و دڵنیا بن کە ئەوانیش ئەگەن بە ئامانجی بەرزی خۆیان بە وێنەی ئەوانەی رابردوو، هەروەها لەو سەرگوزەشتەیەدا هەموو باسی بەرباد بوون و لە ریشە هێنانی ئەو کۆمەڵە مل هوڕە بە دەسەلأتەی فیرعەونە، کەواتە با کۆمەڵە ستەمکارەکەی مەککە و ئەو کاتەش بترسن لەوەی دووچاری سزایەك ببن بە وێنەی سزای فیرعەون و کۆمەڵەکەی کە هەڵوێستی هەردوو وەکو یەك ناشیرین و ناڕەوا بوو بەرامبەر ئایینی خوا و پێغەمبەری خوا. ئینجا لێرەدا دێت بەدوای ئەو سەرگوزەشتەی موسادا بەسەرهاتی ئیبراهیم(علیه السلام) و هەڵوێستی گەلەکەی لەگەڵی دا، چەند زنجیرەیەك لە بەسەرهات و سەرگوزەشتەی ئیبراهیم پێغەمبەر(علیه السلام) هاتووە لە چەند سورەتی تردا وەکو: ﴿البقرة، الأنعام، هود، إبراهیم، حجر، مریم، انبیاء، حج﴾ لە هەموو**

سورەتێك دا بەش و زنجیرەیەکی باس کراوە کە رێك و پێك بێت لەگەڵ ئەو شوێنە و مەبەستی ئەو سورەتەدا، وەکو بە یارمەتی خوا هەر یەکە لە شوێنی خۆی دا روون ئەکرێتەوە. ئەو زنجیرەی کە لەم سورەتەدا نیشان ئەدرێ لە بەسەرهاتی ئیبراهیم(علیه السلام) بریتی یە لە زنجیرەی پێغەمبەرێتی و رەوانە کردنی بۆلای گەلەکەی، وت و وێژی لەگەڵیان لە بارەی عەقیدە و باوەڕەوە، ئینکارو بێزاری لەو بتە پەرستراوانە، رووکردن و پەرستن تەنها بۆلای خوا، هەروەها بیر خستنەوەی رۆژی دوایی، ئینجا بەدوای ئەوەدا شێوەیەك لە شێوەکانی ئەو رۆژە ئەهێنێ کە بت پەرستەکان بێزاری دەرئەبڕن لەو بتانە، پەشیمان ئەبنەوە لەو پەرستنە ناڕەوای کە سەری لەو سزاو ئازارەوە دەرکردن کە تێی چەقیون، کە ئەوەش تەمێ و دەرسێکە بۆ بت پەرستەکانی ئەم نەتەوە... جا لەبەر ئەوە بە فراوانی ئەدوێ لە عەقیدە و باوەڕ بە تاك و تەنیایی خوا، بێ نرخی و پڕوپووچی عەقیدە و باوەڕی بت پەرستی و هاوبەش رەوادان، ئەدوێ لە پاشە رۆژی سەخت و بەدبەختی بت پەرستان لە رۆژی دوایی دا، خوای گەورە فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەم زنجیرەیە بخوێنێتەوە بەسەر بت پەرستەکانی قورەیش دا کە خۆیان بە رۆڵەی میرات بەر و کەلەپوور وەرگری ئیبراهیم دائەنا، کە گوایە ئەوان لەسەر ئایینە راستەکەی ئەون، لە کاتێك دا کە ئەو بت و هاوبەشەیان رەوا ئەدا بۆ خوای تاك و تەنیا و ئەوماڵەی کە ئیبراهیم دروستی کرد بۆ خواپەرستی بە تەنیا ئەمان ئەو هەموو بتەیان بە دەور و بەری دانابوو، ئەفەرموێ: ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ إِبۡرَٰهِيمَ﴾ ئەی پێغەمبەر بخوێنەرەوە بەسەریان دا هەواڵی ئیبراهیم، ئەو ئیبراهیمەی کە ئەوانە خۆیان بە نەوەو میرات بەری دائەنێن و شوێنی ئایینی ئەو کەوتوون، بخوێنەرەوە بەسەریان دا کە ئیبراهیم دژو دوژمنی بت پەرستی بووە و بێزاری دەربڕیوە لەوەی کە باوکی و گەلەکەی بتیان پەرستووە وەکو ئێوە، دژی باوکی و گەلەکەی بووە و بە سەرسوڕمان و بێزاری دەربڕینەوە پرسیاری لێ کردون لەو کارە ناڕەوای کە لەسەری بوون، وەکو ئەفەرموێ: ﴿ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا تَعۡبُدُونَ﴾ بخوێنەرەوە بەسەریان دا هەواڵی ئیبراهیم، هەواڵی ئەو کاتەی کە وتی بە باوکی و بە گەلەکەی: ئایا ئێوە چی ئەپەرستن؟! بە سەر سوڕمانەوە ئەو پرسیارەی لێ کردن بۆ ئەمەی تێ یان بگەیەنێ کە ئەو پەرستراوانی ئەوانە شایانی پەرستن نین و هیچ نرخێکیان نی یە، ئەوانیش لە وەڵامی دا بە کەشخە و شانازی یەوە

﴿قَالُواْ﴾ وتیان: ﴿نَعۡبُدُ أَصۡنَامٗا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ﴾ [1] چەند وێنە و هەیکەلێ ئەپەرستین و ئینجا بەیانی تا ئێوارە ئەمێنینەوە بە دیاریانەوە و لەبەر خاتری ئەوان. ئەو سەر لێ تێك چووانە ناویان ئەبردن بە ﴿آلهة﴾ واتە پەرستراوەکان، بەلاَم بە اصنام بۆمان ئەگێڕێتەوە، واتە وێنە و هەیکەلی تاشراوی دەست کرد، تا روون ببێتەوە ئەوپەڕی نەفامی ئەوانە کە بەدەستی خۆیان ئەوانەیان دروست ئەکرد و کەچی ئەیشیان پەرستن!! ئینجا ئیبراهیم(علیه السلام) دەستی کرد بە بێدار کردنەوەیان لە خەوی بێ ئاگایی، سەرنجی دڵی راکێشان بۆ پڕوپووچی ئەوەی کە خەریکن پێ یەوە: ﴿قَالَ﴾ فەرمووی پێ یان: ﴿هَلۡ يَسۡمَعُونَكُمۡ إِذۡ تَدۡعُونَ﴾ ئایا ئەو پەرستراوانە گوێ یان لێتانە کاتێ ئەیانپەرستن و نزاو هاواریان لێ ئەکەن؟ ﴿أَوۡ يَنفَعُونَكُمۡ أَوۡ يَضُرُّونَ﴾ ئایا سوودتان پێ ئەگەیەنن بەهۆی ئەو نزا و هاوار لێ کردن و پەرستنەوە، یان زیانتان پێ ئەگەیەنن بەهۆی نەپەرستن و هاوار لێ نەکردنیان؟ واتە پەرستراو هەر هیچ نەبێ ئەبێ ئاگای لە بەندەکانی خۆی ببێ و پەرستن و نزا و هاوارەکانیان ببیستێ، دەی ئەمانە هەرچۆنی نابیستن ئایا خاوەنی سوود و زیانن؟ بێگومان شتێکی ئاشکرایە کە نە بیستن هەیە و نە زیان و سوود گەیاندن. بت پەرستەکانیش نەیان توانی لەو بارەیەوە هیچ بڵێن، چونکە ئەیان زانی مەبەستی ئیبراهیم(علیه السلام) لاقرتی پێ کردن و بێزاری دەربڕینە لێ یان، هیچ بەڵگە و شتێکیان بە دەستەوە نی یە بەرگری پێ بکەن، هیچیان بۆ نەمایەوە جگە لەوە ﴿قَالُواْ﴾ وتیان: ﴿بَلۡ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ﴾ نەخێر ئەمانە نە بیستن و نە سوودیان هەیە و نە زیان ئەگەیەنن، بەڵکو ئێمە ئەیان پەرستین، چونکە زانیمان کە باوك و باپیرمان پەرستوونیان و بەم جۆرەیان کردووە کە ئێستا ئێمە ئەیکەین، واتە کوێرانە شوێن باو باپیرمان کەوتووین و لاسایی ئەوان ئەکەینەوە، ئیبراهیم(علیه السلام) هەرچەند زۆر بە ئارام و دەروون دار و خۆگر بوو، بەلاَم ئیتر خۆی پێ نەگیرا و دایچڵەکاندن و دوژمنایەتی خۆی دەربڕی دەربارەی بتەکانیان و ئەو عەقیدە و باوەڕە پووچەی لەسەری بوون،

---

[1] بە پێی تەفسیرەکە وشەی ﴿ نظل ﴾ فیعلی ناقصە وەکو ئەصل وایە، وابێ ئەو کاتە ﴿ عاكفين ﴾ خەبەرە، زۆر لە زانایان لەسەر ئەوەن کە فیعلی تەواوە ئەو کاتە حاڵە بە هەردوو بار هەر باشە و مەبەستەکە یەکە. زانینی تەواو لای خوایە.

قَالَ أَفَرَءَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلْأَقْدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ
ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٧﴾ ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ
يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾

بەم رەنگە ﴿قَالَ﴾ پێی فەرمون: ﴿أَفَرَءَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ * أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلْأَقْدَمُونَ﴾ ئایا بیرتان کردووەتەوە و تێفکراون تا بزانن چی یە ئەمەی ئێوە و باوکو باپیرە پێشووەکانتان پەرستووتانە؟ واتە بێزارم لە کردەوەکەتان و تەشەرتان لێ ئەدەم و من ئەوانە ناپەرستم ﴿فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّيٓ﴾ چونکە ئەوانە هەموو دوژمنن بۆمن[1]. ﴿إِلَّا رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ بێجگە لە پەروەردگاری هەموو جیهان[2] ئا بەم جۆرە قورئان تێمان ئەگەیەنێ و فێرمان ئەکات کە لەبارەی باوەڕ و عەقیدە و چاوپۆشی نابێ بکرێ و خاتر خویی باوك و کەس و کار و هیچ کەس بەکار ناهێنرێ، یەکەم پەیوەندی عەقیدەیە، یەکەم شتی نرخ دار بریتی یە لە ئیمان و باوەڕ، بێجگە لەوە تابیع و شوێن کەوتووە. ئینجا ئیبراهیم(علیه السلام) دەست ئەکات بە باسی هەندێ سیفەتی پەروەردگارە پەرستراوەکەی، و پەیوەندی خۆی پێ یەوە لە هەموو کاتێك دا لەسەر هەموو بارێ:

١- ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ﴾ کەسێکی ئەوتۆ کە منی دروست کردووە و دایهێناوم بەهۆی ئەوەوە ڕێنموونیم ئەکات هەمیشە بۆ هەموو پێویستی یەکم، چونکە خوا ڕێنموونی هەموو دروست کراوێکی ئەکات بۆ ئەو مەبەستەی کە بۆی دروست کراوە، بۆ هەموو کاروباری هەردوو جیهان، ئەو ڕێنموونی یە دەست پێ ئەکات لە یەکەم جاری دروست کردنی یەوە تا دوا هاتنی ماوەی مانەوە و ژیانی بە ڕێنموونی یەك کە دەست بدات و بگونجێ بۆ ڕاکێشانی سوود و بەرژەوەندی و بەرگری دژو زیان، ئەو

[1] بە پێی تەفسیرەکە رستەی ﴿ فإنهم... هتد ﴾ هۆی بێزاری و تەشەر دان و نەپەرستنەکەی ئیبراهیمن و بە دوو جۆری تریش باس کراوە: ١.خەبەر بێت بۆ وشەی ﴿ ما ﴾. ٢.رستەیەکی سەربەخۆ بێت بۆ روون کردنەوەی حاڵی پەرستراوەکان. بەم دوو جۆرەش هەر ئەگونجێ. ئینجا با بزانرێ کە وشەی ﴿ عدو ﴾ تاکە بەلاَم بۆ تاك و کۆ و نێرو مێ بەکار ئەهێنرێ، و ناوبردنی دار بەرد بە دوژمن بە پێی رۆژی دوایی یە، چونکە لە رۆژی دوایی دا هەموو پەرستراوە ناڕەواکان ئەبن بە دوژمن، یان بە شێوەی تغلیب وتراوە.

[2] بە پێی تەفسیرەکە ئیستیسناکە موتەسیلە و چونکە لەناو خۆیان و باو باپیریان دا کەسی وا بووە کە خواپەرست بووە یان بەهۆی ئەوەوەیە لەگەڵ بتەکان دا خوایشیان پەرستووە، ئەگونجێ مونقەتیعیش بێت.

ڕێنموونی یە بۆ ئادەمی دەست پێ ئەکات لە هەڵمژینی بێچوو لە سکی دایکی دا بۆ خوێنی منداڵدان و دوایی دێت بە نیشان دانی ڕێگای بەهەشت و رابواردن بەناز و ڕێزەکەی، واتە ئەو خوایە منی دروست کرد لەلایەکەوە کە خۆی ئەزانێ و من نازانم، کەواتە تەنیا ئەو زانا ترە بە خۆم و هەموو کارو فرمانم و هەست و ئارەزوو و پێویستی ئەم ژیان و ئەم جیهان و ئەو ژیان و ئەو جیهانم، کەواتە ڕێنموونیم ئەکات بۆلای خۆی وناسینی خۆی، بۆڕێگایەك کە پیا بڕۆم و بۆ بەرنامەیەك کە لەسەری بڕۆم.

٢- ﴿وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ﴾ کەسێکە کە ئەو خۆراکم پێ ئەداو تێراوم ئەکات. ﴿وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ﴾[1] کاتێ نەخۆش بکەوم ئەو چاکم ئەکاتەوە و خۆشیم بۆ ئەهێنێ. ڕێژەی نەخۆشی بۆلای خۆی دا و نەك بۆلای خوا، بەم رەنگە نەیفەرمو: کاتێ نەخۆشی خستم ئەو خۆشم ئەکاتەوە، بێگومان چەند هۆیەکی ئاشکرا هەیە بۆ ئەوە:

ا- شوێنەکە و باسەکە شوێن و باسی هەڵژماردنی چاکە و بەهرەی خوایە و دیارە نەخۆش خستن بە چاکە و بەهرە تەماشا ناکرێ.

ب- نەخۆش خستن بە رواڵەت شتێکی خراپە، کەواتە شەرمی کرد لە خوایەوە نیشان بدات و بیکات بە کردەوەی خوا هەرچەند هەموو شت بە دەست خوایە و بە بێ خواهیش و مەیلی ئەو هیچ شتێ نابێ و روونادات، وەکو لە سورەتی ﴿الکهف﴾ دا وێنەی ئەمەمان بە درێژیی باس کرد لە پاش گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی موسا و بەندەساڵحە زاناکەی هاوەڵی.

ج- زۆربەی نەخۆشی کە روو ئەکاتە بەندە خەتای خۆیەتی و بەهۆی کردەوەی نالەباری خۆیەوە رووی تێ ئەکات و خوا دووچاری ئەکات، زۆربەی نەخۆشی روو ئەدات لە گوێ پێ نەدان و پارێز نەکردن لەو شتانەی هۆی نەخۆشین، ئیبراهیم(علیە السلام) هەستی کرد بە سەرپەرشتیی بە سۆز و چاودێریی نەرم و ناسك و پڕ لە بەزەیی خوا بەسەریەوە، لەبەر ئەوە دانی نا بەو چاکە و بەهرە پڕ لە فەڕەی خوا و جاڕی ئەوەی دا و ئاراستەی باوك و گەلەکەی کرد، بەڵکو ئەوانیش بیر بکەنەوە و چاو لەبەری ئەم هەموو چاکە بێن و مل هوڕی و سەرکێشی یان نەمێنێ،

---

[1] ئەم رستەیەی نەکرد بە سیلەیەکی سەربەخۆ بەڵکو عەتفی کردە سەر ﴿ یطعمني و یسقین ﴾ و کردی بە تابیعی ئەوان، چونکە زۆربەی نەخۆشی و دەرد لە خۆراکەوە پەیدا ئەبێ و تابیعی خۆراکە.

وَٱلَّذِى يُمِيتُنِى ثُمَّ يُحۡيِينِ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِىٓ أَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لِى خَطِيٓـَٔتِى يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴿٨٢﴾ رَبِّ هَبۡ لِى حُكۡمًا وَأَلۡحِقۡنِى بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٣﴾

**﴿وَٱلَّذِى يُمِيتُنِى ثُمَّ يُحۡيِينِ﴾** پەروەردگاری هەردوو جیهان کەسێکە کە من لەم جیهانەدا ئەمرێنێ و لە پاشان لەو جیهان زیندووم ئەکاتەوە، نیشاندانی مردن لە خواوە و رێژەی مراندن بۆلای خوا هیچ ناشیرینی تیا نی یە و بێ شەرمیی روونادات، چونکە مردن شتێکی گشتی یە و هەموو کەس ئەزانێ کە ئەبێ هەر ببێ و قوتار بوونی نابێ لێ ی، هەرشتێکیش وا بێ بە شەڕو خراپە سەیر ناکرێ، وەکو پەندی پێشینانی کوردی ئەڵێ: ﴿مەرگ لەگەڵ ئاو ماڵ دا جەژنە﴾، بێجگە لەوەش بێگومان مردنی چاکان هۆی گەیشتنیانە بەناز و رێز و خۆشی ئەو جیهان کە خۆشی ئەم جیهانە هیچ چاونادات لە ئاستی و هیچ نرخێکی نی یە بەرامبەر ئەو، کەواتە لە راستی دا مردن بۆ چاکان چاکە و بەهرەیە چ جای کەسێکی وەکو ئیبراهیمی خەلیل(علیە السلام) **﴿وَٱلَّذِىٓ أَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لِى خَطِيٓـَٔتِى يَوۡمَ ٱلدِّينِ﴾** کەسێکە کە چاوەڕوانم و ئومێد ئەکەم کە ببورێ لێم و گوناهو هەڵەم بسڕێتەوە لە رۆژی دوایی دا، بەڕاستی ئەم فەرمودەیە زۆر جێگای بیر لێ کردنەوەیە، مافی ئەوەی هەیە پەند و تەمێ ی باشی لێ وەرگیرێ... ئەوەتا ئیبراهیمی خەلیل(علیە السلام) کە یەکێکە لە پێغەمبەرە گەورەکان و لە پێناوی رەزامەندی خوا و لەبەر خوا خۆی داڕنی لە هەموو شتی ئەم جیهانە، دەستی هەڵگرت لە باوك و خزم و خوێش و خاك و وڵات و هەموو شتی تر کە لەم جیهانەدا دڵ پەیوەندی هەیە پێ یەوە، ئەو ئیبراهیمەی کە خوا خۆی بەو جۆرە ناسیوە و دڵ و هەست و دەروونی هەمیشە لەگەڵ خوادا بووە و هەرگیز گوناهو تاوانی نەبووە... ئەو ئیبراهیمە گەورەیە، ئەوپەڕی شتێ کە چاوەڕوانی بۆ کردبێ ئەوەبوو کە خوا تاوان و هەڵەی بسڕێتەوە لە رۆژی دوایی دا، خۆی بە پاك و بێ گوناه نیشان نەدا، بەڵکو خۆی بە تاوانبار و هەڵە دایە قەڵەم، پشتی نەبەست بە کردەوەی خۆی، خۆی وا نەئەبینی شایانی هیچ شتێکە، بەس ئومێدی هەیە بە لوتفی خوای خۆی و چاوەڕوانی بەزەیی یەتی، تەنها ئەوە و بەس، ئەوەیە

هەستی لە خوا ترسی و شەرم کردن لەخوا، ئەوەیە هەستی وریایی و خۆپاریزیی و بیم و ترس لەخوا، ئەوەیە هەست کردن بە ئاگاداریی و چاودێریی خوا، هەستی راستەقینە بە نرخی چاکە و بەهرەی خوا و بێ نرخی و لاوازی کردەوەی بەندە. ئیبراهیمی خەلیل(علیە السلام) لەو فەرمودانەدا عەقیدە و باوەڕی راست و رەوای روون کردەوە لەبارەی خواوە: تاك و تەنیایی خوای هەموو جیهان، دان نان بەمەی کە هەموو کاروباری ئادەمی بەدەست خوایە و بە خواهیش و مەیل و دەسەڵاتی خوایە، زیندوو کردنەوەو حیساب و پرسیاری لە بەندەکانی و لوتف و بەزەیی خوا و تاوان و قسور و کەم و کوڕی بەندە. ئەمانە چەند شتێ بوون کە گەلەکەی بڕوایان پێ‌ی نەبوو، هەرچۆن بت پەرستەکانی قورەیش بڕوایان پێ‌ی نەبوو، ئەوا خوا لەم سەرگوزەشتەیەدا بیرو باوەڕی راستی ئیبراهیمی روون کردەوە لە یەکەم جارەوە بۆ ئەو گەلی قورەیشە کە شانازی یان ئەکرد بە ئیبراهیمەوە. ئینجا ئیبراهیم دەستی کرد بە نزاو لاڵەیەکی نەرم و ناسکی دوور و درێژ بە باوەڕی بەهێز و ئاگاداریی دڵ بە ترس و سامەوە داوای کرد لە خوای خۆی و نزاکانی هیچیان هیچ بەشێکی ئەم جیهان و زەوی یەی تیا نی یە، تەنانەت داوای تەندروستیش ناکات، بەڵکو نزاکەی نزایەکە روو ئەکاتە بەرزترین پلەو بەرێز ترین ئامانج، نزاکەی لە دڵێکەوە دێت کە خوای ناسیوە بەهۆی ئەوەوە بێجگە لەخوا هەموو شتێکی ئەم جیهانە بە سووکو بێ نرخ سەیر ئەکات، فەرمووی: ﴿ رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ ﴾ ئەی پەروەردگارم پێم ببەخشە زانینی تەواو و ناسینی هەموو شتێ لە جێگا و سنوور و رادەی خۆی دا، داوای شتێکی کرد کە پێویست بوو بۆ هەڵسانی بەو فەرمان و ئەرکەی خرابووە سەرشانی کە بریتی بوو لە جێنشینی خوا و پێشەوایی بەندەکانی. بم لکێنە بە پیاو چاکانەوەو بم خەرە رێزی ئەوان، بەم رەنگە یارمەتیم بدە و بۆم رێك بخە هەڵسم بە کردەوەی چاك تا بچمە ریزی پیاو چاکانێ کە گەردو لەکەی گوناهو تاوانیان پێوە نی یە، ئیبراهیمی خەلیل داوا ئەکات بچێتە ریزی پیاو چاکانەوە!! ئای لەم خۆ لێ نەگۆڕانو خۆ نزم کردنەوە، ئای لەم وریایی و بێداریی یە، ئای لەم بیم و ترسی کەم و کوڕی یە کە بە سروشت ئادەمی هەیەتی، ئای لەم ترسەی لە وەرگەڕانی دڵ و دەروون، ئای لەم سووری یە لەسەر کردەوەی چاك و چوونە ریزی چاکان!!

وَٱجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿٨٤﴾ وَٱجۡعَلۡنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨٥﴾ وَٱغۡفِرۡ لِأَبِيٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٨٦﴾

---

﴿وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ﴾ فەراهەم بێنە بۆم ناوبانگی چاك و رێز لەناو گەلە داهاتووەکان دا، خوا نزاکەی وەرگرت ئەوەتا هەموو گەل و میللەتێ بە چاکە ناوی ئەبات و رێزی هەیە لای، یان مەبەستی ئەوەبوو کە لە پاش خۆی کەسێ ببێ کە بانگی خەڵکی بکات بۆ رێگای راست کە رێگای خوایە، خەڵکی بگێڕێتەوە بۆ ئەو ئایین و میللەتە راستەی کە خۆی بانگی بۆ ئەکرد. بێگومان بەم جۆرەش نزاکەی وەرگیرا و مەبەستەکەی بەدی هات، ئەوەتا لە نەوەی ئیسحاق ئەو هەموو پێغەمبەرە هاتن تا گەیشتە عیسا، کە بەهۆی دایکی یەوە لە دواترین نەوەی پێغەمبەرانی نەوەی ئیسحاقە، ئینجا لە نەوەی ئیسماعیل محمدی نارد(ص) کە ئایین و میللەتی ئیبراهیمی تازە کردەوە تا رۆژی دوایی بەجۆرێ ناگونجێ گۆڕان و دەست تێ خستنی. ﴿وَٱجۡعَلۡنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ﴾ لە رۆژی دوایی دا بم گێڕە بە یەکێ لەوانە کە ئەچنە بەهەشت کە تەنها جێگای نازو نیعمەتە و بم خەرە رێزی ئەوانە کە بەهەشت وەرئەگرن و بە خاوەنی وێنەی میرات بەر. ﴿وَٱغۡفِرۡ لِأَبِيٓ﴾ ببورە لە باوکم و گوناهەکانی بسڕەرەوە بە رێنموونی کردن و خستنە سەر رێگای راست و باوەڕ هێنان ﴿إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ﴾ بەڕاستی ئەو یەکێك بووە لە ون بووان لە رێگای خوا و لە رێزی گومڕایانە. ئەم نزایە ئەگەر پێش مردنی باوکی بێت ئەوە بەو جۆرەی کە وتمان راڤەی ئەکەین و هیچ گرێ و ئیشکالی تیا نی یە، ئەگەر لە پاش مردنی بووبێ ئەو کاتە مەبەست لێ بوردن و چاوپۆشی و سڕینەوەی رووتە، چونکە لە پاش مردن تازە رێنموونی و یارمەتی دان بۆ باوەڕ هێنان ناگونجێ و نابێ، لەسەر هەردووبار و بە هەرکام ئەم نزایە پێش ئەوە روون ببێتەوە بۆ ئیبراهیم کە باوکی دوژمنی خوایە و هەتا هەتایی ئەبێت لە دۆزەخ دا، وەکو لە سورەتی(التوبة) دا ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُۚ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ﴾ کەواتە ئەم نزایە وەرگیراو نزاکەشی بە جێگای قسە و باس نەما و گرێ و ئیشکالی تیا نەما.

وَلَا تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ ﴿٨٧﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾ وَأُزْلِفَتِ الْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٩٠﴾ وَبُرِّزَتِ الْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ ﴿٩١﴾ وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٩٢﴾ مِن دُونِ اللَّهِ هَلْ يَنصُرُونَكُمْ أَوْ يَنتَصِرُونَ ﴿٩٣﴾ فَكُبْكِبُوا فِيهَا هُمْ وَالْغَاوُونَ ﴿٩٤﴾ وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ ﴿٩٥﴾

﴿وَلَا تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ﴾ ریسواو بێ ئابڕووم مەکە لە ڕۆژێك دا کە خەڵکی زیندوو ئەکرێتەوە: ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ * إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ [1] ڕۆژێ کە هیچ سامان و دارایی و کوڕ و ئەولادێ سوود ناگەیەنن بە هیچ کەس جگە لە کەسێ کە چووبێتە حوزووری خوا بە دڵێکی ساغ و پاك و خاوێن لە نەخۆشی بێ ئیمانی و بێ بڕوایی و نیازی جگە لەم جیهانەدا هیچ سوودێ ناگەیەنێ بە خاوەنەکەی و بەکاری نایەت لەو جیهان دا ماتوڵ ئیمان و باوەڕی ڕێك و ڕاستی نەبووبێ و بە نیازی خواوە بەختی نەکردبێ، هەروەها کوڕ و ئەولاد هەرچەند ساڵح و پیاو چاك بن سوودیان نابێ و تکایان پێ ناکرێ بۆ باوکێ ئیمان و باوەڕ دار نەبێ، لەم فەرمودەیەوە وەرئەگیرێ کە ئیبراهیمی خەلیل(علیه السلام) تا چ ڕادەیەك هەستی کردووە بە سامناکی ئەو ڕۆژە و تا چ ڕادەیەك شەرم گرتوویەتی لە خواو بیم و ترسی کەم و کوڕی خۆی داگیری کردووە لە کاتێك دا کە پێغەمبەرێکی ئاوا گەورەش بووە، هەروەها ڕوون ئەبێتەوە تا چ ڕادەیەك تێگەیشتوو و زانا بووە بە حەقیقەتی کار. ئەوەتا نرخ بۆ هیچ شتێ دانانێ لە ڕۆژی حیساب و پرسیاردا بێجگە لە پاك و خاوێنی دڵ و دڵسۆزیی و ڕاستی بۆ خوا و خۆ داڕنین و خۆ ڕووت کردن لە هەموو شتێ جگە لە نیازی خوا. ئینجا بە بۆنەی ئەم نزایە چەند نموونە و شێوەیەك لە بەسەرهاتی ئەو ڕۆژە نەخشە ئەکێشێ کە ئیبراهیمی

---

[1] بە پێی تەفسیرەکە ئەم ئیستیسنایە موتەسیلە و لە مەفعولە و نەگونجێ و دروستە ئیستیسنا بێ لە فاعیلەکە و لە مەبەست دا هەر یەك شت ئەگرێتەوە، هەروەها دروستە ئیستیسناکە موتقەتیع بێت و لەسەر ئەو بارەش تەفسیر کراوەتەوە.

خەلیل ئەو هەموو بیمەی لێ ئەکات، وەکو ئێستا ئەو ڕۆژە ئامادە بێت بە پێش چاویەوە و سەرنجی ئەدات و بەو مەل کەچی و سام و ترسەوە ئەو نزایە ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَأُزْلِفَتِ الْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ بەهەشت نزیك ئەخرێتەوە بۆ لە خواترسەکان بە جۆرێ لە شوێنی راوەستانی ئەو ڕۆژەوە ئەیبینن و مۆژدە بەخش و کەشخە ئەکەن بەوەی کە بۆ ئەو شوێنە ئەنێررێن، ﴿وَبُرِّزَتِ الْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ﴾ دۆزەخ دەرئەخرێ و ئاشکرا ئەکرێ بۆ گومڕاکان بە جۆرێ بە چاو ئەیبینن لەو شوێنی خۆیانەوە، داخ و ترس و سام داگیریان ئەکات کە ئەزانن ئەدرێنە بەر بۆ ناو ئەو ئاگرە سەختە، ﴿وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ * مِن دُونِ اللَّهِ﴾ ئەوترێ پێ یان: ئایا لە کوێ یە ئەوەی کە ئێوە ئەتان پەرست بێجگە لە خوا و تێپەڕتان ئەکرد لە پەرستنی خوا بۆ پەرستنی ئەو؟ ﴿هَلْ يَنصُرُونَكُمْ أَوْ يَنتَصِرُونَ﴾ ئایا یارمەتیتان ئەدەن بەمەی بەرگری سزاتان لێ بکەن؟ یان خۆیان بۆ خۆیان رزگار ببن و خۆیان قوتار بکەن لەو سزایە؟ بێگومان ئەم شێوە پرسیارە وەڵامی نی یە، چونکە مەبەست توانج و تەشەر لێ دانیانە بۆ سزا دانی دەروونیان، لەبەر ئەوە بە بێ چاوەڕوانی وەڵام ئەفەرموێ: ﴿فَكُبْكِبُوا فِيهَا هُمْ وَالْغَاوُونَ * وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ﴾ ئینجا بەسەر ڕوودا ئەخرێنە ناو ئەو دۆزەخەوە جار لەدوای جار هەتا نیشتەجێ و جێگیر ئەبن لە بێخی دۆزەخ دا، ئەو بتانە بەو جۆرە فڕێ ئەدرێنە ناو دۆزەخ خۆیان و ئەوانەش کە لە ڕێگای ڕاست لایان دا و ئەو بتانەیان پەرست، هەروەها لەگەڵ هەموو شەیتانەکان کە لەشکر و سەربازەکانی شەیتانی هەرە گەورەن کە ناوی ئیبلیسە، یان مەبەست هەموو شوێن کەوتووەکانی تری شەیتانە لە جن و ئادەمی، ئەمانە هەموو ئەخرێنە دۆزەخ و کۆئەکرێنەوە لەوێ، خوا پەنامان بدات، با سەر تێك دەر و سەر لێ تێك دراوان بە داخ و کینە و دوژمنایەتی یەوە بتلێنەوە لەناو ئەو ئاگرەیش دا، وا دەرئەکەوێ لە پێشەوە بتەکان فڕێ ئەدرێن بۆ زیادە نائومێدیی بت پەرستەکان و زیاد ڕیسوا کردنیان. ئینجا با گوێ شل کەین لە بت پەرستەکان کە چی ئەڵێن بە بتەکانیان!

قَالُواْ وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ ﴿٩٦﴾ تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ وَمَآ
أَضَلَّنَآ إِلَّا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٩٩﴾ فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ
﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾

---

**﴿ قَالُواْ﴾ ئەڵێن: ﴿وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ﴾ لە کاتێك دا لە دۆزەخ دا شەڕە قسە و ئاژاوەیان لەگەڵ ئەکەن یان لە نێوان خۆیان دا ئاژاوە ئەکەن و یەکتر تاوانبار ئەکەن: ﴿ تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە لە گومڕایی و سەر لێ شێوانێکی روون و ئاشکرادا بووین ﴿ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ لە کاتێك دا ئێوەمان یەکسان کرد لەگەڵ پەروەردگاری هەموو جیهان دا بەمەی باوەڕمان وابوو کە ئێوە شایانی پەرستنن و ئێوەمان پەرست لەباتی خوادا، یان لەگەڵ ئەوەدا،واتە دان ئەنێن بە سووچ و تاوانی خۆیان دا، ﴿ وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا ٱلْمُجْرِمُونَ﴾ ئێمەی گومڕا نەکرد و لە ڕێگای ڕاست لای نەداین جگە لەو تاوان بارانە کە دوایان کەوتین و بە قسەمان کردن، واتە سەرۆك و گەورەکان، یان یەکەم تاقم کە لە ئایینی خوا لایان داو لە پاش دا خەڵکی و جن و تاقمی تر چاویان لێ کردن، یان هەرکەسێ کە هانی دان و بانگی کردن بۆ بت پەرستی، ئینجا بەداخ و مەراقەوە ئەڵێن: ﴿ فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ * وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ﴾ کەواتە هیچ تکاکاران بۆ ئێمە نی یە و هیچ دۆستێکی دڵ گەرممان نی یە کە بەزەیی یەکی بێتەوە پێمان دا، واتە پێغەمبەران و فریشتە و پیاوچاکان تکاکاری باوەڕدارانن و ئێمە هیچ لەو تکاکارانەمان نی یە و باوەڕداران دۆستی دڵ گەرم و خاوەن بەزەیی یان هەیە کە ئەوانی گەرەك بێت و ئێمە نیمانە، یان مەبەست ئەوەیە لە دونیادا بتەکانیان ئەپەرست کە تکاکاریان بن لە کاتی تەنگی دا و دۆست و خۆشەویستیان هەبوو کەچی ئەوا لە ڕۆژی دوایی دا کە لە هەموو هات تەنگانە ترە هیچی لەوانەیان نی یە، کەواتە ئەمە ماوەتەوە ئاواتی گەڕانەوە بخۆن بۆ ئەمەی گوێ ڕایەڵی بکەن و بگەڕێنەوە بۆلای خوا، لەبەر ئەوە ئەڵێن: ﴿فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً**

﴿فَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئاخ و كاشكێ جارێكی تر گەڕانەوەمان ببوایە بۆ دنیا تا بەهۆی ئەوەوە ببین بە باوەڕدار و بگەڕێین بە بەشێ لە باوەڕداران، خۆ دیارە ئەوەش ئاواتی رووتە و هەرچۆنێ تكا و لاڵە نی یە، تازە گەڕانەوەش نی یە. ئینجا ئەو چەند رستەیە ئەهێنێ كە لەم سورەتەدا ئەیهێنێ لە پاش هەموو سەرگوزەشتەیەكەوە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ * وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ ئینجا هەرچۆنێ لەپاش گێڕانەوەی بەسەرهاتی موساوە گەڕاوە بۆ بەسەرهاتی ئیبراهیم ئەوا لێرەیش دا ئەگەڕێتەوە بۆ بەسەرهات و سەرگوزەشتەی نوح(علیه السلام)، بەسەرهات و باسی نوحیش لە چەند سورەتێك دا هەیە و لە هەموو سورەتێ دا ئەو زنجیرەیە ئەهێنێ كە پەیوەندی هەیە بە مەبەستی ئەو سورەتەوە وەكو هەموو بەسەرهات و سەرگوزەشتەكانی تر، گرنگ ترین شت لەم زنجیرەی ئێرەدا باسی بانگ كردنیەتی بۆ لەخوا ترسان و جاڕدانی بەمە كە داوای هیچ كرێ یەك ناكات لەسەر ئەو رێنموونی یەی ئەیكات، چونكە داوای كرێ و پاداشت لەخوای ئەو خەڵكە ئەكات كە فەرمانی پیاداوە بە رێنموونی و بانگ كردنیان، ئەو ئاگادار كردنەوە شتێكی زۆر پێویستە بۆ هەموو بانگ كردن و رێنموونی یەكی راست كە تەنها بە نیازی خوا و لەبەر خاتری خوا بكرێ، لەبەر جیا كردنەوەی لە هەموو بانگ و بانگەوازی درۆینە كە بینراوە لە كاهینەكان و زۆر لە پیاوانی بەناو ئایینی كە بانگ كردنەكەیان ئەكەن بە چەكێ بە دەستیانەوە بۆ ژێر دەست كردن و ژێر بار كردنی خەڵكی نەفامی بێ چارە، ئەیكەن بەهۆی كۆكردنەوەی دارایی و سامانێكی زۆر فراوان بە ناڕەوا و ناشەرعی، لە رێگای ئایینەوە خوێنی خەڵكی ئەمژن و دایان ئەدۆشن، جا لەبەر ئەوە قورئان بۆمان باس ئەكات لە پێغەمبەرانەوە كە لە رێوە خەڵكی یان ئاگادار كردەوە بەمەی كە كرێ و پول و پارەیان ناوێ لەو خەڵكە، ئینجا با گوێ شل كەین لە قورئانی بەفەڕ،

كَذَّبَتۡ قَوۡمُ نُوحٍ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٠٥﴾ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٠٦﴾ إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ﴿١٠٧﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ
وَأَطِيعُونِ ﴿١٠٨﴾ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١١٠﴾
۞ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلۡأَرۡذَلُونَ ﴿١١١﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتۡ قَوۡمُ نُوحٍ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ گەلەکەی نوح بڕوایان نەکرد و نەهێنا بە پێغەمبەران و بە درۆزنیان دانان. ئەمە دوا دوایی سەرگوزەشتەیە: لە سەرەتاوە باسی فەرمو تا لە یەکەم جارەوە دەری بخات و بزانرێ سەری ئەو گەلە لە چی یەوە دەرچووە و کورتەی هەواڵەکەیان چی بوو، ئینجا دەست ئەکات بە درێژە، گەلەکەی نوح بە دیمەن و رواڵەت تەنها باوەڕیان بە نوح نەهێنا و بە درۆزنیان دایە قەڵەم، بەڵام قورئان وای نیشان داین کە بڕوایان بە هەموو پێغەمبەران نەهێنا و هەموانیان بە درۆزن زانی، چونکە پێغەمبەرایەتی لە بنەڕەت دا یەک شتە، کە بریتی یە لە بانگ کردن بۆ باوەڕ کردن بە تاکی و تەنیایی خوا، خاوێن کردنی پەرستن و گوێ رایەڵیی تەنها بۆ ئەو، کەواتە هەرکەس بڕوا نەکات بە تەنیا پێغەمبەرێک، ئەو کەسە بڕوای بە هەموو پێغەمبەران نی یە، چونکە هەموو یەک بانگیان هەیە و یەک شتیان وتوە. قورئان ئەم مەبەستە زۆر جار نیشان ئەدات و دەست نیشانی بۆ ئەکات لە چەند شوێنێک دا، بە چەند جۆر و شێوەیەک، چونکە باوەڕ کردن بەو یەکێتی یە یاسایەکی گرنگە لە یاساکانی بیرو باوەڕ و عەقیدەی ئیسلام، کە لە هەموو ئایین و پەیامەکانی خوادا بووە، بەهۆی ئەوەوە ئادەمی دابەش بوون بە دوو بەش، بە درێژایی چەرخ و پێغەمبەرێتی و پێغەمبەران خەڵکی دوو ڕێزن: ریزی ئیمانداران و ریزی کافران، موسڵمان و ئیمان دار کاتێ سەرنج ئەدات و چاو هەڵئەخات ئەبینێ کۆمەڵی ئیماندار لە هەموو ئایین و باوەڕێ کە لەلایەن خواوە هاتبێ هەموو کۆمەڵ و میللەتی خۆیەتی لە یەکەم ئایین و پێغەمبەرەوە تا دواترین ئایین و پێغەمبەر – سەلامی خوا لە هەمووان بێت – ئەو ریز و کۆمەڵەکەی تر لە هەر میللەتێ و لەهەر ئایینێ بریتی یە لەو کۆمەڵەی کە باوەڕی نەهێنا بێ و کافرە، کەواتە ئیماندار باوەڕی هەیە بە هەموو پێغەمبەران و ڕێزی هەموانی بەلاوە هەیە، چونکە هەموو هەڵگری یەک باوەڕ و یەک پەیامن کە پەیامی تاک و تەنیایی خوایە. تیرەی ئادەمی بەلای باوەڕداری تێگەیشتووی راستەقینەوە دابەش نابێ بەهۆی رەگەز و رەنگ و خاک و نیشتمانەوە، بەڵکو دابەش ئەبێ بەهۆی ئیمان و کوفر و راست و بەتاڵەوە، بێگومان**

باوەڕداری راستەقینە ئەبێ لەگەڵ خاوەنی ئیمان و ئەهلی حەق دا بێت و لە ریزی ئەم دا راوەستێ بە دژی بێ باوەڕ و ئەهلی بەتاڵ لە هەموو چەرخێك دا و لە هەموو ولآتێك دا، بەو جۆرە تەنیا یەك ترازوو لە دەست موسڵمان دا پەیدا ئەبێ بە درێژایی هەموو مێژوو، هەستی ئادەمی بەرز ئەبێتەوە لە ئاستی رەگەزایەتی تیرەو رەنگ و زمان و نیشتمان و لە هەموو خزمایەتی ئێستا و کۆن، بەرز ئەبێتەوە لەوانە هەموو، تەنیا شتێ نرخ دارە لە رووی راستی دا، ئەوەش ئیمان و باوەڕە بە ئایینی خوا کە کێشانەی هەمووانی پێ ئەکرێ و بە پێی ئەوە نرخ دیاریی ئەکرێ بۆ هەمووان. گەلەکەی نوح بڕوایان نەکرد بە پێغەمبەران، ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ﴾ لەکاتێك دا براکەیان کە نوح بوو، واتە یەکێ بوو لە خۆیان و لە کەس و کار و تیرەی خۆیان، پێی وتن: ﴿أَلَا تَتَّقُونَ﴾ ئایا ناترسن لەخوا و خۆتان ناپارێزن لەهۆی خەشم و سزای، واتە بترسن لێ ی بە کۆتایی هێنان لە پەرستنی هەموو شتێ جگە لە خوا، ﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ﴾ بەڕاستی من بۆ ئێوە فروستادە و پێغەمبەرێکی ئەمینم، بە بێ خیانەت و فڕو فێڵ و غەش کردن لێتان، ئەوەی پێم سپێرراوە لەلایەن خواوە پێتان رائەگەیەنم بە بێ زیاد و کەم، ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتە لەخوا بترسن و گوێ رایەڵی من بن لەوەی پێتان رائەگەیەنم. ئینجا دڵنیایان ئەکات لەبارەی تەماع و نیازی پول و پارە و دەست کەوتی ئەم جیهانەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ﴾ من داوای هیچ کرێ و پاداشتێکتان لێ ناکەم لەسەر ئەم پێغەمبەرێتی و راگەیاندنە ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ پاداشت و کرێی من لەسەر هیچ کەس نی یە جگە لەسەر پەروەردگاری هەموو جیهان، واتە تەنیا داوا لەو ئەکەم و چاوەڕوانی لای ئەوم هەیە کە بە بەزەیی و لوتفی خۆی پاداشتم بداتەوە، ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتە لەخوا بترسن و گوێ رایەڵی من بن. ئەوە بوو بە کورتی بانگ کردن و بانگەوازەکەی نوح(علیه السلام) کە یەکێ بوو لە خۆیان و خزم و برا و کەسیان بوو و بە سۆز و دڵسۆزی یەوە بانگی کردن بۆ رێگای رزگاری بە بێ فڕو فێڵ و نیازی هیچ دەست کەوتێکی ئەم جیهانە کە ئەبوایە بڕوایان بکردایە بەو برا راستەی خۆیان کە ئەیانناسی و شارەزای راستی و خوو رەوشتی شیرینی بوون، بەڵام ئەو گەلە بێ فەڕە هیچ گوێ یان شل نەکرد بۆ ئەو ئامۆژگاری یە شیرینە و بڕوایان پێ نەکرد و رەخنەیەکی نەفامانەیان ئەگرت کە لە هەموو میللەت و نەتەوەیەك نەفامان ئەو رەخنەیان گرتووە: ﴿قَالُوا﴾ وتیان بە نوح: ﴿أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ﴾ ئایا باوەڕ

ئەمێنین لەبەر تۆ و بە قسەی تۆ لە کاتێك دا کە لات و لوت و بێ نرخ و ئەوانەی کە پەست ترین کەسن شوێنت کەوتوون؟ واتە هەرگیز ئێمە شتی وا ناکەین، لە هەموو نەتەوەیەك دا ئەم جۆرە کەسانە چەسپانی یان کردووە بۆ باوەڕ هێنان بە پێغەمبەرەکەیان، چونکە ئەوانە دەمارو کەشخە و لوت بەرزی یان نەبووە تا بەهۆی ئەوەوە عاریان لێ بێت سەر داخەن و گوێ رایەڵیی بێن، بەرژەوەندی و جێ و شوێن و پایە و پلەیەکیان نەبووە تا مەترسی نەمان و لەدەست چوونی بکەن، بەڵکو بە پێچەوانە پاڵ پێوەنەری بەهێزیان بووە بۆ باوەڕ هێنان، چونکە ئەو تاقمە چەوساوە و بەش خوراو و ماف داگیر کراو بوون و ئاییینی خوایش هەمیشە دادی بلأو کردووەتەوەو مافی هەموو خاوەن مافێکی داوە و دەست درێژی و داگیر کردنی لە ڕیشە هێناوە، کەواتە ئەو تاقمە لە هەموو نەتەوەیەك دا چسپانی یان کردووە بۆ شوێن کەوتنی پێغەمبەران - درودی خوایان لێ بێت -، بەڵام تاقمی پیاو ماقوڵ و ساماندار و خاوەن جێ و شوێنەکان بەهۆی لوت بەرزی و خۆ بە زل زانی و مەترسی لە دەست دەرچوونی بەرژەوەندی و کەشخە و داگیر کردنەوە هەمیشە دواکەتوو بوون لە باوەڕ هێنان دا، زۆربەیان ئەوپەڕی دوژمنایەتی یان بەکارهێنا و هەموو هێز و توانای خۆیان بەخت کردووە بۆ بەرگری کردنی ئاییینی خوا و ڕێگا گرتن لە پێغەمبەرەکان -سەلامی خوایان لێ بێت - ئەو کۆمەڵە پڕو پووچە زۆر بە لەکە و عارێکی زلیان ئەزانی ئاییینی خوا بچەسپێ و ئەمان یەکسان بکات لەگەڵ ئەو هەموو خەڵکی ترەدا!! جا لەبەر ئەو چەند هۆیە کە باس کرا هەمیشە ئەو تاقمە خەریکی پڕ و پاگەندە و پەڵپ و بەهانە و ڕەخنە گرتن بوون لە پێغەمبەران -سەلامی خوایان لێ بێت- کە یەکێ لەو بەهانە و ڕەخنەیانە ئەم ڕەخنەیە بوو کە خەریکین بە باسەکەیەوە کە ئەمە ڕەخنە و بیانوویە کە بە تایبەتی قورئان باسی ئەفەرموێ و ئەگێڕێتەوە لە کافرەکانی قورەیشەوە لەچەند شوێنێك دا و مەبەست لەم ڕەخنە و بیانووە پڕ و پاگەندە بووبێ بەمەی کە ئەو ئاییینە ئەگەر چاك بووایە ئەو هەژار ولات و لوتە دەوریان نەئەدا، یان مەبەست ئەوە بێ کە ئەو هەژار و لاتانە لە ڕووی زانین و تێگەشتنەوە شوێنی نەکەوتوون و باوەڕ هێنانەکەیان لە ڕاستی و دڵسوزی یەوە نی یە، بەڵکو بە نیاز و چاوەڕوانی سوود و دەست کەوتێکە، یان مەبەست ئەوە بووبێ کە ئەوان ڕەوشت و باو و کرداریان پەست و ناڕەوا بووە و شایانی ئەوە نین بکەونە ناو پیاوی پیاوانەوە، لەکە و عارە بۆ کۆمەڵی ئەمان تێکەڵی ئەوان بکەن، کەواتە ئەگەر ئەیەوێ ئەمان باوەڕ بهێنن و شوێنی کەون با ئەو لات و لوتانە دەرکات و پاڵیان پێوە بنێ،

قَالَ وَمَا عِلۡمِي بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١١٢﴾ إِنۡ حِسَابُهُمۡ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّيۖ لَوۡ تَشۡعُرُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١٤﴾ إِنۡ
أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴿١١٥﴾ قَالُواْ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمَرۡجُومِينَ ﴿١١٦﴾ قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوۡمِي كَذَّبُونِ ﴿١١٧﴾ فَٱفۡتَحۡ
بَيۡنِي وَبَيۡنَهُمۡ فَتۡحٗا وَنَجِّنِي وَمَن مَّعِيَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١٨﴾ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ ﴿١١٩﴾ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا
بَعۡدُ ٱلۡبَاقِينَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٢١﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٢﴾

---

**مەبەست هەرجۆر بووبێ نوح(عليه السلام) بەرپەرچی دانەوە و دەم كوتی كردن كە لە وەڵام دا ﴿قَالَ﴾ فەرمووی پێ یان: ﴿وَمَا عِلۡمِي بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ من چوزانم و چ ئاگام هەیە لەوەی ئەمانە كردوویانە؟ من داوای باوەڕ هێنان ئەكەم لە خەڵك، ئەمانە بە دیمەن و ڕواڵەت باوەڕیان هێناوە و ئیتر هەر نیاز و هەر كردەوەیەكیان بووبێ و ببێ خوا ئەزانێ و حەواڵەی خوان، ﴿إِنۡ حِسَابُهُمۡ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّيۖ﴾ حیساب و پرسیاری نیاز و دەروون و كردەوەی تریان لەسەر هیچ كەس نی یە جگە لەسەر خوای من، چونكە تەنیا ئەو ئاگادارە بەسەر ئەو جۆرە شتانەدا، ﴿لَوۡ تَشۡعُرُونَ﴾ ئەگەر ئێوە زانا و خاوەن هەست بن ئەوە ئەزانن، بەڵام نەفام و نەزانن بە هۆی ئەوەوە شتێ ئەڵێن كە نایزانن، ﴿وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ من نیم بە دەركەری باوەڕداران ﴿إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٞ﴾من هیچ نیم جگە لەوە ترسێنەرێكی ئاشكرام، واتە من پیاوێكم ڕەوانە كراوم بۆ ترساندنی خەڵكی لە بێ باوەڕیی و گوناهو تاوان، ئیتر ئەوانەی بانگیان ئەكەم و ئەیان ترسێنم ساماندار و بەرز و ماقوڵ بن یان هەژار و بێ نەواو پەست و ژێر دەستە و نەزان بن؟ كەواتە چۆن شایان و ڕەوایە من باوەڕدار دەركەم بۆ ئەمەی دەوڵەمەند و سامان دار بكەوێتە شوێنم؟ یا من لەسەرمە ئێوە بترسێنم بە ڕوونی ئتر كاری من دەركردنی هەژاران نی یە لەبەر خاتری دڵی سامان و دارایی دار. لە دوای ئەوە نوح(عليه السلام) بەو جۆرە بەهێزە دەم كوتی كردن و ئەو گەلە مل هوڕە سەركێشە یەك كەوتوو دەستە پاچە بوون لە وەڵام دانەوە و هیچ وتە و قسەیەكی ژێری یان بە دەستەوە نەما،ئینجا بە پێ ی باوی سەركێش و مل هوڕان دەستیان كرد بە هەڕەشە و تاپاڵ ﴿قَالُواْ﴾ وتیان بە نوح پێغەمبەر(عليه السلام): ﴿لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمَرۡجُومِينَ﴾ ئەی نوح ئەگەر كۆتایی نەهێنی لەوەی ئەیڵێیت و لەو بارەی كەوای لەسەر بێگومان ئەبێ بە یەكێ لە بەرد باران كراوان و ئەچیتە ڕیزی ئەوانەوە، واتە ئەتكوژین بە بەردباران كردن، ئینجا نوح(عليه السلام) ڕووی كردە تاقە خاوەن و یارمەتی دوری و نزای كردە لای خوای خۆی كە پەنای خۆی و باوەڕ دارەكان بدات و ڕزگاریان بكات ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿رَبِّ إِنَّ قَوۡمِي كَذَّبُونِ﴾ ئەی پەروەردگارم بێ گومان گەلەكەم بڕوای پێ نەكردم و بە درۆزنی**

دانام، بێگومان خوا ئەزانێ گەلەکەی نوح بڕوای نەهێنا، بەڵام وتنەکەی نوح پێویستە، چونکە نزا و لاڵە و داوای یارمەتی و تۆڵە سەندنی پێویستە بە دەم بوترێ، لەبەر ئەوە وتنە پەرستنە و دان نانە بە گێڕانەوەی هەموو کارێ بۆ لای خوا کە ئەوەش پێویستی سەرشانی هەموو بەندەیەکە، ﴿ فَٱفۡتَحۡ بَيۡنِي وَبَيۡنَهُمۡ فَتۡحٗا ﴾ کەواتە حوکم و بڕیارێ کە خراپە کار و تاوان باری پێ لەناو بەری و تۆڵەی لێ بسێنێ،ڕاست و چاکانی پێ سەرخەیت، ﴿وَنَجِّنِي وَمَن مَّعِيَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ ڕزگارم بکە خۆم و ئەوەی لەگەڵمە لە باوەڕداران، خوای خاوەن بەزەیی نزای پێغەمبەرەکەی وەرگرت کە هەڕەشەی لێ کرا بوو بە کوشتن و بەرد باران لە لایەن سەرکێش و بێ باوەڕانەوە لەسەر ئەوەی بانگی خەڵکی ئەکات بۆ لە خوا ترسان و پەرستنی خوا، گوێ ڕایەڵیی پێغەمبەری خوا، داوای هیچ پول و پارە و کرێ یەکیش ناکات و نیازی هیچ مەبەستێکی ئەم جیهانە نی یە، شێوە و چۆنی یەتی وەرگرتنی ئەو نزایەی باس فەرمووە لە شوێنێکی تردا بە درێژی، لێرەدا بە کورتی ئەفەرموێ: ﴿ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ * ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا بَعۡدُ ٱلۡبَاقِينَ﴾ نوح ئەو نزایەی کرد و ئینجا ئێمەش نوح و ئەو کەسەی کە لەگەڵی بوو ڕزگارمان کردن لەو کەشتی یەی پڕ کرا بوو،ڕزگارمان کردن لە خنکاندن لە ئاوی تۆفان و ئینجا لە پاش ڕزگار کردنی ئەوان ئەوانەی کە مانەوە و نەچوونە ناو کەشتی یەکەوە و هەموو خنکاندن ئەو چەند ڕستەیە ئەهێنێ بە دوای گێڕانەوەی سەگوزەشتەدا، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ * وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ سەرگوزەشتەی چوارەم هود پێغەمبەر و گەلەکەیەتی کە ناوبانگە بە عاد و بە ناوی باپیرە گەورەیانەوە، ئەم گەلە دائەنیشتن لە وڵاتێك دا نزیکی(حضرموت) و ناوبانگ بوو بە(الأحقاف) واتە چەند چیا و شاخێکی لمین، ئەم گەلە لە پاش گەلەکەی نوح هاتن، ماوەیەگ پاش تۆفان کە سەر زەوی پاگ کردەوە لە بێ بڕوا و ستەمکاران، ئەم گەلە لە پەیدا بوون و ئەمانیش بە وێنەی گەلەکەی نوح ڕێگای بێ باوەڕی و بت پەرستی یان دایە بەر و ئینجا خوا هود پێغەمبەری بۆ ڕەوانە کردن – سەلامی خوایان لێ بێت – زۆربەی ئەو گەلە سەرکێش و مل هوڕ بوون و بڕوایان نەهێنا تا خوا ئەوانیشی لە ڕیشە هێنا بە وێنەی گەلەکەی نوح،ئەم سەر گوزەشتەیە بە درێژی لە سورەتی(الأعراف و هود) دا تێپەڕی کرد و باس کرا، هەرچۆنێ لە سورەتی(المؤنون) دا هەر باس کرا، بەڵام بە بێ باسی عاد و هود، لێرەدا بە کورتی ئەیخاتە پێش چاو و ئەم سەر و ئەوسەری باس ئەفەرموێ: بانگ کردنی هود بۆیان، دوا ڕۆژ و چارەنووسێ کە بێ بڕواکانی پێگەیشت، دەست پێ ئەکات بە چەند ڕستەیەك سەرگوزەشتەکەی نوحی دەست پێ کرد،

كَذَّبَتۡ عَادٌ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ﴿١٢٥﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ
وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٢٧﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتۡ عَادٌ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ ئەو گەلەی کە بە ناوبانگ بوو بە عاد بڕوای نەکرد بە پێغەمبەران و بە درۆزنیان دانا ﴿إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ﴾ لەکاتێك دا کە هودی برایان وتی پێ یان: ئایا ناترسن لە خوا و خۆتان ناپارێزن لە هۆی خەشم و سزای، واتە بترسن و خۆتان بپارێزن ﴿إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ﴾ بە ڕاستی من بۆ ئێوە نێراو و پێغەمبەرێکی ئەمینم ڕاستتان لەگەڵ ئەکەم و بێ فڕ و فێڵ و ئەوەی پێم سپێراوە لە لایەن خواوە پێتان ڕائەگەیەنم ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتە لە خوا بترسن و گوێ ڕایەڵی من بن، ﴿وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ﴾ من داوای هیچ کرێ و پاداشتێکتان لێ ناکەم لەسەر ئەم پێغەمبەرێتی و ڕاگەیاندنە: ﴿إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ ئەجر و پاداشتی من لەسەر هیچ کەس نی یە جگە لەسەر پەروەردگاری هەموو جیهان...

کورتە و پاڵفتەی ئەوەی هەموو پێغەمبەرێ ڕایگەیاندووە بریتی یە لە یەك شت و یەك مەبەست، بانگ کردنی خەڵك بوو بۆ لە خوا ترسی و گوێ ڕایەڵیی پێغەمبەری خوا، جاڕدان و دەربڕینی ئەوەی کە پێغەمبەر بە تەما و چاوەڕوانی هیچ شتێك دەست کەوتێکی ئەم جیهانە نی یە لە لایەن ئەو گەلەی کە بۆی ڕەوانە کراوە و چاوەڕوان و ئومێدی تەنیا بە پاداشتی خوایە. ئینجا لە پاش ئەوە کار و کردەوە و شتێکی پێ ڕاگەیاندن کە تایبەت بوو بەو گەلەوە، بێزاری دەربڕی لەو کار و کردەوەیانە، ئەوەش بریتی بوو لە سێ شت:

١- زیادە ڕەوی یان لە دروست کردنی کۆشك و خانووی زۆر بۆ کەشخە و شانازی بە مل خەڵك دا بە زۆر و دەسەڵات و سامان و دارایی فراوان.

٢- هەڵخەڵەتانیان بەخۆشی و کاروباری ئەم جیهانەو بێ ئاگایی یان لە خوا و ترسان لێی.

٣- دڵ ڕەقی و بێ بەزەیی یان.

أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ
جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾ وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾
وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣٥﴾ قَالُوا سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَوَعَظْتَ أَمْ
لَمْ تَكُن مِّنَ الْوَاعِظِينَ ﴿١٣٦﴾ إِنْ هَٰذَا إِلَّا خُلُقُ الْأَوَّلِينَ ﴿١٣٧﴾ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿١٣٨﴾

**ئینجا با لەڕیز گوێ شل بکەین بۆ هەر سێکیان:**

**١- فەرموی پـێ یـان: ﴿أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ﴾ ئایـا ئێـوە لـە هـەموو شـوێنێکی بـەرزدا خانوویـەك دروسـت ئەکـەن کـە بـە وێنـەی نیشانەیەکی ڕوون و بەیـداخ لـە دوورەوە دەرئەکـەوێ لـە کاتێکدا کە شتێکی خۆڕایی و بـێ سـوود و بـێ نرخ ئەکـەن، چونکە مەبەسـتتان کەشـخە و شـانازی و تـەنیا دەرخستنی لـێ هـاتنو دەسـەڵاتە کە ئـەوەش مەبەستێکی بێ سوود و دوا بڕاوە، واتە بەخت کردنی سامان و لـێ هـاتن و تێکۆشان ئەبێ بۆ شتێك بێت کە سوود بەخش بێت بۆ مەردوم.**

**٢- ئەفـەرموێ: ﴿وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ﴾[1] چـەند کۆشـك و قـەڵای بـەتین فەراهـەم ئەهێنن، ئایا کارگە و جێگای پیشە سازی فەراهەم ئەهێنن بۆ تاشینی بەرد و کون کردنی شاخ و دروسـت کردنـی کۆشـك و داڕشـتن و بـەرز کردنـەوەی ئـەو نیشانانەی بەسەر بەرزی یەکانەوە، ئەمانەش کە ئەکەن وەکو ئێوە هـەرگیز ئەمرن و هـەتا هەتایە بەم جیهانەدا بمێننەوە، لەوانە ئەوە لە دڵتان دا بێت و لاتان وابێ کە ئەمانـەی ئەیکـەن بـەس بـن بـۆ پاراسـتنتان لـە مـردن و هـۆی مـردن و پـەلاماردانی دوژمـن و هـەموو سەرهاتێکی خراپ.**

**٣- ﴿وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ﴾ کـاتێ دەسـت بوەشـێنن لـە مـەردوم دەسـت ئەوەشـێنن بە ناڕەوا و ستەمکاریی و دڵ ڕەقی بەبێ لەزەیی و سەر لێ کردنەوە و بە بێ نازێ تـەقێ کـردن، ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتـە لـە خـوا بترسـن و خۆتـان بپـارێزن لـە خەشـم و هـۆی**

---

[1] ئەم دوو ئایەتە بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراونەتەوە، بەڵام ئەوەی کە لە تەفسیرەکەدایە باوەڕم بەهێزتـرە پـێ ی، خوا خۆی باش ئەزانێ

سزای سەختی، گوێ ڕایەڵیم بکەن، ئینجا خوا بەهرە و چاکەی خوای بیر خستنەوە بەسەریانەوە، لە یەکەم جارەوە بە کورتی و لە پاشان بە درێژی. کەواتە پێویستە لەسەریان سوپاس و گوێ ڕایەڵی خوا بکەن و بترسن لەوە لێ یان تێك بدات و ئەوەی پێ ی داون لێ یان بسێنێتەوە، سزای بە تینیان بدات،فەرموی پێ یان: ﴿وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ﴾ بترسن و خۆتان بپارێزن لە تۆڵە و سزای کەسێ کە یارمەتی ئێوەی داوە بە هەموو چاکە و بەهرەی کە ڕشتوویەتی بەسەرتان دا و خۆتان ئەزانن و ئەیناسن، ﴿أَمَدَّكُم بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ * وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾ یارمەتی داون بە حوشتر و وڵاخو ماڵات و کوڕی زۆر،بە چەند باغ و کانی چاوی تێ بڕیون، هەروەها ئەمانە بەهرە و چاکەیەکی گەورەن لە هەموو چەخێك دا، ئینجا ترساندنی بە شێوەیەکی برایانە و سۆز و بەزەیی پێ یان دا، فەرمووی: ﴿إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ بە ڕاستی من مەترسی سزای ڕۆژێکی زۆر گەورە کە بێتە سەرتان ئەگەر کۆتایی نەهێنن لەو بارەی وان لەسەری و نەگەڕێنەوە بۆ لای خوا و سوپاسی ئەو هەموو چاکەی نەکەن، بەڵام مۆچیاری و تەمێ و ترساندن کار ناکات لەو دڵە و شکە ڕەق و تەقەی ئەوانە، لەبەر ئەوە ﴿قَالُوا﴾ وتیان بەهود(علیە السلام) ﴿سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُن مِّنَ الْوَاعِظِينَ﴾ یەکسانە لەسەرمان ئایا تەمێ و مۆچیاری بکەیت یان تۆ هەر لە مۆچیاری کەرانیش نەبیت،واتە هیچ گوێمان نی یە لە مۆچیاری تۆ و واز ناهێنین ﴿إِنْ هَٰذَا إِلَّا خُلُقُ الْأَوَّلِينَ﴾ [1] چونکە ئەم ئایینەی کە ئێمەی لەسەرین هیچ شتێ تر نی یە جگە لە باو و ڕەوشت و ڕێگای پێشووەکان، کەواتە هەر لەسەری ئەڕۆین و ﴿وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾ ئێمە نابین بە سزا دراو و سزا نادرێین لەسەر پەیڕەوی ئەوان. ئینجا بە پێ ی مەبەست لە گێڕانەوەی سەرگوزەشتەکانی ئەم سورەتە هیچ درێژە نادات بەو قسە و باسەی ڕووی دا لە نێوان هود و گەلە سەرکێشەدا، بەڵکو بە دوو وشە باسەکە دوایی پێ ئەهێنێ و ئەو گەلە مل هوڕە ئەپێچێتەوە و لە پێش چاو لایان ئەبات بە خۆیان و هەموو کۆشك و سامان و عەنعەنەو تەنتەنەیانەوە،

---

[1] وشەی ﴿ خَلق ﴾ باوە ئێستا وە بە ﴿خُلق و خَلق ﴾ یش خوێنراوەتەوە، بە هەرحاڵ بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتوە و مەبەستەکە یەك شتە.

فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَٰهُمْۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةًۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٤٠﴾ كَذَّبَتْ
ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ
﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِي
جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ ﴿١٤٩﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿فَكَذَّبُوهُ﴾ گەلەکەی هود بڕوایان نەمێناوە و هودیان بە درۆزن دانا ﴿فَأَهْلَكْنَٰهُمْۚ﴾ بەهۆی ئەوەوە ئێمەیش بەربادمان کردن، ئای چەند گەل و میللەت لە پاش عاد هاتن وەکو ئەوان هەڵخەڵەتان بەم جیهانە و بەم ژیانی ئەم جیهانە، هەتا لە شارستانی دا پێشکەوتن و دوور کەوتنەوە لە خوا، لایان وا بوو هیچ پێویستیان بە خوا نی یە ماتوڵ خۆیان لێ هاتوون و هۆی ژیان و زاڵ بوون و سەرکەوتنیان لە ژێر دەست دایە... کەچی لە ناکاودا سزای سەختی خوا داباری بەسەریان دا و لە ناوی بردن، کەواتە با خەڵکی ژێر بن و بەمان تەمێ خوار بن ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةًۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ * وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ ئینجا گەلی ثمود دێتە سەرباس کە عەرەب بوون و لە شاری(حجر) دائەنیشتن لە نێوان حیجاز و شام دا، ئەمیش پێغەمبەرەکەیان بانگی کردن بەو جۆرە وێنەی کە هەموو پێغەمبەرێ بانگی گەل و نەتەوەکەی کردووە. قورئان بانگ کردنی ئەو پێغەمبەرانە -درودی خوایان لەسەر بێت- بە یەك وشە و بە یەك شێوە ئەگێڕێتەوە تا بزانرێ کە ئایینی خوا لە بنەڕەت و مەبەست دا یەك شتە، پێغەمبەران هەموو بۆ مەبەستێ نێراون کە بریتی یە لە باوەڕ بە خوا و ترسان لێ ی و گوێ ڕایەڵیی پێغەمبەر، ئەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ * إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ * إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ * فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ * وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ ئەو گەلە ژیانێکی ئێجگار خۆشیان هەبوو، لە هەموو بارێکەوە تێر و تەواو بوون، بەڵام بێ ترس و بێ ئاگا لە خوا، جا صالح پێغەمبەر(علیه السلام) ئەو ناز و نیعمەتەی خستنە پێش چاو و ترساندنی**

لە نەمان و لێ سەندنەوەی، هەروەهاترساندنی لە دوا ڕۆژ و حیساب و پرسیار لێ یان، بێزاری دەبڕی لە بێ باکی و بێ ئاگایی یان، فەرموی: ﴿أَتُتۡرَكُونَ فِي مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ﴾ ئایا وازتان لێ ئەهێنرێ و ئەمێڵرێنەوە لەم ناز و نیعمەتەی کە هەیە و جێگیرە بۆتان لێرەدا و لەم وڵاتی خۆتانەدا، هەر ئاوا ئەژین بە هێمنی و بە بێ ترس و بیم لە نەمان و لە گۆڕان و لە هیچ شتێ؟ واتە گومانتان وا نەبێ کە ئەم ژیانەتان هەروا ئەڕوا، بەڵکو پێویستە بیر بکەنەوە لەمەی خوا پێ ی داون و بزانن کە ئەمە هیچی نامێنێ و جیهانێکی تر دێتە پێشەوە و ئێوە ئەگەڕێنەوە بۆ لای خوا و بە پێ ی کردەوەتان ڕەفتارتان لەگەڵ ئەکرێ. لە پێشەوە بە کورتی و بەبێ دیاریی کردن و ناز و نیعمەتەکەی خستنە پێش چاو، ئینجا بە درێژیش بۆ باس کردن، فەرموی: ﴿فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ﴾ واتە ئایا وازتان لێ ئەهێنرێ بۆ خۆتان بژین لە ناو باخات و کانی و چەشمەی زۆردا، ﴿وَزُرُوعٖ وَنَخۡلٖ طَلۡعُهَا هَضِيمٞ﴾ لە ناو کشت و کاڵی زۆر فراوان و باخی خورکایە کە بەر و میوەکەی پێگەیشتوو و نەرمە و بە ئاسانی هەضم ئەکرێ، یان ناسك و پڕە و چووە بە یەك دا و هێشووەکەی شۆڕ بووەتەوە لەبەر زۆری، یان مەبەست ئەوەیە چەکەرەی بەرەکەی زۆر نەرم و ناسکە، چونکە هێنی دارخورمای مێینە نەك نێر، کەواتە خورماکەی زۆر چاکە، بەهەر جۆر و بە هەر حاڵ دار خورمای جوێ کردەوە لە درەختەکانی باخەکان و بە تایبەتی ناوی برد، چونکە شتێکی زۆر بە کەڵك و بەکارە لە ژیانی ئادەمی دا لە کەلێ بار و ڕووەوە.. ﴿وَتَنۡحِتُونَ مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتٗا فَٰرِهِينَ﴾ ئێوە لە شار و کەژەکان خانوو دائەبڕن و دای ئەتاشن بە کەشخە و دەمار و لوت بەرزی یەوە، یان بە لێ هاتن و لێزانینەوە، واتە ئایا ئێوە ئەمێڵرێنەوە لەو خانووانەدا کە داتان بڕیوون لە شاخەکان؟ لە پاش ئەوە دای لە دڵیان بە بیر خستنەوەی ئەو هەموو شتە گرنگانە و سام و ترس خستنە بەرە، ئینجا بانگیان ئەکات بۆ لە خوا ترسان، گوێ ڕایەڵیی و بۆ هەڵسانیان بە پێچەوانە و دژی خراپە کەران و دەست درێژی کەرانی گەلەکەیان،

فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوا أَمْرَ الْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ الَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾
قَالُوا إِنَّمَا أَنتَ مِنَ الْمُسَحَّرِينَ ﴿١٥٣﴾ مَا أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِآيَةٍ إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴿١٥٤﴾

فەرموی: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتە لە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن لێ ی، گوێ ڕایەڵی من بن ﴿وَلَا تُطِيعُوا أَمْرَ الْمُسْرِفِينَ﴾ گوێ ڕایەڵی فەرمانی کەسانێ مەکەن کە زیادە ڕەوی کەرن لە گوناهو تاوان و سەرکێشی لە خوا، واتە گەورە و سەرۆکەکانتان ﴿الَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ﴾ کە ئەوان خراپە بڵاو ئەکەنەوەو ئاژاوە ئەنێنەوە لە وڵات و زەوی دا و چاکە ناخەنە ناو و هیچ خراپێ چاك ناکەن، واتە هەر کردەوەی خراپیان هەیە بێ ئەوەی چاکەی تێکەڵ بکەن، ئەمانە نۆ کەس بوون لە وڵاتەکەدا هەمیشە خەریکی خراپکاری بوون و بە هەموو جۆرە پیلانیان ئەگێڕا دەبارەی ئایین و پێغەمبەرەکەیان کە بەو شێوەیە ڕێك و ڕاستە ئامۆژگاری کردن و بانگی کردن بۆ ڕێگای ڕاست، بەڵام ئەو هەوڵ و تەقالا و بانگ کردنە کار ناکات لەو دڵە ڕەق و تەقە مردووەی ئەو گەلە بێ ئاگایە، لەبەر ئەوە گوێ یان نەگرت و نەرم بوون، وەڵامیان دایەوە بەم جۆرە نەفامی و بێ نەزاکەتی یە، ﴿قَالُوا﴾ وتیان بە صالح پێغەمبەر(علیه السلام) ﴿إِنَّمَا أَنتَ مِنَ الْمُسَحَّرِينَ﴾ تۆ هیچ نیت جگە لەوەی یەکێکی لە جادو لێ کراوان کە ئەوەندە جادویان لێ کراوە تا شێت بوون و ژیریی یان تێك دراوە، واتە تۆ شێت و سەر لێ تێك دراوی، کەواتە گوێت لێ ناگرین، ﴿مَا أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا﴾ تۆ نیت دجگە لەوەی ئادەمی یەکی وێنەی ئێمە، واتە ماتۆڵ تۆ ئادەمیت نابێ پێغەمبەر بیت. ئەم ڕەخنە بێ جێ و ناڕەوا نەفام و نەزانەکانی هەموو گەل و نەتەوەیەك گرتیان بە دەستەوە، لەبەر نەفامی و نەزانی یان لایان وا بوو کە پێغەمبەر ناگونجێ لە ئادەمی بێت ماتۆڵ هەواڵ ئەهێنێ لە

ئاسمانەوە، ئەو نەفام و نەزانانە بێ ئاگا بوون لەوە کە پێغەمبەری ئادەمی ناگونجێ لە ئادەمی بێت [1] ئەوانە تێنەگەیشتوون لە ڕادە و پلەی بەرزی ئەم جۆرە گیان لەبەرە، خۆیان نەفام و نەزان و بێ بەش بوون بەهۆی ئەوەوە بڕوایان نەبوو کە ئادەمی گیان لەبەرێکی جیاوازە و لێ هاتوو و ئامادەیە بۆ ئەمە لەم زەوی یەدا بژی بە سروشتی ئادەمی یانە، بەم ڕەنگە بخەوێ و بخوا و بخواتەوە و هەڵسێ و دانیشێ و بگەڕێ بە دەر و دەشت و بازاڕ و لەگەڵ ئەوەدا پەیوەندی ببێ بە ئاسمان و کۆمەڵی هەرە بەرزەوە، هەروەها لە هەموو گەل و نەتەوەیەك دا پەڵپ و بیانوو گیراوە لە پێغەمبەران، داوای بەڵگە و نیشانە و موعجیزەیان لێ کراوە، وەکو ئەم گەلە کە وتیان بە صالح: ﴿فَأۡتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ دەی کەواتە بەڵگە و نیشانەیەکی ڕوون بهێنە ئەگەر تۆ ڕاست ئەکەیت و یەکێکی لە ڕاست گۆیان، ئەگێڕنەوە کە پەڵپیان بەست و داوایان کرد پێش چاویانەوە حوشترێکیان بۆ دەربهێنێ لەبەردێ کە خۆیان دیاریی یان کرد، ئەو حوشترەش ئاوس بێت و لە کاتی مانگی دەیەمی ئاوسی دا بێت، ئینجا بزێ و بێچوویەکی گەورەی بە قەد خۆی ببێ، ئەویش داوای کرد لە خوا و خوایش بە گوێرەی پەڵپ و داواکەیان مەبەستەکەیانی بەدی هێنا و ئینجا صالح پێغەمبەر(علیه السلام)،

[1] لێکۆڵینەوە و ڕوون کردنەوەی ئەم مەبەستە لە چەند شوێنێکی تردا بە جوانی باس کراوە، بە تایبەتی لە سورەتی(یس) دا کە لە پێش ئەم سورەتەوە تەفسیرمان کرد، کەواتە پێویست نی یە لێرەدا دووبارە کردنەوە و با سەرنجی ئەوێ بدرێ.

قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ
﴿١٥٦﴾ فَعَقَرُوهَا فَأَصْبَحُوا۟ نَٰدِمِينَ ﴿١٥٧﴾

---

﴿قَالَ﴾ فەرمووی پێ یان: ﴿هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ﴾ ئەمە حوشترێکی مێینە نیشانە و موعجیزەیەکی ئاشکرایە لە لایەن خواوە بۆی هەیە بەشە ئاوێکی خۆی لە ڕۆژی تایبەتی دیاریی کراودا و بۆ ئێوەش بەشە ئاوی خۆتان هەیە لە ڕۆژێکی زانراوی دیاری کراودا، واتە ئاوی ئەو بیرە دابەشە لە نێوان ئەم و ئێوەدا، ڕۆژێ بۆ ئەم و ڕۆژێ بۆ ئێوە کەستان مەچن بەسەر هیچ کام دا ﴿وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ﴾ هیچ سزا و خراپەیەکی دەربارە مەکەن ﴿فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە و لە تۆڵەی دا سزای ڕۆژێکی زۆر گەورە بتانگرێ و بێتە سەرتان، واتە سزای ڕۆژێ کە زۆر گەورەیە بەهۆی زۆر گەورەیی و زۆر سەختی ئەو سزای تیای دا ڕوو ئەدات، ئینجا ئایا ئەو موعجیزە زۆر گەورە و ئەو نیشانە و بەڵگە ئاشکرایە کاری کرد لە دڵ و دەروونی ئەو گەلە مل هوڕەدا؟ نەخێر کاری لێ نەکردن و ئیمان و باوەڕی لە دڵیان نەڕواند و ڕووناکی فەراهەم نەهێنا لە هەست و دەروونە تاریکەکەیان دا، لەگەڵ ئەوەدا ئەوەندە شتێکی نایابی سەر سوڕ هێنەر بوو هەست و هۆشی داگیر کردبوون و بەری لێ بڕی بوونەوە، کەواتە وادە و پەیمانەکەیان نەبردە سەر و ئەو مەرجەی لێ وەرگرتن هەڵنەسان پێ ی وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَعَقَرُوهَا﴾ ئینجا ئەو حوشترەیان سەر بڕی، ﴿فَأَصْبَحُوا۟ نَٰدِمِينَ﴾ ئینجا پەشیمان بوونەوە لەسەر بڕینەکەی لەبەر بیم و ترسیان لە هاتنی سزا و تۆڵەی نەك بە نیازی گەڕانەوە و تۆبە بۆ لای خوا، یان ئەگەر بەو نیازەس بووبێتەو گەڕانەوە تازە وەرناگیرێ، چونکە کاتی هاتنی سزاکە و بەدی هاتنی بوو، تۆبە و گەڕانەوەش لەو کاتەدا وەرناگیرێ، چونکە کاتی ئائومێدی یە وەکو خوا ئەفەرموێ: ﴿وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّى تُبْتُ ٱلْـَٰٔنَ﴾ واتە تۆبە و گەڕانەوە وەرناگیرێ و نی یە بۆ ئەوانەی کە کردەوە خراپەکان ئەکەن و کۆتایی لێ ناهێنن و پەشیمان نابنەوە هەتا مەرگ ئامادەی هەرکامیان ئەبێ و ئەو کاتە ئەڵێ بە ڕاستی ئێستا ئەوا پەشیمانم و ئەگەڕێمەوە بۆ لای خوا.

﴿ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ ﴾ بەهۆی ئەوەوە سزای بەتینی ئەو ڕۆژە گەورەیە گرتنی و داگیر کردن. ئەو سەر بڕینە هەرچەندە لە لایەن هەموانەوە نەبوو، بە دەستی هەمووان بەدی نەهات، بەڵام بە ڕەزامەندی هەمو بەدی هات و هیچ بەرگری کەرێکیان نەبوو بەهۆی ئەوەوە بە کردەوەی هەموو پیشان دا و تۆڵە و سزاکەی بۆ هەموو بوو. هەموو گوناهێکی تریش هەر بەو جۆرەیە، هەرکەس ئاگادار بێت بە هەر گوناهیٚ و بە پیٚ ی توانا هەوڵ نەدات بۆ بەرگری ئەو کەسە بەشدارە لەو گوناهەدا، ئەمە شتێکی زانراوە لە ئایینی ئیسلام دا و ڕوون کراوەتەوە بە چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر(علیه السلام) جا بەهۆی ئەوەوە قوڕی خەست کراوە بەسەر هەمووان دا، چ ئەوانەی گوناهەکان ئەکەن و چ ئەوانەمان کە بە پیاوی چاکە تەماشا ئەکریٚ و بە ڕواڵەت دوورین لەو گوناهو تاوانە، بەڵام بیٚ دەنگ و بە ئارام لیٚ یان دانیشتووین و دەستمان گرتووە بە کڵاوە شڕی خۆمان و ئەڵێین چی بکەین دونیاکە خراپ بوو و تازە بە ئێمە چاك ناکریٚ!! بەڕاستی ئەم جۆرە عوزرانە هیچ پەڕۆیەکمان بۆ ناکات و خوا خۆی چاکمان ئەناسیٚ و ئاگادارە بەسەر هەموو نیاز و خەتەرەیەك دا، خوا بە گوێرەی خراپی خۆمانمان لەگەڵ ئەکات، بەڵکو بەزەیی یە بیٚ سنورەکەی خۆیمان بۆ بخاتە کار آمین. بێگومان گەلیٚ کەس هەن سەریان سوڕ ئەمێنیٚ و سەرسام ئەبن لە ئاستی ئەم جۆرە موعجیزانە کە خوا دای بە پێغەمبەران، بۆ وێنە سەرسام ئەبیٚ لەمەی حوشتریٚ بێتە دەرەوە لە بەردێکی ڕەق و تەق، لە دەروونی خۆیدا، یان بە دەمیش ئەڵیٚ: ئایا چۆن شتی وا ئەگونجیٚ؟ بەڵام بە ڕاستی هەرکەس شتی وا بڵیٚ یان بە دڵیشی دا گوزەر بکات زۆر زۆر جێگای سەرسوڕمانە، بە ڕاستی هەرکەس دڵسۆز بێت بۆ ئەو جۆرە ئادەمی یانە ئەوەی هەیەبەزەیی بێتەوە پیٚ یان دا و گریانی بێت بۆ حاڵیان کە چۆن ئەوان لەسەر ڕێگای ژیریی ترازاون؟ چۆن تا ئەو ڕادە بیٚ هۆش و نەفامن؟ بێگومان ئیمان و باوەڕداری ڕاستەقینە هەرگیز سەرناکاتەوە لەو جۆرە شتانە و ئەزانیٚ خوا دەسەلات و توانینی بیٚ سنووری هەیە و زاڵە بەسەر هەر شتێك دا مەیل و خواستی لیٚ ببیٚ، ئەوانەی کەسەر ئەکەنەوە بیٚ باوەڕەکانن، دەی ئایا بۆ بیریٚ ناکەنەوە لەو هەموو گیان لەبەرە کەلەم خاك و زەوی یە

دەرئەچێ و دێتە دەرەوە؟ ئایا چ جیاوازی یەك هەیە لە نێوان پەیدا بوونی ئەو دوو جۆرە پەیدا بوونی ئەو حوشترە کە لەو بەردە هاتە دەرەوە لەگەڵ پەیدا بوون و فەراهەم هاتنی ئەم هەموو حوشترەی تر؟ ئایا ئەم هەموو حوشتری ترە لە خاك فەراهەم نایەت؟ جیاوازی ئەم دوو جۆرە پەیدا بوونە مەگەر هەر لەم ڕووەوە بێت کە ئەم جۆرەیان دەقی پێوە گیراوە و بەهۆی ئەوەوە لە پێش چاو کۆن بووە و نایابی یەکەی لە بیر چووەتەوە و ئەو جۆرەکەیان نەبینراوە، بە ڕاستی زۆر سەیرە ئەوانە بە چاو ئەو زەوی ئاسمان و مانگ و ئەستێرە و خۆر و ئەم هەموو شتی ترە ئەبینن بەم هەموو ڕێك و پێکی و ڕژێمە نەگۆڕاوە دامەزراوە، بیری ناکەنەوە لەوە کە چۆن ئەمە هەموو فەراهەم هات؟ ئایا خۆی خۆی فەراهەم هێنا؟!! ئایا بە ڕێکەوت پەیدا بوو؟!! بێگومان هەرکەس هۆشی بەلای خۆیەوە بێت تەریق ئەبێتەوە و شەرم ئەکات لەو دوو بارە بڵێت و باوەڕی پێ ی هەبێ، کەواتە ناچار ئەبێ هەر بڵێ: بە دەستێکی دەسەڵاتی توانای زانای لێزان ئەم هەموو شتە فەراهەم هاتوو، دەی کەسێ ئەمانە دروست بکات و فەراهەمی بێنێ بۆ ئەبێ نەتوانێ حوشترێ لە بەرد بێنێتە دەر یان هەر جۆرە موعجیزەیەکی تر؟ خوا بە بەزەیی خۆی ڕێگامان لێ ون نەکات و سەرمان لێ تێك نەدات،آمین. ئینجا با بگەڕێنەوە بۆ لای قورئان وریا و بێدارمان بکاتەوە و کۆتایی ئەم بەسەرهات و سەرگوزەشتەشمان بۆ بێنێ بەو چەند ڕستەیە کە لەم سورەتەدا سەرگوزەشتەکانی پێ دوایی ئەهێنێ، کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ * وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴾ ئینجا سەرگوزەشتەی لوط پێغەمبەر دێتە پێشەوە لێرەدا، بە پێ ی مێژوو ئەبوایە لە کاتی سەگوزەشتەی ئیبراهیم دا باس بکرایە و لەگەڵ ئەوا بوایە، چونکە لە چەرخێك دا بوون و جێگای شوێنیان نزیك بووە لە یەکەوە، لوط برازایشی بووە و بەسەرهات و سەرگوزەشتەیشیان پەیوەندی یان هەیە و بەشێکیان تێکەڵن، بەڵام لەم سورەتەدا تێبینی ئەوە نەکراوە و بە پێ ی دواوبەری چەرخ و مێژوو هەموو سەرگوزەشتەکان ڕیز نەکراون، ئەوەی تێبینی کرابێ و مەبەستە ڕوون کردنەوەی یەکێتی پەیام و بەرنامەیە لەگەڵ چارەنووس و دوا ڕۆژی ئەو نەتەوە و گەلانە هەر لەم جیهانەدا پێش هاتنی ڕۆژی دوایی کە لە هەمووان دا باوەڕ داران ڕزگار کران و بێ بڕواکان سزا دران و بەربادکران.

كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٦٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٦٢﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ
وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٦٤﴾ أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ
ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٦٥﴾ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴿١٦٦﴾

---

ئەم پێغەمبەرەش دەست پێ ئەکات لە ڕاگەیاندنی پەیامەکەی و بانگ کردنی بەوجۆرە و شێوەی کە نوح و ئیبراهیم و صالح دەستیان پێ کرد –سەلامی خوا لە هەمووان بێت– وەکو بۆمان ڕوون ئەکاتەوە: کە ئەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ * إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ * إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ * فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ * وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ وێنەی ئەم چەند ڕستە و ئایەتە تێپەڕی کرد و ڕاڤە و تەفسیر کرانەوە، کەواتە لێرەدا لەو بارەیەوە پێویست نی یە هیچ بڵێین. ئینجا دوای ئەوە لوط(علیه السلام) ڕوو بەڕوویان وەستاوە و بەرگری کردن و بێزاری دەربڕی دەربارەی گوناهێکی زۆر پیس کە باو بوو لە ناو ئەو گەلەدا و بە ناو بانگ و ناسراو بوون پێ ی، کە ئەوەش بریتی بوو لە نێر بازی. بێگومان پێغەمبەران –سەلامی خوایان لێ بێت– ڕەوانە کراون وەکو پزیشك بۆ چارەسەر کردن و تیمار کردنی هەموو نەخۆشی و دەرد و زامێکی ئادەمی لە هەموو بار و ڕوویەکی ژیان و جیهانی یەوە، کەواتە ئەبێ دەست پێ بکەن لە پیس ترین دەرد و خراپترین نەخۆشی یەوە و ئینجا بە چارەسەرکردنی کام نەخۆشی کە باو بووبێ لە ناو ئەو گەلانەدا و کاریگەر تر بووبێ لێ یان، ئاشکرایە کە بێ باوەڕیی لە هەموو دەردێ پیس ترە و بنەڕەتە بۆ دەرد و نەخۆشی یەکانی تر، لەبەر ئەوە لە پێش هەموو شتێکەوە بانگی نەتەوە داوە بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشی گرنگ تریان، جا لەبەر ئەوە لوط(علیه السلام) بە پێشەوە بانگی گەلەکەی کرد بۆ باوەڕ هێنان و ئینجا هەوڵی چارەکردنی ئەوگوناهو تاوانە گەورەی دا کە لە ناو ئەو گەلەدا باو بوو و دەردە دار بوو پێی.

فەرموی: ﴿أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾[1] ئایا لە نێوان هەموو خەڵکو جیهاندا ئێوە بە تەنیا جویێ ئەبنەوە و نێر بازیی ئەکەن و ئەنیشن لە نێرەکان ﴿وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم﴾ واز ئەهێنن لەوەی کە پەروەردگارتان دروستی کردووە بۆتان کە بریتی یە لە ئافرەتەکان کە ئەبن بە هاوسەرتان بۆ ئەمەی ڕابوێرن لەگەڵیان و کردەوەی ژن و مێردی یان لەگەڵ بکەن؟ یان واز ئەهێنن لەو شوێنە تایبەیتی یە سروشتی یەی کە خوا دروستی کردووە بۆتان لە حەڵاڵ و هاوسەرەکانتان؟ واتە کارێکی زۆر خراپی کەس نەکردوو ئەکەن. عار و لەکەیەکی ناشیرینە پێتانەوە، کەواتە کۆتایی لیێ بێنن، ﴿بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ﴾ واتە ئێوە گەل و کۆمەڵێکن دەرچوون لە سنووری ئارەزوو، یان زیادە ڕەوی کەر لە گوناهو خراپەکاری دا، بێگومان ئەم گوناهە پیسەی کە گەلی لوطی پیێ بەناوبانگە ئێجگار ناڕەوا و نا پەسەندە، ترازانێکی گەورەیە لە سروشت، چونکە خوا کە نێر و میێ ی دروست کردووە و ئارەزووی یەکتری پیێ داون مەبەست پەرەسەندن و درێژ پێدانی ژیانە لە ڕێگای سك و زاوە کە پێك دێت، بەهۆی یەك گرتنی نێر و میێ و گەشتنیان بە یەك، کەواتە ئەو ئارەزوو و سۆز و مەیلە بەشێکە لە ڕژێم و یاسای گشتی لەم بوونەوەرەدا کە بە هۆی ئەوەوە هەموو کاروباری ئەم بوونەوەرە ئەچیێ بەڕێوە و خواهیش و کاردروستی خوا بەدی دێت. شتێکە ڕوون و ئاشکرایە کە نێر بازیی و لیێ چوونی نێر بۆ نێر ئەم مەبەست و ئامانجە گرنگەی پیێ بەدی نایەت، بەڵکو هیچ مەبەستێکی ڕێك و ڕەوای ئادەمی پێك نایەت، ناگەنجیێ لەگەڵ سروشت و یاسای ئەو بوونەوەرەدا، کەواتە ئەو کردەوەی گەلی(لوط) ە لادان و ترازانە لە سروشتی ئەم بوونەوەرە، جا لەبەر ئەوە هیچ چارە نەبوو و پێویست بوو گەڕانەوەیان لەو ترازان و لادانە، یان لە ڕیشە هێنان و لە ناو بردنیان و پاك کردنەوەی زەوی لیێ یان، تا ئەو لادان و ترازانە پەرە نەسێنیێ و وڵات پیس نەکات. ئینجا کاتیێ لوط(علیە السلام) بانگی کردن بۆ کۆتایی هێنانلەو کردەوە پیسە و بێزاری دەبڕی لیێ ی، ڕوون بووەوە کە ئەوانە ئامادە نین بۆ گەڕانەوە، بەڵکو دەستیان کرد بە هەڕەشە و تاپاڵ لەلوط،

---

[1] بە پیێ ی تەفسیرەکە وشەی(من) بەستراوە بە وشەی(تأتون) وە، ئەگونجیێ بەسترابیێ بە ﴿ الذكران ﴾ وە و بەو جۆرەش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام جۆری تەفسیرەکە باشتر ئەچێتە دڵەوە.

قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰلُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ ﴿١٦٧﴾ قَالَ إِنِّى لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ ﴿١٦٨﴾ رَبِّ نَجِّنِى
وَأَهْلِى مِمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٩﴾ فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٧٠﴾ إِلَّا عَجُوزًا فِى ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿١٧١﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ﴿١٧٢﴾

بەم ڕەنگە ﴿قَالُوا۟﴾ وتیان پێ ی: ﴿لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰلُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ﴾ بە ڕاستی ئەی لوط ئەگەر تۆ کۆتایی نەهێنی لەم تەشەر دان و قسە و باسەت، بێگومان یەکێ ئەبیت لە دەرکراوان و لەم خاکە دەرئەکرێیت، وا دەرئەکەوێ باویان وا بوویێ ڕقیان لە هەرکەسێ هەڵسابێ دەریان کردووە، جا بە پێ ی ئەوە هەڕەشەیان کرد لە لوط و لوط غەریب و بێگانە بوو لە ناویاندا، چونکە لە عێراقەوە لەگەڵ ئیبراهیمی مامی دەرچوون و گەیشتنە وڵاتی شام و لەوێ لوط بە تەنیا لە ناو ئەو گەلەدا مایەوە هەتا خوا کردی بە پێغەمبەر بۆ سەریان بۆ گەڕانەوەیان لەو بار و کردەوەی کە لەسەری بوون، کەچی ئەوانیش بەو جۆرە خراپ و ناپیاو بوون لە باتی تەمێ گرتن و گوێ ڕایەڵیی هەڕەشەیان لێ کرد و بەو شێوە ناشرینە، ئینجا ئەمیش هیچی بۆ نەمایەوە ئەمە نەبێ کە بێ پێچ و پەنا بێزاری و خەشمی خۆی دەربڕی لە کردەوەکەیان و نزا بکاتە لای خوا کە خۆی و ماڵ و خێزانی ڕزگار بکات لەو تۆڵە و سزای کە ئەیدات بەسەر ئەو گەلە بێ بڕوادا. ﴿قَالَ﴾ لوط فەرمووی بەو گەلە تاوانبارە: ﴿إِنِّى لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ﴾ بەڕاستی من لەو کەسانەم کە زۆر خەشم و بێزاری و ڕقیانە لە کردەوەکەتان، ﴿رَبِّ نَجِّنِى وَأَهْلِى مِمَّا يَعْمَلُونَ﴾ ئەی پەروەردگارم من و خێزان و کەس و کارە تایبەتی یەکانم ڕزگار بکە لە سزا و تۆڵەی کردەوەیەك کە ئەوانە ئەیکەن. خوایش نزاکەی وەرگرت بەم جۆرە کە ئەفەرموێ: ﴿فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ * إِلَّا عَجُوزًا فِى ٱلْغَٰبِرِينَ﴾ ئینجا ئێمەیش لوط و خێزان و ئاڵ و بەیتەکەیمان هەموو ڕزگار کرد جگە لە پیرە ژنێ کە لە لایەن خواوە بڕیار درا بوو مانەوەی لە ناو ئەوانەی مانەوە لە سزادا و سزا دران. ﴿ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْءَاخَرِينَ﴾ لە پاش دەرچوونی ڕزگار کراوەکان، ئینجا ئەوانی ترمان بەرباد کرد و لە ڕیشەمان هێنا، بەم ڕەنگە شار و وڵاتەکەی بە خۆیانەوە ژێر و ژوور کرد و بەجارێ هەڵی گێڕایەوە،

وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا فَسَاءَ مَطَرُ الْمُنذَرِينَ (١٧٣) إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ (١٧٤) وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ (١٧٥)

وەکو لە شوێنی تردا باسی ئەفەرموێ. ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا﴾ باراندمان بەسەریان دا جۆرە بارانێك، واتە بارانێکی تایبەتی نەناسراو کە بریتی بوو لە بەردە بارانیان بە بەردە وردەیەکی خۆڵین و گڵتمێکی ڕەق. ئیتر ئەو بەردە بارانە بۆ تاق و تەرایەك بووبێ کە بەری ئەو ژێر و ژوور بوونە نەکەوتبن وەکو کۆکەڵێ ئەڵێن، یان بەردە بارانە کە بە شێوەیەکی گشتی بووبێ سەرباقی ژێر و ژوور کردنەکە، ئەوەش بۆ زیادە سزا و ڕیسوا کردن وەکو زۆریە ئەفەرمون و دیمەن و ڕواڵەتی ئایەتەکانیش قوڵ گیرن بۆ ئەم ڕایە، بە هەر جۆر بووبێ ﴿فَسَاءَ مَطَرُ الْمُنذَرِينَ﴾ کەواتە زۆر خراپ بوو بارانی ترسێنراوەکان کە ئەوەش بارانەکەی ئەوان بوو. بێگومان ئەو شارە وێران بووانە لە وڵاتی شام دا بوون، گومان وایە لەم شوێنەدا بووین کە ئێستا بووە بە دەریا و پێ ئەوترێ: دەریای مردوو –البحر الميت– بەڵگەیە هەیە بۆ ئەو گومان، چونکە هەندێ دەریایە چەند شارێکی داپۆشیوە کە کاتی خۆی ئاوەدان بوون و پڕ بوون لە دانیشتوان، هەندێ لەوانەی کە ئەگەڕێن بە دوای دۆزینەوەی دروشم و نیشانەی کۆن دا پاش ماوە و بەشێ لە قەڵایەکیان دەست کەوت لە نزیکەی دەریای ناوبراودا، لە تەنیشتی یەوە قەساب خانە و جێگای سەربڕینیان بۆ دەرکەوت کە لە کاتی خۆی دا ماڵاتی تیا کراوە بە قوربانی بۆ بت و پەرستراوان. بەهەر حاڵ قورئان بەسەرهاتی شارەکانی گەلەکەی(لوط)ی باس کرد و بێگومان هەواڵەکانی ئەو ڕاست و جێگای باوەڕی بەهێزی بێگومانە.

ئینجا بە گوێرەی باوی خۆی بەم سورەتەدا ئەوا لە پاش لێ بوونەوە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ * وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ پێویست نی یە بە تەفسیری و ڕاڤەی ئەم چەند ڕستەیە کە لە پێشەوە کراوە.

كَذَّبَ أَصۡحَٰبُ لۡـَٔيۡكَةِ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٧٦﴾ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ شُعَيۡبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ﴿١٧٨﴾ فَٱتَّقُواْ
ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٧٩﴾ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٨٠﴾ ۞أَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَلَا
تَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُخۡسِرِينَ ﴿١٨١﴾ وَزِنُواْ بِٱلۡقِسۡطَاسِ ٱلۡمُسۡتَقِيمِ ﴿١٨٢﴾

---

ئینجا حەوتەم سەگوزەشتە دێتە پێشەوە کە سەرگوزەشتەی شوعەیب پێغەمبەری(علیه السلام) و ئەم بەسەرهاتە ڕووی داوە پێش بەسەرهاتی موسا و هارون. بەڵام وەکو لە پێشەوە وترا لە گێڕانەوەی سەرگوزەشتەکانی ئەم سورەتەدا تێبینی جێگا و شوێن و مێژوویان نەکراوە، ئەم سەرگوزەشتەیە بەناوبانگە بە بەسەرهاتی: ﴿اصحاب الأيكة﴾ کە زۆرتر بڕوا وایە ئەوان دانیشتوانی(مَديَن) بووبن کەوا لە نێوان حیجاز و فەلەستین دا، لە دەوری کەنداوی عەقەبەدا و وشەی(الأيكة) ناوە بۆ دار و درەختێکی پڕ کە چووبن بە ناویەک دا، کەواتە ئەبێ بە دەوری ئەو وڵاتی مەدینەدا باخات و دار و درەختی زۆر بووبێ، یان ئەمانە گەلێکی تر بووبن جیاواز لە دانیشتوانی مەدیەن، شوعەیب ڕەوانە کراوە بۆ سەر هەردوو گەلەکە، شوعەیب(علیه السلام) کە پێغەمبەر بوو بۆ سەر ئەو گەلە بانگی کردن بۆ خوا پەرستی و ئەو گەلە بەد بەختەش باوەڕیان پێ نەکرد و تا خوا دووچاری سزای سەختی کردن، لە یەکەم جارەوە ئەم چەند ڕستەیەی ئاراستەی کردن بە وێنەی ئەو چەند پێغەمبەرانەی تر، وەکو ئەفەرموێ: ﴿كَذَّبَ أَصۡحَٰبُ لۡـَٔيۡكَةِ ٱلۡمُرۡسَلِينَ * إِذۡ قَالَ لَهُمۡ شُعَيۡبٌ أَلَا تَتَّقُونَ * إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ * فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ * وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ پێویست نی یە بە ڕاڤەی ئەم ڕستەیانە کە ڕاڤەیان تێپەڕی کرد، بەس ئەوەی لێرەدا شایانە بە باس ئەمەیە کە ئەیفەرموو: ﴿اخوهم شعيب﴾ هۆی ئەوە چی بێ؟ هەندێ لە زانایان ئەفەرمون: شوعەیب(علیه السلام) لەم گەلە نەبووە و بەڵکو لەو گەلە بووە کە مەدیەن بوون و لە پێشەوە ڕەوانە کراوە بۆسەر ئەو گەلی خۆیە، بەهۆی ئەوەوە لە سورەتی(هود) دا ئەفەرموێ: ﴿وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗا﴾ ڕەوانەمان کرد بۆ سەر دانیشتوانی مەدیەن شوعەیبی برایان. لە پاش

ئەوان ڕەوانە کرا بۆ سەر ئەو گەلەی کە بە ناوبانگ بە: ﴿اصحاب الأيكة﴾ و لەبەر ئەوە لەمان نی یە بە برای ناو نەبرد بۆیان. کۆمەڵێکی تر ئەفەرمون: ئەو دوو گەلەی یەکێکن و لە سورەتی هوددا بە برای ناوبرد، کەواتە پێویست نی یە لێرەدا دووبارەی بکاتەوە. لە پاش بانگ کردنیان بۆ باوەڕ هێنان و لە خوا ترسی ئینجا فەرمانی پیادان بە کۆتایی هێنانیان لە ترازووبازی و دزی کردن لە کێشان و پێوانەدا کە گوناهێکی پیسی زیاندارە و باو بووە لە ناو ئەو گەلەدا و وا دەرئەکەوێ ئەو گەلە بەسەر ڕێگای قافڵە و کاروانی وڵاتانی ترەوە بووبن، بەهۆی ئەوەوە توانیویانە جەور و ستەم بکەن لەوانەی کە ڕائەبووردن بە لایان دا بە ڕێگا لێ گرتن و تاڵان وکوشتن و بڕین، جا لەبەر ئەوە بانگی کردن و فەرمانی پیادان بەم چەند فەرمانە:

١- ﴿أَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَلَا تَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُخۡسِرِينَ﴾ پێوان ڕێك و ڕاست بکەن چ بۆ خۆتان و چ بۆ خەڵکی، لەوانە مەبن کە لە پێوان و کێشان دا زیان دەرن بە مافی خەڵکی، بەم ڕەنگە بە مەنی بچووك و سەنگی سووك بفرۆشن و مافی خەڵکی، بە مەنی گەورە و سەنگی گەورە لە خەڵکی وەرگرن و مافی خۆتان وەرگرنەوە، واتە وەرگرن لە خەڵکی بەو جۆر و شێوەی کە پێ یان ئەدەن، پێ یان بدەن بەو جۆرە و شێوەی کە لێ یان وەر ئەگرن، ﴿وَزِنُواْ بِٱلۡقِسۡطَاسِ ٱلۡمُسۡتَقِيمِ﴾، بە ترازوویەکی ڕێك و ڕاست کێشانە بکەن، کێشان و پێوان بە سێ جۆر ئەکرێ:

أ- ڕێك و بێ زیاد و کەم.

ب- بە جۆرێ زیان دەر بێت لە خەڵکی.

ج- بە جۆرێ قازانج بگەیەنێ بە خەڵکی.

فەرمانی دا بە یەکەم و دووەمی قەدەغە کرد و بێ دەنگ بوو لە سێیەم، چونکە ئەگەر بیکەیت چاکە و پیاوەتی یە و ئەگەر نەیشی کەیت هیچ ناپیاوی گوناهی تیا نی یە.

وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴿١٨٣﴾ وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلۡجِبِلَّةَ ٱلۡأَوَّلِينَ
﴿١٨٤﴾ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلۡمُسَحَّرِينَ ﴿١٨٥﴾ وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿١٨٦﴾
فَأَسۡقِطۡ عَلَيۡنَا كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٨٧﴾ قَالَ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٨٨﴾
فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمۡ عَذَابُ يَوۡمِ ٱلظُّلَّةِۚ

---

**٢- ﴿وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ﴾ کەم و کوڕی مەکەن لە شتەکانی خەڵکی دا و هیچ مافێکیام ژێر پێ مەکەن، ئەمە یاسایەکی گشتی ترە لە پێشووەکە و هەموو شتێکی ناڕەوا ئەگرێتەوە.**

**٣- ﴿وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ﴾ ئەو هەموو خراپەکاری یە مەکەن لە وڵات دا کە ببنە تێك دەر و شێوێنەی وڵات.**

**ئینجا ترساندنی لە خەشم و سزای خوا و هەستی لە خوا ترسی هەڵگران لە دەروونیان دا، فەرموی ﴿وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلۡجِبِلَّةَ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ بترسن و خۆتان بپارێزن لە کەسێ کە ئێوەی دروست کردووە و ئەو هەموو خەڵکە پێشووانە کە هاتن و ڕابوردن.ئەو گەلە بەد بەختە بەرامبەر ئەو هەموو تەمێ و مۆچیاری یەك گرنگانە دەم درێژیی یان مرد بەسێ شتی زۆر ناڕەواو یەکەم: ﴿قَالُوٓاْ﴾ وتیان: ﴿إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلۡمُسَحَّرِينَ﴾ تۆ هیچ نیت جگە لەوەی لە جادو لێ کراوانی. واتە بەهۆی ئەوەوە جادوت لێ کراوە و شێتی، کەواتە هەرچی ئەڵێیت بێ نرخە و قسەی تێکەڵ و پێکەڵ وەکو وڕێنە و بکەیت وایە. دووەم: ﴿وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا﴾ تۆ هیچ نیت جگە لەوە ئادەمی یەکیت وێنەی ئێمە، واتە ماتوڵ ئادەمیت نابێ پێغەمبەر بیت، ئەوەش بە گوێرەی باوی هەموو نەفام و نەزانەکانی هەموو گەلەکان کە ئەوەندە تێنەگەیشتوو بوون لایان وا بوو ئادەمێتی و پێغەمبەری دژی ئەکترن و کۆنابنەوە پێکەوە، لەبەر ئەوە بەهەموو دڵ و دڵنیایی یەوە ئەیان وت: ﴿وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾ بە ڕاستی ئێمە باوەڕ و گومانمان وایە پێت کە تۆ لە درۆزنانی و ئەوەی پێمان ڕائەگەیەنی درۆ و دەلەسەیە. سێیەم: گاڵتە و لاقرتی یان لێ ئەهات بە**

ترساندن و هەڕەشەی لێ کردنیان بە سزای خوا و بەهۆی ئەوە بەریان لێ ئەبڕی یەوە بە هاتنی سزا و وتیان: ﴿ فَأَسۡقِطۡ عَلَيۡنَا كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ کەواتە دەی چەند پارچەیەك لە ئاسمان بخە بەسەرمان دا، ئەگەر تۆ لە ڕاست گۆیانی و ڕاست ئەکەیت لەوەی پێمان ڕائەگەینی، ئا بەو جۆرە بێ شەرمانە بە لاقرتی یەوە بەریان ئەبڕی یەوە لەو پێغەمبەرە دڵسۆزە(علیە السلام) بە وێنەیلێ برینەوەی کە قورەیش کە لە سورەتی(الأسراء) دا باسی فەرمو: ﴿ أَوۡ تُسۡقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمۡتَ عَلَيۡنَا كِسَفًا ﴾ لە وەڵامی ئەو بێ شەرمە نەفامانەدا ﴿قَالَ﴾ شوعەیب فەرموی: ﴿قَالَ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴾ خوای من لە هەموو کەس زانا ترە و ئاگادارە بە هەر کردەوەیەك ئەیکەن و بەهەر تۆڵە و سزایە کە شایانە بۆتان، جا ئەگەر بیەوێ تۆڵەتان لێ بسێنێ بەو جۆرەی خۆتان ئەڵێن ئەیسێنێ، یان ئەگەر بیەوێ بە تۆڵەیەکی تر خۆی ئەزانێ و هەموو شت بە دەست خۆیەتی، ئینجا بە کورتی و بە پەلە دوا ڕۆژەکەیان باس ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿ فَكَذَّبُوهُ﴾ ئینجا ئەو گەلە بڕوایان نەکرد بە شوعەیب و بەردەوام بوون لەسەر ئەو بێ بڕوایی یە، ﴿فَأَخَذَهُمۡ عَذَابُ يَوۡمِ ٱلظُّلَّةِۚ﴾ بەهۆی ئەوەوە سزای ڕۆژی سێبەر و هەورەکە گرتنی و دای بەسەریان دا تا سووتاندنی و بەربادی کردن، سزاکەیشیان لەو جۆرە و بابەتە بوو کە خۆیان بە لاقرتی یەوە داوایان کرد. چونکە ئەو سزایە ئەمە بوو کە(ئیبن و جەریر و عەبدی کوڕی حمید و ئیبن والمنذر و ئیبن و ئەبی حاتەم و حاکیم) هەواڵەکەی ئەهێنن و ئەیگێڕنەوە لە(ئیبن و عەباس) ەوە -خوا لە هەمووان ڕازی بێت- کە خوای گەورە گەرمایەکی زۆر بەتینیان بۆ ئەنێرێ تا هەناسەیان ئەگرێ، ئینجا لە تاوا ئەچنە ناو خانووەکانیانەوە و ئینجا ئەو گەرمایە لەگەڵیان ئەچێتە ناو ماڵەکانیان، ئینجا لەوێ دەرئەچن بۆ دەشت، ئینجا خوا هەورێکیام بۆ ئەنێرێ سێبەریان بۆ بکات لە خۆر -کەئەوەیە هەورەکە- بەهۆی ئەوەوە خۆشی و فێنکی یەك ئەبینن و ئینجا بانگ ئەکەنە یەکتر تا هەموو لە ژێر ئەو هەورەدا کۆئەبنەوە، ئینجا خوا ئاگرێ ئەبارێنێ و ئەیخات بەرسەریان دا و هەموویان ئەخوا و ئەسووتێنێ،

إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٩٠﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٩١﴾

---

﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٍ﴾ بە ڕاستی ئەو سزایە سزای ڕۆژێکی زۆر گەورە بوو. بە ڕاستی ئەم بەسەرهاتانە هەموو بەڵگە و نیشانەیەکی ئاشکرا و بەهێزن و هۆی ئیمان و گەڕانەوەیە بۆ هەرکەس کە بێ بەش نەبێ لە فام و ژیری، بەڵام زۆربەی خەڵکی بێ بەشن بەهۆی ئەوەوە باوەڕ ناهێنن وەکو خوایش فەرموی لە پاش گێڕانەوەی هەموو بەسەرهاتێ لەبەسەرهاتەکان: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ * وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ لێرەدا دوایی هات ئەو حەوت سەرگوزەشتەی کەلەم سورەتەدا بە کورتی و بە شێوەیەکی جیاواز باسی فەرمون. هەموویان دڵخۆش کردن و دڵ نەوایی پێغەمبەریان(علیه السلام) تیا بوو لەگەڵ ترساندن و هەڕەشە لەوانەی بێ بڕوا بوون پێ ی. لە هەموویان ڕوون بوویەوە بەسەرهات و دەنگ و باسی پێغەمبەرێتی و پێغەمبەران و بڕوا نەهێنانیان و پشت تێ کردنی بێ باوەڕان و بەربەرەکانێ و بڕ و بیانوو و بەر لێ برینەوەیان و دووچار بوونیان لە تۆڵە و سزای کردەوەی خراپی خۆیان هەر لەم جیهانەدا، پێش هاتنی سزای سەختی نەبڕاوەی ئەو جیهان. ئەم سەرگوزەشتانەی دەست پێ کرد لە دوای سەرەتای سورەتەکە کە بە تایبەتی ئەدوا لە پێغەمبەر و بت پەرستەکانی قورەیش، ئینجا سەرگوزەشتەکانی دوایی هێنا کە هەموو نموونە و بەڵگە و نیشانە بوون لەسەر ڕاستی و بەدی هاتنی بەڵێنی سەرکەوتن و زاڵ بوونی ئایینی خوا و پێغەمبەرەکەی(علیه السلام) هەروەها ژێر کەوتن و مل شۆڕی بت پەرستەکان و دووچاری بوونیان بە تۆڵە و سزای سەختی خۆیان، ئینجا لە پاش ئەو سەرگوزەشتانە، ئەوا ئەگەڕێتەوە بۆ مەبەستی سورەتەکە کە لە سەرەتاکەدا گەیاندی ئەوەش بریتی بوو لە دامەزراندن و بەهێز کردنی عەقیدە و باوەڕ بە قورئان و پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمان (علیه السلام)،

وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ
عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾

**ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ بە ڕاستی ئەم قورئانە کە هەندێکی ئەم سەرگوزەشتانە و ئەم هەواڵە هەیبی یانە بوو، هێنراوە و نێراوە خوارەوەی پەروەردگاری هەموو جیهانە. ﴿نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ﴾ [1] هێنایە خوارەوە جوبرەئیلیێ کە ڕاست و ئەمینە، واتە هەرچی پێ سپێراوە ڕای ئەگەیەنێ بەبێ زیاد و کەم بە هۆی ئەوەوە کراوە بە ئەمین دار بەسەر سروشتی خواوە ﴿عَلَىٰ قَلْبِكَ﴾ بۆ سەر دڵی تۆ ﴿لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ﴾ بۆ ئەمەی ببی بە یەکێ لە ترسێنەران ﴿بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ﴾ بە زمانێکی عەرەبی ڕوون و ڕەوان و ڕوون کەرەوە کە زمانی ئەو گەلەبوو کە یەکەم جار ئەوانی پێ ترسێنراوە بە گوێ ی ئەوان دا چوو، کەواتە چاك تێ ی ئەگەیشتن و بیانووی وەرنەگرتن و تێنەگەیشتن نەبوو. وشەی(قلب) بۆ دوو شت بەکارئەهێنرێ:**

**١- ئەو پارچە گۆشتەی کە هۆی فام و تێگەیشتن و ژیری یە.**

**٢- گیان و ڕۆح.**

**بەهەر کام لێرەدا ڕێکە و ئەگونجێ. ئینجا هێنانی ئەو وشەیە چەند شتێ نیشان ئەدات و چەند هۆیەکی هەیە:**

**١- نیشان ئەدات کە ئەو قورئانە بە باشی وەرگیراوە و جێگر و دامەزراوە لای پێغەمبەر(علیه السلام) چونکە یەکسەر لە ڕێوە دراوە بە دڵی بە فەڕی و خەریك کراوە تەنیا بەوەوە. کەواتە پارێزراوە لە گۆڕان شێوان و لێ گۆڕان.**

**٢- لە ڕووی ڕاستی دا لێپرسراو و داوا لێ کراو و فەرمان پیا دراو تەنیا دڵە، ئیتر لەش و هەموو ئەندامەکانی تر خزمەت کار و شوێن کەوتووی دڵن و بەبۆنەی ئەوەوە ئەو جۆرە شتانە ڕوویان تێ ئەکەن.**

**٣- دەرئەکەوێ کە پێغەمبەر(علیه السلام) لە هەموو بار و ڕوویەکەوە ڕێك و پێکە، لە هەموو کردار و ڕەفتار و ڕەوشتێك دا ڕێگای ڕاستی داوەتەبەر، چونکە هەرکەس دڵی**

---

[1] ناوبراوە بە ﴿ روح ﴾ چونکە لە بارەی ئایینەوە خەڵکی پێ زیندوو ئەبێتەوە، یان لەبەر ئەوەیە کە ئەو هەمووی هەر ڕۆحە وەکو خەڵکی تر نی یە لەشیشی هەبێ. خوا خۆی باش ئەزانێ.

چاك بێت ئیتر هەموو شتی چاك ئەبێت وەكو پێغەمبەر(علیه السلام) ئەفەرموێ: ﴿الا ان في الجسد مضغة إذا صلحت صلح لها سائر الجسد...﴾ ئاگادار بن كە بە ڕاستی لە لەش دا پارچە گۆشتێ هەیە هەر كات ئەو چاك بێت هەموو لەش لەبەر ئەو چاك ئەبن كە ئەوەش دڵە، ئەمە بەشێكە لە حەدیسێ كە نەوەوی لە(الأربعين) ە دا ئەیهێنێ. دەی كاتێ قورئان لە ڕێوە هێنرایە خوارەوە بۆ سەر دڵی و ڕووناكی و پیت و فەڕی ڕژێنرا بەسەری دا دیارە ئەو ڕووناكی و پیت و فەڕە لەوێوە سەرواز ئەكات بۆ هەموو گیان و لەش و شتێ تری.

٤- ئەم قورئانە بەش و خۆراكی ڕۆحە، هەرشتێ بەش و خۆراكی ڕۆح بێت لە یەكەم جارەوە بە ڕۆح ئەدرێ. كەواتە پێویستە وتنی وشەی(قلب) بۆ گەیاندنی ئەو مەبەستە. جا ئەگەر مەبەست پێ ی ڕۆح بێت ئەوە جێ ی خۆیەتی، ئەگەر مەبەست ئەم پارچە گۆشتە تایبەتی یە بێت هەر ئەو ئەگرێتەوە، چونكە ئەو پارچە گۆشتە كانگاو هۆی ئیش و كاری ڕۆحە لە لەش دا. ئەم قورئانە بەو عەرەبی یە بە ڕێك و ڕەوانە هات و لە یەكەم جارەوە چوو بە گوێچكەی ئەو گەلە عەرەبەدا و چاك تێ ی ئەگەیشتن و هەموو سەرسام بوون لە ئاستی، چەند جار بەری لێ برینەوە بەمەی ئەگەر ڕاست ئەكەن ئەڵێن لە لایەن خواوە نەهاتووە دەی وێنەی بڵێن و هەواڵیشی پێ دان كە ناتوانن بە ئەندازەی بچووك ترین سورەتیشی بڵێن، ئەوایش بە هەموو هێز و توانا هەوڵ و تەقەلایان دا و چەند وتە و وتاریشیان هۆنی یەوە و كەچی نەیان توانی بەرامبەری بوەستن و ناچار بوون پەلاماری تیر و شیریان دا بۆ بەرگری و بەربەستی، نائومێد بوون لە بەرگری كردن لەو بارەكەی ترەوە كاتێ تێگەیشتن كە ئەم قورئانە لە جۆری وتە و وتاری ئادەمی نی یە و لەسەرچاوەیەكی ترەوە هاتووە، تێگەیشتن كە ئەم قورئانە هەرچەند بە زمانی خۆیان هاتووە، بەڵام لە سنووری دەسەڵات و توانای ئەمانە دا نی یە كەواتە قورئان هەر خۆی ڕوونە و بەڵگە و نیشانەیەكی تێر و تەواو و موعجیزەیەكی ئاشكرایە لەسەر ڕاستی خۆی و پێغەمبەرێتی پێغەمبەر(علیه السلام) جا لەگەڵ ئەوەدا تەنها بەوە ناوەستێ،

وَإِنَّهُۥ لَفِى زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٩٦﴾ أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُا۟ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٩٧﴾ وَلَوْ نَزَّلْنَٰهُ عَلَىٰ بَعْضِ ٱلْأَعْجَمِينَ ﴿١٩٨﴾ فَقَرَأَهُۥ عَلَيْهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١٩٩﴾

---

**بەڵکو ئەم ڕابەر و بەڵگەش ئەهێنێتەوە و ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُۥ لَفِى زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ بە ڕاستی ئەو قورئانە هەیە لە کتێبەکانی گەلە پێشووەکان دا، واتە لەو کتێبانەدا کە لە ئاسمانەوە هاتوونەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەران و گەلە پێشووەکان و باس و ناو نیشانی قورئان هەیە، هەروەها باس و ناو ونیشانی ئەو پێغەمبەرەی کە ئەم قورئانەی دێتە سەر، هەروەها مەبەستە سەرەکی یەکانی قورئان و بنەڕەتەکانی عەقیدە و باوەڕێ کە قورئان پێ ی هاتووە، ئەمانە هەموو هەن لەو کتێبە پێشووانەدا، دەی ئەگەر ئەم قورئانە نێراوی خوا نی یە یائا لە کتێبەکانی تری خوادا چۆن ئەم باسانەی تیا ئەبوو؟ چۆن قورئانێکی ڕێك و پێك دەرئەچوو لەگەڵ ئەوەی لەو کتێبانەدا هاتوو؟ ئایا محمدی نەخوێندەوار ئەوەی لەکوێ بوو، و چۆن زانی؟!! ئای ئەو بێ بڕوایانە نازانن کە قورئان بەو جۆرەیە کە باس کراو بێ ئاگان لەوە؟ ﴿أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُا۟ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ ئایا نەبوونی بە نیشانە و بەڵگەیەکی ڕوون بۆیان لەسەر ڕاستی قورئان ئەمە کە زانایانی بەنی ئیسرائیلی ئەوە ئەزانن و قورئان بەو جۆرە ئەناسن، ئەو زانایانەش وەکو عەبدوڵای کوڕی سەلام و هاوڕێکانی: ئوسەید و سەعلەبە و ئیبن و یامین. ئەم پێنجە کە لە زانایانی یەهود بوون، هەروەها سەلمانی فارسی کە لە زانایانی نەسارا بوو، ئەمانە کە زانی یان قورئان ڕاستە و لە تەورات و ئینجیل دا هەیە باوەڕیان هێنا.**

**هەروەها لە پێش ئەمانەوە کۆمەڵێك لە زانای نەسارای نەجران کە لە چەرخی مەککەدا موسڵمان بوون و هەموو شایەتی یان دا لەسەر ڕاستی ئەم قورئان و هاتنە خوارەوەی لە لایەن خواوە، دەی ئایا زانین و شایەتی ئەوانە نابێ بە بەڵگەیەکی ڕوون و ڕەوان بۆ بێ بڕواکانی مەککە؟ شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە ئەو زانین و شایەتی دانە ڕابەر و نیشانەیەکی تێر و تەواوە لەسەر ڕاستی قورئان و پێغەمبەرێتی پێغەمبەری ئازیز(صلی الله علیه وسلم)، ئیتر با بوەستێ شایەتی دانە بەناوبانگەکەی پادشای حەبەشی کە لە ناو کۆڕی زانا و عابیدەکانی وڵاتد دا دای بە پێش چاوی ئەو وەفدەی کە قورەیش بە دیاریی یەکی**

زۆرەوە ناردیان بۆ لای ئەو پادشایە بۆ ناردنەوە و گێڕانەوەی جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب و هاوڕێکانی کە کۆچیان کرد بۆ وڵاتی حەبەش، ئەوە بوو لە پاش گوێ گرتن لەو چەند ئایەتەی کە جەعفەر خوێندی بە سەریان دا، پادشا وتی: سوێند بە خوا ئەم قورئانە لە سەرچاوەیەکەوە هاتووە کە ئینجیلی عیسای لێ هاتووە، ئەو پادشا زانایە لە پاشان موسڵمان بوو، هەرچەند نەهات بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و بەخزمەتی نەگەیشت، کاتێ مرد پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی دا بە مردنی و لە مەدینەوە نوێژی مردوویان لەسەر کرد -خوا لێ ی ڕازی بێ-.[1] زانین و شایەتی ئەوان و وێنەیان ڕابەری و نیشانەیەکی زۆر بەهێزە بە تایبەتی بۆ قورەیش کە لەو کاتەدا بڕوایان بە زانایانی ئەهلی کیتاب زۆر بوو، لە زۆر شت دا ئەیان نارد بۆ لایان و پرسیاریان لێ ئەکردن، بەڵام ئەو بێ بڕوایانە بۆ ڕابەر و بەڵگە دانەما بوون و باوەڕ نەهێنانیان تەنها بەهۆی لوت بەرزی و خۆ بە زل زانی یەوە بوو، ئەیان ویست سەرپێچی و سەرکێشی بەکار بێنن، ئەوەتا ئەگەر ڕابەری بەهێز تریشیان پیشان بدرایە هەر سوودی نەبوو، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ نَزَّلْنَاهُ عَلَىٰ بَعْضِ الْأَعْجَمِينَ * فَقَرَأَهُ عَلَيْهِم مَّا كَانُوا بِهِ مُؤْمِنِينَ﴾[2] ئەگەر ئێمە ئەو قورئانەمان بناردایەتە خوارەوە بۆ سەر کەسێکی عەجەمی کە بە هیچ ڕەنگ عەرەبی نەزانی بایە و ئینجا ئەو کەسە قورئانی بخوێندایەتەوە بەسەر ئەو بێ بڕاوایانەدا، هێشتا هەر باوەڕیان نە ئەهێنا و نە ئەبوون بە باوەڕدار پێ ی، کە ئەمە ئەو پەڕی موعجیزەیە، پیاوێکی عەرەبی نەزان قورئانێ بخوێنێتەوە کە هەموو عەرەب و عەجەم لە ئاستی دەستە پاچە و پەك کەوتوو بن و نەتوانن وێنەی بچووکترین سورەتی بڵێن!! لەم فەرموودەیەدا دڵ نەوایی پێغەمبەر هەیە(ﷺ) و ڕوونی ئەکاتەوە کە باوەڕ نەهێنانی ئەوان هیچ سووچێکی ئەمی تیا نی یە، بەڵکو ئەوانە خۆیان خراپن مل هوڕ و سەرکێشن و نایانەوێ دان بنێن بە ڕاستی دا و ڕێگای ڕاست بدەنە بەر، بەهۆی ئەوەوە خوایش قاریان لێ ئەکرێ،

---

[1] ئەم ئایەتە بە چەند جۆرێکی تریش ترکیب ئەکرێ و بە جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە، هەموو هەر یەك مەبەست ئەگەیەنن، بەڵام ئەمەی لە تەفسیرەکەدایە بە ڕێك و پێك تری ئەزانم.

[2] بەجۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام بە ڕاستی بە دووری ئەزانم، ئەمەی لە تەفسیرەکەدا وتومە زۆر ڕوون و ئاشکرایە و ڕێکە لەگەڵ ئایەتەکانی پێش و پاشیان، خواش باشتر ئەزانێ.

كَذَٰلِكَ سَلَكْنَٰهُ فِي قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٢٠٠﴾ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٢٠١﴾ فَيَأْتِيَهُم
بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٠٢﴾ فَيَقُولُوا۟ هَلْ نَحْنُ مُنظَرُونَ ﴿٢٠٣﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿٢٠٤﴾ أَفَرَءَيْتَ
إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾

---

بیّ بڕوایی له دڵیان دا جێگیر ئەكات، وەكو ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ سَلَكْنَٰهُ فِي قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ ئا بەو شێوە بیّ بڕوایی یە و لەسەر ئەو بارە قورئانمان خستووەتە ناو دڵی ئەو تاوانبارانەوە، بە باوەڕ پیّ نەكراوی لە دڵ و دەروونیان دا جێگیرمان كردووە، لە دەروونیان دا هەر بەو جۆرە ئەمێنێتەوە ﴿لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ﴾ باوەڕی پی ناهێنن ﴿حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾ هەتا سزای ئێش و ئازار دەر ئەبینن كە ناچاریان ئەكات بە باوەڕ هێنان ﴿فَيَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ واتە باوەڕ ناهێنن هەتا ببینینی ئەو سزایە و سەخت تر لەوە كە هاتنی سزاكەیە كوت و پڕ و لە ناكاودا لە كاتێك دا كە ئەوانە هەست ناكەن بە هاتنی، چونكە هیچ نیشانە و دروشمێكی لە پێشەوە نی یە، ئینجا لەو كاتەدا هۆش ئەكەنەوە و ئەزانن كە چ شتێكی گەورە و گرنگیان لە دەست چووە كە بریتی یە لە ئیمان و باوەڕ هێنانەكەیان، ﴿فَيَقُولُوا۟ هَلْ نَحْنُ مُنظَرُونَ﴾ ئینجا لەو كاتەدا بە داخ و مەراقەوە ئاوات ئەخوازن و ئەڵێن ئایا ئێمە مۆڵەت دراو ئەبین و سزامان دوا ئەخریّ هەتا بگەڕێینەوە و باوەڕ بهێنین؟ بەڵام نەخێر شتی وا نابیّ و تازە شتەكە لە دەست چووە.ئەو بیّ بڕوایانە بە شێوەی گاڵتە و لاقرتی و بەبیّ شەرمانە پەلەیان ئەنایەوە بە هاتنی ئەو سزایەی كە هەڕەشەیان لیّ ئەكرا پیّ ی، هەڵ خەڵەتا بوون بەو خۆشی و ڕابواردنەی كە تیای دا بوون گومانیان نەبوو كە ئەو خۆشی و عەیش و نۆشەیان لە دەست ئەچیّ و ئەكەونە سزا و ناڕەحەتی، ئەوا خوا بێداریان ئەكاتەوە لەو خەوی بیّ ئاگایی یە و شێوەی خۆیانیان ئەخاتە بەر چاو كاتیّ كە ئەو سزا دێتە سەریان كە لاقرتی

یان پێی ئەهات و پەلەیان ئەنایەوە بۆی، ئەفەرموێ: ﴿ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴾ ئایا ئەوان پەلە پەل ئەنێنەوە بە سزای ئێمە و بە لاقرتی یەو ئەڵێن: کوا و کەی دێت؟ واتە پەلە نانەوەکەیان زۆر نەفامی و بێ شەرمی یە و زۆر ناڕەوایە و بێزاری هەیە دەربارەی، ئایا ئەوانە بەو ڕابواردن و خۆشـی و مۆڵـەت دانـە هەڵخەڵـەتاون؟ ﴿ أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَاهُمْ سِنِينَ * ثُمَّ جَاءَهُم مَّا كَانُوا يُوعَدُونَ * مَا أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يُمَتَّعُونَ ﴾ دەی پێم بڵێ و هەواڵم بدەرێ ئەگەر ئێمە ئەوان بە خۆشی بژیەنین و بە تەمەنی درێژەوە چەند ساڵێ لە پاشان ئەو سزای کە بەڵێن دراوە و هەڕەشەیان لێ کراوە پێی بێت بۆیان و دووچار ببن پێی، ئایا کاتێ ئەو سزا هات چ سوودێ ئەگەیەنێ بەوان ئەو هەموو نەخۆشی و ڕابواردن و ناز و ڕێز و تەمەنی درێژەی کە لەوە و بەر پێ یان دراوە، بەرگریی ئەو سزایان لێ ئەکات یان هیچ سووکی ئەکات؟ بێگومان هیچ سوودێ ناگەیەنێ و هیچ بارێك سوك ناکات، لە فەرمودەیەکی سەحیح دا ئیبن و کەسیر ئەیهێنێ لە تەفسیرەکەی دا ئەفەرموێ: لە ڕۆژی دوایی دا کافر ئەهێنرێ و یەك جار ئەکرێ بە قوت دا بە ناو ئاگردا و لە پاشان پێ ی ئەوترێ: هەرگیز خێر خۆشیت دیوە لەمەو بەر؟ هەرگیز هیچ ناز و نیعمەتێکت دیوە؟ ئەویش ئەڵێ: نەواللە ئەی پەروەردگارم، کێ لەم جیهانەدا لە هەموو کەس سزا و مەینەتی بەتین تر بووە و ئەهێنرێ و ئەویش یەك جار ئەکرێ بە ناو بەهەشت دا و ئینجا پێ ی ئەوترێ: هەرگیز ناخۆشیت بینیوە؟ ئەویش ئەڵێ: نەواللە ئەی پەروەردگارم... ئینجا ئەیان ترسێنێ بەمە کە ترساندن سەرەتا و پێشڕەویسزا و بەرباد بوونە، خوای خاوەن بەزەیی هیچ وڵات و شارێکی بەرباد نەکردووە و سزای نەداوە هەتا پێغەمبەر و ترسێنەرێکی بۆ نەناردبێ بۆ تەمێ کردن و ڕێنموونی پیشاندانی ڕابەر و نیشانەی ئیمان و باوەڕ،

ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ﴾ دانیشتوانی هیچ شار و ولاتێکمان بەرباد و وێران نەکردووە مەگەر لە کاتێك دا ترسێنەر بووە بۆیان و لە پێشەوە ترساندوونی بە سزای خوا لەسەر بێ باوەڕیی و کردەوەی خراپیان، ئەو ترساندنەشی ﴿ذِكۡرَىٰ﴾ لەبەر تەمێ و ئامۆژگاری و بیرخستنەوەیان، بێگومان ئادەمی بە جۆرێ دروست کراوە کە بە سروشت خواناس و خواپەرست بێت، سروشتێ هەست ئەکات بە پەروەردگارێکی تاك و تەنیا ئەگەر تێك نەچووبێ و لای نەدابێ و لەسەر تەوەرەی خۆی نەترازابێ، سەرەڕای ئەوە ئەم هەموو نیشانە و ڕابەرە ڕوونانەی لەم بوونەوەرەدا فەراهەم هێناوە، کە هەموو شایەتن لەسەر بوونی ئەو پەروەردگاری تاك و تەنیا و ڕێنموونی و ڕابەریی ئادەمی ئەکەن بۆ ناسین و پەرستن، جا ئادەمی لە سروشتی خۆی ترازا و بیری نەکردەوە لەو هەموو بەڵگە و نیشانە ڕوونانە، ئەو کاتە خوا ترسێنەر و پێغەمبەرانی ناردووە بۆ تەمێ و بیر خستنەوەی ئەو بێ هۆش و لە سروشت ترازاوانە، ئینجا ئەگەر هێشتا بەوەش نەگەڕانەوە بۆ سەر ڕێگا ڕاستە سروشتی یەکەیان ئیتر هەر سزایە بدرێن زۆر جێگای خۆیەتی و ڕێك و ڕەوایە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾ ئێمە ستەم کار نەبووین لە سزادان و بەرباد کردنی ئەوان لە پاش تەمێ و ترساندنیان، هیچ کات ئێمە کار و پیشەمان ئەوە نەبووە کە بە وێنەی ستەمکاران ڕەفتار بکەین بەم ڕەنگە بەبێ سووچ و تاوان سزای خەڵکی بدەین، بەبێ ئەوەی لە پێشەوە تەمێی بکەین و بیترسێنین.. لە پێشەوە باسی کرد کە قورئان نێرراوە خوارەوەی خوایە و جوبرەئیل هێنایە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ)، ئینجا بەو بۆنەیەوە باسی بێ بڕواکانی کرد و پەلەنانەوەیان بەو سزای کە لە قورئان دا هەڕەشەیان لێ کراوە پێی، ئینجا ئەوا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو قورئانە شتێکی لێ دوور ئەخاتەوە کە بێ بڕواکانی ئەو کاتە بازی یان پێ ئەکرد بۆ پڕ پاگەندە کاتێ کە دەستە پاچە بوون لە ئاستی و بەری لێ بڕی بوونەوە، ئەیان ووت: ئەمە شەیتان ئەیهێنێ،

وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمْ عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ ﴿٢١٢﴾
فَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾

---

**ئەفەرمویْ: ﴿وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ﴾ ئەو قورئانە هێنراوە خوارەوەی پەروەردگاری هەموو جیهانە و شەیتانەکان نەیان هێناوەتە خوارەوە. ﴿وَمَا يَنۢبَغِي لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ﴾ شایان نی یە بۆ ئەوان و ناگونجیْ هێنانە خوارەوەی و ناتوانن و دەسەڵاتیان نی یە بەسەر ئەوەدا ﴿إِنَّهُمْ عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ﴾ چونکە بەڕاستی شەیتانەکان بەرگری کراون لە بیستنی ئەوەی مەلائیکە ئەیلێت لە ئاسمان دا، چ جای وەرگرتن و بیستنی قورئان لیْ یانەوە، یان مەبەست ئەوەیە کە شەیتان عەزلە و بەگری کراو و دوور خراوەیە وناگاتە ئەو ڕادەیە کە سروشتی خوا ببیستیْ. بەڕاستی سەر سوڕ ئەمێنیْ لە نەفامی ئەو بت پەرست و بیْ بڕوایانە کە چۆن شەرمیان نە ئەکرد شتی وا پڕ و پووچ و ناڕەوا بە دەمیان دا ئەهات کە گوایە شەیتان ئەم قورئانە ئەهێنیْ لە کاتێك دا کە قورئان لە چەند شوێن دا نەفرەتی خوا ئەکات لە شەیتان و خەڵکی دوور ئەخاتەوە و بەرگری ئەکات لە شوێن کەوتنی شەیتان، مەبەستەکانی هەموو دژ و پێچەوانەی ڕا و ئارەزووی شەیتانن، بەڵیْ ماڤ خۆیانە و ئەبیْ نەفام و نەزان هەر شتی ئاوا بڵێت، ئەبیْ خۆیشی ئەزانیْ چی ئەڵێت. ئینجا لێرەدا بە کورتی ڕووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) یەکەم خوا پەرست بووە و پێشەوای خوا پەرستانە و دوور ترین کەس بووە لەو تاوانە گەورەیە. بۆ ئەمەی خەڵکی تر باش بترسن و خۆیان بپارێزن لە بت پەرستی و هاوبەش ڕەوادان، ئەفەرمویْ: ﴿فَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْمُعَذَّبِينَ﴾ کاتیْ ئەوانەت زانی کە باس کران، کەواتە هیچ پەرستراوێکی تر نەپەرستی لەگەڵ خوادا تا بەهۆی ئەوەوە ببی بە یەکیْ لە سزادراوان و بچیتە ڕیزیانەوە، کاتیْ پێغەمبەر(ﷺ) هەڕەشەی ئاوا سامناکی ئاراستەی بکریْ ئەگەر بێجگە لە خوا هیچ شتیْ تر بپەرستیْ، دەی ئەبیْ خەڵکی تر چۆن بن و چۆن ڕزگار بن لە سزای سامناکی خوا؟ لەو ڕۆژەدا بێگومان لایەنگیری نی یە و تەنانەت پێغەمبەریش ناپارێزریْ ئەگەر ئەو تاوانە گەورەیە بکات! ئینجا لە پاش ترساندنی خۆی**

فەرمانی دا کە کەس و کارە زۆر نزیکەکەی بترسێنێ تا خەڵکی تر تەمێ خوار بن، سروشتی فەرمانەکەیش وایە و ئەبێ هەر بەو جۆرە بێت، ئەفەرموێ: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ﴾ خزم و کەسە زۆر نزیکەکانت بترسێنە.(ئیمامی بۆخاری و موسلیم) ئەگێڕنەوە کە کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ سەر سەفا و ئینجا جاڕی دا و بانگی کرد: ﴿یا صباحاه﴾ کۆبوونەوە لای بۆ هەواڵ زانین، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ئەی بنی عبدالمطلب ئەی بنی فهر، ئەی بنی لۆی، پێم بڵێن ئەگەر من هەواڵتان بدەمێ کە لەشکرێ وا بەسەر ئەو شاخەوە ئەیەوێ بدا بەسەرتان دا ئایا بڕوام پێ ئەکەن؟ ئەوانیش وتیان: بەڵێ. ئەویش فەرموی: دەی بێگومان من ترسێنەرم بۆ ئێوە لە پێش هاتنی سزایەکی بەتین، ئینجا ئەبو لەهەبی مامی وتی: ئەی لە ناوچی و ڕەنجەڕۆ بیت ئایا بۆ ئێمەت تەنیا بۆ ئەمە بانگ کرد؟ بەو بۆنەوە سورەتی لەهەب هاتە خوارەوە دەربارەی ئەبو لەهەب.(ئیمامی موسلیم) حەدیسی ئەهێنێ لە دایکی باوەڕداران عائیشەوە -خوا لێ ی ڕازی بێت- کاتێ ئەم ئایەتە هات پێغەمبەر(ﷺ) هەستا و فەرموی: ئەی فاطمەی کچی محمد، ئەی سەفیەی کچی عبدالمطلب، ئەی بنی عبدالمطلب. من لە لایەن خواوە خاوەنی هیچ شتێك نیم بۆ ئێوە، واتە بەرگری سزای خوام پێ ناکرێ بۆ ئێوە ئەگەر باوەڕ نەهێنن، چی ئاروزو ئەکەن و ئەتانەوێ لە دارایی و سامانم داوام لێ بکەن،(موسلیم و ترمذی) حەدیسێ ئەهێنن لە ئەبوهورەیرەوە کە ئەم ئایەت هات پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کردە قورەیش بە شێوەی گشتی و بە تایبەتی بەم ڕەنگە فەرموی: ئەی کۆمەڵی قورەیش خۆتان ڕزگار بکەن لە ئاگر، ئەی کۆمەڵی بنی کەعب خۆتان ڕزگار بکەن لە ئاگر، ئەی فاطمەی کچی محمد خۆت ڕزگار بکە لە ئاگر. چونکە سوێند بەخوا من خاوەنی هیچ شتێك نیم بۆ ئێوە لەبارەی خواوە بەس سیلە ڕەحمتان هەیە لەگەڵم دا لەم جیهانەدا بەجێ ی ئەهێنم و لە ڕۆژی دوایی دا سوودی نی یە ئەگەر باوەڕ نەهێنن. ئەم حەدیسانە و چەند حەدیسی تر لەم بارەیەوە روونی ئەکەنەوە کە چۆن پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ئەو فەرمانەی وەرگرت و گوێ رایەڵیی خوای خۆی کرد و چۆن ئەو فەرمانەی راگەیاند بە خزمە زۆر نزیکەکانی، دەستی هەڵگرت لە هەموو کارێکیان و حەواڵەی خوای کردن لەبارەی کاروباری ڕۆژی دوایی یانەوە، روونی کردەوە بۆیان کە

خزمایەتی و نزیکی یان لە خۆیەوە سوودیان پێ ناگەیەنێ ماتووڵ کردەوەی خۆیان سوودیان پێ نەگەیەنێ، خۆی کە پێغەمبەری خوایە هیچ شتێکی ئەوانی بەدەست نی یە لەبارەی خواوە... ئا ئەمەیە ئیسلام بەم روون و رێکی و رەوانی یەوە، هەموو خەڵك بەندەیە و تەنیا خوا خوایە و کەس ناتوانێ دەست بدات لەهیچ و کارو بڕیارێکی، هەموو لە رێوە بەبێ واسیتە خوای خۆیان ئەپەرستن، کەس هیچی بەدەست نی یە بۆ هیچ کەس، بەڵکو هەموو شتێ ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوا، بەڵێ تکا کردن راستە و هەیە چ بۆ لێ بوردنی گوناه، چ بۆ بەرزکردنەوەی رادە و پلەی بەندە، بەڵام ئەویش بەستراوە بە ئیزن و فەرمانی خواوە تا ئەو ئیزن و فەرمان نەدا کەس ناتوانێ تکا بۆ هیچ کەس بکات، بێگومان هەرگیز ئیزن نادات بە تکا کردن بۆ کەسێ کە ئیمان و باوەڕی نەبێ، کەواتە هیچ بەندەیەك لە رۆژی دوایی دا تکا کردنیشی بەدەست نی یە و سەربەخۆ ناتوانێ تکا بکات، هەروەها بێگومان لەم جیهان و لەو جیهان بەندەی ئیمان و باوەڕدار سوود وەرئەگرێ لە باوك و باپیری ساڵح و چاك، بەم رەنگە بەهۆی ئەو خواناسانەوە لەم جیهانەدا قازانج و دەست کەوتیان ببێ و بەرگری زیانیان لێ بکرێ، بۆ وێنە وەکو دوو منداڵە هەتیوەکە کە لە سورەتی(الکهف) دا باسمان کردن. یان لەو جیهان دا رادە و پلەی رۆڵە و نەوە بەرز بکرێتەوە لە بەهەشت دا و بکرێ بە هاوسەر و هاوڕێ ی باوك و باپیرە چاکە لەخوا ترسەکان، وەکو لە ئایەتی سورەتی(الطور) دا دەرئەکەوێ: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَانٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَا أَلَتْنَاهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَيْءٍ﴾ ئەمانە و وێنەی ئەمانە هەن، بەڵام هەمووی زیادە لوتف و میهرەبانی کە خوای بەزەیی دار بەکاری ئەهێنێ لەگەڵ ئەو بەندە چاکە خواناسانەدا و دڵنەوایی ئەوانی پێ ئەکات و رێز گرتنی ئەوانە لە رێوە و بەڵام لە پەنای ئەوان دا ئەمانیش سوود بەخش ئەبن، وەکو پەندی پێشینانی کوردی ئەڵێ:((لەپەنای گوڵە گەنم دا چەند گوڵ مرۆر ئاو ئەخواتەوە))، بێجگە لەوەش ئەو سوود و قازانج و دەست کەوتە بە دەست پیاو چاکەکە نی یە و ئەو نایکات، بەڵکو تەنها بەدەست خوایە و خوا ئەیکات. پێویستە لەسەرمان بە وردی بیر بکەینەوە تا تێ بگەین و هەموو کەسێ و هەموو شتێ لە رادەو سنووری خۆی دا راگیر بکەین بە پێی بڕیاری ئایینە بەفەڕەکەمان، هەرگیز لەو سنوورانە تێپەڕ نەکەین کە ئەو بۆی داناوین.

وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢١٥﴾ فَإِنۡ عَصَوۡكَ فَقُلۡ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٢١٦﴾ وَتَوَكَّلۡ
عَلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾ ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ
ٱلۡعَلِيمُ ﴿٢٢٠﴾ هَلۡ أُنَبِّئُكُمۡ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٖ ﴿٢٢٢﴾ يُلۡقُونَ ٱلسَّمۡعَ
وَأَكۡثَرُهُمۡ كَٰذِبُونَ ﴿٢٢٣﴾

---

لەپاش فەرماندان بە ترساندنی خزمە زۆر نزیکەکان، ئینجا فەرمان ئەدات کە چۆن لەگەڵ باوەڕداران دا ڕەفتار بکات، ئەفەرموێ: ﴿وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ باڵی بەزەیی و نەرم و نیانی ڕاخە بۆ ئەو باوەڕ دارانەی کە شوێن کەوتوون، ئەوانەی کە هاتن، بە دەم بانگ و بانگەوازەکەتەوە، پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بە درێژیی تەمەن و ژیانی بەفەڕی بەو جۆرە بوو لەگەڵ باوەڕداران دا کە خوا فەرمانی دا، خو و ڕەوشتی بریتی بوو لە قورئان و نوێنەری ڕاستەقینە بوو بۆ قورئان، ئینجا ڕوونی ئەکاتەوە بۆی کە چۆن بێت لەگەڵ ئەوانەدا کە مل کەچ ناکەن و گوێ ڕایەڵی نابن، ئەفەرموێ: ﴿فَإِنۡ عَصَوۡكَ فَقُلۡ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ﴾ ئینجا ئەگەر ئەو ترسێنراوانە مل پێچی و سەرکێشی یان لێ کردی و باوەڕیان نەهێنا ئەوە پێ یان بڵێ: بەڕاستی من بەریم لە کردەوەتان و لەوەی کە ئەیکەن، واتە بێزاری دەر بڕە لێ یان و تێکەڵی یان مەکە. ئەم فەرمانە بۆ چەرخی مەککە بوو پێش ئەوەی فەرمانی پێ بدرێ بە جەنگ و کوشتاری بت پەرستەکان، ئینجا فەرمان ئەدات بە ڕووکردنی بۆ لای خوای خۆی کە هەمیشە چاودێریی و سەرپەرشتی ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ﴾ هەموو کاروبارت هەواڵەی خوا بکە کە زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و هیچ شتێ ناتوانێ مل پێچی لێ بکات، بە بەزەیی یە پێت. پشت بەو خوایە ببەستە کە توانایە بەسەر ژێر خستن و لەناو بردنی دوژمنەکانی و یارمەتی دان و زاڵ کردنی دۆستەکانی، چارەسەری ئەوانەت بۆ ئەکات کە سەرپێچی ئەکەن لێت، پشت بەو خوایە ببەستە کە هەمیشە ئاگای لێتە و چاودێریت

ئەكات، ئەو خوایە ﴿ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ﴾ كە تۆ ئەبینێ كاتێ هەڵئەسێ بۆ نوێژ بە تەنیا ﴿وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ﴾[1] ئەبینێ گۆڕانت لە هەموو بارو رووكنەكانی نوێژدا لەناو ریز و كۆمەڵی نوێژكەران دا كە پێش نوێژیی یان بۆ ئەكەیت و وەستان و ركوع و سوژدەیان پێ ئەبەیت.

﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ بەڕاستی ئەو خوایە تەنها ئەو بیسەر و ئاگاداری راستەقینەیە. ئینجا هەمیتر دێتەوە سەر قورئان لە یەكەم جاردا دڵنیایی كرد لەسەر ئەوە كە قورئان نێرراوە خوارەوەی پەروەردگاری هەموو جیهانە و جوبرەئیل هێنایە خوارەوە، لەجاری دووەم دا دەم كوتی ئەوانەی كرد كە ئەیان وت: شەیاتین ئەم قورئانەی هێناوەتە خوارەوە. لەم جاری سێ یەمەدا روونی ئەكاتەوە كە شەیاتین نایەن بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) و بە هیچ رەنگ ناگونجێ داباریێن بەسەری دا لەبەر دوو شت: یەكەم: شەیاتین بۆلای كەسێ دێن و دائەبارێن بە ملی دا كە زۆر درۆزن و تاوانبار بێت، دەی ئاشكرایە كە پێغەمبەر(ﷺ) بەرزترین پلەی بووە لە راستی و بێ گوناه و تاوانی دا. دووەم: ئەوانەی كە لەناو عەرەب دا ناو ئەبران بە كاهین و لایان وابوو جن و شەیاتین هەواڵیان بۆ ئەهێنن زۆربەی قسە و هەواڵەكانیان بەدی نەئەهات و بە درۆدەرئەچوون، دەی هەموو هەواڵەكانی پێغەمبەر(ﷺ) وەكو رۆژی رووناك بەدی ئەهاتن، ئەفەرموێ: ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ﴾ ئایا هەواڵتان پێ بدەم كە شەیاتین دائەبارێن بەسەر چ كەسێك دا؟ ﴿تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ﴾ دائەبارێن بەسەر هەموو كەسێك دا كە درۆزن بێت و زۆر تاوانبار و گوناهكار بێت، ﴿يُلْقُونَ ٱلسَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَٰذِبُونَ﴾ ئەو درۆزن و تاوانبارانە زۆر بەتین گوێ ئەگرن لە شەیاتین و هەواڵ و شتیان لێ وەرئەگرن و زۆربەیان درۆ ئەكەن و لەو هەواڵانەدا كە ئەیدەن بە خەڵكی و بە درۆزن دەرئەچن، ئیتر لەبەر ئەوە كە ئەو شتانەی وەری ئەگرن لە رووی زانینەوە نی یە و گومان و خەیاڵاتە و خۆشیان چەند دەلەسەی تری پیا ئەنێن، یان بەهۆی ئەوەوە كە شەیاتینەكان هەواڵەكانیان بە باشی و رێكی وەرنەئەگرت لە

---

[1] ئەم ئایەتە بە چەند جۆرێكی تریش تەفسیر كراوەتەوە، مەبەست لە هەمووان هەر یەكە، كە خوا پێغەمبەر(ﷺ) ئاگادار ئەكات بە لوتف و نزیكیی و چاودێریی خوا بۆی و هەمیشە وا لە پەنای دا.

مەلائیکەوە و ئینجا چەند درۆی تریشیان ئەخستە پاڵ و ئەیاندا بەگوێی کاهینەکان دا و ئەوانیش هەواڵیان پێ ئەدا بە خەڵکی. ئیمامی و بوخاری و موسلیم و ئیبن و مەردەویە حەدیسێ ئەهێنن لە دایکی باوەڕدارانەوە عائیشە – خوا لێ ی رازی بێت – کە ئەفەرموێ: چەند کەسێ پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی کاهینانەوە و ئەویش فەرموی: ئەوانە هیچ نین، ئینجا ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە لە چەند جار و کاتێك دا هەواڵ ئەدەن بە هەندێ شت و بەڕاست دەرئەچێ. ئەویش فەرموی: ئەو شتە راستە جنۆکە وەری ئەگرێ و ئەیخاتە گوێی دۆستەکەی و ئینجا پتر لە سەد درۆی تێکەڵ ئەکەن.

بێگومان جن و شەیاتین بە پێی قورئان و حەدیس لە پێشەوە رێگای هات و چۆی ئاسمان و گوێ گرتن لە مەلائیکەیان بووە، لەپاشان بەرگریی کران لەو چوون و گوێ گرتنە مەگەر بە گورگە فڕێ کەسێکیان گوێ بگرێ ئەویش دەست بەجێ پارچە ئاگرێك ئەکەوێتە شوێنی و ئەیفڕێنێ ئیتر زامداری بکات یان بە تەواوی بیسوتێنێ، جا ئەو وشە راستە کە وەریان ئەگرت لەو کاتەدا بووبێ پێش بەرگریی کردنیان یان ئەبێ بیبڕین بەسەر ئەو کاتانەدا کە بە گورگە فڕێ وەریان ئەگرت و بڵێین هەموویان ناسووتێن، هینی وایان هەیە ئەمێنێتەوە، ئەوەش کە وەری گرتووە شتێ تربووە جگە لە قورئان. چونکە وەکو لە ئایەتی پێشوودا فەرموی: جن و شەیاتین دوور خراوە و بەرگریی کراون لە گوێ گرتن و وەرگرتنی قورئان چ لەلایەن خۆیانەوە، بەم رەنگە سروشتەکەی خوا وەرگرن و یان بەهۆی مەلائیکەوە لەوانی یەوە وەرگرن... هەندێ جار ئەو بێ بڕوایانە ئەیان وت: قورئان شیعرە و پێغەمبەر(ﷺ) شاعیرە و ئەمەی هەڵبەستووە لەلایەن خۆیەوەیەتی و ئەڵێ لە خواوە بۆم هاتووە، بەڕاستی ئەوانە سەرسام و سەرگەردان بوون کە چۆن بەرەنگاری ئەم قورئانە بوەستن کە وێنەیان نەدیوە، بەم جۆرە ئەچێتە دەروونی خەڵك و دڵی سەندوون و زاڵە بەسەریان دا بە هیچ کلۆج چاری ناکەن. ئینجا ئەوا قورئان بەرپەرچیان ئەداتەوە و دەم کوتیان ئەکات و روونی ئەکاتەوە کە بەرنامەی قورئان و محمد جیاوازە لە بەرنامەی شیعرو

شاعیران. بە هیچ رەنگ یەك ناگرن، چونكە ئەم قورئانە رێك و راست و دامەزراوە لەسەر رێگایەكی روون، بانگ ئەكات بۆ یەك مەبەست و ئامانجێكی دیاریی كراو، رێگایەكی راستی داوەتە بەر بۆ گەیشتن بۆ ئەو مەبەست و ئامانجەی، پێغەمبەر(ﷺ) ئەمڕۆ شتێ نالێت سبەی هەڵیوەشێنێتەوە، شوێنی هەوا و ئارەزووی نەفس ناكەوێ و بە گوێرەی ئەوە بگۆڕێ هەر دەمە و بە بارێك دا، بەڵكو سوور و كۆڵ نەدەرە لەسەر بانگ كردنی خەڵكی، دامەزراوە لەسەر عەقیدە و باوەڕێكی تایبەتی و هەمیشەیی لەسەر بەرنامەیەك كە هیچی لاری تیا نی یە، شاعیران بەو جۆرە نین و شاعیران دیلی دەستی سۆز و ئارەزووی نەفسی خۆیانن كە هیچ كات لەسەر باری دامەزراو نی یە، هەست و سۆزی خۆیان كاربەدەست و جڵەو راكێشیانە، بەهۆی ئەوەوە تەنیا شتێك لە كاتێك دا بە رەش سەیری ئەكەن، لە كاتێكی تردا بە سپی ئەزانن، كاتێ دەروونیان خۆشی و رەزامەندی تیا بێت شتێ ئەڵێن، كاتێ خەشم و قین لە دڵیان دا بێت شتێكی تر ئەڵێن دژ و جیاوازی قسە و وتەكەی تریان!! لەگەڵ ئەوەش دا لەسەر خەیاڵ ئەژین و شتی بێ ئەساس و ناڕاست بە حەقیقەت و راست دائەنێن و بە خەیاڵی خۆیان شت دروست ئەكەن! بەڵام ئەو كەسەی كە خاوەنی بانگ و بانگەوازێكی دیاریی كراوی راستەقینەیە و كە ئەیەوێ بەدی هێنانی ئەوەی بانگی بۆ ئەكات لە واقیع و لە ژیان دا، ئەو خاوەن بانگ و بانگەوازە بەو جۆرە نی یە و بەو شێوە ناژی كە شاعیرانی لەسەر ئەژین، ئەم مەبەست و ئامانجێكی تایبەتی و رێگا و بەرنامەی خۆی هەیە، بە رێگاكەی خۆی دا ئەڕوات و لەسەر بەرنامەكەی خۆی بەچاو و دڵێكی كراوەوەو بە ژیریی یەكی ئاگادار و وریاوە و بە خەیاڵات و شتی پڕو پووچ رازی نابێ و داناكەوێ. كەواتە رێگا و بەرنامەی پێغەمبەر و شاعیران زۆر جیاوازن لە یەكتر و دژی یەكترن، هیچ كام لە یەك ناكەون و ناگۆڕێن بەوی تر لە ئاستی هیچ كەس،

وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِى كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا
يَفْعَلُونَ ﴿٢٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱنتَصَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟
وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾

ئەفەرموێ: ﴿وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ﴾ شاعیرەکان تەنها گومڕاکان و لە ڕێگای ڕاست ترازاوەکان شوێنیان ئەکەون لە هەڵبەست و هۆنراوەکانیان دا و ڕێگایان ئەدەنە بەر و تەنها ئەوانە کەیف خۆش ئەبن بە هەڵبەستەکانیان و بە جوان و شیرینی سەیر ئەکەن. بێگومان شوێن کەوتووەکانی محمد بەو جۆرە نین، بەڵکو ڕاست و دامەزراون لەسەر ڕێگای ڕاست وخاوەنی خو و ڕەوشتی پاکن. ئینجا دڵنیایی ئەکات لەسەر ئەوە و ڕوونی ئەکاتەوە کە شاعیران بەو جۆرەن ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِى كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ﴾ ئایا نەت دیوە و نەتزانیوە کە شاعیرەکان بە هەموو دۆڵ و شیوێك دا بە سەرگەردانی مل ئەنێن و ئەڕۆن. واتە لە هەموو بابەت ئەدوێن بە زیادە ڕەویی و لە سنوور تێپەڕین و بە بێ گوێ پێدان و تێفکرین، ئەوەتا لە مەدح و سەنا و زەم کردن و زامدار کردنی ناموس و شەرەف و جوێن دان و بەڵێنی درۆ و کەشخە و شانازی و ڕووپامایی و هەموو جۆرە شتێکی تردا ئەگەنە ئەوپەڕی ڕادە و پلە، ﴿وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ﴾ ئەوانە شتێ ئەڵێن کە خۆیان نایکەن، بۆ وێنە هانی خەڵکی ئەدەن بۆ بەخشین و خۆیان هیچ نادەن بە کەس، هانی خەڵکی ئەدەن بۆ چاکە کردن و خۆیان هیچ پیاوەتی یەکیان لە دەست نایەت، هان ئەدەن بۆ ڕاست گۆیی و خۆیان درۆ و دەلەسە بازن، بۆ کەمترین نوختە و هۆ ناموسی خەڵکی لەکەدار ئەکەن و کەچی خۆیان ناگێڕنەوە لە ئیشی خراپ و کاری بێ ناموسی. ئینجا شتێکی ئاشکرایە کە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) یەکەم کەس و پێشەوا بووە لە بەدی هێنانی هەر شتێکی خێرو چلکە کە فەرمانی پێ دابێ. ئایەتێ لە ئایەتەکانی قورئان ئەمەیە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ واتە ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێناوە ئایا بۆچی شتێ ئەڵێن کە خۆتان نایکەن، خەشم و قاری خوا زۆر گەورە و بەتینە لەمەی ئێوە شتێك بڵێن کە خۆتان نایکەن. بە کورتی زۆر ڕوون و ئاشکرایە کە سروشتی ئیسلام کە بەرنامەیەکی تێرو تەواوی ژیانە جیاوازە لە سروشتی شیعر کە هەستێکە هەمیشە شوێن کەوتووی سۆز و ئارەزووی خاوەنەکەیەتی کە زۆرتر ئەژی لەسەر ئاوات و خەیاڵ پڵاو.

لەگەڵ ئەوەش دا ئیسلام بەرگریی شیعر و فەن ناکات و قەدەغەی نەکردوون لە بنەڕەت دا، وەکو وەرئەگێریێ بە رواڵەت لە دەم و دوامانی یەوە، بەڵکو بەرگری و قەدەغەی بەرنامەیەکی کردووە کە زۆرتر شیعری لەسەر دامەزراوە، بەرنامەی سۆز و ئارەزووی بێ بار و دانەمەزراو، بەرنامەی ئاوات و خەیاڵ پلاو، بەلاّم کاتێ کە هەست و دەروون دامەزران لەسەر بەرنامەی ئیسلام، لەبارەی شیعر و فەن و هەموو شتی تریەوە رەنگ و شێوەیەکی ئیسلام وەرگرت، کاتێ هەست و دەروون بەرنامەیەکی دامەزراوی هەبوو و مەبەست و ئامانجەکانی ئیسلامی بوو، کاتێ سەرنجی ئەم جیهانەی ئەدا بە چاوێکی ئیسلامی و بە رووناکی ئیسلام. لەم کاتەدا ئیسلام شیعر و فەن قەدەغە ناکات و دژی نی یە،جا لەبەر ئەوە ئەم کۆمەڵە شاعیرەی جیا کردەوە لە کۆمەڵی شاعیرە خراپەکان بە دەرکردن و فەرموی: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱنتَصَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْ ﴾ واتە هەموو شاعیران بەو جۆرەن کە باس کران و لەسەر ئەو بارو شێوە خراپەن، جگە لەوانەی کە ئەم چوار سیفەتەیان هەیە:

١- ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕی رێك و راستیان هێنا.

٢- ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ کردەوە چاکەکانیان کردووە و بەجێ هێناوە.

٣- ﴿وَذَكَرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾ باس و ناوی خوایان زۆر بردووە لە شیعرەکانیان دا و زۆریەی شیعرەکانیان لەبارەی سوپاس و سەنای خواو پەرستن و هاندانی خەڵکی یە لەسەر گوێ رایەڵیی و خۆپاراستن لە سەرکێشی و گوناهو تاوان، هەروەها شتێك کە رەزامەندیی خوای تیایە و هۆی بەهێز کردنی باوەڕە.

٤- ﴿وَٱنتَصَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْ﴾ تۆڵەیان سەندووە لەپاش ئەمەی ستەمیان لێ کراوە. واتە زەمی کەس ناکەن مەگەر بۆ تۆڵە سەندن لەوانەی کە لە پێشەوە زەمی ئەمانیان کردبێ.

ئەمانە باوەڕیان هەیە، کەواتە دەروونیان پڕ بووە لە باوەڕی راست و ژیانیان لەسەر بەرنامە راوەستاوە، کردەوەی چاکیان بەجێ هێناوە، کەواتە هێزو وزەیان رووی کردووەتە کاری چاك و شیرین. ئەمانە تۆڵەیان سەندووە لە ستەمکار، کەواتە تێکۆشان و بەربەرەکانی یان هەیە و هێزو وزەیان ئەکەوێتە کار و بزووتنەوە بۆ یارمەتی دان و زاڵ کردنی ئەو ئایین و باوەڕە راستەی کە گرتوویانەتە گەردن. بێگومان(حەسانی کوڕی سابت و کەعبی کوڕی مالیك و عەبدوڵلاّی کوڕی رەواحە و عەبدوڵلاّی کوڕی زەبەعری و ئەبو سوفیانی کوڕی حاریث) لەو شاعیرانە بوون کە بەرگری یان کرد لە ئیسلام و پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی جەنگی بت پەرستەکان لەگەڵ ئیسلام و موسڵمانەکان لە چەرخی پێغەمبەردا(ﷺ). لە حەدیسی

سەحیح دا هەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بە حەسان: زەم و هەجویان بکە و جوبرەئیلت لەگەڵە. عبدالرحمن ی کوڕی کەعب لە باوکی یەوە ئەگێڕێتەوە کە وتی بە پێغەمبەر(ﷺ) خوای گەورە لە بارەی شاعیرانەوە ئەم ئایەتانەی ناردووە، واتە ئیتر ئەبێ ئێمە شیعر نەڵێین، لە وەڵامیان دا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: بێگومان باوەڕدار تێکۆشان ئەکات لە ڕێگای خوادا بە شمشێر و بە زمانی، سوێند بە کەسێ کە گیانی منی بەدەستە ئەو شیعرانەی ئێوە پیایان دا ئەڵێن وەکو سەری رم و تیر وایە.[1] ئینجا با بزانرێ کە شیعری ئیسلامی تەنها بریتی نی یە لەم جۆرانەی کە باس کران، هەروەها شیعری ئیسلامی پێویست ناکات لە ڕێوە تەنها باسی ئیسلام و ڕووداوەکانی ئیسلام بکات، بەڵکو شیعری ئیسلامی ئەمەیە مەبەستەکەی ڕاست و ڕەوا بێت و بە هەستێکی ئیسلامی یەوە بوترێت. بە کورتی ئیسلام لەبارەی ئەم بوونەوەرە فراوانەوە بە شێوەی گشتی و لەبارەی ئادەمیی و ژیانی ئادەمیی یەوە بە تایبەتی باوەڕو تێگەیشتن و زانینێکی بۆ هێناوین هەر شیعرێ لە چوارچێوەی ئەو باوەڕ و زانین وتێگەیشتنە دەرنەچێ ئەو شیعرە ئیسلامی یە ئیتر لە هەر شتێك دا و بۆ هەر مەبەستێك وترا بێت، هەرکەس سەرنجی شیعری پیاوە هەڵکەوتووەکان و خواناسەکانی ئەم ئوممەتە بدات لە چەرخی کۆن و تازەدا شیعری ئیسلامی بۆ ڕوون ئەبێتەوە و جیای ئەکاتەوە لەو شیعرانەی کە ئیسلامی نین. ئینجا دوایی سورەتەکە ئەهێنێ بە هەڕەشەیەکی سامناك بە شێوەیەکی کورت بەرامبەر بەو هەموو سەرکێشی و دەمبازی و بێ شەرمی و نەفامی یە کە لەلایەن بت پەرستەکانەوە بەرپا ئەکران و لە سورەتەکەدا پیشان دران و خرانە پێش چاو، ئەفەرموێ: ﴿وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ﴾ ئەوانەی کە زوڵم و ستەمیان کرد لە خۆیان، بەم ڕەنگە دژی ئەم ئایەتانی خوا وەستان و ڕوویان وەرگێڕا لەوەی بیریان لێ بکەنەوە، ئەوانە لەمە و دوا ئەزانن کە بە چ جۆرە گەڕانەوەیەك ئەگەڕێنەوە بۆلای خوا لەپاش مردن. بێگومان وەرئەگەڕێنەوە لەم باری ئێستایان بۆلای ئاگری دۆزەخ. خوا پەنامان بدات لێ ی کە هیچ سزا و ئازارێ ناگاتە ئەوە.

**سورەتی ﴿الشعراء﴾ دوایی هات لە ٥/١١ خوا یارمەتی بدات بۆ ئەوەی کە ماوە تەفسیری بکەم و لەم ڕۆژەدا دەستم کرد بە تەفسیری سورەتی ﴿النمل﴾.**

---

[1] ئەم حەدیسە ئیمامی ئەحمەد ئەیهێنێ و ریوایەتی ئەکات.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

طسٓ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْقُرْءَانِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿١﴾ هُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢﴾

## سورەتی(النمل)
## مەککەیی یە و(٩٣) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە لەپاش سورەتی(الشعراء) هاتە خوارەوە، لەسەر رچە و رەوشتی ئەو ئەڕوا: سەرەتایەکی هەیە کە مەبەست و مەوزوعی سورەتەکەی تیایە، چەند سەرگوزەشتەیەکی تیایە کە یارمەتی دەرن لەسەر وەرگرتن و دامەزراندنی ئەو مەبەست و مەوزوعە، چەند هەڵوێستێکی تایبەتی دیاریی کراو دەرئەخات بۆ بەراورد کردنی هەڵوێستی بت پەرستەکانی مەککە و هەڵوێستی گەل و نەتەوەکانی رابوردوو، تا بەهۆی ئەوەوە بیر بکرێتەوە و تەمێ وەرگیرێ لەوانەوە. مەبەستی سەرەکی ئەم سورەتە وەکو لە سورەتە مەککەیی یەکانی تردا عەقیدەیە، کەباوەڕە بە خواو پەرستنی بە تەنیا و باوەڕ بە ڕۆژی دوایی و پاداشت و تۆڵەی ئەو ڕۆژە و باوەڕ بە سروشی خوا.

سەرگوزەشتە و بەسەرهاتەکانی گەلە پێشووەکان ئەهێنێ بۆ جێگیر کردن و دامەزراندنی ئەو مەبەستانە و پیشاندانی پاشەڕۆژی بێ بڕواکان و باوەڕ دارەکان وەکو روون ئەبێتەوە لەکاتی خۆی دا، ئینجا با شەرم و سام و ترسەوە گوێ شل بکەین بۆ ئایەتە بەفەرمەکانی سورەتەکە. لە یەکەم جارەوە ئەفەرمویْ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ * طسٓ﴾ لەبارەی ئەم جۆرە پیتانەوە چەند جارێ دواین، کەواتە با لێرەدا بێ دەنگ بەسەری دا تێپەڕین، لەپاش ئەو دوو پیتە دێتە سەر باسی قورئان بە پیێ باوی خۆی لە هەموو سورەتێك دا کە قاپی کرابێتەوە بەم جۆرە پیتانە، ئەفەرمویْ: ﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْقُرْءَانِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ ئەم ئایەتە گەورەو

گرنگانەی کە لەم سورەتەدان چەند ئایەتێکن و لە کتێبێکی گرنگ کە روونە و رێکی و راستی یەکەی بە هۆی ئەوەوە کە موعجیزەیەکی ئاشکرایە لە هەموو چەرخ و کاتێك دا، هەموو کەس پەك کەوتوو و دەستە پاچەیە لە ئاستی، یان روون کەرەوەیە بۆ ئەو هەموو فەرمان و بڕیارو ئەو هەموو شتەی تیای دا باس کراوە کە هەمووی لە بەرژەوەندی بەندەیانی خوایە و هۆی بەختی و کامەرانی هەردوو جیهانە، ئینجا وەسف و سەنای ئەم قورئانە، یان ئەم کتێبە ئەکات بەمە: ﴿هُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ کە رێنموونی و رێگا نیشان دان و موژدەیە بۆ باوەڕداران، بێگومان قورئان رێنموونی و موژدەی تیایە نەك یەکسەر بریتی یە لە رێنموونی و موژدەدان، بەڵام ئەوەندە بەتینە لە رێنموونی و موژدەدان دا وەکو تەنها بریتی بێ لەوەو بەس، جا لەبەر گەیاندنی ئەو مەبەستە بەم شێوەی فەرموو، نەیفەرموو رێنموونی و موژدەی تیایە، بەڵێ بە راستی قورئان رێنموونی ئەکات و رێگا نیشان دەرە و رووناکی بەخشە لە هەموو سەرگەردانی و ون بوون و تاریکی یەك دا، هەرچۆنێ موژدە دەرە بۆ ژیانی هەردوو جیهان، هەرچەند قورئان بە شێوەی گشتی رێنموونی و موژدە دەرە، بەڵام سوود و بەرهەمی رێنموونی و موژدەکەی تەنها بۆ باوەڕدارانە لەبەر ئەوە تایبەتی کرد بەوانەوە و فەرمووی: ﴿هُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ چونکە قورئان کتێبێکی زانین و زانیاریی و تیۆ روانین یان بەدی هێنان نی یە کە هەرکەس بیخوێنێتەوە و ئەوەی تیایە وەری بگرێ، ئیتر سوود بەخش ببێ پێی، بەڵکو قورئان کتێبێکە لە یەکەم جارەوە لەگەڵ دڵ ئەدوێ و رووناکی و بۆنی خۆشی خۆی ئەڕژێتە ناو دڵێکی کراوەوە کە بە باوەڕی بەهێز و ئارامی دڵەوە وەریان گرێ، هەتا دڵ باوەڕی بەهێزتر بێت باشتر شیرینی قورئان ئەچەژێ، لە مەبەست و تەمێکانی شتێ وەرئەگرێ کە دڵە رەق و وشکەکان لێ ی بێ بەشن، بەهۆی نوور و رووناکی یەکەیەوە رێ ئەبا و رێگا ئەداتە بەر بۆ ئاوات و ئامانجێ کە دڵە بێ بڕواکان رێی پێ نابەن و کوێرانە ئەیخوێننن! وا ئەبێ یەکێ چەند جار ئایەتێك یان سورەتێك ئەخوێنێتەوە، بەڵام بە پەلە بێ

بیر لێ کردنەوە بەبێ ئاگایی، بەهۆی ئەوەوە هیچ پیت و فەڕ و بەرهەمێکی ئاشکرای دەست کەوت نابێ، دەروونی پاراو نابێتەوە و لە تاریکی رزگاری نابێت، کەچی هەڵ ئەکەوێ لەناکاودا بە خوێندنی چەند ئایەتێ. بەڵکو تەنها ئایەتێك دڵ و دەروونی ئەکرێتەوە بۆ تیشکی بەتینی قورئان، بەهۆی ئەوەوە پڕ ئەبێ لە هێمنی و ئارام و چەند شتی بۆ دەرئەکەوێ کە هەر بە خەیاڵیشی دا نەئەهات و ژیانی ئەگۆڕێ لە بەرنامەیەکەوە بۆ بەرنامەیەکی تر، لە رێگایەکەوە بۆ رێگایەکی تر، هەر رژێم و یاسا و بەرنامەیەك کە لە قورئان دا هەیە لە پێش هەموو شتێکەوە لەسەر ئیمان و باوەڕ راگیرە، هەر دڵێ ئەو ئیمان و باوەڕە رێکەی تیا نەبێ، ئەم قورئانە وەرنەگرێ لەسەر ئەم بنەڕەتە کە سروشە لەلایەن خواوە و ئەوەی تیای دا هەیە بەرنامەیەکە و خوا تەنها ئەوەی ئەوێ، ئەو کەسەی کە ئەو باوەڕە رێکەی نەبێ رێنموونی لەم قورئانە وەرناگرێ بە رێکی و بەو جۆرەی شایانە، موژدە بەخش نابێ بەو موژدانەی تیایەتی. لەم قورئانەدا چەند غەزنەی گەورە و گرنگ هەیە لە رێنموونی و زانین و ناسین و تەمێ و ئامۆژگاری، کلیلی ئەو هەموو غەزنەیانە هەڵناگیرێن بەو کلیلی ئیمانە نەبێت، ئەو کەسانەی کە بە راستی خاوەنی ئەو ئیمان و باوەڕە راستە بوون بە هۆی ئەو قورئانەوە چەند شتیان بەدی هێنا لە ژیان دا کە هەریەکێ لەوانە موعجیزە بوون و شتێکی کەس نەدیوو بوون بە درێژایی مێژوو و تەمەنی ئادەمی، بەڵام کاتێ ئەم قورئانە کرا بە کتێبێك کە ئایەتەکانی بخوێنرێتەوە بە ئاواز و دەنگ لەراندنەوە وە بە وێنەی گۆرانی یان بەس بۆ پیت و فەڕ وەرگرتن، کاتێ قورئان بەو شێوەیە بخوێنرێ ئەوە تەنها ئەچێتە ناو گوێچکە و ئیتر لەوێوە تێپەڕ ناکات بۆ ناو دڵ، دیارە ئەو کاتە هیچ کردەوە و بەرهەمێك وەرناگیرێ و هیچ کەس سوودێکی ئەو تۆی لێ وەرناگرێ، چونکە ئەو کاتە قاپی غەزنەکانی داخراون لێ ی بە بێ کلیل، ئینجا سیفەت و نیشانەی ئەو ئیمان دارانە پیشان ئەدات کە رێنموونی و موژدەیان لە قورئانەوە دەست کەوت ئەبێ،

ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ ئەو باوەڕ دارانە كەسانێكن كە نوێژ بە رێك و راستی بەجێ ئەهێنن، زەكات ئەدەن، واتە كردەوە چاكەكان بەجێ ئەهێنن كە نوێژ و زەكات سەر تەلَیانن، ﴿وَهُم بِٱلْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾ ئەوانە بە تایبەتی بڕوای بەهێزیان هەیە بە رۆژی دوایی بەبێ چەكەرە و گومان و دوو دلَی، هەمیشە دامەزراون لەسەر ئەو بڕوایە. ئەوانە بەو جۆرە رێك و راستە نوێژ بەجێ ئەهێنن، كەواتە بە دلێكی ئاگاوە ئەوەستن لەبەردەم پەروەردگاریان دا و گیانیان هەست ئەكات بەوەی كە لە حوزووری خوادان و خەریكن بە داوا و نزاوە لێ و وان بە پێش چاوی قودرەتی یەوە، بێگومان ئەو بێداری و هەستە هۆی هەموو پیت و فەڕێكە و مایەی دوور كەوتنەوەیە لە هەموو لاری و نالەباری یەك. زەكات ئەدەن بەو باوەڕە دامەزراوە، كەواتە دەروونی خۆیان پاك و خاوێن ئەكەن لە چلَك و چەپەلَی چاوبرسێتی و چنگ گوشراوی و بەرز ئەبنەوە و زالَ ئەبن بەسەر خۆشەویستی سامان و دارایی دا بەم رەنگە خۆیان رزگار ئەكەن لە بەندەیی سامان و لە پێناوی دا دووچاری بێ ناموسی و ناڕەوایی نابن، دەست گیرۆیی براكانیان ئەكەن و یارمەتی یان ئەدەن بە هەندێ لەوەی خوا پێ ی داون، هەلَئەسن بە هەندێ لە ماف گەل و كۆمەلَی موسلَمانان كە خۆیان ئەندام و بەشێكن لەو گەل و كۆمەلَە. ئەو باوەڕە بەهێزەیان هەیە بە رۆژی دوایی، كەواتە حیساب و پرسیاری ئەو رۆژە دلَی خەریك كردوون، و بەرگری یان ئەكات لە سەركێشی نەفسیان كە بە ئارەزووی ناڕەوای خۆیان پەل بكوتن و سام و ترس و شەرم كردن لە خوا گیان و دەروونیان داگیر ئەكات، كەواتە خۆیان ئەپارێزن لە گوناهو تاوان و وەستان لە بەردەم دادگای خوادا بە چلَك و چەپەلَی گوناهەوە، كەواتە بە زوویی ئەگەڕێنەوە لە هەر هەلَە و تاوانێكیان. ئەو باوەڕ دارانە كە زیكر و یادی خوا ئەكەن و هەلَئەسن بە ئەركێ كە خراوەتە سەر شانیان و مەترسی ئەكەن لە پرسیار و تۆلَەی خوا و ئومێد و چاوەڕوانی رەزامەندی و پاداشتی خوا ئەكەن... ئەوانە دلَیان كراوەتەوە بۆ قورئان، كەواتە قورئان ئەبێتە رێنموونی و موژدە بۆیان و ئەبێتە نوور و رووناكی بۆ گیان و رۆحیان و چەرخە ئەكات بەناو خوێن و دەماریان دا، هەموو كردەوە و جولاَن و بزووتنەوەیان لەبەر ئەو رووناكی یە دایە، توێشووی رێگایانە، ئارامی و پاراو بوونی دەروونیان بەو قورئانەیە. باوەڕ كردن بە رۆژی دوایی بەو جۆرە گرنگە و بەرهەمی گەورە و گرنگی هەیە لە ژیانی هەردوو جیهان دا،

إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ زَيَّنَّا لَهُمْ أَعْمَـٰلَهُمْ فَهُمْ يَعْمَهُونَ ﴿٤﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ وَهُمْ فِى ٱلْآخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ ﴿٥﴾

---

لەبەر ئەوە ئەم هەڕەشە سەختە ئاراستەی بێ بڕواکان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ زَيَّنَّا لَهُمْ أَعْمَـٰلَهُمْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی باوەڕ ناهێنن بە ڕۆژی دوایی کردەوە خراپەکانیانمان ڕازاندووەتەوە بۆیان و لە پێش چاویان شیرینمان کردوون، ﴿فَهُمْ يَعْمَهُونَ﴾ بەهۆی ئەوەوە ئەوانە چاوی دڵیان کوێرە و خراپی کردەوەکانیان نابینن، کەواتە بە سەرگەردانی یەوە ئەسوڕێنەوە لە شیو و دۆڵەکانی گومڕایی دا و لە چۆڵ و بیابانی نەفامی دا داماون و ڕێگا نابەن بەهۆی ڕزگاری و سەر فرازی. باوەڕ بە ڕۆژی دوایی لەغاوێکە جڵەوی ئارەزووە ناڕەواکانی نەفس و دەروونی پێ ئەگیرێتەوە و ڕاگیری ئەکات لە ڕادەیەکی ناوەڕاست و میانەدا، بەرزی ئەکات لە بەرەڵایی و زیادە ڕەوی، هەرکەس باوەڕی نەبێ بە ڕۆژی دوایی ناتوانێ خۆی بگێڕێتەوە لە هیچ ئارەزوویەك و خۆی لێ بێ بەش ناکات، چونکە گومانی وایە کە ئەوە هەلێکە و بۆی هەڵکەوتووە و دەستی داوە بۆی لەم ماوە کورتەی ژیان دا، کەواتە با بەسەری دا تێپەڕ نەکات، ئینجا ئایا ئەبێ چی بەرگری بکات و بیگێڕێتەوە لە بەجێ هێنانی ئەو ئارەزووە بەتینەی، لە پێك هێنانی ئەو خۆشی و لەزەتە، لە کاتێك دا بە تەمای هیچ پاداشت و تۆڵە نی یە و هیچ مەترسی نی یە لە وەستان لەبەردەم دادگای خوادا؟ جا لەبەر ئەوە هەموو بەجێ هێنان و پێك هێنانی ئارەزوو و لەزەتی شیرین کراو و ڕازاوەیە بەلای هەر نەفسێ کە بڕوای بە ڕۆژی دوایی نەبێ، پەلاماری ئەدا و بۆی ڕائەپەڕێ و بە هەموو خۆشی یەکەوە بە بێ ترس و سام و شەرم لەخوا، نەفس بە جۆرێ دروست کراوە سروشتی وایە بە سۆز و پەرۆشە بۆ هەر شتێ ئارەزووی بکات و بەلایەوە بەلەزەت بێت، بە شیرین و جوانی بزانێ، ماتوڵ باوەڕی بەهێزی نەبێ بە ڕۆژی دوایی و بە جیهانی تری نەبڕاوە لەپاش ئەم جیهانی ئێستا کە ئەڕوا و نامێنێتەوە، هەرکات ئەو باوەڕە

بەهێزەی هەبوو، ئەو کاتە خۆشی و لەزەتی لە کردەوەیەکی تردا هەیە و سۆز و پەرۆشی بۆ شتێکی تر جیاواز لە هینی بێ باوەڕان، کە لەزەت و خۆشی سك و لەش لە چاوی دا هیچ نرخێکی نی یە!! خوای گەورە خۆی نەفسی ئادەمی بەو جۆرە دروست کردووە و گێڕاویەتی بە ئامادە و لێ هاتوو بۆ کەوتنە سەر ڕێگای ڕاست و وەرگرتنی ڕێنموونی ئەگەر چاو بکاتەوە بۆ بەڵگە و نیشانەکانی ڕێگای ڕاست، بە ئامادە و لێ هاتو بۆ لادان و ترازان لە ڕێگای ڕاست و خولانەوە بە سەرگەردانی ئەگەر بیری نەکردەوە و چاوی هەڵنەخست بۆ ئەو هەموو ڕابەر و بەڵگە روونانەی کە خوا فەراهەمی هێناون و سەرنجی بۆ ڕاکێشاون و مەیل و خواهیشی خوا ئیش ئەکات و بەدی دێت بە پێ ی ئەو باو و ڕەوشتەی کە نەفسی لەسەر دروست کردووە لەو دوو بارەی کە باس کرا بۆ نەفسی ئادەمی، جا لەبەر ئەوە قورئان لە بارەی بێ باوەڕەکانەوە فەرموی: ﴿زَيَّنَّا لَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ فَهُمْ يَعْمَهُونَ﴾ واتە ئەوانە باوەڕیان نەهێنا بە ڕۆژی دوایی، کەواتە بە پێ ی باوی خوا ئەبێ کردەوە خراپەکانیان لە پێش چاویان شیرین ببێ و بە چاکی بزانن... مەبەست بە ڕازاندنەوە و شیرین کردنی خوا ئەمە بوو کە باس کرا، کەواتە ئەوانە چاوی دڵیان کوێرە و هەست ناکەن بە خراپی و چەپەڵی کردەوە خراپەکانیان، یان سەرگەردانن و ڕێگای ڕاست نادۆزنەوە، پاشە ڕۆژ و چارەنووسی ئەو بێ بڕوایانەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ وَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ﴾ ئەوانە کەسانێکن کە تایبەتی یە بەوانەوە خراپتر و بەتین ترین سزا لەم جیهانەدا یان لە کاتی سەرە مەرگ دا یان لە هەردوو جیهان دا، ئەوانە لە ڕۆژی دوایی دا تەنها ئەوان زیان دار تر و ڕەنجەڕۆ ترن، واتە زیانی ئەو ڕۆژەیان زۆر بەتین ترە لە زیانی ئەم جیهانەیان، چونکە زیانی ئەوێ بە سۆ ترە و نەبڕاوەیشە، خوا پەنامان بدات لێ ی، ئینجا سەرەتای سورەتەکە دوایی ئەهێنێ بەم فەرمودەیە کە سەرنجی پێغەمبەری ئازیز ڕائەکێشێ بۆ گەورەترین چاکە و بەهرە و بەخششێ کە خوا داویەتی پێ ی، بەڕاستی فەرمودەکە ئێجگار بەتام ۆ مەزەیە و دەرمان و مەرهەمە بۆ هەموو سزا و ئازارێ کە لەلایەن بێ بڕواکانەوە ڕووی کردبێتە ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە(ﷺ)،

وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلْقُرْءَانَ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ عَلِيمٍ ﴿٦﴾ إِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهْلِهِۦٓ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا سَـَٔاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ ءَاتِيكُم بِشِهَابٍ قَبَسٍ لَّعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٧﴾ فَلَمَّا جَآءَهَا نُودِىَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِى ٱلنَّارِ وَمَنْ حَوْلَهَا

---

ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلْقُرْءَانَ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ عَلِيمٍ﴾ بەڕاستی ئەی پێغەمبەر تۆ قورئانت پێ ئەدرێ و قورئان فێر ئەکرێیت لەلایەن خوایەك کە کار دروست و لێزان و ئاگادارە بەسەر هەموو شتێك دا، کاردروست و لێزانە لە فەراهەم هێنان و بەڕێوەبەری و سەرپەرشتی هەموو دروست کراوەکانی دا، ئاگادارە بە هەموو هەواڵ و بەسەرهات و بارێکیان دا، لێزان و کاردروستی و ئاگاداری یەکەی بە ڕوونی دەرئەکەوێ لەم قورئانە و لە ناردنی ئەم قورئانەدا، لە بەرنامەکەی دا، لە ئەرك و داواکانی لە بەندەکانی، لە تەمێ و پەند و ئامۆژگاری یەکانی، لە ڕێگە و ڕەچەیەك کە دایناوە بۆ ژیان لە هەردوو جیهان دا، لە....، لە....، لە....

ئینجا دەست ئەکات بە گێڕانەوەی هەندێ بەسەرهات و سەرگوزەشتە کە پێشانگایە بۆ کاردروستی و لێزانی و ئاگاداریی خوا، لە یەکەم جارەوە دەست پێ ئەکات بە چەسپاندنی بە گێڕانەوەی زنجیرەیەك لە بەسەرهاتی موسا(علیه السلام)، وەکو بفەرموێ: ئەی پێغەمبەر تۆ نەوزوهور و – یەکەم کەس – نیت کە سروشت لە لایەن خواوە وەرگرتبێ، ئەوە موسا لە پێش تۆوە ئەرکی پێغەمبەرێتی خرایە سەرشان و بانگ کرا بۆ ئەمەی بچێ بۆلای فیرعەون و گەلەکەی، ئەو سزاو غەم و مەینەتەی دووچاری ئەبی لە گەلەکەتەوە و ئەو بێ بڕوایی و سەرکێشی یەی کە ئەیبینی لێ یانەوە ڕووداوێکی یەکەم جار نی یە، ئەوەتا فیرعەون و گەلەکەی لە دەروون دا ئەیانزانی و باوەڕیان بوو بە موعجیزەو رابەر و ئایەتەکانی خوا، کەچی دانیان پیا نەئەنا بە سەرکێشی و بە مل هوڕی، ئینجا تەماشاکە پاشەڕۆژیان چۆن بوو و خوا چی بەسەر هێنان و با گەلەکەی تۆیش بە تەمای وێنەی ئەوان بن بەسەریان بێت، ئەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهْلِهِۦٓ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی بەسەرهاتی موسا بکە، بەسەرهاتی ئەو کاتەی کە وتی بە خێزانەکەی: ﴿إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا﴾ بێگومان من ئاگرێ چاو ئەکەم لە دوورەوە بە جۆرێ دڵی پێ خۆش ئەکەم. ئەمە لە کاتی گەڕانەوەی بوو لە وڵاتی مەدیەنەوە بۆ میسر، ئەوەش لە تەنیشتی شاخی(طور) ەوە بوو، باو وابوو لە چۆڵ و بیابان دا ئاگر ئەکرایەوە

لەسەر بەرزی یەکان دا بۆ ڕێنموونی ڕێبواران بە شەودا، کاتێ ئەو ئاگرەیان ئەدی ئەچوون بۆلای بۆ میوانی و خۆ گەرم کردنەوە، یان بۆ دەلیل و ڕێگا نیشان دەری، جا لەبەر ئەوە بە بینینی ئەو ئاگرە شادمان بوو و فەرموی: ﴿سَاٰتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ﴾ واتە بوەستن لێرەدا ئەچم بۆ لای ئەو ئاگرە و لەوێ هەواڵێکی ڕێگاتان بۆ ئەهێنمەوە ﴿أَوۡ ءَاتِيكُم بِشِهَابٖ قَبَسٖ لَّعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ﴾ یان گڕو بزوسکێ لەو ئاگرەتان بۆ ئەهێنم بەڵکو خۆتانی پێ گەرم بکەنەوە. موسا(علیه السلام) بەو نیازەوە ڕۆیی بۆلای ئەو ئاگرە و ئاگادار نەبوو بەمەی کە خوا کاری گرنگی پێ ی هەیە و لای ئەو ئاگرەدا بەرزترین بەهرەی دەست ئەخات وەکو روونی ئەکاتەوە بەم چەند ئایەتە: ﴿فَلَمَّا جَآءَهَا﴾ ئینجا کاتێ موسا هات بۆلای ئەوەی بە ئاگری زانی ﴿نُودِيَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِي ٱلنَّارِ وَمَنۡ حَوۡلَهَا﴾ بانگی لێ کرا بەمەی کە پیت و فەڕدارکراوە ئەو کەسەی لەناو ئاگردایە و ئەو کەسەی بە دەوری دایە، بەڕاستی بانگ لێ کردنێکی ئێجگار گەورە و گرنگە هەموو بوون و بوونەوەر ئەچێ بە پێشوازی یەوە و سام و ترس داگیری ئەکات و مل کەچە بۆی، هەموو دڵ و گیان بۆی دێتە لەرزە و هەشۆکە، بانگ لێ کردنێکە کە ئاسمان و زەوی یەك ئەگرن تیای دا و پەیوەندی ئەکەن پێکەوە، دروست کراوی زۆر بچووك بانگی دروست کەر و پەروەردگاری گەورەی خۆی وەرئەگرێ، لەو بانگ کردنەدا ئادەمی لەڕ و لاواز ئەبێتەوە بۆ دواترین پلەی، ئەکات بە پلەی وت و وێژ و راز و نیاز لەگەڵ دا کردن بەهۆی لوتف و بەزەیی و فەزڵی خواوە. ئینجا ئەو ئاگرە چی یە و کێ لەناویایەتی و کێ بە دەوریایەتی؟ بێگومان بە پێ ی راست تر و بەهێزترین را ئەوەی موسا بینی لە جۆری ئەم ئاگرەی زەوی ئێمە نەبوو، بەڵکو ئەوە نوور و رووناکی و جۆرێ تر بوو لە ئاگر کە سەرچاوەکەی کۆمەڵی هەرە بەرز بوو، ئاگرێ بوو کە فریشتەکانی خوا هەڵیان گیراندبوو، بۆ ڕێگا پیشان دان و ڕێنموونی هەرە گەورە، وەکو ئاگر و بە وێنەی ئاگر دەرئەکەوت و ئەو فریشتە و گیانە پاکانەی تیا بوو، بەهۆی ئەوەوە بانگ لێ کردنەکە بەو جۆرە هات کە تێپەڕی کرد تا دەر ببڕێ و هەواڵ بدات بەو پیت و فەڕەی کە ڕێژراوە بەسەر ئەو فریشتانەی کە لەناو ئەو ئاگرەدان... بەسەر موسادا کە وا بە دەوری دا... بوون و بوونەوەر ئەو بەهرە و بەخشە بەرز و بڵندەی لە دەفتەری خۆی دا نووسی، ئەو پارچە زەوی یە کە ئەو ڕووداوەی تیای دا ڕووی دا مایەوە لەو دەفتەرەدا و نووسرا بە پیت و فەڕدار و ڕێز گیراو بەهۆی ئەو ڕووداوەوە.

وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨﴾ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٩﴾ وَأَلْقِ عَصَاكَ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ
كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفْ إِنِّى لَا يَخَافُ لَدَىَّ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿١٠﴾

---

**ئینجا فەرموی: ﴿وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ خوایەك كە ناوی(الله) یە و پەروەردگاری هەموو عالەم و جیهانە پاك و خاوێنە لە هەموو لەكەو وێنە و هەر شتێ كە شایانی زاتی پاكی خوا نی یە، بێگومان بانگ لێ كردنی موسا و بیستنی فەرمودەی خوا لەو شوێنە بەفەڕەدا هۆی گومانی وێنە و شتی ناڕەوایە بۆ خوا لەلایەن نەفام و نەزان و بەد گومانەوە، بە تایبەتی لەسەر ئەو رایە كە ئەڵێ مەبەست بە وشەی(من) خوایە. كەواتە زۆر پێویستە هێنانی ئەم رستەیە لێرەدا بۆ بەرگری و نەهێشتنی ئەو جۆرە گومانە ناڕەوایانە لەلایەن نەفام و نەزان و بەد گومانانەوە، پاكی و بێ لەكەیی خۆی روون كردەوە لەگەڵ پەروەردگارێتی بۆ هەموو جیهان و عالەم ئینجا روونی كردەوە بۆ موسای بەندەی كە ئەو كەسەی بانگی لێ كرد خوایە: فەرموی: ﴿يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ ئەی موسا بە راستی كار ئەوەیە كە من خوایەكم ناوم(الله) و زاڵم بەسەر هەموو شتێك دا و هیچ شتێك ناتوانێ مل پێچی بكات لە زۆر و دەسەلاتم، لێزان و كاردروستم، واتە ئەو كەسەی بانگی لێ كردی منم كە ناو نیشانم ئەوەیە. موسا(علیه السلام) بۆ هەواڵ زانین هات، یان بۆ گڕی ئاگر كە خۆیانی پێ گەرم بكەنەوە. بەڵێ هەواڵی دەست كەوت، بەڵام نەك ئەو هەواڵە بچووكەی كە بەدوای دا هات، بەڵكو هەواڵێكی ئێجگار گەورە و گرنگ كە سەری تیرەی ئادەمی پێ بەرز بووەوە و پێی گەیشت بە ئاسمان و پۆپەی هەرە بەرز، بەڵێ گڕو رووناكی دەست كەوت، بەڵام نەك ئەو گڕ و رووناكی یە كەم و كورەی كە بە نیازی یەوە هات، بەڵكو گڕ و سەرە بزوسكێكی دەست كەوت لە رووناكی بێ پەی و بێ سنووری خوا كە رێنموونی خۆی و خێزان و گەل و نەتەوەكەی پێ بكات بۆ رێگا راستەكەی خوا كە هۆی دەست كەوتی كامەرانی هەردوو جیهانە، دیارە ئەو بانگ لێ كردنە بۆ هەڵبژاردن و پێغەمبەرێتی بوو، بۆ رەوانە كردن بوو بۆ سەر گەورەترین و بەهێزترین ستەمكار لە زەوی دا لەو چەرخ و كاتەدا، جا كەواتە ئەبێ بەهێزی بكات و یارمەتی بدات بە جۆرێ بتوانێ هەڵسێ بەو ئەركە گرانەی كە خراوەتە سەرشانی، ئەوە بەمە بوو لەو كاتەدا دوو موعجیزەی زۆر گرنگ و سەر سوڕهێنەری پێدا كە**

راستی پێغەمبەرێتی یەکەی پێ روون بکاتەوە: یەکێکیان گۆچان و دار دەستەکەی بوو کە ئەبوو بە ئەژدیها و ئینجا ئەبوویەوە بە دارە وشکە رەقەکە، ئەوی تریان ئەوە بوو دەستی ئەخستە ژێر باڵی خۆی و کە دەری ئەهێنا شوعلە و بریقەیەکی بەهێزی لێ پەیدا ئەبوو، وەکو بە درێژ تر لە سورەتی(طه) دا باس کراو لێرەدا بە کورتی بەسەری دا تێپەڕ ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَأَلْقِ عَصَاكَ﴾ بانگی لێ کرا کە گۆچانەکەت فڕێ دە، ئەویش فڕێی دا و کوت و پڕ بوو بە مارێ لە گەورەیی دا وەکو ئەژدیها وا بوو، لە چەسپانی دا وەکو تیرە مار ئەفڕی ﴿فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ﴾ ئینجا کاتێ موسا ئەو مارەی بینی بەتین و بە چەسپانی ئەجولێ بە جۆرێ وەکو تیرە مار بێ وایە، کاتێ ئەوەی بینی بە پێی سروشتی ئادەمی ترسا و بەهۆی ئەوەوە پشتی تێ کرد و رای کرد لێ ی و لای نەکردەوە بۆلای و نەگەڕایەوە سەری، ئینجا بانگی لێ کرا بۆ دڵ ئارام کردنی و بۆ روون کردنەوەی سروشتی ئەو ئەرکەی دووچاری ئەبێ ﴿يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفْ﴾ ئەی موسا نەترسی، ﴿إِنِّي لَا يَخَافُ لَدَيَّ ٱلْمُرْسَلُونَ﴾ چونکە بێگومان پێغەمبەران لای منن و لە حوزوری من دا ناترسن، واتە ئەی موسا تۆ کراوی بە پێغەمبەر و وایت لە حوزوری من دا، کەواتە شایان نی یە بترسیت لە هیچ شتێك، چونکە پێغەمبەران ناترسن، کاتێ سروشیان بۆ دێت و فەرمانی خوا وەرئەگرن، بەڵکو ترس بە دەروونیان دا گوزەر ناکات لەو کاتەدا، هەرچەند و هەر ئەنداز هۆی ترس و بیم ببێ و فەراهەم بێت، چونکە گیان و دڵ و دەروون و هەست و هۆشیان داگیر کرداوە و بە سروشی خوا و وەرگرتنی فەرمان و ئەرکێ کە خراوەتە سەرشانیان لەلایەن خواوە. رواڵەت و دیمەنی ئەم فەرمودەیە وا نیشان ئەدات کە پێغەمبەران هەرگیز بیم و ترس روویان تێ ناکات لای خوا، کەواتە ئەبێ هیچ کام لەوان دووچاری هیچ کردەوەیەکی ناڕەوا و ناشایستە نەبووبن، بێگومان تیایان دا نەبووە کە ئەو جۆرە کردەوانە روویان دابێ لێ یانەوە ئیتر پێش پێغەمبەرێتی یان لە پاشیش دا، بۆ وێنە وەکو ئادەم و داود و سولەیمان و یونس و هەروەها موسا کە لە پێش پێغەمبەرێتی دا کابرا بێ باوەڕە قیبتی یەکەی کوشت، ئەو جۆرە کردەوانە هەرچەند گوناهو تاوان نەبن ئەگەر کەسێ تر بیکات، بەڵام بۆ پێغەمبەران بە گوناهو تاوان و ستەم ناو ئەبرێن، کەواتە گومان ئەبرێ کە بەهۆی ئەو جۆرە شتانەوە ترسیان بووبێ و بێگومان بۆشیان نابێ، چونکە خوا ئەبورێ و ئەیانسڕێتەوە، کەواتە پێویستە نەهێشتنی ئەم گومانە و بەرگری ئەوەی دیمەن و رواڵەتەکە نیشانی ئەدات،

إِلَّا مَن ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ حُسْنًا بَعْدَ سُوٓءٍ فَإِنِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١﴾ وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ
سُوٓءٍ فِي تِسْعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿١٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ ءَايَٰتُنَا مُبْصِرَةً قَالُوا۟ هَٰذَا
سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾ وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا

---

**چا لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَن ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ حُسْنًا بَعْدَ سُوٓءٍ فَإِنِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ [1] ئەوەیان کە ستەمی کردبێ لەخۆی بەم رەنگە کارێکی کردبێ کە شایانی رادە و پلەی بەرزی ئەو نی یە و لەپاشان لە باتی ئەو کردەوە و بە دوای دا چاکەی هێنابێ، بەم رەنگە تۆبە و گەڕانەوەی بووبێ بۆلای خوا لە دوای خراپی یەکە، ئەو کەسە هەرچەند شتێکی کردووە هۆی بیم و ترسە، بەڵام هەر ترسی نابێ و ناترسێ، چونکە بەڕاستی من زۆر لێ بوردە و بەزەیی دارم، ئەوەی رووی داوە لێ یەوە ئەیسڕمەوە و ئەبوورم لێ ی، لەپاش ئەوە موسا(علیە السلام) دڵشاد و دڵ ئارام بوو خوای گەورە موعجیزەیەکی تری پیشان دا کە بەم فەرمودەیە بۆمان باس ئەکات و بۆمان ئەگێڕێتەوە، ﴿وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ﴾ واتە دەست بکە بە باخەڵت دا و لە یەخەی کراسەکەتەوە بیخەرە ژێر باڵت و کاتێ دەرت هێنا دێتە دەرەوە بە سپێتی و شوعلە و بریقە ئەداتەوە بە بێ ئەمەی نەخۆشی و بەڵەکی ببێ ﴿فِي تِسْعِ ءَايَٰتٍ﴾ کە**

---

**[1] بە پێی تەفسیرەکە ئیستیثناکە مونقەتیعە و مەبەست بە وشەی(مـن) تاقمێکە لە پێغەمبەران، بێجگە لەمە چەند رایەکی تر هەیە و وتراون:**

**١.مونقەتیع بێت و مەبەست(من) خەڵکی ترە جگە لە پێغەمبەران.**

**٢.موتەسیلە و مەبەست بە(من) تاقمێ لە پێغەمبەرانە.**

**٣.موتەسیلە و مەبەست گشتی یە، پێغەمبەران و هەرکەسی تر.**

**٤.موتەسیلە و لێ دەرکراو لابراوە، واتە پێغەمبەران ناترسن بەڵکو زاڵمان و ستەمکاران ئەترسن جگە لەوەی زوڵمی کردبێ و لەپاشان گەڕابێتەوە بۆلای خوا، ئەو کەسەی بەو جۆرە بێت ترسی بۆ پەیدا نابێت، چونکە خوا لێ بوردە و بەزەیی یە، بەڕاستی ئەم رایانەش ئەچێتە دڵەوە بە ئارامم پێ ی، بەڵام ئەوەی لە تەفسیرەکەدایە رای زۆر کەسی لەسەرە، لەبەر ئەوە هەڵم بژارد، خوا خۆی باشتر ئەزانێ.**

ئەم دوو موعجیزەیە دوانن لەو نۆ موعجیزە کە پێی رەوانە کراوی ﴿إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَقَوۡمِهِۦٓۚ﴾ بۆلای فیرعەون و گەلەکەی ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ﴾ واتە رەوانە کرای بۆلای فیرعەون و گەلەکەی، چونکە بەڕاستی ئەوانە کۆمەڵ و گەلێکی لە سنوور دەرچوون، لە سنوری زێریی ئەگەر لە پێشەوە ئاین و پێغەمبەریان نەبووبێ، لە سنووری ئاین و زێریش ئەگەر پێغەمبەریان بۆ هاتبێ.

موسا(علیه السلام) لەو کاتەدا ئەو دوو موعجیزەی بینی و بەڵێنی پێ دا بەو حەوت موعجیزەکەی تر کە لێرەدا باسی نافەرموێ و لە سورەتی(الأعراف) دا باسی فەرمون کە بریتین لە: ساڵی قاتی و گرانی و کەم و کوڕی بەروبومی میوەهات و باخات و تۆفان و کوللە و ئەسپێ و قورباق و خوێن. وەکو لە سورەتی ناوبراودا بە درێژیی راڤە و روون کراونەتەوە ﴿فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَٰتُنَا مُبۡصِرَةٗ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ﴾ ئینجا کاتێ موعجیزەکانی ئێمەیان بۆهات کە روون و ئاشکرایش بوون ئەوانە وتیان: ئەمەی ئێمە ئەیبینین جادویەکی ئاشکرایە. ﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ﴾ ئەوانە لەبەر ستەم کاری و لوت بەرزی و خۆ بە زل زانی دانیان نەنا بەو موعجیزە روونانەدا و بڕوایان پێ نەهێنا لەکاتێ دا کە لە دەروونیان دا باوەڕیان پێ یان بوو بە رێکی بە بێ هیچ گومان و دوو دڵی یەك.

سەرۆك و گەورە ستەم کارەکانی قورەیش لەگەڵ قورئان دا بەو جۆرە بوون، لە دەروونی خۆیان دا بە باشی ئەیان زانی کە راستە و بەلام بە لوت بەرزی و خۆ بە زل زانی دانیان نەئەنا بەو شتە راستەدا کە دڵ و دەروونیان بە حەق و راستی ئەزانی. چونکە ئەیان زانی ئەگەر باوەڕەکەی دەروونیان دەربڕن و دان بنێن بەو ئایینە راستەدا ئەبێ واز بێنن لە ستەمکاری و کەشخە و بافیشەکەیان کە لە پەنای ئەو ئایینە پڕو پووچەدا دەست کەوتیان بووە. حەق و راست لە هەموو کاتێك دا روون و ئاشکرایە زۆر لە دان نەنێرەکان لەبەر نەزانی و نەناسی نی یە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە مەترسی لێ ئەکەن و بە راستی خەتەرە بۆ ئەو بارە لارەی کە وان لەسەری، چونکە بێگومان ئەو حەق و راستە چنگلیان ئەکات و کەڵبەکانیان دەرئەهێنێ و بەرگری یان ئەکات لە هەموو ناڕەوایی و دەست درێژیی یەك.

فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ عِلْمًا ۖ وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥﴾

---

﴿فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ ئینجا تەماشاکە و سەرنج بدە ئایا چۆن بوو پاشە ڕۆژی ئەو خراپەکەر و تێك دەرانی وڵاتە؟ واتە فیرعەون و تاقمەکەی، دوا ڕۆژی ئەوانە خنکان بوو لە دەریادا بۆ ئەم جیهانە و سووتان بە ئاگری دۆزەخ و بەتین ترین سزا لە ڕۆژی دوایی دا کە قورئان لە چەند شوێنی تردا ڕوونی کردووەتەوە، لێرەدا دەست نیشانی بۆ ئەکات، بەڵکو بێ ئاگاکانی ئەم نەتەوە بێدار ببنەوە و بگەڕێنەوە و خۆیان بەد بەخت و عاقیبەت شەڕ نەکەن وەکو فیرعەون و تاقمەکەی، ئەم بێ ئاگایانەی کە بە ڕێبازی فیرعەون و تاقمەکەی دا ئەڕۆن و زۆربەیان دان نانێن بەم ئایینە ڕاستە ڕوونەی کە بۆیان هات و بە مل هوری و لوت بەرزی نەیان ویست و نایانەوێ ملی بۆ داخەن!!

لەپاش گێڕانەوەی زنجیرەیەك لە بەسەرهاتی موسا(علیه السلام) ئینجا باسی داود و سولەیمان پێغەمبەر دێتە پێشەوە، کە ئەم باوك و کوڕە وەکو موسا لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیلی بوون. بە کورتی دەست نیشان ئەکات بۆ داود و ئەدوێ لە سولەیمان بە درێژیی و درێژتر لە دووان لێ ی لە سورەتی تردا. هەرچەند دووانەکەی ئێرە لە بارەی زنجیرەیەکە لە زنجیرەکانی ژیانی وەکو ئەزانین لەمەوپاش، لە مێژووی بەنی ئیسرائیل دا بەسەرهات و سەرگوزەشتەی ئەم سێ پێغەمبەرە لە گرنگ ترین شت و گرنگترین بەسەرهاتە. قاپی سەرگوزەشتەی ئەم دوانە ئەکاتەوە بە باسی بەهرە و چاکەی خوا بەسەریانەوە. ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ عِلْمًا﴾ سوێند بەخوا بەشێك لە زانینمان دا و بەخشیمان بە داود و بە سولەیمان، ئەو بەشە زانینەی کە دای بە داود لەم سورەتەدا دیاریی نەکرد، بەڵام بە درێژیی لە چەند سورەتی تردا باسی فەرمووە. جا بە گوێرەی ئەوە هەندێ لەو زانینە بریتی یە لە فێر کردنی زیکر و سەنای خوا و خوێندنی زەبوور بە ئاوازەوە بە جۆرێ کە هەرشتێ بە

دەوری دا بیّ بۆی ئەسەندەوە و لەگەڵی دا ئەیووت لە خۆشی دەنگ و ئاوازەکەی ئەو، هەندیّ تر لەو زانینە فێر کردنی پیشەسازی زریّ و تاس کڵاو و کەرەسەی جەنگ بوو، وە ژێر بار کردن و ژێر دەست کردنی ئاسن بۆی کە بە مەیل و ئارەزووی خۆی بەکاری بێنیّ و هەرشتێکی پێویست و مەبەست بێت لیّ ی فەراهەم بێنیّ، هەندیّ تر لەو زانینە فێر کردنی حوکمڕانی و بڕینەوەی نیزاع و ئاژاوەی نێوانی خەڵکی بوو، کە سولەیمانیش بەشداری ئەکرد تیای دا، بەشە زانینی سولەیمان بریتی یە لەوەی لەم سورەتەدا بە درێژیی باسی ئەفەرمویّ بێجگە لە فێر کردن و زانینی حوکمڕانی و جڵەو گرتنە دەستی با بوو کە بە فەرمانی خوا ژێر بار و مل کەچ بوو بۆی، فەرمان پێدان و بەکارهێنانی لە پێویست و مەبەستی خۆی دا، هەروەها جنۆکە و شەیاتینیش. سەرگوزەشتەکە دەست پیّ ئەکات بە دەست نیشان کردن بۆ ئەم چاکە و بەهرە گەورەیەی کە خوا بەخشی بەم باوك و کوڕە، هەر لەو ئایەتەدا کە باسی ئەو بەهرەیە ئەکات سوپاس و چاولەبەری ئەو دووانە بۆ خوای بەخشندەی خۆیان ئەخاتە پێش چاو و دانیان بە نرخ و ڕێزی گەورەیی ئەو بەهرەیە لایان.

ئەفەرمویّ: ﴿وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەو دووانە وتیان: هەموو سەنا و سوپاسیّ بۆ خوایە کە زیادە و ڕێزی ئێمەی داوە بەسەر زۆر لە بەندە باوەڕ دارەکانی دا. کەواتە نرخ و ڕێزی زانین دەرکەوت و گەورەیی منەتی خوا بەو بەهرەیە روون بووەوە و ئاشکرا بوو و زیادەی کەسیّ کە ئەو چاکە و بەهرەی پیّ درابیّ. لێرەدا جۆری ئەو زانینەی دیاریی نەکردو روونی نەکردەوە کە ئەو زانینە لە چ بارەیەکەوە بووە، چونکە مەبەست لێرەدا دەربڕین و دەرخستنی زانینی رووتە بە شێوەی گشتی و بە بیّ دیاریی کردن، لەبەر گەیاندنی ئەمە کە هەموو زانینیّ بەهرە و بەخششێکە لەلایەن خواوە شایانی هەموو خاوەن زانینیّ ئەمەیە کە سەرچاوەی زانینەکەی بناسیّ و روو بکاتە خوای خۆی بە سوپاس و ستایش کردنی لەسەر ئەو چاکە و بەهرەیە کە پیّ ی داوە، ئەو زانینە بەکار بێنیّ لە رەزامەندی ئەو خوایەی کە ئەو چاکەی دەربارە کردووە، کەواتە ئەبیّ زانین خاوەنەکەی دوور نەخاتەوە لە خوای خۆی و ئەو خوای خاوەن چاکە و بەهرەی لەبیر نەباتەوە، هەر زانینیّ دڵ

دوور بخاتەوە لە خوا زانینێکی ناڕاست و بێ نرخە و لای داوە لە سەرچاوەکەی و لە مەبەست و ئامانجی و نابێ بەهۆی خۆش بەختی نە بۆ خاوەنەکەی و نە بۆ خەڵکی تر، بەرو بەرهەمی ئەو زانینە بریتی یە لە بەد بەختی و بیم و ترس و بێ ئارامیی و وێران بوون، چونکە ئەو زانینە پچڕاوە لە سەرچاوەکەی، لای داوە لە ڕێگای راستی خۆی و رێگای لێ ون بووە و ترازاوە لێ ی. بێگومان ئەمڕۆ ئادەمی چەند قۆناغێکی بڕیوە لە قۆناغەکانی زانین و زانیاریی، چەند هەنگاوێکی گرنگی ناوە لەو بارەیەوە، بەڵام ئایا تا ئەمڕۆ چ بەر و بەرهەمێکی چنی و دەست کەوت بوو لەم جۆرە زانین و زانیاری یەی کە خاوەنەکانی خوای خۆیانیان لە بیر نی یە و یادی ناکەن و لێ ی ناترسن و سوپاسی ناکەن و بەو زانین و زانیاری یەی کە پێ ی داون رووی تێ ناکەن؟ ئایا چی یان دەست کەوت بوو جگە لە کوشتن و بڕین و وێران کردن و بەرباد کردنی بێ تاوان، و جگە لە بڵاو کردنەوەی ترس و لەرز و بێ ئارامیی لەناو خەڵك دا؟ ئەو ترس و بیم و بێ ئارامی یەی کە خەوی شوم کردووە لە رۆژهەڵات و رۆژئاوا و هەڕەشەیان لێ ئەکات بە نەمان و بەرباد بوون؟ ئایا کێ دوو بۆمباکەی هێرۆشیما و ناکازاکی لەبیر ئەچێ کە ئەوەی کرد کە کردی؟!! [1] ئینجا لە پاش دەست نیشان بە چاکە و منەتی زانین بەسەر داود و سولەیمان دا و سوپاس و چاو لەبەریی ئەوان بۆ خوای خۆیان و ناسین و رێز و نرخ پێدانیان بۆ ئەو چاکە گرنگەی خوا بەسەریانەوە،

---

[1] پرۆفیسۆر(م.ی) کە مامۆستایە لە زانکۆی(برمنجهام) یەکێکە لە ئەندامی پیشەسازی ئامادەکردنی بۆمبای زەڕە، لەپاش رووداوی ئەو دوو بۆمبایە ئەڵێ من گومانم نی یە کە لە ماوەیەکی کەم دا چەند بۆمبایەك فەراهەم ئەهێنرێ کە هێزی تەقینەوەی بەرز ئەبێتەوە بەسەر ئەم بۆمبایانەدا بە دە هەزار تەن و بەدوای ئەوانەدا بۆمبای یەك ملیۆن تەنی پەیدا ئەبێ، - هیچ شتێك بەرگری ناکات و ناگونجێ خۆپارێزی لێ ی، شەش بۆمبای وەکو ئەوە بەسە بۆ وێران کردن و لەناوبردنی ولاتی بەریتانیا بەتەواوی. بەڕاستی قسەکەی بەڕاست گەڕا ئەوەتا بۆمبای هایدرۆجینی پەیدا بوو کە بۆمباکانی هێرۆشیما و ناکازاکی گاڵتەی منداڵانە لە چاوی دا کە تەنیا بۆمباکەی هێرۆشیما دەست بەجێ دوو سەد و دە هەزار کەس تا دوو سەد و چل هەزار یابانی کوشت جگە لە زامدار و قاچ پەڕیو کە بە دە هەزار ژمارە نەکران!

وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾

---

لەپاش ئەوە ئەفەرمویٔ: ﴿وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ دَاوُۥدَ﴾ سولەیمان میرات و کەلەپووری داودی وەرگرت، واتە لە شوێنی داوددا دانیشت لە پێغەمبەرێتی و پادشایەتی دا و بوو بە پێغەمبەرێکی پادشا لەپاش وەفاتی داوود. بەڵێ داود پێغەمبەرێتی و زانین و پادشایەتی پیٔ درا، بەڵام پادشایەتی باس ناکریٔ لەکاتی باسی چاکە و نیعمەتی خوا بەسەر داود و سولەیمانەوە، بەڵکو تەنها زانین باس ئەکریٔ، چونکە پادشایەتی لەوە بچووك تر و بیٔ نرخ ترە لەو جۆرە کاتانەدا باس بکریٔ و لەگەڵ پێغەمبەرێتی و زانین دا باس بکریٔ، کەواتە ئەوەی دڵ بۆی بڕوا مەبەست بە میرات و کەلەپوور زانینە، وەکو لەم فەرمودەیشەوە وەرئەگیریٔ، ﴿وَقَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ﴾ سولەیمان جاڕی دا و وتی: ئەی خەڵکینە ئێمە فێر کراین و زانا کراین بە گوفت و گۆی پەلەوەر، واتە پەلەوەر کە دەنگی دیٔ و ئەخوێنیٔ مەبەستێکی هەیە خوا ئێمەی تێگەیاندووە لە نیاز و مەبەستەکانیان. لە هەموو جۆرە شتیٔ کە درا بیٔ بە پێغەمبەران و پادشایان بە ئێمە دراوە، واتە سامان و دارایی زۆرمان پیٔ دراوە.. وتمان بەم فەرمودەیە وا نیشان ئەدات کە زانین شتێکی بەنرخە و شایانە بۆ باس کردن، چونکە ئەوەتا بە تایبەتی و بە شێوەیەکی دیاریی باسی زانین و فێرکردنی زمانی پەلەوەر ئەکات.. لە پێشەوە، ئینجا بە کورتی و بیٔ دیاریی کردن ناوی چاکە و بەهرەکانی تری خوا ئەبات بەسەریەوە. سولەیمان(علیه السلام) ئەم جاڕەی دا لەناو خەڵك دا مەبەستی ئەوەبوو دان بنیٔ بە چاکە و بەهرەکانی خوادا بەسەریەوە، چاو لەبەریی خۆی بۆ خوا دەربڕیٔ لەناو خەڵك دا – ئەوەش شتێکی پێویستە – نەك مەبەستی کەشخە و شانازی بێت بەسەر ئەو خەڵکەدا، وەکو بەم رستەیەش روونی ئەکاتەوە: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ﴾ واتە بەڕاستی ئەمەی کە دراوە بە من فەضل و چاکەیەکی روون و ئاشکرایە دەربارەم لەلایەن خواوە. کەواتە روون و ئاشکرای کرد کە مەبەستی سوپاسی خوا و دان نان بووە بە چاکەی خوا بەسەری یەوە. پەلەوەر و هەموو گیان لەبەرانی تر لە نێوان خۆیان دا شتێکیان هەیە کە هۆی راگەیاندن و وەرگرتنی نیاز و مەبەستی یەکترە – کە ئەوەیە زمان و گوفت و گۆیان –

لە نێوان خۆیان دا. خوای گەورە دەربارەی هەموو شت ئەفەرمویٚ: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم﴾ هیچ جۆرە گیان لەبەرێك نی یە لە زەوی دا و هیچ باڵندەیەك نی یە کە بە باڵەکانی ئەفڕیٚ مەگەر هەموو ئەوانە ئوممەت و میللەتێکن بە وێنەی ئێوە، بێگومان ئەوانە کاتیٚ ئوممەت و میللەتن کە لە نێوان خۆیان دا چەند شتێك هەبێت کە هۆی یەکێتی و پەیوەندی یان بێت و ژیانیان پێکەوە، لە نێوان ئەندامەکانیان دا هۆی راگەیاندن و وەرگرتنی نیاز و مەبەستی یەکتر و تێگەیشتنیان ببێت لە یەکتر، ئەمەش شتێکە هەستی پیٚ ئەکریٚ لە ژیانی چەند جۆریٚ زۆر لە پەلەوەر و گیانلەبەرانی تردا. زانایانی هەریەکە لەو جۆرانە تێکۆشان ئەکەن لە رێگای تێگەیشتنی هەندیٚ لە زمان و گوفت و گۆی ئەو گیان لەبەرانە، لە راستی دا شتێکیان دەست کەوت بووە لەو بارەیەوە، بەڵام نەك بە شێوەی دڵنیایی و زانینی تەواو، بەڵکو بە شێوەی گومان و گۆترە کاری، ئەوەی خوا بەخشی بە سولەیمان لەم جۆر و بابەتە نی یە، بەڵکو ئەوە شتێکی تری تایبەتی بوو بە پێچەوانەی باوی خەڵکی، بە شێوەی زانینی راستەقینە و دڵنیایی تەواو بوو بە وێنەی زمان و گوفت و گۆی ئادەمی، و لە رێگای هەوڵ و تێکۆشانەوە ئەوەی دەست کەوت نەبوو، بەڵکو ئەوە بەهرە و بەخششیٚ بوو بە شێوەی موعجیزە خوا دای بە سولەیمان(علیە السلام) بە وێنەی ئەو شتە سەر سوڕهێنەر و موعجیزە نایابانەی کە خوا دای بە پێغەمبەرانی تر – سەلامی خوا لە هەموویان بێت –.

بەڕاستی پێویستە روون کردنەوە و دڵنیایی کردن لەسەر ئەو باوەڕو مەبەستە، چونکە هەندیٚ لە زانایانی تازەی تەفسیر لەوانەی کە زانیاری تازە سەرسامی کردوون و دڵی بردوون ئەیانەویٚ ئەوەی کە قورئان بۆمان باس ئەکات لەبارەی سولەیمانەوە راڤەی بکەنەوە بەمە کە جۆریٚ بووە لەوەی کە زانایان لە رێگای زانیاری تازەوە هەوڵی بۆ ئەدەن. بێگومان ئەو بۆچوون و ئەو باوەڕە شتێکی زۆر ناڕەوا و ناڕاستە و لادانی ئەو بەهرە و موعجیزەی سولەیمانە لە سروشت و شێوە راستەقینەکەی خۆی، سەرەنجام و بەرهەمی تێك شکان و زیادە سەرسامی یەك کە هەندیٚ کەس دووچاری بوون و ئەبن بەرامبەر ئەم توانین و زانیاری یە کەمەی کە ئادەمی رێی پیٚ بردووە و دەست کەوتی بووە. بێگومان هەرکەس ژیری لەکار نەکەوتبیٚ و کەمێك تێگەیشتوو بێت لە خوایەتی خوا سەرناکاتەوە هەرگیز لەم جۆرە شتانە، ئەزانیٚ کە بۆ خوا هیچی تیٚ ناچێت بەندەیەك لە بەندەکانی زانا بکات بە نیاز و

مەبەستی پەلەوەر و هەموو گیان لەبەرانی تر، فێری زمان و گوفت و گۆی ئەوانی بکات لەلایەنی خۆیەوە بە بێ تێکۆشان و هەوڵی ئەو بەندەیە. ئایا خوایەك کە هەموو ئەو پەلەوەر و گیان لەبەرانەی دروست کردبێ لە هیچ و گیانی کردبێ بە بەریان دا و رێنموونی کردبن بۆ هەموو پێویستی خۆیان و فێری کردبن کە نیاز و مەبەستی خۆیان راگەیەنن لە نێوان خۆیان دا، خوایەك کە ئەوانەی زانا کردبێ و فێری ئەو شتە گرنگانەی کردبن، بۆ ئەبێ سەر بکرێتەوە و سەر سوڕ بمێنێ لەوەی بەندەیەکی وەکو سولەیمان فێری زمان و گوفت و گۆی ئەوانە بکات؟!

بەهرە و موعجیزەی سولەیمان تەنها ئەوە نەبوو کە فێری زمانی ئەو گیان لەبەرانە کرابوو، بەڵکو بەهرەیەکی تری ئەوە بوو کە بای بۆ ژێر بار کرابوو کە فەرمانبەر و گوێ رایەڵ بن بۆی بە وێنەی لەشکر و سەربازە ئادەمی یەکانی، ئەو تاقمە پەلەوەرەی کە ژێر بار کرابوون بۆی فام و تێگەیشتنی تایبەتی یان پێ درا بوو بەرزتر لە رادەی پەلەوەرانی تر. ئەوەش شتێکی راستە و روون ئەبێتەوە لە بەسەرهات و سەرگوزەشتەی ئەو پەپوسلێمانەی کە لەم سورەتەدا دەست نیشانی بۆ ئەکات، کە ئەوەی ئەو پەلەوەرە کردی مەگەر ژیر تر و زیرەك ترین ئادەمی بیکات، بێگومان ئەوەش موعجیزەیەك بوو جیاواز لەباوی گیان لەبەران و پەلەوەری تر. بەڵێ شتێکی راستە کە پەلەوەر خوا هەست و تێگەیشتنێکی تایبەتی پێداوە، بەلأمناگاتە رادەی زانین و تێگەیشتنی ئادەمی، هەروەها شتێکی راستە و هیچ گومانی تێدا نی یە کە ئەو پەپو سلێمانەی ئەمڕۆ هەیە رێك و پێك لە جۆری ئەوەیە کە لەمەوپێش بووە لە چەرخی سولەیمان و پێش تر، ئەوەتا خوا ئەو جۆرەی دروست کردووە، لەهەر جۆرێك دا خوا شتێکی فەراهەم هێناوە هۆی پاراستنی ئەو جۆرەیە و نەگۆڕانی بە شێوە و جۆرێکی تر، هەرگیز لەو نەوع و جۆری تایبەتی خۆیە ناگۆڕێت بە جۆر و نەوعێکی تر، ئەوە بەشێکە لە باو و رەوشتی خوا لە دروست کراوەکانی دا و بەشێکە لە یاسا و رژێمی گشتی ئەم بوونەوەرە، بەلأم بوونی ئەم رەوشتە راستە دامەزراوە بەرگری گۆڕانی ئەو باو و رەوشتە ناکات کاتێ مەیل و خواهیشی خوای لەسەر بێت. ئەو خوایەی کە ئەم هەموو باو و رەوشتەی داهێناوە لە یەکەم جارەوە.

وَحُشِرَ لِسُلَيْمَٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْا۟ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ قَالَتْ
نَمْلَةٌ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٨﴾ فَتَبَسَّمَ
ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ

---

ئینجا با بگەڕێینەوە بۆ ئەم سەرگوزەشتەیە و بەسەرهاتی سولەیمان(علیه السلام) کە ئەفەرموێ: ﴿وَحُشِرَ لِسُلَيْمَٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ﴾ کۆکرایەوە بۆ سولەیمان سەرباز و لەشکرەکانی لە جنۆکە و ئادەمی و پەلەوەر لە ناوچە و وڵاتەکانەوە. ئەم کۆمەڵە گەورەیە سوپا و لەشکرەکەی سولەیمان بوو کە پێك هاتبوو لەو سێ جۆرە. ئادەمی جۆرێکی ناسراو و زانراوە و پێویست نی یە لە بارەیەوە هیچ بڵێین، بەڵام پێویستە لەبارەی جنۆکەوە ئەندازەیەك بدوێین، چونکە لەبارەی ئەمانەوە ئێمە هیچ نازانین جگە لەوەی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) بۆی باس کردووین، ئەوەش ئەمەیە:

١- ئەوانە دروست کراون لە گڕو بڵێسەیە لە ئاگر.

٢- ئەوان ئادەمی ئەبینن و ئادەمی ئەوان نابینن، مەگەر خۆیان ببەنە شێوەیەکی ترەوە جگە لەو بارەی کە لەسەری دروست کراون.

٣- ئەمانە دوو تاقمن: کافرو موسڵمان. کافرەکانیان کە پێ یان ئەوترێ شەیاتین دەسەڵاتیان هەیە بەسەر ئەوەدا نیاز و خەتەرەی خراپ بخەنە دڵی خەڵکی یەوە، بەڵام نازانین چۆن ئەیخەن و چۆن ئەکەن؟

٤- ئەزانین کە کۆمەڵ و تاقمێ لەمانە خوا ژێر بار و ژێر دەستی کردن بۆ سولەیمان کە ئیش و کاری گرنگی بۆ بکەن، وەکو لە سورەتی(سبأ) دا بە درێژیی باسی ئەفەرموێ، ئەمانەی کە لەم سوپا و لەشکرەدا بوون کە لێرەدا باسیان ئەفەرموێ لەو تاقم و کۆمەڵە ژێر بار کراوەن.

ئینجا ئەڵێن ئەوەی کە خوا ژێر دەست و ژێر باری کرد بۆ سولەیمان کۆمەڵ و تاقمێ بوون لە جنۆکە و کۆمەڵ و تاقمێ بوون لە پەلەوەر، نەك هەموو جنۆکە و پەلەوەر. هەرچۆنێ لەشکر و سەربازەکانی لە ئادەمی کۆمەڵ و تاقمێ بوون نەك هەموو ئادەمی لەسەر زەوی دا، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەمەیە کە پادشایەتی سولەیمان لە فەلەستین و لوبنان و سوریە و عێراق و دەوروبەریان تێنەپەڕی. هەروەها بەڵگە لەسەر ئەوە کە هەموو جنۆکە ژێر بار نەبوو، ئەمەیە کە شەیتان و رۆڵە و نەوەکانی کە لە تیرەی جنۆکەن کارو پیشەیان لە چەرخی سولەیمان دا بەهێز کردنی کوفر و بێ بڕوایی بوو، نیاز و خەتەرەی خراپیان دەخستە دەروونی خەڵکی، دەی ئەگەر ژێر بارو گوێ رایەڵی سولەیمان بوونایە شتی وایان نەئەکرد، چونکە سولەیمان یەکێ بوو لە پێغەمبەران و بانگی خەڵکی بۆ رێگای خوا ئەکرد و لەشکر و سوپای کۆ ئەکردەوە بۆ جەنگ و کوشتاری دوژمنانی خوا. هەروەها لەبارەی پەلەوەریشەوە ئەگەر هەموو پەلەوەر بە هەموو جۆرەکانی یەوە مل کەچ و ژێر بار بوونایە بە ئاسانی نەئەگونجا بۆ سولەیمان ئاگادار بوونی بە ئامادە نەبوونی تەنها پەپو سلێمانەیەك و نەی ئەفەرموو: ئەوە چی یە پەپووەکە نابینم؟! کەواتە ئەوەی دیار نەبوو پەپوویەکی تایبەتی بوو، ئەگونجێ لەناو هەموو پەپوودا تەنها ئەو پەپووە ژێر باری بووبێ، یان ئەو جارە نۆبەی ئامادە بوونی ئەو بووبێ بۆ ئەو لەشکر و کۆمەڵە گەورەیە، بەڕاستی بەڵگە و نیشانە هەیە بۆ ئەمە کە مەبەست پەپوویەکی تایبەتی یە، ئەوەتا ئەو پەپووە کە سولەیمان هەواڵی پرسی بە دوای دا گەڕا پەپوویەك بوو جیاواز لە هەموو پەپویەکی تر، بەڵکو لە هەموو پەلەوەرێ تر بە شێوەی گشتی لە ژیریی و هەست و لێزانینی دا تا رادەیەك ئەو کردەوانەی ئەو پێی هەڵسا و بەجێی هێنان مەگەر بە پیاوی زۆر وریا و زیرەك بەجێ بهاتایە، وەکو بۆمان دەرئەکەوێ لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی دا.

ئەو سوپا و لەشکرە گەورەیە کۆ کرایەوە بە جۆرێ هەمووی یەکی گرت وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَهُمْ يُوزَعُونَ﴾ ئینجا راگیر کران هەتا دوا و بەریان یەکی گرت بۆ ئەمەی پرژ و بڵاو نەبنەوە و بە ریز و بە رێکی و بە رژێم بڕۆن، ئینجا بەو جۆرە بە رێ خران و رۆیشتن ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوۡا۟ عَلَىٰ وَادِ

﴿النَّمۡلِ﴾[1] هەتا کاتیٚ هاتن بەسەر شوێنێك دا ئەوەندە مێروولەی زۆر بوو پیٚی ئەوترا دۆڵ و شیوی مێروولە ﴿قَالَتۡ نَمۡلَةٞ﴾ لەوێدا مێروولەیەك کە چاودێر و فەرماندەر بوو بەسەر ئەو مێروولانەی کە پرژو بڵاو بووبوونەوە بۆ لەوەڕ و خۆراك پەیدا کردن، ئەو مێروولەیە بە زمانی خۆیان و بەو جۆرەی کە لە نێوان خۆیان دا یەکتری تیٚ ئەگەیەنن وتی بە مێروولەکانی تر ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمۡلُ ٱدۡخُلُواْ مَسَٰكِنَكُمۡ﴾ ئەی ئەو مێرولانەی وان بە دەرەوە بچنەوە ناو جێگا و شوێنەکانی خۆتان کە ئارامی تێدا ئەگرن، بەدەرەوە مەمێنن ﴿لَا يَحۡطِمَنَّكُمۡ سُلَيۡمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ با سولەیمان و لەشکرەکەی ژێر پیٚ و پێشێلتان نەکەن لە کاتێك دا هەست ناکەن پێتان ﴿فَتَبَسَّمَ ضَاحِكٗا مِّن قَوۡلِهَا﴾ واتە سولەیمان تێگەیشت لەو مێروولەیە و بەهۆی ئەوەوە زەردەخەنەی کرد بە پێکەنینەوە لە قسەکەی و وتەکەی، چونکە سەری سوڕما لە تێگەیشتن و ژیری و وریایی یەکەی و ریٚ بردنی بە بەرژەوەندی خۆیان، بەڕاستی شتێکی زۆر سەیرە کە مێروولە بەو جۆرە لێزان و ئاگادار و وریا بێت و هەروەها کەیف خۆش و دڵخۆش بوو بەو بەهرە گەورەی خوا پیٚی داوە، ئەوەتا تیٚ ئەگات لە چپە و قسە و باس و مەبەستی ئەو گیان لەبەرە بچکۆلەیە، لەبەر ئەوە دڵی کەوتە سۆز و پەرۆش بەرامبەر ئەو چاکە و بەهرە تایبەتی یە و نزا و لاڵەی کردە خوای خۆی کە یارمەتی دەر و قۆڵ گیری بێت لە هەڵسانی بە سوپاسی ئەو بەهرەیە و بەجیٚ هێنانی کردەوەیەك کە هۆی رەزامەندی خوایە، رووی کردە خوای خۆی و ﴿وَقَالَ رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ﴾ وتی: پەروەردگارم کۆم کەرەوە بە هەموو شتێکمەوە و ئەندامەکانم و هەست و زمان و دڵ و دەروون و نیاز و خەتەرە و هێز و وزە و کردار و وتارم... ئەمانەم هەموو کۆکەرەوە لەمەدا کە بەمانە هەموو سوپاسی چاکە و بەهرەیەکت بکەم کە رشتووتە بەسەر خۆم و بەسەر دایك و باوکم دا. لەم وشەیەوە وەرئەگیریٚ کە تا چ رادەیەك هەستی سولەیمان بەهێز بووە بە چاکە و بەهرەی خوا؟ تا چ رادەیەك دەروون و ویژدانی کەوتووەتە سۆز و پەرۆش و لەرزە لە ئاستی چاکەی خوا؟

---

[1] ناوی شوێنێکە لە ولاٚتی شام یان لە تائیف یان لەوپەڕی یەمەن بەناوبانگە لەناو عەرەب دا و باس کراوە لە وتار و شیعریان دا و لەبەر مێروولە ئەو ناوەی لیٚ نراوە.

﴿وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ﴾ واته کۆم کەرەوە لەمەدا کە کارو کردەوەیەکی چاك بکەم کە تۆ پێی رازی بیت، سولەیمان کە ویستی بەو جۆرە سوپاسی خوای خۆی بکات کۆمەکی داوا کرد کە بەو جۆرە هەڵسێ بە کردەوەی چاك، چونکە ئەیزانی کە کردەوەی چاك لوتف و فەزڵێکە لەلایەن خواوە رێك ئەخرێ بۆ بەندە ﴿وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ بە بەزەیی خۆت بم خەرە ناو بەندە چاکەکانت و بمخەرە ریزی ئەوانەوە، ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) ئەیزانی کە چوونە ریزی بەندە ساڵحەکان رەحمەت و بەزەیی یەکە لەلایەن خواوە فریای بەندە ئەکەوێ، لەبەر ئەوە نزاو لاڵەی کرد لەخوا تا ئەو لوتفەی لەگەڵ بکات، ئەو پاڕە و لاڵەی کرد لە کاتێك دا کە پێغەمبەرێك بوو خوا ئەو هەموو شتە تایبەتی یانەی پێ دابوو، هیچ بێ و بێ باك نەبوو لە بێ باکی خواو دەسەلآت و توانای بێ بڕانەوە و بێ سنووری، ئینجا ئێمە پێویستە لەم باس و بەسەرهاتەدا بیر بکەینەوە و بوەستین لە بەردەم دوو شتی سەر سوڕهێنەر و دوو موعجیزەی گەورە کە قورئان ئەیخاتە بەرچاو نەك تەنیا موعجیزەیەك:

١- تێگەیشتنی سولەیمان و ئاگادار بوونی بە قسە و مەبەستی ئەو مێروولەیە کە گەلەکەی خۆی بەو جۆرە ترساند و وریای کردنەوە بۆ ئەمەی دووچاری بەسەرهاتی خراپ نەبن لەلایەن سولەیمان و سوپاکەیەوە.

٢- زانین و ناسینی ئەو مێروولەیە کە ئەمە سولەیمان و سوپاکەیەتی.

ئینجا یەکەم هەرچەند شتێکی زۆر گەورە و گرنگە، بەلآم زۆر جێگای سەر سوڕمان نی یە، چونکە سولەیمان(علیە السلام) یەکێکە لە پێغەمبەران و باوی خوایش وایە کە لەسەر دەستی پێغەمبەران دا ئەو جۆرە شتانە دەرئەخات کە پێ یان ئەوترێ: موعجیزە، پێغەمبەرێتی بە بێ ئەو جۆرە شتانە نەبووە و ناگونجێت، کەواتە کاری ئەو ئاسانە و نزیکە لە دەروونی خەڵك دا، بەلآم دووەم ئێجگار هۆی سەرسوڕمانە. بەڵێ ئەگونجێ کە مێروولە و هەر گیان لەبەرێکی تر هەست بکات کە ئەوە کۆمەڵ و خەڵکێکی زۆرن، ئەگەر خۆیانی لێ لا

نەدەن پێشێل ئەبن و بەهۆی ئەو هەستەوە با راکەن و خۆیان قوتار بکەن، شتی وا ئەگونجێ و جێگای سەر لێ کردنەوە نی یە، چونکە خوا هەموو گیان لەبەرێکی رێنموونی کردووە بۆ هۆی ژیان و بەرژەوەندی خۆی، بەلاّم مێروولەیەك بزانێ کە ئەو کۆمەڵە سولەیمان و سوپاکەیەتی، بەڕاستی ئەوە شتێکی کەس نەدیووە و زۆر هۆی سەرسوڕمانە و ئەبێ مەردوم تەمێ و عیبرەتی لێ وەرگرێ و باوەڕی بەهێز ببێ بە دەسەلاّت و لێزانی و کاردروستی خوای پەروەردگار، هەرکەس ژیریی ناتەواوە و بەهۆی ئەوەوە خوا نەخواستە باوەڕی نی یە یان باوەڕی بێ هێز و لاوازە بەم هەواڵ و بەسەرهاتە، ئەو کەسە ئەگەر بیرێ بکاتەوە لە شێوەی گوزەرانی مێروولە و هەڵسانی بە هەندێ کردەوەی ئاشکرای سەر سوڕهێنەر و بەڕێوەبردنی کاروباری بە ئەوپەڕی وردی و رژێمی تێرو تەواوە، هەرکەس بەچاوی ژیریی سەرنجێکی ئەو شتە ئاشکرایانەی بدا بێگومان باوەڕی بەهێز ئەبێ و هیچ گومان و دوو دڵی نامێنێ، بۆ وێنە: بە رژێم و یاسایەکی رێك و پێك ئەگەڕێ و هات و چۆ ئەکات بۆ پێك هێنانی خۆراك و هۆی ژیانی، ئەو خۆراکەی کە پەیدای ئەکەن کۆی ئەکەنەوە و خەرمانی ئەکەن لە خانوو و جێ و شوێنی تایبەتی دیاریی کراوی خۆیان لە پاش وشك کردنەوەی، ئەگەر تەڕی و بارانی لێ بکەوێ بە جارێ بە کۆمەڵ ئەکەونە هات و چۆ لەو شوێنەدا ئەیگوێزنەوە بۆ دەرەوە و ئەیخەنە بەر خۆرەتاو تا بەجوانی وشك ئەبێتەوە و ئینجا ئەیبەنەوە بۆ جێگای تایبەتی خۆی، ئینجا لەپاش وشك کردنەوەی ئەیکەن بە بڕوێش و عەماری ئەکەن، چونکە بە ساغی کرم و سوس تێ ی ئەدات، بەلاّم بە بڕوێشی باشتر ئەمێنێتەوە و ئامادە تریشە بۆ خواردنی خۆیان، ئەو خانوو و شارانەی کە دروستی ئەکەن زۆر بە جۆرێکی لێزانی و ژیرانەن، بەم رەنگە کون ئەکاتە زەوی و قوڵ بۆی دائەچێ و ئەچێتە خوارەوەو ئینجا لەناو سکی زەوی دا چەپەك لێ ئەدات بەم لاو ئەو لادا و ئینجا بەرز ئەبێتەوە و لە بەرزەوە خانوو دروست ئەکات، خان لەسەر خان و پڕیان ئەکات لە خۆراك بۆ ماوەی زستان و ئەو کاتانەی کە رێگای دەر و دەشتیان نی یە، بەو جۆرە عەمار و خانووەکانیشیان ئەپارێزن لەوەی ئاو و تەڕیی کار بکاتە سەر خۆیان و خۆراکەکەیان.

وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَالِيَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَاْذْبَحَنَّهُۥٓ أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢١﴾ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإِۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾ إِنِّي وَجَدتُّ ٱمْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٢٤﴾

---

ئینجا دێته سەر باسی بەسەرهاتی سولەیمان لەگەڵ پەپووەکەی و پادشای شاری(سبأ) دا، ئەفەرموێ: ﴿وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ﴾ سولەیمان کۆمەڵی پەلەوەری پشکنی و بەچاوی کردن تا بزانێ کام ئامادە و دیارە و کام دیار نی یە؟ ئیتر ئەو پشکنین و بەرچاو کردنە تەنیا لەبەر پەپوو بووبێ و بەدوای ئەودا گەڕا بێت لەبەر ئەوە ئیشێکی تایبەتی بوو پێ ی وەکو هەندێ ئەڵێن، یان هەر بە پێ ی باوی پادشا و کاربەدەستانە کە ئەبێ بپرسنەوە لە سەرباز و ژێر دەستەیان، لەبەر هەر مەبەستێ بووبێ سەرنجی داو پەپووی نەبینی و ﴿فَقَالَ﴾ بەهۆی ئەوەوە فەرموی: ﴿مَالِيَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ﴾ ئایا ئەوە چی یە بۆ من پەپوو نابینم؟! وا دەرئەکەوێ لە یەکەم جارەوە لای وابوو کە لەوێ یە و شتێ هەیە بەرگری ئەکات لە بینینی، لەبەر ئەوە پرسیاری پێشوو و ئەم پرسیارەی کرد کە ئایا راستە لەوێ نی یە، فەرموی: ﴿أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ﴾[1] نەخێر، ئایا یەکێ بووە لەوانە کە ئامادە نەبوون و لێرە نین؟ روون بووەوە کە ئامادە نی یە و لەوێ نی یە، لە پرسیارەکەوە دەرکەوت بۆ هەموان کە بە بێ

---

[1] بە پێ ی تەفسیرەکە وشەی(أ م) منقطعهیة، کەواتە ئەمەش پرسیارێکی تری سەربەخۆیە و زۆربە لەسەر ئەم رایە یە، دروستە متصلەش بێت، ئەو کاتە هاوتایە بۆ رستەی پێشوو، بە هەردووکیانەوە یە ك پرسیارن.

پرس و ئیزنیش ڕۆیشتووە، کەواتە پێویستە سەر نەنرێتەوە لەم کردەوە ناڕەوایە و بەسەری دا تێپەڕ نەکرێ، ئەگینا بێ سەر و پێ یی روو ئەدات و شیرازە ئەپچڕێ و فەوزا روو ئەدات لەناو سوپاکەدا، لەبەر ئەوە سولەیمان(علیه السلام) ئەبێ بپرسێتەوە لەو کارە ناڕەوایە و هەڕەشە بکات لەو سەربازەی کە بە پێچەوانەی جووڵاوەتەوە، کەواتە ماف خۆی بوو کە فەرموی: ﴿لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَاْذْبَحَنَّهُۥٓ﴾ سوێند بەخوا سزایەکی بەتینی ئەدەم یان سەری ئەبڕم، بەڵام سولەیمان پادشایەکی ستەمکار نی یە، بەڵکو پێغەمبەرە و هێشتا عوزرو بیانووی پەپووی نەبیستووە، کەواتە رەوا نی یە دواترین بڕیار لەسەر سزا و تۆڵەی بدا پێش پرسیار و گوێ گرتن لە بیانووی، لەبەر ئەوە ئەمەیشی فەرموو: ﴿أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ﴾ یان بەڕاستی رابەر و نیشانەیەکی روونم بۆ ئەهێنێ کە حازر نەبوونەکەی پەڕۆ بکات و ببێتە هۆی رزگار بوونی لە سزاو تۆڵەکەی، واتە ئەگەر ئەم باری سێ یەمە نەبوو ئەو کاتە یەکێ لە دووبارە پێشووەکەی دەربارە ئەکرێ. ﴿فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ﴾ ئینجا ماوەیەکی دووری پێ نەچوو پەپوو هاتەوە و هەواڵ و دەنگ و باسێکی زۆر گرنگی پێ بوو، بە شێوەیەك قسە و باسەکەی دەست پێ کرد باسی دیار نەبوون و حازر نەبوونی لە ئارادا نەمێشت وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ﴾ ئینجا هاتەوە وتی بە سولەیمان(علیه السلام) زۆر بەچاکی ئاگاداربووم بە شتێ کە تۆ لەمەوبەر نەتزانی بوو و ئاگادار نەبووی پێ ی ﴿وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ﴾ [1] لە وڵاتی(سبأ) وە هەواڵێکی راستی بێگومانم بۆ هێناوی، ئینجا پاش ئەوە

---

[1] (سبأ) لە بنەڕەت دا ناوی پیاوێکە کوڕی یشجب ی کوڕی یعرب ی کوڕی قحطان. لەپاشان کرا بە ناو بۆ وڵاتێك لەلای خوارووی رۆژئاوای نیوە دورگە، لە یەمەن و هەرچۆنێ ناوە بۆ ئەوە و تائیفەیەك لەنەوەی ئەو(سبأ) ناوەن.

که بۆی روون بووەوە بە باشی گوێی بۆ ئەگرێ، دەستی کرد بە گێڕانەوەی هەواڵەکە بە درێژیی...

هەواڵی ئەو وڵاتەی پێ گەیاند لەبارەی دنیا و بیر و باوەڕیانەوە، لەبارەی دنیاوە وتی:

١- ﴿إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ تَمۡلِكُهُمۡ﴾ بەڕاستی بۆم دەرکەوت کە ئافرەتێك پادشایی و حوکمڕانی دانیشتوانی ئەو وڵاتەیە، واتە بەڵقیس کە کچی پادشا بوو لە پێش خۆیەوە.

٢- ﴿وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَيۡءٖ﴾ لە هەموو شتێ پێی درابوو، لە دارایی و سامان و دەسەڵات و سوپا و چەك و هەرشتێ تر کە پادشایان پێویستیان پێی هەبو لەو چەرخ و سەردەمەدا.

٣- ﴿وَلَهَا عَرۡشٌ عَظِيمٞ﴾ بۆ ئەو ئافرەتە هەیە تەختێکی گەورە کە لەسەری دانیشێ، واتە تەختی پادشایان کە ئەڕازێنەوە بە ئاڵتوون و زیوو و گەوهەر و ئەو هەموو شتە بەنرخانە، کە ئەوەیش نیشانەیە لەسەر بەرزی ئەو پادشایە و فراوانی هێز و دەسەڵاتی، لەبارەی دنیاوە پادشایەکی ئاوایان بووە.

لەبارەی بیرو باوەڕەوە بەم جۆرە بوون کە وتی: ﴿وَجَدتُّهَا وَقَوۡمَهَا يَسۡجُدُونَ لِلشَّمۡسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بۆم دەرکەوت و زانیم کە ئەو ئافرەتە و گەلەکەی سوجدە ئەبەن بۆ خۆر و لە پەرستنی خوا تێپەڕ ئەکەن بۆ پەرستنی خۆر، ﴿وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ واتە هۆی ئەو پەرستنە نارەوایەش ئەوەیە کە شەیتان کردەوە خراپەکانی ئەوانەی جوان و شیرین کردووە بۆیان و رازاندوویەتی یەوە لە پێش چاویان ﴿فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ بەهۆی ئەوەوە بەرگری کردوون لە رێگای راست، کە رێگای خواپەرستی یە بە تاك و تەنیا ﴿فَهُمۡ لَا يَهۡتَدُونَ﴾ کەواتە ئەوانە رێگایان ناکەوێ لەو رێگا راستە و نایدەنە بەر،

أَلَّا يَسْجُدُواْ لِلَّهِ ٱلَّذِي يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿٢٥﴾
ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ۩ ﴿٢٦﴾ ۞ قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ
﴿٢٧﴾ ٱذْهَب بِّكِتَٰبِي هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَٱنظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُاْ
إِنِّيٓ أُلْقِيَ إِلَيَّ كِتَٰبٌ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾

---

**﴿ أَلَّا يَسْجُدُواْ لِلَّهِ ٱلَّذِي يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾[1] واته بەرگری کردن لە ڕێگای ڕاست بۆ ئەمەی سوجدە نەبەن بۆ خوایەك کە شتی پۆشیوە و شاراوە لە ئاسمانەکان و زەوی دادەرئەخات و ئاشکرای ئەکات، ئیتر ئەو شاراوە باران بێت لەئاسمانەوە و هەر شتێ کە لە زەوی ئەڕوێت یان هەر نهێنی و شتێکی غەیبی تر، ﴿ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴾ ئەزانێ و ئاگادارە بە هەر شتێ و هەر نیاز و کردەوەیەك کە ئێوە ئەیشارنەوە، هەر شتێ کە دەری ئەبڕن و ئاشکرای ئەکەن، ئەو پەپووە تا ئەم کاتەش لە دیمەنو شێوەی تاوانباردایە کە هێشتا پادشا بڕیاری تەواوی نەداوە لەبارەیەوە، جا لەبەر ئەوە دوایی هەواڵەکە ئەمێنێ بە دەست نیشان کردنی بۆ ئەو خوایە کە پەروەردگاری هەمووانە و خاوەنی تەخت و سەڵتەنەتی هەر بەرز و هەرە گەورەیە، کە هیچ تەخت و بەختێکی تر بەراورد ناکرێ لەگەڵی دا و چاونادات لە ئاستی، ئەو دەست نیشان کردنەشی کرد تا پادشا زیاتر و باشتر سەر شۆڕ بکات لەبەردەم گەورەیی خوادا وتی: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴾[2] خوایەك کە ناوی(الله) یە هیچ خوایەکی تر نی یە جگە لە ئەو خوایە، خاوەن و پەروەردگاری عەرشی گەورەیە. ئینجا با هەندێ بیر بکەینەوە لەو پەپووە زیرەکە تێگەیشتووە ئیماندارە، کە چەندە بە لێزانی یەوە ئەو هەواڵەی گەیاند، چەندە وریا و شارەزا بوو، ئەوەتا زانی کە ئەو ئافرەتە**

---

[1] بە پێی تەفسیرەکە ﴿ ألا يسجدوا ﴾(مفعول لە) ە،(ان) ناسیبەیە(لا) زیاد نی یە، بە چەند جۆرێکی تریش إعارب کراوە کە مەبەست لە هەموو هەریەکە، بەڵام جۆری تەفسیرەکەم بەلاوە بەهێزە.

[2] وشەی(عرش) لە زمانی عەرەب دا بریتی یە لە تەختێ کە ڕازاوەتەوە بۆ پادشا لەسەری دانیشێ، لە زمانی شەرع دا بریتی یە لە دروست کراوێکی خوا لە ژووری هەموو ئاسمانەکانەوە، بڕیاری هەموو شتێ لەوێ دەرئەچێ.

پادشایە، ئەو گەلە ژێر دەست و رایەتن بۆی، ئەوانە رۆژ پەرستن، ئەیزانی کە سوجدە ئەبێ تەنیا بۆ خوا ببرێ، ئەو خوایەی کە ئەو چەند سیفەت و نیشانە گرنگەی بۆ باس کرد، کە مەگەر پیاوی زۆر ژیری خواناس بەباشی ئەوە بزانێ! بەڕاستی گومان وایە کە هیچ پەپوویەکی تر لەو پلە و رادەدا نی یە. بەڵکو ئەوە پەپوویەکی تایبەتی بووبێ کە خوای گەورە فەراهەمی هێنابێ بۆ سولەیمان پێغەمبەر(ﷺ) بە جۆرێکی کەس نەدیوو پێچەوانەی باو. ئەو بەو جۆرە هەو هەواڵە گرنگەی دا، بەڵام سولەیمان پێغەمبەری پادشا(علیه السلام) بەوە هیچ باری نەگۆڕا و پەلەی نەکرد لەباوەڕ پێ کردن و نە لە بە درۆ خستنەوەدا،بەڵکو ﴿قَالَ﴾ فەرمووی بە پەپووەکە: ﴿سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ بێگومان بیر ئەکەینەوە و بەراوردێ ئەکەین تا بزانین ئایا راستت کردووە لەو هەواڵەدا یان درۆت کردووە و لە کۆمەڵی درۆزنانی؟! بیر کردنەوەش بەمە بوو کە نووسراوێکی نووسی بۆیان و فەرموی بە پەپووەکە: ﴿ٱذْهَب بِّكِتَٰبِى هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ﴾ ئەم نامە و نووسراوی منە بەرە بۆیان و ئینجا فڕێی دە لایان و ﴿إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ﴾ لەپاشان خۆت کە ناردە لێ یان و خۆت داشارە لە نزیکیانەوە و ﴿فَٱنظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ﴾ ئینجا تێفکرە بزانە لەناو یەك دا چی دەڵێن و وت و ویژ و وەڵامیان چۆنە و کامەیە؟ پەپوو هەڵسا بەو فەرمانەی پێی سپێررا بوو، نامە و نووسراوەکەی گەیاندە شوێنی خۆی، ئینجا پادشا کاتێ نامەکەی بینی سەری سوڕما و ویستی لەوبارەیەوە راوێژ بکات لەگەڵ پیاو ماقوڵانی گەلەکەی دا بەم جۆرەی کە ئەفەرموێ: ﴿قَالَتْ﴾ پادشا بەلقیس وتی پێ یان ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟﴾ ئەی کۆمەڵی تایبەتی و پیاو ماقوڵان ﴿إِنِّىٓ أُلْقِىَ إِلَىَّ كِتَٰبٌ كَرِيمٌ﴾ بەڕاستی من نامە و نووسراوێکی بەرێزم بۆ خراوە و پێم گەیەندراوە!! دیمەن و رواڵەتی وتە و رستەکەی وا پیشان ئەدات کە نەیزانیوە کێ ئەو نامە و نووسراوەی بۆ خستووە و چۆن پێی گەیەندراوە؟ ئەگەر بیزانیایە پەپوو بۆی بردووە وەکو هەندێ لە تەفسیرەکان ئەڵێن ئەو کاتە ئەوەیشی باس ئەکرد و ئەو هەواڵەیشی پێ ئەدان، چونکە ئەوە شتێکی نایابی کەس نەدیوو و جێگای سەرسوڕمانە. نامەکەی بە رێزدار ناوبرد لەبەر ئەوە مۆر کرابوو، یان بەهۆی ئەوەی لەلایەن پادشایەکی گەورە هاتبوو، یان لەبەر ئەوە مەبەست و ناوەڕۆکەکەی گرنگ بوو، شێوەی نوسراوە کە هێز و بەرزی و بڵندی ئەگەیاند. ئەو هەواڵەی پێدان و ئینجا رایگەیاند کە لە کێوە بۆی هاتووە؟

إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلۡمَلَؤُاْ أَفۡتُونِي فِيٓ أَمۡرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمۡرًا حَتَّىٰ تَشۡهَدُونِ ﴿٣٢﴾

**وتی: ﴿إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ﴾ بەڕاستی نامەکە لە سولەیمانەوە هاتووە و ﴿وَإِنَّهُۥ﴾ بەڕاستی مەبەست و ناوەڕۆکی ئەو نامەیەش ئەمەیە: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ﴾ بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان، سەرکێشی مەکەن و یاخی مەبن لێم و وەرن بۆلام بە موسڵمانی و مل کەچی بۆ خوا. بەڕاستی نووسراوەکە ئێجگار نایابە، روون و رەوان و کورت و سووك و ئاسان، بێ پێچ و پەناو ئەوپەڕی هێزو بڵندیش ئەنوێنێ، دەست پێ ئەکات بەناوی خوا و لەپاشان تەنها مەبەستێ داوا ئەکات: یاخی مەبن لە نێرەری ئەم نامەیە و بێن بۆلای بە مل کەچی و گوێ رایەڵی بۆ خوایە کە بەناوی ئەوەوە بانگیان ئەکات و قسەیان لەگەڵ ئەکات، لە شوێن کەوتنی هەواو و ئارەزووی نەفس بەرگری یان ئەکات و پێویستی شوێن کەوتنی حەق و راستی، کە ئەوەش کورتە و پاڵفتەی هۆی هەموو پیت و فەڕێکە لە هەردوو جیهان دا، بێجگە لەوە لە یەکەم جارەوە خوایەتی خوا و تاك و تەنیایی و دەسەڵات و توانا و بەزەیی زۆر و فراوانی خوا نیشان ئەدات. بەو جۆرە ئەو هەواڵەی پێ گەیاندن، ئینجا داوای راوێژی لێ کردن و رایگەیاند کە هیچ بڕیارێ نادا بە بێ رەزامەندی ئەوان و بڕیاری ئەوان، ﴿قَالَتۡ﴾ وتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَفۡتُونِي فِيٓ أَمۡرِي﴾ ئەی کۆمەڵە تایبەتی یەکە دەست نیشانم بۆ بکەن و رای خۆتانم پێ بگەیەنن و بیڵێن لەم کارەدا و چی ئەڵێن لە بابەت ئەم نووسراوە؟! پرستان پێ ئەکەم و راتان لێ وەرئەگرم ﴿مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمۡرًا حَتَّىٰ تَشۡهَدُونِ﴾ چونکە من لەمەوبەر باوم وا بووە بڕیار دەر نەبووم لە خۆمەوە و هیچ کارێکم نەبڕیوەتەوە بە تەنیا، هەتا ئێوە ئامادە بوون و بە دیارەوە بوون، لەم کارەش دا بە بێ ئێوە هیچ بڕیارێ نادەم. ئاشکرایە کە هەر لە یەکەم جارەوە کاری کرد لە دەروونی پادشادا و گرتی و ئەوەی لە دڵی دا بوو گەیاندی بە کۆمەڵەکە، ئەوەبوو وتی نامە و نووسراوێکی بەڕێزم بۆ هاتووە، هەروەها ئاشکرایە کە نەیئەویست جەنگ و بەربەرەکانی بکات لەگەڵ سولەیمان دا، بەڵام بێ پێچ و پەنا شتەکەی نەئەوت و دانی پیا نەئەنا، بەڵکو بەو شێوەیە گەیاندی و خستیە راوێژ و پرس و را، ئەو کۆمەڵەش بە پێی باوی دەست و پێ یی و ئەوانەی نزیکن لە پادشا و کاربەدەستانەوە هێز و توانا و ئامادەیی خۆیانیان دەربڕی بۆ گوێ رایەڵی و بەر بەرەکانێ و جەنگ لەگەڵ هەرکەس پادشا فەرمان بدات،**

قَالُواْ نَحۡنُ أُوْلُواْ قُوَّةٖ وَأُوْلُواْ بَأۡسٖ شَدِيدٖ وَٱلۡأَمۡرُ إِلَيۡكِ فَٱنظُرِي مَاذَا تَأۡمُرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَتۡ إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ
قَرۡيَةً أَفۡسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗۚ وَكَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٤﴾ وَإِنِّي مُرۡسِلَةٌ إِلَيۡهِم بِهَدِيَّةٖ فَنَاظِرَةُۢ
بِمَ يَرۡجِعُ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا جَآءَ سُلَيۡمَٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٖ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيۡرٞ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم

---

لەبەر ئەوە وەڵامی دا ﴿قَالُواْ﴾ وتیان: ﴿نَحۡنُ أُوْلُواْ قُوَّةٖ وَأُوْلُواْ بَأۡسٖ شَدِيدٖ﴾ ئێمە خاوەنی هێزین، بە لەش و بە ژمارە و بە چەك و خاوەنی ئازایی و چالاکی یەکی بەتینین و لە جەنگ دا خۆگر و دامەزراوین. بەو جۆرە ئامادەیی خۆیانیان دەربڕی، بەڵام راو بڕیاریان دایە دەستی پادشا و وتیان: ﴿وَٱلۡأَمۡرُ إِلَيۡكِ﴾ کاروبار بە دەستی خۆتە و حەواڵە کراوە بۆلای خۆت: ﴿فَٱنظُرِي مَاذَا تَأۡمُرِينَ﴾ کەواتە سەرنج بدە و بیر بکەرەوە ئایا فەرمان بە چی ئەدەیت؟! واتە خۆت چیت بەلاوە باشە وا بکە، جەنگ ئەکەیت یان ئاشتی؟ بیکە و ئێمە گوێ رایەڵین. ئافرەتەکە بە راستی ژیر و دانا و دڵسۆز بوو بۆ وڵاتەکەی لەبەر ئەوە باری ئاشتی هەڵبژارد، چونکە بێگومان تا بگونجێ و دەست بدات ئەبێ ڕێگای ئاشتی بدرێتە بەر و ئەبێ لە پێشەوە چەکی نەرم و نیانی بەکار بهێنرێ، ئەگەر چارە نەما ئەو کاتە چەکی هێز بەکار بهێنرێ، جا لەبەر ئەوە دەست نیشانی کرد بۆیان بۆ زیان و سەرەنجامی خراپی جەنگ و کوشتار، بەم رەنگە: ﴿قَالَتۡ﴾ وتی: ﴿إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرۡيَةً أَفۡسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗ﴾ بێگومان پادشایان هەرکات بە زۆر و داگیر کردن چوونە شارێکەوە وێران و بەربادی ئەکەن و بەرزتر و دەسەڵات دارەکانی دانیشتوانی ئەگێڕن بە پەست تر و ریسوا ترینی هەمووان، واتە هەرچەند ئێوە خۆتان بە بەهێز و بە دەسەڵات دابنێن، بەڵام جەنگ و ئاژاوە بەسەرەیە و بە نۆبەیە هەرجارەی یەکێ ئەیباتەوە، دەی کەواتە ئەگەر جەنگ و کوشتارتان کرد لەوانەیە ژێر بکەون

و ئەو کاتە بە سەروماڵەوە تیا ئەچن، ئینجا دووبارەی کردەوە و دڵنیایی کرد لەسەر ئەوە کە کارو پیشەی زۆرداران ئەوەیە کە باس کرا، وتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ﴾ واتە پادشا و زۆرداران کاتێ سەرکەوتن و زاڵ بوون بەو جۆرە ئەکەن کە وتمان، خۆی کە پادشا بوو شارەزای سروشت و رەوشتی پادشایان بوو، شتەکەش هەروا بینراوە، کەواتە با رێگای دوژمنایەتی نەداتە بەر و توند و تیژیی بەکار نەهێنێ، بەڵکو لە رێگای ئاشتی و دۆستایەتی یەوە هەوڵ بدات، بێگومان دیارە دیاریی دڵ نەرم ئەکات و دۆستی و خۆشەویستی نیشان ئەدات لەوانەیە ببێتە هۆی بەرگری کوشتارو دوژمنایەتی، لەبەر ئەوە وتی: ﴿وَإِنِّي مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ﴾ من بەراستی فروستادە ئەنێرم بۆلایان بە دیاریی یەکی گرنگەوە ﴿فَنَاظِرَةٌ بِمَ يَرْجِعُ الْمُرْسَلُونَ﴾ ئینجا چاوەڕوانی ئەکەم نێرراوەکان بەچی یەوە ئەگەڕێنەوە؟ واتە دە با بزانین دیاریی یەکە وەرئەگرێت یان نە؟ مەبەستی ئەوەبوو – وەکو ئەیشگێڕنەوە لێ یەوە – ئەگەر پادشایەکی دنیایی بێت ئەوا وەری ئەگرێ و رازی ئەبێت پێی ئەو کاتە بەو جۆرە ئەجوڵێتەوە لەگەڵی، ئەگەر پێغەمبەریش بێت ئەوا گوێی لە سامان و ماڵ نی یە و وەری ناگرێ و رازی نابێ بە باوەڕهێنان و شوێن کەوتنی ئایینەکەی نەبێت. فروستادەی نارد بە دیاریی گەورە و گرنگی خۆیەوە ﴿فَلَمَّا جَاءَ سُلَيْمَانَ﴾ ئینجا کاتێ چوو بۆلای سولەیمان ﴿قَالَ﴾ سولەیمان وتی: ﴿أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ﴾ ئایا ئێوە چاکە و پیاوەتیم لەگەڵ ئەکەن و یارمەتیم ئەدەن بە دارایی و سامان؟! واتە بێزارم لە کردەوەکەتان ئەئەبوو شتی واتان بکردایە و من ئەوە وەرناگرم و پێویستیم پێی نی یە ﴿فَمَا آتَانِيَ اللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّا آتَاكُم﴾ چونکە ئەوەی خوا پێی داوم چاکترە لەوەی داویەتی بە ئێوە، کەواتە من بەو دیاریی ئێوە کەیف خۆش و شادمان نابم،

﴿بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ﴾ بەڵكو ئێوە كەیف خۆش و شادمان ئەبن بە دیاریی یەكەتان، بەڵێ، ماف خۆی بوو بەو جۆرەی فەرموو، چونكە:

١- مەسەلە ماڵ و شت و مەكی بێ نرخی ئەم جیهانە نەبوو، بەڵكو مەسەلەی ئایین و باوەڕ بوو كە هیچ شتێ تر هاوتای ناكات و ناگۆڕێتەوە بە هیچ شتێكی تر.

٢- ئەوەی خوا پێی دابوو بریتی بوو لە پێغەمبەرێتی و زانین، كە دارایی و سامان بە هیچ ڕەنگ چاونادات لە ئاستی.

٣- ئەو جنۆكە و شەیاتین و باو پەلەوەری بۆ ژێر بار كرابوو، كەواتە ئەو دیاریی ئەوانە هەرچەند گەورە و گرنگ بووبێ چ نرخێكی هەیە بۆ ئەو پێغەمبەرە پادشا(علیە السلام)؟! لەبەر ئەوە دیاریی یەكەی وەرنەگرت.

ئینجا پاش دەربڕینی بێزاری و تەشەر لێ یان ئەم هەڕەشە سامناكەی ئاراستە كردن: فەرموی: ﴿ارْجِعْ إِلَيْهِمْ﴾ بگەڕێرەوە بۆلایان بە دیاریی یەكەیانەوە و چاوەڕوانی دوا ڕۆژ و چارەنووسێكی سامناك بكەن، ﴿فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخْرِجَنَّهُم مِّنْهَا أَذِلَّةً وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾ ئینجا سوێند بەخوا دێین بۆیان و ئەدەین بەسەریان دا بە لەشكر و سوپا و سەربازانێ كە بە هیچ ڕەنگ توانای ئەوەیان نی یە بە بەرگری یان و دەسەڵاتیان نی یە بەسەر بەربەرەكانی لەگەڵیان، سوێند بەخوا دەریان ئەكەین لەشارو وڵاتەكەیان بە زەلیلی و ژێر دەستی لە كاتێك دا كە ڕیسوا و بێ ئابڕوو و سەرشۆڕ و شكێنراو ئەبن. ئینجا سولەیمان(علیە السلام) لای وابوو كە ئەم وەڵامە كارەكە دوایی پێ ئەهێنێ و پادشای(سبأ) گوێ ڕایەڵ ئەبێ بۆ بانگ و بانگەوازەكەی، چونكە لە دەم و دوامانی یەوە دەركەوت كە جەنگ ناكات و ئاشتی ئەوێ بە نیشانەی ڕێز گرتنی نامەكە و ناردنی فروستادە و دیاریی، كارەكەش بەو جۆرە دەرچوو كە سولەیمان هەستی كرد، قورئان باسی ئەوە ئەكات كە نێرراوەكەی پادشا چۆن گەڕایەوە و چی یان پێ وت؟ ئەویش بڕیاری چی دا؟! بەڵام لە شێوەی گێڕانەوەی باسەكەوە وەرئەگیرێت كە دێت بۆ خزمەتی سولەیمان و سولەیمانیش ئەوە ئەزانێ و ئەیەوێ پێش ئەوە بگاتە بەرەوە تەختە گرنگە شاهی یەكەی ببینێ! و باوەڕ وایە مەبەستیشی ئەوە بووبێ كە پادشا و گەلەكەی ئەو موعجیزە گەورەیە ببینن و بەهۆی ئەوەوە باوەڕ بهێنن بەخوا و مل كەچ بن بۆ ئایینەكەی،

قَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَيُّكُمۡ يَأۡتِينِي بِعَرۡشِهَا قَبۡلَ أَن يَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ عِفۡرِيتٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ
أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَۖ وَإِنِّي عَلَيۡهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٞ ﴿٣٩﴾ قَالَ ٱلَّذِي عِندَهُۥ عِلۡمٞ مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن يَرۡتَدَّ
إِلَيۡكَ طَرۡفُكَ

**جا لەبەر ئەوە ﴿قَالَ﴾ سولەیمان فەرموی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ﴾ ئەی کۆمەڵی پیاو ماقوڵ و لەشکرە تایبەتی یەکان: ﴿أَيُّكُمۡ يَأۡتِينِي بِعَرۡشِهَا قَبۡلَ أَن يَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ﴾ کام لە ئێوە تەختەکەیم بۆ ئەهێنێ پێش ئەوەی ئەوانە بگەنە بەرەوە و بێن بۆلام بە گوێ رایەڵی و مل کەچی؟ ﴿قَالَ عِفۡرِيتٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَۖ﴾ دێوێکی ناهەموار و یەکێکی گەورەی بەهێز لە جنۆکەکان وتی: من بۆت ئەهێنم پێش ئەوەی تۆ هەڵسی لە ئەنجوومەنی دادگا و حوکمڕانیت ﴿وَإِنِّي عَلَيۡهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٞ﴾ بێگومان من توانا و بەهێزم بەسەر هێنان و هەڵگرتنی دا و ئەمینم و پارێزگاری ئەکەم و نایەڵم هیچی لێ زایە ببێ و هیچی بەسەر بێت. سولەیمان(علیه السلام) ماوەکەی بە درێژ دانا و زووتر و چەسپان تری لەوە ئەویست ﴿قَالَ ٱلَّذِي عِندَهُۥ عِلۡمٞ مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئەوەی بەشێ لە زانینی کتێبی لابوو وتی: ﴿أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن يَرۡتَدَّ إِلَيۡكَ طَرۡفُكَ﴾ من بۆت ئەهێنم پێش ئەوەی چاو بنێی بە یەك دا و چاو بنوقێنی، واتە ئەگەر چاوت کراوە بێت و بتەوێ بینوقێنی پێش ئەمەی پێڵوت بگەڕێتەوە بۆلات و بینوقێنی من بۆت ئەهێنم و ئامادەی ئەکەم!! قورئان ناوی ئەو کەسەی نەبردووە، هەروەها ئەو کتێبەش روون نی یە بۆمان چی یە، ئەوەی ئێمە وەری گرین و تێی بگەین ئەمەیە کەسێکی ئیماندار کە پەیوەندی بە خواوە هەیە لەلایەن خواوە شتێکی پێ دراوە کە هیچ شتێ بەرگری ناکات و یاخی نابێ لێ ی، یەکسانە لەبەردەمی دا شتی دوور و نزیك، بوون و نەبوونی بەرگر و بەرهەڵست، ئەم ئەندازەیە ئەوپەڕی ئەوەیە کە ئێمە بتوانین بیڵێین بە بێ ترس و سەر لێ کردنەوە، و بە بێ ئەمەی بکەوینە شوێن شتی پڕو پووچ و ئەفسانە. بێگومان لە کتێبەکانی تەفسیردا لەبارەی ئەو کتێبە و ئەو کەسەوە چەند شتێك وتراوە، بەڵام هیچ کام لەوانە**

جێگای یەقین و باوەڕی راستەقینە نین، کەواتە پێویست نی یە خۆمانی پێوە خەریك بکەین، ئەم کارە ئاسانترە لەوەی ئەوەندە قوڵ بۆی داچین، بەڕاستی جێگای سەر لێ کردنەوە نی یە کاتێ بە دوور بینی واقیع سەرنجی بدەین، چونکە چەند شتی نهێنی هەبوو لەم بوونەوەرەدا بە دڵی کەس دا گوزەری نەئەکرد و کەچی بەدی هاتن و بەچاویش بینران، چەند شتی نهێنی تریش هەیە کە ئێمە هیچی لێ نازانین و بێ ئاگاین لێ یان و چەند هێز هەیە لەم بوونەوەرەدا کە بەکارمان نەهێناون، لە دەروونی ئەم ئادەمی یەدا چەند شتی نهێنی هەیە و چەند هێز و وزەی گرنگ هەن و هێشتا رێمان پێ نەبردوون و بە پێچەوانەی باو و زانینی ئێمەن، هەرکات خوا بیەوێ رێنموونی بکات بۆ هەرکام لەوانە و لەسەر دەستی دا بەدی هێنا ئەو کاتە شتێکی کەس نەدیوو بەدی دێت و بە موعجیزە سەیر ئەکرێن و خەڵکی لە ئاستی سەرسام و سەرگەردان ئەبن، ئەو کەسەی کە خوا ئەو بەشە زانینەی پێ دابوو بەهۆی ئەو زانینە نەفسی ئامادە بوو بۆ ئەمەی رێ ببات بە هەندێ شتی نهێنی و بەشێ لە هێزی ئەم بوونەوەرە کە ئەو کارە گرنگەی پێ فەراهەم هێنا، چونکە ئەو بەشە زانینە دڵی بەستنەوە بە خواوە بە جۆرێ ئامادەی کرد بۆ وەرگرتن و بەکار هێنانی ئەو هێزو نهێنی یەی کە پێ‌ی دا.

هەندێ لە زانایانی تەفسیر ئەڵێن: ئەو کەسە سولەیمان بووە، بەڵام بەڕاستی دڵ بەم رایە ئارام نی یە، چونکە ئەگەر ئەو بوایە بە رێکی ناوی ئەبرد و نەی ئەشاردەوە، چونکە باسەکە باسی ئەوە، هەروەك بۆ شتە تایبەتی یەکانی تر ناوی برد، هەروەها بۆ ئەمیش بەڕێکی ناوی ئەبرد و هیچ هۆیەك نی یە بۆ شاردنەوەی ناوەکەی. هەندێ تر لە زانایان ئەفەرمون: ئەو کەسە ئاسەف کوڕی بەرخیا بووە کە ئامۆزای سولەیمان بووە، ئیسمی ئەعظەمی خوای ئەزانی و بەهۆی ئەوەوە ئەو کارە گرنگەی کرد، بەڵام بەڵگەو نیشانە نی یە لەسەر ئەو رایەش. بەهەر جۆر و بەهەرکەس کرا ئەو تەختە شایی یە چەندە دوور بو، وەکو ئەڵێن: ئەوپەڕی رادە بە توندی و بەهێز دامەزرا بوو لە شوێنی خۆی دا و قایم کرابوو، ئەو تەختە گەورەیە لەو ماوە زۆر کورتەدا حازر بوو و ئامادە کرا لەبەردەم سولەیمان دا،

فَلَمَّا رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّى لِيَبْلُوَنِىٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّى غَنِىٌّ كَرِيمٌ ﴿٤٠﴾

---

﴿فَلَمَّا رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّى﴾ ئینجا کاتێ سولەیمان تەختەکەی بینی بە حازر و ئامادەیی لەلای دا وتی: ئەمە لە فەزڵ و لوتفی پەروەردگارمەوەیە، ﴿لِيَبْلُوَنِىٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ﴾ بۆ ئەوەی تاقیم بکاتەوە ئایا سوپاسی ئەکەم و چاولەبەرم، بەم رەنگە تەنها لەخوایەوە بناسم و هەڵسم بە مافی ئەو چاکەیە، یان دانی پێدا نانێم و چاو لەبەر نابم و هەڵناسم بە مافی؟!

فەراهەم هاتنی ئەو کارە گەورە و زۆر گرنگە دڵ و دەروونی سولەیمانی هێنایە سۆز و پەرۆش و سەرسامی کرد، هەستی کرد کە ئەو چاکە و بەهرەیە تاقی کردنەوەیەکی زۆر گەورە و بەتینە، پێویستی هەیە بە بێداری یەك و وریایی یەکی بەهێز تا لەو تاقی کردنەوەدا دەرچێت، پێویستی هەیە بە کۆمەکی لەلایەن خواوە بۆ ئەمەی هێز و توانای ببێ لەم تاقی کردنەوەدا، پێویستی هەیە بۆ ئەمەی ئەو بەهرە و چاکەیە بناسێت و هەست بکات بە لوتف و فەزڵی خاوەن چاکە و بەهرەکە، تا ئەویش چاودێریی بکات و کاروباری بگرێتە دەست و بەرەڵای نەکات و نەیخاتە ژێر ئارەزووی نەفس، خواناس و خوا نەناس ئا بەو جۆرە جیاوازن لەیەکتر، خواناس تا چاکە و بەهرە برژێت بەسەری دا چاو لەبەر تر ئەبێت و سەری بەندەیی باشتر دائەخات بۆ خوای خۆی، بەڵام خوا نەناس تا بێت بەرەڵلاَ تر ئەبێت و کەشخە و شانازی و لوت بەرزی بەتین تر و بەهێزتر ئەبێت! بێگومان خوا پێویستی بەهیچ کەس و بە سوپاسی هیچ کەس نی یە، کەواتە هەرکەس سوپاس و چاولەبەریی ببێ بۆ خۆی ئەیکات، هەرکەس وانەبێ خۆی زیان ئەکات، وەکو سولەیمان ئەفەرموێ: ﴿وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ﴾ هەرکەس سوپاسی ئەکات ئەوە تەنها بۆ خۆی ئەیکات و سوود و بەرهەمی ئەو سوپاسیەی بۆ خۆی ئەگەڕێتەوە، چونکە بەهۆی ئەو سوپاسەوە چاکە و بەهرەکەی بەردەوام پتر ئەبێ و هەڵئەستێت بە مافی بەندەیی و پێویستی سەرشانی خۆی بەجێ ئەهێنێ و خۆی ئەپارێزێت لە بەد نمەکی و ناپیاوی، ﴿وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّى غَنِىٌّ كَرِيمٌ﴾ هەرکەس چاو لەبەر نی یە و دان

نانیٚ به چاکه و بەهرەی خوادا بەوە خوا هیچ زیانێك ناکات، چونکه بێگومان پەروەردگاری من دەوڵەمەندە و پێویستی نی یه به سوپاسی هیچ کەس و دەست گوشادە، چاکە و بەهرە ئەڕژێنیٚ به بیٚ چاوەڕوانی سوپاس. ئەگێڕنەوە که جنۆکه ژێر بار کراوەکانی سولەیمان(علیه السلام) ویستیان پادشای(سبأ) ناشیرین بکەن و کەم نرخی بکەن له دوو بارەوە، یەکەم: کەم سەلیقه و سوك ئەقڵە، دووەم: قاچ و قولی له ئەهلی ئادەمی ناکات، بەڵکو وەکو هینی وڵاخ و چوار پیٚ وایه، ئینجا سولەیمانیش ویستی راست و ناڕاستی ئەوەی وتراوە تاقی بکاتەوە، یەکەم فەرمانی دا که له پێش هاتنی دا گۆڕانیٚ بەسەر تەختەکەیدا بهێنن و شێوەی ئەندازیٚ بگۆڕن تا بزانن ئەیناسێتەوە یان نا؟ بەهۆی ئەوەوە دەرئەکەویٚ ژیریی و ساویلکەیی ئەو ئافرەتە. دووەم: فەرمانی دا ناو ماڵی ئەو کۆشکەی که تێی دێت بکریٚ به حەوزێکی گەورە و ماسی و هەندیٚ گیان لەبەری ئاوی تیٚ بخرێت و سەری ئەو ئاوە به شوشەی سپی بگیرێت که رەنگی ئاوەکه ئەداتەوە، شوێنی سولەیمان لەلای سەرەوە بێت و پادشا که هات بەسەر ئەو ئاوەدا گوزەر بکات و بچێت بۆ خزمەتی سولەیمان، جا ئەو کاته به ئاوی ئەزانیٚ و ناچار قول هەڵئەکات و دەرئەکەویٚ قاچ و قولی چۆنه!! سولەیمان(علیه السلام) ئەو دوو فەرمانەی دا ئیتر ئەمەی که ئەیگێڕنەوە راست بیٚ و مەبەستی تاقی کردنەوەی ئەو دوو شته بیٚ که وتراون یان ئەوە راست نەبێت و مەبەستی ئەو تاقی کردنەوە نەبێت، بەڵکو هەر مەبەستی روون کردنەوەی رادەی زیرەکی و ژیریی پادشا بێت و سەرنج راکێشانی بەڵکو بیر بکاتەوە و بزانیٚ که ئەوە تەختەکەی ئەوە که چەندە دوور بووە و چەند بەتین و توندی قایم کراوە و ئێستاش ئەوەتە له پێش هاتنی ئەمەوە لەلای سولەیمانەوە، کەواته بزانیٚ ئەوە موعجیزەیەك بوو خوا دای به سولەیمان، هەروەها بیر بکاتەوە لەو هەموو لەشکر و هێز و دەسەڵاتە که خوا پیٚی داوە و هیچ دەسەڵات و پادشایەکی تری ئەو زەوی یه نایگاتیٚ و له ئاستی چاو نادات!! کەواته با باوەڕ بهێنیٚ بەو خوایه که سولەیمانی گەیاندووەتە ئەو رادەیه... لەبەر[١] هەرکام لەو مەبەستانە،

---

[١] بەڕاستی دڵ بەم ئایەی دووەم به ئارام تره و باوەڕی بەهێز تره، چونکه لەبارەی رای یەکەمەوە شتی پڕوپووچ و ئیسرائیلیات زۆر وتراوە، بەڵکو زۆربەی زانایان رای یەکەمیان بەلاوە دەلەسه و ئەفسانەیه.

قَالَ نَكِّرُواْ لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِىٓ أَمْ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٤١﴾ فَلَمَّا جَآءَتْ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرْشُكِ قَالَتْ
كَأَنَّهُۥ هُوَ وَأُوتِينَا ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ ﴿٤٢﴾ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَٰفِرِينَ
﴿٤٣﴾ قِيلَ لَهَا ٱدْخُلِى ٱلصَّرْحَ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا

﴿قَالَ﴾ سولەیمان فەرموی بە سەرباز و لەشکرەکەی: ﴿نَكِّرُواْ لَهَا عَرْشَهَا﴾ واتە تەختەکەی وا لیٚ بکەن تا بە ئاسانی بۆی نەناسریٚتەوە، بەم رەنگە گۆڕانیٚکی بەسەردا بیٚنن و شیٚوەی بگۆڕن ﴿نَنظُرْ أَتَهْتَدِىٓ أَمْ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ﴾ ئەو کاتە سەرنج ئەدەین کە تەماشای کرد و بینی ئایا ئەیناسیٚتەوە و ڕێی پیٚ ئەباتەوە یان لەوانەیە کە نایناسنەوە و ڕێی پیٚ نابەنەوە... ئەوانیش تەختەکەیان بەو جۆرە لیٚ کرد: ﴿فَلَمَّا جَآءَتْ﴾ ئینجا کاتیٚ پادشا بەلْقیس هات بۆلای سولەیمان و تەختەکەی بە گۆڕاوی لەبەردەمی دا بوو ﴿قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرْشُكِ﴾ پیٚی وترا: ئایا تەختەکەی تۆ بەم شیٚوە و ویٚنەیە و وەکو ئەم تەختە وایە؟!! بەڕاستی کارەکە زۆر نایاب و سەرسوڕهیٚنەرە و شتی وەها بە دلْ و خەیالْی دا نەئەهات، چونکە تەختەکەی خۆی لە ولاٚتیٚکی زۆر دوورە و لە شویٚنی زۆر مەحکەما قایم کراوە و حەرەس و سەربازی بە دیارەوەیە، ئەو ولاٚتە لە کویٚ و ئەم ولاٚتە لە کویٚ؟! ئەم ولاٚتە لە کویٚ کە ولاٚتی شامە و قودسە و پایتەختی پادشایەتی سولەیمانە؟ ئایا ئەم تەختە ئەگەر تەختەکەی ئەوە چۆن هیٚنراوە؟! ئایا کیٚ هیٚنای؟ لەم لایشەوە هەر ئەوە هەرچەند گۆڕانیشی بەسەردا هاتووە! ئایا بلْیٚ ئەو نی یە، چونکە بە پیٚی باو و تیٚگەیشتنی ئیٚمە هیٚنانی دوورە و ناگونجیٚت؟! یان ئایا بلْیٚ بەلْیٚ، ئەوە بە پیٚی ئەو هەموو دروشم و نیشانانە؟!! نەخیٚر هیچ کامی نەوت، بەلْکو وەلاٚمیٚکی دایەوە ئەوپەڕی ژیریی و لیٚزانی ئەگەیەنیٚت: ﴿قَالَتْ﴾ وتی: ﴿كَأَنَّهُۥ هُوَ﴾ وەکو ئەو وایە و ئەلْیٚی ئەوە، وا دەرئەکەویٚ لەدلْی خۆی دا باش زانی کە ئەوە و گومانی برد کە مەبەستی سولەیمان لە هیٚنان و گۆڕانی ئەو تەختە پیشاندانی موعجیزەیە و لەگەلْ تاقی کردنەوەی رادەی تیٚگەیشتن و ژیریی دا، لەبەر ئەوە لەدوای وەلاٚمەکەوە وتی بە سولەیمان:

﴿وَأُوتِينَا الْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ﴾[1] لەپێشی ئەو بەسەرهات و ئەم موعجیزەیە ئێمە زانین و باوەڕمان پێ دراوە و زانا کراین و باوەڕمان پەیدا کردووە بە توانا و دەسەلآتی بێ سنووری خوا و راستی پێغەمبەرێتیت، ئێمە هەر لەمەوبەر مل کەچ بووین بۆ تۆ و بۆ ئایینەکەت و موسڵمان بووین، کەواتە پێویستمان نەبوو بە پیشاندانی ئەم موعجیزە و هیچ رابەر و بەڵگەیەکی تر.

ئینجا خوای گەورە هۆی دەرنەبڕینی باوەڕ و موسڵمانێتی یەکەی لەمەوبەریان روون ئەکاتەوە ئەفەرموێ: ﴿وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ بەرگری کرد لە باوەڕ هێنان و دەربڕینی باوەڕەکەی لەمەو بەر ئەمە کە جگە لەخوای ئەپەرست ﴿إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَافِرِينَ﴾چونکە بێگومان لەگەل و کۆمەڵێ بوو کە کافر و رۆژ پەرست بوون، واتە ئەو ئافرەتە پادشا لەناو ئەو گەلەدا بووە و لەناو ئەوان دا پێگەیشتووە، ئەوان هەموو دامەزراو بوون لەسەر رۆژ پەرستی و ئەمیش بە تەنها نەیئەتوانی خۆی جیا بکاتەوە لەوان، کەواتە ئەمیش وەکو ئەوان رۆژپەرستی ئەکرد، دەی ئەو رۆژ پەرستی یەش بەرگری ئەکات لە خوا پەرستی، ﴿قِيلَ لَهَا ادْخُلِي الصَّرْحَ﴾ وترا بە بەڵقیس پادشا فەرمو بچۆرە ناو کۆشکەکە ﴿فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً﴾ ئینجا کاتێ کە بینی بە دەریای زانی و گومانی وابوو ئاوێکی زۆرە، چونکە – وەکو لە پێشەوە وتمان – پێشی هاتنی سولەیمان، فەرمانی دا کە کۆشکێکی بۆ دروست بکرێت لە شوشە و ناوماڵەکەیشی هەر شوشە بێت و بەسەر ئاوەکە دامەزرێت و لەناو ئاوەکەدا ماسی و گیان لەبەری ئاوی ببێ، دیارە ئەو کاتە شوشە نابینرێت، بەڵکو تەنها ئاوەکە ئەبینرێت ﴿وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا﴾ هەردوو قولی هەڵکرد بۆ ئەمەی پالێمی تەڕ نەبێت، چونکە لای وابوو بەناو ئاوا گوزەر ئەکات و ئەڕوا بۆ خزمەت سولەیمان و نەیئەزانی کە بەسەر شوشەدا ئەڕوات، لەبەر ئەوە سولەیمان شتەکەی بۆ روون کردەوە،

---

[1] بەپێی تەفسیرەکە ئەم رستە وتەیە هی پادشای(سبأ) ە و بەم شێوە رێك و پێکە و هیچ قسە و باسێکی ناوێت، رایەکی تر لەسەر ئەوەیە کە ئەمە فەرمایشتی سولەیمان و کۆمەڵەکەیەتی و مەبەستیان دان نان و شانازی یە بەم چاکەی خوایە بەسەریانەوە.

﴿قَالَ إِنَّهُۥ صَرۡحٞ مُّمَرَّدٞ مِّن قَوَارِيرَۗ قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي وَأَسۡلَمۡتُ مَعَ سُلَيۡمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٤﴾﴾

---

**﴿قَالَ﴾ پـێی فـەرموو: ﴿إِنَّهُۥ صَرۡحٞ مُّمَرَّدٞ مِّن قَوَارِيرَۗ﴾ بێگومـان ئـەوەی تـۆ بـە دەریـا و ئـاوی ئەزانی کۆشکێکە ساف و لوس کراوە و لە شوشەیە!! پادشا کە ئەوەی بینی بەو جۆرە سەرسام و سەرگەردان بوو لە ئاستی ئەم شتە نایابە و ئەم دەسەلات و پادشایەتی یە کە خەڵکی لەبەردەمی دا دەستە پاچەیە، بۆی روون بووەوە کە سولەیمان هێزو دەسەلاتێکی پێ دراوە لـەتوانا و دەسـەلاتی ئادەمی بـەدەرە! بـەهۆی ئـەوەوە گـەڕایـەوە بۆلای خـواو دانـی نـا بەمـەی جـەور و سـتەمی لـەخۆی کـردووە تـا ئێـستا کـە جگـە لـەخوای پەرسـتووە، وەکـو ئەفەرموێ: ﴿قَالَتۡ﴾ شا بەڵقیس وتی: ﴿رَبِّ إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي﴾ ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من جەورو ستەمم کردووە لە نەفسی خۆم لەمەوبەر ﴿وَأَسۡلَمۡتُ مَعَ سُلَيۡمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ ئەوا لەگەڵ سولەیمان دا و بە پەیڕەوی سولەیمان موسڵمان و مل کەچ بووم بۆ خوایەك کە ناوی ﴿الله﴾ و پەروەردگاری هەموو عالەم و جیهانە. دڵی شا بەڵقیس رووناکی وەرگرت و ڕێگای راستی دۆزی یەوە و کەوتە سەری، تێگەیشت و زانی کە ئیسلام بریتی نی یە لە سەرشۆڕی و مل کەچی بۆ هیچ کەس، با پادشا و پێغەمبەرێکی وەکو سولەیمانیش بێت، کە ئەو موعجیزە و دەسەلاتەشـی بـینی، بـەڵکو ئیـسلام بـریتی یـە تـەنها لـە مـل کەچـی و گـوێ رایـەڵی بـۆ پەروەردگاری هـەموو عالـەم، لەگەڵ هـاوڕێی بـاوەڕداران و بانگ کـەرانی ڕێگـای خـوا لەسـەر بنـەڕەتی یەکسانی هـەموان بەرامبـەر بەخواو مل کەچی و فەرمانبـەری بـۆ خـوا... ئـەوەتا وتی: لەگەڵ سولەیمان مل کەچ بووم بۆ پەروەردگار، نەیوت: مل کەچ بووم بۆ سولەیمان.**

**قورئان ئەم وشە و رستەیەی بە روونی باس فەرمو تا روون ببێتەوە سروشتی باوەڕ بە خوا و موسڵمانێتی، کەواتە موسڵمانێتی بەرزی و سەرکەوتنە بۆ ژێر دەستە و داماوان و بەرز بوونەوەیان بۆ ڕیزی خاوەن هێز و دەسەلات داران، لە ئیسلام دا زۆردار و بێ زۆر نی**

یە، بەڵکو هەموو یەکسانن و برای ئاینین، هەموو پێکەوە مل کەچن بۆ خوای هەموو. بێگومان پیاوە زلەکانی قورەیش بەهۆی نەفامی و نەزانی یانەوە یاخی ئەبوون کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) بانگی ئەکردن بۆ ئیسلام، چونکە دەروونیان پڕ بوو لە دەمار و لووت بەرزی، لایان وا بوو مەبەست لەو بانگ کردنە مل کەچ کردن و ژێر دەست کردنیان بوو بۆ سەرۆکایەتی پێغەمبەر(ﷺ) کەچی ئەوەتا ئافرەتێك لە مێژوودا کە پادشا و دەسەڵات دار بوو مل پێچی نەکرد و یاخی نەبوو لە بانگ کردنی بۆ ئیسلام، چونکە زانی کە ئیسلام تەنها مل کەچی بۆ خوا و یەکسانی ئەخاتە نێوان بانگ کەر و بانگ کراو و پێشەوا و شوێن کەوتوو!!

ئا بەو جۆرە دووا لە چەند زنجیرەیەك لە بەسەرهاتی سولەیمان و کۆتایی پێ هێنا بەم رستە بەتام و پڕ مەزەیە.

ئینجا ئەوا دەست ئەکات بە زنجیرەیەك لە بەسەرهاتی صالح پێغەمبەر و تائیفەی سەموود، لە زۆربەی شوێنەکانی قورئان دا بەسەرهاتی ساڵح و سەموود لەگەڵ نووح و هود و لوط و شوعەیب دایە، هەندێ جار سەرگوزەشتەی ئیبراهیم هەیە و لە هەندێ جاریش دا نی یە، لەم سورەتەدا کە زۆرتر لە بەسەرهاتی ئیسرائیلی یەکان ئەدوێت باسی موسا و داود و سولەیمان ئەکات و بە کورتی ئەدوێ لە هود و شوعەیب و هیچ باسی ئیبراهیم ناکات. لەم سورەتەدا لەبارەی حوشترەکەی ساڵحەوە نادوێ، بەڵکو لەبارەی نۆ کەسە پیلان گێڕەکەوە ئەدوێ کە خوا لەناوی بردن بە خۆیان و هەموو ئەوانەی کە لەگەڵیان بوون، باوەڕدار و هەموو لەخوا ترسەکانی رزگار کرد و جێ و شوێنی هەموو تاوانبارەکانی بە وێرانی هێشتەوە تا بەڵگە و هۆی تەمێ خواریی بێت بۆ چینەکانی داهاتوویان، بەڵام بت پەرستەکانی مەککە تەمێ خوار نەبوون لێ یانەوە لەگەڵ ئەوەدا هەموو جارێ گوزەریان ئەکرد بەو شوێنەدا و شوێنەوارەکەشیان ئەبینی،

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٥﴾﴾

ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا﴾ سوێند بەخوا رەوانەمان کرد بۆلای گەل و تائیفەی سەموود برای خۆیان کە ساڵح بوو، ﴿أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ﴾ بەم رەنگە وتمان خوا بپەرستن و بە تەنیا گوێ رایەڵی ئەوبن. پەیام و پێغەمبەرێتی یەکەی کورت کردەوە لە تەنها شتێك دا کە پەرستن و گوێ رایەڵی خوایە، بێگومان ئەو تەنها بڕیارە بناغە و بنەڕەتە بۆ هەموو پەیامەکانی ئاسمان لە هەموو کات و چین و چەرخێك دا، هەموو کاروباری ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو تەنها بڕیارە، لەگەڵ ئەوەدا ئاسمان و زەوی و هەرچی وا لە نێوانیان دا شایەتن لەسەر راستی تەنها ئەو پەیامە و بانگی مەردوم ئەکەن بۆ باوەڕ هێنان پێی، لەگەڵ ئەوەدا پەیامەکە ئەوەندە روون و رەوانە کەچی لە هەموو چین و چەرخێك دا تاقم و کۆمەڵێکی زۆر هەڵوێستێکی نارەوا و نەفامانەیان هەیە بەرامبەر ئەو شتە راستە سروشتی یە، باوەڕیان پێ ی نی یە، دانی پیا نانێن، بەڵکو بێ پێچ و پەنا دەم درێژیی ئەکەن بە لاقرتی پێ کردن و بە درۆ خستنەوەی، لەو رێگا راستە لائەدەن و ئەو هەموو توولە رێگا نالەبارانە ئەدەنە بەر کە هەڵیان ئەدێرێ و بەد بەختیان ئەکات، هەرچۆنێ پەیام و پێغەمبەرێتی یەکەی کورت کردەوە هەروەها هەڵوێستی ئەو گەلەشی کورت کردەوە: ﴿فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ﴾ ئینجا دەست بەجێ و کوت و پڕ ئەوان بوون بە دوو کۆمەڵ و تاقم کە ئاژاوە و بەربەرەکانێ ی یەکتری یان ئەکرد. کۆمەڵێ باوەڕی هێنا و گوێ رایەڵ بوو، کۆمەڵێکی تر باوەڕی نەهێنا و دژ وەستا، زۆربە لەم کۆمەڵە بێ بڕوا و دژە بوون، وەك بۆمان دەرئەکەوێ لە شوێنەکانی تر لە قورئان دا کە ئەم بەسەرهاتە ئەگێڕێتەوە. لێرەدا بۆشایی یەك ئەهێڵێتەوە بە پێ ی باوی قورئان لە گێڕانەوەی بەسەرهات و سەر گوزەشتەکان دا و ئەزانێن کە بێ بڕواکان پەلەیان ئەنایەوە بۆ ئەو سزایەی کە ساڵح ئەیترساندن پێ ی لەباتی داوای رێنموونی و بەزەیی خوا، ئەوانە لەگەڵ پێغەمبەرەکەیان دا لەو بارەیەوە رێك بە وێنەی بت پەرستەکانی قورەیش بوو لەگەڵ پێغەمبەردا – سەلامی خوا لە هەموو پێغەمبەران و شوێن کەوتووەکانیان بێت –.

قَالَ يَٰقَوۡمِ لِمَ تَسۡتَعۡجِلُونَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبۡلَ ٱلۡحَسَنَةِۖ لَوۡلَا تَسۡتَغۡفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿٤٦﴾
قَالُواْ ٱطَّيَّرۡنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ

---

ئەوانە لەبەر نەفامی خۆیان پەلەیان ئەنایەوە و سالّح پێغەمبەریش ﴿قَالَ﴾ پێ ی فەرموون: ﴿يَٰقَوۡمِ لِمَ تَسۡتَعۡجِلُونَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبۡلَ ٱلۡحَسَنَةِۖ﴾ ئەی گەلەکەم بۆچی پەلە ئەکەن و پەلە ئەنێنەوە بە هاتنی تۆڵە و سزایەك کە نارەحەت و ناسازتان ئەکات پێش چاکەیەك کە هۆی کامەرانی و رزگاریتانە، واتە ئەتانەوێ تۆبە و گەڕانەوە بۆلای خوا دوا بخەن تا کاتی هاتنی تۆڵە و سزاکە لەو کاتەدا تازە لێتان وەرناگیرێت. ئەوانە لەبەر نەفامی و گومڕایی خۆیان ئەیانوت ئەگەر هەڕەشەکەی راست بوو و بەدی هات ئەو کاتە تۆبە ئەکەین و ئەگەر نا هەر لەسەر ئەم باوەڕو بارەی خۆمان ئەبین ﴿لَوۡلَا تَسۡتَغۡفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾ با تۆبە بکەن لە بت پەرستی و داوای لێ بوردن بکەن لە خوا، بەڵکو بەزەییتان پێ بکرێت. ئەو گەلە بەد بەختە لەباتی ئەوە تەمێ و مۆچیاری یەکەی وەرگرن ﴿قَالُواْ﴾ ئەیان وت: ﴿ٱطَّيَّرۡنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ﴾ ئێمە دووچاری بەدبەختی و تەنگ گوزەرانی بووین بەهۆی تۆوە و بەهۆی ئەوانەی لەگەڵتن لە باوەڕداران! ئەوەی دووچارمان ئەبێت لەناو چاوی ئێوەی ئەناسین و بەهۆی نەحسی و نەگبەتی ئێوەوەیە!

لە چەرخی جاهیلی دا باو بوو کەسێك نیازی کارێکی بکردایە پەلەوەرێکی هەڵئەفڕاند ئەگەر بەلای راست دا برۆشتایە بەرەو لای چەپ بە کارێکی چاکی دائەنا و ئەیکرد بە نیشانەی چاکیی، ئەگەر لای چەپی یەوە بۆلای راستی برۆشتایە ئەیکرد بە نیشانەی خراپی و کۆتایی لێ ئەهێنا!! بێگومان نە پەلەوەر غەیب زانە و نە جوڵانەوەی نیشانەیە لەسەر چاکی یان خراپی هیچ کارێ، بەڵام ئادەمی ناژی بە بێ شتێکی غەیبی نەزانراو کە هەرچی

ترازا لە ڕێگای ڕاست ئەو شتانەی حەواڵەی خوای زانا و ئاگادار نەکرد، بێگومان ئەبێ حەواڵەی ئەو جۆرە بۆچوونە پڕو پووچانەی بکات و شوێنی ئەو باوەڕە ناڕاستە بێ جێ یانە بکەوێ کە لە سنوورێك دا ناوەستێ و مل کەچ نابێ بۆ هیچ ژیریی یەك و هیچ باوەڕ و ئارامی ناگەیەنێت بە دەروون. هەتا ئەم چەرخ و کاتەش ئەبینی ئەوانەی کە ڕانەکەن لە باوەڕ هێنان بەخوا، مل هوڕ و لوت بەرزن لەوە کە شتی غەیبی حەواڵەی خوا بکەن، چونکە بە نەفامی و نەزانی خۆیان لایان وایە کە لە زانین دا گەیشتوونەتە ڕادەیەك پێویستی یان بە ئایین نی یە و ئایین بە شتێکی پڕو پووچ سەیر ئەکەن!! ئا ئەوانە کە باوەڕیان نی یە بە خوا و بە ئایینی خوا و بە غەیبی خوا، ئەوانە ئەبینین کە هەندێ شتی پڕو پووچ زۆر بە گرنگ ئەگرن، بۆ وێنەی ژمارەی ١٣، وە بە ڕێگادا بڕۆن پشیلەی ڕەشیان پێ بگات و لە بەردەمیانەوە بڕوا، یان بگەن بە ڕێوی، یان بە کەروێشك... هتد، هەروەها چەند شتی پڕپووچی تر کە بە ئاسانی نایەنە ژمارە و باس. کە هەندێکیان ئەکرێن بە نیشانەی بەخت و ئامەد و هەندێکیان بە نیشانەی بەد بەختی و نامەدی، یان ئەڵێن: فلانە ڕۆژم پێوە نایەت و فلانە ڕۆژم پێوە دێت، یان ئەڵێن: مەکە واز بێنە سەبری هێنا، ئەو کارە بکە جەختی هێنا، ئەمانە و وێنەیان هەموو بێ بنج و بنەوانە و هیچیان تیا بەسەر نی یە و لە نەفامی و نەزانی یەوە هاتوون، پێویستە لەسەر هەموو باوەڕدارێ کە بە پڕوپووچیان سەیر بکەن و بە هیچ ڕەنگ گوێ یان نەبێ لێ یان، جا گەلە نەزانەکەی سەموود بە پێی ئەو باوی نەزانی و نەفامی یە سالح پێغەمبەر و ئیماندارانیان بە شووم و هۆی بەدبەختی سەیر ئەکرد! هەر بەسەرهاتێکی خراپیان دووچار ئەبوو لەناوچاوی ئەمانیانەوە ئەناسی!! ئینجا سالح پێغەمبەریش(علیه السلام) بەرپەرچی دانەوە و گێڕاندنی یەوە بۆ ڕووناکی ئیمان و باوەڕی ڕاستەقینە،

بـۆ شـتێکی روون کـە دووره لـە هـەر تـەم و تـاریکی یـەك ﴿قَالَ﴾ فـەرمووی پـێ یـان: ﴿طَـٰٓئِرُكُمۡ عِندَ ٱللَّهِۖ﴾ بەسەرهات و هۆی بەسەرهاتنتان لای خوایە، هـەموو بەش و چارەنووس و دوا رۆژتان لای ئەوە و ئەو هەموو شتێکی بڕیار داوە و هەموو شتێك بەدەستی ئەوە. ئینجا هۆی بەسەرهاتەکەیانی روون کردەوە فەرمووی: ﴿بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ تُفۡتَنُونَ﴾ نەخێر ئێوە گەلێکن تاقی ئەکرێنەوە لەلایەن خواوە بەو بەسەرهاتانەتان، یان بە رەوانە کردنی من بۆ سەرتان، خوای گەورە چەند رەوشت و یاسایەکی داناوە و فەرمانی داوە بە چەند شتێك و رێگای رووناکی روون کردووەتەوە بۆ بەندەیانی خۆی، جا هەرکەس شوێنی باو و رەوشتەکەی خوا کەوت، بە پێی رێنموونی ئەو رۆیشت بەرێوە ئەو کەسە خەیر و خۆشی دەست ئەکەوێت، بە بێ پێویستی بە هەڵفڕاندنی پەلەوەر و ئەو جۆرە پڕوو پووچانە، هەرکەسیش لابدات لە باو و رەوشتی خوا، لادا لە رێگای راست ئەو کەسە دووچاری خراپە و بەسەرهاتی خراپ ئەبێت. کەواتە وریایی و بیر کردنەوە لە رەوشتی خوا لەم جیهانەدا و تەمێ وەرگرتن لـە رووداوەکان و هەست کردن بە تاقی کردنـەوەی خوا بۆ بەندەکانی، تـەنیا ئەمانە خێرو چاکە مسۆگەر ئەکات بە ئیزنی خوا، ئا بەو جۆرە عەقیدە و باوەڕی راست خـەڵکی ئەگێڕێتـەوە بۆ رووناکی و رێك و راستی لە بڕیـار دانـی هـەموو کاروباردا، دڵ و دەروونیـان ئەگێڕێتـەوە بۆ وریایی و بێدار بوونەوە و بیر کردنـەوە لە هـەموو رووداو و بەسـەرهاتێکیان دا، هەست داریـان ئـەکات بەو دەستە قودرەتەی خوا کە هەموو شتێك لەو دەرئەچێ و تەنها بەو فەراهەم دێت، هەروەها هەستیان پێ پەیدا ئەکات کە هیچ شتێك لە خۆڕایی نی یە و بە رێکەوت و بێ مەبەست نی یە، ئەو کاتە نرخی ژیان و نرخی ئادەمی بەرز ئەبێتەوە. بەڵام ئەو فام و تێگەیشتنە راستە هەموو کەس نیەتی و هەموو دڵـی گوێ رایـەڵی ناکات بۆ تـەمێ و پەند و مۆچیاری، بەڵکو دڵـێ ئـەو تێگەیشتنەی هەیـە کـە مۆچـیاری وەرئـەگرێ و بـە تـەواوی نەشێوابێت و لـەکار نەکەوتبێ. ئـەو دڵـەی کـە بـەم جـۆرە دەردەدار بووبێ بـە هـیچ رەنـگ چارەسـەر ناکرێت، بۆ نموونە: لەناو گەلەکەی ساڵح دا نۆ کەس هەبوون بە تەواوی شێواو و چارەسەر نەکراو بوون بەهۆی ئەوەوە خەریکی خراپەکاری و پیلان گێڕی بوون بۆ ساڵح و هاوڕێکانی،

وَكَانَ فِي ٱلْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾ قَالُوا۟ تَقَاسَمُوا۟ بِٱللَّهِ
لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِۦ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ ﴿٤٩﴾

---

وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَكَانَ فِي ٱلْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ﴾ لەشارەكەی سالْح دا نۆ كەس هەبوون كە خراپە و ئاژاوەیان ئەنایەوە لە زەوی دا و هیچ چاكەیان نەئەكرد و هیچ خراپەیەكیان چاك نەئەكرد، واتە كارو فرمانیان تەنیا خراپەكاری بوو بە بێ تێكەڵ كردنی چاكە! ئەو نۆ كەسە یەك تەن و یەك بار لێ ی وەستا بوونەوە بۆ خراپەكاری، دڵ و دەروونیان جێگای چاكە و چاكەكاری تیا نەمابوو، ئەوانە بێگومان بێزار و تەنگەتاو ئەبوون لە بانگ و بانگەوازەكەی سالْح، چونكە ئەوانە وەكو میكرۆبی پیس وان، لە جێ و شوێن و ئاو و هەوای پاك دا ناژین و ئەیانەوێ شوێنی پیس و ئاو و هەوای ناساز دروست بكەن بۆ ژیانی خۆیان. ئەوانە ئەم پەندە فارسی یە دەق و سەروبەریانە: ﴿طبع ناسازی جعل را بوی طل دردی سرست﴾ كەواتە ئەبێ بكەونە تێكۆشان بۆ لەناوبردنی سالْح و ماڵ و خێزانی كە كانی چاكە و چاكەكاری بوون لە وڵات دا، لەبەر ئەوە ﴿قَالُوا۟﴾ لە نێوان خۆیان دا وتیان بە یەكتر: ﴿تَقَاسَمُوا۟ بِٱللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥ﴾ سوێند خواری یەكتر بین و هەموو سوێند بخۆین بەخوا كە لەناكاودا بەشەو بدەین بەسەر خۆی و ماڵ و منداڵ و خێزانی دا و بەربادیان بكەین، ﴿ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِۦ﴾ لەپاشان سوێند ئەخۆین و ئەڵێین بە كەس و كارو خوێن بەدەستی: كە ئێمە ئامادەی نەمامی ماڵ و خێزانەكەی نەبووین و چ جای ئەوەی لە ناویان بەرین و خۆشی بكوژین، ﴿وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ﴾ بێگومان و دڵنیا بن ئێمە راستگۆین و راست ئەكەین لەمەی كە پێتان ئەڵێین.

وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا وَمَكَرۡنَا مَكۡرٗا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٥٠﴾ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكۡرِهِمۡ أَنَّا دَمَّرۡنَٰهُمۡ وَقَوۡمَهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٥١﴾

بەڕاستی زۆر سەیرە و هۆی سەرسوڕمانە کە کۆمەڵێکی وا بانگ بکەنە یەکتر و بڵێن: با سوێند بخۆین بەخوا لەسەر ئەو گوناهە زۆر زلە کە کوشتنی ساڵح پێغەمبەرو خێزانەکەیەتی!! ئەو ساڵحەی کە بانگیان ئەکات بۆ پەرستنی ئەو خوایە کە ئەوانە سوێندی پێ ئەخۆن!! بەڵام چی ئەکەیت لە سەر لێ شێوان و گومڕایی؟! چی ئەڵێیت لەگەڵ ئەوانەی کە خۆیان کوێر ئەکەن لە ئاستی نوور و ڕووناکی ڕێنمونی خوا؟ خوا پەنامان بدات بە بەزەیی خۆی. ئا بەو جۆرە ئەوانە ڕاوێژیان کرد و ئەو پیلانە گەورەیان ڕێك خست، بەڵام بێ ئاگا بوون لەوە کە تۆڵە و سزای خوا لە کەمین دایە بۆیان و چاوەڕوانی کات و شوێنی خۆی ئەکات و ئەمان هەستی پێ ناکەن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا وَمَكَرۡنَا مَكۡرٗا﴾ ئەوانە لە پەنهانی دا پیلان و تەڵەکە و نیازێکی خراپیان کرد، ئێمەیش دژی کردەوەی ئەوان کردەوەیەکمان کرد ﴿وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ لەکاتێك دا کە ئەوانە هەستیان پێ نەئەکرد، بەڵام کردەوەی ئەوان لە کوێ و کردەوەی خوا لە کوێ؟!! تەگبیر و نیازی ئەوان لە کوێ و هێنی خوا لە کوێ؟! هێزو بڕیاری ئەوان لە کوێ و هێنی خوا لە کوێ؟!

زۆرجار زۆردار و ستەمکار و مل هوڕان هەڵەن و هەڵخەڵەتاون بە فڕو فێڵ و هێزو دەسەڵاتێ کە بە ڕواڵەت هەیانە، بێ ئاگان لەو چاوە قودرەتەی کە هەمیشە ئەیانبینێ و هەرگیز بێ ئاگا نابێ و هەڵە ناکات، هەست ناکەن بەو هێزە بێ سنوورەی کە هەموو کاروبارێکی لەژێر دەست دایە و لەناکاودا بە کوت و پڕی ئەدا بەسەریان دا و خۆیان و فێڵ و تەڵەکە و پیلانیان لە ڕیشە ئەهێنێ و دوچاری تۆڵەی کردەوەی ناپەسەندی خۆیان ئەبن، وەکو لێرەدا سەرنج ڕائەکێشێ بۆ دووچار بوونی گەلەکەی سەمود بە تۆڵە و بەرهەمی کردەوەکەیان کە ئەفەرموێ: ﴿فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكۡرِهِمۡ﴾ ئینجا سەرنج بدە چۆن دوا ڕۆژی پیلان و کردەوەکەیان بەدی هات بەو شێوەیە کە ئەوەبوو ﴿أَنَّا دَمَّرۡنَٰهُمۡ وَقَوۡمَهُمۡ أَجۡمَعِينَ﴾ ئێمە ئەوانە و گەل و کۆمەڵەکەیانمان بەرباد کرد بە تێکڕایی و پێکەوە! ئینجا دڵنیایی ئەکات لەسەر ئەو بەرباد بوون و لەناو چوونە،

فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةً بِمَا ظَلَمُوٓا۟ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥٢﴾ وَأَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٥٣﴾ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٥٤﴾

ئەفەرموێ: ﴿فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةً بِمَا ظَلَمُوٓا۟﴾ ئینجا ئەوەیە خانووەکانیان بە خاڵی و خەواڵ و چۆڵی یان بە رووخاوی و کەوتوویی بە مل یەك دا بەهۆی بێ بڕوایی و ستەم کاریی یان ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ بەڕاستی لەو رووداو و بەسەرهاتەدا نیشانە و بەڵگەیەکی روون هەیە بۆ گەل و کۆمەڵێ کە زانا بن، کەواتە تەمێ و رێنموونی وەرئەگرن. لەپاش پیشاندانی شێوەی سزای کت و پڕی لەناکاودا دەربارەی بێ بڕوا ستەمکارەکان ئینجا باسی رزگار کردنی ئیمانداره لەخوا ترسەکان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَأَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ﴾ ئەوانەی کە باوەڕیان هێنا بوو و ئەترسان لەخوا بەهۆی ئەوەوە خۆپارێز بوون لەگوناهو تاوان، ئەوانەمان رزگار کرد لە تاوانبارەکانی و لە سزا و تۆڵەیەك کە دووچاریان بوو، بێگومان هەرکەس بەڕاستی لەخوا بترسێ خوا ئەیپارێزێ لەوشتانەی کە بیم و ترسیان لێ ئەکرێت، چونکە خوا دوو بیم و ترس کۆ ناکاتەوە لەسەر هیچ بەندەیەکی وەکو لە حەدیسی قودسی دا هەیە.

ئینجا زنجیرەیەك لە بەسەرهاتی لوط پێغەمبەر(علیه السلام) ئەهێنێ بە کورتی، لەم زنجیرەیەدا باسی بڕیاری دەرکردنی ئەکات لەلایەن گەلەکەیەوە، تاوانەکەشی ئەوەبوو کە تەمێ و ئامۆژگاری ئەکردن و بێزاری دەرئەبڕی لە کردەوەیەکی ئێجگار پیس و ناڕەوا کە بە درێژایی مێژووی ئادەمی ئەو گەلە بە شێوەی گشتی دووچاری ئەو دەردە پیسە بوون و کردوویانە بە باو، بە شتێکی رێك و پێکیان داناوە، ئەو گوناهە پیسەش بریتی بوو لە نێربازیی و کۆتایی هێنان لە رێگای سروشتی تایبەتی کە ئادەمی لەسەر دامەزراوە، بەڵکو هەموو گیان لەبەرانی ئەم زەوی یە بە شێوەی گشتی یان زۆربەی لەسەرە. بەڕاستی شتێکی

زۆر سەیرە و هۆی سەرسوڕمانە لە مێژووی هەموو تاقم و کۆمەڵێکی ئادەمی دا، چونکە ئەگونجێ و ڕێك ئەکەوێ چەند کەس و تاکە تاکەیەك دووچاری ئەو دەردە ببن بەهۆی نەخۆشی دەروونی یەوە یان بەهۆی بەسەرهات و ڕووداوێکی کاتی یەوە، زۆرکات ئەو کردەوە پیسە ڕوو ئەدات لەناو لەشکر و سەربازدا یان لە بەندیخانەکان دا کە ئافرەتیان تیا نی یە، چونکە ماوەیەکی زۆر ئەمێننەوە و ئارەزوو زۆریان پێ ئەهێنێ. بەڵێ ئەو کردەوە پیسە لەو کاتانەدا و لەبەر ئەو هۆیانە ڕوو ئەدات لەلایەن تاك و یەکە یەکەوە، بەڵام ئەمەی کە شتێ وا بڵاوە بکات و ببێ بە یاسا لەناو گەل و وڵاتێك دا بە تێکڕایی لەگەڵ بوون و دەست کەوتنی ئافرەت و ئاسانی ژن هێنان، ئەوە شتێکی کەس نەدیووە لە مێژووی ئادەمی دا، مەگەر لەناو ئەو گەلە بەد بەختەی لوط پێغەمبەردا کە خوا لە ڕیشەی هێنان و وڵاتەکەیشی ژێر و زەبەر کردن. بێگومان ئارەزووی ژن و مێردیی شتێکی سروشتی یە و جووت بوون و یەکگرتنی نێرو مێ خوا کردوویەتی بە یاسا لەناو گیان لەبەران دا بۆ پەرەسەندن و مانەوەیان، بەڵکو لەناو هەموو ڕواوێ لەم زەوی یەدا، بەڵکو ئەتوانین بڵێین: بوون و یەکگرتنی نێرو مێ شتێکی سەرەکی و بنەڕەتە لە داڕشتنی ئەم بوونەوەرەدا بە شێوەی گشتی. گیان لەبەر و بێ گیانی وەکو وەرنەگیرێ لە دیمەن و ڕواڵەتی ئەم ئایەتەوە: ﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ [1] لە زانیاری تازەیش دا بەو جۆرە دەرکەوتووە، ئەوەتا ئەڵێن: زەررە بنەڕەتە لەم بوونەوەرەدا و ئەڵێن: زەررەش پێك هاتووە لە کارەبای موجەب و سالیب، واتە نێرو مێ!! بەهەرحاڵ شتێکی ئاشکرایە کە هەموو زیندەوەری ئەم زەوی یە ڕاگیرە لەسەر ئەو یاسایە، تەنانەت ئەو زیندەوەرانەش کە لە تیرەی خۆیان نێرو مێ یان نی یە لە هەموو یەکێك لەوانەدا سێلی نێرو مێیی هەیە، بە یەك کەوتنی ئەو سێلانە پەرە ئەسێنن و زۆر ئەبن. ئینجا کاتێ کە خوا یەکگرتنی نێرو مێی کرد بە یاسای ژیان، سۆز و

---

[1] سورەتی ذاریات. لەو شوێنەدا ڕاڤەی ئەم ئایەتە کراوە بە درێژیی و ئەو مەبەستە ڕوون کراوەتەوە و خوا خۆی باش ئەزانێ.

مەیل و خۆشەویستی کرد بە شتێکی سروشتی لە نێوان نێرو مێ دا کە بە پێی پێویستی ئەو سۆز و ئارەزووە بەهێزە هەیە لەنێوان ئەو دوو تیرەیەدا. ئەوەش لەبەر ئەوە ژیان بە ئاسانی لە ڕێگای سروشتی خۆیەوە بڕوات بەڕێوە. زیندەوەرەکانیش لەزەت و خۆشی وەرئەگرن لە پێکهاتنی مەبەستە سروشتی یەکانیان دا، ئەوان بەو جۆرە بەخۆشی و کامەرانی ئارەزوو و لەزەتی خۆیان بەجێ بهێنن، ئینجا خوای خاوەن دەسەلآت و بەزەیی ئەوەی خواهیش و مەیلی لەسەرە پێکی ئەهێنێ. کەواتە لادان لەم ڕێگایە و لەم یاسایە لادانە لە سروشت، لادانە لە ڕێگای راست، لادانە لە ژیریی و دەست درێژیی کردنە بۆ سەر ئادەمێتی بە تایبەتی، جا لەبەر ئەوە زۆر جێگەی سەرسوڕمانە کە بە جارێ گەلێکی وەك ئەو گەلەی لوط لابدات لەو ڕێگا راستە سروشتی یە پڕ سوودە کە پەرەسەندن و مانەوەی گیان لەبەرانی لەسەر راگیرە، لادانەکەشیان بە بێ ناچاری و بە بێ هۆ و پاڵ پێوە نەرێکی ژیریی یە، کەواتە ماڤ خۆی بوو کە ﴿لوط﴾(علیە السلام) بە تایبەتی ئەو تاوانەی گرت بەدەستەوە بەو هەموو بێزاری یەوە بەرەنگاری ئەو گەلەی کرد.

ئینجا با بێینەوە بۆ خزمەتی قورئان و گوێ بگرین لەو زنجیرەیە لە بەسەرهاتی لوط و گەلەکەی کە بۆمان باس ئەفەرموێ: ﴿وَلُوطًا﴾ باسی لوط بکە یان بەڕاستی(لوط) مان رەوانە کرد بە پێغەمبەری ﴿إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە وتی بە گەلەکەی بە سەرسوڕمان و بێزاری یەوە ئایا ئێوە ئەو کردەوە ئەکەن کە ئەوپەڕی خراپی و ناشیرینی یە، یان لە کاتێك دا کە ئەزانن بە پیسی و ناشیرینی ئەو کردەوەتان؟! کە تاوان و خراپەکاری بە زانینەوە خراپترە تا بە نەزانی، یان لە کاتێك دا چاوتان لەو کردەوە پیسەیە و بە ئاشکرا بە پێش چاوی یەکتری یەوە ئەیکەن، کە ئەوە لە هەموو شت خراپترو ناشیرین ترە،

﴿ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ﴾ چۆن ئایا بەڕاستی ئێوە ئەچنە لای پیاوان و ئەو کارە پیسەیان لەگەڵ ئەکەن، لەبەر بەجێ هێنانی ئارەزوو لە پیاوان کە شتێکی زۆر ناڕەواو بێ جێ یە و پیاو بۆ ئەوە دروست نەکراوە، لە کاتێك دا بەسەر ئافرەتان دا تێپەڕ ئەکەن کە شتێکی بەجێ یە و ڕەوایە و ئارەزووی ڕاستەقینە بەوان بەجێ دێت؟ بێجگە لەوەش مەبەست تەنها بەجێ هێنانی ئارەزوو نی یە، بەڵکو مەبەستی گرنگ و سەرەکی زاوزێ کردنە و پەرەسەندن و مانەوەی ئادەمی یە کە ئەمەش بە هیچ ڕەنگ بە پیاوان دەست کەوت نابێت. واتە کارەکەتان ئەوەندە ناشیرین و ناڕەوایە لەوانەیە کە جێگای باوەڕ نەبێت کە شتی وا روو بدات!! ئینجا واز ئەهێنێ لە تانە و بێزاری دەربڕین و لەکەداریان ئەکات بە نەزانی و نەفامی و ئەفەرموێ: ﴿بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾ ئێوە گەل و کۆمەڵێکن نازانن و نەفامن.

لوط(علیه السلام) ئامۆژگاری ئەو گەلەی کرد بەو شێوە زۆر گرنگەوە هەرچەند پیسی و ناڕەوایی کردەوەکەیان زۆر ئاشکرایە و پێویست بە باس کردن ناکات، بەڵام سەرەڕای ئەوە لوطبە تەواوی شتەکەی شی کردەوە، بە تەواوی ڕوونی کردەوە لە چەند بار و ڕوویەکەوە، کەچی ئەو گەلە نەفامە لە سروشت ترازاوە لە باتی تەمێ وەرگرتن، یان هەر هیچ نەبێت تەریق ببنەوە و سەر داخەن، ئەوانە بێ شەرمی و دەم درێژیی یان بەهێزتر بوو، چونکە ئەو کەسەی کە لەسەر تەوەرەی ئادەمی یەتی ترازا بێت، نەزانێ بە زمانی سروشت بدوێ وەکو گەلەکەی لوط، ئەو کەسە ئەبێ نەفام و نەزان و بێ شەرم بێت،

﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوٓاْ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَٰهَا مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٥٧﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًاۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٥٨﴾﴾

---

لەبەر ئەوە: ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوٓاْ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ﴾ پاش ئەو هەموو پەند و ئامۆژگاری یە گرنگەی لوط وەڵامی گەلەکەی هیچ نەبوو جگە لەوە کە لە نێوان خۆیان دا وتیان بە یەکتر: لوط و خێزان و شوێن کەوتووەکەی دەرکەن لە شارو ولاتەکەیان ﴿إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾ چونکە ئەوانە چەند ئادەمی یەکن خۆیان پاك و خاوێن رادەگرن لە کردەوەی ئێمە دوور ئەکەونەوە و بە پیس و قیزەونی سەیر ئەکەن، ئەمەیان کرد بەهۆی ئەو بڕیارە ناڕەوایە، جا رەنگە مەبەستیان لاقرتی پێ کردنیان بێت یان بێزاری دەربڕین لەوە کە دوور کەوتنەوە لە کردەوەکەی ئەمان بە پاکی و خاوێنی سەیر ئەکەن، چونکە ئەو گەلە پیسە بەهۆی ترازانیان لە سروشت هەست ناکەن بە پیسی شتی پیس، بەڵکو پیس بە پاك ئەزانن و پاك بە پیس!! ئەیشگونجێ کە دڵ تەنگ و بێزار بووبن لەو پاکی و خۆ بە پاك راگیر کردنە ماتوڵ بەرگری یان ئەکات لە کۆتایی هێنان لەو کردەوە پیسەی کە ئارەزوویان لەسەریەتی.

لەهەرجۆر و بەهەرحاڵ ئەوان بڕیاری خۆیانیان دا، خوایش شتێکی بڕیار دابوو جیاواز و دژی بڕیارەکەی ئەوان، وەکو روونی ئەکاتەوە بەم چەند رستەیە ﴿فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ﴾ ئینجا ئێمەیش لوط و خێزان و منداڵەکەیمان رزگار کرد جگە لە ژنەکەی کە ﴿قَدَّرْنَٰهَا مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ﴾ بڕیارمان دابوو بوونی لە ریزی ئەوانەی کە مانەوە لە سزادا ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًاۖ﴾ باراندمان بەسەر ئەوانەی مانەوە بارانێك، بارانێکی نەناسراوی کەس نەدیو ﴿فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ﴾ ئینجا زۆر خراپ بوو بارانی ئەو ترسێنراوانە کە لە پێشەوە هەڕەشەیان لێ کرا و ترسێنران و کەچی گوێ یان پێ نەدا. لە چەند سورەتێکی تردا بە تایبەتی(الأعراف) و(هود) بە درێژیی ئەم بەسەرهاتەی باس فەرمووە. لێرەدا بە کورتی بەسەریان تێپەڕی کرد، کەواتە با ئێمەیش درێژەی پێ نەدەین و کۆتایی پێ بێنین و درێژیی یەکەی بۆ ئەو سورەتانەی درێژەیان پێ داوە.

لەپاش نیشان دان و خستنە پێش چاوی چەند زنجیرەیەك لە بەسەرهات و سەرگوزەشتەی موسا و داود و سولەیمان و سالح و لوط – سەلامی خوا لە هەموویان بێت –

ئینجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) کە سوپاس و سەنای خوا بکات و سەلامی لەسەر هەموو بەندە هەڵبژێرراوەکانی خوا کە ئەوانەی لەم سورەتەدا باس کران بەشێکن لیێ یان، ئەو سوپاس و سەلامە ئەکات بە دەروازەیەك بۆ گەردشێکی گرنگ لەبارەی باوەڕو ئایینەوە. گەردشێك لە چەند پێشانگایەکی ئەم بوونەوەرە، لە قوڵایی دڵ و دەروون و چەند نیشانەیەکی رۆژی دوایی و چەند شێوەیەك لە بەسەرهاتەکانی و رووداوە سامناکەکانی زیندوو کردنەوە و کۆکردنەوە، کە هەموو کەس لە ئاستی دائەچڵەکیێ و سام و ترس داگیری ئەکات جگە لەوانەی خوا مەیلی ببێ. لەم گەردشەدا چەند شتی روون و ئاشکرا ئەخاتە پێش چاو و سەرنجی بۆ رائەکێشێ کە هیچ کەس ناتوانێت دانی پیا نەنێت و بەهیچ رەنگ رێگای ملەجەڕێ ناهێڵێ و ئەبێ دان بنێ و باوەڕ بێنێ بەخوای پەروەردگار و فەراهەم هێنەر و بەڕێوەبەری ئەم دەستگا و دووکانە. قاپی کردنەوەی ئەم هەموو تەمێ و ئامۆژگاری یە بەو سوپاس و سەنا و سەلامە، هاندانە لەسەر پیت و فەڕ وەرگرتن بەو دووانە تا بەهۆی ئەوەوە هەرچی ئەدرێ بە گوێچکەی گوێ گران دا چاك گوێی بۆ بگیرێت و باش دامەزرێ و جێگیر ببێ لە دەروونیان دا، جا لەبەر ئەوە بووە بە باو لەناو زانایان و خەتیب و واعیزەکان دا چین لەدوای چین قاپی کردنەوە بەو دووانە و لەپێش هەموو عیلم و زانینێ کە بگەیەنرێت بە خەڵکی و هەموو پەند و وتارو مۆچیاری یەك کە بڵاو بکرێتەوە، هەروەها بووە بە باو بۆ هەموو پەرتووك و نامەیەك لەناو موسڵمانان دا. لەپاش گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەو کۆمەڵە پێغەمبەر – سەلامیان لەسەر بێت – و باسی دەنگ و باس و هەواڵیان کە هەمووی بەڵگە و نیشانەی ئاشکران لەسەر گەورەیی و دەسەڵاتی بێ سنووری خوا، لەپاش باس کردنی ئەو هەموو موعجیزە گەورانە کە دای بەو پێغەمبەرانە و سەرخستن و زاڵ کردنی خۆیان و شوێن کەوتووەکانیان، ژێر خستن و تۆڵە سەندن لە دوژمنەکانیان. لەپاش ئەمانە هەموو، فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە سوپاسی خوا بکات لەسەر ئەو هەموو چاکە و بەهرەیە کە خوا رشتی بەسەر بەندەکانی دا، لەسەر ئەو عیلم و زانینەی کە پیێی داو ئاگاداری بەو شتە نەزانراوانە، هەروەها فەرمانی دا کە سەلام بکات لە بەندە هەڵبژێرراوەکانی لەسەر فەزڵ و هونەریان و هەڵسانیان بەو هەموو خزمەتە گەورانەی کە پێی هەڵسان بەرامبەر ئایینی خوا و رزگار کردنی زۆر لە بەندەیانی خوا لە چاڵی گومڕایی و سەرگەردانی، بوون بە پێشەوا و چاولێکراو لە گوێ رایەڵی خوا و هەموو خوو رەوشتێکی چاك و پڕ سووددا،

قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ۗ ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾ أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً

فەرموی: ﴿قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: هەموو سەناو سوپاس و ستایش بۆ خوا ﴿وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ﴾ سەلام لەسەر بەندەکانی خوا کە هەڵیبـژاردن بـۆ هـەڵگرتنی پێغەمبەرێتی و راگەیاندنی بانگ و بانگەوازی خوا و روون کردنەوەو رێنموونی بۆ بەرنامەی خوا، لەپاش ئەو قاپی کردنەوە، ئینجا چەند تەقەیەك ئەدات لە دڵە بێ بڕواکان کە زانا نین بەم هەموو بەڵگە و رابەرە روونانەی خوا لەم بوونەوەرەدا، تەشەریان لێ ئەدات و لاقرتی یان پێ ئەکات و بێداریان ئەکاتەوە بە گومڕایی و نەزانی و نەفامی یان. لە یەکەم جارەوە شێوە پرسیارێ ئاراستە ئەکات، کە وەڵامەکەی ئەبێت تەنها وەڵامێ بێت و دەست نادات جگە لەو وەڵامە، مەبەست لەو شێوە پرسیارە بێزاری دەربڕینە لە بڕیار دانی ئەو بتانەی کە کراون بە هاوبەش بۆ خوا، ئەفەرموێ: ﴿ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ ئایا خوایەك کە ناوی ﴿الله﴾ یە باشترە یان ئەوەی ئەو بت پەرستانە ئەیگێڕن بە هاوبەش بۆ خوا؟! بێگومان ئەوەی کە نەفام ئەیکات بە هاوبەش و لەباتی خوا ئەیپەرستێ یان دار و بەرد و بتێکە، یان مەلائیکە و جنۆکە و یان هەر دروست کراوێکی ترە لە دروست کراوەکانی خوا، هیچ کام لەو پەرستراوانە ناگاتە رادەیەك کە لەهیچ شتێك دا وێنەی خوا بێت چ جای ئەوەی چاکتر بێت، بەدڵی هیچ کەس دا گوزەر ناکات هیچ کام بەرامبەر کێ و هاوتایی پێ بکرێ لەگەڵ خوادا، جا لەبەر ئەوە دەرئەکەوێت کە ئەم پرسیارە بەم شێوەیە وەکو تەنیا مەبەست لاقرتی کردن بێت بە بت پەرستە نەفامەکان، بەس بۆ تەشە لێدانیان، چونکە دەست نادات بۆ ئەوە بکرێ بە پرسیاری راستەقینە یان چاوەڕوانی وەڵام بکرێ بۆی!! جا لەبەر ئەوە لائەدا لەم شێوە پرسیارە و ئەڕوا بۆ پرسیارێکی تر، کە وەرئەگیرێ لە واقیعی ئەم بوونەوەرە بە چواردەوریان دا، لەو شتانەی کە بەچاوی خۆیان ئەیبینن! ئەفەرموێ: ﴿أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ ئایا کەسێك کە ئاسمـان و زەوی دروسـت کـردووە ﴿وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ هێناویەتیـە خـوارەوە و باراندوویەتی بۆ ئێوە لە ئاسمان و لای سەرووتانەوە ئاو و بارانێك،

﴿فَأَنۢبَتۡنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهۡجَةٖ﴾[1] ئینجا رواندمان بەو ئاوە چەند باغ و باخچەیەك كە خاوەنی جوانی و رەونەق و شیرینین ﴿مَّا كَانَ لَكُمۡ أَن تُنۢبِتُواْ شَجَرَهَآۗ﴾ ناگونجێ و دەست نادات بۆ ئێوە رواندنی درەخت و رواوێ ئەو باغ و باخچەیانە، چ جای دروست كردنی خۆیان و بەرو بووم و میوەیان، بەو هەموو تام و بۆن و رەنگ و شێوەی جیاوازەوە، ئایا ئەو كەسەی ئەمانەی كردووە و فەراهەمی هێناون چاكترە یان ئەو بتانەی كە ئێوە ئەیانكەن بە هاوبەش؟ ئەم زەوی و ئاسمانانە شتێكی راستن و هەن و كەس ناتوانێت دانیان پیا نەنێت، هەروەها هیچ كەس ناتوانێ بڵێ: ئەم بتانە دروستی كردوون، هیچ كام لەو بت پەرستانە لایان وا نەبوو كە ئەم بوونەوەرە خۆی بۆ خۆی دروست بووە و راگیرە، چونكە ژیریی ئەچوو بە گژ دەمیان دا و دەم كوتی ئەكردن، لەبەر ئەوە شتی وایان نەئەوت، بەڵكو ئەیانوت خوا دروستی كردوون، ئەوانە هەرچەند بت پەرست بوون و باوەڕیان بەو شتە پڕو پووچە هەبو بەڵام نەفامی و نەزانی یان تا ئەو رادەیە بەتین نەبوو بە وێنەی ئەم تاقمە بێ بڕوا و مادیی یەی ئەمڕۆ و ئەم چەرخە دوایی یە تا بڵێن: ئەم جیهان و بوونەوەرە بە رێكەوت و خۆی بە خۆی فەراهەم هات!! كە هەموو خاوەن هۆش و ژیریی یەك تەریق ئەبێتەوە بەوە شتی وا بە دەمی دا بێت، كەواتە تەنها بیر خستنەوەی فەراهەم هاتنی ئەم ئاسمان و زەوی یە و تەمێ و بێدار كردنەوە بۆ بیر كردنەوە لەو كەسەی دروستی كردوون، تەنیا ئەو بیر خستنەوە و ئاگادار كردنەوە بەس بوو بۆ دەم كوت كردنی ئەو بت پەرستانە و پەك خستنیان و روون كردنەوەی پڕو پووچی ئەو بت پەرستنەیان، ئەم پرسیارە كە لەم ئایەتەدا هەیە راست و بەجێ یە لە هەموو چەرخێك دا و هەتا هەتایە و هەموو خاوەن فام و ژیریی یەك ناچار ئەكات بە دان نان و باوەڕ هێنان بە بوونی تەنیا خوایە كە تاكی و تەنیایی یەكەی ئاشكرا ئەبێت لە كردەوە و بەرهەمەكانی ئەم ئاسمان و زەوی یە فراوانەدا، لە داڕشتنی رێك و راست

---

[1] بە پێی تەفسیرەكە وشەی(أم)(منقطعە) یە و وەكو زۆریەشی لەسەرە، هەروەها ئەو چوارەكەی تریش كە دێن بە دوای دا بیارە ئەو كاتە(أ) ی پرسیارە لەگەڵ وشەی(بل) كە لێرەدا بۆ دەم كوت كردنەوەو پەك خستنە، هەڵئەگرێ(متصل) ەش بن وەكو(أم) ی یەكەم لە ئایەتی پێشوودا، لەسەر باری یەكەم(خبر) بڕیار ئەدرێت بۆ وشەی(من) و لەسەرباری دووەم هاوتای بۆ بڕیار ئەدرێت بە بەڵگەی بوونی لە ئایەتی پێشوودا، خوا خۆی باش ئەزانێ.

و گونجاوی هەموو بەش و پارچەکانی ئەم بوونەوەرە گەورەیە لە هەموو بارو روویەکی یەوە، کەواتە ئەبیٚ لە یەك خوایشەوە هاتبیٚ و راگیر بێت و کاروباری بەڕێوە ببرێت، هەرکەس لای وا بیٚ خۆی بۆ خۆی بەدی هاتووە بەم هەموو رژێمە تێرو تەواوە بێگومان ئەو کەسە بیٚ بەشە لە تێگەیشتن و ژیریی، بەراستی خۆیشی نازانیٚ چی ئەڵیٚ!!

بەراستی خوا پەنامان بدات لە بیٚ بڕوایی ئەو بڕوایانە کە بە دیمەن وەکو ئادەمی یەکی تێرو تەواو وان بە رواڵەت خاوەنی بیستن و بینین و هۆشن، کەچی بێبەشن لە بەرهەم و سوودی بیستن و بینین و ژیریی، ئەگەر نا چۆن ئەوانە شتی وا بەدڵیان دا گوزەر ئەکات!! ئەگەر بەهەرکام لەوانە بوترێ: فرۆکەیەك یان سەیارەیەك بینرا لە خۆیەوە پەیدا بوو بەو هەموو پارچە و جەڕ و مەکینەوە، لەخۆیەوە کەوتە کار و بە رێکی ئەگەڕێ، هەرکام لەوانە ئەگەر شتی وایان پیٚ بوترێ بێگومان ئەزانن کە درۆیەکی زۆر زۆر زلە و بە هیچ رەنگ بڕوایان بە شتی وەها نی یە و بە گونجاوی سەیر ناکەن!! ئەی ئایا چۆن ئەڵیٚ ئەم بوونەوەرە گەورەیە لە خۆیەوە بە رێکەوت پەیدا بووە و بە بیٚ کەس کاروباری ئەڕوات بەڕێوە؟!! بەراستی زۆر جێگای سەرسوڕمانە تا ئەو رادەیە نەفامی و سەر لیٚ شێواوی، پەنا ئەگرین بەخوا کە بەد بەختی و نەزانی وامان بەسەر نەهێنیٚ. ئەو ئاوەی کە لەسەردا دێتە خوارەوە و ئەباریٚ شتێکی راستە و هەیە و بەچاو ئەبینریٚ و هیچ کەس رێگای نی یە و ناگونجیٚ دانی پیا نەنێت و باوەڕی پیٚی نەبێت، هەروەها ناگونجیٚ و جێگای باوەڕ نی یە کە بە رێکەوت و لە خۆیەوە پەیدا ببیٚ و بێتە خوارەوە بەم رژێم و یاسا نەگۆڕاوە و بەو ئەندازەی کە ژیانی پیٚ راگیرە، بەو ئەندازە مەزبووتە کە تێبینی تیادا کراوە و پێویستی هەموو زیندەوەر و زیندەوەرەکانی ئەم زەوی یەیە بە تایبەتی ئادەمی. ئینجا فەراهەم هاتنی ئەم هەموو باخ و باخچە و درەخت و گوڵ و گوڵزارە بەو هەموو بەر و میوە و شێوە شیرینەوە کە دڵی هەموو کەس شێت و شەیدایان دەبێت!! رەنگکردن و رازاندنەوەی تەنها گوڵیٚ لەو گوڵانەوەی کە بە هۆی ئەو ئاوەوە پەیدا ئەبن هەموو ئادەمی لەئاستی دەستەپاچەو پەککەوتوون، بەراستی بیرکردنەوە لەو ئاوە و بەرهەمەکانی با بەشێوەیەکە سادەش بێت بەسە بۆ رواندنی ئیمان و باوەڕی بەهێز لە دڵ و دەروونێك کە لە بەرد رەقتر نەبێت، لە کوٚتەرە داری پرتوکا و وشك تر و لەکارکەوتوو تر نەبێت.ئای چەندە شیرین و بەجیٚ یە لەم کاتەدا کە سەرنجی راکێشا بۆ ئەم شتە نایابانە هێرش ئەکاتە سەر بیٚ بڕواکان بە ئاراستەکردنی ئەم پرسیارە، کە مەبەست پێی تانەو تەشەر دانە لیٚ یان لەسەر هاوبەش بڕیار دانیان بۆ خوای پەروەردگار،

أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا وَجَعَلَ
لَهَا رَوَٰسِىَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾

**ئەفەرموێ ﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ﴾ ئایا لەگەڵ خوایەك كە ناوی ﴿الله﴾ یە هیچ خوایەكی تر هەیە كە ئەوان دانی پێدا بنێن و بیپەرستن بیكەن بە هاوبەشی بۆ خوایەك كە ئەم هەموو شتەی بەدەستە؟!! بێگومان لەڕووی ژیری یەوە هیچ ڕێگا و ماوە نی یە بۆ ئەو بڕیار و باوەڕە هیچ چارە نی یە ئەبێ دانبنرێ و ملكەچی بكرێ بۆ تەنیا خوایەكی بێ وێنە و هاوبەش. لێرەدا دەرئەكەوێت هەڵوێستی بێ بڕواكان بە شتێكی سەرسوڕهێنەر كە ئەو بتانە ئەكەن بە هاوبەش و لەباتی خودا ئەیانپەرستن، هەروەها جێگای سەرسوڕمانن كە چۆن بەوجۆرە سەرلێ تێكچووو لەڕێگای ڕاست ترازاوون؟!! كەواتە زۆر جێگای خۆیەتی كە كۆتایی ئەهێنێ لەدەم كوتكردنیان بە ڕوو بەڕوو، ئەیگوێزێتەوە بۆ باسی ئەم سیفەتە خراپەیان و ئەم هەواڵەیان پێئەدات، ئەفەرمووێ ﴿بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ﴾ واتە ئەوان گەل و كۆمەڵێكن باویان وایە لائەدەن لە ڕێگای ڕاست و لەسەر باری ڕاست و ڕوونە كە خواپەرستییە بە تەنیا و دانیان گرتووە بەسەر ئەو شتە پڕووپووچەدا كە بریتی یە لە بت پەرستی و هاوبەش بڕیاردان، یان مەبەست ئەوەیە كە ئەوانە كۆمەڵێكن ئەو بتە بێ نرخانە ئەكەن بە هاوتا و هاونرخی خوای بێ هاوتا!! ئنجا ئەگوێزرێتەوە بۆ شتێكی تری ڕاست لەم بوونەوەرەدا و ئەمیش ئەداتەوە بە ناوچاویان دا وەكو پێشووەكە، ئەفەرموێ: ﴿أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا﴾ ئایا كەسێ زەوی گێڕاوە بە جێگای ئارام و نیشتەجێ ی بە سەریەوە، زەوی كردووە بە دامەزراو و بە ئارام و بەبێ تاسەو لەنگەرە، ﴿وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا﴾ گێڕاویەتی لە ناو بە ناوی دا چەند ڕووبارێ ﴿وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ﴾ گێڕاویەتی زەوی و بۆ بەرژەوەندی زەوی چەند شاخ و چیای گەورەی دامەزراو، ﴿وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا﴾ گێڕاویەتی لە نێوان دوو دەریادا دوو دەریای شیرین و دەریای سوێر بەرهەڵست و بەرگریان ئەكات لە تێكەڵ بوون و زاڵ بوونی هەركام**

بەسەر ئەوی تردا، ئایا کێ ئەمانەی کرد؟! ئایا کەسێك ئەمانەی کردبێت چاکترە یان ئەو بتە بێنرخانەی کە ئەوانە ئەیانپەرستن؟!!

ئەوەی لە ئایەتی پێشوودا باسکرا بریتی بوو لە دروستکردن و بەدی هێنانی ئاسمانەکان و زەوی، بەڵام ئەمەی لێرەدا باس ئەکرێت شێوە و بارێکە کە زەوی لەسەر دروست کراوە، بێگومان خوا زەوی کردووە بە جێگای مانەوە و ژیان و پەرەسەندی، بە جۆرێ دامەزراوە و شیاوە و دەست ئەدات بۆ ئەمەی ژیان فەراهەم بێت و دامەزرا و ڕاگیربێت تیای دا، ئەوەش بە چەند هۆیەکە ئەگەر هەر جۆرە گۆڕانێك ڕووبکاتە هەرکام لەو هۆیانە کارەکە ئەشێوێ و دەست نادات بۆ ئەم ژیانەی کە ئێستا ئەڕوا بە ڕێوە، ئەگەر بار و جێ و شوێنی لەگەڵ مانگ دا یان لەگەڵ خۆردا بگۆڕێت یان شێوەی خۆی بگۆڕێ یان قەبارەی بگۆڕێ، یان کەرەسەو پارچەکانی خۆی یان ئەوانەی بە دەوری دان، یان باری خولانەوەی بە دەوری خۆی دا، یان بە دەوری خۆردا، یان ڕادەو خولانەوە مانگ بەدەوریدا..هتد. هەرکام لەمانە و لەهەرهۆیەکی تر بگۆڕێ بە هەربارێك دا باری ئەم ژیانەی ئێستای پێدەگۆڕێ! ئەو کۆمەڵ و تاقمەی کە یەکەم جار ئەم قورئانەیان هاتەسەر و چپاندی بە گوێچکەیاندا ئەم هەمووشتە نایابە سەرسوڕهێنەرانیان نەزانیوە کە ئەم جۆرە ئایەتانە دەست نیشانی کردووە بۆیان و بەرەبەرە دەرئەکەون و پێ یان ئەزانرێ، بەڵام نایابی قورئان ئەوەیە کە ئەوشتانەی ئەیانخاتە پێش چاو ئەیانکات بە ڕابەر و بەڵگە ئەو شتانە بۆ هەموو تاقم وچینێ دەست ئەدەن، لە هەموو چەرخێك سوودیان لێ وەردەگیرێ، بەلێ یەکەم تاقم و هۆکانی زەوی بۆ ژیان نەزانراوە و نەناسرابوون لایان، بەڵام بە چاو زەوی یان دیوە بەو هەموو خێر و بێرەوە و ژیان ژیان بەسەریەوە بەرێك و پێکی ئەگوزەرێ، هیچ کەس نەیتوانیوە بڵێ: هیچ بت و پەرستراوێ هەیە لەدروستکردنی ئەم زەوی یەدا، دەی تەنیا ئەوە بەس بووە بۆ دەم کوتکردنەوەی ئەو بت پەرستانە تانەو تەشەر لێدانیان لەسەر بت پەرستیەکەیان و مل پێشۆڕکردنیان بۆ پەرستنی خوا بەتەنها، ئنجا قاپی لەسەر پشتە بۆ هەموو تاقم و چینەکانی داهاتووی یەکەم کە بەرەبەرە شتی وا نایابی سەرسوڕهێنەر بدۆزنەوە لەوانەی کە ئەم جۆرە ئایەتە دەسنیشانی بۆدەکەن، هەتا زانین و زانیاری فراوانتر ببێتخەڵکی زاناتر ئەبن بە مەبەستەکان

و قورئانی پیرۆز ئەمەیە کە بۆ هەموو تاقم و چینێك دەست دەدات، لەگەڵ هەموو جۆرە ژیرییەك دواوە!! ڕووبار و چەشمەکان لە زەوی دا دەماری ژیانن، بڵاوبونەتەوە بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و بەرەو ژوور و بەرەو خوار، لەگەڵ خۆیاندا ئاوەدانی و هەرزانی زیندەوەر ئەبن و بڵاویی ئەکەنەوە بە وڵاتدا، ئەو ڕووبارانە لە کۆبوونەوەی ئاوی باران پێکدێت و هاتووچۆی باران بەپێی سروشتی زەوی، ئەو خوایەی کە ئەم بونەوەرەی دروست کردووە، هەر ئەو بڕیاری داوە لە پێکهێنان و داڕشتنیدا، گونجانی پێکهاتنی هەردوو، هاتنە خوارەوە ی باران و هاتوچۆ و گەڕانی چەشم و ڕووبارەکان. هیچ کەس ناتوانێ و ڕێگای نی یە بڵێ: کە کەسێ تر جگەن لە خوا دەخلی هەیە لەو شتانەدا، یان بەشداری هەیە لە پێکهاتنیاندا، گەڕان و هاتوچۆی ئەو هەموو ڕووبارە شتێکی ڕاستە و هەیە و بت پەرست و بێباوەڕەکان بە چاوی خۆیان ئەیبینن. دەی ئایا کێ ئەم شتە ڕاستە گرنگەی بەدی هێنا ﴿أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ﴾ کەواتە پەرستنی هیچ پەرستراوێ تر جگە لە خوا ناڕاست و ناڕەوایە. ئەو هەموو شاخ و چیا گەورە گەورانە جێگیر و دامەزراون بەسەر زەوی یەوە، زۆرتر ئەوانن کە هۆی پەیدابوونی ڕووبارەکانن، ئاوی باران لەو شوێنە بەرزانەدا کۆئەبێتەوە و بەتین وبەهێز هەڵئەقوڵێت بۆ ناو دەشت و شیوەکان و ئەو هەموو پیت و فەڕە ئەڕژێنێ بەسەر وڵاتدا، ئەو هەموو ئاوی سوێر و تاڵ و شیرین و خۆش گەوارە هەیە و پێویستی بە هەردوو جۆرەکە هەیە، خوا کارێکە وای کردووە هەر ئەمێنێتەوە و هیچیان زاڵنابن بەسەر ئەوی تردا!! دەی ئایا کێ ئەمانەی هەموو پێك هێناوە؟! ﴿أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ﴾ هەموو کەس ناچارە ئەبێ بڵێ: نەخێر، نەوەڵڵا هیچ خواپەرستانێکی تر نی یە بەڕاستی، هەرکەس لەبەر خۆیەوە هەرشتێك بڵێت ئەو کەسە بەبێ هۆشی ئەیڵێت وەکو وڕێنە وابکات وایە و هەرکەس زانا بێت هەرگیز باوەڕی ناڕەوای نابێت، شتی ناڕاست ناڵێت، کەواتە هۆی پڕوپووچی باوەڕی ئەو بت پەرستانە نەزانین بوو، لەبەر ئەوە بە ووشەی ﴿بَلْ﴾ کۆتایی هێنا لە دەم کوتکردنی وتەشەلێدانیان و گواستیەوە بۆ باسی هۆی بت پەرستیەکەیان و فەرمووی: ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ زۆربەی ئەوانە یان هەموویا نازانن، کە نرخێکی ببێت بەهۆی ئەوەوە هەست ناکەن بە پڕوووپووچی ئەو بارەی وان لەسەری لەگەڵ ئەوەدا کە زۆر ئاشکرایە.

له پاش پیشاندان و سەرنج ڕاکێشانیان بۆ هەندێ تابلۆ له پێشانگای ئەم بوونەوەرە گرنگە. ئنجا ئەیانگوێزێتەوە بۆ سەرنجدان و بیرکردنەوە له خۆیان و هەندێ شتی تایبەتی یان، ئەفەرموێ ﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ﴾ ئایا کەسێکی وا کەدێت بە هاوار و نزای ناچار و داماوەوە کاتێ هاوار و نزای لێ ئەکات، تەنگی و زەحمەت و ناڕەحەتی لائەدات له خەڵکی؟! ﴿وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ﴾ ئەتانکات بە جێنشینی گەلانی پێش خۆتان له زەویدا، بەم ڕەنگە وڵات و جێ و شوێنەکەی ئەوانتان ئە خاتە ژێردەست بە نارەزووی خۆتان، ئیش و کاری تیا ئەکەن و بەرهەم و خێری لێوەرئەگرن ئایا کەسێ کە ئەمانە ئەکات چاکترە یان ئەوانە کە ئێوە بە ناڕەوا و ناهەق ئەیان پەرستن؟! ناچار و لیقەوماو و بە تەنگ هاتوو له کاتی تەنگی و ناڕەحەتیدا هیچ پەنایەکی نی یە جگە له خوا کە هاواری لێئەکات وپەنای پێئەبات بۆ نەمێشتن و لابردنی ئەو تەنگ و بارەی له کاتێك دا کە بەگیر هاتووە و هیچ چارە و دەسەڵاتێك شك نابات و هیچ یارمەتی دەرێکی نی یە و سەرنجی چواردەوری خۆی ئەدات هیچ هۆی ڕزگار بوونی نی یە، لەوە و پێش ئومێدی بە هەرشتێك بووبێت سەری له هیچ دەرچوو، لەو کاتە تەنگە نائومێدیەدا سروشتی بێدار ئەبێتەوە، کەواتە پەنا ئەبات بۆ خوای تەنیاو تاك، کە خاوەنی هەموو هێز و دەسەڵاتێکە و هەموو کۆمەك و یارمەتی و فریاکەوتنێکە، ڕوونەکاتە خوا ئەگەر لەوە و بەر له کاتی خۆشیدا هەر بیری بەلاوە نەبوو!! خەڵکی لەکاتی خۆشیدا بیئاگا ئەبن لەمە کە هەموو شتێك بەدەستی خوایەو ئە گەڕێتەوە بۆ لای خوا، بەهۆی ئەوەوە چاوەڕوانی هێز و یارمەتی و پارێزگاری ئەکەن له هێزێ لەهێزە لاوازەکانی ئەم زەوی و جیهانە.بەڵام لاکاتی ناچاری و تەنگەتاویدا پەردەی بێ ئاگایی بەسەر سروشتیانەوە نامێنێت، ئەگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگاریان بە ملکەچی و لاڵە و پاڕانەوە و پەنائەهێننەوە بۆ قاپیەکەی ئەو، هەرچەند لەوە و بەر بێئاگاو مل هوڕ و لوت بەرز بوبن. جا قورئان ئەو مل هوڕ و لوت بەرزانە ئەگێڕێتەوەئاگاداریان ئەکاتەوە بەو شتە ڕاستەی کە هەیەو داشاردراوە له سروشتیان دا، باسی ئەکات بۆیان له ڕیزی ئەو شتە ڕاستەقینانەی بوونەوەر کە له پێشەوە باسی کردن، دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی، هیچنانە خوارەوە و باراندنی باران، ڕواندنی درەخت، ئەو هەموو باغ و

باخچه ڕواوانه، گێڕانی زەوی بە نیشتجێ و جێگای ئارام و دروست کردنی ئەو هەموو چیا و شاخانە و دامەزراندنیان، فەراهەم هێنانی ئەو هەموو ڕووبارەو بەرگر و بەرهەڵست لە نێوان ئەو هەموو ئاوی سوێر و ئاوی شیرینەدا، کەواتە پەنابردنی ناچار بەخوا و بە هاوارەوەچوونی خوا بۆیان شتێکی ڕاستەقینەیە بەوێنەی ئەو هەموو شتە ڕاستەقینانە کە باسمانکرد. ئەم ئایەتە بەڵگەیەکی ڕوون و ڕەوانە لەسەر ئەوە کە بەهاوارەوە چوونی وفریادڕەسی بەشێوەی نهێنی و غەیبی تایبەتیی یە بەخواوە بەوێنەی دروست کردن و داهێنانی ئاسمانەکان و زەوی، ئەوهەمووشتانەی تر کەلەم ئایەتانەدا باسی ئەفەرموێ و کردوونی بە هاوسەرو هاوتای یەك و لەڕیزی یەك داباسی کردوون، ئەم باوەڕش شتێکی زۆرگرنگ و پێویستە لە هەموو ڕکاتی نوێژەکانمان دا بلێین:﴿وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾واتەئەی خوای تەنیا لەتۆ داوای یارمەتی وکۆمەکی ئەکەین، واتە کۆمەك بەشێوەی نهێنی و غەیبی، نەك بەشێوەی ئاشکراو کاروباری مادی ئەم جیهانە کە لەچوارچێوەی هێزی بازووی بەندەدا یە، داوای کۆمەکی بە م جۆرەیە شتێکی شەرعی یەو فەرمانی پێ دراوە لەئاینی پاکی ئیسلام دا، کەواتە با بەندەی موسڵمان ئاگای لەخۆی بێت پێچەوانەی ئەم بیروباوەڕ و بڕیارە نەجوڵێتەوە، ئەوشتانەی کەتایبەتن بەخواوە تەنها بۆ خوایان بەکاربهێنێت، ئیتر نەك بۆکەسی تر. ئەگەر کەسێ ئەڵێ: چەند ناچار و داماو هەن نزا ئەکەن،کەچی بەهاوارەوە چوونی نزاکەیان نابینرێت؟! لەوەڵامدا ئەڵێین[1] :

١- ئایەتەکە نافەرموێ هەموو ناچار داماوە و مەبەست گشتی نی یە بەڵکو مەبەستهەرکام و هەرکەسێکە.

٢- ئەگەر بڵێین بۆ هەمووانە و بێ بڕین بەسەرگشتی دا.. ئەو کاتە ئەڵێین: وەرگرتنی نزاو بەهاوارەوە چوون بەسراوە بە ویست وخواهیشی خواوە، واتە خوا ئەچێ بەهاواری هەموو ناچارێکەوە ئەگەر ویستی لەسەربێت، بۆ بەڵگەی ئەوە لە ئایەتی تردا بەستویەتی بەویستی خۆیەوە، ئەوەتا لەو شوێنەدا ئەفەرموێ:﴿فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن شَآءَ﴾ واتە ئینجا لائەدات لێتان ئەوەی کە ئێوە نزا ئەکەن بۆ لای ئەگەر خوا بیەوێ و مەیلی ببێت، بێگومان قورئان هەندێکی ڕاڤەو تەفسیرە بۆ هەندێکی تر.

---

[1] لە سورەتی(زمر) دا ئەم باسە درێژتر و ڕوونتر هەیە، با سەرنجی ئەوێ بدرێت..

٣- وەرگرتنی نزاو بە هاوارەوە چوون تەنها یەك باری نییە و هەر بریتی بێت لەوەی نزاکە داوای کردووە، بەڵکو چەند بار و شێوەی تر هەیە کە ئەوە چاکترە بۆی، ئەو نازانێ و خوا خۆی باش ئەیزانێت.

٤- مەبەست بەم ناچارە کەسێکە کە بە تەواوی و بەدڵ بڕابێت، خۆی دابڕنی بێت لە ئومێد و چاوەڕوانی هەموو شتێك، بەڕاستی و ئیخلاصەوە تەنیا پشت ببەستێ بە خوا وخۆی حەواڵەی خوا بکات، دەی هەموو ناچارێکی وا خوا بێگومان نزاکەی وەردەگرێت و ئەچێ بەهاواریەوە، هەر جۆر داوادەکات. لەم بارەیەوە حدیسی زۆر بەناوبانگ هەن، ئنجا با هەندێك بیر بکەینەوە لە خۆمان کە چۆن دروست کراوین لەم زەویەدا و دێین و ئەڕۆین چین لە دوای چین، چین و تاقمێك ئەڕوا و یەکێکی تر دێتە شوێنەکەیی و شاد ئەبێت بە جێگا و مەئواکەی، دەی ئایا جگە لە خوا هیچ کەسێکی تر هەیە بڵێ من ئەوەم کرد، یان بەشداریم کرد تێیدا؟!! ئایا خوا ئێمەی دانەهێناوە و دروستی نەکردووین لەم زەویەدا، لە هەموو بارێکەوە بۆ هۆی ژیانی بۆ فەراهەم نەهێناوین، بەشێوەیەك کە بتوانین هەڵسین بە ئەرکی جێنشینی؟! ئەمەش بەهۆی کۆمەکی و یارمەتی و یەکگرتنی چەند شتێکی دوور لە یەکی جیاجیا ئەگەر هەرجۆرە ناکۆکی و نارێکیەك ڕووبکاتە هەرکام لەوانە ژیان ناگونجێ یان بەڕێکی ناڕوا و بەسەر نابرێت. بە کورتی ئەم ئاسمان و زەویە ئەوەی وا لەنێوانیاندا بە وێنەی مەکینەیەکە و هەموو بەش و پارچەکانی دەخلیان هەیە لەم ژیانی ئێمەدا، ئەگەر هەر جۆرە نارێکیەك ڕووبکاتە هەر کام ژیان ناگونجێ یان ئەشێوێ و تاڵ ئەبێت، دەی ئایا جگە لە خوا کێ ئەم هەموو شتەی ساغزاندووە و یەکی خووستوون؟! ئنجا ئایا کێ ئەم مردن و ژیانەی بڕیاردا، چین لەدوای چین ئادەمی ئەهێنێ بەدوای یەك دا؟!! خۆ ئەگەر مردن نەبوایە ئەو هەموو ئادەمیە کەڕۆیشتوون بمانایە و هەموو یەکیان بگرتایە بێگومان زەوی هەڵی نەدەگرت، ژیان و شارستانی و ئاوەدانی و بیرکردنەوە لەهۆی ژیان و گوزەران دوا ئەکەوت و ئەوەستاو هەریز بەرەو پێشکەوتن نەئەڕۆیشت. بێگومان ئەمانەی کە وتران و زۆر شتی تر هەن کە نەوتراون، ئەوانە هەموو شتێکی ڕاست و ڕوون و ئاشکران، دەی کێ ئەمانەی دروست کرد؟

أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓۗ

---

**﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾ ئەمانـەی کـە وتـران لـە قـوڵایی دڵـدا جێگیرن، لـە ژیـان دا هەسـتیان پێدەکرێت، بەڵام خەڵکی لە بیریان ئەچێ و بێئاگا ئەبن لێی، وەك و ئەفەرموێ: ﴿قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾ زۆر کەم بیر ئەکەنەوەی یان هەر بیر ناکەنەوە، واتە ئەگەر بیرتان کردایەتەوە خوای خۆتانتان ئەناسی و چاو لە بەری ئەو هەموو بەهرە و چاکەی خوا ئەبوون و تەنها ئەوتان ئەپەرست و هاوبەشتان بۆ بڕیار نەئەدا. ئنجا چەند شتێکی تری ئاشکرایان ئەدا بە ناوچاودا و کـە پەیوەنـدی بـە ژیـانی خـەڵکی هەیـە و بـە چـاوی خۆیـشیان ئـەیان بیـنن، ئەفـەرموێت: ﴿أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ﴾ وازبێـنن لـەوەی کـە باسـکرا، ئـەی ئایـا کەسێك کە ڕێنموونیتان ئەکات لە تاریکیەکانی شەودا کاتێ ئەگەڕێن و سەفەر ئەکەن لە بەڕ و ووشکی و لە دەریادا ڕێنموونیتان ئەکات بە ئەستێرە و بە چەند نیشانە و دروشمی تر لە زەوی دا، ﴿وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓۗ﴾ کەسێك کـە بـا ئـەنێرێتو ڕەوانـەی ئـەکات بـە موژدە دەر لە پێش باران کە ڕەحمەتی خوایە بۆسەر بەندەکانی و ژیان لـە سـەر ئەوە ڕاگیرە، ئایا کەسێ کەئەمانە ئەکات چاکترە یان ئەو بتانەی کە ئێوە ئەیانکەن بەهاوبەشی خوا؟!! خەڵکی بەشێوەی گشتی و بەتایبەتی ئەو یەکەم تاقمە کە ئەم قورئانەی چوو بەگوێچکەدا سـەفەریان ئـەکرد و ئەگـەڕان بـەڕێگاو بیابانـدا، چ لـە بـەڕ و چ لـەدەریادا و ئەگەردروشـم و نیشانە یان نەبێ ڕێگا دەرناکەن، ون ئەن، بەتایبەتی لە شەوە تاریکەکاندا، دەی ئایا کێ ڕێنموونی یان ئەکات؟ کێ فێری ئەوە یان ئەکات کە بەهۆی ئەستێرە و ئەو نیشانەوە ڕێگا دەرکەن؟! ئایا کێ هێزی بیستن و بینینی داونەتێ تا بە هۆی ئەوەوە ڕەنگ و دەنگ وەرگرن؟ ئنجا کێ ئەو هێزی ژیریی یە یان پێ ئەدات تاسوود وەرگرن لە هێزە هەست کەرەکان و بتوانن بەراوردی شت بکەن؟ ئایا کێ ئەو بەهرەیانە ئەدات بەو خە ڵکە بێجگە لە خوا؟ ئەو هەموو بایە کەهەڵ ئەکات و گەردش ئەیات، ئیتر بەهۆی هەر شتێکەوە فەراهەم هاتبێ، ئایا کێ ئەی گێڕێ بە جۆرێ کەهەور هەڵ ئەگرێت و ئەیگێڕێ لەشوێنێك بۆ شوێنێکی ترو موژدەدەرە بەبارینی باران کە ژیانی لەسەر ڕاگیرە؟**

أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٦٣﴾ أَمَّن يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٦٤﴾

---

ئایا کێ ئەمانە ئەکات بێجگە لە خوا ﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ﴾ ئایا لە گەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی تر هەبە کەدەسەلاتی ببێت بە سەر ئەواندا؟! ﴿تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ خوایەك کەناوی ﴿الله﴾ یە پاك و بێ لەکە و بەرز و بڵندە لەوەی ئەو بت پەرستانە ئەیکەن بە هاوبەشی، بەرزو بڵندە خوای تواناو پەروەردگار لەهاوبەشی دروست کراوی بێ دەستەلاتی دەستەپاچە.

ئینجا دوای باسەکە ئەهێنێ یەپرسیارێك کەبۆ بەر لێ برینەوە و پەك خستنە، پرسیارێك لە بارەی دروست کردن و دووبارە کردنەوەیان و ڕۆزی دانانیان، ئەفەرموێ: ﴿أَمَّن يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾ ئایا کەسێك کەدروست کردنی داهێناو لە یەکەم جارەوە خەڵکی دروست کرد، لە پاشان دووبارەی ئەکاتەوە، ﴿وَمَن يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ کەسێ کەڕۆزی بەشتان ئەدات لە لایەن ئاسمان و ژوره وە، لەلایەن زەوی و لای خوارەوە، ئایا کەسێك کەئەمانە ئەکات چاکترە یان ئەو بتانەی کەهیچ شتێکیان پێ ناکرێت؟! پەیدا بوون و بەدیهێنانی خەڵکی لە یەکەم جارەوە شتێکی ئاشکرایە و وا بەپێش چاوەوە، هیچ کەسێك ناتوانێت دانی پیا نەنێت، ئەو پەیدا بوون وبەدی هاتنەش بەهیچ جۆر ناگونجێت بەبێ خوا یەکی تاك وتەنیا، دەهەر هەوڵ وتەقالایەك درا لە ڕێگای پچڕینی ئەم بونەوەر و خەڵکە لە خوای تاك وتەنیا هەموی سەری لە هیچەوە دەرچوو، لە هەموو بۆشێك بۆشتر بوو، هەرکەس بیەوێت خۆی بێ ئابڕو و شەرمەزار نەکات هەرگیز ناڵێت: ئەم بونەوەرە زۆر گرنگە بە هەموو یاسا و ڕژێمە نەگۆڕا و تێر و تەواوەوە کە بچوکترین پارچەو بەشی- چ جای هەمووی- هەموو زان و خاون ژیریی یەك سەرسام و سەرگەردان ئەکات، هیچ خاوەن ژیریی یە ك لەڕووی نایە بڵێ: ئەم شتە گرنگە لەخۆیەوە و بەڕێکەوت پەیدا بووە، بە ڵکو ئەبێت هەربڵێت: خوایە کی زانا ی بەدەسەلاتی لێزانی کارروست بەدی هێناوە، بێگومان ئەبێ تاك وتەنیاش بێت، ئەگینا کارەکە ئەشێوا بە

مل يەك دا، بەڵكو لەیەكەم جارەوە بەدی نە ئەهات. بوون وبەدی هاتنی یەكەم جار بەو جۆرە بو كەباس كرا، بەلاّم دووبارە كردنەوە لە كۆن و تازەوە دەمە دەمی ی تیدا كراوە و ئەشكرێت.. هەموو كەس بەرێكی دانی پیا نانێت وباوەڕی پێ ی نی یە، بەلاّم بە ناچاری دان نراو باوەڕ هێنرا بەدروست كردنی یەكەم جار ئەبێت باوەڕ بكرێت بە دووبارە كردنەوە، تا هەركەس بەرهەم و سەرەنجامی كردەوەی ئەم جیهانی ئێستا جێگای كردەوەیە، كردەوەش ئەوەتا دوو بەشە: چاكەو خراپە. بەپێ ی دادو لێزانی و كار دروستی خوایی پێویستە بونی پاداشت وتۆڵە، نەبوونیان دژو پێچەوانەی داد و بەرژەوەندی و كاردروستی یە، بێگومان ئەم جیهانە هەرچەند لەهەندێ كاتدا ئەندازەیە لەتۆڵە وپاداشتی تیا بەدی ئەكرێت، بەلاّم بەتەواوی بەدی نایەن. كەواتە پێویستی هاتنی جیهانێكی تر بۆئەو مەبەستە گرنگەیە، كەواتە دان نان و باوەڕ بەدروستكردنی یەكەم جار هۆی باوەڕ و دان نانە بەدووبارە كردنەوە، بەڵگەو نیشانەیەكی ڕوون و بەهێزە لەسەر ئەوەی كە داهێنەری ئەم خەڵكە ئەبێت دووبارە كەرەوەش بێت بۆیان، بەپێی خواهیش و مەیلی خۆی، جا لەبەر ئەوە دووبارە كەری هێنا بەدوای داهێنەرداو جووتی كرد لە گەڵی دا و هەردووكیانی كۆكردەوە لە پرسیارەكەدا و پێكەوە دانی بەناوچاوی بت پەرست و بێ بڕواكانداو فەرموی: ﴿أَمَّن يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾ وەكو لەپێشەوە باسكرا. ڕۆزی دانی بەندەكانی خوالەزەوی دا لەچەند شێوەیەكی جیاوازدا دەرئەكەوێت ئاشكرا تریان بۆ ئێمە كشتوكاڵ و درەخت ومالاّت و گیانلەبەرە و ئاو و هەوا، بۆ خۆراك و خواردنەوە و هەناسە ورگرتن و هەناسەدان،هەندێ لە ڕۆزی بریتی‌یە لەو هەموو شتە نایابانەی كە لە ناوسكی زەوی ولە ناو دەریاكاندا هەن، لە بارەی خۆراك و پۆشاك و چەند شتێكی تر كە سودی لێ وەردەگیرێت لە ژیاندا، هە ندێ تر بریتی یە لەو هەموو هێزە بە كار و سوود بەخشانە وەكو كارەبا و جۆرەها تیشك وچەندین هێزی تریش هەن هێشتا كەس نایان زانێت، جگە لە خوا، بەرە بەرە دەریان ئەخات بۆ بەندەكانی. ڕۆزی یان كە لە ئاسمان و لە لای سەرووە بۆیان دێت بۆ ئەم ژیانی ئێستا،

روناکی و گەرمی و باران و ئەو هێز و وزانەی کە خوا پێکی هێناوە بۆ ژیان بەسەر بردن لەم جیهانەدا، بۆ رۆژی دوایی ئەو هەموو بەخشایشە ئەیرژێنێت بەسەریان دا لە ئاسمانی لوتف و بەزەی خۆیەوە، لە ئایەتەکەدا باسی ئەم رۆزی یەی هێنا بەدوای باسی دروست کردن و دووبارە کردنەوەی بەندەکانی، چونکە رۆزی پەیوەندی بە تین و بە هێزی هەیە پێیانەوە، پەیوەندی ڕۆزی و زەوی بە دروست کردنیان لەم جیهان وزەوی یەدا شتێکی ئاشکرایە کە بە هۆی ئەوە ژیانیان ئەبێت و پەیوەندی بە دوبارە کردنیانەوە، لەو جیهان دا ئەمەیە خەڵکی لەو جیهان دا پاداشت و تۆڵەیان لەسەر ڕەفتار و کردەوەیانە لەم رۆژی یەی کەلەم جیهان پێ یان دراوە، هەروەها پەیوەندی ڕۆزی ئاسمان لەم جیهان ئەمەیە کە ژیانی لەسەر ڕاگیرە، هۆی پاداشت و تۆڵەی ئەو جیهانیشە، ئەمە نمونەیەك بوو لێرەدا باس کرا بۆ روون کردنەوەی ڕێك و پێکی و گونجاوی و پەیوەندی یەکە هەیە لە نێوان مەبەست و ڕستە و وشەکانی قورئاندا. دروست کردنی یەکەم جار و دووبارە کردنەوەی شتێکی راست و حەقیقەتە، هەروەها رۆزی ئاسمان و زەوی شتێکی راست و زانراوە، بەلاّم بت پەرست و بێ بڕواکان بێ ئاگا ئەبن لەم شتە راستانە، بە هۆی ئەوە وە قورئان ئەیان گرێتەوە بۆ لایان و بە شێوەی دەم کوت کردن و پەك خستن و بەر لێ برینەوە، ئەم پرسیارەیان ئاراستەئەکات و ئەفەرموێت:﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾ ئایا پەرستراوی تر هەیە لەگەڵ خوادا کە بتوانێ ئەم جۆرە کارانە بکات؟! تابکرێت بە هاوبەشی لە پەرستن دا؟! ئینجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە هەمتر بەریان لێببڕێتەوە، بەدوای هێنانی بەڵگە و ڕابەر لەسەر ئەوەی هاوبەش هەیە بۆ خوا و ئەوەی ئەوان ئەیلێن. ئە فەرموێ: ﴿قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێیان ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن کە ئەڵێن لەگەڵ خوادا خوایەکی تر هەیە دەی ڕابەرو بەڵگەتان بهێنن لەسەر ئەوەی ئەیلێن! ئیتر ڕابەر و بەڵگەی ژیری یان بیسترا و لە ئاینەکانی لەوە و بەر. بێگومان ئەوانە هیچ بەڵگە و نیشانەیەکیان بەدەستەوە نیە، توانا و دەسەلاّت دار نین بەسەر هیچ نیشانە و دروشمێك کە بوّنی ڕاستی باوەڕ و داواکەی ئەوانی لێ بێت، بەڵکو

بە پێچەوانەوە، ئەم بوونەوەرە فراوانە پڕە لە بەڵگە و ڕابەر و نیشانە لەسەر ناڕەوایی و بیجێیی ئەوەی ئەوان ئەیڵێن و باوەڕیان پێی هەیە، کەواتە داوای ڕابەر و بەڵگە لێ یان هەرچۆنێك بەر لێبڕینەوەی تیادایە و دەستەپاچەیی و بۆشی یان ڕوون ئەکاتەوە هەروەها لاقرتیان پێدەکات و نەفامیان دەرئەخات، چونکە عەقیدە و باوەڕ نابێت بنج و بناوانی نەبێ و لەسەر بۆش دامەزرێت! ئا بەم شێوە ڕوون و ڕەوان و ئاسانە قورئان ئەدوێ لەگەڵ هەموو دڵ و دەروون و جۆرە ژیرییەك دا، ئەکوڵێتەوە لە بارەی بیر و باوەڕەوە، ئەم بەڵگەو نیشانە ڕوونانە ئەخاتە پێش چاو لە چوارچێوەی ئەم بونەوەرە و ئەو شتانەی کە ئەبینرێن و هەستیان پێ ئەکرێت، بە جۆرێ ئەدوێو ئەکوڵێتەوەو دڵ و دەروون داگیر ئەکات، سروشت بێدار ئەکاتەوە، چڵك و ژەنگی لەسەر لائەبات، تا بەڕێگای ڕاستی خۆیدا بڕوات، هەست و سۆزو ویژدان ئەهێنێتەو سۆزو پەرۆش بەو شتە ڕاستانەی کە تێیدا دا چەقاوە، بەڵام پەردەی بێئاگایی و لەبیر چوون هاتووە بەسەریاندا، قورئان ڕێگایەکی داوەتە بەردەست نادات بۆ گیرو گرفت و دەمەدەمە تێیدا، بەهۆی ئەوەوە قورئان زاڵ و سەرکەوتووە و کار ئەکات لە هەموو جۆرە ئادەمییەك، مەگەر ئەوانەی کە بێبەشن لە تێگەشتن و ژیری، ئیتر ئەوانە وەك و بەرد و دار وان و وشك و ڕقوتەق و چار نەکراون. لەم کۆمەڵە ئایەتانەی کە ڕابوردن سەرنجی ڕاکێشا و گەردشی کرد بەدڵ و دەروون بەناو ئاسمانەکان و زەوی و چەند ناوچەیەك لە ناوچەکانیان، بۆ ڕوونکردنەوەی تەنیایی خوا بەبێ وێنەو هاوبەش، ڕوونی کردەوە کە دەسەڵات و توانینی تە واو تایبەتییە بەو خوای تاك و تەنهاوە، لەپاش ئەوەی‌ئنجا ئەوا سەرنج ڕائەکێشێت و گەردش ئەکات بە دڵ و دەروون لەبارەی غەیبەوە کە زانینی تایبەتییە بە خوای پەروەردگارەوە، کە دروست کەر و بەڕێوبەری هەموو شتو هەموو کارو بارێك،

﴿قُلۡ لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلۡمُهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّنۡهَا﴾

---

ئەفەرموێ پێغەمبەر(ﷺ) ﴿قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ بڵێ هەر کەس وا لەئاسمانەکان و زەوی دا لە مەلائیکە و جن و ئادەمی، هیچ کەس لەوانە غەیب نازانن، بەڵکو تەنها خوا غەیب دەزانێ، واتە هیچ کەس غەیب زان نی یە جگە لەخواو زانینی غەیب تایبەتییە تەنها بە خواوە، ئەم ئایەتە و ئەم باسە پێویستی هەیە بە ڕوونکردنەوە و لێکۆڵینەوە، چونکە چەند ڕای جیاوازی تێدایە و مەسەلەکە زۆر گرنگە لەبارەی عەقیدە و ئاین و باوەڕەوە، کەواتە با هەندێ درێژە بدەین بەم باسە: ووشەی غەیب لە زمانی عەرەبدا بە هەر شتێك ئەڵێن کە بە پێش چاوەوە نەبێت. لە زمانی شەرعدا بە دووجۆر بەکاردێت:

١- هەرشتێ نەبینرێ و هەستی پێنەکرێت لەبەرئەوەی پەیدا نەبووە هێشتا یان هەیە و بەلام نی یە لە چوارچێوەی هەست و بینین دا، ژیریش لە خۆیەوە هەستی پێناکات ئیتر ڕابەر و بەڵگە لەسەر بوونی ببێ یان نەو.

٢- هەرشتێك هەستی پێنەکرێت ژیریش لە خۆیەوە نەیزانێت، هیچ بەڵگەو نیشانەشنەبێت لەسەر بوونی.

جۆری یەکەم گشتی ترە، چونکە خوا سیفەتەکانی مەلائیکە و ڕۆژی دوایی و هەموو ڕووداوو بەسەرهاتەکانی ئەگرێتەوە کە هیچ جۆرە بەڵگە و نیشانە نییە لەسەر بونیان، وەك و ئەو هەموو بەسەرهات و ڕووداوانەی داهاتوو، ئەو شتانەی کە لە زانینی هیچ کەسدا نین و بەدڵی هیچ کەسدال نایەن و گوزەر ناکەن، بەس لە زانین و بڕیاری خوادا هەن، کە ئەوانەش نایەنە ژمارە، بەلام جۆری دووەم تەنها ئەم بەشەیان ئەگرێتەوە کە ڕابەر و نیشانەی نی یە لەسەر بوونیان.. یەکێك لەو شوێنانەی کە مەبەست لە وشەی غەیب تیای دا جۆری یەکەمە و شێوە گشتی یە کەیە، ئەوەیە کە لەسەرەتای سورەتی(البقرە) دا ئەفەرموێت ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾، هەروەرها لە سورەتی(الحشر) دا: ﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾. یەکێك لەو شوێنانەی کە مەبەست بە وشەی غەیب تیای دا جۆری دووەمە، ئایەتی سورەتی(الأنعام) ە کە ئەفەرموێت:

﴿وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ لَٱسْتَكْثَرْتُ مِنَ ٱلْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُ﴾[1] هەروەها لەو سورەتەدا: ﴿وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ﴾[2] ئەم جۆری دووەمە زانینی تایبەتی یە بە خوا وە و هیچ کەسی تر نایزانێت مەگەر بە ئاگادارکردنەوەی خوا بەسەر هەر ئەندازە و بەشێکی کە خوا خۆی مەیلی هەبێت، ئەویش تەنها بۆ پێغەمبەر و نێردراو ی خوا یان مەلائیکە وەکو لە دوادوایی سورەتی(الجن) ئەفەرموێت: ﴿عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا﴾[3] بە مانەش ناوتریٚ: غەیب زان، بەڵکو ئەوتریٚ: زانا کراون، یان ئاگادار کران بەسەر غەیب دا لەلایەن خواوە، ئیتر بەهەر جۆر و شێوەیەك کە خوا خۆی ئەزانیٚ و ئاگاداریان ئەکات، واتەزانینی ئەم جۆرە غەیبە بە هیچ جۆرە دەسەلاتی بەندەی تێدا نی یە، بە تێکۆشان و هەوڵی بەندە فەراهەم نایەت، چونکە وەکو وترا هیچ دروشم و نیشانەیەك نی یە لەسەری، هیچ هۆی فەراهەم هێنانی نی یە لەلای بەندەوە، بە وێنەی ئەو هەموو زانینی ترە کە بۆ بەندە فەراهەم دێت و خوا زانای ئەکات بەهۆی تێکۆشان و بەراورد کردن و تێڕوانین و بیرکردنەوە..

لەم باسەوە ڕوون بوەوە کە مەبەست لەو غەیبەی کە لەم ئایەتەدا زانینەکەی تایبەتی کردووە بە خواوە و ڕەوای نەداوە بۆ هیچ کەس، مەبەست لەو غەیبە بەشی دووەمی جۆری دووەمە، ئەگینا ئەوەتا ئەو هەموو غەیبی ترە کە ڕابەر و نیشانە هەیە لەسەریان بەندە ئەیانزانیٚ، وەکو بوونی خوا و تاك و تەنیایی و هەموو سیفەتەکانی تری، هەروەها بوونی مەلائیکە و پێغەمبەران و کتێبەکانی خوا و ڕۆژی دوایی، ئەگەر مەبەست پێی جۆری یەکەم و شێوەی یەکەم بێت ئەبێت بڵێن: مەبەست بەو زانینە کە تایبەت کراوە بە خواوە لەم ئایەتەدا زانینێکە کە هیچ هۆیەکی نەبێت، چونکە ئەو جۆرە زانینە تایبەتی یە بەخواوە، تەنها خوا زانینەکەی هیچ هۆیەکی نی یە، زاتی پاکی خۆی تەبێت، ئیتر بێجگە لەو زانینی هیچ کەسێکی تر بەبیٚ هۆ نابیٚ و دەست ناداتبەڵام نیاز و مەبەستی لادانە لە دیمەن و ڕواڵەتی

---

[1] واتە من غەیب زان نیم، ئەگەر غەیبم زانی بایە خێرو چاکەم بۆ خۆم زۆر دەکرد و ناخۆشی و سزا دووچارم نەئەبوو، دەی ئاشکرایە ئەو غەیبەی کە نەیزانیوە لەم جۆری دووەمەیە.

[2] واتە من ناڵێم پێتان غەیب ئەزانم، ئەمەش دیارە ئەو غەیبەی کە نی فەرموو پێیان ئەیزانم، لەم جۆرەیە کە وترا.

[3] واتە خوا زانای غەیبە، کەواتە هیچ کەس ئاگادار ناکات بەسەر غەیبە تایبەتییەکەی خۆیدا، مەگەر پێغەمبەر و نێرراوی خۆی کە خۆی هەڵیبژاردووە و ڕەزامەندی بووە لە ئاگادارکردنی بەسەر ئەو ئەندازەی کە شایان و پێویستە.

ئایەتەکەبەبێ پاڵ پێوەنەرێك، ئەوەش ناڕاست و ناڕەوایە. بێجگە لەوەش ئەگەر مەبەست لە زانینەکە ئەوەبیچێت ئەو کاتە تایبەتی نابێت بە غەیبەوە، بەڵکو زانینی خوا بۆ غەیب و غەیری غەیب بەبێ هۆیە و زانینی جگە لە خوا هەموو هۆی هەیە، کەواتە ئەبێت ووشەی غەیب زیاد بێت و لەوانەیە پێچەوانەی مەبەست نیشان بدات.

ئەگەر مەبەست بە وشەی غەیب جۆری یەکەم – شێوە گشتی یەکە – بێت ئەبێت یان بەم جۆرە بڵێین کە وتمان، یان ئەبێ بڵێین: مەبەست هەموو غەیبە، واتە هەرکەس وا لەئاسمانەکان و زەوی دا هەموو غەیب نازانێ، بەڵام خوا هەمووی ئەزانێ، ئەوکاتە وا نیشان ئەدات کە جگە لە خوا غەیب زان هەیە، دەی ناو بردنی جگە لە خوا بە غەیب زان ناڕەوایە و دروست نی یە لەشەرع دا بە پێی بڕیاری زانا و پێشەوایانی ئیسلام، چونکە ئەگەر مەبەست ئەوە بێت کە لەخۆیەوە و بەبێ هۆیەك غەیب زانە، ئەوە کوفرە بەلای هەموانەوە، لەبەرئەوە ئەو جۆرە زانینە تایبەتی یە بە خواوە و هەرشتێکیش تایبەتی بێ بە خواوە ڕەوا دانی بۆ هەرکەسێکی تر کوفرە بەبێ خیلاف، ئەگەر مەبەست ئەوە بێت کە بەسەر غەیبدا ئاگادار کراوە یان زانا کراوە، ئەوکاتە ئەبێ هەر بەم شێوە بوترێ و ناوببرێت، نابی بوترێت: غەیب زانە! یان غەیب ئەزانێ!چونکە ماناو مەبەستە ناڕەواکەی لێ وەرئەگیرێت، خۆ بێگومان پێویستە لە مجۆرە شوێنانەدا خۆپاراستن لە بەکارهێنانی هەر وشەیەك کە مانا و مەبەستی ناڕەوا بگەیەنێت، بۆ وینەی یەکێ بڵێ خوا غەیب نازانێت، مەبەستی ئەو بێت کە هیچ شتێك بۆ خوا غەیب نی یە، بەڵکو ئەوەی کە ناوئەبرێت بە غەیب بۆ ئێمە بەلای ئێمەوە ناوئەبرێت، ئەم ڕستەیە هەرچەند بەو نیازەوە ڕاستە، بەڵام بەکارهێنانی قەدەغەیە و ناڕەوایە، چونکە دیمەن و ڕواڵەتەکەی ناڕاست و ناڕەوایە ڕەحمەت و ڕەزای خوا برژێت بەسەر ئیمانی ڕەبانی دا کە زۆر بەتوندی ئەدوێ لەو کەسەی کە ڕستەیە بەکارئەهێنێ و ئابرووی بۆ ناهێڵێتەوە، هەروەهازانایان بێزاریان دەربڕیوە دژی ئەو کەسەن کە ئەم سێ ڕستەیە بەکار ئەهێنێ بە شێوەی مەتەڵ: بێزارم لە حەق و خۆشم ناوێ و فیتنەم خۆش ئەوێت، خۆم لە ڕەحمەت لائەدەم و لێ ی ڕائەکەم، مەبەستی بە حەق مردنە و بە فیتنە ماڵ و ئەولادە، بە ڕەحمەت باران.

لەم لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەدا دەرئەکەوێت کە مانا و مەبەستی ڕێك و ڕوون بێت و پێویستی نەبێت بە پینە و پەڕۆ، ئەوە بوو کە وتمان: مەبەست بە وشەی غەیب لەم ئایەتەدا جۆری دووەمە وەکو ئەم حەدیسەش دەست نیشانی بۆئەکات کە بوخاری و موسلیم و ترمزی و نەسائی و ئەحمەد و کۆمەڵێ تر ئەیگێڕنەوە لە مەسروقەوە کە دایکی ئیمانداران عائیشە ئەفەرموێت: ﴿مَن زَعَمَ ان محمد(ﷺ) يَعلَمُ ما في الغَد او يَخبرُ الناس بما في الغد فَقَد اعظم الفرية على الله، والله تَعالى يقولُ: قُل لا يعلَمُ من فى السماوات و الأرض الغَيب إلا الله﴾ [1] ئینجا بەم جۆرە غەیبە کە زانیینی تایبەتی بە خواوە، خوا پێغەمبەرانی ئاگادار کردووە بەسەر ئەندازە و بەشێکدا ئایا بێجگە لەوان کەسی تر لە خواناسان ئاگادار دەکرێت، یان ئەو ئاگادار کردنە تایبەتی یە بە پێغەمبەرانەوە؟! کوڕ و جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە تایبەتی یە بە پێغەمبەرانەوە، لەبەر ڕواڵەت و دیمەنی بەهێزی ئایەتی دوای سورەتی ﴿الجن﴾ کە لەمەوبەر هێنامان و لەپەراوێزەوە ڕاڤەمان کرد، بێگومان ڕابەرو وبەڵگەکەیان زۆربەهێزە، ئەوەتا ئاگادارکردنەکەی کورت هەڵهێناوە لە ڕەسول دا، ڕەسولیش لە زمانی شەرعداو هەروەها بەپێ عورف وعادەت نێنراو و ڕەوانە کراوی خوایە کەبە وەحی فەرمان لەخواوە وەرئەگیرێت بۆڕاگەیاندنی بەخەڵك، کەواتە پیاوچاك و خواناسەکانی تر ناگرێتەوە بەهیچ کلۆجی، هەر تەئویل وپینەو پەڕۆیەك بکرێ لەم ئایەتەدا بۆ ئەو مەبەستە بێ جێ یە وناڕەوایە ولەشەرع دانرخی نی یە.

ئەمە ڕای کوڕ و جەماوەر بوو بەڕابەر ە بەڵگە کانیانەو کەلام وایە بەرگری ناکرێت و ملە جەڕێ ناکرێت اە ئاستی، لەگەڵ ئیەوەدا کۆمەڵێ هەن ئەفەرموون: دروستە بۆ خواناسانی تریش کە پێیان ئەوترێت ئەولیاو ئاگادارکردنیان بەسەر هەندێ غەیب دا، لەسەر ئەو بنەڕەتە کەسێك ئیددیعای زاینی غەیب بکات لە ڕووداوێك دا، ئەو کەسە کافر نابێت، یەکێك لە کۆمەڵە شێخی ئیبن و لحەجەر لە کتێبی(بیان قواطع اللإسلام) دا، بەڵام خواپادشتی ئەمیش و ئەوانی تریش بداتەوە، ئایا چۆن شتی وایان ڕەوا داوە لەگەڵبوونی ئەم ئایەتەدا

---

[1] هەرکەس بڵێ: کە محمد غەیب زانە و ڕووداوی داهاتوو ئەزانێ، یان هەواڵی داهاتوو ئەدات بە خەڵکی ئەوکەسە درۆیەکی زۆر زل ئەکات بەدەمی خواوە لەبارەی خواوە، ئەوەتا خوا ئەفەرموێ: بڵێ: هەرکەس والە ئاسمانەکان و زەوی دا غەیب نازانێت، بەڵکو تەنها خوا غەیب ئەزانێت.

کە تێپەڕی کرد: ﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا ٢٦ إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ﴾ بەڵێ بەڵگەو ڕابەریان لەسەر ڕابەرەکان ئەمەیە کە شێخ لە کتێبی ناوبراودا فەرمویەتی: زۆر لەو پیاو چاکانە هەواڵی غەیبیان لێ بیستراوە و بینراوە. بەڵام بەڕاستی سەر سوڕ ئەمێنێ کە ئەو زانا بەرزانە چۆن پشت ئەبەستن بە بەڵگەی ئاوا لاواز لە مەسەلەی ئاوا گرنگ دا، کە پەیوەندی بە عەقیدە و ئیمانەوە هەیە؟!! بەڵێ ڕاستە ئەو جۆرە شتە غەیبیانە بینراوە و بیستراوە لە زۆر لە پیاو هەڵکەوتووەکانی ئەم ئوممەتەدا، تاڕادەیەك نایەنە ژمارە، ئەو شتانە ناو ئەبرێن کەشف و ئیلهام و فەراسەت و هەموو گومانێکی بەهێزن و هیچیان ناگەنە ڕادەی زانین و یەقین، کە ئاژاوە و دووبەرەکی و قسە وباسەکە لەوەدایە لەوەدایە، ئەگەر ئوانە ڕادە و پلەی زانین و یەقین دا بوونایە دەستیان نەئەدا بۆ گۆڕان و هەڵە، بێگومان دەست ئەدەن هەر بە پێ ی فەرموودەی ئەو پیاوە گیەورانە کە ئەفەرموون:﴿الخطا الكشفي الإجتهادي﴾[1] هەروەها بە فەرموودەی ئەوانە خۆیان بە ئیلهام و فەراسەتیان ناو بردوون نەك بەزانین و یەقین. بۆ نموونە: گرنگترین ڕووداوی بەناوبانگی جێنشینی دووەمە کەلەسەر مینبەری مزگەوتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بانگی کردە سەرۆکی لەشکری ئیسلام لە نەهاوەند و فەرمووی:﴿يا سارية الجبل!!﴾ ئەوە بوو پاش لێ بوونەوە لە وتارەکەی پرسیاریان لێ کرد ئەوە چی بوو وتت؟! ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: وا کەوتە دڵمەوە، کە ئەوە پێی ئەوترێ: ئیلهام. هەروەها ئەگێڕنەوە جارێکیان ئەبو ززەڕی غەفاری چوو بۆ خزمەت جێنشینی سێیەم لە ڕێگا چاوی هەڵتەقا بە ئافەرەتێك دا و ئنجا گەشتە لایی و پێی فەرموو: ئەبوزەڕ بۆنی زینا لە چاوت دێت. ئەویش گومانی وابوو ئیدیعای زانینی غەیب دەکات، زانینی ئەو جۆرە غەیبانە ئەبێ خوا وەحی سروشتی پێ بکات، وەحی سروشیش بە پێغەمبەران ئەبێت. لەبەر ئەوە بە بێزاری وتی: اوحی بعد محمد؟ ئایا لەپێش محمد(ﷺ) وەحی خوا ئەبێت؟! جێنشین فەرمووی: نەوەڵڵا، بەڵام ئەمە ژیری و فەراسەتێکی ئیمانداره!! ئەوەی کە ئەکەوێتە دڵ خواناسان ئەگەر لە ڕادەی زانین و یەقین دا بوایە باش ئەناسرا و جیا ئەکرایەوە لەوەی کە شەیتان ئەیخاتە دڵ و نەئەشێوا لەکەس لەگەڵ ئەوەدا بەباشی ناناسرێن و جیا ناکرێنەوە

---

[1] واتە کەشف و کەرامەت دا هەڵەیە، بە وێنەی هەڵەی إجتهادی موجتەهیدەکان.

لەیەکتر و مەترسی لێ شێوان و لێ گۆڕانی لێنەکرێت. شیخی شەعرانی لە کتێبی تەبەقاتیدا ئەفەرموێ لە باسی شێخی گەیلانی دا: پرسیار کرا لە شێخ ئایا ئەوەی کە ئەکەوێتە دڵ بەچی جیا بکرێتەوە کە ئەوە لەلایەن خواوە یە نەك لەلایەن شەیتانەوە؟ ئەویش بەجۆرێچك وەڵام ئەداتەوە وەك بفەرمێ: نازانم!! بەس ئەفەرموێ: نازانم!! بەس ئەفەرموێ: ئەوەی لەلایەن خواوە بێت هەموو کات ڕوو نادات بەپێ ی داوا و ئارەزووە بەندە. بەڵام ئەوەی لەلایەن شەیتانەوە ڕوو بکاتە دڵ هەمیشە بە پێ ی داوا و ئارەزووی بەندە پەیدا ئەبێت..

کورتە و پاڵفتەی ئەم باس و مەسەلەیە ئەمەیە:

١- هەرشتێکی غەیبی کە بەڵگە و نیشانەی لەسەر بێت ڕابوردوو بێت یان هینی ئێستا یان لە داهاتوو دا پەیدا ببێ زانینی ئەم جۆرە غەیبانە تایبەتی یە بە خواوە هیچ کەسی تر تەنانەت پێغەمبەرانیش -سەلامی خوایان لەسەر بێت- لە خۆیانەوە بە هەوڵ و تێکۆشانی خۆیان نایزانن و ناگونجێ و دەست نادا بیزانن، هەرکەس بڵێ ئەیزانم یان فلان ئەیزانێ، ئەو کەسە کافر ئەبێ، چونکە هاوبەش بۆ خوا ڕەوا ئەدات لەیەکێ لە سیفەتەکانیدا.

٢- خوا هەندێ لە بەندەکانی ئاگادار کردووە بەسەر ئەندازەیەك لەم غەیبانە، بە پێی بەرژەوەندی و پێویستی یەکی خوا خۆی زانیویەتی، ئەو بەندەیانەش فرستادە و نێردراوی خوان، واتە بەس پێغەمبەرەکان، هەرکەس لای وابێ و بڵێ: کەسی تریش ئاگادار ئەکرێت ئەو کەسە ئەگەر بەهەزار حاڵ و پینە و پەڕۆ کافر نەبێ و حوکمی پێویست حاکمی شەرع تەمێ ی بکات و ئابڕووی ببات.

٣- لەم جۆرە غەیبانە دروستە لە خەودا یا بە شێوەی کەشف و ئیلهام و کەرامەت بخرێنە دڵی خواناسانەوە بێجگە لە پێغەمبەران، زۆر وزە بەندە ڕوویشی داوە، بەڵام ئەو پیشاندان و خستنە ڕووە ناگاتە پلەی زانین و یەقین، لەبەر ئەوەشە بەو ناوە تایبەتی یانە ناوبراون:(کەشف، ئیلهام،...هتد) تا ئەوانە بەزانینی غەیب نەزانرێن و خاوەنەکانی بە غەیب زان نەناسرێن و ناو نەبرێت، بەڵام بەداخەوە زۆر کەس زیادە ڕەوی ئەکەن و خستنە دڵە بەزانین دائەنێن و ئەڵێن: بەخوا فلان ئەزانێ و ئاگادارە بەم

هـەموو نیـاز و خەتـەرە و کاروبارێکـت!! پێویـستە ئیمانـداران زیـادەڕەوی نەکـەن و ئاگایان لە خۆیان بێت و لە سنووری شەرع دەرنەچن و تێپەڕ نەکەن.

ئەم باسەهەرچەند ئەندازەیە درێژەم پێدا، بەڵام پێویست بوو، ئەوەی نووسیومە لام وایە ڕاستەوخۆ ڕێ ی لە ڕاست و ڕەوا خستووم، ئەمانە قسەی خۆم نین، بەڵکو لەسەرچاوەی زۆر باوەڕپێکراو وەرمگرتوون، هەموو سەرچاوەکانی تەفسیرەکەم وچەند سەرچاوەیەکی تر بە تایبـەتی. بـەس چـەند شـتێکی تـر ماوەتـەوە و لێکۆڵینـەوەی ئـەوانیش پێویستە بـۆ ئەمـەی نەکرێن بەگری و ئیشکال لەلایەن نەزانەوە، ئەوانیش بریتین لـە هەواڵدانی ئەوانـەی ڕیـازەت گرن لە موسوڵمان و لە کافر، هەروەها ئەسێرەگێران و نجوم گەڕان، بەتایبەتی ناسینی کاتی مـانگ و ڕۆژگیران، ئەمانە و چـەند شـتێکی تـر دوا دوایـی سـورەتی(لقمـان) بە یارمـەتی خـوا لەوێ بەدرێژی لێ ی ئەکۆڵمەوە، کەواتە لێرەدا بەس بێت و بگەڕێمەوە بۆ سەر ئایەتەکان.

لە پاش ئەوە زانینی غەیبی بە شێوەی گشتی تایبەتی کرد بە خواوە ڕەوای نەدا بۆ هیچ کەسێکی تر، ئنجا باسی زیندوو بوونەوە و ڕۆژی دوایی ئەکات، کە غـەیبێکی تایبـەتی یە و زۆر گرنگە لەبارەی ئایین و باوەڕەوە و ئاژاوە و دووبـەرەکیێ ی لەسـەرە، ئنجا با بگەڕێینـەوە بـۆ سـەر ئایەتەکـە تیـای دا بە تونـدی لەگـەڵ بـت پەرسـتەکان دا، ئەفـەرموێ: ﴿وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ﴾ ئەو بێ باوەڕیانە هەست ناکەن چ کاتێك زیندوو ئەکرێنەوە، واتە نـەزان و بـێ ئاگـان لەو کاتە بەڵێن پێ دراوە لە پێش هاتن و ڕوودانی دا، کاتێکیش نزیك کەوتـەوە بە هیچ جۆر هەست ناکەن پێ ی، چونکە ئەوکاتە و هاتنی لەو غەیبانەیە کە هیچ کەس لەئاسمان و زەوی دا نایزانێ. ئنجا لەوە واز ئەهێنێ بۆ ئەمەی باسی هەڵوێستیان بکات لـەبارەی ئـەو ڕۆژەوە و ڕادەی زانینیان پێ ی، ئەفەرموێ:﴿ بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلۡمُهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ ﴾ زانینـی ئەوانە دوایـی هـاتووە لە سنووری خۆی وەستاوە و کەم و کورتە لەوەی بکات پێ ی و بیزانن. ئنجا ئەگوزەرێنێتـەوە بـۆ بـارێ تـری خراپتریـان:﴿بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّنۡهَاۖ﴾ واتـە ئـەوە لێگـەڕێ کـە کاتەکـەی نـازانن چاوەڕوانی ڕوودانی ناکەن، ئەوان وان لـە دوو دڵـی و سـەرگەردانی یـەکی گـەورەدا لـەبارەی ئەو ڕۆژە و بەدی هاتنی یەوە، ئایا بەدی دێت یان نا؟!

بَلۡ هُم مِّنۡهَا عَمُونَ ﴿٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبٗا وَءَابَآؤُنَآ أَئِنَّا لَمُخۡرَجُونَ ﴿٦٧﴾ لَقَدۡ
وُعِدۡنَا هَٰذَا نَحۡنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبۡلُ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾

ئنجا لەویشەوە ئەیگوێزێتەوە بۆ بارێکی خراپتر لەو دووبارەی کە ڕابوورد: ﴿بَلۡ هُم مِّنۡهَا عَمُونَ﴾ ئەوانە کوێرن لە بارەی ئەو ڕۆژەوە!! و چاوی دڵیان سمە سای لێ بڕاوەلە ینینی هەر ڕابەر و نیشانەیەك کە بیانگەیەنێت بە حەق و ڕاستی!! ئەو بێ باوەڕانە لە کۆن و تازەوە لە بارەی باوەڕ نەکردنیان بە زیندوو بوونەوە تەنها شتێکیان گرتووە بە دەستەوە، ئە بووە بە قۆرت و گرێ لە ڕێگای باوەڕ نەهێنانیان دا، ئەوەش ئەمە بوو: کە ئەم لەشە لە گۆڕدا ئەڕزێ و ئەبێ بە خۆڵ، دەی ئەو خۆڵە چۆن وەکو خۆی و ئەوسای لێ دێتەوە و گیانی دێتەوە؟!! وەکو بۆمان ئەگێڕێتەوە لەو بێباوەڕانە: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبٗا وَءَابَآؤُنَآ أَئِنَّا لَمُخۡرَجُونَ﴾ واتە ئەو بێ باوەڕانە وتویانە و ئەڵێن: ئایا کاتێ ئێمە و باو باپیرانمان بووین بە خۆڵ، ئایا ئێمە تازە گیانمان ئەکرێتەوە بە بەردا و بە زیندوویی کراوی لە گۆڕەکانمان دەرئەهێنرێین؟ ئەوانە ئەوەیان وتووە و ئەیڵێن، ئەوە بووە بە بەرهەڵست لەمەی تێ بگەن و ڕەوای ژیانی تر بدەن لە پاش ئەم ژیانی ئێستا، ئەوانە لەبیریان نی یە و بیر ناکەنەوە کە ئەوانە دروست کران لەیەکەم جارەوە لە کاتێك دا کە لەوە و پێش هیچ نەبوون، ئەو هەموو سێڵ زیانەی کە لەش و قەبارەی یەکەم جاری پێکهات، هیچ کەس نازانێ جگە لە خوا لەکوێ بوون؟! چۆن هاتن و کۆبوونەوە؟!! بێگومان ئەوانە لە کاتی خۆی دا پرژ و بڵاو بوون لە ناو زەوی و بێخی ئاوی دەریاکان و لای سەرو ئاسمانەوە، بەم ڕەنگە هەندێکیان لە خۆڵی ئەم زەوی یەوە هات، هەندێکی تر لەو خۆرە دوورەوە هاتووە، هەندێکی تریان لە ئاو و هەوا و کەسەرەکیانیانەوە هاتوە و بەشێکیان ئەوە بوو یا ئادەمی یە یان سەوزە و ڕواوی یان ماڵات یان گیان لەبەرێ بە هەناسە هەڵی ژیوە، بەشێکی تر لە شێکی ڕزیوە وە دەرچووە و بووە بە هەڵم و بڵاو بووەتەوە بە ناو هەوادا!! ئنجا ئەو هەموو سێڵ و خانەیە دەرئەکەون لە ناو خۆراك و خواردەمەنی یە کە ئادەمی یەکان ئەیخۆن و ئەیخۆنەوە، لە هەڵم و هەوایەك دا کە هەڵی

ئەمژن، لە تیشك و ڕووناکی یەك کە خۆیانی پێ گەرم ئەکەنەوە، ئنجا هەموو شتە جیاوازەکە کە تەنها خوا ژمارەیان ز سەرچاوەیان ئەزانێت، هەموو ئەوانە کۆ ئەبنەوە لە قەبارەی ئادەمی یەك دا، کەلە منداڵ دا بەرەبەرە پەرە ئەسێنێ و گەورە ئەبێ، هەتا ئەبێ بە ئادەمییەك و ئەژی لەم جیهانەدا و تا ئەمرێ و ئەخرێتە گۆڕەوە، دەی ئەو بێ باوەڕانە کە ئەو قسە بێ جێ یە ئەکەن و سەریان سوڕ ئەمێنێ لە زیندوو بوونەوە، شتێکی ئاشکرایە لە یەکەم جارەوەبەو شێوەیە فەراهەم دێن، کەواتە بۆ ئەبێ بیر نەکەنەوە لە دروست کردنی یەکەم جار، بۆ ئەبێ سەریان سوڕ نەمێنێ لەیەکەم جار هەر سەر بکەنەوە لە دووەم جار و دووبارەکردنەوە؟!! بەڕاستی زۆر جێگای سەرسوڕمانە هەرکەس ئەوەندە نەفام بێت کە دووبارە کردنەوە بە نەگونجاو دابنێ؟!! ئەو بێ بڕوایانە تەنها بەو قسە ناڕەوایەوە نەوەستان، بەڵکو دەم درێژی یان ئەکرد بە بێزاری دەربڕین و لاقرتی کردن و ئەیانوت:﴿ لَقَدْ وُعِدْنَا هَٰذَا نَحْنُ وَآبَاؤُنَا مِن قَبْلُ ﴾سوێند بەخوا بەڵێن و هەڕەشەی ئەم زیندووکردنەوەمان لێکراوە – لەخۆمان و لە باو و باپیرمان – لەمەو پێش، واتە هەڕەشە کراوە لە ئێچمە لەلایەن محمدەوە و لە پێش ئەمیشەوە ئەم بەڵێنو هەڕەشەیە کراوە لە باوك و باپیرمان، دەی ئەوەتا هیچ نەبوو!! کەواتە شتەکە ڕاست نی یە!! ﴿إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴾ ئەم بەڵێن و هەڕەشەیەی کە محمد ئەیکات هیچ نی یە جگە درۆ و دەلەسەی گەلە پێووەکان کە نوسراوەتەوە، لەپاش ئەوان بە جێ ماوە و ئەمیش ئەیگێڕێتەوە!! ئەو نەفامانە بێ ئاگا بوون لەوە کە ئەو ڕۆژی دوایی و زیندوو بوونەوە کاتی تایبەتی دیاری کراوی خۆی هەیە، هیچ کەس جگە لەخوا زیندووبونەوە کاتی تایبەتی دیاری کراوی خۆی هەیە، هیچ کەس جگە لە خوا ئەو کاتە نازانێ، بەپەلە نانەوە هیچ کەس پێش ناکەوێت، بە داوا و چاوەڕوانی هیچ کەس دواناکەوێت، بەڵکو ئەبێ هەر لەو کاتی دیاری کراوەدا بەدی بێت. ئنجا لێرەدا دەستێك ئەدات لە دڵیان و سەرنجیان ڕائەکێشێ بۆ دواوە بۆ لای ئەو گەلە بێ بڕوایانە کە ئەوانیش گاڵتەیان لێ ئەهات و لاقرتی یان ئەکرد بە بەڵێن و هەڕەشەی پێغەمبەرەکانیان. سەرنجیان ڕائەکێشێ بۆ لایان کە چۆن خوا لەڕیشەی هێنان و بەربادی کردن بە هۆی بڕوانەکردنیان،

**ئەفەرموێ: ﴿قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: بڕۆن بگەڕێن بە زەوی و وڵاتان دا ئنجا سەرنج بدەن بزانن چۆن بوو دواڕۆژی تاوانبارەکان، واتە ئەو وڵاتە وێران کراوانە بەناوبانگن و دروشم و شوێنەواری وێران کردنیان هەیە، با لەوەوە تەمێ خوار بن، چونکە ئەو تاوانبارانە ئەوەیان بەسەر هێنرا لە تۆڵەی بێ بڕوایی و تاوانەکانیان، کەواتە با بترسن و تەمێ خوار بن، چونکە باو و ڕشەوشی خوا گۆڕانی بۆ نی یە، لەدوای ئەوە فەرمانی دا ئەو تەمێ یەیان ئاڕاستە بکات، ئنجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر کە نائومێد بێ لێ یان و دەستیان لێ بشوات و لێ یان گەڕێ با دووژاری پاشە ڕۆژی سەخت و سامناکی خۆیان بن، بە وێنەی تاوانبارە ڕابردووەکان، هیچ داخیان بۆ نەخوات و دڵ غەمگین نەبێ لەسەریان، چونکە ئەم هەڵساوە بە پێویستی سەرشانی خۆی بەرامبەر ئەوان و ئەوەی پێویست بێت پێ ی ڕایگەیاندون و ڕێنموونی کردوون، ئەفەرموێ ﴿وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُن فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ﴾ غەمبار و دڵ غەمگین مەبە لەسەر ئەوانە کە نایەنە سەر ڕێگای ڕاست و سوور و کوڵ نەدەرن لە کوفر و بێ باوەڕیی، لە تەنگی دا مەبە و تەنگە تا وەمەبە لە پیلان و نیازی خراپەیان دەربارەت. لەم فەرموودەوە وەرئەگیرێت سۆز و بەزەیی تینی پێغەمبەر(ﷺ) کە تا چ ڕادەیەك داخ و دووری چەشتووە لە سەر دووچار بوونیان بە وێنەی سزا و بەدبەختی یەك کە دووچاری گەلە سیاچارەکانی ڕابردوو بوو، هەروەها وەرئەگیرێ بە تینی پیلان و کردەوەی خراپیان دەربارەی خۆی و ئاینەکەی و ئیمانداران تا ڕادەیەك ئەو دڵە فراوان و گەورەیەی پێ تەنگ هات و تەنگە تاو بوو، ئنجا هەمیتر ووتەیەکی تری نالەبارەیان باس ئەکات کە ئەیان وت لەبارەی زیندوو بوونەوە و هەڕەشە لێ کردنیان بە سزای ئەم جیهان،**

وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٧١﴾ قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ ٱلَّذِى
تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ

ئەفەرمویٚ: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەوانە ئەڵێن: ئایا کەی ئەم بەڵێن و هەڕەشەیە دێت؟! ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن!! ئەو نەفامانە بە گاڵتە و لاقرتی یەوە ئەو دەم درێژی یە یان ئەکرد هەرکاتیٚ بترسێنرایەن بە وێنەی سزای ئەو وڵات و شوێنانەی کە بەناوبانگ بوون بە دەورە خۆیان دا بوون و هەموو جاریٚ لە هاتوو چۆی گەشت و سەفەرەکانیان دا ڕائەبوردنبە لایان دا و شوێنەواری وێران کردنیان بەچاوی خۆیان ئەبینی، ئەوانەش کە بیتی بوون لە شارەکانی گەلەکەی لوط و سەمود لە حیجزدا، جێگای و شوێنی عاد لە ئەحقاف، جێگا و شوێنی سبأ لەیەمەن دا، جا وەرە سەرنجی ئەو کەلە ڕەقی و کەلە بۆشی یە بدە، لەباتی سام و بیم دڵی دابگرتنایە و موچرکە بە لەشیان بهاتایە، کەچی گاڵتەیان لیٚ ئەهات و لاقرتی یان ئەکرد تا دووچاری سزای هەردوو جیهان بوون، ئەوە بوو لە بەدردا بە کافری کوژران، خوا پەنامان بدات لە نەفامی و نەزانی. ئنجا لێرەدا فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە وەڵام و بەرپەرچیان بداتەوە و بەچەند وشەیەکی کورت کە وێنە و تارمایی سزایە کە ئەخاتە دڵ کە چاوەرشوانی بەدی هاتنی ئەکریٚ، هەروەها شێوەی لاقرتی پیٚ کردنێکی ترسێنەر، فەرمووی: ﴿قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ ٱلَّذِى تَسْتَعْجِلُونَ﴾[1] بڵیٚ پیٚ یان: بێگومان هەندیٚ لەو سزای کە ئێوە پەلەی لیٚ ئەکەن دواتان کەوتووە و پێتان ئەگات.ئەوەتا لە بەدردا پیٚ یان گەیشت، بێگومان ئەوی تریشیان پیٚ ئەگات لە ڕۆژی دوایی دا، چونکە ئەوانە بە کافری ڕۆیشتن: ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ بە ڕاستی خوای تۆ خاوەن فەزڵ و لوتفە، ئەو لوتف و فەزڵەش ئاشکرایە لە دواخستنی سزای ئەوانە و موڵەت دانیان لە کاتێکدا کە چەند تاوانباریشن، بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ لای خوا و بکەونە سەر ڕێگا ڕاستەکەی،

---

[1] وشەی(لعل، عسی، سوف) لەلایەن پادشایانەوە مەبەست چاوەڕوانی و دوو دڵی نی یە بەڵکو بۆ جەزم و دڵنیا بین، بەڵام ئەو وشەیە ئەیڵێن بۆ دەربڕینی دامەزراوی و پەیە نەکردنیان، چونکە هەڕەشە لیٚ کراون لەدەست دەرناچن، ئەوەندە جیٚ ی باوەڕن بە بەڵێنیشیان وەکو بەدی هاتوو وایە، جا ئەم وشانە لە قورئان دا بەو جۆرە هاتوون، لەبەر ئەوە بەو جۆرە تەفسیرم کردەوە.

وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَعۡلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمۡ وَمَا يُعۡلِنُونَ ﴿٧٤﴾ وَمَا مِنۡ غَآئِبَةٍ فِي
ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٍ ﴿٧٥﴾

---

﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَشۡكُرُونَ﴾ بەلاّم زۆربەی ئەوانە سوپاس ناکەن، چونکە بیر ناکەنەوە و نرخی ئەو چاکە و بەهرەیەی خوا نازانن، بەڵکو پەلە پەل ئەنێنەوە بە هاتنی سزا و بەدی هاتنی ئەو هەڕەشەی لیٚ یان کراوە. ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَعۡلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمۡ وَمَا يُعۡلِنُونَ﴾ بێگومان خوای تۆ ئاگادارە و ئەزانێت بەو دوژمنایەتی و کینە بەری یەی هەیانە دەربارەی تۆ و ئاینەکەت و لە دەروونیان دا پێچ ئەخوات و دڵیان دایشاردووە و دەری نابڕێت، زانایانە بەوەی دەری ئەبڕن و نایشارنەوە، کەواتە موّڵەت دراون وە نەبیٚ قوتار بن و لەدەست دەرچن، بەڵکو لێپرسینەوەیان ئەبیٚ لەسەر هەموو کردەوەکانیان، ئنجا باسەکە دوایی ئەهێنیٚ بە دڵنیاکردن لەسەر ئاگاداری خوا و زانینی تێر و تەواوی، کە هیچ شاراوە و پۆشیدەیەکی لیٚ وننابێت نەلەئاسمان و نەلەزەوی دا ئەفەرمویٚ: ﴿وَمَا مِنۡ غَآئِبَةٍ فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٍ﴾[1] هیچ شتێکی نادیاریی زۆر شاراوە نی یە لە ئاسمان و زەوی دا مەگەر وا لەکتێبی ڕوون دا، واتە ﴿لوح المحفوظ﴾ یان عیلمی بیٚ سەرەتا و و بیٚ پەیی خوا، با بیر و خەیاڵ و بڕوا و بخولێتەوە بەم زەوی و ئاسمانە فراوانەدا و گەردش بکات بە شوێنی ئەو هەموو شتانەدا کە نابینرێن و نین بە پێش چاوەوە، لە هەرشتیٚ و لەهەر نهێنی یەك و لەهەر هێزیٚ و لە هەر هەواڵیٚ کە هەموو بەستراون بە زانینی خواوە و تەنها یەکیٚ نابێت و ون نابێت و ناشارڕێتەوە، پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگارە زانایەیە، ئنجا بە بۆنەی باسی زانینی بیٚ پەی و نەبڕاوە و بەرگری نەکراوی خوا، بەو بۆنەیەوە باسی وتە و بڕیارە ڕاست و بڕاوەکانی قورئان ئەکات کە هاتنە خوارەوە لە بارەی ئەو مەسەلانەی کە ئیسرائیلی یەکان لە نێوان خۆیان دا ئاژاوە و دووبەرەکی یان بوو تیٚ یان دا، ئەوەش لەو بارەوە کە ئەو وتە و بڕیارانە بەشێکن لە زانراوەکانی خوا، و نمونەیەك بوون لە فەزڵ و لوتفی خوا دەربارەی ئەوانەی دووبەرە بوون، تا ئەوەش ببیٚ بە دڵنەوایی و دڵخۆشی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەمەی لیٚ یان گەڕیٚ بۆ خوا، دواترین بڕیاری خۆی بدات لە نێوان ئەم و ئەوان دا،

---

[1] ئەم وشەیە وەکو وشەی(خافیە) وایە، هەردوو یان سیفەتن یان ئیسمیەتیان زاڵ کراوە. پیتی(ت) بۆ زیادە ڕەوی یە، یان هەر گواستراونەتەوە بۆ ئیسمێتی و(ت) بۆ گواستنەوەیە.

﴿إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَكۡثَرَ ٱلَّذِي هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ٧٦ وَإِنَّهُۥ لَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٧٧﴾

**ئەفەرموێ:** ﴿إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَكۡثَرَ ٱلَّذِي هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ﴾ **بەڕاستی ئەم قورئانە باس ئەكات و ئەخوێنێتەوە بەسەر نەوەكانی ئیسرائیل دا باری ڕاست و حەقیانەت لە زۆربەی ئەو باس و مەسەلانەی كە ئەوان لە نێوان خۆیان دا ڕاو بیریان و بڕیاریان جیاوازە و ئاژاوە و دووبەرەكی ئەكەن تییان دا. نەسرانیەكا دوو بەرەكی بوون و ئاژاوەیان بوون لە عیسا پێغەمبەر و دایكی دا -درودی خوا لەسەریان بێت- كۆمەڵێ ئەیان وت: عیسا ئادەمی یەكی ڕووتە، كۆمەڵێ تر ئەیان وت: خوا پێك هاتووە لە سێ شت(اب، إبن، روح القدس) إبن عیسایە و اب كە خوایە و لە ڕادەو پلەی بەرزی هاتە خوارەوە بۆ سەرزەوی لە شێوەی روح القدس دا، ئنجا لەش و قەبارەی ئادەمی وەرگرت لە مەریەم دا و لە شێوەی عیسادا لەدایك بوو!! كۆمەڵێ تر ئەیان وت: إبن ئەزەلی نی یە و بێ سەرەتا نابێت، بەڵكو دروستكراوە لە پێش ئەم جیهانەوە، لەبەر ئەوە ڕادە و پلەی لە اب نزمترە و مل كەچە بۆی!! كۆمەڵێ تر دانیان بەوە نەئەنا كە روح القدس جەوهەر بێت. كۆنگرەی نەبقییەی ٣٢٥ ی زاینی و كۆنگرەی قوستەنتەنیەی ٣٨١ ی زاینی بڕیاریان دا إبن روح القدس یەكسانن بۆ(اب) لە یەكێتی خوایی یان(إبن) ئەزەلی و بێ سەرەتا لە(اب) پەیدا بووە، روح القدس هەڵقوڵا لە(اب) ەوە و كۆنگرەی‌تەلی تەلەی ساڵی ٥٨٩ ی زاینی بڕیاریان دا كە روح القدس لە إبن یش هەڵقوڵاوە!! جا لەبەر ئەوە كەنیسەی ڕۆژهەلات كە كەنیسەی ڕۆژئاوا لەم خاڵەدا جیا بوونەوە و هەمیشە دووبەرەكی و ئاژاوە بووە و هەیە لە نێوانیان دا. ئنجا قورئان هات قسە و بڕیاری ڕێك و ڕوون ڕەوان گونجاوی خۆی كرد كە عیسا ئادەمی یە و بەندەی خوای تاك و تەنیا یە، لە مەریەم پەیدا بووە بە بێ باوك و خوا كرد بە پێغەمبەر بۆ سەر ئیسرائیلی**

یەکان.. هتد. لەبارەی و لە سێدارەدانی چەند ڕای جیاوازیان هەیە و چەند تاقم و بەرەیەکن: تاقمێ ئەڵێن: درا لە سێدارە هەتا مردوو، ئینجا خرایە گۆڕ و لە پاش سێ ڕۆژ لە گۆڕەکەی هاتە دەرەوە و بەرز بوویەوە بۆ ئاسمان. تاقمێ تر ئەڵێن: بە هوذا یەکێك بوو لە هاوەڵە تایبەتی یەکانی ڕاست نەبوو لەگەڵی و ئەو دەست نیشانی کردە لای جوولەکەکان بۆی، ئینجا شێوەی عیسا بەسەر ئەودا کشاو درا لەسێدارە. کۆمەڵێ تریان ئەڵێن: شێوەی بەسەر(سیمون) ناوێك دا کشا و لەباتی ئەو لەسێدارە درا. ئنجا قورئان هەواڵەڕاستەقینەکەی لەم بارەیەشەوە داو فەرمووی: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ﴾و فەرمووی: ﴿يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ﴾ جوولەکە دەستیان خستبووە تەورات و یاساکانی خوایان گۆڕیبوو، ئنجا قورئان هات شێوە ڕاستەکەی تەوراتی دەرخست و فەرمووی ﴿أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ﴾قورئان هەواڵەڕاستەکەی پێ گەیاندن لەبارەی خۆیان و پێغەمبەرەکانیان بەبێ تێکەڵ کردنیبەو هەموو شتە پڕ و پووچەی کەلە گێڕانەوەی خۆیان دا بوو، بەچەند جۆر و شێوەیەك کە خۆشیان تیای دا یەك بار و یەك ڕا نەبوون، بەشێوەیەك پاکی و بێگەردی پێغەمبەرەکانی نیشان دا لەو هەموو چڵك و چەپەڵیەی کە ئەو ڕوو ڕەشانە پێغەمبەرەکانی خۆیانیان پێ لەکەدار کردبوو، بە جۆرێ هیچ کامیان ە پاك دەرنەکردبوون، ئێستاش ئەو شتە پیسانە هەر ماوەتەوە لایان و پیاو شەرمەزار ئەبێت لە باسکردن و گێڕاوەیان!! بۆ نمونە: ئبراهیمی خەلیل(سڵاوی خوای لەسەر بێت) کە باوکی هەموو پێغەمبەرانی دوای خۆیەتی و ڕێزدارە لای هەموو خواناسێك و هەموو سەلاوات ئەدەن لە دیداری پاکی. دەربارەی ئەم زاتە پاکە ئەڵێن: کە خێزانی خۆی داوە بە پادشای فەلەستین و پادشای میسر بەناو ئەوەوە کە خوشکی یەتی بۆ ئەوەی چاو لەبەری بن و سودێکی لێ یانەوە دەست کەوێت!! دەك هەزار بار نەفرینی خواتان لێ بێت بۆ ئەو دەلەسە پیسەی بەدەمتان هاتووە. قورئانی بە فەڕ هات

لاپەڕەی پاك و خاوێنی ئەو پێغەمبەرانەی دەرخست، بەڕاستی ئەم هەواڵە ڕاستانە ی قورئان و ەدروچ خستنەوەی ئیسرائیلی یەکان بە خۆیان و ئەو مێژووە ناڕاست و ستەمکارانەیانەوە کە هەڵیان بەست بۆ پێغەمبەرەکانیان. بەڕاستی ئەوە موعجیزەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرا بوو، چونکە ئەگەر لەلایەن خواوە ئەم هەواڵە ڕاستانە نەهات، ئایا کەسێکی نەخوێندە و دوور لە خوێنەدوار و زانین ئەم هەواڵە ڕاستانەی لەکوێ وەرگرت، کە بەبێ ترس ە بیم بیدا بەناوچاوی ئەو هەموو زانای ئیسرائیلی یانەدا، ئەوانیش هیچ ڕێگای تەك و جم و پەل کوتانیان نەمێنێ؟!! جا سەیر ئەمەبوو ئەم قورئانە گەورەیە کە زانا و دوژمنەکانی میللەتەکانی تر لە ئاستی دەستە پاچە و داماو بوون، بت پەرستە نەفام و نەخوێندەوارەکانی مەککە و دەورو بەری دانیان پیا نەئەنا و دەمبازی دەربارەی ئەکرد!!

قورئان بەو جۆرە ڕاستی پێغەمبەرەکانی خوا و کتێبەکانی ڕوون ئەکاتەوە: ﴿وَإِنَّهُۥ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ بەڕاستی ڕێنمونی یە بۆ ئیمانداران، ئەیانپارێزێت لە گومڕایی و دووبەرەکی و یەك بەرنامەیان بۆ دائەنێت، ڕێگایان بۆ دیاری ئەکات، ڕەحمەتە بۆیان، بەرهەڵستی دوو دڵی و بێ ئارامی و سەرگەردانی یان لێ ئەکات، ئنجا بەرهەڵستی سزای ڕۆژی دوایی یان لێ ئەکات. بێگومان قورئان هۆی ڕێنمونی و هۆی ڕەحمەتە بۆ هەموو کەس، بەڵام تەنها ئیمانداران و ئەوانەی ئامادەن بۆ ئیمان سوودی لێ وەرئەگرن، لەبەر ئەوە تایبەتی کرد بە ئیماندارانەوە کە ئیماندارانی ئیسرائیلی یەکانی ئەو چەرخەش ئەگرێتەوە. بەرنامەیەك کە قورئان هیچنای تاقانەیە بۆ زیندوو کردنەوەی دڵ و دەروون، ڕێك و پێك کردنی لەگەڵ ڕەوشتی سروشتی پاك و خاوێن دا بەئاسانی و بێ پێچ و قۆرت و گرێ، بەڵکو بە سووك و ئاسان و گونجاو لەگەڵ باو و یاسای ئەو بوونەوەرەی تیای دا ئەژی، بەهۆی ئەوەوە ئارامی و ئاشتی ئەخاتە نێوان بەندە و دڵ و دەروونی، نێوان گەل و ئەندامی گەل و هەموو ئادەمی و هەرچی وا لەم بوونەوەرەدا.

﴿إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُم بِحُكْمِهِۦۚ﴾[1] بەڕاستی خوا بڕیار ئەدات لەنێوان ئەو ئیسرائیلی یانە کە باس کران بە بڕیارە ناسراوەکەی خۆی کە بریتی یە لە بڕیاری داد و ڕاستی کە جگە لەوە بڕیاری تری نی یە، ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ﴾ تەنها ئەو زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و ئەوپەڕی ڕادە زانایە بە هەموو شتێك، کەواتە هیچ بڕیارێکی بەرگری ناکرێت، بەپەچ نادرێتەوە، هەموو بڕیارێکی پاك و بێگەردە لە هیچ هەڵە و هیچ لەکەیەك، کەواتە تۆڵ ئەسێنێ لە تاوانیاران و پاداشتی چاکان و پاکان ئەداتەوە. ئنجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە پشت ببەستێ بە خوای خۆی، ئەفەرموێ: ﴿فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِۖ﴾ واتە خوای تۆ زانا و لێزان و کاردروست و دەسەڵات دارە بەسەر هەموو شتێك دا، کەواتە پشت ببەستە لەسەر خوا و هەموو کار و فەرمانت حەواڵەی ئەو بکە و گوێت نەبێت لە دوژمنایەتی ئەوانە، ﴿إِنَّكَ عَلَى ٱلْحَقِّ ٱلْمُبِينِ﴾ چونکە تۆ لەسەر ئاینێکی ڕاست و ڕوونی، یان ڕوون کەرەوە جیا کەرەوەی حەق و بەتاڵ و خاوەنەکانیانەوە، واتە کە تۆ بەو جۆرە بیت دڵنیا بە کە خوا یارمەتیت ئەدات ز کۆمەکیت ئەکات. بەو فەرمان و فەرموودە یە دڵخۆشی پێغەمبەر ئەداتەوە و دڵنەوایی ئەکات لەسەر کێشی و باوەڕ نەهێنانی گەلەکەی، لەپاش ئەو هەموو هەوڵ و تێکۆشان و ئامۆژگاری یە گرنگەی کە بەکاری هێنا لەگەڵیان، لە پاش ئەوەی بەو قورئانە گەورەیە لەگەڵیان دوا، ئەمجار هەمیتر لەسەر ئەو دڵنەوایی یە ئەڕوات بەمەی باوەڕ نەهێنانی ئەوانە هیچ سووچێکی ئەمی تیا نی یە، چونکە ئەم بەبێ کەم و کوڕی ئەوەی پێویست کراوە لەسەری بە جێ ی هێناوە لە ڕێنموونی ئەو مل هوڕانەدا، بەڵکو سوچەکە لە خۆیانەوەیە کە وەك مردوو و کەڕ و کوێر وان.

---

[1] ئەو ڕاناوە هەڵئەگرێ بگەڕێتەوە بۆ ئیمان داران و کافران، دەست ئەدا بگەڕێتەوە بۆ گەلەکەی لەگەڵ خۆی دا، خوا خۆی باش ئەزانێ..

﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْاْ مُدْبِرِينَ ﴿٨٠﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِي ٱلْعُمْيِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ
إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨١﴾ ۞ وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ
ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴿٨٢﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ تۆ ڕێنموونی و بانگ کردنت نا بیسێنیٚ بە مردووەکان ﴿وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْاْ مُدْبِرِينَ﴾ تـۆ بـانگ کردنـت نابیـسێنیٚ بەوانـەی کـە کـەڕن، کـاتیٚ ڕوو وەرگێڕن لیٚت و بڕۆن لـەلات ببـە پـشت تـیٚ کردنـەوە ﴿وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِي ٱلْعُمْيِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ﴾ تۆنیت بەڕێگا نیشاندەری لایاندەی لە گومڕایی و ڕێگا لادانیان، واتـە ئەوانـە وەکو مـردوو و کـەڕ و کوێر وان، بانگ کردن و ڕێنموونی تۆ هەست پیٚ ناکەن و نابیستن، بە وێنەی کوێرن دەسگیر و ڕێگـا پیـشاندەری خۆیـان نـابینن! بەڕاسـتی هـەر بـە قورئـان ئەکـەویٚ گەیانـدنی مانـا و مەبەست بە وێنە ووتاریٚ کە بەباشی بچەقێتە دڵەوە و بە چاکی وەرگیرێت، با سەرنج بدەین لێرەدا سیٚ وێنەئەهێنێتەوە بۆ ئەو کۆمەڵە سەرکەشە و لە نەفامی و بیٚ مێشکی و کەودەنیان دا پیشان ئەدات، جارێك لەشێوەی مردووان کە وا پێغەمبەر(ﷺ) بانگیان ئەکات و ئەوانیش بانگەکە نابیستن، چونکە مردوو هەستی نی یە! جارێکی تر وێنە و شێوەی کەڕان دا پشت بکەنە بانگ کەر، چونکە کە ڕ نابیسێتیٚ بە تایبەتی لـە کـاتی پـشت تـیٚ کردنـدا، جارێکـی تـر پیشان ئەدات لە وێنەی کوێران دا کە هەمیشەیی بن لە کوێری یەکەیان دا، چونکە کوێر هیچ نابینیٚ!! لەبەرامبـەر ئـەو مـردوو و کـەڕ و کوێرانـەوە ئیمانـدار ئـەمێنیٚ، کەواتـە تـەنها ئـەمان زینـدوون، ئـەمان بینـەر و بیـسەرن، ئەفـەرمویٚ: ﴿إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ لـە نێـوان بـیٚ باوەڕان دا تۆ ڕێنمونی و بانگی خۆت نابیسی بە هیچ کەس جگە لەوانەی کە دڵیان ئامادەیـە بـۆ وەرگرتنـی ئـاین و بەڵگـە و نیـشانە ڕوونـەکانی خـوا کـە بـەهۆی گیـان و هێـزی بیـستن و بینینـەوە وەری ئـەگرن، نیشانەی گیـان لەبـەریی زانـین و هەسـت کردنـە، نیشانەی بیستن و بینین سوود وەرگرتنە بە بیستراو و بینراو، ئەوانە سوود وەرئەگرن بەهۆی گیـان و بیـستن و بینینەکەیانـەوە، کـار و فرمـانی پێغەمبـەر(ﷺ) لـەو بارەیـەوە ڕاگەیانـدن و بـە گـویٚ دا دان و ڕێنموونی و نیشان دانە و ئیتر ئەوانە مل کەچ ئەبن و باوەڕ ئەهێنن، وەکو ئەفەرمویٚ: ﴿فَهُم مُّسْلِمُونَ﴾چونکە ئەوان هەمیشە مل کەچن بۆ هەق، یا ڕاستن لەگـەڵ خـودا و خۆیـان یـەك بـار**

و یەك تەن ئەكەن بۆ خوا.. ئنجا بە جوانی ئەزانم ئەندازەیەك بدوێم لەبارەی بیستن و نەبیستنی مردووان بۆ گفت و گۆ و وتاری زیندووان، زانایانی ئیسلام لەم مەسەلەیەدا دوو تاقمن:

(كەمالی ئیبن ئەلهەمام) كەلەزانایانی حەنەفی یە ئەفەرموێ: زۆربەی زانا بەرزەكانی ئێمە لەسەر ئەوەن كە نابیسن، لەبەر ئەوە ڕایان نی یە لەسەر تەلقینی مردوو، ئەڵێن ئەگەر كەسێ سوێند بخوات قسە لەگەڵ كەس ناكات و لەپاشان بە مردوویی قسەی لەگەڵ بكات سوێندەكەی ماكەوێ.(سەفارینی) لە كتێبی ناوبراوی خۆی دا بە(الحور الذاخرة) ئەیگێڕێتەوە: كە دایكی ئیمانداران عائشە -خوای لێ ڕازی بێت- لەسەر نەبیستنە، كۆمەڵێ لە زانایان شوێنی ئەو كەوتوون لەوەدا.(قازی ئەبو علی) كەلەگەورەكانی زانایانی حەنبەلی یە لەكتێبی(الجمع الكبیر) ی خۆی دا ئەم ڕایەی بەلاوە بەهێزە، ڕابەری ئەم تاقمە دیمەن و ڕواڵەتی ئەم ئایەتەی ئێرەیە: ﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ﴾ و ئایەتی: ﴿وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ﴾ چەند كۆمەڵێكی تر لەسەر ئەوەن كە ئەبیستن و بیستنیان هەیە لە هەندێ كات دا(ئیبن عبد البر) ئەفەرموێ: زۆربەی زانایانی ئوممەت لەسەر ئەم ڕایەن.(إبن جریر و تەبەری و إبن قوتەیبە) و چەند تر ئەم ڕایەیان هەڵبژاردووە، بەڵگەی ئەمانیش چەند حەدیسێكە كەلەكتێبە باوەڕپێكراوەكان دا هەیە، یەكێ لەوانە حەدیسێكە كەلە صەحیحی بوخاری و موسلیم دا هەیە، لە ئەنەس و ئەویش لە ئەبو تەلحەوە -خوا لێ یان ڕازی بێت- كە ئەبو طڵحة ئەفەرموێ: كاتێ ڕۆژی بەدر ڕووی دا پێغەمبەر(ﷺ) زاڵ بوو بەسەر بت پەرستەكان دا، فەرمانی دا بەمە بیست و ئەوەندە كەس بە سەرۆكەكانی كە كوژرابوون، لاشەكانیان بخەنە ناو بیرێك لە بیرەكانی بەدر پێغەمبەر یەكە یەكە بانگی لێكرد: ئەی ئەبو جەهلی كوڕی هاشم، ئەی ئومەیەی كوڕی خەلەف، ئەی عوتبەی كوڕی ڕەبیعی، ئایا ئەو هەڕەشەی كە خوا لێی كردن بەدی نەهات و دەستتان نەكەوت كە بەڕاست دەرچوو ز بێگومان ئەو بەڵێنە دای بە من بەدی هات و دەستم كەوت بەڕاست!! ئنجا عومەری فاروق -خوای لێ ڕازی بێت- وتی: ئەی پێغەمبەری خوا: ئەوانەی تۆ قسەیان لەگەڵ ئەكەیت لاشەیەكی بێگیانن! ئەویش فەرموی سوێند بە كەسێ كە گیانی منی بەدەستە ئێوە بیسندەتر نین لەوانە بۆ ئەوەی من ئەیڵێم. لە ڕیوایەتی موسلیم دا ئەمەشی فەرمو: بەڵام ناتوانن وەڵام بدەنەوە! یەكێ تر لەو حەدیسانە ئەمەیە كە(بەیهەقی و حاكم) ئەیهێنن لە ئەبو هورەیرەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) كاتێ گەڕایەوە لە ئوحود وەستا بەسەر موصعبی كوڕی عومەیر و هاوڕێكانی یەوە و فەرمووی: من شایەتی

ئەدەم کە ئێوە زیندوون بەلای خواوە، کەواتە زیارەتیان بکەن و سەلامیان لیٚ بکەن، چونکە سوێند بیٚ بە کەسیٚ گیانی منی بەدەستە هەرکەس سەلامیان لیٚ بکات تا ڕۆژی دوایی ئەمان وەڵامی ئەدەنەوە. یەکیٚ تر لەوانە حەدیسێکە کە لە بوخاری و موسلیم دا هەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەندە هەرکات خرایە گۆڕ و هاوڕێکانی گەڕانەوە بێگومان ئەو مردووە تەقەی پێڵاوەکانیان ئەبیستیٚ!! هەروەها چەند حەدیسێکی تر هەیە لەم بارەیەوە.

لەنێوان ئەم دوو تاقمەدا بە درێژیی لێکۆڵینەوە ڕووی داوە، هەرکام لەبارەی بەهێز کردنی ڕای خۆی و ڕابەر و بەڵگە کەی و بیٚ هێزکردنی ئەو بارەکەی بەرامبەری، وەکو بەدرێژی باس کراوە لەهەندیٚ لە کتێبەکان دا و پێویست نی یە بەو باس و لێکۆڵینەوە لێرەدا، چونکە هیچ کار و بارێکی ئیسلام نەبەستراوە بە هیچ کام لەم دووبارەیەوە، مەسەلەکە ئیجتهادی یە و هەرکام لەم دوو ڕایە کۆمەڵیٚ لە زانا و موجتەهدی لەسەرە، کەواتە با سەرنجی ئەم مەسەلە بدریٚ وەکو هەموو مەسە ئیجتیهادی یانەی تر و هیچ نەکریٚ بە هۆی دووبەرەکی و ئاژاوە، باهیچ کەس لایەنگیر نەبێت بۆ هیچ کام لەم دوو ڕایە بە بیٚ جیٚ و ناڕەوا، ڕووی سوور دانەگیرسیٚ و ڕەگی ملی بەرز نەبێتەوە لەسەر هیچ کام، بەڵکو ئەگەر زانا و خوێندەوار بایر بکاتەوە لە ڕابەر و نیشانەی هەردوو، هەرکامی بەدڵ بوو و دڵنیا بوو لەسەری ئەو بارەیان بگرێت و ئیتر نەیکات بە هەرا و بەزم، هەرکەس زانا و خوێندەوار نی یە، دەی بۆ خۆی لیٚ ی دانیشیٚ، چونکە لە خۆیەوە مافی بەربەرەکانیٚ و دەمەدەمیٚ ی نی یە.

لەو ئایەتە ڕابوردوو وانەدا بەچەند ڕابەر و نیشانەیەك زانین و دەسەڵاتی خوای ڕوون کردەوە، ئنجا شیاوی و گونجاوی زیندوو بونەوەی کرد، پاشان چەند نیشانەی ڕوونی هێنایەوە لەسەر ئەوەی کە قورئان موعجیزەیە، بەهۆی ئەوەوە ڕوون بوو وەوە کە پێغەمبەر(ﷺ)ڕاستە، کەواتە هەواڵی غەیبیەکانی قورئان وپێغەمبەر(ﷺ) ڕاست و لەبارەی زیندوو کردنەوە و ڕۆژی دوایی و حیساب و پرسیار و تۆڵە و پاداشتەوە کە ئەوانەش هەموو نازانرێن لەلایەن قورئان و پێغەمبەرەوە نەبیٚ، ئنجا بەو بۆ نەوە باسی چەند شتێك ئەکات کە پێشڕەوی ئەو ڕۆژەن و لەسەرەتایەوە ڕوو ئەدەن. سەرەتا و نیشانەی نزیکی ئەو ڕۆژە زۆرن، یەکێك لەوانە پەیدابوونی گیان لەبەرێکە کە بەناوبانگە ﴿دابة الأرض﴾ گفت گۆ ئەکات لەگەڵ خەڵك دا و خەڵك لیٚ ی تیٚ ئەگەن و ئەزانن کە ئەوە موعجیزەیە کە خوا پیشانیان ئەدات و نیشانەیە لەسەر نزیکی ڕۆژی دوایی. باسی پەیدا بوونی ئەم گیان لەبەرە لەگەڵ حەدیس دا هەیە و هەندێکیان سەحیحن، لەو حەدیسە سەحیحانەدا هیچ باسی نا و

نیشان و چۆنیەتی ئەو گیانلەبەرەیان تیا نی یە، بەڵکو سیفەت و ناو و نیشانی لەچەند حەدیسێکدا هەیە کە نەگەشتونەتەڕادەی حەدیسی سەحیح. لەبەر ئەوە هەروا بەسەری دا تێپەڕئەبین بەبێ باس و بڕیاری ئەو ئێوە و سیفەت و نا و نیشانە، ئەمەمان بەسە بوەستین لە سنووری ئایەتەکە و ئەو حەدیسە سەحیحانەدا، کە پەیدا بوونی ئەو گیانلەبەرە نیشانەی نزیکی هاتنی ڕۆژی دوایی یە، لەو کاتەدا ئیتر تازە تۆبە و گەڕانەوە لەکەس وەرناگیرێت، هەرکەس لەوە و بەر باوەڕی نەهێنا بێ، ئەوانەی تا ئەو کاتە باوەڕیان نەهێنا بێ، بەو جۆرە ئەمێننەوە و بڕیاری ئەو بارە یان لەسەر ئەدرێ کە وان لەسەری، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ﴾ کاتێ نزیک کەوتەوە بەدی هاتنی ڕۆژی دوایی و سەرەتاکانی سزایەك کە بەڵێن و هەڕەشە یان پێ کراوە -لەئایەتە تایبەتی یەکان دا- لە بێ بڕواکان، لەو کاتەدا ﴿أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ﴾ لەو کاتەدا بۆیان دەر ئەهێنین لە زەوی گیان لەبەرێکی گرنگ ﴿تُكَلِّمُهُمْ﴾ گفت و گۆیان لەگەڵ ئەکات و بۆیان باس ئەکات کە ﴿أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ﴾ خەڵکی -واتە بێ بڕواکان- لەوە و بەر باوەڕیان نەئەهێنا بە ئایەتەکانی ئێمە، کە ئەو هەواڵ و دەنگ و باس و بەڵێن و هەڕەشەیان تیا بوو، ئەو ئایەتەتانەی کە بەڵگە و ڕابەرێکی ڕوون بوون و یەکێك لەو بەڵگە ڕوونانە دەرهاتن و پەیدا بوونی ئەو گیانلەبەرانە بوو کە هەواڵیان پێدا و ئەوەتالەو کاتەدا ئاشکرا ئەبێت و تازە ڕێگای باوەڕ هێنان ئەبەسترێ و قاپی گەڕانەوە دائەخرێ، کەواتە گفت و گۆ و قسە و اسە تەشەرێکی ئێجگار بەهێزە وتیرێکی ژەهراوی یە ئەکرێ بە بەنۆکەی دڵی بێ بڕواکان دا [1] لەو سەردەمەدا. ئنجا لە باسی ئەم نیشانە ڕوونەوە کە بەڵگەیە لەسەر نزیکی هاتنی ڕۆژی دوایی تێپەڕ ئەکات و ئەگوێزرێتەوە بۆ باسی شێوەیەك لە شێوەکانی مردوو زیندوو کردنەوە و کۆکردنەوەیان، لەم باسەدا یەکوردتی بەسەرهاتێکی بێ بڕواکان ئەهێنێ و ئەیخاتە پێش چاو،

---

[1] لەم ئایەتەدا چەند ڕایەك هەیە، و چەن جۆرێك تەفسیر کراوە، پێویست ناکات بە باس کردنیان چەنکە لە زۆر کتێبەکان دا بەدرێژی ئەو ڕاو تەفسیرانە هەن، لەناو ئەو هەموو ڕاو تەفسیرانەدا ئەمەی کەلە تەفسیرەکەدا هەڵم بژارد بە بەهێز تری ئەزانم، زانینی تەواو لای خوایە.

وَيَوۡمَ نَحۡشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٖ فَوۡجٗا مِّمَّن يُكَذِّبُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُمۡ يُوزَعُونَ ﴿٨٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُو قَالَ أَكَذَّبۡتُم بِـَٔايَٰتِي وَلَمۡ تُحِيطُواْ بِهَا عِلۡمًا أَمَّاذَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٨٤﴾

ئەفەرموێ: ﴿وَيَوۡمَ نَحۡشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٖ فَوۡجٗا مِّمَّن يُكَذِّبُ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئەو ڕۆژە بکە کە ئێمە کۆ ئەکەینەوە لەهەموو گەلو میللەتێك پۆلێکی زۆر لەوانەی کەباوەڕیان نی یە بە ئایەتەکانی ئێمەو بەدرۆیان ئەزانن، ئیتر ئەم پۆل وکۆمەڵە هەموو بێ بڕواکانی میلەتەکان بن یان تاقمێ بن لە سەرۆك و زۆرداران کە خەڵکی تر شوێنیان کەوتبن، بەهەرکام مەبەست بێت ئەمە کۆکردنەوەیەکی تایبەتی یە لەپاش زیندووکردنەوە و کۆکردنەوەی گشتی، ئەوهەموو بێ بڕوایانە لەهەمووگەل وئومەتی پێغەمبەران پێکەوە ڕاگیر ئەکرێن ﴿فَهُمۡ يُوزَعُونَ﴾ ئینجا پێشووەکانیان بەند ئەکەین هەتا دوای یەکانیان ئەگاتە بەرەوە و دواو بەریان یەك ئەگرێ! بەو جۆرە ڕوانە ئەکرێن و هەموو تاقمێ ڕاگیر ئەکرێت ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُو﴾ هەتا هەموو دێن بۆ ئەو مۆڵگا و شوێنی وەستانەی کە دیاریی کراوە بۆیان، لەوێ دا: ﴿قَالَ﴾ خوا ئەفەرموێ پێیان: ﴿أَكَذَّبۡتُم بِـَٔايَٰتِي﴾ ئایا ئێوە بڕواتان نەبوو بە ئایەتەکانی من کە ئەیترساندن لەمرۆژەو شایەت بوون لەسەر ڕاستی هاتنی ئەم رۆژەی کە تێ ی کەوتوون؟!! ﴿وَلَمۡ تُحِيطُواْ بِهَا عِلۡمًا﴾ لەکاتێکدا هیچ زانا نەبوو بەو ئایەتانە، کەچی بە دەلەسەتان دانان وباوەڕتان پێ نەهێنان، واتەئەوپەری نەفامی یەکە لەخۆتانەوە دەمتان ئەکوتا و بێ بڕوا ئەبوون بەو ئایەتانە، ﴿أَمَّاذَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾[1] ئەی ئایاچیتان کرد بەو ئایەتانە؟! واتە لەبارەی ئەو ئایەتانەوە ئێوە هیچ کردەوەیەکی ترتان نەبوو جگە لەباوەڕنەهێنان و بە درۆخستنەوەی کە ئەوەش تاوانێکی زۆر گەورەبوو، کردەوەیەکی ئێجگار ناڕەوا بوو نەئەبوو شتی وابیوایە، مەبەست لەم پرسیارانە شەرمەزارکردن و ئابڕووبردن و پەك خستنە، کەواتە وەڵامیان نی یەجگە لەبێ دەنگ بوون و زمان بەستران،

---

[1] بەپێ ی تەفسیرەکە وشەی ﴿ أم ﴾ بەمانا ﴿ بل ﴾ ە و بۆ گواستنەوەیە لە تەشەردانێکەوە بۆ تەشەردانێکی تر لە بێ باوەڕەکان، بەم جۆرە دوو شێوە پرسیار هەیە لەئایەتەکەدا، ئەگونجێ وشەی ﴿ أم ﴾ منقطعة نەبێ وەکو لە تەفسیرەکەدا وتراوە بەڵکو متصلە بێت، ئەوکاتە ماوتا ئەبێت بۆ پرسیار لێ کراوی پێشو بە هەردوو ئە بن بە پرسیارێك.

وَوَقَعَ ٱلۡقَوۡلُ عَلَيۡهِم بِمَا ظَلَمُواْ فَهُمۡ لَا يَنطِقُونَ ﴿٨٥﴾ أَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا جَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ لِيَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ
مُبۡصِرًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٨٦﴾ وَيَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي
ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۚ وَكُلٌّ أَتَوۡهُ دَٰخِرِينَ ﴿٨٧﴾

---

ئاڕاستەکردنی ئەم جۆرە پرسیارە بە وێنەی شتێکی زۆر قورس و گران ئەکەوێ بەسەریاندا وهەناسەیان لێ ئەچنێ ودەم ئەبەستێ: ﴿وَوَقَعَ ٱلۡقَوۡلُ عَلَيۡهِم بِمَا ظَلَمُواْ فَهُمۡ لَا يَنطِقُونَ﴾ بڕیاردانی سزادان و سووتاندنیان بەسەردا جێگیر ئەبێ بەهۆی ستەمکاری یانەوە کە بریتی یەلە بێ بڕوای و بەدرۆخستنەوەی ئایەتەکانی خو، کەواتە گۆیان ئەبەسترێ وهیچ نالێن وهیچ عوزروبیانوویەك ناهێننەوە، هیچ قسەو بیانوویەکیشیان نی یە تابیکەن وبیلێن بەخوا، خواپەنامان بدات بەبەزەیی یە بێ سنورەکەی خۆی-امین-. لەپاش نیشاندانی ئەم شێوە سامناکەی بێ بڕواکان کە بەسەریان دێت و دووچاری ئەبن بەماتەمینی وسەرگەردانی و نائومێدی لەڕۆژی دوایدا، لەپاش ئەوە ئینجا ئەگوێزێتەوە و دێتەوە بۆ ئەم جیهان، سەرنج ڕائەکێشی بۆتەماشاکردنی پێشانگایەك لەپێشانگاکان کەشایانە دەروونو ویژدانیان بێدار بکاتەوە،بانگیان بکات بۆبیرکردنەوە لە ڕژێمە نایابە نەگۆڕاوەکەی ئەم بوونەوەرەو بیخاتە دەروونیانەوە کە پەروەردگارێ هەیە کە چاودێری یان ئەکات و هۆی ژیان و ئارامی یان بۆ فەراهەم ئەهێنێ، ئەم بوونەوەرە گەورەیەی دروست کردووە بەشیاو وگونجاو و ڕێك وپێك لەگەڵ بوون و ژیان و مانەوەی ئەمان دا، ئەفەرموێ ﴿أَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا جَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ لِيَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًا﴾ ئایا ئەو بێ بڕوایانە نەیانزانیوە و بەچاوی دڵ نەیانبینیوەو کە ئێمە شەومان دروست کرد و وە بۆ ئەوەی ئەوان ئارامی تیا بگرن و بحەوێنەوە تیای دا، ڕۆژمان دروست کرد وە بە ڕوناکی، شتی تیا ئەبینرێ، تا بەهۆی ئەوەوە بتوانرێ هۆی گوزەران و ژیان پێك بهێنرێت ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾ بەڕاستی لە دروست کردنی شەوڕۆژوبەدواهێنانیان بەم جۆرەی کە هەیە، چەند بەڵگە و نیشانەی ڕوون هەیە بۆئەوانەی کە باوەڕیان هەیە و باوەڕ ئەهێنن بە خوای پەروەردگار. بەڕاستی بیرکردنەوە لەم دووشتە ئاشکرایە کەژیانی

لەسەر ڕاگیرە شایانە بۆ ئەمەی ویژدانێکی ئاینی لەئادەمی دا هەڵگیرسێنێ و بێداری بکاتەوە، بەو دەستە قودرەتەی کە ئەم دیو و ئەو دیو ئەکات بەم دوو شتە بەڕژێم ویاسایەکی نەگۆڕاوی تێر و تەواو!! بەلاّم ئەو کەسانەی کەوشك ورەق وتەقن دەماری تەڕی یان تیانی یەئەوانە بێ بەشن لەڕوناکی ئەم هەموبەڵگەونیشانە ڕوونانە،بەهیچ ڕنگ چارەسەرناکرێن!خوا پەنامان بدات..

ئینجا لەباسی ئەم دوو نیشانە ڕوونەوە کە ژیانی ئەم خەڵکەی پێوە بەستراوە لەم جیهانەداو لەباسی ژیانیان بە ئارامی و کامەرانی لەژێر سایەی ئەم ڕژێمە وردەی بوونەوەردا، لەم باسانەوە کوتوپڕ تێپەڕئەکات و ئەچێ بۆ باسی وێران کردنی ئەم جیهانە و داچڵەکان وترس و بیم و نەمانێ کە ڕووئەکاتە هەموو-گیان لەبەرێك بێجگە لەوانەی خوا مەیلی ببێ، هەروەها باسی هەندێ ڕوداوی ترو دوا ڕۆژ و چارەنوسی خەلکی لەو ڕۆژەدا، ئەفەرموێ: ﴿وَيَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۚ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ڕۆژێ بکە کە فوو ئەکرێ بەو شتەی کە پێی ئەوترێت(صور) وەکو بۆقیەی سوپا و لەشکر، بەهۆی ئەوەوە هەرکەس وا لە ئاسمانەکان و زەوی دا لەترس و بیم دا دائەچڵەکێ و ئەکەوێتە دڵە لەرزە تا هەموو ئەمرن بێجگە لەو کەسانەی خوا بیەوێت بە ئارام بن و نەمرن، ئیتر ئەوانە چوار مەلائیکە بەناوبانگەکە بن، یان هەڵگرانی عەرش، یان هەرکەسی تر، ئینجا لە پاش ئەو فووکردنی زیندووکردنەوەی مردوان سەرجەم و بە یەکجار ئینجا لە پاش ئەو کردنی کۆکردنەوەی هەموانە، لەم سێ یەمەدا هەمووی کۆ ئەبێتەوە. وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَكُلٌّ أَتَوۡهُ دَٰخِرِينَ﴾[1] هەمووکەس ئامادەی شوێنی وەستان ئەبن بە زەبوونی ومل شۆڕی لەبەردەم دادگای هەرەبەرزدا، ئیترچ بێ تاوان و چ تاوانبار. لەگەڵ ئەوترس و داچڵەکانەدا گۆڕان وتێك چوونی گشتی ڕووئەدات لەم بوونەوەرەدا

---

[1] هەندێ لەزانایان ئەفەرموون دووجارفوئەکرێ بە(صور) دایە یەکەم بۆمراندن ووێران کردنی ئەم جیهانەیە، دووەم بۆزیندووکردنەوەوکۆکردنەوە وکۆکردنەوە، بەلاّم ڕای بەهێزلەسەر ئەوەیە کەسێ جار فووئەکرێت پیاداوەکو لەم تەفسیرەکەدا وترا.

وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴿٨٨﴾ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا وَهُم مِّن فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ ءَامِنُونَ ﴿٨٩﴾

**یەکێ لەو ڕووداوە گرنگانە ئەمەیە ئەفەرموێ: ﴿وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ﴾ لەو ڕۆژەدا شاخ و چیاکان ئەبینی بە جۆرێ وا گومان ئەبەیت دامەزراون لە جێگا و شوێنی خۆیان دا لە کاتێك دا دامەزراو نین، بەڵکو ئەگەڕێن بە وێنەی گەڕانی هەورا! چونکە هەمووی ئەبێ بە تۆز و وەکو تەم و هەڵمێ کە لە ناو پەیدا ئەبێت و ئەبێ بەم هەورە گورە گەورانە، کە چین لەسەر چین ئەکەون بەسەر یەك دا و تەپە ئەدەن و زۆرجار ئەویش شێوەی شاخ و چیای هەیە لەسەر چین ئەکەون بەسەر یەکدا و تەپە ئەدەن زۆرجار ئەویش شێوەی شاخ و چیای هەیە و دوورە بە وەستاو سەیر ئەکرێن و دائەنرێن!!ئەوفوکردنە بەسورە ئەوهەموو گۆڕان شتانەی ترکە لە و ڕۆژداپەیدا ئەبن ولەپاش ئەوبەدی دێن ئەوانە هەموو﴿صُنْعَ ٱللَّهِ﴾ بەرێك وپێکی فەراهەمیان ئەهێنێ ودەسکردی خوایە، ﴿ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ﴾ خوایەك کە هەموو شتی دروست کردووە بەپێی بەرژەوەندی تێرو تەواو، کەواتە ئەو بەسەرهات و ڕووداوانە زۆر گەورە و گرنگ و بەجێن، مەبەست پێ یان شێواندن و وێران کردن نی یە بە بێ سوود و مەبەست، بەڵکو لەبەر مەبەستێکی زۆر گەورەیە! بەرهەم و بەروبومێکی زۆر بەنرخیان لێ پەیدا ئەبێت، چونکە ئەو بەسەرهات و ڕووداوانە هۆی هاتنی ڕۆژی دوایی و زیندوو بوونەوەو حیساب و پرسیار و لێپرسینەوەن لە کردەوەکانی بەندەیانی خوا، ئەو کاتە ئەم**

---

[1] گەلێ لەزانایان یانی تازەئەم ئایەتەئەکەن بەبەلگە لەسەرخولانەوەی زەوی ئەڵێن مەبەست بەگەڕانی چیاکان گەڕانی ئێستایەتی لەم جیهانەدا،واتەخوا هەواڵمان ئەداتێ کە ئەم چیاوشاخانە ئێستا ئەگەڕێن لەسەرئەم باروشێوەی کەئێستانەیانبینین لە جێگاوشوێنی خۆیاندا،دەی ئەوکاتە ئەبێ ئەگەڕانەیان بەمەبێت کەلەگەڵ زەوی ئەخو لێتەوە بێگومان ئەم جۆرەمەبەست وتەفسیرەناگونجێ مەگەر بەزۆرە ملێ ولادانلە دیمەن ورواڵتی ئایەتەکان چونکە(و) لەپێش ئەم ڕستەیەوە یان بۆحاڵە یان بۆ عەتفە. لەسەرباری یەکەم ئەوتەفسیرو مەبەستەبە هیچ ڕنگ ناگونجێ، لەسە رباری دووەم هیچ پەیوەندی نا بێ بەڕستەکانی پێشی یەوە،نەلەمەبەست ونەلەبەش و پارچە کانی دا،ئەوکاتە بەپێ ی عیلمی بەلاغە ڕەوانی یە وبەلاغەتی نامێنت، بێجگە لەوەش لەگەڵ وێنەکەدا نارشیکە،چونکە ئەوکاتە شاخەکان دامەزراوان لەشوێنەکانی خۆیانداوگەڕانەکەیان سەر بەخۆنیە،هەور دامەزراونیە وگە ڕانیشی سە ربەخۆیە،کەواتە بالەتەفسیری ئاوارە دوربین.

هەموو کردەوەیەی کە لەم جیهانەدا ئەکرێن هەروا بێ سەرو شوێن ناڕۆن، بەڵکو پاداشتی چاکە و چاکان ئەدرێتەوە و تۆڵەش ئەسەنرێت لە خراپەکاران و تاوانباران، کە ئەوەش شتێکی زۆر پێویستە و نەبوون و بەدی نەهاتنی دژو پێچەوانەی دادو کاردروستی و لێزانی خوایە، دژو پێچەوانەی بەرژەوەندی گشتی یە. کەواتە هۆی ئەو بەسەرهات و ڕووداوانە جیا کردنەوەی چاکە و چاکانە لە خراپەکاران و بەدی هێنانی پاداشت و تۆڵەیە، وەکو بەم فەرمودەیەش دەست نیشانی بۆ ئەکات بۆ ئەو مەبەستە گرنگە، ﴿إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ﴾ بەڕاستی خوا بە باشی ئاگادار و زانایە بەهەر کردەوەیەك کە ئێوە ئەیکەن، کەواتە پێویستە و زۆر ڕێك و ڕەوایە ئەم ڕووداوانە تا ڕۆژی دوایی بێت و پاداشت و تۆڵە بەدی بێت و هەرکام لە چاکان و تاوانباران بە بەرهەم و سەرەنجامی کردەوەی خۆیان بگەن، وەك بە کورتی لەم دوو ئایەتەدا ڕوونی ئەکاتەوە: ﴿مَن جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ خَيْرٌ مِّنْهَا﴾ هەرکەس لەو ڕۆژەدا بێت بە کردەوەی چاکەوە، واتە خوا بپەرستێ بە تاك و تەنیا ئەوە بۆ ئەو کەسە هەیە پاداشتی خێرو چاك کە دەست کەوتی ئەبێت لەلایەن ئەو چاکەی خۆیەوە، بەهۆی ئەوەوە یان بۆ ئەو کەسە هەیە چاکتر لە چاکەی خۆی، بەم ڕەنگە پاداشتەکەی چەندانە ئەکرێتەوە لای خوارەکەی یەك بە دە، و پاداشتەکەی هەمیشەیی و نەبڕاوەیە، ﴿وَهُم مِّن فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ آمِنُونَ﴾ ئەو کەسانە بێ باکن و مەترسی یان نی یە لە ترس و داچڵەکانی هەرە گەورەی ئەو ڕۆژەی کە بریتی یە لە ترسی ئەو کاتەی کە فەرمان ئەدرێت بە توڕدانی خەڵك بوناو دۆزەخ، ئەم مەترسی و داچڵەکاندنە جیاوازە لەترس و داچڵەکانی کاتی فوکردن بە ﴿صور﴾ دا، یان ترسوسامی ئەو ڕۆژە سەختە کە چاکانیش دائەگرێ، ئەوجۆرە سام و ترس و داچڵەکانە یەکە بەسروشت پەیدا ئەبن لە یەکەم جارەوە لە کاتی ڕودانی شتی سامناك و بینینی شتی ناهەموورا، هەرچەندە هیچ مەترسی زیان و سزایشی نەکرێت، کەواتە هیچ دژی و بە گژا چوون ڕوونادات لە نێوان ئەم ئایەتە و ئەو ئایەتانەی تر کەوا نیشان ئەدەن ترس و داچڵەکان بەشێوەی گشتی هەیە و هەمووان داگیر ئەکات، بەڕاستی بێ باکی و نەترسان لەو بیم وترسەی لەم ئایەتەدا مەبەستە، ئەوبێ باکی و دانەچڵەکانە بە تەنها بە سەبۆ پاداشت دانەوە لەو ڕۆژە سامناکەدا، ئیتر هەرچی تر ببێ زیادە ئەمێنێتەوە، چاکە یەکە خوا ئەیدات. لەلوتفی بەزیاد بێت. ئەم خواپێداوانە لەم جیهانەدا لە خواترسان، کەواتە خوا لەو جیهان بێ باکیان ئەکات وبیم و ترسی هەردوو جیهانیان لەسەر کۆناکاتەوە، وەکو لەحەدیسی قودسی دائەفەرموێت: ﴿لااجمع على عبد خوفين ولاآمنين....هتد﴾.

وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَكُبَّتۡ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ هَلۡ تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٩٠﴾

﴿وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَكُبَّتۡ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ﴾ هەركەس لەو ڕۆژەدابێت بەخراپەوە، واتە دژ و پێچەوانەی خوا پەرستی، واتە دژو پێچەوانەی خواپەرستی،ئەوانە ڕووو دەم وچاویان بەرەو خوار ئەکرێتەوە و بەسەر ڕوویان دا ئەخرێنەناو ئاگر، خوا پەنامان بدات لەو بەد بەختی یە. بێگومان ئەوسیاچارانە کوّت و زنجیر کراون وبەسە ڕرووودا ئەبرێن بەرێوە تا ئەگەنە دوّزەخ و ئینجا هەر بەوشێوە توڕ ئەدرێنە ناویەوە بەڕاستی شێوەیەکی ئێجگار سامناك ودڵ داچڵەکێنەرە، حەق وایە بە بیر لێکردنەوەی تیکە لە گەرودا بگیرێت، سەرباقی ئەوە تانەو تەشەریشیان لێ ئەدرێ بوّسزادانی دەروونیان و پێ یان ئەڵێن: ﴿هَلۡ تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ ئایا توّڵەی هیچ شتێکیان لێ ئەسێنرێت جگە لەوەی خوّتان کردووتانە لە دوونیادا، واتە نەخێر، ئەمەی دەربارەتان ئەکرێ توّڵەی کردەوەی خوّتانە، و خوّتان بەدەستی خوّتان ئاواتان کرد بەخوّتان ئەوانە لایان ئەکردە ڕێنموونی خواو ڕوویان وەرئەگێڕا، کەواتە بە ڕوودا بخرێنە ناو ئاگر خوا بمان پارێزێت لەو بەدبە ختی یە، آمین.

ئینجا کوّتای سورەتەکە ئەهێنێ بە ئاڕاستەکردن ورگەیاندنی چەندشتێك لەلایەن پیغەمبەرەوە دروودی خوای لەسەربێت بەو میلله ت وخەڵکەی کەڕەوانە کراوە تەسەریان:

١- کورتەی بانگ کردن وبانگەوازەکەی وئەو بەرنامەی کەهەیەتی لەوەدا.

٢- حەواڵە کردنی ئەو خەڵکە بوّ پاشەڕوّژ و چارەنووسێ کە خوّیان هەڵی ئەبژێرن بوّ خوّیان دوای ڕوون کردنەوەو ڕاگەیاندنی ئەو هەموو شتە گرنگەی کە تێپەڕی کرد لە بارەی‌ئاینی وعەقیدەوە.

٣- کوّتای سورەتەکە بێنی بەسوپاس وسەنای خوا و ئیتر خەڵکە کە لێ گەڕێ بوّخوا..

إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلْبَلْدَةِ ٱلَّذِى حَرَّمَهَا وَلَهُۥ كُلُّ شَىْءٍ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ
ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩١﴾ وَأَنْ أَتْلُوَا۟ ٱلْقُرْءَانَ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ
ٱلْمُنذِرِينَ ﴿٩٢﴾

---

**با بەڵگە و نیشانە ڕوونەکانی خۆی دەرخات بۆیان وپرسیار وحیسابیان لە گەڵ بکات بەرامبەر کردەوەکانیان،ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلْبَلْدَةِ ٱلَّذِى حَرَّمَهَا﴾واتە ئەی پێغەمبەر بڵێ: من فەرمانم پیا نەدراوە بە هیچ شتێ جگە بەمەی خوای پەروەردگاری ئەم شارە بپەرستم -واتە مککە- ئەو خوایەی کەڕێزی داوە بەم شارە و قەدەغەی کردوە ڕێز شکاندنی بەم ڕەنگە دەست دریژی بکرێت بۆ کەسێ پەنای پێ ببات و نیچیرو پەلەوەری بتارێنرێ و دارودرەختی ببڕێ یان هەڵکەندرێت، هەروەها هەر شتێکی تر کە بێ ڕێزی ئەو شارە بەفەڕ پیشان بدات چ جای بت پەرستی و گوناهو تاوانی گەورە، ئەو گەلە بت پەرستەی کە یەکەم جار ئەم قورئانەی هاتە سەرو چوو بەگوێچکەیاندا باش بڕوایان بوو بە ڕێزی ئەو شارەو ئەو ماڵی خوا کەلە بنەڕەت دا دروست کرابوو بۆ خواپەرستی بە تەنیا بەبێ وێنە و هاوبەش، بەهۆی ئەو ماڵی خواوە گەورەی و سەرۆکایەتی گەلی عەرەبیان دەست کەوت بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەدا ئەو خوایە یان بەتەنها نەئەپەرست، بەڵکو هاوبەشیان بۆ ڕەوائەدا. کەواتە باوەڕو عەقیدەکەیان سەراسەر نەزانی و نەفامی بوو، باوەڕ ووتارو کردەوەکەیان ئێجگار دژو پێچەوانە و لاربوو، بەڕاستی جێگای سەر زەنشت و تانەو تەشەربوون کە هەر هیچ نەبێ چاولەبەری ئەم چاکە و بەهرە گەورەیە بوونایە کە لەم ئایەتەدا وەرئەگیرێت. بەتایبەتی فەرموی(خوای پەروەردگاری ئەم شارە) بۆ بایەخ دان بەو شارە و ڕێزونرخ پێدانی، ئەگەرنا خوا خاوەنی هەموو شتێکە وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَهُۥ كُلُّ شَىْءٍ﴾ تەنها هینی خوایە و تایبەتی یە بە خواوە هەمووشتێك بە دروست کردن ومولکایەتی و چاودێری و سەرپەرشتی. ﴿وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ فەرمانم پیا دراوە بەمەی لەوکەسانەبم کەخۆیان تایبەتی ویەکبارو یەك تەن کردووەبۆخوا وهەمووشتێکیان بۆخوایەك بە پاك وخاوێنی وبەبێ هیچ جۆرە شەریك و هاوبەشێك. بانگ وبانگەوازەکەی پێغەمبەر درودی خوای لێبێت لەسەر ئەمەرگیربووکەلەم ئایەتەدا فەرمو،هۆی دامەزراندن و گەیشتنی**

بەومەبەستە گەورەیەش ئەمەیە کەئەفەرمویٚ: ﴿وَأَنْ أَتْلُوَا ٱلْقُرْءَانَ﴾ واتە فەرمانم پیٚ دراوە کە قورئان بخویٚنم بۆخۆم و بەسەرخەڵك داو بەدەوام بم لەسەری، بۆخۆی بیخویٚنیٚ تا بەرەبەرە شتە نایاب و نهیٚنی یەکانی دەرکەویٚت بۆی ڕووناکی وپیت وفەڕو بەهرەکانی گیان و هەست و لەشی داگیر بکات، ئەو کاتە بەباشی ئەو ئەرکە گەورەو گرنگەی کە پیٚی سپیٚراوە بۆی بەجیٚ دیٚت، بیخویٚنیٚ بەسەر خەڵك دا بۆ بانگ کردن و ڕیٚنموونی ڕووناك کردنەوەی، دەروون ڕیٚگاکە یان، چونکە قورئان کتیٚبی ئەو پەیامە گەورەیە و دەستوریەتی و هۆی گەیاندن وبەدی هیٚنانی یەتی، ئەبیٚ بەقورئان تیٚکۆشان و بەربەرەکانیٚ بکات لەگەڵ کافرەکان دا، تەنها قورئان بەسە بۆئەومەبەستە، بە قورئان تیٚکۆشان ئەکریٚت لەگەڵ ڕۆح وگیانی وژیری خەڵك دان بە قورئان چوار دەوری دەروون و ویژدان ئەدریٚ، ڕیٚگائەگیریٚ لە هەست وتیٚڕوانینیان، بە قورئان بوومەلەرزە ئەخریٚتە دڵە وشك و ڕەقەکان و ئەخریٚتە بزووتنەوە لەرزە، جەنگ وکوشتار کە لەدوایی دا دامەزراوە فەرمانی پیٚ درا تەنها بۆپاراستنی باوەڕداران بوولە سزادانیان ودەست دریٚژیی لەسەریان، بۆ ئەمەی بە ئازادی وسەربەستی بتوانریٚت بانگ کردنی خەڵکی وهەڵسان بە بەدی هیٚنانیان و بەجیٚ هیٚنانیان و بەجیٚ هیٚنانی یاسا و بەرنامە و دەستەرەکەی ئەم ئایین وپەیامە. کەواتە هەرکەس بەم قورئانە چارەسەر نەکریٚت و نەڕوا بەڕیٚگای ڕاست دا، ئەوکەسە نومیٚد و چاوەڕوانی چارەسەرکردنی ناکریٚ بە هیچ ڕەنگ ﴿فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ﴾ ئینجا هەرکەس ڕیٚنموونی وەرئەگریٚ و ڕیٚگای ڕاست ئەدات بەر بەشویٚن کەوتنی ئەم قورئانە و پەیڕەوی کردنی من لەو ئایینەی کە پیٚ ی ڕەوانە کراوم ئەو کەسە ڕیٚنموونی وەرگرتنە کەی تەنها بۆ خۆیەتی، چونکەسوود و بەرهەمەکەی تەنها بۆخۆیەتی، هەرکەس گومرابیٚت و ون بوو بیٚ بەمەی دژوپیٚچەوانەی من بیٚت: ﴿فَقُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ﴾ ئەوە پیٚ ی بڵیٚ: من هیچ نیم، جگە لەوەی یەکیٚکم لە ترسیٚنەران، واتە تۆڵەی گومرای یەکەت بۆخۆت ئەگەڕیٚتەوە،ئۆباڵت بەئەستۆی خۆتە ومن هیچ زیانیٚك ناکەم، چونکە تەنها من ترسیٚنەرم و هەڵساوم بە کاروفرمانی خۆم. لەم فەرمودەیەوە وەرئەگیریٚ باوەڕیٚ کە پیٚی ئەوتریٚت ﴿فردية التبعة﴾ واتە هەرکەس پرسیاری ڕیٚنموونی و گومرای خۆی لە خۆی ئەکریٚت، بەرهەم وتۆڵەی ئەو دوانە بۆ خۆی ئەگەڕیٚتەوە، بەڕاستی ئەمەیە ڕیٚز و لەمەدا دەرئەکەویٚت کە ڕیٚزی ئەم ئادەمی یە ئیسلام گرتوویەتی یە ئەستۆی خۆی پیٚکهیٚنانی، کەواتە ئادەمی وەکو مالآت و گیانلەبەری بیٚ چارە نادریٚتەوە بەر بۆ باوەڕهیٚنان بە ناچار کردن،

﴿وَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾ بڵێ: هەمووسوپاس و سەنایەك بۆ خوایەك کە ناوی ﴿الله﴾ یە، لەسەر ئەو هەموو چاکە و بەهرەیەی کە ڕشتوویەتی بەسەرم دا، کە گەورەترین و گرنگ ترینیان بەهرەی پێغەمبەرێتی یە ﴿سَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعۡرِفُونَهَاۚ﴾ بێگومان بەڵگە ونیشانە ڕوونەکانی خۆیتان پیشان ئەدات ئینجا ئێوەش ئەیانناسن، کە ئەوانە بەڵگە و نیشانە ڕوونەکانی خوان. خوای گەورە ڕاستی فەرمووە، ئەوەتا ڕۆژ بە ڕۆژ هەندێ پیشانی بەندەکانی ئەدات و هەندێ لە وشتە نهێنی یە نا یابا نەی دەر ئە خات لەم بوونەوەرەدا کە پڕپڕە لەو جۆرە شتانە، ﴿وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ﴾[1] بێگومان خوای تۆبێ ئاگانی یە لەکردەوەتان وهەر کردەوەیەك کە ئەی کەن،بێ ئاگانی یە لەچاکە وفەرمان بەریوگوێ ڕیەڵیی تۆئەی پێغە مبەر، کەواتە پاداشتیکە شایان نی خۆت بێت ئەتداوە، بێ ئاگا نیە لە بێ بڕوای ئەو هەموو تاوان و خراپەکاری یەی کە ئێوە ئەیکەن، بێ باوەڕەکان، کەواتە تۆڵە و سزای خۆتان ئەچەژن، وا نەزانن و گومان بەرن کە مۆڵەت دان و دوا خستنی لەبەر بێ ئاگایی یە، بەڵکو بە گوێرەی لێزانی و کاردروستی و بەرژەوەندی یە، ئا بەمڕستە بەهێزە سورەتەکەی دوای پێ هێنا کە لە یەك کات دا بەڵێن و هەڕەشە ئەگەیەنێ بۆ هەرکەس شایانە بۆ هەرکام. بەڕاستی کۆتایی یە کەی زۆر بەجێ وشیرینە بۆ دڵنیا کردن لەسەرئەو هەموو هەڕشە و بەڵێنەی کە لەم سورەتەدا تێپەڕی کرد، خوا بە لوتف و بەزەیی خۆی پەنامان بدات لە سزای خەشمی خۆی. آمین .

وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وآله و صحبه أجمعين

٤ ی شوال ١٤٠١ کۆچی

---

[1] بە ﴿ یعملون ﴾ یش خوێنراوەتەوە، ئەو کاتە تەنها هەڕەشەی لێ وەرئەگیرێ لە بێ باوەڕ و تاوانباران.

## سورەتی القصص
## مككە یی یە و(٨٨) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتە هاتە خوارەوە لەکاتێکدا کە موسوسڵمانەکان لەمەککەدا تاقمێکی کەم و ژێر دەستە و لاوازبوون وبت پەرستەکان خاوەنی هێز و دەسەڵات و سامان بوون، هاتە خوارەوە ترازووی ڕاستەقینەی دانا بۆ هەموو هێزێك و نرخی دیاری کرد بۆ هەرشتێك لە ڕاددەی خۆی دا، هاتەخوارەوە بڕیاری داو ڕوونی کردەوە کە تەنها هێز و دەسەڵاتێ هەیە لەم بوونەوەرەدا کە هێز و دەسەڵاتی خوایە، لەم بوونەوەرەدا تەنها شتێك نرخی ڕاستەقینەی هەیە کە ئەویش باوەڕە کەواتە هەر کەس هێزی خوای لەگەڵ بێت هیچ مەترسی یەکی لەسەرنی یە، با ڕووت وقوت بێت بەدیمەن و ڕواڵەت لەهەموو هێز دەسەڵاتێك و هەرکەس هێزی خوا دژی بێت نەبێ ترسە و و نە بەئارامە و نەدڵ دامەزراوە، هەرچەندە هەموو هێزی ئەم جیهانەی لەگەڵ بێت وپشتیوان و یارمەتی دەری بێت، هەرکەس باوەڕو ئیمانی ڕاستەقینەی هەبێت ئەوە هەموو خێرو چاکە یەك بۆ ئەوە، هەرکەس بێ بەش نەبێ لێ ی هیچ شتێ سوودی پێ ناگەیەنێت، جا لەبەر ئەوە ئەم سوورەتە پێك هاتووە لە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتی موسا و فیرعەون لەسەرەتاوە، بەسەرهات و سەرگوزەشتەی قارون لەگەڵ موسا و گەلەکەی لەدوا دوایی دا، یەکەم هێزی پادشایەتی و حوکمڕنی و دەسەڵات پیشان ئەدات، هێزی فیرعەون، سەرکێشی زۆردار ولێزانی وریا، لە بەرامبەریەوە موسا یە کە تلفێکی شیرە خۆربوو بەبێ هێزو بەبێ پەناو بەبێ پارێزەر لەکاتێك دا فیرعەون زاڵ و بەرز وبڵند بوو لە وڵات دا، دانیشتوانی بەش بەش کردبوو، کردبوونی بە چەند تاقمێك و بەنی ئیسرائیلی یەکان بێ دەست لاواز وژێر دەست کردبوو، کوڕکانی سەرئەبڕن، ئافرەتەکانی ئەمێشتەوەو هەمیشە وریابوو بەسەریانەوەو مەترسی لێ ئەکردن، دەستی گرتبوو بەسەریاندا بەڵام

هێزودەسەڵات و زاڵی فیرعەون و وریایی و لێزانینەکەی هیچ سوودی پێ نەگەیاندن، بەڵکو موسای تڵفی بێ سایە و پەنایشی بۆ چارەسەر نەکرا، لە کاتێکدا کە لەژێر چاودێری و پارێزەری تاقانە هێزی ڕاستەقینەدا بوو، سەرپەرشتی ئەکرد وبەرگری سزا و خراپەی لێ ئەکرد، چاوی دوژمنی لێ کوێر ئەکرد، بەری پێ بڕی یەوە لە فیرعەون و لەشکرەکەی بە ئاشکرا، بەم ڕنگە خستیە ناوماڵەکەی فیرعەون و لەوێ پێ ی گەیاند وگەورەی کرد، خۆشەویستی ئەو تڵفەی جێگیر کرد لەناوەڕۆکی دڵی خێزانەکەی دا،کەواتە ئەوفیرعەونە مل هوڕە لەئاستی دەست بەستراو و مل کەچ بوو، بەرگری کرا لەهەموو سزادانێکی خوا کارێکی کرد ئەو فیرعەونە خۆی بەدەستی خۆی شتێکی کرد کە خۆی لێ ئەپاراست ومەترسی لێ ئەکرد، ڕووداوی دووەم ڕاددە ونرخی سامان دارای نیشان ئەدات کەزانینیشی لەگەڵ دابێت، ئەو سامان دارایی یە کەخەڵکی سەرسام کردبوو، قارونیشی مل هوڕو سەرکێش کرد، هەروەها ئەو زانینەی کە قارون کەشخەی پێوە ئەکردو لای وابوو لەڕێگای ئەو زانینەوە ئەو هەموو سامانەی دەست کەوت بووە، بەڵام ئەوانەی کەزانینی ڕاستەقینەیان پێ درابوو لەگەلەکەی غەزنە وسامان و دەسەڵاتەکەی قاروون سەرسامی نەکردن و ئاواتە خوازی نەکردن بۆی، بەڵکو چاوەڕوانی ئەوەبوون کەلای خوایە، چاویان بڕی بووە پاداشت ولوتفی خوا، ئەیانزانی کە ئەو چاکترە و نەبڕاوەیەن، لەپاشان دەستی قودرەتی خوا هاتە کار وقارونی بەسەروبەرەوە لەناو برد بەخۆی وکۆشك و غەزنەکەیەوە بردنی بە ناخی زەوی دا ودروشمیشی نەهێشتن، نە سامان و نەغەزنە فریای نەکەوت ونەزانینی سوودی پێ گەیاند، دەستی قودرەت هاتە کار ئەوەی بەسەر قارون هێنا وەك هاتە کار لەبارەی فیرعەونەوە، بەم ڕنگە بەخۆی و لەشکرو سوپاکەیەوە خنکاندنی لەدەریا! بێگومان فیرعەون جەورو دەست درێژی کردە سەر بەنی ئیسرائیل بەحوکمڕانی وپادشایەتی، قارون تاوان وناڕەوایی کردە دەربارەیان بەهۆی زانینەوە وبەهۆی سامانەوە،، دواڕۆژی ئەو دووستە مکارە یەك بوو، ئەم

بەسەر وبەرەوە برا بەناخی زەوی دا، ئەویش بە خۆی وسوپاکەیەوە خنکێنرا لەدەریادا، وەکو باس کرا.لەو کاتە هیچ هێزێك لەهێزە کانی زەوی نەبوو بەرگری وبەر هەڵستی ئەو جەورو ستەمە بکات، بەڵکو تەنها دەستی قودرەت هاتە کار وبەئاشکرا بەرگری کرد وئەو هەمووجەورە وتاوانەی لەناوبرد لە کاتێك دا کەخەڵکی دەستەپاچە وداماوبوون لەوەی بوەستن لەڕووی دا. ئەم دوو ڕووداوە دەرەی ئەخەن کەکاتێ هێزی خراپە وتاوان یەکلا یی بووە وە بۆدەست درێژی وبەهیچ ڕەنگ ڕووناکی تیا نەما، هێزی خێر داماو دەستە پاچە بوو بەرامبەری و مەترسی کرا لەلادان و بەرگە نەگرتنی ئیمانداران، لەو کاتەدا دەستی قودرەت هاتە پێشەوە ئەوەی کرد کە کردی!! بەڵام بابزانین کاتێ خوا ئەو یارمەتی یەی دان وبە زۆر دەسە لاتی خۆی بەرگری لێ کردن و تۆڵەی سەند لەدوژمنی ستە مکار کە ئیمانداران وعەقیدە وباوەڕ کەیان دەربلەری وڕووبە ڕووی هێزی شەڕ وتاوان وەستا، تائەوەیان نەکرد،خواش ئاوا بە ئاشکرا لە سەریان نەهاتە وەلام،ئەوە بوو چەند ساڵ لەوە بەر بەژێری ئەوبارە گرانە وە نرکەو نا لە یان ئەهات،خوا نەهات بەهاواریانەوە، چونکە لەو ماوەدا ملیان شۆڕ کردبوو بەپریسوایی وجو لەیان لەخۆیان بڕی بوو، ڕۆژێ لەڕۆژان سەریان بەرز نەکردەوە،بەبێ پێچ پەنا عەقیدە وئاینی خۆیانیان دەرنەخست ونەوەستا بەرامبەر ئەوهەموو کوفرە وتاوانە نکەواتە بابزانێ کەباوی خوا بۆهەموو چەرخێ ولەناو هەموو گەلێك هەر بەو وێنە وجۆرە بوو وەە روایش ئەبێت، تا بەندە کانی خوا نەکەونە جوڵەو وبزووتنەوە بەرامبەری هێزی شەڕبە پێ ی دەسەلا ت وتوانا وپشت نەبەستن بە ئاین وعەقیدە کەیان،شایانی ئەوەنابن خوابە ئاشکرا بەرگری یان لێ بکات و لەسەریان بێتە وەلام وسەریان بخات ودوژمنیان بۆ لەناوبەرێ ئینجا لەگەڵ ئەو دووبەسەرهاتەو لەناو بەناویاندا چەند شتێکی تر ئەهێنێ کەهەمووی هۆی بیرکردنەوەو چاو دڕینە وڕێنموونی وەرگرتنن وەکو لەمەوپێش بۆمان دەرئەکەوێ لەکاتی تەفسیر کردنیان دا بەیارمەتی خوا.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ نَتۡلُواْ عَلَيۡكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرۡعَوۡنَ بِٱلۡحَقِّ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٣﴾

---

ئینجا با بێینەوە بەردەم کۆشکی بەرزی سورەتەکە و قاپی یەکەی بکەینەوە بەم ڕستە پیتە بەفڕانە: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *طسٓمٓ﴾ ئەوەی کەوتومانە لە گەڵ لەوسورەتانەی کەئەم جۆرەپیتانە یان لەسەرە تاوە هەیە بەسە بۆئێرە یش و هەمر سورەتێکی تر وێنەی. کەواتە لەم بارەیەوە لێرەدا هیچ نالێین و ئەڕوین بۆئایەتەکانی تر: ﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ﴾ ئەم ئایەتە گرنگانەی لەم سورەتەدا هەن چەند ئایەتێکن لەو کتێبە بەرێزەی کە بەڵێن دراوە لە کتێبە پێشووەکاندا بەهێنانە خوارێ بۆ سەر محمد کە ئەویش کتێبێکی ڕوون کەرەوەی هەق وڕاستە لەدرۆ و بەتاڵ، ڕوون کەرەوەی شتی ڕەوایە لەناڕەوا، ڕوون کەرەوەیە بۆ خۆی کە فەرموودەی خوایە نەك هیچ کەسی تر، یان ڕوون کەرەوەی ڕاستی پێغەمبەرە دروودی خوای لێبێت، یان ڕوون کەرەوەی هەواڵی لەمەو بەر و داهاتوو، یان ڕوون کەرەوەیە بۆ ڕزگاربوون لە گومان و دوودڵی گومڕایان، کەواتە ئەم کتێبە ڕوون کەرەوەیە لە دەستکردی ئادەمی نی یە، ئادەمی توانای نی یە بە داهێنانی بەڵکو وەحی خوایە ئەیخوێنێتەوە بەسەر بەندەی خۆیدا، کە محمدە درودی خوای لێبێت، لەسەر زمانی جوبرەئیل وەکو ئەفەرموێ: ﴿نَتۡلُواْ عَلَيۡكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرۡعَوۡنَ بِٱلۡحَقِّ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾ ئەخوێنینەوە بەسەرت دا ئەی پێغەمبەر بەڕاستی بە حەقیانەت هەندێ هەواڵی گرنگی موسا وفیرعەون لەبەر سودی گەل وکۆمەڵێك کە باوەڕیان هەیە یان ئامادەن بۆ باوەڕهێنان،هەر چەند ئەم قورئانە هاتووە ڕاگەیەنرێت بەهەمووان، بەڵام تەنها ئەم تاقمە سوودی لێ وەرئەگرن، کەواتە وەك تایبەتی بێت پێیانەوە هەر بۆ ئەوان هاتبێت وایە. ئەم کتێبە گرنگە بەشێوەی گشتی ئاڕستەی ئەم تاقم و گەلە کرا، تا پەروەردەیان بکات وپێیان بگەیەنێ و ڕێگا وبەرنامە یان بۆ نەخشە بکێشێ، کەواتە بۆ ئەم سەرگوزەشتە و هەواڵانەش مەبەست ئەم تاقمی باوەڕدارانەیە، چونکە تەنها ئەوان پەند و تەمێ ی لێ وەرئەگرن، شێوەی ئەم فەرموودەیە بۆن و هەناسەی خۆشی و لوتف و نەسیمی ڕێز و بەگرنگ گرتن ئەدات بە مێشك و دەماخی ئیمانداران، هەست داریان ئەکات

بەنرخ وپایە وپلەی بەرزیان لای خوا، ئەوەتا خوای گەورە هەواڵ دەنگ و باسێکی گرنگ ئەخوێنێتەوە بەسەر پێغەمبەردا درودی خوای لێبێت، لەبەرخاتری ئیمانداران و تەنها بۆ ئەوان، بەهۆی ئەو سیفەتی ئیمان و باوەڕیانەوە!!

لەپاش ئەم سەرەتایە دەست پێ دەکات بە گێڕانەوەی هەواڵەکە لە یەکەم زنجیرەوە زنجیرەی لەدایك بونی موسا و لەهیچ سورەتێکی تر لەو سورەتانەی کە هەواڵی موسا و فیرعەونیان تیایە بەم جۆرەی نەکردووە لەیەکەم زنجیرەوە دەستی پێنەکردوە، ئەوەش لەبەر ئەوەیە ئەو یەکەم زنجیرەیە ئەو کاتە تەنگەی کە موسای تیا لەدایك بوو و ڕووت وقوتی موسا لەمنداڵی یەوە لەهەموو هێزو هۆی چارەسەرکردنی کاروباری، بێ هێزی ولاوازی گەلەکەی وژێرباری وسەرشۆڕیان وکەوتنیان لەناو چنگی دوڕندانەی فیرعەون، ئەمانە هەموو پێکەوە مەبەست و ئامانجی سەرەکی سورەتەکە پێك ئەهێنن، ئەو دەستە قودرەتە بەئاشکرا دەرئەخات کە بەتەنها خۆی هاتە مەیدان، نەك لەپەنای پەردەی ئادەمی یان هەرشتێکی تردا، دای لەجەورو ستەم وسەرکێشی و لەڕیشەی هێنا کاتێ خەڵکی دەستە پاچە بوون لە لێدانی وبەرگری، یارمەتی لاواز ژێر دەستەکانی دا کاتێك کە هیچ پەنایەکیان نەبوو بەڕواڵەت، سەری خستن کردنی بەکاربەدەست لەوڵات دا!! ئەمەش کەوترا مەبەستێ بوو پێویست بوو ڕوون کردنەوەی وجێگیر کردنی لە دەروونی ئەو کۆمەڵە کەمە لاوازەی چەرخی مککە، کە دەستە پاچە و وداماوبوون بە دەست کۆمەڵی زۆری زۆرداری بەهێزی بت پەرستان لەو چەرخەدا، پێویست بوو دڵنیا کردن و بەهێز کردنی دڵ و دەروون ئەو کۆمەڵە کەمە، هەرچۆنێك پێویست بوو ئاگادارکردن و ترساندنی ئەو کۆمەڵە زۆرە ستەمکارە سەرکێشە، بەڵکو تەمێ خواربن وخۆیان نەخەنە بەرخەشم سزای خوا بەوێنەی فیرعەون وکۆمەڵەکەی هەروەها ئەم بەسەرهات وسەرگوزەشتە یە دەرس وتەمێ یەهەتا هەتایە بۆهەردوو تاقمێ تر بەوێنەی کۆمەڵەکەی ئەوچەرخە و مەککە. بێگومان سەرگوزەشتەی موسا سڵاوی خوای لێبێت لەسورەتەکانی تردا زۆرتر دەست پێ ئەکات لە زنجیرەی ڕەوانەکردنی پێغەمبەرێتی یەکەوە، کە ئیمان وباوەڕی بەهێز و وەستا ڕووبەڕووی ستەم وسەرکێشی، لەپاش هێزی ئیمان سەرکەوت وزاڵ بوو وهێزی جەورو ستەم داخرا و ژێرکەوت، لەو سورەتانی تردا پیشانی دا ئەوە پێویستە، بەلأم لێرەدا ئەوەپێویست نی یە، بەڵکو لێرەدا ئەمە مەبەستە کەهێزی شەڕ وستەم هەرکات یەك بار لێ وەستا وهیچ ڕووناکی تیا نەما ئەو کاتە هۆی نەمان و لەناوچوونی ها بەخۆیەوە، هەرکات یاخی بوو بەتەواوی ئەوکاتە کەسی ناوێ بەرهەڵستی

بوەستێ و بەرگری لێ بکات، بەڵکو ئەوکاتە دەستی قودرەتی خوایی دێتە کار بۆی و لەناوی ئەبات ودەستی ستەم لێ کراوە ودەست درێژی لێ کراوان ئەگرێت و ڕزگاریان ئەکات و پێ یان ئەگەیەنێ و پەروەردە یان ئەکات و ئەیانکات بەکار بەدەست وپێشەوا و ئەیانکات بەخاوەنی وڵات. ئا ئەمە بوو مەبەست لە هێنانی ئەم سەرگوزەشتە و بەسەرهاتە لەم سورەتەدا، جا لەبەر ئەوە لەم سورەتەدا دەستی پێکرد لە زنجیرە یەکەوە کە ئەم مەبەستە پێك ئەهێنێ و ڕوونی ئەکاتەوە، هەموو سەرگوزەشتەکانی قورئان لەسەرڕیار و شێوەیەکن، کە مەبەست لەهێنانەکەیان و مەبەستی ئەو شوێنە پێك بێنێ کە ئەو سەرگوزەشتەی بۆ هێنرا. چونکە ئەم سەرگوزەشتانە لە قورئاندا هۆی پەروەردەکردن و پێگەیاندنی دڵ ودەروون، هۆی دامەزراندن وجێگیر کردنی چەند مەبەست وبیرو باوەڕێکن، کەواتە ئەبێت ئەو ڕێك وپێکی یە هەبێ لەنێوان باروشێوەی سەرگوزەشتەکان و ئەو مەبەستانەی کە ئەهێنرێن بۆی، پەیوەندی ڕێك و ڕەوانیشیان بێت بەو جێگاو شوێنەی کەباس کراون تیای دا.

ئەوزنجیرانەی کەلەم سورەتەدا باس کراون ئەمانەن:

زنجیرەی لەدایك بوونی موسا سلاوی خوای لێبێت لەگەڵ ئەو هەموو تەنگی یەی کەدەوری دابوو، لەگەڵ باس وسەرپەرشتی وچاودێری خوا بۆ ئەو لەدایك بوونە. زنجیرەی ئەوپێگە یشتنوهێزی وگەنجی وئەولێزانی وکاردروستی وزانینە خوا پێ ی دابوو هەروەها چەند باس وبەسەرهاتێکی تری دەرچوونی لەمیسر وگەیشتنی بە مەدین لەولاتی شام ئینجا مانەوەی لەوێ چەند ساڵێك وژن هێنان وگەڕانەوەی بۆمیسر وزنجیرەی بانگ لێ کردن وخستنی ئەر کی پێغە مبەرێتی لەسەر شانی، لە پاشان بەرەنگاری وبەربەرەکانێ لەگەڵ فیرعەون وگەل کۆمەڵەکەی داوسەرکێشی وباوەڕنەهێنانی ئەوان ئینجاگەیشتنیان بەپاشە ڕۆژی شایانی خۆیان.

زنجیرەی یەکەم ودووەمی زیاتر درێژە پێدا کە دوو زنجیرەی تازەن وتەنها لەم سورەتەدا باس کراون، مەبەست لەهێنانی سەرگوزشتە کەپێك ئەهێنن و لەم دوانەدا دەرئەکەوێت هاتنە پێشەوەی دەستی قودرەت،لە پێش ئەمەی دەست بکات بەسەرگوزەشتەکە بەچەند ئایەت نەخشەی ئەو بارو چەرخە ئەکێشێ کەئەو ڕووداوانەی تیا بەدی هات، ئەو کاتەی کە سەرگوزەشتەکانی تیا ئەگەڕێ، ئەو مەبەست و ئامانجەی کە لەپەنای ئەو ڕووداوانە دابوون و دەری ئەخات و ڕوونی ئەکاتەوە، ئەو مەبەست وئامانجەی کە هۆی گێڕانەوەی ئەم سەرگوزەشتانەن،

إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ ﴿٥﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ﴾ بەڕاستی فیرعەون لەخاك ولآتی میسردا بەرزو زاڵ بوو، لە جەوروستەم دا لەسنوری تێپەڕی کرد. ﴿وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا﴾ دانیشتوانی کرد بە چەند بەش وکۆمەڵێك وشوێنیٚ ئەکەوتن لەهەر شتێك دا ئارەزووی بکردایە، یان هەر کۆمەڵێك بۆ کاروفرمانێکی ولآت و پادشایەتی یەکی، یان کردنی بەچەند کۆمەڵێك ودوژمنایەتی خستە نێوانیان، تا خەریك بن بەیەکتر و پەردەشیان نەبێت چاوی بدڕنەوەو دژی ڕاپەڕن،کە ئەوەش دەستوورو باوی دەوڵەتە گەورەکانە لەم چەرخەی ئێمە و چەند چەرخێك لەمەوبەر لەکاتێکدا کە قاپی پیسیان خستە ولآتەکەمانەوە، نەفرینی خوایان لیٚ بێت. لەنێوان ئەو دانیشتوانەدا ﴿يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِّنْهُمْ﴾ تائیفە و کۆمەڵێکی لەوان ژێر بارو سەرشۆڕ و چەوساوەکرد، بە چەند جۆرو شێوەیەك سزاو ئازار، لەکاتێکدا کە ﴿يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ﴾ کوڕەکانی بەزۆر ولێشاوی سەر ئەبڕن و ﴿وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ﴾[1] کچ وئافرەتەکانی ئەهێشتەوە، ئەم تائیفە وکۆمەڵەش بەنی ئیسرائیلی یەکان بوون، کەکاتی خۆی لەشامەوە چوون بۆ میسر، خواپەرست بوون لەسەر ئایینی باوك و باپیریان بوون، هەرچەندە لاری ولادانیان بەسەرهاتبیٚ، باوەڕیان بەتاك وتەنیای خوا مابوو، دژی ئاینی فیرعەون وبت پەرستی بوون، جا لەبەر ئەوە و بەهۆیەوە ئەو مل هوڕ وستەم کارە هەستی کرد کە بوونی ئەوانەلە ولآت دا جێگای مەترسی یە بۆ پادشایەتی یەکەی، نەئەکرا-لەبەر زۆری یان- دەریانکات لەولآت دا، چونکە ئەترسا بین بەکۆمەك و یارمەتی دەری پادشاکانی دەوروبەری و بەجاریٚ بەوانیشەوە لیٚ ی هەڵسن، لەبەرئەوە ئەوڕێگای شەیتانی و ئاگرینەی داهێنا بۆ نەهێشتنی ئەو مەترسی یەی کە هەیبو لەم تائیفە کە دژی خۆی وئایینەکەینی. ئەگێڕنەوە کەچەند مامانیٚ دیاریی کرد و فەرمانی**

---

[1] ئەوسیٚ کردەوە ڕابردوون وبە داهاتوو نیشا نیان ئەدات لەبەر ئامادە کردنی ئەو شێوە خراپە کەئەویش باوە لە ڕەوانبێژیدا. ! !

دا کە ئامادەبن بەسەر ئافرەتە دوو گیانەکانەوە، هەرکات منداڵە کانیان بووهەواڵی بدەنێ ئەگەر کوڕبن با سەریان بڕن تا ئامارەی پیاویان کەم بێت و بەهۆی ئەوەوە بێ هێزی بێ دەسەڵات بن!! ئەگەر کچن لێ گەڕێن بابن بۆ کارەکەریی، بێجگە لەوەش بوونی ئەوهەموو ئافرەتە بێ پیاو و بێ کەسە سزایەکی سەخت ترە لەهەموو سزایەك!!! ئەگێڕنەوە کە ئەو ستەمکارە کافرە خەوێکی بینی: کەئاگرێ لەقودسەوە هات و دای بەسەر خانووەکانی میسردا،هەموو ماڵە قیبتی یەکانی سوتاند وخانووی ئیسرائیلی یەکانی هێشتەوە، ئینجا پرسیاری ئەم خەوەی کرد لەزانایانی گەلەکەی، ئینجا کاهینە کان هەوڵیاندایە کەپیاوێ لەوشارەوە دەرئەچێ ونەمانی ئەمان لەسەر دەستی ئەودەبێت، بەهۆی ئەوەوە فەرمانی دابە وکردەوە پیسە کەس نەدیوە!ئەم گێڕانەوانە ڕاست بن یان نا، فیرعەون ئەو تاوانە گەورەیەی کرد دەربارەی ئەو گەلە بێ چارە ﴿إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ چونکە بەڕاستی فیرعەون لەو کەسانە بوو کە وڵات وێران کەرو پەرەپێدەر و بڵاو کەرەوەی تاوان و خراپەن. فیرعەونی ستەمکار بەهەموو هێزی تێکۆشانی کرد بۆ نەهێشتن و لەناوبردنی ئەو گەلە هەژارە، بەڵام خوای گەورە شتێکی ویست وبڕیاردا جیاواز لەوەی فیرعەون ویستی و لەدەروونی خۆی دا بڕیاری دا، ستەمکاران وسەرکێشە یاخی یەکان هێزو دەسەڵاتێ کە بەڕواڵەت هەیانە ئەیانخەڵەتێنێ و سەرخۆشیان ئەکات و بەهۆی ئەوەوە بێ ئاگان وبیر ناکەنەوە بۆلای خوا و تا چاوەڕوانی خواهیش و بڕیاری خوا بکەن، لایان وایە توانان بەسەر هەڵبژاردنو بڕیاریاردانی ئەوەی ئەیانەوەی بۆ دوژمنانیان، لەبەر نەفامی و بێ ئاگایی یان لایان وایە توانان بەسەر ئەوەی ئارەزووی ئەکەن، کەچی شتەکە بە پێچەوانەوە دەرئەچێت بۆنموونە: فیرعەون: خواهیشی ئەوە بووکەباس کرا، بڕیارو خواهیشی خوایش ئەوەبوو کە ئەفەرمۆێ: ﴿وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئێمەیش ئەمانەوێ کە منەت بنێین بە بەخشایشی خۆمان بەسەر ئەوانەی کە بە لاواز و بێ هێز دائەنران ژێر بار و ڕیسوا کران لەزەوی دا، واتە گەلی ئیسرا ئیلی لەوڵاتی میسردا، منەت بنێن بەخشایشی خۆمان بەسەر ئەوانەی کە بە لاواز بێ هێز دائەنران وژێر بارو ڕیسوا کران لەزەوی دا، واتە گەلی ئیسرا ئیلی لەوڵاتی میسردا، منەت بنێن بەسەریان دا بەڕزگار کردنیان لەوژێر دەستەیی وسزا مەینەتە کە ناڵەیان ئەهات لەژێر باری گرانی یەوە ﴿وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ﴾ ئەوان بگێرین بەمیرات بەروکە لەپووری فیرعەون و گەلەکەی بخرێتە دەستی ئەوان، یان بە میرات بەرو وڵاتی شامی یان بخرێتە ژێر دەست،

**﴿وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ﴾ جێگیرو دامەزراویان بکەین لەزەوی دا وزاڵ ودەسەڵات دار فەرمان ڕەوایان بکەین لەخاك و وڵاتی میسر و شام دا ﴿وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا يَحْذَرُونَ﴾ نیشانی فیرعەون وهامان ولەشکرو سوپاکەیان بدەین لەلایەن ئیسرائیلی یەکانەوە ئەوەی کەکاتی خۆی لێ ی ئەترسان وخۆیان لێ ئەپاراست، واتە ئەوەی کەفیرعەون و گەلەکەی بیمیان لێ ئەکرد، دووچاریان ببێ لەلایەن ئیسرائیلی یەکانەوە، ئێمە ویستمان ئەوە بەدی بێنین وپیشا نیان بدەین،**

**ئابەم شێوە پاشەڕۆژ وچارەنووسی ئەو دوو کۆمەڵەی ڕوون کردەوە و دەری بڕی پێش گێڕانەوەی بەسەرهات وسەرگوزەشتەکەیان، ئینجا دەست پێ ئەکات بە گێڕانەوەی سەرگوزەشتەکە، هەر لەیەکەم جارەوە بەشێوەیەك ئەیهێنێ دەستە قودرەتەکەی خوا ئاشکرا ئەکات بێ پێچ وپەنا، بێگومان موسا لەدایك بوو لەو کات و چەرخە سەخت و تەنگەدا، کە ئیسرائیلی یەکان تیای دا ئەژیان لەژێر باری زۆر گرانی جەور و ستەمی فیرعەون دا، بە جۆ رێ کە ڕۆژی ڕووناکیشیان شەوی ڕەشی تاری بوو، وەك بومان دەرکەوت و لەسەرەتاوە وەرگیرا، لەدایك بوو لە کاتی ك دا ترس و بیم دەوری دابوو و مردن بەلای سەرەیەوە وەستا بوو، تیغ ئامادە بوو بۆ سەربڕینی، چونکە بەپێ ی بڕیاری فیرعەون ئەبێ مامان ئامادە بێت هەر کوڕێ لە دایك بوو دەست بەجێ هەواڵی بگەیەنێ تا سەری ببڕن بە بێ دواخستن! لەو کاتە سەختە سامناکەدا لە دایك بوو، کەواتە دایکی هەژار سەرگەردانە، نازانێ چی بکات؟! دڵە لەرزەیەتی ئایا کەی هەواڵی بگەیەنرێت بە جەللادەکانی فیرعەون؟! ئایا چی بکات بەم کوڕە خۆشەویستەی؟! ناتوانێ پارێزگاری بکات! ناتوانێ بیشارێتەوە! منداڵە و لەدایك بووە و ئەبێت بگری و ئەو دەنگەی ئەبیسترێ و بێگومان پێ ی ئەزانرێ، ئەی خوایە چی بکات؟! بۆ کوێ بڕوات؟ چارەسەری ئەم ڕۆڵەی چۆن بکات؟!! کەواتە هیچ پەنایەك نی بەپەنای خوا نەبێت، ئنجا لە وێدا دەستی قودرەت هاتە پێشەوە ئەو گرێ کوێرەیەی کردەوە بو ئەو دایکە داماوە، بەم ڕەنگە خوا خستیە دڵی یەوە کە چی بکات و چۆن بجوڵێتەوە؟**

وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ

وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ﴾ رامان گەیاند بۆ لای دایکی موسا کە شیری بدەرێ تا بۆت دەست ئەدات شاردنەوە و داشاردنی ﴿فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ﴾ ئینجا کاتێ مەترسیت لێ پەیدا کرد، بەمەی هەستی پێ بکرێ و پێ ی بزانرێ ﴿فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ﴾ ئەو کاتە بیخەرە ناو دەریاکەوە -دەریای نیل- بەم ڕەنگە بیخاتە ناو سندوقێك و فرێ ی داتە ناوی وەکو لە شوێنی تردا باسی فەرمووە ﴿وَلَا تَخَافِى﴾ نەترسیت لەوەی کە شتێکی خراپی بەسەر بێت ﴿وَلَا تَحْزَنِىٓ﴾ غەمبار مەبە لە دوورکەوتنەوە و جیا بوونەوەی لێت ﴿إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ﴾ چونکە بەڕاستی ئێمە بەم نزیکانە ئەیگێڕینەوە بۆ لای خۆت و خۆت سەرپەرشتی و پەروەردەی ئەکەیت ﴿وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ لەپاشان ئەیکەین بە یەکێك لە پێغەمبەران و ڕەوانە کراوان. بێگومان دایکە موسا پێغەمبەر نەبوو تا وەحی بۆ هاتبێت، کەواتە مەبەست لە وشەی ﴿واوحینا﴾ ڕاگەیاندن و تێگەیاندنە نەك بە شێوەی وەحی پێغەمبەران -سەلامی خوایان لێ بێت- بەڵکو بە جۆر و شێوەیەکی تر، ئیتر بە ناردنی فریشتە بێت، لە وێنەی پیاوێك دا بە وێنەی ئەو فریشتەی ناردی بۆ لای مریەم، یان بە خەو نیشانی دابێت، یان هەر خستبێتیە دڵی یەوە و دڵنیای کردبێ پێ ی، کە ئەو جۆرە تێگەیاندنە پێ ی ئەوترێ: ﴿ئیلهام﴾. بەهەرکان لەم سێ بارە خوای خاوەن بەزەیی و بەدەسەڵات ئەو دایکەی تێگەیاند.

ئەی خوایە تەنها تۆ خوای، زۆر و دەسەڵات تەنها هینی تۆیە، کارەکە ئێجگار سەرسوڕهێنەرە!! با هەندێ بیر بکەینەوە لەم ڕووداوە. ئەی دایکە موسا شیری بدەرێ، ئینجا هەرکات مەترسیت لێ کرد لە کاتێك دا کە لە کۆشتایە و لە ژێر سەرپەرشتی و چاودێری خۆت دایە، کاتێ مەترسیت لێ کرد کە مەمکت لە دەمی دایە، وا بە پێش چاوتەوە کاتێ مەترسیت لێ کرد فڕێ ی دە ناو دەریاکەوە!!! و نەترسیت و غەمبار نەبیت، چونکە لەو دەریایەدا وا لە ژێر چاودێری کەسێك دا کە ئارامی و ئاسایش دەست ناکەوێت لەپەنای ئەودا نەبێت، کەسێك کە مەترسی لە پەنای ئەودا و لەگەڵ ئەودا بە هیچ ڕەنگ نەبووە و

نابێ، کەسێ کە ئەو شتانەی جێگای مەترسین هەرگیز نزیکی قەدەغەی ئەو ناکەونەوە! ئەو کەسە کە ئاگری سارد و بێ ئازار کرد لە ئاستی ئیبراهیم! ئەو کەسەیە کە جەریاش ئەکات بە جێگا پەنا و ئارام و خەوتن! ئەو کەسە کەسێکە نە فیرعەون و نە هەرچی زۆردار و ستەمکاری زەوی هەیە ناتوانن نزیك بکەونەوە لە قەڵای پەنای کار لێ نەکراوی. ئنجا بەه بەه لەو دوو موژدە گەورە و گرنگە، موژدەی گێڕانەوەی پارچە جگەرەکەی دایکی موسا بۆ ژێر سایە و سەهەندی دایکە بەسۆز و بەزەیی یەکەی بەم نزیکانە، ئنجا موژدەی گێڕانی بە پێغەمبەر و پێشەوا لە پاش ماوەیەکی ترا! ئەو تێگەیاندن و ڕاگەیاندنە بارانێکی ڕەحمەت بوو باری بەسەر ئەو دڵە بە کوڵە بێ ئارامەدا فێنکی کردەوە و پڕی کرد لە ئارامی و خۆشی و کامەرانی. ئنجا با بزانین ئەو خستنە ناو دەریا و دان بە دەم ئاوەوە سەری لە چی یەوە دەرچوو؟!! سەری لەمەوە دەرچوو کە ئەفەرموێ: ﴿فَٱلۡتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرۡعَوۡنَ﴾ واتە دایکی موسا ئەوەی پێ ی سپێردرا بوو بە جێ ی هێنا، ئینجا دەستە و بەستە و پیاوە تایبەتی یەکانی فیرعەون موسایان دۆزی یەوە لە دەریاکەدا و ژێر دەستی خۆیانیان کرد، کەواتە بەدیمەن و بە ڕواڵەت ئەو کردەوە سەری لەوپەڕی خراپی یەوە دەرچوو، چونکە ئەو دایکە هەژارە مەترسی هەر لەوە بوو کە خێڵی فیرعەون بزانن بە ڕۆڵە و خۆشەویستەکەی، هەموو مەترسی هەر لەوە بوو کە خێڵی فیرعەون بزانن بە ڕۆڵە و خۆشەویستەکەی، هەموو هەوڵ و تەقەلایەکی بۆ ئەمە بوو بیشارێتەوە لەوانە، کەچی ئەوا بەدەستی خۆی کارێکی کرد خستیە دەستیان!! بەڵێ سەرەنجام ئەوە بوو، بەڵام لێرەدازۆری بێ سنووری خوا خۆی دەرخست و بەری بڕی یەوە لە فیرعەون و هامان و سوپا و لەشکرەکەیان، چونکە ئەوان لە زەوی دا ئەگەڕان بەدوای منداڵێکی نێرینەی ئیسرائیلی یەکان دا، وا جاسووس و پیاوی تایبەتی خۆیان بڵاو کردبوووەوە لە شاردا و گوێ یان هەڵئەخست بۆ ئەمەی تەنها منداڵێك لەوانەیان لەدەست دەرنەچێت، کەچی ئەوان خول خول بێ ئەرك وبەدوادا گەڕان ئەوەی بەدوای دائەگەڕان کەوتەدەستیان، کەوتە بەردەستی فیرعەونی بێ بەزەیی وداخ لەدڵ!! بەڵێ خوا ئەو ڕۆڵەشێرە خۆرە بێ سایە وپەنایەی خستە بەر دەستی ئەوفیرعەونە و کۆمەڵە بەدبەختەکەی، بەڵام بە چ نیازێ؟ لەبەرچی، با گوێ شل بکەین بۆ قورئان سەرەنجام و دواڕۆژی ئەو دەست خستنەمان بۆڕوونبکاتەوە،

لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَـٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾ وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّى وَلَكَ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا

---

بفەرموێ: ﴿لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا﴾ واتە تاقمەکەی فیرعەون پێ یان کەوت لە موسا وخستیانە ژێر دەستی خۆیان بۆ ئەمەی ببێ بە دوژمن وداخی دڵ بۆیان، واتە کردەوەکەیان سەری لەوەوە دەرچووکە موسا بووبە دوژمن بەری لێ بڕینەوە، داخ ومەراقی بردە سکیان، ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَـٰطِـِٔينَ﴾ بەڕاستی فیرعەون وهەمان ولەشکر وسەربازەکانیان هەڵەبوون، بەڵێ هەڵە بوون نەیان ئەزانی هەرچی خوا بڕیاڕی دابێ ئەبێت هەر ئەوە بێ چارەو خۆپارێزیی ناکرێت وبەرگری هیچ بڕیارێکی ناکرێت ئینجا با بزانین بەچ جۆرێ خوا ئەو ڕۆڵە بێ چارە وبێ پشتیوانەی ڕزگار کرد و هێشتی یەوە لەژێر دەستی ئەوستە مکارەدا، هێشتی یەوە بەڕێز وخۆ شەویستی و کامەرانی یەوە، باگوێ شل کەین بۆ قورئان وەڵامە کەمان ئەخاتە دەست، کە ئە فەرموێ ﴿وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّى وَلَكَ﴾ ژنەکەی فیر عەون وتی بە فیرعەون: ئەمە هۆی ڕووناکی وچاوخۆشی دڵە بۆ منیش بۆ تۆش ﴿لَا تَقْتُلُوهُ﴾ مەیکوژن، ﴿عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا﴾ هیواو چاوەڕوانی ئەکەم کەسوودمان پێ بگەیە نێت یان بڕیاری بدەین بەڕۆڵەو کوڕی خۆمان، ئەمانەی وت، چونکە نور و ڕووناکی بەناو چاوی موساوو ڕوون وئاشکرابوو، نیشانەی پیت وفەڕو نەجابە تی پێوە ئاشکرابوو. بەکورتی هەرچەند خوا خوایە و بە هەرجۆرێ بیویستایە موسای ئەپاراست، بەڵام خواکار سازە لەم جیهانەداباوی وایەهەرشتێك ئەکات هۆی بۆئەسازێنێ، هۆی ئەوکارەی موسای بەم جۆرەکرد: خۆشەویستی دڵی ژنەکەی فیرعەون، دڵی فیرعەونیشی ژێربارکردبوو بۆئەوئافرەتە، هەرچی بووتایە بەجێ ی ئەهێنا وپێچەوانەی نەئەجولا یەوە، کەواتە ویستی سۆز و بەزەیی وخۆشەویستی بکات بەقەڵغانی موسا، کەئەوە ئەوپەڕی لوتفە و بەرژەوەندی موسا لەوەدابوو، خوای گەورە هۆی لەناوچوونی فیرعەون وشوێن کەوتووەکانی خستە دەستیان و بەو شێوە بەرگری کردن لێ ی و بەخۆشی و بەخۆشەویستی هێشتی یەوە،

وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٩﴾ وَأَصۡبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًاۖ إِن كَادَتۡ لَتُبۡدِي بِهِۦ لَوۡلَآ أَن رَّبَطۡنَا
عَلَىٰ قَلۡبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَتۡ لِأُخۡتِهِۦ قُصِّيهِۖ فَبَصُرَتۡ بِهِۦ عَن جُنُبٖ وَهُمۡ لَا
يَشۡعُرُونَ ﴿١١﴾ ۞ وَحَرَّمۡنَا عَلَيۡهِ ٱلۡمَرَاضِعَ مِن قَبۡلُ فَقَالَتۡ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰٓ أَهۡلِ بَيۡتٖ يَكۡفُلُونَهُۥ لَكُمۡ وَهُمۡ
لَهُۥ نَٰصِحُونَ ﴿١٢﴾ فَرَدَدۡنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَيۡ تَقَرَّ عَيۡنُهَا وَلَا تَحۡزَنَ وَلِتَعۡلَمَ أَنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ

---

﴿وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ لەکاتێکدا کەئەوانیش هیچ هەستیان نەکرد بەهەڵەو نەزانی وبێ ئاگایی خۆیان. ئینجا بالێرەدا واز لەموسا بێنین تاماوە یەك وبگە ڕێینەوە بوڵای دایکە غەمبارە داماوەکەی بزانین چۆن ئەژی؟! چۆن شەو ڕۆژی لێ ئەکوزەری؟! ئەفەرموێ: ﴿وَأَصۡبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًاۖ﴾ دڵی دایکی موساگەڕا بەدڵێکی خاڵی وچوڵ، هەست وهۆش وژیری لانەما لەتاو موسا وبیمی لەناو چوونی ونەمانی، بێگومان هیچ باس ویادێکی لانەما جگە لە هینی موسا!! ﴿إِن كَادَتۡ لَتُبۡدِي بِهِۦ﴾ بەڕاستی ها نزیك وخەریك بوو ڕاستی لێ بڵێ وئاشکرای بکات لەناو خەڵك داو شێت وشەیدا ببێت وبڵێ: من کوڕی خۆم زایە کرد، من ڕۆڵەی خۆم فەوتاند، من بەدەستی خۆم دام بەدەم ئاوەوە وخستمە ناودەریا. خەریك بوو لەتاوان ئاوا ڕاستی لێ بڵێ: ﴿لَوۡلَآ أَن رَّبَطۡنَا عَلَىٰ قَلۡبِهَا﴾ ئەگەر ئێمە دڵمان بەئارا مو دامەزراو نە کردایە ونەمان بەستا یەتەوە خۆی پێ نەئەگیرا وئاشکرای ئەکرد، بەڵام هێزو دامەزراومان کرد ﴿لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بۆ ئەمەی یەکێك بێت لەوانەی دڵ دامەزراو وباوەڕ دارودڵ دامە زراوەن بەبە ڵێنی ئێمە. بەڵێ بەڕاستی کارەکەی ئێجگار دڵ داچڵە کێنەربوو، تابیری لێ بکەیتەوە گەورەیی وسامناکی ڕوون تر ئەبێتەوە، ئافرە تێك کەبینی لەوە وبەر چەند کوڕپەی خۆشەویستی وەك کوڕپەی خۆی سەر بڕاوە، ئینجا بەهۆی تەنها ڕاگەیاندنێکەوەوە کوڕپە نازدارە کەی بخاتە بێشکەوە وسندوقێکەوە وبیدا بەدەم ئاوەوە

وبیخاته ناو دەریایه کی گەورەی وەکو نیل!! ئەبێ ئەوئافرەته ئەگەر خوا دامەزراوەی نەکات

چۆن دڵی ناتەقێتەوە؟! ئەبێ خەتەرەو خەیاڵ چی بەسەربێنێ؟! چۆن وبۆچی ئەمەی کرد؟!

ئاخۆ لەکوێ بێت وچی بەسەر هاتبێ؟! ئاخۆ شەپۆلی ئەوئاوه زۆرە چی بەسەر هێنابێ؟! ئایا

من چۆن بێ بیم وباوك بووم لەوەی ئەو پارچەی جگەرەم توڕدەمە ناو دەریا؟!! چۆن من

هەڵسام بەم کارەسامناکه! کەهیچ دایکێ لەم جیهانەدا شتی وای نەبیستوه چ جای

کردبێتی؟!! چۆن من چاوەڕوانی سەلامەتی بکەم لەجێگایەك کەسەرانسەری شوێنی

مەترسی یه، من چۆن لەخۆمەوە کەوتمە شوێن شتێك کەهەروا خرایه دڵم وپێم ڕاگەیەنرا؟!

ئەمانەوچەند خەتەرەو خەیاڵێکی ترکەخەو و خۆراك لەمەردوم هەڵئەگرێ، بابوەستێ هەوڵ

وتێکۆشانی شەیتان بۆ ئەمەی چەند پەلەو زەلەی پێ بکات دووچاری ناڕەزایی خوای بکات.

ئەو دایکە غەمبارە هەروا بێ هیچ دانە نیشت، بەڵکو هەوڵ وتێکۆشانی کرد بۆ هەواڵ

وزانینی وەکو ئەفەرمێ: ﴿وَقَالَتْ لِأُخْتِهِۦ قُصِّيهِ﴾ دایکی موسا وتی بەخوشکەکەی موسا:

بکەوە شوێنی وهەواڵێکی بزانە، ئیتر ئەوە پێش زانینی جێگا وشوێنی بووبێت ومەبەستی

ئەوە بووبێ کەئەکەوێتە کوێ وچی بەسەر دێت؟!! یان پاش ئەوەبوو کەزانی یان کەوتە لای

فیرعەون ومەبەستی ئەوەبووبێ کەبزانێت ئایا ئەیکوژن یان نا؟! بەهەر کام ولەسەر هەر بار

کەوتە دوای بۆ تاقیب کردن ﴿فَبَصُرَتْ بِهِۦ عَن جُنُبٍ﴾ ئینجابەدی کرد لەدوورەوە، دیارە خۆی لێ

هەڵە ئەکات وورده ورده نزیك ئەکەوێتە وە تادێتە لای لە ماڵی فیرعەون دا، ﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾

لەکاتێکدا وبەجۆری کەتاقمەکەی فیر عەون هەستیان نەکرد کەئەوەخوشکی یەتی وبەدوای

دائەگەڕێ بۆ هەواڵ زانینی، یان مەبەست ئەویە تاقمەکەی فیرعەونموسایان دۆزی یەوە

بردیانە لای فیرعەون و بەو جۆرە کەباس کرا هێشتیانەوە لەکاتێکدا هەستیان نەکرد کەهەڵە

بوون ئەوکارە بەزیانی خۆیان تەوا وبوو، بوو بەهۆی نەمانیان. ئنجا باسی هۆی گێڕانەوەی

موسا ئەکات بۆ لای دایکی، ئەفەرموێ: ﴿وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ﴾ ئێمە لەوە و بەر و هەر لەیەکەم جارەوە بەرگری شیر دەرانمان کرد لە موسا و قەدەغەمان کرد لەسەری شیری کەس بخوات، مەمکی کەس وەرگرێت، بەهۆی ئەوەوە داما بوون بەدەستی یەوە و منداڵەکەشیرە خۆرە و شیری کەسیش وەرناگرێت﴿فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُ لَكُمْ وَهُمْ لَهُ نَاصِحُونَ﴾ ئینجا خوشکەکەی موسا پـێی وتـن: ئایاڕێنموونی و دەست نیشانتان بکەم بۆ سەر خانەوادە و ماڵێك کە بۆتان بەخێو بکات و کاروباری ببەن بەڕێوە، لە کاتێك دا کە بەڕاستی دڵسۆز ئەبن بۆی و بە پاك و خاوێنی لەگەڵی ئەجوڵێنەوە، ئەوانیش بەوە زۆر کەیف خۆش و شادمان بوون. ئەویش دەست نیشانی کرد بۆ دایکی و بۆ ماڵی خویان و ئەوانیش لەگەڵی دوین و دیارە ئەوەش گەورەترین ئامانج و ئاواتی دایکی یەتی لەم جیهانەدا!! ئا بەو جۆرە خوا ئەفەرموێ: ﴿فَرَدَدْنَاهُ إِلَىٰ أُمِّهِ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ﴾ ئینجا ئێمە موسامان گێڕایەوە بۆ لای دایکی بۆ ئەمەی چاو ڕوون و دڵخۆش ببێت و غەمگین نەبێت، ﴿وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾ بۆ ئەمەی بزانێت کە بەڵێنی خوا ڕاستە و بێگومان بەدی دێت، ئەو بەڵێنەی کە لەپێشەوە پـێ ی ڕاگەیاند. ئینجا با بیر بکەینەوە و بە مل کەچی یەوە تۆزێ بوەستین لەبەردەم ئەو دەستە قودرەتەی کە ئەم کارە گرنگەی فەراهەم هێنا، ئەو فیرعەونە مل هوڕە ستەم کارە کە وێنەی خوارە چەندین کۆرپە و ڕۆڵەی شیرینی ئەو گەلە هەژارەی سەربڕی کەچی ئەم تەنها کۆرپەیەی لێ بەرگری کرد و بوو بەهۆی نەمان و لەناوچونی خۆی و هەموو دەسەڵات و سوپا و سامانی، ئەم تەنها ڕۆڵەیەشی پەروەدەکرد و پـێ ی گەیاند پـێ ی و بردی یەوە لای دایکیشی و ئەبێت فیرعەون هەڵسێ بە ئەرکی بەخێو کردنەکەیشی!!

وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤﴾ وَدَخَلَ ٱلْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦ ۖ فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ

---

خوای گەورە بەو شێوە بەڵێنی خۆی بەدی هێنا ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی ئەوانە نازانن و بێ ئاگان لە بەڵێنی خوا و ڕاستی بەدی هاتنی. ئنجا دەست ئەکات بە زنجیرەیەکی تر لە بەسەرهات و ژیانی موسا(درودی خوای لەسەر بێت) پاش ئەوە کە گەورە بوو و گەیشتە ئەوپەڕی هێز و تێر و تەواو بوو، لێرەوە دەست پێ ئەکات ئیتر بێ دەگ ئەبێچێت لەو ماوە دوور و درێژەی کە بەسەری دا تێپەڕی، لە پاش گەڕانەوەی بۆ لای دایکی تا ئەم کاتە، کەواتە نازانین کە گەڕایەوە بۆلای دایکی چەند مایەوە؟ چۆن پێگەشت لە کۆشکەکەی فیرعەون دا؟ لەپاش بڕانەوەی لەشیر پەیوەندی‌لەگەڵ دایکی دا چۆن بوو؟ ڕادە و ڕێزی لە ماڵی‌فیرعەون و لەدەرەوە چۆن بوو؟ لەمانە هەموو بێدەنگ ئەبێت، چونکە سوود و نرخی ئەوانە نی یە لێرەدا لەبارەی مەبەست لەم سورەتە و گێڕانەوەی بەسەرهات و سەرگوزەشتەکەدا، ئەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا﴾[1] کاتێ موسا گەیشتە ئەوپەڕی هێزی لەش، و پێگەیشت و ژیری تێر و تەواو بوو - کە ئەو کاتەش لەتەمەنی سی تا چل ساڵە - لێزان و کاردروستی لێزانان و زانینی زانایانمان پێدا و پێ بەخشی، کەواتە وتار و کردارێکی تەبوو کە بە خراپ دابنرێ ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ هەروەها بە وێنەی

---

[1] هەندێك ئەفەرموون مەبەست بە ﴿ حكم ﴾ پێغەمبەرێتی یە و مەبەست ﴿ علم ﴾ زانینی ئایین و شەریعەتەکەیە، یان مەبەست بە یەکەم ڕەوشت و لێزانی پێغەمبەرانەوە و دووەم تەوراتە، مەبەست بەدیهێنانی بەشی دووەمە لەو بەڵێنەی کە کاتی خۆی ڕایگەیاند بە دایکی موسا، بەڵێنی یەکەمیش ئەوە بوو کە فەرموی: ﴿ فرددناه إلى أمه ﴾ ئەمەش جوان و ڕێکە.

پاداشتی موسا و دایکی ئێمە پاداشتی کەسانێ ئەدەینەوە کە کردەوەی خۆیان چاك ئەکەن بە پـێ ی رشـەزامەندی خوا. ئنجا ئایا موسا مایـەوە لای فیرعـەون و لـە مالْ و کۆشکەکەی ئەودا تا ئەو تەمەنە؟ یان جیا بوو بێتەوە لێ ی و کەناری گرتبێ، دەروون و ویـژدانی رێگای نەدابێ بژی لەو شوێنەدا کە بەکوفر و تاوان و ستەم ئەو پەڕی رادە گرنگ بوو، کە ئەوەش نـاگونجێ لەگـەلْ پاك و خـاوێنی دلْ و دەروونـی کەسێکی وە موسـا(دروودی خـوای لەسـەر بێت)؟ بەتایبەتی ئەبێ دایکی تێ ی گەیاندبێ کە ئەم کێ یە؟ و گەل و نەتەوە و ئاینی کێن و چین؟! هیچ رابەرێکی بەهێزمان بەدەستەوە نی یە، بەلاّم لە گێڕانـەوەی بەسەرهاتەکەوە دلْ لـەبارەی دووەم بـە ئـارام و بـەهێز تـرە، ﴿وَدَخَلَ ٱلْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا﴾ موسا هاتـە نـاو شارەکەی فیرعەون لـە کاتێك دا کە باوی هاتنی نەبوو، خەلْکی چاوەڕوانی هاتنی نەبوون. وادەرئەکەوێت ئـەو شـارە پایتـەخت بـوو بـێ لەو کاتـەدا، ئنجا ئایا لـەکوێ وە هـات و لەچ شوێنی بوو لە پێش هاتنی دا؟ ئایا لە کۆشکەکەی فیرعەونەوە هات کە عین شمس بوو؟ یان لەوە و بەر کەناری گرتبێ و دەرچوو بێ لە کۆشك و لە پایتەخت و لـە پاشان هاتبێتـەوە لـەو کاتەدا چاوەڕوانی نەئەکرا، بۆ وێنە: لە کاتی نیوەڕۆ کە کاتی خەوتن و ئارام گرتنی خەلْکە. بـەهر حـالْ و لەهـەر کـات دا هاتـە شـارەکە ﴿فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ﴾ ئینجا لەوشـارەدا رێ ی کـەوت لـە دوو پیـاو کەجـەنگ و ئاژاوەیـان بـوو، خـەریك بـوون یـەکتریان ئەکوشـت ﴿هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ﴾ ئەمـە یـان لـە تـاقم و هـاو ئاینەکـەی بـوو ﴿وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦ﴾ ئەمـەیان لـە تـاقمی دوژمـن و ناحەزیەتی، ﴿فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ﴾ ئنجا ئەوەیان کەلە تاقمەکـەی خۆی بوو هـاواری لێ کرد و داوای یارمـەتی و کۆمـەکی لێ کرد لـە دژی ئەو بەسـەر ئـەوەی کـە لـەتاقمی دوژمنەکەی بوو -واتە یەکێکیان ئیسرائیلی و ئەوی تریان قیبتی بوو- ئـەلْێن لە پیاوەکانی دەورو بەری فیرعەون بووە و ئەلْێن چێشت کەری بووە، ئەو دووانە بەو جۆرە تێ هەلْگژابوون و لە پاشان ئەوەیان داوای یارمەتی کرد لە موسا،

﴿فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيۡهِۖ﴾ ئینجا موسا کوڵه مستێکی لێدا و بەهۆی ئەوەوە گیانی دەرکرد و کوشتی! لەشێوەی باسەکەوە وا پیشان ئەدات کە موسا لەو کاتەدا لای فیرعەون نەمابێ و لە کۆشکەکەی دەرچوو بێ، ئەو ئیسرائیلی یە زانیبێتی کە داخ لە دڵە بۆ فیرعەون و کۆمەڵەکەی، ئەیەوێت یارمەتی گەلە هەژارە چەوساوەکەی بدات، ئەگەر نا ئاوا هاواری لێ نەئەکرد بۆ یارمەتی دان، هەروەرها وەرئەگیرێ هێز و چالاکی موسا، ئەوەتا بە کوڵەمستێ ئەو قیبتی یەی لە گیان کرد، بەڵام هەرچەندخەشم و قین و بێزاری بەتین بووبێ لە فیرعەون و کۆمەڵەکەی وا دەرئەکەوێ نەیویستووە ئە قیبت یە بکوژێ، ئەووتا لەگەڵ لەشی کابرای بینی بە بێ گویان دەست بەجێ پەشیمان بووە وە و گەڕیەوە بۆ لای خوا و ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿هَٰذَا مِنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ﴾ ئەم کوشتنە لە کردەوەی شەیتانە، چوننکە بەهۆی خەشم و غەزەبەوە ڕووی دا، خەشم و غەزەبیش بەهۆی شەیتانەوە ڕووئەدات، ئەو ئاگرە ئەو هەڵیئەگیرسێنێ، هەموو کردەوەیەکی خراپ ئەو شیرینی ئەکات لە پێش چاو ﴿إِنَّهُۥ عَدُوّٞ مُّضِلّٞ مُّبِينٞ﴾ بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی گومراکەرە کە دوژمنایەتیی یەکەی زۆر ڕوون و ئاشکرا یە. ئەو کابرا قیبتی یە هەرچەند کافر بوو، لەو تاقمە ستەم کارەی فیرعەون بوو کە چەند ساڵ و زەمان خەریکی دەست درێژی بوون دەربارەی ئەو گەلی ئیسرائیلی یە هەژارە، گومانیش وایە ئەو شەڕی گێڕابێت بە ئیسرائیلی یەکە، هەرچەند ئەو کابرا هۆی کوشتنی زۆر بووە، بەڵام بۆ کەسێکی وەك موسا –کەلەپاشدا بوو بە پێغەمبەر– شایان و ڕەوانی یە درێژی و کوشتن. چونکە ئەوانەی کە خوا کردوونی بە پێغەمبەر هەر لە بنەڕەت دا بە پاکی هێناونی و ئارەزووی گوناهو خراپەکاریان نەبووە، بەڵێ ئەو کوشتنە زیان ناگەیەنێت بە پاکی و مەعسومیەکەی، چونکە بەدەست ئەنقەست نەبووە و نیازی کوشتنی نەکردووە و شتەکە بە هەڵە ڕووی دا، پێش پێغەمبەریەتیش بووە، بەڵام بە پێ ی باوی خواناسان –تەنانەت پێغەمبەران و ئەوانەی ئەکرێن بە پێغەمبەر– گوناه هەرچەند بچوك بێت ئەوان بە گەورەی دائەنێن و بەهۆی بچوکترین هەڵ بیم و ترسیان لێ ئەنیشێت و خۆیان لائەبێ بە ستەمکار و تاوانبار،

قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَٱغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُۥٓ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ ﴿١٧﴾

---

جا لەبەر ئەوە موسا پەشیمان بوویەوە لەو کردەوەی خۆیەوە و گەڕایەوە بۆ لای خوا بە پاڕە و لاڵە و ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي﴾ ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من جەور و ستەمم کردووە لە خۆم بەهۆی کوشتنی ئەو قیبتی یەوە پەشیمانم لەو کردەوە ﴿فَٱغْفِرْ لِي﴾ کەواتە لێم ببورە و گوناهەکەم بسڕەوە، خوایش گەڕانەوە و تۆبەکەی وەرگرت ﴿فَغَفَرَ لَهُۥٓ﴾ بە هۆی ئەوەوە لێ ی بورد ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ چونکە بێگومان تەنها خوا زۆرلێ بورد و بەزەیی دارە بە زۆری و فراوانی. وا دەرئەکەوێت موسا(دروودی خوای لەسەربێت) بەهۆی دڵی باوەڕداری ڕاستەقینە هەرکات سۆز و گەرم و گوڕی ڕاستی گەیشتە ئەو ڕادە بەتینە هەست ئەکات بە لوتف و بەزەیی خوا و وەرگرتنی نزا و لاڵەکەی، بێگومان ئەوەش یەکێکە لە چاکە و بەهرەکانی خوا بەسەر بەندەکانی یەوە، جا بەرامبەر بەو چاکە گەورەیە و چاکەی هێز و زانین و لێزانی و کاردروستی یەک کە خوا ڕشتبووی بەسەری دا، تاوانباران نەکات و لە ڕیزی ئەوان دا نەبێت. ﴿قَالَ﴾ موسا وتی: ﴿رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ﴾ ئەی پەروەردگارم بەحەقی چاکە و بەهرەی تۆ بەسەرمەوە بم پارێزە، یان سوێند بە بە چاکە کردنی تۆ و بەهرەت بەسەرمەوە من تۆبە ئەکەم و ئەگەڕێمەوە بۆ لای تۆ ﴿فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ﴾ کەواتە هەرگیز نابم بە پشتیوان و کۆمەك بۆ تاوانباران. ئیتر ئەو پشتیوانی و کۆمەکی یە ئەوە بوویێ کە لەناو کۆمەڵی فیرعەون دا بووە و لە دیمەن و شێوەی ئەوان دا بینراوە و بە یەکێ لە وان ناسراوە، یان بریتی بێ لە یارمەتی هەر شتێك و هەر کردەوەیەك کە هۆی تاوان بێت و سەری لەوەوە دەرچێ وەك یارمەتی ئەو ئیسرائیلی یە کە سەری لە کوشتنی ئەو کابراوە دەرچووە کە شتێکی نا ڕەوا بوو؟ بە هەرکام و بە هەر جۆر بەڕاستی دوور کەوتنەوە لە تاوان و تاوانبار گەورەترین سوپاس و بەرامبەریی کردنە بۆ چاکە و بەهرەی خوا، ئەوەیە نیشانەی ڕاستی. موسا(دروودی خوای لەسەر بێت) ئەوەی لەدەست قەوما،

فَأَصْبَحَ فِي ٱلْمَدِينَةِ خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا ٱلَّذِي ٱسْتَنصَرَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُۥۚ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِيٌّ مُّبِينٌ
﴿١٨﴾ فَلَمَّآ أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِٱلَّذِي هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِي كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًۢا
بِٱلْأَمْسِۖ إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِينَ ﴿١٩﴾

---

﴿فَأَصْبَحَ فِي ٱلْمَدِينَةِ خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ﴾ بەهۆی ئەوەوە لە شارەکەدا بوو بە پیاوێکی بێ ئارام و بیم دار، مەترسی ئەکرد لەوەی پێ ی زانرا بێت و تۆڵەی لێ بسەنرێتەوە، بەجۆرێ هەموو کات چاوەڕوانی ئەکردووچاری ببێ لەو کاتەدا کە ئەو بەو بێ ئارامی و ترسەوە ئەژیا ﴿فَإِذَا ٱلَّذِي ٱسْتَنصَرَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُۥۚ﴾ کەسەرنجی دا ئەوەی کە دوێنێ داوای یارمەتی لێ کرد و هاواری لێ کرد بە دەنگی بەرز و داوای یارمەتی لێ کرد و داوای بە هاوارەوە چوون و کۆمەکی لێ ئەکات دژی قیبتی یە تر کە لەگەڵی دا بەشەڕ هاتووە، وا دیارە ویستویەتی کە ئەمیش بە کوڵە مستێ بکوژێت وەکو ئەوەی دوێنێ ﴿قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِيٌّ مُّبِينٌ﴾ موسا وتی بە ئیسرائیلی یەکە: بەڕاستی تۆ پیاو خراپ و گومڕایەکی ئاشکرای، ئەوە بوو ڕۆژی پێشوو بووی بەهۆی کوشتنی یەکێك و ئەمڕۆش لەگەڵ یەکێکی تردا تێ هەڵگژابوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەیش دا هەر قیبتی یەکە تانبار ترە، چونکە ئەو تاقمە ستەمکارە هیچ کات دەستیان نەگێڕاوەتەوە لە هەر تاوان و دەست درێژی یەك کە بۆ یان کرا بێت دەربارەی گەلی ئیسرائیلی، کەواتە ویستی قیبتی یەکەی ئەمڕۆش وەکو دوێنێ لێ بکات، ﴿فَلَمَّآ أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِٱلَّذِي هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا﴾ ئینجا کاتێ موسا ویستی بە هەڵمەت و توندی بدات لەوەی کە دوژمنی گەورەیە بۆ هەردووکیان – واتە خۆی ئیسرائیلی یەکە– ﴿قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِي كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًۢا بِٱلْأَمْسِۖ﴾ دوژمنەکەیان وتی: ئەی موسا ئایا ئەتەوێ بم کوژیت هەرچۆنێ دوێنێ یەکێکت کوشت؟! وا دەرئەکەوێت کە بۆن و هەناسەیەك بڵاو بووبێتەوە لە کوشتنی قیبتی یە پێشووەکە، گومان برابێت بە موسا، چونکە ناسرا بوو بەوە کە بێزارە لە فیرعەون و تاقمەکەی و جەور و ستەمی زۆر و بەهێزیان، بێجگە لەوەش کوشتنی یەکێك لە پیاوانی فیرعەون لەسەر دەستی موسا شتێکی زۆر گەورە و گرنگە لای ئیسرائیلی یەکان و داخی دڵی ساڕێژ ئەکردن جا بەهۆی ئەوەوە ئەبێ ئەو

هەواڵە گرنگە بە خۆشی یەوە لە نێوان خۆیان بە نهێنی و چپە باسکراوە و ئینجا لەوەوە هەواڵەکە دەرچووە، بەهۆی ئەوەوە کاتێ موسا پەلامار ئەدات قیبتی دووەم گومان ئەبات کە موسا ئەیەوێ ئەمیش بکوژێت، لەبەر ئەوە ئەوەی پێ وت، بێجگە لەوە ئەمەیش پێ ی وت ﴿إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ تۆ ناتەویچ جگە لەمە بە بێ سەر لێ کردنەوە و لێدان و کوشتن و برین بەکار بهێنی لە ناو خەڵك دا، ﴿وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِينَ﴾ ناتەوێ لە ریزی پیاو چاکان و یەکێ بیت خراپ چاك کەران، ئەمیشی وت بە موسا، چونکە کاتی جەور و تاوان و خراپەکاری پەرەی سەند لە وڵات دا بە بێ بەرگری و بێزاری دەربرین. ئەو کاتە خەڵکی لەسەر سروشتی ئادەمی ئەترازێ و لە هەموو بار و رووبەکەوە ئەشێوێ بە مل یەك دا، کەواتە چاك بە خراپ و خراپ بە چاك سەیر ئەکرێت، بەرگری جەور و ستەم بە تاوان و خراپەکاری دائەنرێ و بڵاو کردنەوەی تاوان و خراپە لە وڵات دا بە چاکترین رەوشت و کردەوەی چاك ئەژمێررێ، کەواتەئەبێ موسا بە خراپەکار و گێرە شێوێن دابنرێ کە ئەیویست بەرگری جەور و تاوانی چەند ساڵە بکات!! زۆر لە زانایانی تەفسیر ئەفەرموون: ئەم وتارەی کە ئاراستەی موسا کرا لە لایەن ئیسرائیلی یەکەوە بوو، چونکە کاتێك پێ ی وت تۆ گومرا و سەر لێ شێواوی، پەلاماری دا بۆ کابرای قیبتی، ئیسرائیلی یەکە گومانی وا برد کە نیازی ئەوی کردوو لەبەر ئەوە ویستی بیترسێنێ بەوە و بەرگری بکات لە خۆی، هەروەها کوشتنی قیبتی یەکەی رۆژی پێشوو شتێکی نهێنی بوو لە نێوان خۆی و موسادا و کەسی تر نەیزانیبوو تا بیدات بە ناو چاوی دا. بەڵێ هەرچەند شتەکە رێی تێ ئەچێ، هەرچەند ئەمجۆرە ناپیاوی یانە زۆر روویداوە لەنێوان ئیسرائیلی یەکان دا بەرامبەر چاکە و پیاوەتی یە گرنگەکانی موسا، هەرچەند ئەم بارەش هەڵئەگرێ و جێگای بروایە، بەڵام باری یەکەم باشتر ئەنوسێت و بە ژیری یەوە و چاکتر ئەچەقێتە ناو دڵ. بەهەرکام و لەسەر هەر بار وا دەرئەکەوێت کە موسا کۆتایی هێناو کابرای قیبتی بۆی دەرچوو، هەواڵی دا موسا لای کۆمەڵ و تاقمی فیرعەون، ئەوانیش دەنگ و باسەکەیان گەیاند بە فیرعەون و ئەویش کۆنگرەی پێ گرتن بۆ راوێژ پێ کردن لە بارەی موساوە و بریاری کوشتنیان دا، ئینجا خوای گەورە کارێکی وای کرد موسا بەو کەین و بەینەی زانی،

وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ يَسْعَىٰ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَٱخْرُجْ إِنِّي لَكَ مِنَ
ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢٠﴾ فَخَرَجَ مِنْهَا خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢١﴾ وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ
مَدْيَنَ قَالَ عَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يَهْدِيَنِي سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿٢٢﴾ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً
مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّىٰ
يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴿٢٣﴾

---

**بەم جۆرە کە ئەفەرموێ: ﴿وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ يَسْعَىٰ﴾ پیاوێك لەوپەڕی شارەکەوە هات بەپەلە و چەسپانی ئەکرد، ﴿قَالَ﴾ وتی بە موسا: ﴿يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ﴾ بەڕاستی کۆمەڵێ پیاوە گەورەکان بەهۆی تۆوە کۆبوونەتەوە و ڕاوێژ ئەکەن بۆ کوشتنت ﴿فَٱخْرُجْ﴾ کەواتە لەشارەکە دەرچۆ پێش ئەوەی بتگرن ﴿إِنِّي لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ﴾ فیرعەون و کۆمەڵەکەی هەستیان کرد کە کوشتنی ئەو قیبتی یە لەلایەن موساوەدێ، ئەوە تۆڵە سەندن و زاڵ کردنی ئیسرائیلی یە کە تائەو کاتە بەدڵی هیچ کەسێکدا نەهاتووە سەربەرز کردنەوە و ملەجەڕە، بەڵکو ئەبێ وەکو مەڕ لەبەردەم قەساب دا کەوتبن و چی بەسەر یهێنرێ جووڵە نەکەن، کەواتە ئەو کارە گەورەیە کۆنگرە و کۆبوونەوەی ئەوێ، ئەوانە کۆبوونەوە و بڕیرای کوشتنیان دا و نەیانزانی سەری بڕیارەکەیان لە هیچەوە دەرئەچێ، خوا پیاوێکی وا دڵسۆز ئەسازێنێ ئەو هەواڵەی بۆ دێنێ، پیاوەکە ڕای بەهێز لەسەر ئەوەیە کە لەکەس وکاری نزیکی فیرعەون بووە، خوا لەخۆیان ئەو پیاوەی سازاند ئەو هەواڵەی بۆ هێنا!! ﴿فَخَرَجَ مِنْهَا خَآئِفًا﴾ بەهۆی ئەوەوە موسا لەشارەکە دەرچوو بەبیم و ترسەوە ﴿يَتَرَقَّبُ﴾ چاوەچاوی بوو لەوەی پێ ی بزانن و بیگرن، یان چاوەڕوانی لوتفی خوای ئەکرد کە ڕزگاری بکات. بەهەر کام لەوانە مەبەست بێت ئەم نزایەی کرد و ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئەی پەروەردگارم ڕزگارم بکە لەو گەل و کۆمەڵ ستەمکارانە، ئا بەو جۆرە لەشارەکە دەرچوو، قوتار بوو لێ یان، دەرچوو بە تاقی تەنیا و نەشارەزا و بەرە و شاری مەدیەن لە خاکی شام بە ئومێد و پشتیوانی خوا، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ﴾ لەکاتێك دا ڕووی کرد بەرە و**

شاری مەدیەن شاری شعیب پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەربێت) ﴿قَالَ عَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يَهۡدِيَنِي سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾ وتی ئومێدەوارم و چاوەڕوانم پەروەردگارم ڕێنموونیم بکات بۆ ناوەڕاستی ڕێگای ڕزگاری. ئەگێڕنەوە کە سێ ڕێگای هاتە بەر ئەویش ناوەڕاستەکەی هەڵبژارد و کاتێ دوژمنان هاتن بەدوا دا دوو ڕێگاکەی تریان دایە بەر و وتیان ئەوەی ترسی لە خۆی ببێ بەسەر شەقامی ڕاست و پان دا ناڕوات بەڵکو لاڕێ و تولە ڕێ ئەداتە بەر. ڕێگایەکی زۆر دوور و درێژی دایە بەر بە نەشارەزایی و بێ ئاو و نان و تێشوو، ئەڵێن هەشت ڕۆژ ڕێگای کرد بە پیادە و پێ خاوسی و خۆراکی گەڵا دار بووە تا گەیشتە جێ ی ئەو وڵات و خاکەی کە دەسەڵاتی فیرعەون ی بەسەردا نەبوو، ﴿وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدۡيَنَ﴾ کاتێ گەیشتە سەر ئاوەکەی مەدیەن، واتە ئەو بیرەی کە دانیشتوانی ئەوێ ئاویان لێ هەڵئەگۆست بۆ خواردنەوە ی خۆیان و ماڵاتیان، ﴿وَجَدَ عَلَيۡهِ أُمَّةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسۡقُونَ﴾ بینی بەسەر ئەو ئاوەوە کۆمەڵێکی زۆر لە خەڵکی ئاوی چوار پێ و ماڵاتیان ئەدا ﴿وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمۡرَأَتَيۡنِ تَذُودَانِۖ﴾ بینی لای خوارووییانەوە دوو ئافرەت بەرگری ماڵاتەکەیان ئەکەن لە هاتن بۆ سەر ئاوەکە، ئیتر بۆ ئەمەی تێکەڵی ماڵاتەکەی ئەوان نەبێت، یان هەر بەشەرم بوون مەبەستیان ئەوە بوو ئەوان لێ ببنەوە با تێکەڵی خەڵکی نەبن، یان ئەوان زۆردار و ستەمکار بوون مەترسی یان لێ ئەکردن، موسا ئەو دووانەی بەو جۆرە بینی ﴿قَالَ﴾ وتی پێ یلن: ﴿مَا خَطۡبُكُمَاۖ﴾ ئایا ئێوە مەبەستتان چی یە؟! نایەنە پێشەوە و بەرگری ماڵاتەکەتان ئەکەن ﴿قَالَتَا لَا نَسۡقِي حَتَّىٰ يُصۡدِرَ ٱلرِّعَآءُۖ﴾ وتیان ئێمە هەر باومان وایە ماڵاتی خۆمان ئاو نادەین هەتا شوانەکان ئاوی چوار پێ و ماڵاتی خۆیان ئەدەن و لایان ئەدەن لەسەر ئاوەکە ﴿وَأَبُونَا شَيۡخٞ كَبِيرٞ﴾ باوکمان پیاوێکی پیری گەورەیە، واتە باوکمان پەککەوتووە ناتوانێ هەڵسێ بە ئاودان و سەرپەرشتی ماڵاتەکەمان، لە ناچاری دا ئێمە بەخێویان دەکەین و ئەیانهێنین بۆ سەر ئاو، ئێمەش پێمان ناکرێ و بەجوانی ناوانین شان شانێن و مل ملانێ و تێکەڵی پیاوان، لەبەر ئەوە ئەوەستین تا ئەوان لێ ئەبنەوە. موسا(دروودی خوای لەسەر بێت) هەرچەند ماندوو و برسی و غەریب و ڕاکردوو بوو کاتێ ئەو شێوە ناڕەوایەی بینی خۆی پێ نەگیرا و پیاوەتی سروشتی پاك و خاوێنی هاتە جۆش و پەلاماری دا چووە پێشەوە بۆ ئەمەی لە پێشەوە ئەو ئافرەتانە ڕایی بکات بە پێ ی باوی پیاوی پیاوانە کە هەمووکات کاری ئافرت و داماوان پێش ئەخەن،

فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾ فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا
تَمْشِي عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ
عَلَيْهِ ٱلْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَتْ إِحْدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُ
إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِيُّ ٱلْأَمِينُ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ٱبْنَتَيَّ هَٰتَيْنِ عَلَىٰٓ
أَن تَأْجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ

﴿فَسَقَىٰ لَهُمَا﴾ ئینجا ئـاوی بـۆ هـەڵگوزین و ئـاوی ماڵاتەکـەیان دا، ﴿ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ﴾ لەپاشان چوو بۆ ژێر سێبەرێك کە بەو دەورەدا بوو، بێگومـان ماندوو و برسـی و بێ جێ و ڕێگە یە، بێجگە لە خوا داوا لـە کێ بکات؟! ﴿فَقَالَ﴾ بەهۆی ئەوەوە وتـی: ﴿رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾ ئـەی پـەروەردگارم بـە ڕاستـی مـن بێ ئـەوا و پێویسم بۆ هـەر خێر و خۆراك و هۆی ژیان و ڕۆزیەکە کە لەخەزنەی خۆت بیبارێنی بەسەرم دا، خوای گەورەش دەست بەجێ هـات بـە هـاواری یـەوە دەوووری خێـری لێ کـردەوە لـە هـەموو باریـچکەوە، بـەم ڕەنگـە دوو ئافەتەکە چوونەوە بۆ لای باوکیان بە چەسپاندنی هەواڵی ئەو پیاوە یان بۆ باس کرد کە ئەو پیاوەتی یەی لەگەڵ کردن، ئەویش فـەرمانی دا کە بۆی بـانگ بکـەن، ﴿فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا تَمْشِي عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ﴾ ئینجا ئـەکێك لـە دوو کچەکانی هـات بۆ لای و لەسـەر شێوەی شـەرم و حەیایـەکی گـرنگ هـات و ئـەهات بـەڕێوە بەشێوەیەك ڕوو و دەم و چاوی داپۆشی بـوو، وەك جێنشینی دووەم ئەفەرموێ، هات لەسەر شێوەی ئافەرتی پاك و خاوێنی داوێن پاك ئەگات بە پیاوان، ﴿قَالَتْ﴾ وتـی پـێ ی: ﴿إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ﴾ بەڕاستـی باوکم بانگت دەکات ﴿لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا﴾ بۆ ئەمەی پاداشتت بداتـەوە بە کرێ ی ئـەو ئاوەی کە بۆ ئێمـەت هەڵگوَست و دات بە ماڵاتەکەمان، بەو شێوە کورت و ڕوون و ڕەوانە بانگی موسای کرد و ئەویش بە گوێ ی کرد: ﴿فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيْهِ ٱلْقَصَصَ﴾ ئینجـا کاتێـك هـات بـۆلای باوکەکـەی و دەنـگ و بـاس و بەسـەرهاتی خـۆی گێڕایـەوە ﴿قَالَ لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ وتـی پـێ ی مەترسـە ڕزگـار بوویت لەو کەلە ستەمکارە، واتە فیرعەون و کۆمەڵەکەی. بێگومان موسا هەرچۆنێ پێویستی

هەبوو بە خۆراك هەروەرها پێویستی هەبوو بە ئارام و بێ ترسی، ئارامی و بێ ترسی پێویست تر بوو، لەبەر ئەوە لە پێشەوە باسی کرد و موژدەی دایە بە ڕزگاربوون، چونکە فیرعەون دەسەڵاتی نەبوو بەسەر مەدیەندا، ئەو دوو کچە پاك و خاوێنە لەژێر ئەرك و مەینەتی یەکی بەتین دا بوون بەهۆی شوانی و بەخێوکردنی ماڵاتەکەیانەوە، بەتایبەتی لە بارەی ئاودانیانەوە، چەنکە ئەبوایە شان شانێن و مل ملانێ و تێکەڵ و پێکەڵی یان بکردایە لەگەڵ ئەو هەموو پیاوە بێگانەدا، یان ئەبوایە، بوەستانایە و بەرگری ئاژەڵیان بکردایە تا ئەو خەڵکە لێ ئەبوونەوە. بێگومان ئافرەتی بە ناموسی پاك و خاوێن دڵ ئازار ئەبێ بەو تێکەڵ و پێکەڵی یەو چاوەڕوانی یەکەیش ئێجگار ئەرکێکی قورسە، ئینجا ئەوا خوا پیاوێکی بەهێزی دەم و دڵ و داوێن پاکی گەیاندووە، کە ئەوەش شتێك بوو بە چاوی خۆیان بینی یان کە ئەوەندە بەهێز بوو مل ملانێ ی کرد تا ئەمانی لە پێشەوە ڕایی کرد و لەو لایشەوە بۆ یان ڕوون بوویەوە کە چەند پاك و خاوێنە، ئەم کوڕە دەرکراو و لێقەوماویشە، کەواتە زۆر بەسۆز و ئارەزووە بۆ کارەکە، لەبەر ئەوە: ﴿قَالَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا﴾ یەکێك لە کچەکان وتیان بە باوکیان: ﴿يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ﴾ ئەی باوکی خۆشەویست بیگرە بە کرێ بۆ شوانی ﴿إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ﴾ چونکە بەڕاستی چاکترین کەس کە تۆ بیگری بەکرێ پیاوێکی بەهێزی دەم و داوێن پاکە. باوکە بەڕێزەکە قسەی کچەکەی وەرگرت و وا دەرئەکەوێت هەستی کردبێ بە مەیل و ئارەزوویەکی سروشتی و پاك وخاوێن لە نێوان موسا و یەکێك لە کچەکان دا کە شایان بێت بۆ دامەزراندنی بنەڕەتی ماڵ و خێزانێکی ڕێك و پێك. لەلایەکی تریشەوە بوونی پیاوی بێگانە و نامەحرەم لە ماڵ دا جوان نی یە، هەرچەند ڕادە و پلەی پاکی بەرز بێت. کەواتە باشترین شت ئەمەیە با شوانەکەیان ببێت بە پیاوێکی مەحرەم و خاوەن ماڵ و جێگای بێ کوڕی پێ پڕبکرێتەوە، لەبەر ئەوە بێ پێچ و پەنا و شەرم کردن فەرمووی بە موسا: ﴿قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنۡ أُنكِحَكَ إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ هَٰتَيۡنِ عَلَىٰٓ أَن تَأۡجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٖۖ﴾ بەڕاستی من ئەمەوێت یەکێك لەم دوو کچەم مارە ببڕم لێت لەسەر ئەمە کرێکاریم بکەیت لە هەشتساڵ دا، واتە هەشت ساڵ شوانی ئەم ئاژەڵەم بکەیت ﴿فَإِنۡ أَتۡمَمۡتَ عَشۡرٗا فَمِنۡ عِندِكَۖ﴾ جا ئەگەر کردت بە دەساڵ و دوو ساڵیش زیادەت کرد بە ماڵاوایی،

وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَۚ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ قَالَ ذَٰلِكَ بَيۡنِي
وَبَيۡنَكَۖ أَيَّمَا ٱلۡأَجَلَيۡنِ قَضَيۡتُ فَلَا عُدۡوَٰنَ عَلَيَّۖ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ ﴿٢٨﴾

---

ئەوە پیاوەتی یەکە لەلایەن خۆتەوە ئەیکەیت و من زۆرت لێ ناکەم ﴿وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَۚ﴾ من نامەوێ ئەرك و زەحمەتت بخەم بەسەرت دا، بەم ڕەنگە بە زۆر دەساڵەکەت پێ بکەم، یان گیر و گرفت وچەند و چۆنیت لەگەڵ بکەم لە چۆنی یەتی کردەوە و کاتی کردەوەت دا ﴿سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ منت دەست ئەکەوێت ئەگەر خوا بیوێت بە یەکێ لە پیاو چاکان، لە کردەوەی شیرین و نەرم و نیانی و بەڵێن بەسەر بردن دا. ئەو باوکە بەرێزە بەو شێوە شیرینە ئەو کارە گرنگەی خستە پێش چاوی و بەڵێنی پێدا بە کردەوەی جوان و زەحمەت نەدان، هیچ خۆیشی لەوەدا هەڵ نەنا، بەڵکو بە پێ ی باوی خواناسان پشتی بە خوا بەست و کار و فرمانەکەی حەواڵەی خوا کرد، موسا ش(دروودی خوای لەسەر بێت) شادومان بوو بەو مامەڵەیە و مارە برین و دابەستن و مارەیی یەکەی قبوڵ کرد و خوای کرد بە شایەت لەسەر ئەو پەیمان و بڕیارە ﴿قَالَ﴾ وتی بە باوکە بەرێزەکە: ﴿ذَٰلِكَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَۖ﴾ ئەوەی وتت پێم و پەیمانت لەگەڵ کردم لەسەر ئەو شەرت و شروتە شتێك بێت ڕاست و دامەزراو لە نێوان من و لە نێوان تۆ دا و کەسمان لێ ی دەرنەچین، ئینجا بەرێکی و بێ پێچ و پەنا مەرجەکەی ڕوون کردەوە وتی: ﴿أَيَّمَا ٱلۡأَجَلَيۡنِ قَضَيۡتُ فَلَا عُدۡوَٰنَ عَلَيَّۖ﴾ هەرکام لە دوو ماوەکەم بڕیار داو بەجێم هێنا بۆت ئیتر دەست درێژی نکرێ لێم و هیچی تر نەدرێت بەسەرم دا بەزۆر ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ﴾ خوا شایەت و چاودێر بێت بەسەر ئەوەی کە ئەیڵێن و لە نێوانمان دا ڕووئەدات و خوا حەواڵە ئەلاکراوی فرمانمان بێت. موسا(دروودی خوای لەسەر بێت) ئاوا بەو جۆرە ئەو مامەڵە و بڕیارەی بە ووردی ڕوون کردەوە، کە ئەوەش شتێکی پێویستە لە هەموو مامەڵە و بڕیارێکی شەرعی دا، لەکاتێك دا کە موسا لە دەروونی خۆی دا لانیازی وا بوو کە ناوە درێژەکەیان بە جێ بهێنێ وەك لە حەدیسێك دا ئەفەرموێ کە

بوخاری ئەیهێنێ کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ:﴿قضى اكثرهما و اطيبهما﴾ زۆرەکەیان و پاك و خاوێنەکەیانی بەجێ هێنا.

ئا بەو شێوە خوا دەرووی لە موسا و شوێنی ئارامی و چاکی بۆ سازاند لە ماڵی خەزورێکی وا چاك و دڵسۆز، بێگومان ئەو دەربەدەری و بەسەرهاتە بەرژەوەندی و هۆی تایبەتی خۆی هەیە کە پەروەردگاری لێزان و کار دروست باش ئەیزانێت. ئینجا لەبارەی ئەم پیاوە پیرە گەورەیە چەند رایەك هەیە کە کێ یە؟ زۆربە لەسەر ئەوەن کە ئەوە(شعیب) پێغەمبەر بووە(دروودی خوای لەسەر بێت)، هەندێ تر ئەڵێن: برازای بووە، و هەندێ تر ئەڵێن: پەیوەندی نەبووە بە شوعەیبەوە، بەڵکو پیاوێکی زانا و سالح بووە لەو شارەدا، ئەم زانینانە هیچ نرخ و بایەخێك نادەن بە سەرگوزەشتەکە و پەیوەندی نی یە بەمەبەست لە گێرانەوەکەی، ئەگەر سوودێکی ببوایە قورئان باسی ئەکردن، کەواتە پێویستە ئێمەش زیادەڕەوی نەکەین و لەسنوری قورئانەکە دەنەچین مەگەر بەگوێرەی حەدیسێك کە دەستمان بکەوێ لەو کتێبانەی کە باوەڕپێ کراون لە ناو زانایانی ئیسلام دا. بە تایبەتی لێرەدا هیچ بەڵگە و نیشانەیەك نی یە لەسەر ئەوە کە ئەو پیاوە(شعیب) بوو بێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە، چونکە هیچ دەست نیشانێك نی یە لە قورئان دا کە ئەو پیاوە لە ماوەی ئەو دە ساڵەدا هیچ باسێکی پێغەمبەرێتی خۆی کردبێ بۆ ئەو تەنها زاوایەی کە لە جێگای کوڕیشی دا بووە بۆی. ئەگەر ئەوە پێغەمبەر بوایە لەو ماوەدا باسێکی ئەوە ئەکرا و هیچ نەبێ قورئان دەستنیشانێکی بۆ ئەکرد، کەواتە با هەر بێ دەنگ بین لەو بارەیەوە و با هەر وازبێنین لەم زنجیرەی بەسەرهات و ژیانی موسا لە ماڵی ئەو پیاوە بەرێزەدا و دەست بکەین بە زنجیرەیەکی تر کەدەست پێ ئەکات لە دواهاتنی ماوەی خزمەت و شوانی یەکەی موسا و نیازی گەڕانەوەی لە مەدیەن بۆ میسر لەو ڕێگایەوە کو دوساڵ لەوە و بەر دایە بەر تەنها و بیم و ترس و بە ڕاکردوویی، بەڵام باری گەڕانەوەکەی زۆر جیاوازە لە باری هاتنەکەی، کاتێ کە هات ڕای کرد لە دەست فیرعەون و کۆمەڵەکەی، خوا خوای بوو هەرجۆر بووە ڕزگاری ببێ و دەرچێ، بەڵام کە ئەگەڕێتەوە خوا ئەیەوێ شتێکی دەست بخات کە بەدڵی هیچ کەس دا گوزەری نەکردووە. ئەیەوێ‌بە پێغەمبەرێتی بیگێڕێتەوە بۆ سەر فیرعەون، زۆردارترین و

سەرکێش ترین پادشای ڕووی زەوی لەو کاتەدا و لەگەڵ تردا، کە ئەو گێڕانەوە و ڕەوانە کردنەش سەری لەوەوە دەرچوو گەلی ئیسرائیلی ڕزگار کرد و فیرعەون بەخۆی و سوپا و سامنی یەوە لە ڕیشە هێنران و خرانە ناو دەریاوە!!!

جا لەپێش ئەمەی دەست بکەین بەم زنجیرە یە با کەمێ بوەستین لەبەردەم ئەو دەستە قودرەتەی کە لەگەڵ موسادا بوو، هەنگاو گواستی یەوە و ئەو هەموو قۆناغەی پێ بڕی هەر لە لەدایك بوون و شیر خواردنەوە تا ئەو کاتی گەڕانەوە! ئەو دەستە قودرەتە موسای خستە ناو دەریا بۆ ئەمەی بکەوێتە دەستی فیرعەون و کۆمەڵەکەی و موسای خۆشەویست کرد لە دڵی ژنەکەی فیرعەون دا، کە فیرعەون ژێر باری بوو بێ سەر لێ کردنەوە و ملە جەڕێ بە پێ ی ویست و ئارەزووی ئەو ئافرەتە ئەجولایەوە!! خوا ئاوا خۆشەویستی کرد تا ئەو منداڵە بە کامەرانی لەسایە و پەنای ئەو دوژمنە گەورەدا، ئەو ماوەیە ژیاندی بە ژیانێکی شاهانە لە ماڵی ئەو دوژمنەدا!! ئینجا لەناکاو دا لە کاتی بێ ئاگایی خەڵکی دا بردیە ناو شارەکەیفیرعەون تا ئەو قیبتی یە بکوژێ، ئەو پیاوە ئیماندارەی بۆ نارد لە تاقمی فیرعەونکە ئامۆژگاری بکات بە دەرچوون لەو شارە تا ڕزگاری ببێ لە کوشتن!! ئینجا لەو ڕێگا دوور و درێژ و سامناکەدا بردی و پاراستی تا کۆی کردەوە لەگەڵ ئەو پیاوە پیرە بەڕێزەدا تا دەساڵ لەوێ بمێنێ و خزمەت و شوانی بکات، ئینجا تا بگەڕێتەوە و لە ڕێگادا ئەو ئەرکە گەورەیەی بخرێتە سەرشان و سپاردە زۆر گرنگەی پێ بسپێررێ!! لەم ماوە دوور و درێژەدا ژیاندی و چاودێری و پارێزگاری کرد، بەچەند تەمێ و بەراورد و تاقی کردنەوە لە پێش بانگ لێ کردن و ڕەوانەکردنی بە پێغەمبەری، بەراوردکردنی چاودێری و خۆشەویستکردن و نازداری و نازپەروەریی، بەراورد کردن و تاقی کردنەوە بە ڕاپەڕین و پەلاماردان بەهۆی داخ و کینەیەك کە تەپەی دابووپیشی خواردبوو وەوە لە دەروون دا، بەراوردکردن بە پەشیمان بوونەوە و سام و بیم لە خوا و داوای لێ بوردن لێ ی، بەراورد کردن بە ترس و داچڵەکان و فڕاندن، بەراورد کردن و تاقی کردنەوە بە غەریبی و تەنهایی و تینوێتی و برسی یەتی . تاقی کردنەوە بە ڕەنجبەری و شوانی لە پاش ژیانی شاهانەی ناو کۆشك و تەختی شایی، هەروەها چەند بەراورد و تاقی کردنەوەیەکی تر بە خۆشی و

ناخۆشی و چەند هەستی جیاواز و چەند خەتەرە و چەند خەیاڵ و چەند ناسین و تێگەشتن و زانین، هەتا پێگەیی و گەیشتە ئەو پەڕی هێزی لەش و ژیری و ئامادە بوو بۆ هەڵگرتنی سپاردەی پەیام و پێغەمبەرێتی. بێگومان پێغەمبەرێتی ئەرکێکی ئێجگار قورس و گرانە و چەند بار و چەند گۆشە و ناوچەی هەیە، خاوەن و هەڵگری پێویستی هەیە بە توێشوویەکی گەورە و گرنگ و دەرچوون و گوزەر کردن بە چەند تاقی کردنەوە و بەراورد کردن و چەشتنی هەموو ساردی و گەرمی و خۆشی و ناخۆشی ژیان. هەڵگری ئەو پەیامە ئەبێ پێشەوا بێت لە هەموو کار و بارێکی ڕەوای ژیان دا تا شوێن کەوتووەکانی پەیڕەوی بکەن. پێویستی بەو هەموو توێشووە خەیە تا بتوانێ و ئامادە ببێ بۆ بەهرە و بەخششەکەی خوا کە تەنها بەدەست خۆیەتی و بە کۆشش و تێکۆشان دەست ناکەوێت، ئەوەش کە بریتی یە لەو وەحی یەی کە پێ ی ئەگەیەنێ و ئەو زانین و تەمێ و ئادابەی کە ئاڕاستەی دڵ و دەروونی ئەکات، بەلوتف و بەزەیی و میهرەبانی خۆی، بە تایبەتی پێغەمبەرێتی موسا لەوانەیە ئەرکی گرانتر بوو بێت یلە هەموو پێغەمبەرێکی تر جگە لە پێغەمبەرێتی محمد(ﷺ) چونکە ئەو ڕەوانە بوو بۆ سەرفیرعەونی ستەمکاری بێ بەزەیی کە مل هوڕترینی هەموو پادشایانی ئەو چەرخ و کاتە و دامەزراوتر بوو، ئەو لە هەمووان زۆرتر و دەست ڕۆیشتوو تر بوو لە ولآت دا. ئەو موسایە ڕەوانە کرا بۆ ڕزگارکردنی گەلێك کە ساڵەهای ساڵە لەژێر باری سەرشۆڕی و ژێر دەستەیی یەوە بوون، بە شێوەیەك ڕاهاتبوون لەسەر ئەو بارە لارە، ژێر دەستەیی و مل شۆڕی سروشتی ئادەمیی تێك ئەدات و ئەیگۆڕێ تا ڕادەیەك کەڵکی نامێنێ و بۆگەن ئەکات و ئەڕزێ و هیچ خێر و بێر و جوانی شیرینیەکی نامێنێ، هیچ کەس هەست ناکات بەو پیسی و بۆگەنی و چەپەڵی یەی کە تیای دا ئەتلێتەوە. جا ڕزگارکردنی گەل و کۆمەڵێکە وا بێ کەڵکو لەکارکەوتوو، فێر کردن و ڕام کردنیان لەسەر ئازادی و سەربەستی و پیاوەتی ئێجگار شتێکی قورس و گرانە! ئە پیاوە(دروودی خوای لەسەربێت) ڕەوانەکرا بوو بۆ سەر گەل و ئومەتێ کە ئایین و عەقیدەیەکی کۆنیان بوو، کەڵ یان لادابوو، لە ناوەڕاستی ڕێگا ڕاستەکەی ترازا بوون، شێوە ڕاستەقینەکەی لە دڵ و دەروونیان نە مابوو، بەڵکو وێنە و دیمەنی تری پەیدا کردبوو، کەواتە دڵ و دەروونیان

ڕاهاتبوو لەسەر بارێکی تایبەتی، نە خاڵی و بۆش و بێ ئاگا کە بە باشی جێگای ئایین و عەقیدەیەکی تازەی ببێتەوە، نە ئایین و عەقیدەیەکی ڕێك و ڕاستیشیان تیا بوو!! ئەو ئایین و عەقیدە پاکەی کە باو و باپیرە پێشووەکانیان هێنایان و لەسەری بوون، جا چارەسەرکردنی ئەو جۆرە دڵانە ئێجگار شتێکی سەخت و گرانە. بەکورتی ڕەوانە کرا بۆ دووبارە کردنەوەی بینای کۆشکی ڕووخاوی گەل و ئوممەتێ، بەڵکو بۆ دروست کردن و داڕشتنی هەر لە بنچینە و بنەڕەتەوە، چونکە ئەوە یەکەم جار بوو کە گەلی ئیسرائیلی ببێ بە گەلێکی سەربەست و سەربەخۆ، ژیانێکی تایبەتی هەبێت، ئایین و پەیامێك کە هەڵسێ بە ڕامیاری و کاربەدەستی و حکومڕانی لە وڵات دا، بێگومان دروست کردن و داهێنانیگەل و ئوممەت شتێکی زۆر بە ئەرك و زەحمەتە، بێگومان دروست کردن و داهێنانی گەل و ئوممەت شتێکی زۆر بەئەرك و زەحمەتە، کەواتە بەڕاستی زۆر بەجێ یە و مافی خۆیەتی ئەم سەرگوزەشتەیە ئەوەندە بایەخی پێ بدرێت و بەگرنگ بگیرێ، چونکە لە ڕووی ڕاستی دا نموونەیەکی زۆر تێر و تەواوە بۆ داڕشتن و دامەزراندنی گەل و ئوممەتێك لەسەر بنەڕەتی بانگەواز و بانگ کردن، لەگەڵ ئەو هەموو درك و داڵ و چڵ و چێو و پلەی سەختە کەڕێگا بگرێ لە ناو خۆ و لە دەرەوە. خوای گەورە موسای پێگەیاند و ژیاندی لەیەکەم جارەوە لە بەرز ترین کۆشك لەو سەردەمەدا بەو هەموو ناز و ڕێز ز بێ باکی و کامەرانی یەوە، لە پاشان ماوەیەك ژیاندی بە بیم و ترس و دەربەدەری، ئینجا دە ساڵیش بەو شێوە ژیاندی بە ئارام و ئاسایشەوە، بەڵام بە شوانی و ڕەنجدەری، بەهۆی ئەو هەموو بەسەرهات و تاقی کردنەوەوە پێ ی گەیاند و پاڵفتەی کرد تا ئامادەبوو بۆ هەڵگرتنی ئەو سپاردە زۆر گرنگ و گەورەیە، ئینجا کاتێ تەواو پێگەشت دەستی قودرەت گێڕایەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی تا لە ڕێگا سپاردەکەی بدات بەسەردا و ئینجا بچێ بۆ جێگا و شوێنی ئیش و کارەگرنگەکەی و ڕاگەیاندنی سپاردەکەی،

﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلْأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِۦٓ ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارًا قَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ

ءَانَسْتُ نَارًا لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٢٩﴾

**وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلْأَجَلَ﴾[1] ئینجا کاتێ موسا ماوەی شوانی یەکەی بەجێ هێنا -کەدەساڵ بوو - وەکو لە پێشەوە باس کرا، ﴿وَسَارَ بِأَهْلِهِۦٓ﴾ شەو ڕەوی کرد بە خێزان و هاوسەرەکەی و لەگەڵیان ڕۆشت و تا گەیشتە نزیك شاخی(طور) ﴿ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارًا﴾ گڕ و ڕووناکی یەکی بە بە شاد و مانیەوە بەدی کرد لە دوورەوە لای ڕاستی شاخی(طور)ه وە کە بە ئاگری ئەزانی، ئنجا کە ئەوەی بەدی کرد ﴿قَالَ لِأَهْلِهِ﴾ وتی بە خێزانەکەی: ﴿ٱمْكُثُوٓا۟﴾ بوەستن و بمێننەوە لێرەدا ﴿إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا﴾ چونکە بەڕاستی من بە باشی ئاگرێکم بەدی کرد واتە بوەستن با من بچم بۆلای ئەو ئاگرە ﴿لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾ بە ئومێدی ئەوەی بەڵکو هەواڵێکی ڕێگاتان بۆ بێنم لای ئەو ئاگرەو یان چڵۆسکێکی گەورەتان بۆ بێنم لای ئەو ئاگرە و یان چڵۆسکێکی گەورەتان بۆ بێنم کە ئاگری پێوەبێت، بەڵکو خۆتان گەرم کەنەوە. وەکو لە سورەتی ﴿طه﴾ دا باس کراو ئەو شەوە تاریك و زۆر سارد بوو و باوی خەڵکی وا بووە لەو جۆرە شوێنە بەرزانەدا بە شەو ئاگریان ئەکردەوە بۆ ئەمەی لەو دەشت و چۆڵ و بیابانەدا هەرکەسێك پێ گیرا بێ بچێ بۆ لای ئەو ئاگرە، ئەگەر ڕێگای ون کردبێ ڕێنموونی بکرێ و ئەگەر سەرمایشی بێت با خۆی گەرم بکاتەوە، جا بەو پێیەی موسا(درووودی خوای لەسەر بێت) ئەوەی فەرمو، لەو کاتەدا نەیئەزانی کە خوا کاری زۆر گرنگی پێ ی هەیە، لای ئەو ڕووناکی ئاگرە، هەر لەبەر ئەو کارە گرنگە نایە دڵی کە بگەڕێتەوە بۆ ئەو میسرەی کە کاتی خۆی بەو هەموو بیم و ترسەوە خۆی لێ قوتار کرد، ئەو ترس و بیمەی لە دڵ دا نەهێشت و لە بیری بردەوە کە کاتی خۆی پیاوێکی فیرعەونی کوشتووە و لەبیریان نەچووەتەوە هەر فیرعەونە ستەمکارەکەی جارانە، ئەمانەی لە دڵ دا نەهێشت و یاد و سۆزی خزم و کەس و کاری لەدڵی هەڵگڕاند، تا گەڕاندی یەوە و گەیاندی یە ئەو شوێنە پێویستی کرد بە چوون بۆلای ئەو ئاگرە کە:**

[1] لە سورەتی(طه) دا ئەم کۆچ کردن و گەڕانەوەمان بە درێژ تر و ڕوون تر باس کرد و بە ناویانگیشە، کەواتە با لێرەدا هەر لەگەڵ قورئانەکە بڕۆین و پێویست بە درێژە ناکات، لێرەدا هەر ئەوەندە بەسە.

فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ مِن شَٰطِيِٕ ٱلۡوَادِ ٱلۡأَيۡمَنِ فِي ٱلۡبُقۡعَةِ ٱلۡمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٠﴾

---

**﴿فَلَمَّآ أَتَىٰهَا﴾ کاتێ چوو بۆ لای و گەیشتە نزیکی ﴿نُودِيَ مِن شَٰطِيِٕ ٱلۡوَادِ ٱلۡأَيۡمَنِ﴾ بانگی لێ کرا لە کەناری لای ڕاستی شیوەکەوە، واتە لەو تەرەفەی کە لە ڕۆشتنی موسادا کەوتە دەستەڕاستی یەوە ﴿فِي ٱلۡبُقۡعَةِ ٱلۡمُبَٰرَكَةِ﴾ لەو پارچە زەوی یە کە پیت و فەڕدار کراوە و موفەڕرکە ﴿مِنَ ٱلشَّجَرَةِ﴾ واتە بانگی لێ کرا لەو درەختەی کە لەوێدا بوو -ڕەنگە ئەو درەختە لەو کاتەدا تاقانە درەختی ئەو شوێنە بەفەڕە بوو بێت -بانگی لێ کرا لەو درەختەوە ﴿أَن يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ بەم جۆرە: ئەی موسا بەڕاستی من کەسێکم ناوم ﴿الله﴾ یە پەروەردگاری هەموو جیهان و عالەمم، ئەم فەرمودەیە هەرچەند شێوەی وتەکەی جیاوازە لەوەی کە لەسورەتی ﴿طه﴾ و ﴿نمل﴾ دا فەرمووی، بەڵام لەمەبەست دا یەك شتە و جیاوازی تێدا نی یە، کەواتە هیچ کام دژ نین و ناچن بەگژی یەك دا، موسا(دروودی خوای لەسەر بێت) یەکسەر ئەم بانگ لێ کردنەی وەرگرت، وەریگرت بە تاق و تەنها! لەو شیوە قوڵە و لەو شەوە تاریکەدا!! وەریگرت بەو جۆرەی کە وەریگرت ئێمە نازانین و چۆن و بەچی وەریگرت و لە چ ڕێگایەکەوە؟! توانی ئەوە وەرگرێت کە لە توانای هیچ کەس دا نی یە مەگەر کەسێکیوەك موسا کە داڕێژراو و پەروەدەکرا لەژێر چاودێری خوادا و ئامادەکرا بوو بۆ ئەو وەگرتنە، ئەو بانگە بەفەڕە شیرینەی لێ کراو تێ گەیەنرا کە کرا بە پێغەمبەر ی خوا و ئەو ئەرکە زۆر گرانەی خرایە سەرشان، بێگومان پێغەمبەر ئەبێت موعجیزەی بە دەستەوە بێ بۆ ڕوون کردنەوەی ڕاستی پێغەمبەرێتی یەکەی، بە تایبەتی موسا کە ڕەوانەئەکرێ بۆ سەر مل هوڕێکی بەهێزی وەك فیرعەون، کەواتە پێویستی هەیە بە موعجیزەیەکی ئێجگار گەورە و بەهێز کە خەڵکی سەرسام و سەرگەردان بکات،**

وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ يَٰمُوسَىٰٓ أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ إِنَّكَ
مِنَ ٱلْأَمِنِينَ ﴿٣١﴾ ٱسْلُكْ يَدَكَ فِى جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ وَٱضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ
ٱلرَّهْبِ فَذَٰنِكَ بُرْهَٰنَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦٓ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٣٢﴾

---

**خوای گەورەش لەیەك جارەوە دوو موعجیزەی گەورەی پێدا: یەكەم: گۆچانەكەی، دووەم: دەستی ڕاستی كە ئەیكرد بە باخەڵی داوەك لەچەند شوێنێكی تردا باس كراو لێرەیش دا ئەفەرموێ: ﴿وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ﴾ بانگی لێ كرا بەمە كە دار دەستەكەت فڕێ دە، ئەویش بە پێ ی فەرمانی پەروەردگاری فڕێی دا، بەڵام چی بەدەستی یەوە و چاك ئەیناسیٚ بەڕێك و ڕوونی كە دارێكی وشك و ڕەق و تەقە، ئەو دار دەستە بوو بە ئەژدیهایەكی گەورە و كەوتە جوولا، و بزووتنەوە و وەك تیرە مار ئەفڕیٚ: ﴿فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ﴾ ئنجا كاتیٚ موسا بینی ئەجوولیٚ و ئەبزوێتەوە بە چەسپانی ئەڵیٚ ی تیرە مارە. كاتیٚ ئەوەی بینی ڕووی لیٚ وەرگێڕا و بەڕاكردن پشتی تیٚ كرد و نەگەڕا یەوە سەری، بەڕاستی ڕووداوێكی كوت و پڕی كەس نەدیوی سەر سوڕهێنەر بووە كە بەدڵی دا نەهاتووە شتی وا و چاوەڕوان و ئامادەبووە بۆی، بە پیٚ ی سروشتی ئادەمی ئەبیٚ لە شتی وا داچڵەكیٚ، ئینجا خوا دڵیٚ ئارام و دڵنیای كرد و فەرمووی پیٚ ی: ﴿يَٰمُوسَىٰٓ أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ﴾ ئەی موسا ڕووبكەرەوە و وەرە بۆ ئێرە و نەترسی ﴿إِنَّكَ مِنَ ٱلْأَمِنِينَ﴾ چونكە بەڕاستی تۆ لەو كەسانەی كە بیٚ باك و بیٚ ترسن لەوەی مەترسی خراپەی لیٚ ئەكریٚ، واتە تۆ یەكێكی لە پێغەمبەران، ئەوانیش بیٚ باك و نەترسن، كەواتە تۆیش مەترسە، ئەمەبوو موعجیزەی یەكەم، موعجیزەی دووەمیش ڕوون ئەكاتەوە بەم فەرمودەیە: ﴿ٱسْلُكْ يَدَكَ فِى جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ﴾ دەستت بخەرە ناو باخەڵ و ژێر باڵت و ئنجا دەری بهێنە، دێتە دەرەوە بە سپێتی و بریقە و ڕووناكی ئەداتەوە بە بیٚ ئەمەی لەكە و بەڵكی پێوە بێت. موسا(دروودی خوای لەسەر بێت بەفەرمانی خوا دەستی خستە باخەڵی و كە دەریهێنا جەست بەجیٚ بەو جۆرەی لیٚ هات كە خوا فەرمووی، دەستەكەی خۆی لە پێشەوە گەنم ڕەنگ و زەرد وام بوو، خوا بەو جۆرەی لیٚ كرد كە موعجیزەیەكی ڕوونە و دەست نیشان ئەكات بە ڕووناكی ڕێگای ڕاستەكەی و ڕوونی و**

بێگەردی ڕابەر و دەست نیشان ئەکات بە ڕووناکی ڕێگا ڕاستەکەی و ڕوونی و بێگەردی ڕابەر و بەگەی، بێگومان لەکاتی شتی وادا دڵ ئەکەوێتە تەپە تەپ و لەرزەو فرەفری نامێنێ پێ ی سروشتی ئادەمی، لەکاتی بیم و ترس دا دەست بخرێتە سەر دڵ فرەفرەی نامێنێ و ئارامی ڕووی تێ ئەکات، جا خوای پەروەردگار ئەم پەند و مۆچیاریەشی ئاراستە کرد ﴿وَٱضۡمُمۡ إِلَيۡكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهۡبِۖ﴾[1] باڵت بلکێنە بە خۆتەوە و دەست بخەرە سەر دڵت لەبەر سام و ترسێ کە بۆ پەیدا دەبێت واتە کە ئەوەت کرد دڵت ئارام ئەبێ و بیم و ترس لائەچێ لائەچێ، وەك دەستی باڵی پەلەوەر بێت کەلەکاتی ئارامی و ترس دا ئەیلکێنێ بەخۆیەوە، لەکاتی ترسا فش و بڵاوی ئەکاتەوە.موسا(دروودی خوای لەسەر بێت) ئەمەی وەرگرت لە خوای خۆی کە وەری گرت، بە چاوی خۆی ئەو دوو موعجیزە گەورەیەی بینی، ئنجا ئەوا مەبەست لەم دوو موعجیزە ئەبێ بزانی، ئەو ئەرك و داوایەی کە ئەخرێتە سەر شانی و لە ندالی یەوە بۆی ئامادە ئەکرێ ئەبێ بیناسێ وبیزانێ، ﴿فَذَٰنِكَ بُرۡهَٰنَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦٓ﴾ ئنجا ئەم دووانە — دار دەستەکەت و دەستت — دوو ڕابەر و بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا کە پێگهاتوون لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ تۆ کە ڕەوانە کراوی پێ یان بۆ سەر فیرعەون و کۆمەڵەکەی ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ﴾ چونکە بەڕاستی ئەوانە گەل و کۆمەڵێکی دەرچوون لە سنوور و قەدەغەی خوا و لەگوێ ڕایەڵی فەرمانی خوا، کەواتە زۆر شایانن بەوە کە تۆیان بۆ ڕەوانە بکرێ بەم موعجیزانەوە، ئەوا دەرکەوت مەبەست پێغەمبەرێتی بوو، مەبەست بەدیهێنانی ئەو بەڵێنە بوو کە دایکی موسا وەری گرت و خرایە دڵی لە کاتێك دا موسا تازە لەدایك بوو بوو، ئەو بەڵێنەی کە چەند ساڵی بەسەردا تێپەری و بەڵام هەر ئەبێ هەر بەدی بێت، چونکە بەڵێنی خوایە کە ڕاستە و گۆڕان نی یە بۆ هیچ بەڵێنێ، ئنجا لەوێدا موسا بیر ئەکاتەوە کە کاتی خۆی یەکێکی لە کۆمەڵی فیرعەون کوشت، ئەوانە بڕیاری کوشتنیان داوە و ئەم ڕای کرد لەدەستیان، کەواتە با داوای پارێزگاری و یارمەتی و بکات تا ئەو کارە گرنگەی پێ بکرێ و پێ ی ببرێ بە ڕێوە، لەبەر ئەوە،

---

[1] بە دوو جۆری تریش خاوەنی(کشاف) ڕاڤە و تەفسیری ئەم ئایەتەی کردووەتەوە، هەردوو جوان و ڕێکن، بەڵام لەم کاتەدا دڵم بەمە کراوەتر بوو کەلە تەفسیرەکەدا وتومە، خوا خۆی باش ئەزانێ..

قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿٣٣﴾ وَأَخِي هَٰرُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا
فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِيٓ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿٣٤﴾ قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجْعَلُ
لَكُمَا سُلْطَٰنًا فَلَا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا بِـَٔايَٰتِنَآ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم مُّوسَىٰ
بِـَٔايَٰتِنَا بَيِّنَٰتٍ قَالُوا۟ مَا هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّفْتَرًى

---

﴿قَالَ﴾موسا وتی ﴿رَبِّ إِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا﴾ ئەی پەروەردگارمبێگومام من یەکێکم لەوان کوشتووە، ﴿أَن يَقْتُلُونِ﴾ کەواتە مەترسی ئەکەم کە بم کوژن لەباتی ئەو کوژراوەدا، موسامەبەستی ئەوە نەبوو بەهانە بێنێتەوە و خۆی لەو کارە گرنگە بدزێتەوە و خۆی لەدەستی قوتار بکات. بەڵکو موسا ئەوەندە سوور بوو لەسەر کارەکە ئەیویست دڵنیا بێت لەوەی کە کارەکەی بۆ ئەڕوات بەڕێوە، ئەوەتا یارمەتی تریشی داوا کرد و وتی ﴿وَأَخِي هَٰرُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا﴾ هارونی برام، ئەو زمانی لەمن بەرەلاّترە و ڕەوان بێژترە لە من ﴿فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا﴾ کەواتە ڕەوانەی بکە لەگەڵم دا بە کۆمەك و یارمەتی دەریی ﴿يُصَدِّقُنِيٓ﴾ کە بەڕاست و ڕاستگۆم دەرکات بەهۆی پاڵفتەکردنی ئەوەی کە ڕاینەگەیەنم بە هێنانەوەی بەڵگە و نیشانە هەسەری، بەڕوون کردنەوەی پڕوو پووچی و قەڵبی ئەوەی دوژمن ئەیڵێت ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ﴾ چونکە بەڕاستی من مەترسی ئەکەم کە فیرعەون و کۆمەڵەکەی بڕوام پێ نەکەن و باوەڕم پێ نەهێنن و بە درۆزنم دابنێن. خوای خاوەن بەزەیی و پەروەردگار داوا و نزاکەی لە موسا وەرگرت و دڵ ئارام و دڵنیایی کرد بەم ڕەنگە، ﴿قَالَ﴾ پێ ی فەرموو﴿سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ﴾ بێگومان بەهێزت ئەکەین و کۆمەکیت ئەکەین بەبرا کەت و بێجگە لەداواکەی موسا موژدەی تەواوی پێدان و دڵخۆشی کردن و فەرمووی:﴿وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَٰنًا﴾ فەراهەمئەهێنین بۆتان دەسەلاّت و سەرکەوتنێکی گرنگ ﴿فَلَا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا﴾کەواتە فیرعەون و کۆمەڵەکەی بە سزاو ئازاردان ناگەنە لای ئێوە و زاڵ نابن بەسەر تاندا، کەواتە موسا و هارون بەدەستی ڕوت و بێ مەچەك نەچونە سەر فیرعەونی زۆر دار و چەکدار، بەڵکو چەکی زۆر و دەسەلاّتی خوایان لەگەڵ بووکە هیچ زۆر و دەستەلاّتێ خۆی بۆ ناگیرێ بەرامبەریان، دەستی هیچ

زۆردار و مل هوڕێکیان پێناگات،ئایا کێ ئەتوانێت سزا بکەیەنێت بەو دووانە؟ کەبەر هەڵست و پەرژینی خوایان بەچواردەورا کراوە!! چونەتە ناو قەڵا و پەنای خوا!! موژدەکەی خوا بەوە دوایی نەهات، لەو سنورەدا نەوەستا کە تەنها بەرگری یان لێ بکات، بەڵکو فەرموی ﴿بِـَٔايَٰتِنَآ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلۡغَٰلِبُونَ﴾[1] بەهۆی موعجیزەکانی ئێمەوە تەنها ئێوە و هەرکەس شوێنتان ئەکەوێ زاڵ و سەرکەوتوو ئەبن. دەستی قودرەتی خوا زۆر جار خۆی دەرئەخات بێ پێچ و پەنا، ئیشی خۆی ئەکات بەئاشکرا تا دەرئەکەوێ ئەو شتانەی خەڵکی بەهۆیان دائەنێن لە رووی دائەنێن لەڕووی ڕاستی دا هیچ نین و هیچ کار ناکەن، مەگەر بە ئیزن و بڕیاری خوا، تا لە دەروون دا ترازووی ڕاستەقینە جێگیر ببێ بۆ کێشانی هەموو هێزێ و هەموو شتێك، لە پاش ترازووی ڕاستەقینە جێگیر ببێ بۆ کێشانی هەموو هێزێ و هەموو شتێك، لە پاش ئەوە موسا گەڕایەوە بۆ میسر بی پێ ی فەرمانی خوا ئەچێتە سەر فیرعەون و کۆمەڵەکەی و بێگومان قسە و باس وت و وێژ و بەر بەرەکانێ و بەرپەرچ دانەوەی زۆر و زەبەندە ڕووی لە نێوان کۆمەڵی خوا و کۆمەڵی شەیتان دا، وەك لەچەند شوێن و سورەتی تردا باسی زۆربەی ئەو ڕووداو و بەسەرهاتانە کراوە، بەڵام لێرەدا بە پێ ی مەبەستی سورەتەکە درێژەی پێ نادات و بەکورتی بەسەری داتێپەڕ ئەکات و ئەچێ بۆ باسی دوا ڕۆژ و سەرەنجامی کوفر و سەرکێشی فیرعەونو کۆمەلەکەی کە بریتی بوو لەخنکانیان لەم جیهانەدا و ئاگری نەبڕاوە و نەفرینی خوا و بێ بەش کردنیان لە بەزەیی خوا و لەو جیهانەدا.

ئینجا با گوێ شل بکەین لە قورئانی بەفەڕ با ئەو باسەمان بۆ بکات ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا بَيِّنَٰتٖ﴾ ئینجا کاتێك موسا هات بە موعجیزەکانی ئێمەوە کە بەڵگەیەکی روون بوون لەسەر راستی موسا﴿قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّفۡتَرٗى﴾ ئەوانە وتیان بە نوسا: ئەمەی کە تۆ هێناوتە هیچ نی یە جگە لەوە جادوویەکە تەنها تۆ وات هێناوەلەپێش تۆ شتی وا نەکراوە، یان دەست هەڵبەستی خۆتە بە هینی خنەدەیتە قەڵەم،

---

[1] وشەی(ب) لە(بایاتنا) بە چەند شتێکەوە بەستراوە:(نجعل، لایصلون، انعبای بڕیار داوە، أقسمی بڕیار دراو، الابون) و بە پێ ی ئەمانە شێوەی تەفسیرەکە ئەگۆڕێت، بەلام لە مەبەست دا نزیکن بەیەکەوە و هەر یەك شتن..

وَمَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّيٓ أَعْلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ مِنْ عِندِهِۦ وَمَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ

﴿وَمَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ﴾ ئێمە ئەمەمان نەبیستووە بوو بێ لە باوك و باپیرە پێشووەكانمان دا، ئەمەی كە فیرعەون و كۆمەڵەكەی وتیان یەكشتە لەگەڵ ئەمەی بت پەرستەكانی قورەیش ئەیان وت بە پێغەمبەر(ﷺ) ﴿مَا هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّفْتَرًى﴾، ﴿وَمَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ﴾ ئەمە هەر دەم بازی و چەنەبازی یەكی ڕووتە ئەوانیش و ئەمانیش ئەیانكرد لە شتێكی ڕاست و ڕوون دا كە نەیان ئەتوانی بەرگری بكەن، هەر یەك دەمبازی و چەنەبازی یە و لەلایەن بەتاڵ و ناحەقەوە كراوە و ئەكرێت بەرامبەر حەق و ڕاست و لەهەر كات و شوێنێك دا هاتبێ و بەرامبەری وەستابێ، ناحەق و بەتاڵش دەم بەستراو بێت بێ وەلام مابێتەوە، لەو كاتەدا ناهەق خواز و خاوەن بەتاڵ هیچی بۆ نەماوەتەوە، ئەوەنەبێ ئەڵێ: ئەوەی خاوەن حەق ئەیڵێ و هێناویەتی جادووە و هیچ بەڵگەیەكیشیان نەبووە ئەمە نەبێ كە ئەمەشتێكی تازە پەیدابووە و ە ناو باو و باپیرانەوە ئەمەیان نەبیستووە، فیرعەون و كۆمەلچەكەی -وەك هەموو وێنەكانیان- لەهەر چەرخێك دا هیچ ڕابەر و بەڵگەیەكیان بەدەستەوە نەبوو، تا موسا لەگەڵ ئەو تاقمە بكۆڵێتەوە و بەرپەرچیان بداتەوە و دوای هیچ ڕابەر و بەڵگەیەكیان لێ نەكرد تا بیانداتێ، كەواتەشایانی ئەوە نەبوو دەمە دەمێ یان لەگەڵ بكات، لەبەر ئەوە كارەكەی هەواڵەی خوا كرد و بە كورتی بڕیەوە، وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّيٓ أَعْلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ مِنْ عِندِهِۦ وَمَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ﴾ موسا وتی پێ یان: پەروەردگاری من زانا ترە لە هەموو كەس و بەباشی زانایە بەو كەسەی كە حەق و ڕێنموونی و هۆی خستنە سەر ڕێگای ڕاستی لە لایەنی یەوە هێناوە، زانایە بەو كەسەی پاداشت و دواڕۆژی چاكی ئەم جیهانەی بۆ هەیە ودەست كەوت ئەبێ كە ئەوەش بریتی یە لە بەهەشتی نەبڕاوە كە لەمجیهانەوە بۆی تێپەڕ ئكرێت،

إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي فَأَوۡقِدۡ لِي يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجۡعَل لِّي صَرۡحٗا لَّعَلِّيٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ

---

**﴿إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ بەڕاستی ستەمكاران ناگەن بە ئامانج و ڕزگارنابن لە سزا و ناخۆشی، كەواتە لەم جیهانەدا ڕێگای ڕاست نادەنە بەر و دیارە لەو جیهانیش عاقیبەت شەڕ ئەبن. بەڕاستی وەڵام و بەرپەرچێكی زۆر شیرین و ڕاست و بەتامە، شێوەیەكی ڕێك و پێك و لێزانی تەمێ و ئامۆژگاری یەكی بەهێزی ناڕاستەكردن كە دەس نیشان ئەكات بە هەرەشە و هیچ ئاڵۆزیشیان ناكات، چونكە بەشێوەیەكی دیاری دان نانێ بە خراپی و عاقیبەت شەڕی یان دا. لەگەڵ ئەو هەموو ئەدەب و شەرمە شیرینەی كە موسا بەكاری هێنا(درودی خوای لەسەر بێت) فیرعەونی ستەمكاری عاقیبەت شەڕ دەم درێژی و خۆ لێ گۆڕان و لاقرتی و نەفامی و بێ شەرمی بەكار هێنا، وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي﴾ فیرعەون وتی بە كۆمەڵێ پیاوەكانی: ئەی گەل و كۆمەڵەكە من نەم زانیوە لەمەو بەر و تائێستا ئاگادار نیم بەهیچ خوا و پەرستراوێكی تر بۆ ئێوە جگە لە خۆم!!! بە ڕاستی وشەیەكی ئێجگار پیس و ناڕەوایە، ئەوپەڕی تاوان و ستەمكاری یە، كەچی ئەو كۆمەڵە نەفامەوە ڕیان گرت بە باوەڕ و دان پیانانەوە و بەبێ سەرپێچی و سەر لێ كردنەوە، پاڵپشتی فیرعەون لەو داوا ناڕەودا دوو شت بوو:**

**١- ئەو باوەڕە پڕ و پووچ و ئەفسانەیەی كە باو بوو لەناو میسری یەكان دا كە پادشاكانیان بە خوا دائەنا و سەیر ئەكرد.**

٢- ئەو دەست وەشاندن و دەست درێژی یەی کە بێ سەر لێ کردنەوە و بێ بەزەیی یانە بەکاری ئەهێنا، بە جۆرێ ڕێگای نەئەدا بە هیچ مێشك و دڵێك بیرێ کاتەوە! بەهیچ زمانێ هیچ شتێ بڵێ جگە لەوەی جگە لەوەی فیرعەون ڕەوای بدات و ڕای لێ بێت، ئەوانە بەچاوی خۆیان ئەیانبینی کە فیرعەون ئادەمی یەکە بە وێنەی خۆیان لە هەموو نیشانە و دروشمێکی ئادەمی یانەدا، کەچی ئەو داوا داوا ناڕێك و ناڕەوای دەکرد و ئەو وشە پیسەی بەدەم دا ئەهات، ئەوانیش گوێ یان بۆ شل ئەکرد بە بێ بێزاری و هیچ ڕەخنەیەك!! ئنجا ویستی وای دەربڕێ و خۆی وا پیشان بدات کە بەدوای ڕاستی دا دەگەڕێ، ئەگەر بۆی دەربکەوێت ئەوەی موسا ئەیڵێت ڕاستە ئەم مل پێچی ناکات، کەواتە با هەوڵ و تێکۆشان بکات بەدوای خوای ئەم موسا دا!! بەڵکو ڕێ ی لێ بکەوێ!!

لەبەر ئەوە وتی بە هامانی وەزیری: ﴿فَأَوۡقِدۡ لِي يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ﴾ کەواتە ئەی هامان کورەی ئاگر تاودە و خشتی سورەکراوم بۆ ی دروست بکە ﴿فَٱجۡعَل لِّي صَرۡحٗا﴾ ئینجا لەو خشتە کۆشکێکی بەرزو بڵندم بۆ دروست بکە ﴿لَّعَلِّيٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ﴾ بەڵکو بە ئومێدی ئەوە سەرکەوم بۆ ئاسمان بۆلای خواکەی موسا و ڕێم ڕێم لێ بکەوێ لەوێ!! واتە ئەگەر موسا ڕاست بکات ئەبێ ئەو خوایە لە ئاسمان دا بێت، کەواتە با ئەوەی بۆ دروست بکات تا لەوێوە سەرکەوێ بۆ ئاسمان ە بزانێ و بزانێت ڕاستە!! یان بەڵکو لەو کۆشکە بەرزەوە بە دووربین سەرنج بدات تا بەهۆی ئەستێرە گێڕی بۆی دەرکەوێت ڕاستە، یان هەر بەچاو ببینێت!!

وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٣٨﴾ وَٱسۡتَكۡبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ إِلَيۡنَا لَا يُرۡجَعُونَ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّۖ

ئەو فیرعەونە شەیتانە كاتێ كە بینی موعجیزەكانی موسا كاری كردووە لە دڵی ئەو خەڵكەدا ویستی خەریكیان بكات بە شتێكی ترەوە، دوو دڵ و دڵ كرمینیان بكات، وتی ﴿وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾ من بە ڕاستی لام وایە و گومان ئەبەم كە موسا لە كۆمەڵی درۆزنانە و درۆئەكات، واتە لەگەڵ ئەوەدا موسا بەڕاست نازانم، بەڵام هەر هەوڵئەدەم و تێكۆشان ئەكەم تاشتەكەم بۆ ڕوون ببێتەوە. ئنجا چەند زنجیرەیەك لە بەسەرهات و ڕووداوی نێوانی ئەم دوو كۆمەڵەیە واز لێ ئەهێنێ و باسی ناكات، تا بەپەلە دوا ڕۆژ و چارەنوسیان باس بكات و بیخاتە پێش چاو، ئەفەرموێ: ﴿وَٱسۡتَكۡبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ﴾ فیرعەو نو سوپا و لەشكرەكەی خۆیان بە زل زانی و مل خوڕی یان بەكار هێنا لە خاك و وڵاتی میسر دا بە ناهەق و نارەوا بێ ئەمەی شایانی ئەوە بن، ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ إِلَيۡنَا لَا يُرۡجَعُونَ﴾ گومانیان برد و لایان وابوو كە زیندوو ناكرێنەوە و ناگەڕێنرێنەوە بۆ لای ئێمە لە ڕۆژی دوایی دا، ئەو گومانە نا ڕەوایەیان برد و بە هۆی ئەوەوە بە ناهەق ئەو هەموو تاوان و خراپەیان كرد لە وڵات دا و خۆیان بەزل زانی و باوەڕیان نەهێنا بە موعجیزە و ڕابەرەكانی خوا وەكو بەدرێژی باس كرا لەچەند شوێن و سورەت دا. ﴿فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّۖ﴾ ئینجا ئێمەش قارمان لێ گرت لە خۆی و و لەشكر و سەربازەكانی و گرتنمانن و ئینجا تورمان دانە ناو دەریاكەوە. ئاوا بە كورتی باسی تۆڵە و سزایان ئەكات و لە هەردوو جیهان دا. لەم جیهان بەگرتنێكی بەتین و فڕێ دانیان بۆ ناو دەریا، فڕێ دران بە وێنەی پیچكە بەردێك كە بەدەست و بەلەپیتكە فڕێ بدرێ. تووڕ درانە ناو ئەو دەریایەی كە موسای بە تازە بووی و شیرە خۆری تێ تووڕ درا و كەچی بوو بە پەنا و قەڵا بۆی، هەر ئەو دەریا بوو كە فیرعەونی مل هوڕی ستەمكاری تێ خرا بە هەموو سوپا و لەشكرە كەیەوە و بوو بە هۆ و جێگای بەرباد بوون و لەڕیشەهێنانیان!! كەواتە ئاسایش و ڕزگاری تەنها لە سایە و پەنای خوادا دەست كەوت ئەبێت، بێ ئارامی و تیا چوون بەدی دێت لە دووری لە پەنای خواوە،

فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ
وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ وَأَتْبَعْنَٰهُمْ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ هُم مِّنَ
ٱلْمَقْبُوحِينَ ﴿٤٢﴾

---

**﴿فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئنجا سەرنج بدە ئەی پێغەمبەر ئایا چۆن بوو دوا ڕۆژی کافرە ستەمکارەکان؟! باسی بکە بۆ گەل و ئوممەتەکەت و بیان ترسێنە لە دووچار بوون بە وێنەی ئەو سزا و تۆڵەیەی کە بۆیان باس ئەکەیت، بەڵکو تەمێ خوار بن، بۆ ئەو جیهانیش بەو جۆرەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ﴾ فیرعەون و کۆمەڵەکەیمان گێڕا بە پێشەوایەك کە بانگی خەڵکی یان ئەکرد بۆ کوفر و تاوانێ کە هۆی سوتان و سزادانن بە ئاگری دۆزەخ، واتە بەهۆی خراپی خۆیانەوە گێڕامانن بە پێشەوا بۆ گومڕایی، بەم ڕەنگە تەنها بە کوفر و گومڕایی!! ئای هاوار، بۆ پیسی و خراپی ئەو پێشەوایی و بانگ کردنە!! ﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا يُنصَرُونَ﴾ لە ڕۆژی دوایی دا بەهیچ ڕەنگ یارمەتی نادرێن، کەواتە بەش و چارەنووسیان تێك شکانی هەردوو جیهان دا، تەنها تێك شکانی ڕووت بەشیان نەبوو، بەڵکو لەگەڵ نەفرین لێ کردنی ئەم جیهان و ناشرین کردن و قێزەون کردنی ئەو جیهانیش وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَأَتْبَعْنَٰهُمْ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً﴾[1] هێنامان بەدوا بەدوایان لەم جیهانەدا نەفرین و نەعلەت، واتە هەتا دونیا دونیایە، لەلایەن مەلائیکە و ئیمانداران ەوە نەفرینیان لێ ئەکرێ و نەغلەتیان بۆ ئەنێرڕێت، ﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلْمَقْبُوحِينَ﴾ لە ڕۆژی دوایی دا ئەوانە لە کۆمەڵی بێزرا و قێز لێ کراوەکانن، لە تۆڵەی بەرزی و بڵندی و خۆ بەزل زانی خۆیانەوە، ئەوە بەش و چارەنووسی کۆمەڵەکەی فیرعەون بوو بە کورتی باسی فەرموو.. ئنجا ئەوا بەش و بەهرەی بەرز و بەڕێزی موسایشمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە کە لەم جیهانەدا دەست کەوتی بوو، هۆی دەست کەوتی پلە و پایە و پلەی هەرە بەرزی ئەو جیهانیشی یەتی،**

---

[1] ئەم دوو ڕستەیە بە چەند جۆرێکی تر تەفسیر کراونەتەوە، هەموویان هەر ڕێك و ڕاستن، زانینی تەواو لای خوایە.

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ ٱلْأُولَىٰ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٣﴾﴾

**ئەفــــەرموێ:** ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ ٱلْأُولَىٰ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ **سوێند بەخوا بەخشیمان بە موسا کتێبێکی گەورە کە(تەورات) و لەپاش ئەوەی چەند تاقم و چینی چەرخە پێشووەکانمان لەناو برد و بەرباد کردن وەکو گەلی نوح و هود و صالح و لوط، ئەو تەورتەمان پێدا کە ڕووناکی یە بۆ دڵ و دەروونی خەڵکی بەهۆی ئەوەوە شتی ڕاست و ڕاستەقینەی پێ بناسن حەق و ناحەقی پێ جوێ بکەنەوە، ڕێنموونی و نیشاندەری بەرنامە و شەریعەتی خوایە، ڕەحمەت و بەزەیی بۆیان، چونکە ئەگەر ڕەفتاریان پێ بکردایە ئەگەیشتن بەڕەحمەتی خوا و سەریان لە ناز و ڕێزی بەهەشتەوە دەرئەچوو، ئەو کتێبەمان بەو جۆرە دا بە موسا بۆ ئەمەی خەڵکی بیر بکەنەوە و تەمێ و مۆچیاری وەرگرن، بیر بکەنەوە کەوا چۆن دەستی قودرەتی خوا هاتە پێشەوە و کەوتە نێوان مل هوڕ و ستەمکار و دەست دەست درێژی کەران و پێشێل کرا و بەش خورا و زۆر پێ هێنراون، بەلەناو بردن و لەڕیشە هێنانی ئەوان و زاڵ کردن و دەسەڵات پێدانی ئەمان. بەڕاستی بەش و بەهرە و بەخششەکەی موسا ئێجگار گەورە و گرنگ بوو، زۆر جیاواز بوو ەگەڵ بەش و چارەنووسی فیرعەون و کۆمەڵەکەی دا.**

**ئا بەم جۆرە دوایی هات دەنگ و باس و سەرگوزەشتەی موسا لەم سورەتەدا، کەشایەتە لەسەر ئەوە کە ئارام و ئاسایش نابێ و دەست کەوت نابێت لە سایە و پەنای خوادا نەبێت، هەرچۆنێ ترس و بێ ئارامی ڕوو ئەدات لەکاتی دووری لە خوا و سایە و پەنای خوادا، شایەتە لەسەر ئەوە، هەرچۆنێ شایەتە لەسەر ئەوە کە دەستی زۆر دەسەڵاتی خودا دێتە**

پێشەوە و بەهاوارەوە هەرکاتێ هێزی شەڕ و گومڕایی یەکلایی بوویەوە و پەرەی سەند بە جۆرێ هێزی خێر و ئیمان پەکی کەوت و دەسە پاچە بوو لەبەرگری کردن.

ئەم سەرگوزەشتەیە لەم سورەتەدا ئەو دوو مەبەستە گرنگە پیشان ئەدات کە زانین و جێگیر بوونیان لە دڵ و دەروون دا و بیر لێ کردنەوەیان زۆر زۆر پێویست بوو بۆ ئەو کۆمەڵە بچکۆلە کەمە زۆر پێ هێنراوی ئەو کاتەی مەککە بەرامبەر کۆمەڵی زۆری زۆرداری بەهێزی بت پەرستەکانی ئەو چەرخە. ئەوان پێویستیان بوو بۆ ئەمەی بێ باك و بەئارام بن و نەترس بن، کۆمەڵی بت پەرستیش پێویست بوون بەڵکو بیر بکەنەوە و کۆتایی بێنن، هەروەها پێویستی هەیە بەو دوو مەبەستە لەهەرکات و چەرخێك دا ئەو دوو هێزە ببن و بەرامبەری یەك بوەستن، گێڕانەوەی مەبەستەکانی قورئان بەو شێوە پڕ لەبەرژەوەندی و هۆی پێگەیاندن و پەروەردە کردنی دڵ و دەروون، ئەم بەشە لە سەرگوزەشتەی موسا دوایی هات(درودی خوای لەسەربێت) بەو جۆرە شێوەی کە باس کرا. ئنجا چەند مەبەستێ ئەهێنێ بەدوای ئەم بەشەدا پێش هێنانی بەشی دووەم: لەبارەی ئەمەوە کە ئەو سەرگوزەشتەیە شایەتە لەسەر ڕاستی پێغەمبەر(ﷺ) کە پیاوێکی نەخوێندەوار و پێگەیشتوو لەناو گەلێکی نەخوێندەوار و دوور لە زانا و خوێندەوار، ئەم هەواڵانەی ڕابردووی چەند هەزار ساڵی لەوە و بەری ئەگێڕایەوە بەدرێژی وەکو خۆی بەچاو دیبێتی لەو کاتانەدا بووبێ، ئەم هەواڵانەش دەق و ڕێك و ڕاست بوون لەگەڵ ئەوەی کەلە تەوراتی دەست تێ نەخراودا بوو، لەگەڵ ئەوەی زانایانی ئەهلی کیتاب ئەیانزانی، ئینجا لەگەڵ ئەوەدا ئەوانە دوژمنێکی ئاشکرا بوون هیچ کام نەیان ئەتوانی لەهیچ شتێك دا دژی بوەستن و بەدرۆی بخەنەوە، بەڵکو هەر گۆڕاندن ودەست تێ خستنێکیان کردبوو لە تەورات و ئینجیل دا ئەم هەواڵی لێ ئەدان و ئەوانیش نەیان ئەتوانی بەرپەچی بدەنەوە.

وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلۡغَرۡبِيِّ إِذۡ قَضَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلۡأَمۡرَ وَمَا كُنتَ مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٤٤﴾ وَلَٰكِنَّآ أَنشَأۡنَا
قُرُونٗا فَتَطَاوَلَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُۚ وَمَا كُنتَ ثَاوِيٗا فِيٓ أَهۡلِ مَدۡيَنَ تَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِنَا وَلَٰكِنَّا
كُنَّا مُرۡسِلِينَ ﴿٤٥﴾ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذۡ نَادَيۡنَا وَلَٰكِن رَّحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَ

کەواتەهەموو ژیریٚ ناچارە ئەبیٚ باوەڕبیٚنیٚ کە ئەم هەواڵانە لەلایەن خواوە گەیشتووە بەم پێغەمبەرە(ﷺ) ئەفەرمویٚ ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلۡغَرۡبِيِّ إِذۡ قَضَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلۡأَمۡرَ﴾ تۆ ئەی پێغەمبەر ئامادە نەبوویت لەو شوێنەی کە لە بەشی ڕۆژئاوای شاخی(طور)ە وە بوو، کە ئەوە شوێنیٚ بوو کە خوا وادە و بەڵێنی دابوو کە موسا بچێت لەوێدا وەحی لەخوا وەرگریٚ و ئەو لەوحانەی کە تەوراتی لیٚ نوسراوەتەوە وەرگریٚ.، حەفتا کەسیش لەگەڵەکەی هەڵبژێرێت ئامادەی ئەو شوێن و کاتەبن، جا ئەفەرمویٚ: تۆ لەو شوێنە نەبوویت لە ئەو کاتەی وەحیمان کردە لای موسا، ئەوەی ویستمان ئاشنای بکەین پیٚ ی، ئەو تەوراتەی کە نوسیمانەوە بۆی لەو لەوحانەی کە لەو شوێنەدا وەریان گریٚ، ﴿وَمَا كُنتَ مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾[1] تۆ لەو حەفتا کەسەش نەبووی کەبەدیارەوە بوون بۆ ئەوەی کەڕووی دا و بینیان و شایەت بوون لەسەری و شتێکی ڕوون ئاشکرایە کوهیچ هۆیەکی تر نەبووە لەلایەن پێغەمبەرەوە بۆ زانینی ئەم هەواڵانە، کەواتە ئەبیٚ ئەم هەواڵانەی لە خواوە وەرگرتبیٚ و وەحی بۆ کرابیٚ وەکو ئەم فەرمودەیەش دەستنشانی بۆ ئەکات ﴿وَلَٰكِنَّآ أَنشَأۡنَا قُرُونٗا فَتَطَاوَلَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُ﴾ واتە تۆ لەویٚ نەبووی، ئەو کات و چەرخەت نەدیوە تا ئەو هەواڵانە بزانی، بەڵکو ئێمە وەحیمان بۆ کردی و وەحی کردنەکەش پێویست بوو، چونکە ئێمە چەند چین و چەرخێکی زۆرمان دروست کرد لە پاش موسا تا ئەکاتە تۆ، ئنجا ئەوەندە ماوە کە درێژەی کێشا و تێپەڕی کرد بەسەریاندا، تا هەواڵو دەنگ و باسە ڕاستەکان دەستیان تیٚ خرا و ئاین و شەریعەتەکە تێکدرا و شێوێنرا و

[1] ئەم ڕستەیە بە چەند جۆر تەفسیر کراوەتەوە، هەندێکیان نزیکە و هەندیٚ تریان بە دوور دائەنریٚ و هەموویشی ئەگونجێت، خوا خۆی باش ئەزانیٚ...

علم و زانینی ڕاستەقینە لەبیرچووەوە، کەواتەپێویستی پەیدا بوو بە تازەکردنەوە و ناردن و ڕاگەیانـدن ی ئـاین و شـەریعەتێکی تـازە و گێڕانـەوە ی بەسـەرهات و سەرگوزەشـتەکان بەشێوەی ڕاستەقینەکەی خۆیـان، بـەهۆی ئـەوەوە سـروشمان کـردە لای تـۆ و ئـەو هەواڵـە غەیبیە نەزانراوەمان پێ ڕاگەیاندا، هەریەکێ لەم هەواڵانە موعجیزەیەکی سەربەخۆن و بەڵگە و نیشانەیەکی ڕوونن لەسەر ڕاستی پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمان وەکو قورئانیش بەتایبەتی باسیان ئەکات و سەرنجیان بۆ ڕائەکێشێت، جا یەکێ تر لەوانەئەمەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتَ ثَاوِيًا فِيٓ أَهۡلِ مَدۡيَنَ تَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِنَا﴾[1] تۆ نیشتە جێ و دامەزراو نەبویت لەناو خەڵکی مەدیەن دا تا بەهۆی ئەوەوە ئاگادار و ئاشنا بوو بی بەسەر هەواڵی موسا و مانەوە و بەسەر هاتی لە مەدیەن دا، تۆ کاتی خۆی لەوێ نەبووی تا ئەو هەواڵانەی بە وردی و درێژی لەم ئایەتانـەدا هـەن تـۆ ئاگـاداری پێیـان ئەیخوێنیتـەوە بەسـەر خەڵکدا هـیچ هۆیـەك نـی یـە بـۆ ئاگاداریـت جگە لـەوە تـۆ پێغەمبـەریت و ئێمـە وەحـی مـان بـۆت کردووە، وەکو دەستنیشان ئـەکات کـە ئەفـەرموێ: ﴿وَلَٰكِنَّا كُنَّا مُرۡسِلِينَ﴾ بـەڵکو ئێمـە نێـرەری تـۆین و کردمـانی بـە پێغەمبـەر و هـەواڵمان پێـدای، یـەکێ تـریش ئەمەیـە: ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذۡ نَادَيۡنَا﴾[2] تـۆ لـە تەنیـشتی شـاخی(طـور) ە وە نـەبویت و ئـەو بانگـەت نەبیـست هـەتا هـەواڵی ئـەو هەواڵـە و بەسەرهاتە بزانیت بەڕێکی ڕایگەیەنێت بەخەڵك: ﴿وَلَٰكِن رَّحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَ﴾ کەواتە بەڵکو زانین و ئاگاداریەکەت بە هۆی ئەوەوە بوو کە ئێمە تۆمان کرد بە پێغەمبەر و زاناو ئاشنامان کردی بەو هاوەڵانە، لەبەر ڕەحمەت و بەزەیی یەك لەلایەن پەروەدگارتەوە بە گەلەکەت و بەو خەڵکە، تا بەهۆی ئەو هەواڵانەوە بزانن کە ڕاستە تۆ پێغەمبەری و ئەو هەواڵانە لە خواوە وەرئەگری،

---

[1] بەجۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە بەڵام ئەوەی لە تەفسیرەکەدایە زۆرتر دڵ پێ ی ئارامە و بەمەوە ڕێکترە خوا خۆی باش ئەزانێت.

[2] بێگومان بوونی موسا لە مەدیەن دا پێش بانگ لێ کردن و گێڕانیەتی بەپێغەمبەر، ئەم بانگ لێ کردنەشی پـێش بڕیاری شەریعەت و تەورات پێ دانە، بەڵام بـەم ڕێـزی خۆیـە دەستنیـشانی نـەکرد بـۆ ئـەم سـێ هەواڵـە، بـەڵکو سێیەمی کـرد بەیەکەم و یەکەمی کرد بە دووەم و دووەمی کـرد بـە سـێ یـەم، هـۆی ئـەوەش دەستنیـشانکردنە بەمـە کەمـەرکام لـەم هەواڵانە بەڵگە و ڕابەرێکی سەربەخۆیە، نەك بەهەرسێکیانەوە ڕابەرێکە..

هـۆی ڕەوانـە کردنەکەشـت ئەمەیـە: ﴿لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ﴾ بـۆ ئەمـەی بترسـێنیٚ بەتوڵـە و سـزای خـوا گـەل و کۆمـەڵێ کەلـەپێش تـۆوە هـیچ ترسـێنەرێکیان بـۆ نەهاتووە، کەواتە زۆر پێویستن بەو ترساندنە ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ بۆ ئەمەی بیر بکەنەوە و پەند و مۆچیاری وەرگرن و خۆیان بپارێزن لە گوناهو تاوان. ئەم ڕستەیە وا نیشان ئەدات کەمەبەست بەم گەلە لێرەدا کەلەپێش پێغەمبەرەوە ترسێنەری تریان بۆ نەهاتووە، ئەو تاقم و چینەیە کە لەو چەرخەدا بوون، نەك گەلی عەرەب بەتێکڕایی کە تاقم و چینە پێشووە کانیش بگرێتەوە، چونکە تازە ئەوانە ڕۆیشتن و بیرناکەنەوە و ناگونجێت پێغەمبەر(ﷺ) ترسێنەری ئەوان بێت، کاتیٚ مەبەست ئەو تاقم و چینە بێت ڕەخنە ناگریٚ بە ئیسماعیل(درودی خوای لەسەر بێت) کە ترسێنەری عەرەب بووە بەلای هەموانەوە، چونکە هەرچۆنیٚ ئەو تاقم و چینە ئیسماعیلیان نەدیوە و پتر لە دووهەزار سالٚ پێش ئەمان بووە، هەرچۆنێك خۆیان نەدیوە ئایین و شەریعەتەکەشیان نەبیستووە و نەترسێنراون پیٚ ی، چونکە ئەو ئایین و شەریعەتعەکەشیان نەبیستووە و نەترسێنراون پیٚ ی، چونکە ئەو ئایین و شەریعەتە پامە نەما و گۆڕایان بە بت پەرستی و شتی پڕوپوچی تر. هەروەها ڕەخنە ناگیریٚ بە موسا و عیسا –سەلامی خوایان لیٚ بێت– چونکە ئەوان بۆ سەر ئیسرائیلیەکان ڕەوانەکراون نەك عـەرەب، ئـەوەش بـەپیٚ ی بـاوی عـەرەب، ئـەوەش بـەپیٚ ی ڕاو بڕیـاری کـۆڕ و جـەماوەری زانایانی ئیسلام، تەنانەت ڕەوانە کرابن بۆ سەر عەرەبیش هەرڕەخنە ناگیریٚ لیٚ یان، چونکە ئـایین و شـەریعەتەکەی ئـەوانیش لـەو چـەرخەدا بـە پوخـت و خـاوێنی نـەمابووەوە و تێـك شێوێنرابوو بە مل یەك دا، بێجگە لەوەش بە هیچ ڕەنگ نەبیستراوە گەلی عەرەب ترسێنرا بن بە شـەریعەتی تـەورات و ئینجیـل، بـەڵکو شـتێکی ئاشـکرایە کـە گـەلی عـەرەب بـە گـەل و نەتەوەیەکی جیاواز و سەربەخۆ سەیرکراون دژی ئیسرائیلی یەکان. بێگومان ئەو ڕێگا و بارە لارەی کە ئەو گەلەی لەسەر بوو لەو کاتەدا هۆی خەشم و سزای خوا بوو، ئەگەر خوا پیێغەمبەری ڕەوانە نەکردایە و بە پیٚ ی بت پەرستی و تاوانی خۆیان سزای بدانایە بەبیٚ ئاگادار کردنەوە و ترساندن لە پێشەوە، ئەگەر خوا بەو جۆرەی بکردایە، ئەوانە بەهانەیان بەدەستەوە ئەبوو، ڕێگایـان بـوو بڵێن: خوایە ئێمـە بیٚ ئاگا بووین، پێغەمبەرێکت ڕەوانە بکردایە سەرمان ئەو کاتە باوەڕمان ئەهێنا و گویٚ ڕایەڵ ئەبووین...

وَلَوْلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَيَقُولُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ
وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا۟ لَوْلَآ أُوتِىَ مِثْلَ مَآ أُوتِىَ مُوسَىٰٓ ۚ أَوَلَمْ
يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۖ قَالُوا۟ سِحْرَانِ تَظَٰهَرَا وَقَالُوٓا۟ إِنَّا بِكُلٍّ كَٰفِرُونَ ﴿٤٨﴾

---

**جا لەبەر ئەوەی هیچ کەس ڕێگای قسە و بەهانەی نەبێت پێغەمبەری ئازیزی(ﷺ) ڕەوانە کردەسەریان وەکو ئەفەرموێ:** ﴿وَلَوْلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَيَقُولُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ **ئەوانەشایانی سزا و بەسەرهاتی خراپن لە تۆڵەی کوفر و تاوانەکانیان دا، ئەگەر پێش ڕەوانە کردنی پێغەمبەر دووچاری ئەو تۆڵە و سزایە بوونایە ئەیانوت: خوایە با پێغەمبەرێکت ڕەوانە بکردایە تەلامان و ئینجا ئێمەش شوێن موعجیزە و ئایەتەکانی تۆ ئەکەوتین و باوەڕمان ئەهێنا و ئاوا دووچار نەئەبووین، جا ئەگەر لەبەر ئەو قسە و بەهانەی ئەوانە نەبوایە، پێغەمبەرمان بۆ نەئەناردن و تۆڵەمان لێ ئەسەندن. بەکورتی پێغەمبەرمان نارد بۆ نەهێشتنی عوزر و بیانوی خەڵك، ئێمە بڕیارمان دا کە تۆڵە لە هیچ بەندەیەك نەسێنین مەگەر پاش ڕەوانە کردنی پێغەمبەر و پێگەیاندن و ڕوون کردنەوەی ڕاستی ئاین و پێغەمبەرەکە بەبەڵگە و موعجیزە.. بەڵێ بێگومان ئەگەر پێغەمبەر نەهاتایە تاوانبارەکان ئەو بەهانەیان ئەهێنایەوە، ئەگەر لەگەڵ پێغەمبەرەکەدا ڕابەر و موعجیزەی نەناردایە، قسەی پێغەمبەرەکە سوار نەئەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەیش دا کاتێك پێغەمبەریان بۆ هات، کە ئایینی ڕاست و ڕوونیشی پێ بوو، بەڵگە و نیشانەی ڕوونیشی بەدەستەوە بوو، ئەو بەد بەختانە شوێنی نەکەوتن و بڕو بیانووی تریان ئەگرت، وەکو ئەفەرموێ:** ﴿فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا۟ لَوْلَآ أُوتِىَ مِثْلَ مَآ أُوتِىَ مُوسَىٰٓ﴾ **ئنجا کاتێ شتی ڕاستیان بۆ هات لەلایەن ئێمەوە – واتە محمد – وتیان: دەی با شتێکمان پێ بدرایە بە وێنەی ئەوەی درا بە موسا – واتە موعجیزەیەك لە وێنەی موعجیزەکانی ئەو – یان ئەم قورئانەش بە یەکجار بهێنرایەتە خوارەوە بە وێنەی تەورات کە هەمووی یەکجار هاتە**

خوارەوە. بەڵام ئەوانە ڕاست ناکەن لەوەی کە ئەیکەن بە هۆی باوەڕ نەهێنانیان، بە نیازێکی پاکەوە ئەو ڕەخنەیە ناگرن، بەڵکو ئەوانەی کە ئەیڵێن بڕ و بیانووی ڕووتە، چونکە: ﴿أَوَلَمْ يَكْفُرُوا بِمَا أُوتِيَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ﴾[1] ئایا ئەوانە پێش هاتنی ئەم قورئانە کافر و بێ باوەڕ نەبوون بەو تەوراتەی کەردا بە موسا؟!! بێگومان لە پێش قورئان و پێغەمبەردا موسایی بوون لە نێو دورگەدا و تەوراتیان لابوو، کەچی ئەو عەرەبە بت پەرستانە کۆتایی یا نەهێنا لە بت پەرستی خۆیان و باوەڕیان نەهێنا بە تەورات کەلە بەردەستیان دا بوو، بانگی خەڵکی ئەکرد بۆ خواپەرستی. دە لەپاش هاتنی قورئان و پێغەمبەر(ﷺ) ئەیانزانی کە ناو و نیشانی پێغەمبەر(ﷺ) لە تورات دا هەیە و نووسراوە، پرسیاریان کرد لە هەندێ لە زانایانی ئەهلی کیتاب لە بارەی قورئانەوە، ئەوانیش وەڵامیان دانەوە کە شتێکی ڕاستە و ڕێکە لەگەڵ ئەوەی کەلە تەورات دا هەیە، کەچی، باوەڕیان نەهێنا بە هیچێ لەمانە و ﴿قَالُوا سِحْرَانِ تَظَاهَرَا﴾[2] وتیان قورئان و تەورات دووجادون پشتگیری و کۆمەکی یەکتریان کردووە و هەرکام ئەوی تر بە ڕاست دەرئەکات ﴿وَقَالُوا﴾ وتیان: ﴿إِنَّا بِكُلٍّ كَافِرُونَ﴾ بەڕاستی ئێمە کافر و بێ باوەڕین بەهەرکام لەم دووانە، کەواتە ئەیانەوێ هەردەمبازی و چەنەبازی بکەن، نەك بەشوێنی ڕاستی دا بگەڕێن. بان بەڵگە و ڕابەری بەهێزیان دەست نەکەوێ لەسەر ڕاستی قورئان و پێغەمبەر(ﷺ) و لەوڵ ئەوەدا هەر لاڕێ ئەگرن و ئەیانەوێت هەر چەنەبازی بکەن، قورئان لەگەڵیان ئەڕوا و هەنگاوی تر ئەنێ و بۆ دەم کوت کردن پەك خستن و تەنگەتا کردنیان،

---

[1] بی پێ ی تەفسیرەکە مەبەست بە هەموو ڕاناوە کۆیی یەکان هەر یەکە و بریتی یە لە بت پەرستەکانی مەککە، بەڕاستی زۆر جوان ئەچێتە دڵەوە، بە دوو سێ جۆری تریش تەفسیر کراون کە هەموو ڕاناوەکان یەك شت نەبن، هەرچەند ئەوانەش ئەگونجێت، بەلام بەهێز نین.

[2] بە پێ ی تەفسیرەکە مەبەست لە وشەی ﴿ سحران ﴾ تەورات و قورئانە، ئەگونجێت مەبەست موسا و محمد بێت – سەلامی خوایان لێ بێت– بە شێوەی موبالەغە وەکو ﴿ فلان عدل ﴾ یان مضاف لابرابێت، هەرچۆنێ لەسەر خوێندنەوەی بە ﴿ ساحران ﴾ ئەبێ هەر مەبەست ئەو دووانە بێت.

قُلْ فَأْتُوا بِكِتَابٍ مِّنْ عِندِ اللَّهِ هُوَ أَهْدَىٰ مِنْهُمَا أَتَّبِعْهُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٤٩﴾ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ

---

**ئەفەرموێ: ﴿قُلْ فَأْتُوا بِكِتَابٍ مِّنْ عِندِ اللَّهِ هُوَ أَهْدَىٰ مِنْهُمَا أَتَّبِعْهُ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵی پێیان: ئەگەر ئێوە قورئان و تەوراتتان بەلاوە چاك نی یە دەی كتێبێكی ترم بۆ بهێنن لەلایەن خواوە كە ڕاست تر و ڕابەر تر بێت لە قورئان و تەورات من شوێنی ئەكەوم و پەیڕەوی ئەكەم، ئنجا بەریان لێ ئەبڕێتەوە، ئەفەرموێ: ﴿إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست و ڕاستگۆن كە ئەیڵێن من و موسا جادوبازن، یان كتێبەكانمان جادووە، دەی كتێبی ترم بۆ بهێنن كە ڕاست و ڕابەر تر بێت، بەڕاستی ئەمە ئەو پەڕی ئینسافە كە بەكاری هێنا لەگەڵ ئەو سەر كێشە لاڕێ گرانەدا، كەواتە هەركەس لە پاش ئەمە دانی ئەنا بە حەق دا سەری دەنەخست بۆی بێگومان ئەو كەسە شوێنی ئارەزووی نارەوای خۆی كەوتووە و دیل و یەخسیری ئەوە، هەركەسیش ئاوا بێت لە هەموو كەس گومڕاترە، وەكو ئەفەرموێ: ﴿فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ﴾ ئینجا ئەگەر گوێ ڕایەڵ نەبوون بۆت و ئەوەی داوایان لێ ئەكەیت، پێ ی هەڵنەسان ئەوە بزانە كە ئەوانە تەنها شوێنی ئارەزویی نارەوای خۆیان كەوتون، ئەو ئاین و بەرنامە ڕاستەی كەلەم قورئانەدا هاتووە شتێكی ڕوون و ئاشكرایە و بەڵگە و ڕابەری ئێجگار ڕوون و ئاشكرایە و بەڵگە و ڕابەری ئێجگار ڕوون و ڕەوانە، كەواتە هەركەس پەیڕەوی نەكرد —بەمەرجێ بیناسێ و لێ ی گەیشتبێ— بێگومان ئەو كەسە هەوا و ئارەزووی نەفس و شەیتانی بەركری ئەكات. بێگومان ڕێگا دووانە و سێ یەمی نی یە، یان بەنیازێكی پاك خاوێن بەدوا گەڕانی حەق و ڕاستی ئەبێ و دووركەوتنەوە لەشوێن كەوتنی ئارەزووی نارەوا و لەو كاتەدا بێگومان باوەڕ و ملكەچی ئەبێ یان دەمبازی ڕووت و شوێن كەوتنی ئارەزووی نارەوا، لەوكاتەدا بێگومان باوەڕ و مل كەچی ئەبێ یان دەمبازی ڕوت و شوێن كەوتنی ئارەزووە نەفس ئەبێ ئەو كاتە بێ بڕوایی و ئالەباری لاڕێ گرتن ڕوو ئەدات، هیچ كەس لە لار و لاڕێ گران هیچ بەڵگەیەكیان بەدەستەوە نی یە، كەواتە ئاشكرایە هەركەس لە پاش پێناسین و تێگەیاندن، گوێ ڕایەڵ نەبێت بۆ ئەم ئاین و بەرنامەی كە پێغەمبەر هێنای ئەو كەسە بە دوای ڕاستی دا ناگەڕێت و شوێنی ئارەزووی خۆی ئەكەوێت..**

﴿وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيۡرِ هُدٗى مِّنَ ٱللَّهِۚ﴾ ئایا کێ گومڕاتر و سەر لێ تێکچووترە لەو کەسەی کە شوێنی ئارەزووی خۆی کەوتووە بە بێ ڕێنمونی لەلایەن خواوە؟! واتە هیچ کەس لەوە گومڕاتر و سەر لێ شێواو تر نی یە، ئەوانە بەدەستی خۆیان خۆیان بەدبەخت کردووە و جەور و ستەمیان لە خۆیان کردووە، کاتێ ئەوان ئاوابن دەربارەی خۆیان خوایش ڕێنموونی یان ناکات و نایانخاتە سەر ڕێگای ڕاست، وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بێگومان خوا ڕێنموونی و ڕابەری ئەوانە ناکات کە ستەمکارن لە خۆیان بە هۆی ڕووچونیانەوە بە پەیڕەوەی و شوێن کەوتنی ئارەزووی نەفسیان، نایانخاتە سەر ڕێگای ڕاست و شایانی ئەوە نین.

بەڕاستی ئەم ئایەتانە ڕێگا ئەبەستی و دەم کوتی ئەوانە ئەکات کە بیانەوێ عوزربێننەوە باوەڕ نەهێنانیان بەوە پەڕۆ بکەن کە تێ ناگەن لەم ئایین و قورئانە، چونکە هەر ئەوەی ئەوێ بگەیەنرێ بە خەڵکی و بخرێتە پێش چاویان، ئیتر خۆی بۆ خۆی ئەوەندە ڕوون و ڕەوان و بێ پێچ و گرێ یە هیچ کەس خوزێی لێ لانادا، جگە لەوەی شوێن کەوتوو و دیل و بەندەی ئارەزووی ناڕاست و ناڕەوای خۆیەتی، هەرکەس دژ و بێ بڕوا بێت پێ ی ئەو کەسە خۆی خراپە و تاوانبارە و زوڵم و دەست درێژیی لە خۆی ئەکات، بە تایبەتی کە ئەو قورئانەی بە یەکجار و هەمووی پێکەوە نەهێنایە خوار، تا بە زۆر و ئەرکێکی‌گران بێتە پێش چاو، بەڵکو بەش بەش و پارچە پارچە هێنای و بەربەرە تا هەروەکو ڕوون و ڕەوانە بە سوک و سوڵ و کەم ئەرکیش بزانێ و هەموو جارە تەمێ و ئامۆژگاری تازە بکرێتەوە. هەرجارەی شتێکی تازە وەرگیرێ و خەڵکی ئاگادار بن بەسەر بەرژەوەندی و حیکمەتێکی تازەدا ئەو کاتە هۆی بیر کردنەوە و تەمێ وەرگرتن زۆرتر بەهێزترە،

وەکو وەرئەگێڕیٚ لەم فەرمودەیەوە: ﴿وَلَقَدۡ وَصَّلۡنَا لَهُمُ ٱلۡقَوۡلَ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ﴾ سوێند بە خوا ئێمە وتراوەکەقورئانە هێنامانە خـوارەوە بۆیـان بـەش بـەش وپارەپـارە وبـەش بـەش وپارەکانمـان هێنـا بـەدوای یـەك دا ودامانئنە دەم یـەك لەبـەر ئـەوە ئەوانـە تـەمیٚ ومۆچیاری وەرئەگرن وباوەڕبێنن. ئەم قورئانە لەهاتنەخوارەوەدا بەش بەشەو بەشەکانی هاتوون بەدوای یـەك دا، هەرچـۆنیٚ لـەم بارەیـەوە وایـە لەهۆنینـەوەیش دابـە جـۆرێکی تایبـەتی یـەجیاواز لەهەموو وتاری تر، بەم ڕەنگە موژدە و بەڵێن وهەڕەشە وترساندن وپەند وئامۆژگاری وبڕیار و فـەرمان وبـەرگری وهـەموو جۆرەکانی تـر تێکـەڵ کـراون، هێـزاون بەشـوێن یـەك دا، لەهـەر شوێن وسورەتێك بەجۆرو شێوەیەك، بەهۆی ئـەوەوە هـەمووکات تـەڕ وتازەیـەو هـەرگیز کۆن نابێت لەپێش چاو دڵ ودەروونـدا، شێوەی قورئان جیاواز و تایبەتی یە وبیٚ وێنەیە بەوێنەی نێرەرەکەی کە بیٚ وێنە وبیٚ هاوتایە.

لەپاش ئەوە ڕوونی کردەوە کە ئەم قورئانە ڕاستەو لەلایەن خواوە هاتووە، ئینجا دڵنیای ئەکات بەباوەڕ هێنانی تاقمیٚ لەزانایانی ئەهلی کیتـاب وهـەروەها لە پاش ڕوون کردنـەوەی لاری ونالـەباری ئـەوبت پەرسـتە مـل هوڕانـە، ئینجـا نموونـە یـەك لـەئادەمی نیشان ئـەدات کەخاوەنی خوو ڕەوشتی پاکن ولەسـەر باری ڕاستی ونیازی و دەروونێکی خاوێنیان هەیە ئـەم نموونەیـەش ئـەو تاقمـە زانـا بـوون کـەباس کـران، لـە بـارەی دیـار یـی کردنـی ئەوتاقمەوەچەند ڕاهەیە: سـەعیدی کوڕی جوبـەر -خوای لیٚ ڕازی بێت - ئەفـەرمویٚ: ئەوانە حەفتا قەشە بوون پاشای حەبەشە ناردنی بۆ مککە، ئینجا کە گەیشتنە خزمـەت پێغەمبەر دروودی خوای لێبێت سورەتی ﴿یس﴾ ی بە سـەردا خوێندن تـا دوایـی ئـەوانیش دەسـتیان کـرد بـەگریان وموسڵمان بـوون.محمـدی کـوڕی ئیسحاق لـە سیرەت دا ئەگێڕێتەوەکەئەوانە نزیکی بیست کەس بوون لەمەسیحی هاتن بۆمککە کاتیٚ هـەواڵی پێغەمبـەر یـان پـیٚ گەیشت

لەحەبەشە وە کەهاتنە خزمەتی لەمزگەوت دا بوو، ئەوانیش دانیشتن وپرسیاریان لێ کرد وچەند کەسێ لەقورەیشی یەکان لەنادی یە ك دا دانیشتبوون بەدەوری مبەکەعبەدا، ئینجا کاتێ لێ بوونەوە لە پرسیارەکانیان پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کردن بۆ باوەڕهێنان وموسڵمانێتی، قورئانی بەسەر خوێندن، ئەوانیش کە قورئانە کەیان بیست فرمێسك بەچاویان دا هۆنەی کرد وموسڵمان بوون، ئینجا کاتێ هەڵسان لەخزمەتی، ئەبوجەهل لەگەڵ چەند کەسی تری قورەیشی ڕێگایان پێ گرتن، و پێ یان وتن: خوا ڕەنجە ڕۆتان بکات چ کۆمەڵێکن، ئێوە لە وڵاتی خۆتانەوە ناردونیان بۆ ئەمەی هەواڵێکی ئەم پیاوەیان بۆ بزانن، کەچی ئەوەندەی پێ نەچوو هەتا لە ئایینەکەتان هەڵگەڕانەوە و باوەڕتان هێنا بەم. بە ڕاستی هیچ تاقمێکمان لە ئێوە نەفام تر و ئەحمەق تر نەدیوە. ئەوانیش وتیان پێ یان: ئاشتیتان لەگەڵ ئەکەین و نەفامیتان لەگەڵ ناکەین، ئایینی خۆمان بۆ خۆمان و ئایینی خۆتان بۆ خۆتان، ڕێگای ڕاستمان و شتی چاکمان بۆ خۆمان بڕیار دواوە و هەڵبژاردووە، ئنجا ئەڵێ: وتراوە کە ئەم تاقمە مەسیحیەکانی نەجرانن، ئەڵێی خوا خۆی باش ئەزنێ ئەوانە کێن، ئنجا ئەڵێ وتراوە کە ئەم ئایەتانە دەربارەی ئەوان هاتونەتە خوارەوە ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴾ دیسانەوە ئەڵێ: پرسیارم کرد لە زەهەری لە زەهەری لەم ئایەتانە کە دەربارەی کێ هاتونەتە خوارەوە؟ ئەویش وتی: تا ئێستا لە زانایانم وا بیستووە کە دەربارەی نەجاشی و هاوەڵەکانی هاتونەتە خوارەوە. دەربارەی هەرکام هاتبن، ئەوا قورئان سەرنجی بت پەرستەکان ڕائەکێشێ بۆ ڕووداوێکی ڕاست کە خۆیان ئاگادارن پێ ی و دانی پێدا ئەنێن، بۆ ئەمەی بیان وەستێنێ بەرامبەر نموونەیەك لە پیاو چاکانی خواوەن دەروون پاك کە چۆن ئەم قورئانەیان وەرگرت و دڵ ئارام بوون پێ ی، کاتێ کە زانی یان ڕاستە و ڕێك و دەقی ئەو ئایینە ڕاستە یە کەلە کتێبەکەی خۆیان دا هاتووە بۆ یان لەلایەن خواوە، هیچ شوێنی ئارەزووی نەفس نەکەوتن و سەریان داخست بۆ حەق و ڕاستی، هیچ گوێ یان نەدایە فاك و فیك و تانە و تەشەری دوژمنە نەزانەکان و دانیان گرت بە خۆیان دا،

﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلِهِۦ مُسۡلِمِينَ ﴿٥٣﴾﴾

---

ئەفەرمویٚ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤۡمِنُونَ﴾ ئەوانەی کە کتێبی خوٚمان پێداون لە پێش قورئانەوە ئەوانە باوەڕیان هەیە بە قورئان و باوەڕی پیٚ ئەهێنن، ئەو باوەڕ هێنانی ئەوانە بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ڕاستی قورئان، چونکە کتێبی پێغەمبەران هەمووی ئەبیٚ لەلایەن خواوە بێت، کەواتە هەموو ڕێکن لەگەڵ یەکتردا، هەرکەسیٚ پێشووە کەیانی پیٚ درا بیٚ ئەو هەق و ڕاستی یەی کە لەودا دیویەتی لە دوایی یە کە دا ئەبینیٚ و ئەیانناسێتەوە، کەواتە دڵنیا و دڵ ئارام ئەبیٚ پیٚ ی، باوەڕی پیٚ ئەهێنیٚ، ئەزانیٚ کە ئەمە لەلایەن خوایە کەوە هاتووە کە کتێبە پێشووەکەی ناردووە ﴿وَإِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ﴾ کاتیٚ کە قورئان بخوێنرێتەوە بەسەریان دا ﴿قَالُوٓاْ﴾ ئەڵێن: ﴿ءَامَنَّا بِهِۦٓ﴾ باوەڕمان هێنا پیٚ ی، چونکە: ﴿إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّنَآ﴾ بەڕاستی ئەو قورئانە ڕاستە و لەلایەن پەروەردگارمانەوە هاتووە، کەواتە ئەوەندە ڕوون و ئاشکرایە هیچی ناویٚ جگە لەوەی بخوێنرێتەوە بەسەریان دا، ئیتر ئەوانەی کە ئایینی ڕاستیان دیوە لە پێشەوە بە باشی لە قورئان دا ئەیناسنەوە و ئەزانن کە هەر لەو سەرچاوەیەوە هاتووە کە کتێبە پێشووە کەی لیٚ هاتووە، ئەوە بوو کە جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب -خوای لیٚ ڕازی بێت- هەندیٚ لە سەرەتای سورەتی ﴿مریم﴾ ی خوێندەوە بەسە نەجاشی دا تەنیا بەو خوێندنەوە تێگەیشت و فەرمووی: سوێند بە خوا ئەمە لەو سەرچاوەیەوە هاتووە کە ئینجیلی عیسای لیٚ هاتووە، ﴿إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلِهِۦ مُسۡلِمِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە لە پێش هاتنی قورئان دا و لە پێش خوێندنەوەی بەسەرمان دا هەموو موسوڵمان بووین، موسوڵمان بوون، چونکە لەسەر ئایینی خوا بوون و ئیسلامیش بریتی یە لە ئایینی خوا، ئیتر لە هەرکات و چەرخێك دا هاتبیٚ و بوو بیٚ، بێجگە لەوەش ئەم ئاین و شەریعەت و پێغەمبەرە کە دواترینە ناونیشانیان بە ڕوونی باس کراون لە کتێبەکەی ئەوان، کەواتە هەر لە پێش هاتنی دا باوەڕیان پیٚ ی بووە و باوەڕیان پیٚ هێناوە،

کەواتە شایانی دوو پاداشتن وەکو ئەفەرموێ: ﴿أُولَٰئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا﴾ ئەوانە کە لەپێش هاتنی قورئان دا موسوڵمان بوون و ئنجا کە قورئان هات و خوێنرایەوە بەسەریان دا باوەڕیان پێ هێنا، ئەوانە دوو جار ئەجر و پاداشتی خۆیانیان پێ ئەدرێ، جارێ لەسەر باوەڕ هێنانیان بە قورئان و جارێکی تر لەسەر باوەڕهێنانیان بە کتێبەکەی خۆیان، بە هۆی ئارامی و خۆگری و دامەزراویی یان لەسەر ئیسلامی پاك و خاوێن و مل کەچی بێ گێر و گرفتیان بۆ خوا، مل کەچی ڕوو و دەرونیان، خۆگری و دامەزراوی یان لەسەر زۆر گران و قورسە لەسەر دڵ و دەروون، لە هەموو خۆگری یەك گرانتر خۆگرتنە لەسەر بەرگری ئارەزووی ناڕەوای نەفس و لاری و دلادانی خەڵکی، جا ئەوانە دامەزراو و خۆگر بوون لەسەر ئەوانە هەموو، خۆگر و دامەزراو بوون لەسەر تانە وتەشەر و سزا دان و لاقرتێپێ کردن لەلایەن دوژمن و ناحەزەوە، وەکو لە ڕیوایەتەکەی محمدی کوڕی ئیسحاق باس کران، هەروەها باوە لە هەموو چەرخ و شوێنێك دا لەلایەن گەل و کۆمەڵ نەفامەوە ئەو تیرە ژەهراوی یانە ئەگرێتە پیاوە ئیمانداره دامەزراوەکان. جا ئەو کۆمەڵە بەختیارە لەم بارەشەوە خۆگر و دامەزراو بوون، بەڵکو بە چاکە و کردەوەی شیرین بەرگری تاوان و ناپیاوی ئەو ناپیاوە نەفامانەیان ئەکرد و ئەیکەن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَيَدْرَءُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ﴾ بە چاکە و بەرگری خراپە ئەکەن، بێگومان وەکو لە پێشەوە وتمان، خۆگرتن بەرامبەر تانە و تەشەر و لاقرتی پێ کردن ئێجگار قورسە و بارێکی زۆر گرانە لەسەر دڵ و دەروون و پیاوی پیاوانەی ئەوێ لەبەر خوا پیش بخواتەوە و بە گوناهو بێ شەرعی داخی دڵی خۆی سارێژنەکات، بەڵام ئەمە شتێکی جیاوازە و پلەیەکی زۆر بەرزە دەستی هەموو کەسی پێ ناگات، بەرامبەر دەست درێژیی نەفام و ناحەز پیاوەتی و چاکە بکرێ، بەرگری و بەرپەرچی لاقرتی کەر و جوێن دەر و ماف داگیر کەر بکرێ لەبەر خوا بە وتەی شرین و زەردەخەنە و دڵنەوایی و خەڵاتکردن: ئەمە لەدەست کەس نایەت جگە لەو ئیماندارانەی کەلەگەڵ خودا ڕاست ئەکەن تا ڕادەیەك لە خوای خۆیان ڕازین بە هەموو جۆر و خوایش لەوان ڕازی یە، ئەو کات هەرچیان دووچار بێت زۆر سوك و ئاسانە لەسەر شانیان لەبەر خوا بەئارام و شادمان بن پێ ی، ئەوانە بەرامبەر خۆیان ئاوا دڵ گوشاد بوون و دڵ گوشادن،

وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِذَا سَمِعُواْ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُواْ عَنْهُ وَقَالُواْ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِى ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٥٥﴾ إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾

---

**بەرامبەر دارایی و سامانیشیان بەم جۆرەن کە دەفەرموێ: ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾ هەندێ لەو سامان و دارایی یەی کە پێمان داون و ڕۆزیمان داون بەخت ئەکەن لەڕێگای خێر و چاکەدا و ئەیدەن بەخەڵکی، سیفەت و نیشانەیەکی تری ئەوانەی کە خۆگر و دامەزراون لەسەر ئیسلامی پاك و خاوێنی ڕاستەقینە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا سَمِعُواْ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُواْ﴾ کاتێ وتەی بێ نرخ و ناڕەوایان بیست پشتی تێ ئەکەن و ڕووی لێ وەرئەگێڕن لەبەر پیاوەتی و خۆچەپەڵ ناکات بە وتنی شتی ناشرین یان گوێ لێ گرتنی. ئیمان و باوەڕداری ڕاستەقینە کار و فرمانی گرنگی هەیە و ئەرکی گەورەی ئیمانەکەی لەسەر شانە کەواتە پەرۆشی ئەوەی نی یە خۆی خەریك بکات بە شتی بێ تام و بێ نرخەوە و دەمە دەمێش ناکەن لەگەڵ دەم پیسان دا، هەرچۆنێ بەشداریان نین لە وتنی شتی خراپ و گوێ بۆ گرتنی، بەڵکو لێ یان ئەگەڕێن و وازیان لێ ئەهێنن و نزای ڕزگار بوونیان بۆ ئەکەن لەو بار لارەی کەوانلەسەری وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ﴾ ئیماندارەکان ئەڵێن بەو دەم پیسانە: ﴿لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ﴾ کردەوەکانی خۆمان تایبەتی یە بە خۆمانەوە و تێپەڕناکات بۆ ئێوە، و کردەوەکانی خۆتان تایبەتی یە بە خۆتانەوە و تێپەڕ ناکات بۆ ئێمە[1] ﴿سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ﴾ ڕزگار بوون و پاك بوونەوەبۆ ئێوە بێت لەو وتار و کردارە ناڕەوای ئێوە ئەیڵێن و ئەیکەن ﴿لَا نَبْتَغِى ٱلْجَٰهِلِينَ﴾ ئێمە داوای تێکەڵی نەفام و نەزانەکان ناکەین و نامانەوێ هاوڕێیەتی یان، بێگومان ئیماندار ئەبێ ئاوا**

---

[1] بەدوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە: ١–دوعاخوازیتان لێ ئەکەین و بەجێتان نەهێڵین. ٢–ئاگادارتان ئەکەین کە ئێمە نیازی خراپمان نی یە دەربارەتان و مەترسیمان لێ مەکەن.

لێزان و دەم و دڵ پاك و دڵسۆز و خێر خواە بێت لە هەموو كات دا، كەواتە ئەوەی لەم ئایەتە وەرئەگیرێ شتێكی هەمیشەیی یە و نەسڕاوەتەوە تەنیا شتێك نەبێ كە بریتی یە لە وازهێنان لە فەرماندان بە چاو پۆشی و بەرگری نەكردنی خراپە و هەوڵ نەدان لە ڕێگای گۆڕینی تاوان و خراپەدا، بێگومان ئەوە سڕاوەتەوە بە ئایەتەكانی جیهاد و تێكۆشان، ئەو نموونە چاكە مە باس كران هیچ پێویستی نەبوو بە تێكۆشان لەگەڵیان بۆ باوەڕهێنان جگە لەوەی ئایەتی قورئانیان بەسەر دا خوێندراوەتەوە، كەچی نموونەی وا بووە كە پێغەمبەر(ﷺ) هەرچەند هەوڵ و تێكۆشانیانی كردبێ‌و هەچەند ویستبێتی و هەوڵی دابێ سوودی نەبووە بۆ باوەڕهێنانی. وەكو لەم فەرموودەیەوە دەرئەكەوێ: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ﴾ بەڕاستی ئەی پێغەمبەر تۆ ناتوانی هەركەس بتەوێ و پێت خۆشە بیخەیتە سەر ڕێگای ڕاست و ئیمان و باوەڕ بنێتە دڵی ﴿وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾ بەڵام خوا مەیلی هەركەسی ببێ ئەیخاتە سەر ڕێگای ڕاستی خۆی و ئیمان و باوەڕداری ئەكات، ﴿وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ خوا خۆی باش زانا و ئاگادارە بەوانەی ئامادە و شایانن بۆ وەرگرتنی ڕێنمونی و باوەڕ هێنانیان، بێگومان خوا مەیل و خواهیشی باوەڕ هێنانی ئەوانەی كردووە كە ئەزانێ ئامادە و شایانن. لە سەحیحی بوخاری و موسلیم دا هەیە كە ئەم ئایەتە لەبارەی ئەبو تالیبی مامی پێغەمبەرەوە هاتە خوارەوە كە یارمەتی پێغەمبەری دا(ﷺ) و بەرگری لێ ئەكرد و بەرامبەری قورەیش وەستا و پاراستی بۆ ئەمەی پەیامەكەی ڕاگەیەنێ بە مەردوم، لەو ڕێگایەدا دووچاری سزا و مەینەت بوو شانی دایە بەری، تەنانەت بەشداربوو لەو مقاتەعە حەساری ئیقتصادی یەی كە قورەیش كردنیان دەربارەی كۆمەڵ و یارمەتی دەری پێغەمبەر(ﷺ) بەڵام ئەو هەموو خزمەت و یارمەتی یەی لەبەر خزمایەتی و برازایەی بوو، لەبەر غیرەت و پیاوەتی كردی نەك لە ڕێگای ڕەزامەندی خوادا، ئنجا كە كاتی مردنی هات پێغەمبەر(ﷺ) چووە سەری و بانگی كرد بۆ باوەڕ هێنانیان و موسوڵمان بوون، بەڵام خوا ئەوەی بەنیسیب نەركد لەبەر ئەوەی خوا ئاگادار بوو پێ ی و خوا خۆی ئەیزانێ شیاوی چی یە؟ زەهەری ئەڵێ: سەعیدی كوڕی

موسەییەب حەدیسێکی بۆ گێڕامەوە لە باوکی یەوە کە یەکێ بووە لە هاوەڵەکان –خوا لێ یان ڕازی بێت– ئەفەرموێ: لەکاتی سەرەمەرگی دا پێغەمبەر(ﷺ) هاتە سەری کە سەیری ئەکات ئەبوجەهل و عبدالله ی کوڕی ئومەییەی لایە، ئنجا پێغەمبەر(ﷺ) پێ ی فەرمو ئەی مامە بڵێ ﴿لاإله إلا الله﴾ تابێ بەوشەیەك بیکەم بەبەڵگە یەك بۆت لای خوا، ئەبوجەهل وعبدا لله ییش ئەیان وت: ئەی ئەبوو تالیب ئایا تۆ لائەدەی لەئایینی عبدا الموتەلیب؟ پێغەمبەر دروودی خوای لێبێت بەم بارەدا خەریك بوو لەگەڵی وئەو دووانەش بەوبارەکەی تردا هەوڵیان داتا بەگوێ ی ئەوانی کرد و دواترین قسەی ئەوەبوو: ئەمرم لەسەر ئاینی عبدالمتەلب و سەرپێچی کرد لەوە بڵێ: ﴿لا إله إلا الله﴾ ئینجا پێغەمبەر فەرموی: سوێند بەخوا داوای لێبوردنت بۆئەکەم ماتۆڵ بەرگری نەکرێم لێت لەلایەن خواوە، ئینجا بەرگری کراو خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَىٰ﴾ [1]. لەبارەی ئەبوتالیبیشەوە ئەم ئایەتەی نارد کە خەریکین بە تەفسیرەکەیەوە، ئەم حەدیسە بەم شێوەیە لەسەحیحی بوخاری وموسلیم دا هەیە لە زەهەری یەوە، هەروەها موسلیم دا هەیە لەزەهەری یەوە، هەروەها موسلیم وترمزی لەئەبوو هورەیرەوە ئەم حەدیسە بەم شێوە ترەئە هێنن: کاتێ مەرگ هاتە سەر ئەبو تالیب پێغەمبەر درودی خوای لێبێت هاتە لای وفەرموی پێ ی: ئەی مامەی بەڕێزم بڵێ: ﴿لا إله إلا الله﴾ بامن شایەتی بدەم پی ی بۆت لەڕۆژی دوایی دا، ئەویش وتی: ئەگەر قورەیش تانەم لێ نادەم بەوەبڵێن: ترسان لەمردن پاڵی پێوەنا تا ئەوەی وت: ئەگەر لەبەر ئەو تەشەرە نەبوایە چاوتم ڕوون ئەکردە دڵم خۆش ئەکردی بە وتنی، ئەو وشەیە ئەگەر بڵێم تەنیا لەبەر دڵخۆش کردنی تۆیە، ئینجا ئەم ئایەتە بەو بۆنەیەوەهاتە خوارەوە: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ﴾ هەروەهالە ئیبن وعەباس وئیبن و عومەر وموجاهید و شەعبی یەوە ئەگێڕنەوە کە ئەم ئایەتە لەبارەی ئەبوتالیبەوەهاتەخوارەوە، دواتر وتەی

---

[1] واتە ڕێك وشایان نی یە بۆپێغە مبەر وئیمانداران دوای لێ بووردن وسرینەوە بکەن بۆبت پەرستانوهاوبەش بریار دەران باخزم وخۆێشیشیان بن –سورەتی تەوبە.

ئەمەبوو:کە ئەو لەسەرئایینی(عبدالموتەلیب) ە. لەبەر ئەوە ئەم هەموو ڕیوایەتانە کۆڕ وجەماوەری زانایان یانی تەفسیر ئەڵێن: دەربارەی ئەبوتالیب هاتووە، بەڕاستی پیاو بەسەرسامی یەوە ئەوەستێ بەرامبەر ڕێکو ڕاستی ودامەزراوەی ونەگۆڕاوەی و نەدوڕاوی ئەم ئایینە بەرزە، چونکە بیر ئەکاتەوە کەئەم پیاوە مامی پێغەمبەر بوو، لە منداڵی یەوە بەخێوی کرد ڕەنجی لەگەڵ کێشا، پارێزەر وبەرگری کە ربوو لێ ی کەچی خوائیمان وباوەڕی بۆنە نوسیبی نەکرد، لەگەڵ ئەوەدا پێغە مبەر(ﷺ) زۆر مە بەستی بووە پێ ی خۆش بوو ئیمان بێنێ، ئەوەش لەبە ر ئەوە هەر یارمەتی و خزمەتێکی کرد لەبەر عەقیدە نەبوو، نیازی خوای لێ نەکردبوو،بەڵکولەبەر خۆشەویستی خزمایەتی و غیرەتی عەشەرتی بوو، خوایش زانایە بەوەو ئاگادار بوو پێ ی، لەبەر ئەوە بڕیاری ئیمان و باوەڕی بۆ نەدا، ئەو کارەی لە دەسەڵات و توانای پێغەمبەر(ﷺ) بەدەرکرد و تایبەتی کرد تەنیا بە خۆیەوە، پێغەمبەری(ﷺ) جگە لە ڕێگا نیشان دان و ڕاگەیاندنی هیچ تری بەدەست نی یە، لە پاش ئەو بانگ کەرانی ڕێگای خوا جگە لە پەند و ئامۆژگاری و هەوڵ دان هیچی تریان لەسەر نی یە و بەدەست نی یە، لەدوای ئەوە دڵی خەڵکی لە نێوان پەنجەرەی قودرەتی خودایە، باوەڕهێنان و نەهێنان بە گوێرەی زانین و مەیل و خواهیشی خوایە و تەنیا خۆی ئەزانێ کێ بۆ چی شایانە. ئنجا دێتە سەر باسی وتەیەکی تری بت پەرستەکان کە ئەیانکرد بە بیانوی باوەڕنەهێنان، ئەوانە بەدەمی خۆیان دانیان ئەنا بەوەدا کە ئایین و ڕێگای پێغەمبەر(ﷺ) ڕاستە، بەڵام ئەیان وت ئەگەر ئێمە باوەڕ بێنین مەترسی ئەکەین کە عەرەبەکانی دەوروبەرمان، یان دوژمانی دەوری نیوە دورگەپەلاماری بدەنێ و دەرمان کەن لە خاکەکەی خۆمان بە زۆر و بمان فڕێنن، ئەو گەورەیی و سەرۆکایەتی و دەسەڵاتەی کە هەمانە لەدەستمان دەرچێ،

وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلْهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَآ ۚ أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا ءَامِنًا يُجْبَىٰٓ إِلَيْهِ ثَمَرَٰتُ
كُلِّ شَىْءٍ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍۭ بَطِرَتْ
مَعِيشَتَهَا ۖ فَتِلْكَ مَسَٰكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّنۢ بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا ۖ وَكُنَّا نَحْنُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥٨﴾

---

ئەم بیانووە ناڕەوایەیان ئەهێنا و ئنجا بەرپەچیان ئەداتەوە و دەم کوتیان ئەکات: ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُوٓاْ﴾ ئەوانە هاتنە لات و وتیان پێت: ﴿إِن نَّتَّبِعِ ٱلْهُدَىٰ مَعَكَ﴾ ئەگەر ئێمە شوێنی ئەم ئایینە بکەوین کە لەگەڵتە و ڕاستە و ڕێگای ڕاست نیشاندەرە ﴿نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَآ﴾ ئەفڕێنرێن و بەچەسپاندی دەرئەکرێین لە وڵات و خاکەکەمان، ئەگێڕنەوە ئەو کەسەی ئەم بەهانەیەی هێنایانەوە حەرسی کوڕی عوسمانی کوڕی نەوفەلی کوڕی عەبد و مەناف بوو هاتە خزمەتی و وتی: ئێمە ئەزانین تۆ لەسەر ئایینێکی حەق و ڕاستی، بەڵام مەترسی ئەکەین ئەگەر ئێمە شوێنیتۆ بکەوین و دژ و پێچەوانەی هەموو عەرەب بین لە کاتێك دا کە ئێمە لە چاو هەموو هەرەب دا زۆر کەمین، مەترسی ئەکەین لەم وڵاتە دەرمان کەن و بمان فڕێنن، خوایش بەرپەرچی دانەوە و فەرموی: ﴿أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا ءَامِنًا﴾ ئایا ئێمە جێگا و شوێنی ئەوانمان نەگێڕاوە بوشوێنێکی ڕێز گیراوی قەدەغەکراوی بێ ترس و بیم و ئاسایش درا کە لەو وڵاتانەوە ﴿يُجْبَىٰٓ إِلَيْهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَىْءٍ﴾ ئەبرێ بۆ لای و کۆ ئەکرێتەوە تیا ی دا بەر و بووم و میوە جاتی زۆر و زەبەندە لە هەموو بابەت و شتێك ﴿رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا﴾ بە ڕۆزی دان لە لایەن ئێمەوە و بەزەیی خۆمان بەبێ هۆیەکی ئاشکرا، واتە بیانووەکەیان ناڕاست و بێ جێ یە، چونکە ئێمە ئەوانمان پاراستووە لەوەی کەس بتوانێ دەست درێژیانلێ بکات، نیشتەجێمان کردون لە شارێکی ئاسایش داری بیم و ترس بەهۆی ئەو کەعبەیەوە کە ڕێز دارە لە دەروونی خەڵك دا، ئەوانە ئەژین لەو شوێنەدا بێ ترس و برسی یەتی، بەلێشاو خواردەمەنی و میوەجاتیان بۆ دێتلەهەموو لایەکەوە، ئێمە بەو کامەرانی یە ئەوانە ئەژیەنین لە کاتێك دا بێ باوەڕ و بت پەرستن، ئەی ئەگەر باوەڕ بێنن چۆن نایانپارێزین و نایان ژیەنین؟!! ئەو نەفامانە دانیان ئەنا بەوەدا کە ئەو ئایینەی پێغەمبەر(ﷺ) هێنایەتی ڕاستە و ڕێنموونی و

ڕێگا نیشاندەرە، بەڵام مەترسی یان ئەکرد کە بەهۆی شوێن کەوتنی یەوە دووچاری سزا بێن و دەرکرێن، ئەوانە خوای خۆیان لەبیر نە بوو، لایان وا نە بوو کە تەنیا خوا پارێزەر و پەنادەرە، نەیان ئەزانی کە هەموو هێزی زەوی ناتوانێ ئەوان دەرکات کاتێ ئەوان لە پەنای خوادا بن و پارێزراوی ئەو بن، هەموو هێزێ لەم جیهانەدا ناتوانێ کۆمەکی و یارمەتی بدات و بەرگری یان لێ بکات کاتێ خوا یارمەتی نەدات، ئەو نەفامی و نەزانی یەش بەهۆی ئەوەوە بوو کە ئیمان و باوەڕ تێکەڵی دڵ و دەروونیان نەبوو، ئەگەر ئیمان و باوەڕ جێگیر ببوایە لە دڵیان دا تێگەیشتن و تێڕاوانیننیان ئەگۆڕا و ئەیانزانی کە ئارامی و ئاسایش دەست کەوت نابێ لە پەنای خوادا نەبێ، ترس و بیم و ڕوو نادات بە هۆی دووری نەبێ لە یادی خوا و ڕێگا و ڕێبازێك کە خوا نەخشەی کێشاوە، ئەو ڕێگا و ڕێبازەی خوا پەیوەندی هەیە و بەستراوە بە هێز و عیززەتی بێ سنوری خواوە، ئەوەش قسەیەکی ڕووت نی یە کە تەنیا بە زمان بوترێ بۆ دڵخۆشکردن و ئارامی دان بە دەروون، بەڵکو ئەوە شتێکە لە قوڵایی ڕاستی یەوە دێت و هەڵئەقوڵێ. چونکە ئەو کەسەی کە بەڕاستی شوێنی ڕێگا و ڕێبازی خوا ئەکەوێ ئەو کەسە ئەبێ یەك کەوتبێ لەگەڵ یاسای ئەم بوونەوەرە و هەموو هێزەکانی و کۆمەکی و یارمەتی وەرگرێ لەو هێزانەوە و بەکاریان بهێنێ لە ژیان دا، ئنجا خوا داهێنەر و فەراهەم هێنەری ئەم جیهان و بوونەوەرەیە و بە ڕێوەبەری هەموو کاروباریەتی بە پێ ی ڕژێم و یاسایەك کە بۆی هەڵبژاردووە. ئەو کەسەی کە شوێنی ڕێگا و ڕێنموونی خوا بکەوێ کەڵك و یارمەتی وەرئەگرێ لەو هەموو هێز و وزە بێ سنورەی کەلەم بوونەوەرەدایە، و پشت ئەبەستێ و ئەچێتە ناو قەڵایەکی بەتین لە ژیان دا، بێگومان ڕێگا و ڕێبازێك کە خوا دایناوە بەرنامەیە بۆ ژیانێکی کامەرانی ڕێك و ڕاست، ژیانێکی بەدی هاتووە لەم جیهانەدا. کاتێ ئەو بەرنامەیە بەدی هات و پێك هات سەرکەوتن و سەرۆکایەتی لەم زەوی یەدا پێك دێت لەگەڵ خۆشبەختی و کامەرانی ئەو جیهان و ڕۆژی دوایی دا، بەرزی و جیاوازی ئەو بەرنامەیە لەوەدایە کە لەیەك پچڕان و جیا بوونەوە ناخاتە نێوان ڕێگای ئەم جیهان و ئەو جیهان، نایەوێ دەست لە ژیانی ئەم جیهان هەڵگرێ بۆ ئەمەی ئامانج و مەبەستی ئەو جیهان پێك بێنێ و دەست کەوت ببێ، بەڵکو هەردو ژیانەکەی تێکەڵکردوون و بە ستوونی پێکەوە،

ژیانی ئەم جیهان هەڵگرێ بۆ ئەمەی ئامانج و مەبەستی ئەو جیهان پێك بێنێ و دەست کەوت ببێ، بەڵکو هەر دوژیانەکەی تێکەڵ کردوون و بەستوونی پێکەوە، ژیانی ئەم جیهانەی کردووە بە ڕێگای ژیانی ئەو جیهان، ئەم جیهانی کردووە بە جێگای کشتوکاڵی ئەو جیهان، ئاوەدان کردنەوە و ڕازاندنەوە و پێشکەوتن و سەرکەوتنی ژیانی ئەم جیهان کردووە بەهۆ بۆ ئاوەدان کردنەوەی بەهەشتی ئەو جیهان و مانەوە تیای دا بەبێ بڕانەوە، بەمەرجێ شوێن کەوتن و پەیڕەوی بەرنامە و ڕێنموونی خوا نیازی فەرمان بەری خوا و چاوەڕوانی ڕەزامەندی خوا لە هەموو کردەوەیەك دا و بە پێی مێژوو ژیانی ئادەمی لەم زەوی یەدا هەر گەل و کۆمەڵێ ڕاست و ڕێك و ڕاوەستاو و دامەزراو بوبن لەسەر بەرنامەی خوا دواڕۆژی هێز و بەرزی و سەرکەوتن مسوگر بووە بۆ ئەو گەل و کۆمەڵە، لەپاش ئامادەرکدن و پەروەردەکردنیان بۆ هەڵگرتنی سپاردەی جێنشینی لەم زەوی یەدا، بێگومان زۆر کەس هەن نەترسی ئەکەن لە شوێن کەوتنی بەرنامە و شەریعەتی خوا و ڕۆیشتن و ڕێگا دانە بەر بەگوێرەی ڕێنموونی خوا، مەترسی ئەکەن لە یەك گرتن و پەلامار دانیان بەیەك جار و دژی ئەمان، مەترسی ئەکەن لە دووچار بوونی تەنگ و چەڵەمەی ئابووری و شتی تر. ئەوانە هەموو گومان و خەیاڵاتی بێ سەر و بەر و بێ جێن بە وێنەی خەیاڵاتەکەی قورەیش کە لەم ئایەتەدا باسی کرد بۆمان، شتێکی ڕوونە کە ئەوەی قورەیش مەترسی یان لێ ئەکرد بە پێچەوانەوە دەرچوو، ئەوە بوو لەپاش شوێن کەوتنی ڕێنوونی و بەرنامەکەی خوا بە چارەکە چەرخێ یان کەمتر دەسەڵات پەیدا کرا بەسەر ڕۆژ ئاواو و ڕۆهەڵاتی زەوی دا، خوای گەورە بەرپەرچی قورەیشی دایەوە دەم کوتی کردن بەو جۆرەی کە بیستمان لەم ئایەتەدا، بێگومان وێنەی ئەو دەم کوت کردن و بەرپەرچ دانەوە هەر هەیە هەتا هەتایە بۆ هەر کۆمەڵ و تاقمێکی تر کە بە وێنەی قورەیشی یەکان نەزان و بەد گومان بن، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی ئەوانە نەزان و نەفامن وتێ ناگەن لەوەی پیت و فەڕ و خێر و خۆشبەختی خۆیانی تیایە، ئەگەر ئەو تاقمە قورەیشی یانە نەفام و نەزان نەبوونایە ئەیانزانی ئارامی و ئاسایش لە کوێوە دێت و بیم و ترس لە چی و لە کوێوە پەیدا ئەبێت؟ ئەگەر ئەوانە بیانویستایە خۆیان دوورخەنەوە و بپارێزن لەوشتەی کە مەترسی لێ ئەکرێ و

هۆی زیان و لەناو چوونە بیریکیان ئەکردەوە و ئەگەڕانەوە بۆ لای ئەو خوایەی کە ئارامی و ئاسایش لە کوێ وە دێت و بیم و ترس لە چی و لە کوێوە پەیدا ئەبێت؟ ئەگەر ئەوانە بیانویستایە خۆیان دوورخەنەوە و بپارێزن لەو شتەی کە مەترسی لێ ئەکرێ و هۆی زیان و لەناوچوونە بیریکیان ئەکردەوە و ئەگەڕانەوە بۆ لای ئەو خوایەی کە ئارامی و ئاساییشی پێ دان و ئەو هەموو ناز و نیعمەتەی ڕشت بەسەریان دا، ئەیانزانی کە یاخی بوون لە خوا و دان نەنان بە چاکەی خوادا و چاو لەبەر نەبوون بۆ خوا هۆی زیان و بەرباد بوون و لەناوچوونە، وەکو ڕوونی ئەکاتەوە و هەڕەشەیەکی سامناک ئەکات بەم فەرمودەیە: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ﴾ زۆر لە دانیشتوانی شاران ولآتانمان لە ناو برد و بەرباد کرد وەکو عاد و سەمود و ئەوانی تر کە ﴿بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا ﴾یاخی بوون لە ژیان و گوزەرانیان بە هۆی سامان و دارایی زۆرەوە، دانیان نەنا بەو هەموو چاکەی کە خوا ڕشتبووی بەسەریان دا، چاو لەبەری نەبوون و پارێزگاری مافی خوایان نەکرد لەو سامان و دارایی یە دا، جا بە هۆی ئەوەوە خوا لەناوی بردن و ولآتەکەی وێران کردن ﴿فَتِلْكَ مَسَٰكِنُهُمْ﴾ ئنجا ئەوەتا جێ و شوێنەکانیان کە ئەبینرێن و گوزەر ئەکرێ بەلایان دا بە وێرانی و بە چۆڵی ﴿لَمْ تُسْكَن مِّنۢ بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا﴾ ئاوەدان نەکرانەوە و نیشتەجێ بیان تیا نەکرا لە پاش ئەوان مەگەر نیشتەجێ یەکی کەم لەلایەن ڕێبوار و گوزەر کەرەوە کە ڕۆژێ یان کەمتر لابدەن بۆ مانوو دەرچوون ﴿وَكُنَّا نَحْنُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴾تەنیا ئێمە بووین بە خواوەنیان و بە وێنەی میرات و کەلەپوور وەرمان گرتن، خوای خاوەن بەزەیی تەنیا بە هۆی تاوان و ستەم و خراپەکرای ولآتتانی وێران نەکرد و دانیشتوانی لەناوبردووە، بەڵکو پێغەمبەریشی بۆ ناردن کە بیانترسێنێ و ڕێگای ڕاستیان نیشان بدات و بانگیان بکات بۆ سەر ئەو ڕێگا ڕاستە بۆ ئەمەی هەموو بڕو بیانوویەك نەمێنێ بۆ هیچ کەس، ئنجا ئەگەر کۆتایی یان نەهێنابێ و نەگەڕابنەوە بۆ لای خوا ئەو کاتە تۆڵەی ئەم جیهانەی لێ سەندوون،

وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِيٓ أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَاۚ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي
ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾ وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتُهَاۚ

---

وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ﴾ خوا وێران کەری شارەکان و لەناوبەری دانیشتوانیان نەبووە و هەرگیز باوی ئەوە نەبووە ﴿حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِيٓ أُمِّهَا رَسُولًا﴾ تا ڕەوانەی کردووە لەگەورەترین شار و پایتەختەکانیان دا پێغەمبەرێك کە ﴿يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَاۚ﴾ خوێندوویەتی یەوە بەسەر دانیشتوانەکان دا ئایەتیەکانی ئێمە و ترساندوونی لە سزای خوا ئەگەر نەگەڕێینەوە بۆ لای خوا ﴿وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ﴾ ئێمە نین بەوێران کەری شارەکان و لە ناوبەری دانیشتوانەکانی مەگەر لە کاتێك دا کە ئەو دانیشتوانە ستەمکار بن بە بڕاوا نەهێنان و بە دوور خستنەوەی پێغەمبەرەکانیان و سەرکێشی و کۆتایی نەهێنانیان لە کوفر و تاوان و بێ باوەڕیی. خوای گەورە پێغەمبەرکانی لە پایتەختەکان ڕەوانە کردووە، چونکە دانیشتوانیان ژیر تر و زیرەکترن، کەواتە شایانترین بەبیر کردنەوە و وەرگرتنی ئەو ئایینە پاکە و کاتێ ئەوانە ئایینەکەیان وەرگرت خەڵکی تر ئەکەوێتە شوێنیان و پەیڕەوی یان ئەکەن و بە ئاسانی مل کەچ ئەبن بۆ فەرمانی خوا، خوای گەورە بە پێ ی ئەو باوی خۆیەوە پێغەمبەری ئازیزمانی ڕەوانەکرد و لە مەککەدا لەو کاتەدا گەورەترین پایتەختی وڵاتی عەرەب بوو کە یەکم جار تیشك و ڕووناکی ئەم ئایینی بەرزی ئیسلامە لەوێ کەوت و ئنجا لەوێوە پەرەی سەند و بڵاو بووەوە، ئەو تاقمە بیانوویەکیان بۆ باوەڕ نەهێنانیان ئەوە بوو کە سوود و بەرهەم و بەرژەوەندی ئەم ژیان و جیهانەیان لەکیس ئەچێ، ئەوا خوای گەورە ئاگاداریان ئەکاتەوە کە هەرچی لەم ژیان و جیهانەدا پێ یان دراوە هەموو شتێکی کەمی بێ نرخە لە چاو ئەو ئەجر و پاداشتەی لای خوایە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتُهَاۚ﴾ ئەوەی پێتان دراوە لە هەرشتێك کە هۆی ژیان بێت لە جیهانەدا ئەوە هەمووی هۆی خۆشی و ڕابواردن و جوانی و زینەتی ژیانی ئەم جیهانەیە لەماوەی تەمەن و مانەوە تان کە دوایی دێت بە زوویی،

وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَفَمَن وَعَدْنَٰهُ وَعْدًا حَسَنًا فَهُوَ لَٰقِيهِ كَمَن مَّتَّعْنَٰهُ مَتَٰعَ
ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ثُمَّ هُوَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٦١﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ
كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٦٢﴾

---

**﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ﴾ ئەو ئەجر و پاداشتەی لای خوایە خۆی لەخۆی دا باشترەلە هینی ئەم جیهانە، چونکە ئەو لەزەت و خۆشی پەتیە بە بێ تێکەڵی هیچ جۆرە ناخۆشی، بەڵام خۆشی ئەم جیهانە هەرکات ببێ تێکەڵە، ئنجا وەکو باشترە شتێکی ماوەیە و نەمانی نی یە، بەڵام هینی ئەم جیهانە ئاشکرایە کە نامێنێ و دوا براو و دوا هاتووە، ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە ژیر نین کە دەربەستی ئەوە نین کە لەلای خوایە و ئەیگۆڕینەوە و دەستی لێ هەڵئەگرن لە بریتی ئەم شتە کەمە دوابراوەدا، واتە ژیر بن و بفامن و شتی وا مەکەن، ئنجا بە کورتی لاپەڕەی ئەم جیهان و ئەو جیهان ئەخاتە پێش چاو و ئیتر خەڵکی سەربەستە کام لاپەڕە هەڵ ئەبژێرێ بۆ خۆی هەڵئەبژێرێ، ئەفەرموێ: ﴿أَفَمَن وَعَدْنَٰهُ وَعْدًا حَسَنًا﴾ دەی کەواتە ئایا هەرکەسێ ئێمە بەڵێنمان پێ دابێ بە بەڵێنێکی شیرین، واتە بەهەشت ﴿فَهُوَ لَٰقِيهِ﴾ ئەو کەسە ئەگات بەو بەڵێنە ئیرینە و دەست کەوتی ئەبێت، چونکە بەڵێنی خوا ڕاستە و ئەبێ بەدی بێت، ئایا ئەو کەسەی بەڵێن پێ دراوە ﴿كَمَن مَّتَّعْنَٰهُ مَتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ بە وێنەی کەسێکە کە ئێمە ژیاندبێتمان لەم جیهانەدا و بە خۆشی و لەزەتە کەمەکەی ژیان ئەم جیهانە و ئەوەمان پێ دابێ و ﴿ثُمَّ هُوَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ﴾ ئنجا لە پاش ئەوە ئەو کەسە لە ڕۆژی دوایی دا لەو کەسانە بێت کە کۆکراوە و ئامادە کراون بۆ پرسیار و سزادان بە ئاگری دۆزەخ؟**

**یەکەم: لاپەڕەی کەسێکە کە لەم جیهانەدا ڕێگای ڕاستی خوای داوەتە بەر و گوێ ڕایەڵی فەرمانی خوا و پێغەمبەرە، بەهۆی ئەوەوە خوا بەڵێنی پێداوە لەم جیهانەدا بەبەهەشتی نەبڕاوەی کەس دیوە، بە ڕزگارکردن لە ئاگری سەختی بێ وێنەی دۆزەخ کە بێگومان ئەو بەڵێنەی دەست کەوت ئەبێ.**

دووەم: ئەندازێ خۆشی و کامەرانی ئەم جیهانەی دەستکەوت بوو بێ کە شتێکی زۆر کەمی دوا براوە، لەپاشان لە ڕۆژی دوایی دا بە زۆر و بە توندی و سەختی و ڕیسوایی ئامادە بکرێ بۆ سووتان بەو ئاگرە سەختە، بەڕاستی ئەمە ئەو پەڕە بە لە بەرپەرچ دانەوە و دەم کوت کردنی ئەو کۆمەڵەی کە بیانووی باوەڕ نەهێنانیان ئەوە بوو مەترسی یان ئەکرد لەوەی ئارامی و ئاسایشیان لێ تێك چێ و دەرکرێن لە وڵات و سوود بەرهەمیان لەدەست دەرچێ، چونکە ئەگەر لە پێناوی باوەڕهێنان و موسوڵمان بوون دا دووچاری ئەو هەموو زیانەش بێن و زۆر پتر لەوە هەرهێشتا ئەو سزا و زەحمەتە زۆر زۆر خۆشترە لەوەی لە ڕۆژی دوایی دا ئامادە بکرێن بۆ پرسیار و سزا چ جای ئەوەی کە مەترسی بەکەیشیان ڕاست نە بوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئارامی و ئاسایش و سەرکەوتن و دەسەڵات و زاڵ بوون و سەرۆکایەتی لەژێر ئاڵای ئایینی خوادا مسوگەر بوو، وەکو لە واقیعی ژیاندا بینرا، کەواتە هەرکەس دەست هەڵگرێ لە ئایین و بەرنامەی خوا لە پێناوی سوود و بەرژەوەندی ژیانی ئەم جیهانەدا بێگومان ئەو کەسە بێ ئاگایە و نەزانە و زیاندار و ڕەنجەڕۆیە. ئینجا گەردش و چەرخەیەك ئەکات بە دڵ و دەروون و شێوەیەك لە شێوەکانی ڕۆژی دواییمان ئەخات پێش چاو، دوا ڕۆژ و چارەنووسی بت پەرستی و گومرایی یان نیشان ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ڕۆژێ بکە کە خوا بانگ ئەکات لە بت پەرستەکان بە تەشەر لێ دان و ڕیسوا کردنەوە ﴿فَيَقُولُ﴾ پێ یان ئەفەرموێ: ﴿أَيۡنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ﴾ ئایا لە کوێن هاوبەشەکانی من، ئەوانەی کە ئێوە بە هاوبەشی منتان دا ئەنان خوای گەورە ئەزانێ کە هاوبەشی نی یە، ئەوانەی هاوبەشیان ڕەوا داوە بە نەفامی لەم جیهانەدا، ئەوانە لەو ڕۆژەدا بە هیچ ڕەنگ ئاگایان می یە لە بتەکانیان و نازانن چی یان بەسەر هاتووە، ڕێگایان نابەنەوە سەر، بەڵام بەم شێوە پرسیارە ڕیسوا و بێ ئابڕوو و شەرمەزاریان ئەکات لە پێش چاوی ئەو هەموو خەڵکە کە خوا نەبێ کەس نازانێ ژمارەیان. جا لەبەر ئەوە وەڵام نادەنەوە و وەڵام دانەوەیان نە پێویستە و نەمەبەستە، ئەوانە نەیانەوێ و بەهەر جۆر خۆیان پاك بکەنەوە لە تاوانی گومڕا کردنی ئەوانەی شوێنیان کەوتوون و لەڕێگای ڕاست ترازاندوونیان، وەکو ڕوون ئەبێتەوە لەم فەرموودەیەوە،

قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَغۡوَيۡنَآ أَغۡوَيۡنَٰهُمۡ كَمَا غَوَيۡنَاۖ تَبَرَّأۡنَآ إِلَيۡكَۖ مَا كَانُوٓاْ إِيَّانَا
يَعۡبُدُونَ ﴿٦٣﴾ وَقِيلَ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ فَدَعَوۡهُمۡ فَلَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُمۡ وَرَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَۚ لَوۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ يَهۡتَدُونَ
﴿٦٤﴾ وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبۡتُمُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٦٥﴾

---

﴿قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ﴾ ئەوانەی کە سەرۆك بوون و خەڵکیان گومڕا کردبوو لەم جیهانەدا سزادان و سووتانئیان بە ئاگری دۆزەخ دەرچوو، دامەزراو و جێگیر بووە ئەوانە ئەڵێن: ﴿رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَغۡوَيۡنَآ أَغۡوَيۡنَٰهُمۡ كَمَا غَوَيۡنَا﴾ ئەی پەروەردگارمان ئا ئەوانەی کە ئێمە گومڕامان کردن، گومڕاکردن هەرچۆن خۆمان گومڕابووین، واتە بەزۆر گومڕامان نەکردن، چونکە ئێمە دەسەڵاتمان نەبوو بەسەر دڵیان دا، بەڵکو خۆیان بەڕزامەندی و سەربەستی خۆیان لایان دا لەڕێگای ڕاست، هەرچۆنێ ئێمە بە ئارەزوو و ڕەزامەندی خۆمان گومڕابووین و لامان دا ﴿تَبَرَّأۡنَآ إِلَيۡكَ﴾ ئێمە بەری بووین لەوان و لە کردەوە کانیان کە بە ئارەزووی خۆیان کردیان، بەری بوونەکەمان ڕوو ئەکەینە تۆ بە پارە و لالەوە ﴿مَا كَانُوٓاْ إِيَّانَا يَعۡبُدُونَ﴾ ئەوانە ئێمەیان نەپەرستووە، ئەوانە بت و شتی تریان پەرستووە، ئێمە خۆمان نەکردووە بە پەرستراوی ئەوان، ئنجا هەمیتر بێ ئابڕوو ئەکرێن ﴿وَقِيلَ﴾ بەتەشەرەوە پێ یان ئەوترێ: ﴿ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ﴾ هاوار بکەنە ئەو بتانەی کە کردوتانن بە هاوبەش بۆ خوا، بانگیان بکەن و خۆتانیان لێ بەری مەکەن و یەخەیان لێ هەڵ مەتەکێنن. هاواریان لێ بکەن با بێن بە هاوارتانەوە و ڕزگارتان کەن، هاواریان لێ بکەن ئەمە ئەو ڕۆژە سەختەیە کە ئێوەی تیا بەگیر هاتوون و هەڕەشەتان لێ کراو ترسێنران پێ ی، ئەو سیا چارانە ئەزانن کە هیچ سوودێ نی یە لە هاوار لێ کردنیان و هیچ کەڵکیان ناگرن، بەڵام بە ناچاری و لەسەر گەدانی دا گوێ ڕایەڵی ئەو فەرمانە ئەکەن وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَدَعَوۡهُمۡ﴾ئنجا ئەوانیش بانگ و هاواریان لێ ئەکەن ﴿فَلَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُمۡ﴾ ئنجا ئەوانیش نایەن بە هاواریانەوە و وەڵامیان نادەنەوە، چونکە داماو و دەستە پاچەن لە وەڵام دانەوە و یارمەتی دان، بێگومان جگە لەوە چاوەڕوانی هیچی تر ناکرێ لەو بتانە، بەڵام مەبەست سەر شۆڕ و ئابڕوو بردن و تەنگە تاو کردنی ئەو بت پەرستانەیە، ﴿وَرَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ﴾ لەو وت و وێژەدا بانگ کەر و هاوار کەران یان هاوار کەر و هاوار لێ کراوان ئەزانن کە سزا

دەوری دان و پێ یانەوە نووسا، یان بە چاو سزا ئەبینن، چونکە دۆزەخ ئامادە ئەکرێ و وا بە پێش چاوەوە، لەو کاتە زۆر سەخت و سامناکەدا دێتە پێش چاو و ئەکەوێتەوە بیریان ئەو ئایین و ڕێگا ڕاستەی کە لە دنیادا بانگ کران بۆی و ئەوانیش ڕوویان وەرگێڕا لێ ی کە تەنیا ڕوو کردن و وەرگرتنی ئەو ڕێگا و ئایینەش هۆی ڕزگاریان بوو، بە سوک و ئاسان لەبەر دەست و توانایشان بوو، جا کە ئەوەیان بیر ئەکەوێتەوە زۆر بە داخەوە ئاواتی بۆ ئەخوازن و ئەڵێن: ﴿لَوۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ يَهۡتَدُونَ﴾[1] ئای کاشکێ ڕێگای ڕاستیان بدایەتە بەر، لە پێشەوە بار و شێوەی سامناکی ڕۆژی دوایی ئەهێنێتە پێش چاویان کە بە تەشەرەوە پرسیاری بت و هاوبەشەکانیان لێ ئەکرێ بە تەشەرەوە لە بارەی هەڵوێستیان بەرامبەر پێغەمبەران –درودی خوایان لێ بێت– ئەفەرموێ: ﴿وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ڕۆژێ بکە کە خوای تۆ بانگیان لێ ئەکات ﴿فَيَقُولُ﴾ بەم جۆرە ئەفەرموێ پێ یان: ﴿مَاذَآ أَجَبۡتُمُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ ئایا چیتان وەڵامی پێغەمبەرەکان دایەوە کاتێ بانگیان کردن بۆ خواپەرستی و باوەڕ هێنان و مل کەچی بۆ ئایینی خوا؟ خوا بە بەزەیی خۆی پەنامان بدات لەو ڕۆژە سامناکە کە پێغەمبەرەکانیش بیم و ترسیان لێ ئەنیشێ و ناتوانن وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ يَجۡمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبۡتُمۡۖ قَالُواْ لَا عِلۡمَ لَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ﴾[2] جا لە جێ یە پێغەمبەران –درودی خوایان لێ بێت– بەو جۆرە دابمێنن لە وەڵام دانەوە ئەبێ بت پەرستان و تاوانباران چۆن هۆشیان بەلای هیچ شتێکەوە بمێنێ؟ پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – شەرم ئەکەن و زاتیان می یە وەڵام بدەنەوە، بەڵام خەڵکی تر بە تایبەتی بت پەرستان و تاوانباران بە هیچ ڕەنگ لەو جۆرە کاتانەدا هۆش و فامیان نامێنێ و ئاگایان نامێنێ لە هیچ شتێك،

---

[1] بە پێ ی تەفسیرەکە وشەی(الو) بۆ ئاوات خواستنە، زۆربەی هەر لەسەر ئەسڵەکە ئەیهێڵنەوە و وەڵامی بۆ بڕیار نادەن. بەڵام بەڕاستی بە شێوەی تەفسیرەکە بەهێزتر و بەتام تر سەیر ئەکرێ و ئەچێتە دڵەوە.

[2] وانە باسی ئەو ڕۆژە بکە پێغەمبەرەکان کۆئەکاتەوە، ئینجا پێ یان ئەفەرموێ: چۆن وەڵام درانەوە لەلایەن ئوممەتەکانتانەوە؟ ئەوانیش ئەڵێن: ئێمە نازانین و بێ ئاگاین، تۆ خۆت ئەزانی، چونکە تۆ باش زانا و ئاگادارێ بە هەموو شتە نهێنی و غەیبی یەکان.

فَعَمِيَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَنۢبَآءُ يَوۡمَئِذٖ فَهُمۡ لَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿٦٦﴾ فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَعَسَىٰٓ أَن
يَكُونَ مِنَ ٱلۡمُفۡلِحِينَ ﴿٦٧﴾ وَرَبُّكَ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخۡتَارُۗ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُۚ

وەکو لەم فەرمودەیەوە ڕوون ئەبێتەوە ﴿فَعَمِيَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَنۢبَآءُ يَوۡمَئِذٖ﴾ ئینجا لەو ڕۆژەدا هەموو هەواڵ و دەنگ و باسێ لەو بارەیەوە وەکو کوێرە لەئاستی ئەوان و شاراوەیە کەواتە نازانن لە وەڵام دا چی بڵێن و ناتوانن هیچ عوزر و بەهانەیەك بێننەوە بۆ کوفر و تاوانەکانیان ﴿فَهُمۡ لَا يَتَسَآءَلُونَ﴾ کەواتە پرسیاریش ناکەن لەیەکتر لەبارەی وەڵامی ئەو پرسیارەوە، هەرچۆنێ لەم جیهانەدا لە کاتی پێ گیران و تەنگ و چەڵەمەدا خەڵکی پرسیار ئەکەن لەیەکتر، چونکە کات و بەسەرهاتەکە ئێجگار سەخت و بەتینە هەست و هۆش ناهێڵێ، کەواتە وەکو کەڕ و لاڵ دەمیان ئەبەسترێ. ئەو تاوانبارانە بەو جۆرە وان لەو تەنگی و سەرگەردانی یەدا، بەڵام ئەوانە مە لەم جیهانەدا گەڕاونەتەوە بۆ لای خوا بە باوەڕ و کردەوەی چاکە و ئەوانە بەم جۆرەن کە ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلۡمُفۡلِحِينَ﴾[1] ئەو کەسەی گەڕاوەتەوە لە کوفر و بت پەرستی بۆلای خوا، باوەڕی هێناوە و کردەوەی چاکی کردووە بە گوێرەی ئیمان و باوەڕەکەی ئەوکەسە بێگومان لەوانەی ئەبێ کە ڕزگار ئەبن وئەگەن بەئامانجیان لای خوا. ئینجا هەموو کاروباری خۆیان وهەمووشتێ ئەگێڕێتەوە بۆ لای خواهیشی خوا و هەڵبژاردنی خوا، چونکە ئەو داهێنەرو پەروەردگاری هەمووشتە، ئەو هەموو شت ئەزانێ گەڕانەوەی هەمووشت وهەموو کارێ بۆلای ئەوە هیچ شتێ هەڵبژێرن بۆ خۆیان یان بۆ هەرکەسێ تر ئەفەرموێ: ﴿وَرَبُّكَ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخۡتَارُۗ﴾ خوای پەروەردگاری تۆ ئەی پێغەمبەر هەرشتێ مەیل بکات دروستی ئەکات، هەڵئەبژێرێ ئەوەی کە بیەوێ هەڵی بژێرێ ﴿مَا كَانَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُۚ﴾ هەڵبژاردن و سەرلێ کردنەوە نی یە

[1] وشەی(عسی، لعل) لەلایەن خواوە بەڵێنی تەواوە لەبەر ئەوە بەو شێوەیەم تەفسیر کردەوە، ئەگونجێ مانا و مەبەستەکەی خۆیانی لێ بگیرێ ئەو کاتە چاوەڕوانی یەکە بۆ بەندەکانە.

ونابیٚ بۆخەڵکی لەهیچ کارو بارێکی خودا، بەڵکو بۆخوا هەیە ومافی خوایە هەڵبژاردن لەهەمووکاروبارێکدا، چونکە خوا لێزان وکار دروستە وئەزانیٚ بە رژەوەندی لەچی دایە، کەواتە نابیٚ هیچ کەس ڕاوێژی بکات بۆ خوا، ئەمە شتێکی ڕاست وڕەوایە کەزۆرجار خەڵکی لەبیریان ئەچیٚ بەتەوای، یان لەهەندیٚ بارو ڕووە لەبیر یان ئەچیٚ، بێگومان خوا خۆی ئەزانیٚ مەیلی دروست کردنی چی ئەکات، هیچ کەس مافی نی یە وخاوەنی ئەوە نی یە کەڕاوێژ بکات بۆ خوا وناتوانیٚ لە دروست کراوی خوادا هیچ زیاد وکەم بکات وبەهیچ ڕەنگدەستی تیٚ بخات، یان هیچ شتێك بگۆ ڕیٚ لەو بارەی خوا ویستوویەتی، خوا بڕیاڕی هەرچی داو هەوڵی بژارد وهەرشتێکی بەهۆی چی دانا ولە هەر پلە وپادە یەك داینا هیچ کەس ناتوانیٚ ڕاوێژی پێچەوانە ی ئەوان بکات، ئەم شتە ڕاست و ڕەوایە لەبیر ئەچیٚ ئەگەر جێگیر ببیٚ لەدڵ ودەروون دا هیچ کەس بێزار وناڕازی نابیٚ لەهەر ناخۆشی یەك ڕووی تیٚ بکات یان ڕوو بدات، کەشخەو شانازی ناکات بەملی خەڵك دا بەهۆی هەردەست کەوتیٚ کە لە سەر دەستی دا فەراهەم بێت، دڵ غەمگین نابیٚ بەهۆی شتیٚ لەدەستی دەرچیٚ، چونکە ئەزانیٚ دەس بژێن وهەڵبژاردن بەدەست ئەم نی یە، بەڵکو تەنیا بەدەست خوایە مەبەست لەم باسە ئەوەنی یە کەبەندە ژیریی وهەست وخواهیش وخەریك بوونی خۆی لە کار بخات وبەبیٚ سوود بیٚ نرخ سەرنجیان بدات، بەڵکو مە بەست ئەمەیە لەپاش هەوڵ وتێکۆشان وبەخت کردنی ئەوەی لە توانادایە هەرشتیٚ پەیدا بوو ڕووی دا وەری گریٚ بەڕەزامەندی دڵ ومل کەچی یەوە بۆ خوا دڵنیای وباوەڕی بەهێزی هەبیٚ بەڕێك وڕاستی ئەوەی خوا بڕیاری داوەو کردوویەتی، چونکە گومانی بەندە لەسەریەتی بەخت کردنی ئەوەی لەتوانای دا هەیە، ئینجا کارەکە بەدەست خوایە وخۆی چی بڕیارداوە هەر ئەوە ئەبیٚ ههر ئەوەیش پڕ لە حیکمەت وبەرژەوەندی یە، ئەوانە هاوبەش ڕەوائەدەن بۆ خوا، تەنیا خوا داهێنەر وهەڵبژێرە وهەمووشت بەدەست ئەوە بەبیٚ شەریك وهاوبەش نەلە دروست کردن ونە لە هەڵبژاردن ونەلە هیچ شتێکی دا،

سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٦٨﴾ وَرَبُّكَ يَعۡلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمۡ وَمَا يُعۡلِنُونَ
﴿٦٩﴾ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ لَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلۡأُولَىٰ وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٧٠﴾ قُلۡ
أَرَءَيۡتُمۡ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمُ ٱلَّيۡلَ سَرۡمَدًا إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِضِيَآءٍۚ أَفَلَا
تَسۡمَعُونَ ﴿٧١﴾

---

**کەواتەڕاست ترین ڕستە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ خوا پاك و بێگەرد و بەرز و بڵندە لە هاوبەش و بڕیاردانی هاوبەش بۆی، کەواتەهیچ کەس و هیچ شتێ ناتوانێ بەربەرکانێ و چەلان بەرچەلانی بکات، هیچ خواهیش و دەسەلات و هەڵبژاردنی ناتوانێ ڕوو بکاتە خواهیش و دەسەلات و هەڵبژاردنی و بوەستێ بەرامبەری. ﴿وَرَبُّكَ يَعۡلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمۡ وَمَا يُعۡلِنُونَ﴾ خوای پەروەردگار ئەزانێ و ئاگادارە بە هەرشتێ کە سنگیان دای ئەشارێ، واتە لەدڵیان دایە و دەری نابڕن، هەرشتێ کەدەری ئەبڕن و ئاشکرای ئەکەن، کەواتە تۆڵە و پاداشتی ڕاست و ڕەوایە و بەجێ یە، شتێکیان بۆ هەڵئەبژێرێ کە شایانە بۆ یان و ئەوانیش شایانن بۆی، ﴿وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ﴾ ئەو خوا پاك و بەرز و بڵند و زانا ناوی ﴿الله﴾ یە هیچ پەرستراوی تر نی یە بەڕاستی جگە لەو، کەواتە هیچ شەریك و هاوەڵ و هاوبەشی نی یە لە دروست کردن و خواهیش و هەڵبژاردنی دا ﴿لَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلۡأُولَىٰ وَٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾ هەموو سوپاس و سەنا و ناو بردن بەچاکەیە تایبەتی یە بەو خوایەو شایانە تەنیا بۆ ئەو لەم یەکەم جیهانە و لە جیهان و ڕۆژی دوایی دا لەسەر هەموو هەڵبژاردنی، لەسەر هەموو چاکە و بەهرەکانی، لەسەر لێزانی و کاردروستی و بەڕێوە بردنی بۆ هەموو کار و فرمانێ، لەسەر داد و بەزەیی یە بێ سنوورەکەی، ﴿وَلَهُ ٱلۡحُكۡمُ﴾ تەنیا بۆ ئەوە و تایبەتی ی بەوەوە حوکم و بڕیار لە هەموو شتێك دا و لەنێوان بەندەکانی دا، هیچ بەرگری**

کەر و بەرپەرچ دەر و گۆڕەری بۆ هیچ حوکم و بڕیارێکی ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ تەنیا بۆ لای ئەو ئەگێڕرێنەوە لە ڕۆژی دوایی دا، کەواتە دوارترین بڕیاری خۆی ئەدا لە نێوانتان دا و هەموو تا ئەگەن بەبەرهەمی کردەوەتان، ئا بەو جۆر و شێوە گرنگ و بەتینە چەند سیفەت و ناونیشانێکی خۆی باس کرد و دەری خستن، چواردەوری گرتن بەهەست کردن بەزۆر توانا و دەسەڵاتی و کارکردنی تەنیا مەیل و خواهیشی لە هەموو شتێك دا، ئاگاداری بەسەر هەموو نهێنی و پەنهانی و ئاشکرایەك دا، کەواتە هیچ پۆشیدە و پاراوە نی یە لەو خوایە شاراوە نابێ، گەڕانەوەی هەمووان تەنیا بۆ لای ئەوە، کەواتە ڕاکردن و هەڵهاتن لێ ی ناگونجێ و دەست نادا، کەواتە خەڵکی چۆن هاوەڵ و هاوبەشی بۆ ڕەواو بڕیار ئەدەن لە کاتێك دا کە هەمووان لە ژێر چنگی قودرەتی ئەودا و دەرباز بوونیان نی یە و نابێ، ئینجا گەردش و خولانەوەیەکی تر ئەکات بە دڵ و دەروون لەم پێشانگاری بوونەوەرەدا کە تیای دا ئەژین و بێ ئاگان لە بەڕێوە بردنی خوا و چاوێری هەمیشەیی و هەمووکاتی خوا بۆ خۆیان و هۆی ژیانیان، هەڵبژاردنی ئەوەی بەباشی ئەزانێ و شایانن بۆ ی لە هەردوو جیهان دا، هەستیان بێدار ئەکاتەوە بۆ دوو شتی ئاشکرای تەنیایی خوای پەروەردگار کە هەرچی ئەو هەڵبژارد هەر ئەوە ڕاست و بەجێ یەو شایانە، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ﴾ واتە ئەی پێغەمبەر بڵێ پێ یان: پێم بڵێن و هەواڵم بدەنێ ئەگەر خوا شەو بگێڕێ بە شتێکی هەمیشەیی تا ڕۆژی دوایی ئایا کێ یە پەرستراوی تر جگە لەوەی ناوی ﴿الله﴾ یە کە ڕووناکی ڕۆژتان بۆ بێنێ؟ بێگومان ناتوانن بڵێن کەسی تر هەیە جگە لە خوا، کەواتە زۆر بەجێ یە کە پێ یان بفەرموێ: ﴿أَفَلَا تَسْمَعُونَ﴾ دەی کەواتە ئایا ئێوە نابیستن و بیسەر نین بە بیستنی بیرکردنەوە و ورد کردنەوە تا بەهۆی ئەوەوە بزانن ئەو کەسەی ڕۆژ لائەبات و شەو دێنێ ئەو کەسە خوایە تا بەهۆی ئەوەوە بزانن ئەو کەسەی ڕۆژ لائەبات و شەو دێنێ ئەو کەسە خوایە و شایانە بۆ

پەرستن؟ بێگومان پەیدا بوونی شەو و ڕۆژ و گۆڕان و بەدوادا هاتنیان بە شوێنی یەکتردا بەم شێوە ڕێکە و لەسەر ئەم بارە نەگۆڕاوە کە وان لەسەری ئێجگار شتێکی نایابی سەر سوڕهێنەرە، بەڵام بەهۆی باو و دەق پێوە گرتنەوە نایابی یەکەیان لە بیر نامێنێ و هەڵاتنی خۆر و ئاوابوونی کەمتر ئەکەوێتە خەیاڵیان و دایان ئەچڵەکێنێ و دایان ناچڵەکێنێ و بیر ناکەنەوە کە چەند سوود و بەرژەوەندی هەیە لەم گۆڕان و بەدوادا هاتنەدا. لەبەر ئەوە قورئان لەو خەوی بێ هۆشی و بێ ئاگایی و لەبیر چونەوە خەڵکی بێدار ئەکاتەوە و دایان ئەچڵەکێنێ و هەمیشەیی شەو یان ڕۆژ یان ئەخاتە بەرچاو و سەرنجیان ڕائەکێشێ بۆ بەرهەمی خراپ و ناڕوا کە لە هەمیشەیی ئەم دوانەوە ڕووی ڕۆژ. پێ ئەکەوێ گەلێ جار بۆ خۆر و ڕووناکی خۆر کاتێك کەون ئەبێ لە پێش چاویان بەهۆی هەورەوە، جا بیر بکەنەوە ئەبێ چۆن بن ئەگەر شەو هەمیشەیی بێت و هەرگیز خۆر و ڕووناکی خۆر نەبینن؟ ئەوەش ئەگەر لە حاڵەتێك دا ببوایە کە بێ بوونی ڕۆژ گوزەران بکرێ و ژیان بگونجایە ز بەسەر ببرایە، بەڵام ئەگەر ڕۆژ هەر نەبوایە گوزەران نەئەکرا و ژیان بەسەر نەئەبرا، هەروەها خەڵکی کاتێ کەوتنە بەر خۆر لە هاوین و کاتی گەرمادا و چەند ساتێك مانەوە هاواریانە بۆ سێبەر و سەهەندێك تیایدا بحەوێنەوە، باو هەناسەیەکی فێنك وەرگرن، سۆزو ئارەزووی شەویان بۆ پەیدا دەبێت کاتێ کە ڕۆژ زۆر درێژ دەبێت، لە شەودا ئارامی و ئاسایش وەرئەگرن، بێجگە لەوانەش گیانو ژیان پێویستیان هەیە بە ئەو ماوەیەی شەوە بۆ ئەمەی ئەو هێزو وزەیە کە بەختی کردووە لە ئیش و کارو بزووتنەوەی ڕۆژدا تازەو دەمە زەرد بکرێنەوە لەوە ماوەی شەوەدا، دەی کەواتە خەڵکی چۆن ئەبوون و ئەژیان ئەگەر ڕۆژ هەمیشەیی بوایە و هەرگیز شەو نەهاتایە، بیگومان ئەگەر شەو هەر نەبووایە لەم جیهانەدا ژیان بە شێوەی گشتی ئەکەوتە مەترسییەکی گەورە و بەڵکو نەئەگونجا،

﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ﴾

**جا ئەوا خوای گەورە سەرنج ڕائەکێشێ بۆ ئەم چاکە و بەهرەیە، دەست نیشان ئەکات بۆ نرخ و سوودی شەو ئەفەرموێ:﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بە خەڵکی: ﴿إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ ئەگەر خوا ڕۆژ بکات بە کاتێکی هەمیشەیی بە سەرتانەوە تا ڕۆژی دوایی ﴿مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ﴾[1] ئایا کێیە پەرستراوی تر جگە لە خوا کە شەوێکتان بۆ بێنێ ئارام و ئاسایشی تیا بگرن و ماندوویی خۆیانی تیا دەرکەن؟ بێگومان هیچ کەس نییە لەم جیهانەدا بڵێ: پەرستراوی تر بتوانێ شتی وا بکات. چونکە هەرچی بە چاو ئەبینرێ هەمووی شایەتە لەسەر خوایەتی خوا، کەواتە ئەچن بە گژ دەمیدا،**

---

[1] بێگومان بەرامبەر ڕووناکی تاریکییە، بەرامبەری شەو ڕۆژە، کەواتە بە پێی ئەوە ئەبوایە یان لە ئایەتی پێشوودا بووترایە: ﴿ نهار ﴾ لە باتی ﴿ ضیاء ﴾ یان لەم ئایەتەدا بووترایە: ﴿ بظلام ﴾ لە باتی﴿ بلیل ﴾، هەروەها یان لێرە ڕستەی ﴿ لتسكنون فیه ﴾ نەبوایە یان بەرامبەری ئەم ڕستەیە لە پێشوودا ببوایە، واتە: ﴿ بضیاء تعملون و تبصرون فیه ﴾، بەڵام با بزانرێ کە هۆنینەوەکەی قورئان ڕێك و ڕاستە لەبەر ئەم چەند هۆیە کە زانایان فەرموویانە و تا ئێستا ڕێگایان پێ بردووە: ڕووناکی خۆی لە خۆیدا بە نرخ و پڕ سوودە، ئیتر لە ڕۆژدا بێت یان نا، ئەوەتا بەهەشت شەو ڕۆژی نییە و هەمیشە ڕووناکە، سوودو فەڕی ڕۆژیەهۆی ڕووناکییەکەیەتی، سوود و بەرهەمی ڕووناکی زۆرە یەکێکیان بوونی ڕۆژە، ڕووناکی نیشانەی بوونە کە بەنرخ ترە لە نەبوون، کە تاریکی بۆ بڕیا ئەدرێ، کەواتە ڕووناکی بە هەرجۆر بگیرێ چاکەو بەهرەیەکی گەورەیە و مافی خۆیەتی دەیتنیشانی بۆ بکرێ و بە تایبەتی ناوی ببرێ، بە پێچەوانەی تاریکی لە هەموو ئەمانەدا کە باس کران هەروەها بە ناوبردنی ڕووناکی دڵ و دەروون دەکرێتەوە و ڕووناك ئەبێتەوە، بە ناوبردنی تاریکی دڵ دائەگیرێ و باری قورس ئەبێ و خۆی لە خۆیدا سزایە، لەبەرئەوە دۆزەخ هەمیشە تاریکە کە ناوبردنی خۆش نییە، بە تایبەتی کە بە چاکەو بەهرە نیشان بدرێ لە یەکەم جارەوە سەری لێئەکرێتەوەو ناچێتە دڵ، بەڵام شەو با تاریکیش بێت بە چاکەو بەهرە سەیر ئەکرێ، ئینجا ئارامی و ئاسایش گرتنی خەڵکی مەبەستێکە سەرەکییە لە شەودا، کەواتە شایانە ناو ببرێ و دەستنیشانی بۆ بکرێ، بەڵام ئیش و کار لەو ڕادەدا نییە بۆ ڕووناکی، کەواتە باس نەکرێ چاکترە.

أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٧٢﴾ وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُواْ فِيهِ وَلِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِۦ
وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٧٤﴾

---

﴿أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ دەی کەواتە ئایا ئێوە نابینان و نابینن ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوونانە لەسەر خوایەتی خوا بە تەنیا و تا بە هۆی ئەوەوە بزانن کە تەنیا خوا خوایە و تەنیا ئەو شایەنی پەرستنە، لە دوای باسی هەمیشەیی شەو فەرمووی: ئایا نابیستن؟ لە دوای باسی هەمیشەیی ڕۆژ فەرمووی: ئایا نابینن؟ بۆ ئەوەش دوو هۆی باس کراوە:

١.ڕووناکی سوود و بەرهەمی زۆرترە کەواتە هەستی بیستن لەگەڵیدا ڕێکترە کە لە بینین و هەموو هەستەکانی تر بەنرخ ترە و سوودو بەرهەمی زۆرترە، ئەوەتا ئەگەر بیستن نەبوایە ئایین وەرنەئەگیرا و هەروەها فێرکردنی هەر شتێ کە بە چاو نەبینرایە.

٢.هەستی بیستن بۆ شەو بەکارترەو بە کەڵك ترە، کەواتە ئەو لەگەڵ باسی هەمیشەیی شەودا ڕێکترە، ئەمیش لەگەڵ باسی هەمیشەیی ڕۆژدا ڕێکترە.

ئەم دوو ئایەتی ڕابردووە سەرنجی ڕاکێشاین بۆ نرخ و کەڵکی شەوو ڕۆژ لە ژیاندا، ئینجا ئەوا بە ڕوونی دەری ئەبڕێ کە ئەم دووانە چاکەو بەهرەیەکن خوا بە بەزەیی خۆی پێی داوین، گرنگترین سوود و بەرهەمیشیان باس ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ﴾ واتە لەبەر بەزەیی خۆی شەوو ڕۆژی بۆ ئێوە فەراهەم هێناوە ﴿لِتَسْكُنُواْ فِيهِ﴾ بۆ ئەمەی ئارامی و ئاسایش بگرن لە شەودا و ﴿وَلِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِۦ﴾ بۆ ئەمەی داوای هەندێ لە ڕۆزی و فەزڵی خوا بکەن و دەستی خۆتانی بخەن لە ڕۆژدا بەو هەموو جۆرە ئیش و کارو کەسابەتە ڕەوایانە کە باون، ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ لەبەر ئەوە سوپاسی خوا بکەن لەسەر چاکەو نیعمەتی، بە کورتی شەو و ڕۆژ دوو چاکەو بەهرەی خوان دێن بە دوای یەکدا خەڵکی پێویستیان پێیان هەیە، چونکە خەڵکی ئەبێ هەوڵ و تێکۆشان بکات و چنگ و پەل بکوتێ بۆ پێکهێنانی هۆی ژیان و گوزەران کە ئەوەش بە ڕێکی ناکرێ ئەگەر ڕووناکی ڕۆژ نەبێ، ئەو هەوڵ و تێکۆشانەش بە بێ ئارامی ئاسایش و خەوتن و ماندوو دەرچوون ناگونجێ کە ئەوەش لە شەودا ڕێکتر و گونجاوترە، دیارە کە بیر کرایەوە لەو چاکەو بەهرەیە کە خوا

فەراهەمی هێناوە ئەو کاتە سوپاسی خوا ئەکرێ و جگە لەو هیچ کەس ناپەرسترێ. لەم ئایەتە و لە چەند ئایەتی تر وەرئەگیرێ کە هەوڵ و تێکۆشان لە پێناوی فەراهەم هێنانی هۆی ژیان زۆر بە نرخ و مەبەستەو تەمەڵی و تەوەزەلی شتێکی بێزراوە، ئینجا ئەگەڕێتەوە سەر بت پەرست و هاوبەش بڕیاردەران و شێوەیەك لە بەسەرهاتی ڕۆژی دواییان ئەخاتە پێش چاو کە لەو ڕۆژە سەخت و سامناکەدا تانەو تەشەریان لێئەدرێ و دەم کوت ئەکرێنەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ﴾ واتە ئەی پێغەمبەر باسی ڕۆژێ بکە کە خوا بانگ ئەکات لەوانە: ﴿فَيَقُولُ﴾ بەم ڕەنگە ئەفەرموێ پێیان: ﴿أَيْنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾ ئایا لە کوێن ئەوانەی کە ئێوە لە دنیادا لاتان وابوو هاوبەشنبۆ من؟ لە کوێن با ڕزگارتان کەن لەم سزا سەختەی کە وان تیایدا؟

ئا بەم جۆرە بێ ئابڕوو ئەکرێن لە پێش چاوی ئەو هەموو گەل و کۆمەڵەوە کە جگە لە خوا کەس ژمارەیان نازانێ، ئەو پرسیارە ئەبێ بە تیری ژاراوی و ئەچێ بە نوکەی دڵیاندا، مافی خۆیانە – خوا پەنامان بدات – ئەو هەموو سزاو ئازارە بدرێن، چونکە تاوانەکە ئێجگار گەورەیە، بەڵام پێویستە بزانرێ – وەك لە چەند شوێنێکدا وتمان – کە هاوبەش بڕیاردان تەنها بریتی نییە لەو جۆرە سادەیەی کە باو بووە لەو چەرخەدا لە ناو نیوە دوورگەی عەرەبدا، بەڵکو پێویستە بزانرێ کە چەند جۆری تری هەیە، پیس ترینی هەموو جۆرەکان و زیان دەر ترینیان بریتییە لە باوەڕهێنان بە بەرنامەو ڕژێم و یاسایەکی تر جگە لەوەی پێغەمبەرمان(ﷺ) هێنای، بڕیاردان و دانانی هەر بەرنامە و ڕژێم و یاسایەکی تر لە جێگای ئەو ئایین و شەریعەتە پاکەدا و وازهێنان لە ڕێگا ڕاستەکەی خوا کە زۆر و زەبەندە خەڵکی دەردەدار بووە بەو دەردە کاریگەرە لە خوێندەوارو نەخوێندەوار، تەنانەت لەوانەی خۆیان بە مسوڵمان دادەنێن و نوێژو ڕۆژووشیان هەیە!!! ئەم شێوە پرسیارو تانەو تەشەرە لەمەو پێش تێپەڕی کردو باس کرا، لێرەدا دووبارە کرایەوە بۆ بەهێزکردن و جێگیرکردنی لە دەروندا، بێجگە لەوە لێرەدا شێوەیەکی تری سامناکی لەگەڵ دایە کە بریتییە لە هێنانی پێغەمبەری هەموو گەل و ئوممەتێ تا شایەت بێت بەسەریانەوە لەسەر هەڵوێستی ئەم جیهانەیان بەرامبەر خۆی و ئەو ئاینەی بۆی هێنان،

وَنَزَعۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدٗا فَقُلۡنَا هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ فَعَلِمُوٓاْ أَنَّ ٱلۡحَقَّ لِلَّهِ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿٧٥﴾

وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَنَزَعۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدٗا﴾ دەرئەهێنین و ئاشکرای ئەکەین و جوێی ئەکەینەوە لە ناو هەموو گەل و ئوممەتێکدا شایەتێك – واتە پێغەمبەرەکەیان – تا شایەتی بدات لەسەر ئەو بارەی کە ئەوانەی لەسەر بوون لەم جیهانەدا ﴿فَقُلۡنَا هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ﴾ ئینجا ئەڵێین: ڕابەرو نیشانەتان بێنن لەسەر ئەو ئاین و عەقیدەو کردەوەی کە لە سەری بوون. هەموو گەلێ ڕاگیر ئەکرێ بەرامبەر پێغەمبەرەکەی، ئەویش شایەتییان لێدەدات، ئینجا خوایش داوای ڕابەرو بەڵگەیان لێدەکات لەسەر ڕاستی ئەو بارەی کە لە سەری بوون، بێچگومان ئەوانیش هیچیان بە دەستەوە نییە، چونکە ئەوان لەسەر بارێکی لارو ناڕاست بوون، ئاشکرایە بە هیچ ڕەنگ ناگونجێ بەڵگەو نیشانەی ڕاستی لەسەر شتی لار و ناڕاست، ﴿فَعَلِمُوٓاْ أَنَّ ٱلۡحَقَّ لِلَّهِ﴾ لەو ڕۆژەدا ئەزانن کە ڕابەری بەهێزی ڕاستی تایبەتییە بە خواوە و هەموو شتێکی حەق و ڕاست تەنیا بۆ خوایە و تەنیا ئەو خوایە شایانی پەرستنە بە بێ هاوبەشی و وێنە ﴿وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾ ون ئەبێ لێ یان ئەوەی بە دەلەسەو درۆ دەست هەڵبەستیان کرد لەم جیهانەدا لەبارەی بت و بت پەرستی و پەرستنی جگە لە خوا، لە پاش سەرگوزەشتەی موساو فیرعەون ئەو هەموو ڕابەرو نیشانەو شتە گرنگانەی هێنا بە دوایدا، چەرخەو گەردشی کرد بە دڵ و دەروون بە ناو ئەو هەموو ڕووداو و پێشانگا گرنگانەی ئەم بوونەوەرەدا، لەم جیهانەوە بردی بۆ ئەو جیهان و ڕۆژی دوایی، لەوێوە هێنایەوە بۆ ئەم جیهان، سەرنجی ڕاکێشا بۆ هەندێ لە بەسەرهات و لە ناوبردنی گەلە ڕابردووەکان، بۆ باوی خوا لەم بوونەوەرو ژیانەدا، کە ئەمانەش هەموو بە ڕێك و پێکی لەگەڵ مەبەستی سەرەکی و بنەڕەتی سوورەتەکەدا، لەگەڵ ئەو سەرگوزەشتە سەرەکییەی کە لە سوورەتەکەدایە: سەرگوزەشتەی موساو فیرعەون، سەرگوزەشتەو بەسەرهاتی قارون، باسی یەکەمیان تێپەڕی

کرد، ئینجا با بێینە سەر دووەمیان: لە یەکەمدا هێزی پادشایەتی و حوکمڕانی نیشاندرا، کە چۆن بێ خێرو بێر ڕۆیی و لە ناو برا کە لەگەڵ جەورو ستەم و سەرکێشی لە خوا و دووری لە بەرنامە و ڕێنموونی خوادا بوو ئینجا ئەوا لێرە بە دواوە دووەم دێت کە بەهێزی سامان و زانین و زانیاری نیشان دەدات، کە چۆن ئەمیش بێ خێرو بێرو بێ سەرو شوێن ڕۆیی، کاتێ لەگەڵ لادان و لەخۆگۆڕان و کەشخەکردن بە مل خەڵك و دان نەنان بە چاکەی خوا و چاو لەبەرنەبووندا بوو بۆ خوا. قورئان کات و شوێنی ئەم بەسەرهاتە باس ناکات، بەس ئەوە ئەفەرموێ: کە قارون لە گەل و نەتەوەی موسا بوو ئینجا لێیان هەڵگەڕایەوەو سەرکەشی و مل هوڕی بەکارهێنا لەگەڵیان، ئیتر ئایا لە کاتێکدا بووبێ کە موسا و ئیسرائیلییەکان هێشتا لە میسردا بوون و پێش دەرچوونیان بێت؟ یان لە پاش دەرچوونیان و لە چەرخی موسادا بووبێ – علیه السلام –؟ یان لە پاش موساو لە ناو گەلی ئیسرائیلی ئەمە ڕووی دابێ؟ چەند ڕیوایەتێك هەیە کە قارون ئامۆزای موسا بووە و ئەم ڕووداوە لە چەرخی موسادا بووە، لە هەندێ لەو ڕیوایەتانەدا ئەمەش ئەڵێ کە ئازارو سزای گەیاند بە دڵی موساو پیلانێکی گەورەی بۆ ڕێکخست کە لەکەداری بکات بە زینا لەگەڵ ئافرەتێکدا کە پول و پارەی پێدابوو لە بەرتیلی ئەو بوختانە گەورەیەدا، لە پاشان خوا پاکی موسای دەرخست و تۆڵەی سەند لە قارون بە خۆی و ماڵییەوە بردی بە ناخی زەویدا. ئێمە هیچ پێویست نین بە هیچ کام لەم ڕیوایەتانە، پێویست نین بە دیاریکردنی کات و شوێنی ڕووداوەکە، چونکە بەسەرهاتەکە بەو شێوەی کە لە قورئاندا هەیە بەسە بۆ پێکهێنانی مەبەست لە گێڕانەوەکەی، ئەگەر دیاریکردنی ئەوانەو زانینیان بایەخ و نرخێکی ببوایە قورئان پێی هەڵئەساو دیاریئەکردن، کەواتە با ئێمەیش لە شێوە قورئانییەکەوە سەرنجی بدەین و وەریبگرین و بزانین، دووربین لەو هەموو ڕیوایەتانە کە لە سەرچاوەیەکی بەهێزی باوەڕپێکراوەوە نەهاتوون و هیچ سوودو بەرهەمێکی بەنرخیشیان نییە،

﴿ إِنَّ قَـٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ۖ وَءَاتَيْنَـٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ

---

**ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ قَـٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ﴾ بێگومان قارون لە گەل و نەتەوەکەی موسا بوو، واتە ئیسرائیلی بوو ئینجا نارەوایی و دەستدرێژی کردە سەریان و ویستی خۆی بەرز بکاتەوە بە سەریانداو هەموو لە ژێر فەرمانی ئەودا بن و خۆی بە گەورەو ئەوانی بە سوك و بێ نرخ سەیر کرد، ئینجا دەستنیشان ئەکات بۆ هۆی ئەو خۆلێگۆڕانە کە پەیدا بوو بۆ قارون، ئەفەرموێ: ﴿وَءَاتَيْنَـٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ﴾سامان و داراییەکی زۆرو فراوانمان پێدا تا ڕادەیەك ئەوەی کە پێویست نەبوو بۆ بەکارهێنان هەماری کرد بوو هەڵگرتنی کیلەکانی جێگاو شوێنەکانی باری کۆمەڵێکی لە پیاوانی بەهێزی گران ئەکردو زۆر بە ئەرك و زەحمەت پێیان هەڵئەگیرا، جا بەهۆی ئەو سامانەوە لە خۆ گۆڕاو دەستدرێژی کردە سەر گەل و نەتەوەکەی کە ئەوە باوی ناکەس و ناپیاوانە کە بەهۆی دەسەڵات و سامانەوە لە پەت بەرئەبن و لە خۆیان ئەگۆڕێن و لوتیان ئەکەن بە کەڵە شاخ لە ئاستی خەڵکی. قورئان جۆر و شێوەی نارەوایی و دەستدرێژیەکەی دیاری نەکردو بێگومان چەند بارێکی تر هەڵئەگرێ، هەڵئەگرێ زەوی و زارو شت وەکی داگیرکردبن کە ئەوەش باوی سەرمایەدارانە لە زۆر کاتدا، بەو هەموو دارایی و دەرامەتی خۆیانەوە تێر ناخۆن و چاو ئەبڕنە ئەوەی وا بە دەست هەژارو بێنەوایانەوە، ئەگونجێ مەبەست بێبەش کردنی هەژارو بێدەسەکان بێت لەو مافەیان کە خوا بڕیاری داوە لە سامانی دەستدارو دەوڵەمەندەکاندا و پێویستی کردووە لەسەر شانیان، هەڵئەگرێ بەم جۆرانەو بە جۆری تریش بە هەر بارو بە هەر ڕەنگ لە ناو گەلەکەیدا کەسی وا بووە کە ویستبێتی بیگێڕێتەوە لەو نارەوایی و دەست درێژییە بۆ سەر ڕێگای ڕاست و ڕەوا کە خوا ئەیەوێ و ڕەوای داوە، کە ئەوەش بەم جۆرەیە: سامان دار بێ بەش ناکات لە سامانەکەی، بێبەشی ناکات لە بەکارهێنانی ڕابواردنێکی ڕاست و میانە، بەڵکو پێویستی ئەکات کە لەو سنوورە ڕاستە تێپەڕ نەکات و بەرگری ئەکات لە زیادەڕەوی، لە پێش هەموو شتێکەوە پێویست ئەکات لەسەری چاودێری و هەست کردن بە ئاگاداری خوا بەسەرییەوە، ئەو خوایە کە بە بەزەیی خۆی ئەو سامان و ناز و نیعمەتەی پێداوە،**

إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ

هەروەها چاودێری و تێڕوانین و هەست کردن بە ڕۆژی دوایی و حیساب و پرسیارو سزاو تۆڵە سەختەکەی و نازو ڕێزە نەبینراوەکەی وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ﴾[1] ئەی پێغەمبەر باسی ئەو کاتە بکە کە گەلەکەی قارون – واتە باوەڕدارە ڕاستەکانیان – وتیان پێی: کەیف خۆش مەبە بەمەی هەتە، کەیف خۆشی و کەشخەو لەخۆگۆڕان، کەیف خۆشی شانازی و بەستنەوەی دڵ بەو سامان و داراییەوە. کەیف خۆشییەك کە زیادەڕەوی تیابێ و خوا لە بیر بباتەوە چاکەو بەهرەکەی لە هۆش نەهێڵێ. بێ ئاگای بکات لە سوپاس و چاو لەبەر بۆ خوا، کەیف خۆش مەبە، کەیف خۆشییەك کە ئەو ماڵ و سامانە دڵ داگیر بکات، خەریکت بکات تەنیا بە خۆیەوە، هۆش و ژیریت بنێتە باڵ و بیفڕێنێ، بێتە هۆی دەم و دەست درێژی بەسەر بەندەیانی خوادا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ﴾ چونکە خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێ کە ئاوا بە تین کەیف خۆش و کەشخەکەرن بە سامان و دارایی ئەم جیهانە، ﴿وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ﴾ لەو گەنج و سامانەی خوا پێی داوی داوای پاداشتی ئەو جیهان بکە، بەم ڕەنگە بەکاری بێنە و سەرفی بکە لەو شتانەدا کە هۆی ڕەزامەندی خواو دەستکەوتی پاداشتی خوان لەو جیهان، ﴿وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا﴾واز مەهێنە لە بەشی

---

[1] هەندێ ئەفەرمون: وشەی(إذ) بەستراوە بە ڕستەی(لتنوء) ەوە، ڕایەکی تر ئەمەیە بەستراوە بە(بغی) وەو ڕایەکی تر بە(آتینا)ەوە، ڕایەکی تر بە(قال إنما أوتیته)، ڕایەکی تر ڕستەیەکی بۆ بڕیار نەدەن. بەڵام بە لامەوە بەسترا بێت بە(ذکر)ی بڕیار دراو ڕێکترە.

خۆت لەم جیهان و خۆت بێبەش مەکە لە خۆراك و پۆشاك و ڕابواردنی حەلاڵ و ڕەوا لە ژیانی ئەم جیهانەدا، ئا لەمەدا دەرئەکەوێ کە میانەیی و ڕێك و ڕاستی بەرنامەی خوا لە ژیاندا، ئەو بەرنامە ڕاستە کە لە ناوەڕاستی ترازوودا ڕاوەستاوەو بە بێ کەم و کوڕی و زیادەڕەوی. ئەو بەرنامەیە کە دڵێ خاوەن سامان ئەبەستێتەوە بە ڕۆژی دواییەوەو ژیانی ئەو ڕۆژەی بۆ ئەکات بە مەبەست و ئامانجی سەرەکی و بنەڕەتی، بێ بەشیشی ناکات لە بەشی ڕەوای ژیانی ئەم جیهان، بەڵکو هانی ئەدات لەسەر وەرگرتنی ئەو بەشەی، داوای لێئەکات بە داوالێکردنێکی گرنگ بۆ ئەمەی ئەم ژیانە هەروا بێ نرخ و بێ سوود لە دەست دەرنەکرێ و دەستی پێوە نەنرێ، بێگومان خوا ئەو هەموو شتە پاك و خاوێنەی دروست کردووە لەم جیهانەدا بۆ ئەمەی ئەم ژیانەی پێ بەسەر ببرێ بە خۆشی و کامەرانی، بۆ ئەمەی خەڵکی لەم زەویەدا بە هەوڵ و تێکۆشان ئەو شتانەی کە هۆی ژیانن پێکی بێنن و زۆر و فراوانی بکەن، تا بەهۆی ئەوەوە ژیان بەرزو تازە ببێتەوە، جێنشینی ئادەمی لەم زەوییەدا بەدی بێت، ئەوەش بە مەرجێ کە ژیانی ئەو جیهان لەبیر نەچێتەوەو ئەو بکرێ بە مەبەست ئامانجی ڕاستەقینە، کەوا ئەو کاتە لانادرێ لە ڕێگای ئەو ڕۆژەو خەریك بوون بە پێکهێنانی هۆی ئەم ژیان و ئەم جیهان یەك خەرو بەرگری کەر نییە لە هەڵسان بە ئەرك و هۆی ژیانی ئەو جیهان، ئەو کاتە خەریك بوون بە هۆی ئەم ژیانە جۆرێکە لە جۆرەکانی سوپاسی خواو بەشێکە لە فەرمانبەریی و پەرستنی خوا کەواتە جیاوازی نییە لە نێوان ئەم ژیان جیهان و ئەو ژیان و جیهان، بەڵکو هەردوو تێکەڵن و پەیوەندی بەهێزیان هەیە پێکەوە، ئاوا ئەم بەرنامەی خوا هاوتایی و ڕێکی و گونجاوی فەراهەم ئەهێنێ لە ناو بە ناوی ژیانی سروشتی ئەم جیهاندا،

وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٧٧﴾

﴿وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ﴾ کردەی چاك و چاکە بکەن بە بەندەیی خوا هەرچۆنێ خوا چاکەی کرد ئەلای تۆ بەم هەموو سامان و داراییەی کە پێی دای. ئەم سامانە چاکەو بەهرەو بە خششێکە لە لایەن خواوە، کەواتە با بەرامبەری بکرێ بە چاکە، چاکە لە وەرگرتنیداو چاکە لە دەست خستن و سەرف کردندا، چاکەی پێ بکرێ لەگەڵ بەندەیانی خوادا، چاك هەست بکرێ بە چاکەی خواو چاو لەبەری بۆ بەکاربهێنرێ، چاکە بەکاربهێنرێ لە سوپاسی خوادا، ﴿وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ﴾ نیازی خراپەکاری مەکە لە وڵاتدا و بە شوێنی ئەوەدا مەگەڕێ، خراپەکاری بە جەورو ستەم لەگەڵ خەڵك، بە ژیان و ڕابواردنێ کە بیم و ترس لە خواو چاودێری ڕۆژی دوایی لەگەڵ نەبێ، خراپەکاری بە ئازاردانی دڵی خەڵکی و تەنگەتاو کردنیان و بڵاوکردنەوەی کینەو رقەبەری لە نێوانیاندا، خراپەکاری بە بەخشش و سەرف کرنی ماڵ لە شتی ناڕەواو گرتنەوەی لە شتی ڕەواو لە هەر شتێ و هەرکەس کە بە جێو ڕێی بێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾[1] چونکە بێگومان خوا خراپەکارانی خۆش ناوێ، واتە خوا خەشمی هەیە لەربارەیان، ڕیسوایان ئەکات و دووریان ئەخاتەوە لە سایەو پەنای خۆی، ئەم چەند تەمێ و ئامۆژگارییە کە ئاراستەی قارون کرا پەیڕەوی کردنیان هۆی سەرکەوتن و پێشکەوتن و ژیانی کامەرانییە لەم جیهانەدا و گەیشتن بە ڕەزامەندی خواو گەیشتن بە نازو ڕێزو نیعمەتە نەبڕاوەکەی بەهەشت لە ڕۆژی دواییدا، بەڵام تەمێ و مۆچیاری چارەسەر نییە بۆ کەسێکی وەکو قارون کە سروشتی تێك چووەو ترازاوە لەسەر تەوەرەی ئادەمێتی، جا بەهۆی ئەوەوە بەرپەرچی ئەو ئیماندارانەی دایەوە بەرامبەر تەمێ شیرینەکانی ئەوان و ڕستەیەکی ووت کە هەموو خراپەو خراپە کارییە ئەگەیەنێ

[1] خۆش نەویستنی خوا لە هەر شوێنێکدا وتراوە یان مەبەست ئەوەیە کە لە تەفسیرەکەدا ووتراوە، یا ماناکەی خۆیەتی و بەڵام بۆ بێدار کردنەوەیە لەسەر ئەوە کە تەنیا خۆش نەویستن بەسە بۆ ترساندن؛ خەشمی لەگەڵ بێت.

﴿قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ أَوَلَمۡ يَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَهۡلَكَ مِن قَبۡلِهِۦ مِنَ ٱلۡقُرُونِ مَنۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُ قُوَّةً وَأَكۡثَرُ جَمۡعًا﴾

---

﴿قَالَ﴾ وتى: ﴿إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ﴾ ئەو هەموو سامان و دارایییەم پێنەدراوە لەبەرئەوە نەبێ کە مافی خۆمەو شایانم پێی لەسەر زانینێ کە لامە و بەو زانینە پێکم هێناوە و کۆم کردووەتەوە، کەواتە هەرچۆنێك بکەم و بەهەر شێوەیەك بجوڵێمەوە ئارەزووی خۆمەو ئێوە مافی ئەوەتان نییە ڕێگاو ڕەچەم بۆ دانێن و ڕا و بڕیاری خۆتان بسەپێنن بە سەرمدا لەم شتانەی کە هینی تایبەتی خۆمن و بە دەست و بازووی خۆم و بە زانینی تایبەتی خۆم فەراهەمم هێناون، بێگومان ئەمە وتەی لەخۆگۆڕاوی و هەڵخەڵەتاوە کە سەرچاوەی دارایی و نیعمەتەکەی لەبیر چووبێ، سەروەت و سامان هۆشی لا نەهێشتبێ و چاوی دڵی کوێر کردبێ، ئەوە نموونەیەکە هەر بووەو هەر هەیشەو ئەیش بێت لە ناو گرۆی ئادەمیدا، زۆر کەس هەیە کە ئەوەی خوا پێی داوە بە ئازایی خۆی دائەنێ و لای وایە تەنها بە لێزانی و لێهاتویی خۆی دەستی کەوتووەو هیچ حسابێ بۆ خوا ناکات، جا لەبەرئەوە خۆی بە سەربەست و ئازاد دائەنێ و لای وایە هیچ کەس ڕێگای نییە دەست بخاتە کارو فەرمانی و بە ئارەزووی خۆی چی ئەکات نابێ لێپرسینەوەی ببێ، بەڵێ ئیسلام دان ئەنێ و باوەڕی هەیە بە موڵکایەتی تایبەتی، ڕێزی هەیە بۆ تێکۆشان لە ڕێگای پێکهێنانیدا لە ڕێگایەکی ڕەواو شەرعییەوە،فەرمان ئەدات بەو تێکۆشان و بەبێ سوود و نرخ سەرنجی نادا، بەڵام هەر لەم کاتەدا بەرنامەیەکی تایبەتی پێویست کردووەو بڕیاری داوەو پێویستی کردووە بۆ پێکهێنان و دەست خستن و زۆرکردن و پەرەپێدانی – ئەو بەرنامەیە – بەرنامەیەکی میانەیەو لە ناوەڕاستدا وەستاوەو هاوکێشی هاوتایی بەکارئەهێنێ، یەکە یەکە و ئەندامی گەل بێبەش ناکات لە بەرو بەرهەمی کۆششەکەی، دەستیشی بەرەڵا ناکات بە ئارەزووی

خۆی ڕابوێرێ تا ئەگاتە ڕادەی بەخت کردن بە بەلاش و فیڕۆ، هەروەها لە چنگ قوچان و دەست گرتنەوەیشدا سەربەستی ناکات تا ڕادەی چروکی و ڕەزیلی، بڕیار ئەدات بۆ گەل مافی ڕەوای خۆی وەرگرێ لەو ماڵو سامانە تایبەتییانە، چاودێری ئەخاتە سەر ڕێگای فەراهەم هێنان و پەرەپێدان و زۆرکردن و سەرف کردن و ڕابواردن پێی، ئەو بەرنامەیە خوا دایناوە بەرنامەیەکی تایبەتییە و دروشم و نیشانەکانی ڕوون و دیار جیاوازن، بەڵام قارون گوێچکەی شل نەکرد بۆ بانگ و بانگەواز و تەمێی گەلەکەی، هەستی نەکرد بە چاکەی خوا بەسەریەوە، ملکەچ نەبوو بۆ بەرنامە ڕێك و ڕاستەکەی، پشتی کردە ئەمانە هەموو بە لوت بەرزی و کەشخەیەکی نەفامانەو ناپیاوانە. جا لەبەرئەوە ئەم هەڕەشەو ترسانەی بۆ هات، پێش تەواو بوونی ئایەتەکە بۆ دەم کوت کردن و بەرپەرچ دانەوەی لەسەر ئەو ووتە ناڕێك و ناڕەوایەی کە تێپەڕی کرد[١].

﴿أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِن قَبْلِهِۦ مِنَ ٱلْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا﴾ ئایا نەیزانیوە کە خوا لە پێش ئەمدا لە چین و چەرخەکانی ڕابردوو کەسی وای لەناوبردو بەربادی کرد کە هێزو دەسەلاتی بە تین تر بوو لەم، کۆو کۆمەڵی لەم زۆرتر بوو. واتە ئەگەر قارون خاوەن هێزو سامانە، دەی بێگومان خوا لە پێش ئەودا بەهێزترو ساماندارتری لەناوبردووە، واتە پێویست بوو لەسەری ئەوەی بزانیایە، بێگومان ئا ئەمەیە زانینی بە کەڵکو پڕ سوودو ڕزگارکەر. ئەگەر زاناو ئاگادار بووایە بەوە لە خۆی نەئەگۆڕاو هەڵنەئەخلەتا و شوێنی فەرمانی خوا ئەکەوت و چاو لەبەری ئەو ئەبوو، یان مەبەست ئەوەیە بێگومان قارون زاناو ئاگادار بووە لەوە، کەواتە چۆن لە خۆی گۆڕاو هەڵخەڵەتا بەو هێزو سامانەی بیری نەکردەوە لە بەسەرهاتی سەختی گەل و ئوممەتە یاخی و سەرکێشەکان، لە پێشەوە هەڕەشەو ترساندنەکەتەنیا بۆقارون بوو ئینجابەشێوەی گشتی هەڕەشە و ترساندنی ئاراستە ئەکات،

---

[١] پرسیارەکە لەسەر ڕای یەکەم بۆ بێزاری و ئینکارە، لەسەر ڕای دووەم بۆ دان پیانانە.

ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾ لە ڕۆژی دواییدا لەم جیهانەدا بۆ سزادان و تۆڵە لێ سەندن پرسیار ناكرێ لە تاوانبارەكان، واتە پێویست نییە، پرسیار بۆ ڕوون بوونەوەی تاوانبارییان، چونكە شێوەی تایبەتی یان نیشانەیە لەسەر تاوانەكەیان، پرسیار وەڵامی ناوێ، مەبەست ئەوە نییە كە بەهیچ جۆر پرسیاریان لێ نەكرێ، بێگومان پرسیاریان لێ ئەكرێ وەكو ئەفەرموێ: ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾[1] بەڵام پرسیار لەو تاوانبارە دۆزەخییانە مەبەست تەشەردان و ئابڕووبردنیانە، نەك مەبەست هەواڵ دان و ئاگاداركردنە لە لایەن تاوانبارەكانەوە، كەواتە ئەم وێنەی ئایەتەی كە خەریكین پێیەوە دژ نین لەگەڵ ئەو ئایەتانەی كە پرسیار لێ كردنیان ئەگەیەنن، ئەو ئەندازە كە باس كرا لە سەرگوزەشتەی قارون بەشی یەكەمی بوو، كە دەستدرێژی و زیادەڕەوی و دەم درێژی قارونی نیشان ئەدا، لەگەڵ پشت تێكردن و ڕوو وەرگێڕانی لە پەندو ئامۆژگاری و خۆ بەزل زانی و سووری و نەگەڕانەوەی لە خراپەكاری و خۆڵێكۆڕان و هەڵخەڵەتانی بە سامان و دارایییەكەی تا ڕادەیەك خوای لە بیر بدەوە، وا بیم و ترسی لە دڵدا نەهێشت و بێباكی كرد لە سزای خوا، ئینجا بەشی دووەم دێتە پێشەوە كاتێ قارون ڕۆژێ لە ڕۆژان خۆی دەرخست و خۆی نیشانی گەل و نەتەوەكەی دا بەو هەموو ئارایش و زینەت و تەنتەنەو عەنعەنەیە كە خوا پێی دابوو، بە هۆی ئەوەوە كۆمەڵێ لە گەلەكەی كە نەفام و باوەڕ لاواز بوون سەرسام بوون و ئەوەی كە بینیان دڵی ڕفاندن و كەوتنە ئاوات خواستن لە قارون و لایان وا بوو كە قارون بەختەوەرەو چارە دارە لە كاتێكدا كە ئەوانەی خاوەنی باوەڕی بەهێز بوون نەكەوتنە لەخشە تەنها شانازییان ئەكرد بە عەقیدەو باوەڕەكەی خۆیان و ئەوەی قارونیان بەلاوە شتێكی بێ نرخ و بەرامبەر پاداشتی خوا بۆ بەندە چاكەكانی خۆیان خۆگر و دامەزراوبن،

---

[1] سوێند بە خوای تۆ ئەی پێغەمبەر پرسیار ئەكەین لێیان هەموو بە تێكڕایی.

فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِي زِينَتِهِۦۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا يَٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِيَ قَٰرُونُ
إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٧٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ
وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ﴿٨٠﴾ فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ
يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴿٨١﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِي زِينَتِهِۦۖ ﴾ ئینجا ڕۆژێ دەرچوو بۆ ناو گەلەکەی بەو خشڵ و زەڕو زیوەرو پۆشاك و وڵاغی سواری ڕازاوەو ئەو هەموو خزمەتکارو دەستەو بەستەی خۆیەوە، ئەوەش بە نیازی کەشخەو شانازی بە مل ئەو خەڵکەدا و نیشاندانی ئەو هەمووە دەسەڵات و تەنتەنەو عەنعەنەیە کە بووی، بێگومان ئەو خۆپیشاندانە هۆی شکستی دەروون و دڵ ڕەنجەییە بۆ گەلێ کەس، مایەی دڵ گۆڕان و ترازانە بۆ ئەوانەی نەفام و باوەڕ لاوازن، جا لەبەرئەوە: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا﴾ ئەوانەی کە ژیانی ئەم جیهانەیان ئەویست وتیان: ﴿يَٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِيَ قَٰرُونُ﴾ ئای کاشکێ وێنەی ئەوەی دراوە بە قارون بۆ ئێمە بووایە ﴿إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ﴾ بە ڕاستی قارون خاوەنی بەش و بەختێکی زۆر گەورەیە. لە هەر کات و شوێنێکدا سامان و زەڕو زیوەری ئەم زەوییە بوو هەندێ دڵ و دەروون ئەڕفێنێ، هۆش و فام ناهێڵێ ئەوانەی کە چاویان بڕیوەتە ژیانی ئەم جیهانە، چاو هەڵناخەن بۆ ئەوەی بەرزترو بەڕێزترە لە هەموو ئەم جیهانەدا، جا بەهۆی ئەوەوە بیرناکەنەوەو ناپرسنەوە لەوە کە ئەو خاوەن بەشە بە چی و لە چەند ئەو بەشەی کڕیوە؟ بە چ هۆیەك دەستکەوتی بووە؟ ئیتر ئەو بەشە پول و پارەو سامان بێت، یان وەزیفەو مووچە خۆری بێت یان ڕێزو بەرزی و قەدر بێت، هیچ بیر ناکەنەوە لەوانە، بەڵکو تەپو کۆ پەلامار ئەدەن و تێکۆشان ئەکەن بۆ ئەو بەشە کەم و کوڕە دوایی هاتووە، هەرچۆنێ مێش و مەگەز پەلامار ئەدات و تەپو کۆ ئەکەوێ بە مل شیرینیدا با ژەهریش بێت، لەگەڵ چاویان کەوت بە شتێ لەو جیفەو بەشە بە دەست

هەرکەسەوە بێت دەست بەجێ لیك و ئاو بە دەمیاندا دێتە خوارەوە، تەماشای ئەو شتە ناکەن کە خاوەن بەش دەستی لێهەڵگرتووە لە پێناویدا و داویەتی لە بریتیدا، سەرنجی ئەوە نادەن کە لە چ ڕێگایەکی پیسەوە بۆی ڕۆشتووەو بە چ هۆیەکی ناڕەواو ناپیاوانە دەستی خۆی خستووە، بۆ وێنە ئەوەتا ئەبینی زۆرو زەبەندە پارە پەیدا ئەکەن لەم چەرخەدا بێ ئەمەی بیربکەنەوە لەوە حەرامە یان حەڵاڵە، بەڵکو بە هەر جۆر دەست کەوێ کابرا سەری پێوە نییە، یان ئەبینی بە هۆی ئەو پارەوە ئەبێ دەست بنێ بە ئایین و عەقیدەکەیەوە، ئەبێ بێ نرخ و بێسوود ڕیسوا ببێ لە ناو گەلدا کەچی چاو دائەخات و ئەو بەدبەختی و سەرشۆڕییە بەسەر خۆی ئەهێنێ بەرامبەر ئەو شتە کەمەی کە دەستی ئەکەوێ!! ئەوانەی کە ئەم ژیانە کەم و کورەیان ئەویست بەو جۆرە بوون کە باس کران، بەڵام ئەوانەی کە دڵیان بەستراوە بە خواوە ئەوە ترازوویەکی تریان هەیە بۆ کێشانەی ژیان، لە دڵیاندا ئامانج و مەبەستێ تر هەیە، جگە لە مەبەستی ناڕەوای ئەم زەوی و جیهانە، ئەوانە دڵ و دەروونیان گەورەترو بەرزو بڵندترە لەوەی پەستی بەسەر خۆیاندا بهێنن و سەرداخەن لە ئاستی هەموو شتە ناڕەواکانی ئەم جیهان و زەوییەو ئەوانە پارێزەرو پەنایان هەیە لە لایەن خواوە لەمەی مل کەچ بکەن لە بەردەم ڕێزو سامانی بەندەیەکی وێنەی خۆیان، ئەوانە کەسانێکن کە زانا کراون و زانینی ڕاستەقنەیان پێدراوە کە بە پێی ئەوە نرخ دائەنێن بۆ ژیان و هەموو کاروباری ژیان، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ﴾ ئەوانەی کە زانینیان پێدرابوو وتیان بەو تاقمە ئاواتەخوازە ﴿وَيۡلَكُمۡ﴾ واتە نەکەن شتی وا نەڵێن و ئاواتی وا نەخوازن ﴿ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّمَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا﴾ پاداشتی خوا لە ڕۆژی دواییدا بۆ ئەو کەسەی لەم جیهانەدا باوەڕی هێنابێ و کردەوەی چاکی کردبێ باشترە لەوەی دراوە بە قارون، باشترەلە هەموو شتێك، باشترە لەم جیهانەو هەرچی وا لەم جیهانەدا، ﴿وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ﴾[1] ئەو

---

[1] بە پێی تەفسیرەکە ڕاناوەکە(ها) ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو وشەی کە زانایان ئەیڵێن و چەند شتی تریشی بۆ باس کراوە، پاداشتی بەهەشت، بەهەشت، خو و ڕەوشت کە لە باوەڕو کردەوەی چاکەوە وەرئەگیرێ.

شتە بەفەڕەی کە زانایان ئەیلێن و هەستی پێ ئەکەن نادرێ بە هیچ کەس جگە لە خۆگرەکان کە خۆگرو بە ئارامن لە بەجێهێنانی فەرمانێ کە پێیان سپێرراوە، لە بەرگری خۆیان و لەو شتانەی قەدەغەکراوە لێ یان، خۆگرن بە پێی باو و بەراوردی خەڵکی ڕەفتار ناکەن، بەڵکو شوێنی ڕەزامەندی خوا ئەکەون. خۆگرن لە ئاستی ئەو شتانەی کە لەم جیهانەدا هەڵخەڵەتێنەرن و خەڵکی لە ڕێگای ڕاست نەترازێنن، خۆگرن لەسەر بێبەشی لەوەی کە خەڵکی هەیەتی و ئارەزووی ئەکرێ، واتە ئەو کەسانەی کە ئاوا خۆگرو بە ئارامن خوای گەورە هەستیان بەرز ئەکاتەوە سەرنجی شتی بێ نرخ نادەن، بەڵکو چاو ئەبڕنە بەرزترین شت کە پاداشتی خوایەو گەیشتنە بە پلەی بەرز لای خوا و نزیك لە خواوە، بە ڕەزامەندی وئارامی دڵەوە چاوەڕوانی لای خوان. ئینجا کاتێ کەشخەو عەنعەنەو زینەت و ئارایشی قارون گەیشتە ئەوپەڕی پلەی خۆی و دڵ و دەروونی خەڵکی ڕاکێشا و خستییە بێئارامی، کەشخەو شانازی و خۆڵێگۆڕانی لە سنور دەرچوو، لەوێدا دەستی قودرەت هاتە پێشەوە سنووری دانا بۆ هەموو نارەواییە، بەزەیی هاتەوە بە خەڵکی بێ هێزو لاوازداو بەرگری لێکردن، لە هەڵخەڵەتان و ترازان لە ڕێگای ڕاست، هاتە پێشەوە دای لە قارون بە خۆی و سەرو ماڵییەوە لەناوی بردن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ﴾ ئینجا بومەلەرزەمان کرد بەو زەوییەی کە قارونی بەسەرەوە بوو و بردمان لە ناخیدا بە قارون و خانوو و ماڵەکەیەوە، زەوی قوتی دان و هەڵی لوشین لە تۆڵەی ئەو هەموو تاوان و نالەبارییەی کە قارون پێی هەڵسا. ﴿فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ کەواتە هیچ تاقم و کۆمەڵێکی نەبوو یارمەتی بدات و بەرگری سزای خوای لێ بکات ﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ﴾ لەو کەسانەش نەبوو کە خۆیان بە خۆیان بەرگری کەری خۆیانن، بە کورتی هیچ یارمەتی دەر و بەرگری کەری نەبوو لە لایەن خزمەتکارو دەستەو بەستەکەی و نە لە لایەن خۆیشییەوە، قارون بەو جۆرە بە خۆی و سەرو ماڵییەوە تیا چوو، بوو بە تەمێ و عیبرەت بۆ خەڵکی،

وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْاْ مَكَانَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا

---

**﴿ وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْاْ مَكَانَهُۥ بِٱلْأَمْسِ ﴾ ئەوانەی کە دوێنێ و لەوەو پێش ئاواتیان ئەخواست بۆ وێنەی پادەو پلەی قارون ئەوانە باریان گۆڕا و گەڕان بە جۆرێ: ﴿يَقُولُونَ﴾ ئەیان وت: ﴿وی﴾[1] واتە سەریان سوڕماو وشەی ﴿وی﴾ یان وت کە کاتێ شتێکی سەر سوڕهێنەر ڕوویدات ئەو ووشەیە ئەوترێ بۆ دەربڕینی سەرسوڕمانی لەو ڕووداوە، ئینجا وتیان: ﴿وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ﴾ بێگومان خوا ڕۆزی فراوان ئەکات بۆ هەرکەسێ خوا خۆی بیەوێ و مەیلی بێ و کەم و کوڕو تەنگیشی ئەکات لە هەر کەس مەیلی بێ، واتە زۆری و تەنگی خوا بە مەیلی خۆی ئەیکات بە پێی زانین و لێزانی خۆی و نە زۆری نیشانەی ڕێزو چاکییەو نە تەنگ و گوزەرانیش نیشانەی بێنرخی و خراپییە، کەواتە ئێمە هەڵە بووین کە لامان وا بوو ئەوەی دراوە بە قارون نیشانەی ڕێزی بوایە بەو جۆرەی بەسەر نەئەهات، ﴿لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا﴾ ئەگەر خوا منەتی نەنایە بە بەدی نەهێنانی ئاواتەکەمان. یان ئەگەر منەتی نەنایە بە لێبووردن و لەو ئاواتە ناڕەوای کە ئێمە خواستمان، ئەگەر ئاوا منەتی نەنایە ئەیبردین بە ناخی زەویدا ﴿وی﴾ ئای لەم بەسەرهاتە سەرسوڕهێنەرە،**

---

[1] لە ووشەی(وی کأن) دا دە ڕا هەیە:

١. ڕای کیسائی کە ئەڵێ:(وی) ووشەیەکی سەربەخۆیە بۆ سەرسام کردنەوەك(ك) پیتی ڕاکێشەرە بۆ عیللەت هێنانەوەیە(أن) تا دوایی عیللەتەکەیە لەسەر ئەم ڕایە وەستان لەسەر(وی) ئەکرێ.
٢. (كأن) پیتی مشبە بە فیعلە و لێرەدا بۆ بڕوای بەهێزە نەك بۆ گومان. لەسەر ئەم ڕایەش وەستان لەسەر وشەی(وی) ئەکرێ کە وشەی پەشیمانییە.
٣. (ویك) وشەیەکی سەربەخۆیە وەك(ك) پیتی خیگابە و(أن) مەفعولێکی لابراو کە(علم)ە، لەسەر ئەم ڕایە وەستان لەسەر(ك) ئەکرێ و ئەبو عمرو لەسەر ئەمەیە.
٤. (ویك) لە بنەڕەتدا(ویلك) بووەو(ل) لابراوە، لەسەر ئەم ڕایەش وەستان هەر لەسەر(ك)ە.
٥. (ویكأن) هەمووی وشەیەکی سەربەخۆیە بە مانا(ألم تر)یە، لەسەر ئەم ڕایە وەستان لەسەر(ن)ە بە هەر کام جوانە.

**﴿وَيۡكَأَنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ بێگومان ناگەن بە ئامانج و ڕزگار نابن ئەوانەی دان نەنێن بە چاکەی خواو چاو لەبەری نین، یان ئەوانەی کافرو بێباوەڕن بە پێغەمبەران و ئەو بەڵێن و هەڕەشەی لێیان کراوە لە لایەن خواوە، هەرچەند قارون جاڕی کافری لە خۆی نەدا و بە ئاشکرا بێباوەڕی خۆی دەرنەبڕی، بەڵام لەخۆگۆڕان و هەڵخەڵەتانی بە سامان و ماڵەکەی و ناسینی ئەو سامانە لە زانین و لێهاتنی خۆی و نەك لە خوا شێوەو ڕواڵەتی کافرانی بەسەردا هێناو لەبەرئەوە برایە ڕیزی کافرانەوە، شێوەی سزاو لەناوبردنەکەی وەکو هینی کافران وابوو، بەم ئەندازەیە کۆتایی هێنا بە باس و بەسەرهاتی قارون و شێوەکەی لە پێش چاو نەهێشت وەکو پەردەیەکی بەسەردا بهێنرێ، ئینجا بڕیارێ دەرئەکات و ئەیهێنێ بە دوای هەردوو باسی سورەتەکەدا، کە ئێجگار ڕێك و لکاوە پێیانەوە، ئەفەرموێ: ﴿تِلۡكَ ٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ نَجۡعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوّٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فَسَادٗاۚ﴾ واتە ئەو جیهان و ماڵە دواییەی کە بەرزۆ بەڕێزو بەناو بانگە – واتە بەهەشت – ئەیگێڕین بۆ ئەو کەسانەی کە لەم جیهانەدا نیازی زاڵ بوون و دەست درێژی و داگیرکردنیان نییەو نایانەوێ ئەو شتانە ڕوو بدەن لە ناو وڵات و دانیشتوانی وڵاتدا، واتە ئەو بەهەشتە مافی ئەوانەیە و بەوان ئەدرێ و لەبەر خاتری ئەوانە، ئیتر با خەڵکی تریش تێی بچێ لە پەنای ئەواندا و بە تکای ئەوان، ئەم ئایەتە نیشانە نییە لەسەر ئەوە کە ئێستا بەهەشت نییەو هێشتا دروست نەکراوەو لە ڕۆژی دواییدا دروست ئەکرێ، چونکە مەبەست لەوەی لە داهاتوودا ئەبێ تێچوون و ڕەوادانی تێ چوونی ئەو بەهەشتەیە نەك دروست کردن و بەدیهێنانی بەهەشت خۆی، بێگومان ئەو کەسانە کە بەو جۆرە نیاز پاکن دڵ و دەروونیان پڕە لە یادی خواو بەستراون بە بەرنامەی خواوە و خۆپارێزن لە هەر شتێك هۆی خەشم و نارەزایی خوا بێت**

وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيۡرٞ مِّنۡهَاۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجۡزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٨٤﴾

---

﴿وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ پاشه ڕۆژی چاك و گەیشتن بە ئامانجی بەرزو بەرێز بۆ لە خوا ترسان و خۆپارێزەرانە، لەو جیهان و ڕۆژی دواییەدا پاداشت و تۆڵە بەم جۆرەیە کە ئەفەرموێ: ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيۡرٞ مِّنۡهَا﴾ هەرکەسێك لە ڕۆژی دواییدا بە چاکەوە بڕوا بۆ حزوری خوا ئەوە بۆی هەیە لە پاداشتدا چاکتر لە چاکەکەی خۆی، چونکە کە خوای خاوەن بەزەیی لای خوارووی دەقاتی ئەکاتەوە بۆی و لای ژوری خوا خۆی ئەزانێ، بێگومان وەرگرتن و پاداشت بۆ ئیمان و باوڕدارانە وەکو لە چەند ئایەتی تردا فەرمویەتی: ئەگینا هیچ چاکەیەك وەرناگیرێ و پاداشت نییە کاتێ لەگەڵ ئیمان و باوەڕدا نەبێ: ﴿وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ﴾ هەرکەسێك بە خراپەو گوناهەوە بڕوا ﴿فَلَا يُجۡزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ ئەوە تۆڵە ناسانرێ لەوانەی کردەوە خراپەکانیان کردووە مەگەر وێنەی ئەوەی کردوویانە بە بێ زیادە، لە لوتف و بەزەیی خوا بە زیاد بێت، ئیتر ئێمەی تاوانبار چیمان ئەوێ؟ لە پاش ئەو سەرگوزەشتانەو لە دوا دوایی سورەتەکەدا ڕووی فەرموودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتێکدا دەرکرا لە شارەکەی کە نیشتمان و جێگای خۆی و باو و باپیری بوو، لە لایەن خزم و کەلەکەیەوە تارێنرا لە کاتێکدا کە بە ڕێگاوە بوو بۆ شاری تازەی - مەدینەی بەفەڕ - هێشتا لە جوحفەدا بوو لە نزیکی مەککەوە، نزیك لە بیم و ترس، لە کاتێکدا دڵەو دواو چاوی ئەیڕوانی بۆ مەککەوە، نزیك لە بیم و ترس، لە کاتێکدا دڵەو دواو چاوی ئەیڕوانی بۆ مەککە کە بەرێزو خۆشەویست بوو لە دڵیاندا و بەجێهێشتن و لێ ی جوێ بوونەوەی زۆر قورس و گران بوو، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە ئایین و بانگ و بانگەوازەکەی لا گرنگترو خۆشەویست تر بوو لە شارو نیشتمان و لە هەموو شتێ تر لەم جیهانەدا ڕووی فەرمودەی تێئەکات و بۆن و هەناسەی خۆشی موژدەیەکی گەورە ئەدا بە دەروون و دەماغی دا،

ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾[1] واتە كەسێ کە پێویستی کردووە لە سەرت خوێندنی قورئان و ڕاگەیاندنی پەیڕەوکردن و ڕەفتار پێکردنی، ئەو کەسە ئەتگێڕێتەوە بۆ شوێنێکی زۆر بەرێز کە باو و ئولفەتت پێوە گرتووە – واتە مەککە – واتە هەرچۆنێ قورئانی پێویست کردووە لەسەرت و ئەو ئەرکە گەورەی خستووەتە سەر شانت، هەروەها یارمەتیت ئەداو وازت لێ ناهێنێ هەروا ئەو بت پەرستانە لە شارە خۆشەویستەکەت دەرتکەن. بەڵکو یارمەتیت ئەدات و زاڵت ئەکات و ئەتگێڕێتەوە بۆی بە سەرکەوتوویی تۆو شوێنکەوتووەکانت و سەرشۆڕی ئەو بت پەرستانە، تۆ تۆ ئەمڕۆ دەرئەکرێی لێی سبەینێ ئەگەڕێتەوە بۆی بە سەربەرزی.

ئا بەو جۆرە خوا ویستی لەو کاتە تەنگ و ناخۆشەدا ئەو موژدە و بەڵێنە خۆشە بدات بە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی(ﷺ) بۆ ئەمەی ڕێگاکای بداتە بەر بە ئارام و دڵ دامەزراوی و بە باوەڕێکی بەهێزو بەو بەڵێنە گەورەیە. بێگومان بەڵێنی یارمەتی و سەرکەوتن هەیە بۆهەموو کۆمەڵێ کە ڕێبازی پێغەمبەرو یارەکانی بداتە بەر، هەرچەند دووچاری سزاو ئازارو بەسەرهاتی ناخۆش بێن، هەرچەند تێکۆشەر لەو ڕێگایەدا بڕوا بێگومان دوا ڕۆژی سەرکەوتن و زاڵی هەر بۆ ئەو تاقمە تێکۆشەرەیە و ئەبێ دوژمنی مل هوڕی سەرکێش لەناو بچێ ئیتر زۆری پێ بچێ یان کەم، ئەم بەڵێنە یەکێك بوو لە هەواڵە غیبییەکانی قورئان و موعجیزەیەکی گرنگ بوو لەو هەموو موعجیزانەی کە خوا دای بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەبوو لە پاش هەشت ساڵ بە لەشکرو کۆمەڵێکی گەورە بە هەموو سەربەرزیو ڕێزەوە هاتەوە مەککەو مەعادەکەی خۆی. خوای گەورە پێغەمبەری گێڕایەوە بۆ شارەکەی خۆی هەرچۆنێ موسای گێڕایەوە بۆ ئەو خاك و وڵاتەی کە کاتی خۆی بە تەنیا و بە ترس و بیمەوە لێی دەرچوو وەکو لەم سورەتەشدا باسی فەرموو.

---

[1] وشەی(معاد) یان لە عادەتەوە وەکو تەفسیرەکەی لەسەر کرا یان لە(عود) واتە شوێنی گەڕانەوەی بۆ ئەکرێ، هەر کەس خەڵکی هەر شارێ بێ بەو شارەی ئەوترێ(معاد) چونکە بۆ هەموو پێویستییە هات و چۆی دەرەوە ئەکرێ و لە پاشدا ئەگەڕێنەوە بۆی، بە تایبەتی بە مەککە وترلوە(معاد)، چونکە بێجگە لە دانیشتوانی خەڵکی تریش هەموو ساڵێ ئەگەڕانەوە بۆیو بۆ حەج کردن لەسەر هەر کامێك مەبەست مەککەیە.

قُلْ رَبِّيٓ أَعْلَمُ مَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ وَمَنْ هُوَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨٥﴾ وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓاْ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ
ٱلْكِتَٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ
بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ ۖ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ ۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا
ءَاخَرَ ۘ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ كُلُّ شَىْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ

---

ئەو مـوژدە خۆشـەی پێـداو ئینجـا پێـی فـەرموو: ﴿قُلْ رَبِّيٓ أَعْلَمُ مَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ وَمَنْ هُوَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بە بێ باوەڕەکان پەروەردگارم ئاگادارترەو باش زانایە بەو کەسـەی هاتووە بە ڕێنموونی بۆ ڕێگای ڕاست و ئاییینی ڕاستی هێناوە، زانایە بەو کەسەی هاتووە بە ڕێنمـوونی بـۆ ڕێگـای ڕاسـت و ئـاییینی ڕاسـتی هێنـاوە، زانایـە بـەو کەسـەی وا لـە نـاو گومڕاییەکی ڕوون و ئاشکرادا، واتە بڕۆ بە ڕێگای خۆتدا، واز بێنە لە کاری بڕیار لە نێوان تۆو گەلەکەتدا لێی گەڕێ بۆ ئەو کەسەی کە قورئانی پێویست کرد لەسەرت، واز لەوە بێنە بۆ خوایە کە پاداشت ئەوانە ئەداتەوە کە ڕێگای خوا ئەدەنە بەر، تۆڵەو سزای گومڕایان ئـەدات، ئینجـا بـە ڕاسـتی بـەدی هـاتنی ئـەو بەڵێنـە بـەمێزو دامـەزراوتر ئـەکات لـە دڵـی بەفەڕی‌پێغەمبەر(ﷺ) بەمەی سەرنجی ڕائەکێشێ بۆ لا گەورەترین بەهرە کە خوا پێی دا لە کاتێکدا کە ئەم هیچ شتی وا نەبووەو هەرگیز چاوەڕوانی بۆ نەکردووە ئـەوەش بریتی‌یـە لـەم قورئانە گەورەیە کە سروشتی کردە لای، کەواتە ئەم بەڵێنەی بۆ بەدیئەهێنێ، هەرچۆنێ ئەم قورئانەی بۆ نـاردو ئـەم خەڵاتە بێوێنـەی کرد، هـەروەها سـەرنجی ڕائەکێشێ بۆ گـەورەیی و گرنگـی ئـەم قورئانـە کـە ئەمـە چـاکەو بـەهرەو ڕەحمـەتێ بـوو لـە لایـەن پـەروەردگارەوە، ئەفـەرموێ: ﴿وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓاْ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ﴾ تـۆ ئـەی پێغەمبـەر بـە ئومێد و چاوەڕوان نـەبویت کـە ئـەم کتێبە گرنگـەت پـێ ئەگەیـەنرێو ئەمێنرێتـە خـوارەوە بـۆ لات. ﴿إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ﴾ [1] بـەڵام پێـت گەیـەنرا لەبـەر بەزەییـەك لـە لایـەن پەروەردگارتـەوە، لوتـف و بـەزەیی

---

[1] بە پێی تەفسیرەکە ئیستیسنای مونقەتیعە کە زۆریە لەسەر ئەوەیە، دروستە موتەسلیش بێ، واتە ئەو کتێبەی لەبەر هیچ شتێ نەناردووە جگە لەبەر بەزەیی.

دەربارەی خۆی لە یەکەم جارەوە کە شتێکی پێ درابوو بە هۆی ئەوە کرد بە پێشەوا لە هەردوو جیهاندا، پلەو ڕادەیەکی ئەوەندە بەرزی پێ ئەدرێ لە ڕۆژی دواییدا کە هەموو کەس ئاواتی پێ ئەباو خۆزگەی پێ ئەخوازێ، ئینجا بەزەیی بوو بە هەموو کەس لەم جیهانەدا، چونکە ڕێنموونی تیایە بۆ ژیانی کامەرانی و بەختەوەری لە هەردوو جیهاندا، هۆی گەیشتنی ئادەمی بە ڕادەو پلەی هەرە بەرزی خۆی. ئەم ئایەتە بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) بە هیچ ڕەنگ بە تەمای پێغەمبەرێتی نەبووەو بیری لەوە نەکردووەتەوە، بەڵکو تەنیا بە هەڵبژاردنی خوا بووە بە مەیل و خواهیشی خۆیو بە پێی زانینی خۆی کە زانیویەتی کێ شایانە بۆی، کێ دەست ئەدات هەڵسێ بەو کارە گرنگە کە گەورەترینی هەموو کارێکە. بێگومان لەو چەرخ و کاتەدا زۆر کەس بوون لە عەرب و لە ئیسرائیلییەکان کە ئەیانزانی کاتی هاتنی دواترین پەیام و پێغەمبەرێتییە و بەهۆی ئەوە بەتەمای ئەو بەهرەیە بوون، بەڵام خوا کە خۆی زاناو لێزان و کاردروستە بە کەسێکی کە چاوەڕوانی بۆ نەئەکرد، بێگومان وەکو بڕیاری هەمووانی لەسەرە پێغەمبەرێتی بە هەوڵو تێکۆشان دەست کەوت نابێ، بەڵکو کارەکە تەنیا بە دەست خوایەو بەبێ هۆی بەندە، ئینجا بەرامبەر ئەو چاکە وبەهرە گەورەیە کە ڕشتی بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ) ئەم چەند شتەی لەسەر پێویست کرد:

١- ﴿فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَٰفِرِينَ﴾ کەواتە بە هیچ ڕەنگ یارمەتیدەرو پشتیوان مەبە بۆ کافرەکان، بێگومان کافرەکان باوەڕیان نییە بە کتێبەی کە دراوە بە پێغەمبەر، کەواتە نابێ ئەمیش کۆمەکی ئەوان بکات، کەواتە بە هەر جۆر ناگونجێ کۆمەکیو یارمەتی و سوێند خواریو خۆشەویستی لە نێوان ئیمانداران و بێباوەڕاندا، چونکە ڕێگاکانیان جیاوازەو بەرنامەیان جیاوازەو ئیمانداران کۆمەڵی خوان و بێباوەڕان کۆمەڵی شەیتانن، کەواتە چۆن و لەسەر چی کۆمەکیو پشتگیریو خۆشەویستی و سوێندخواری ببێ لە نێوانیاندا؟ چۆن یەك بکەون؟

٢- ﴿وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ﴾ با کافرەکان بەرگریت نەکەن لە ئایەتەکانی خوا لە پاش ئەو کاتەی هێنرانە خوارەوە بۆ لای تۆ، واتە گوێیان مەدەرێ و نرخیان بۆ دامەنێ و لەسەر کاری خۆت سور بەو ڕێگا ڕاستەکەی خۆت بدەرە بەر تۆ کە خوا

کردویتی بە پێغەمبەری خۆی و ئایەتی خۆی بۆ ناردوی بێگومان لەگەڵتەو یارمەتیت دەدات، کافران و بێباوەڕان بە هەموو هەوڵو تەقالا ئەیانەوێ بەرگری خەڵکی بکەن لە ڕێگای خوا و ببن بە کۆسپ لەبەر بانگ و بانگەوازی خوادا، ڕێگای پێغەمبەران و ئیماندارانیش ئەمەیە کە ڕێگای خۆیان بدەنە بەر بە جۆرێ کە گوێیان نەبێ لەو کۆسپ و ڕێگرانەو ئەو دوژمنانە نەتوانن بەربەستیان بکەن و لایان بدەن لە کاتێکدا ئەمان کراون بە ئەمیندار بەسەر ئاین و ئایەتەکانی خواوە.

٣- ﴿وَٱدۡعُ إِلَىٰ رَبِّكَ﴾ بانگی خەڵکی بکە بۆ لای پەروەردگارت و بۆ پەرستنی، بە بانگ کردنێکی پاك و خاوێن و ڕوونی و بێ گیرو گرفت و پێچ و پەنا، بانگ بۆ لای خوا بکە نەك بۆ لای نەتەوایەتی و نەك بۆ لای ڕەگەزایەتی و تایفەگەری، نەك بۆ لای خاك و وڵات، نەك بۆ ژێر هیچ ئاڵایەکی ئەم زەمین و جیهانە، نەك بۆ هیچ بەرژەوەندی و دەستکەوتێکی ئەرزی، نەك بۆ شوێنکەوتنی ئارەزووی نەفس و پێکهێنانی هیچ خۆشییەکی کاتی دوابڕاو، ئینجا هەرکەس ئەیەوێ شوێنی ئەم بانگەوازە بکەوێ بەم پاك و خاوێنییەو بێ تێکەڵو پێکەڵی هیچی تر ئەو کەسە با بێتە پێشەوەو شوێنکەوێ و خوا تەنیا بەم جۆرو شێوەیە ئەیەوێ، هەرکەس نیازی تری تێکەڵ ئەکات با بزانێ ئەوە ڕێگای خوا نییە.

٤- ﴿وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ تۆ لە ڕیزی هاوبەش ڕەوادەران نەبی و یەکێ نەبی لەوان بە هۆی کۆمەکی کردنیان یان بە هەر هۆیەکی تر، هاوبەش ڕەوادان چەند جۆرو چەند شێوەی هەیە کاتێ خواپەرستی ڕاستەقینە بەدی دێ کە مەردوم دوور بێت لە هەموو جۆرو شێوەکانی، ڕەوانەدانی هیچ جۆرە هاوبەشی دوورکەوتنەوە لە هەموو جۆرو شێوەکانی ئەوەندە یاسایەکی مەبەست و گەورەو گرنگە بە چەند جۆرو بە چەند شێوە لە چەندەها شوێندا خوا لە قورئاندا ئەیفەرموێتەوە، ئەوەتا لێرەدا بەدوای ئەم ڕستەدا ڕستەیەکی تر ئەهێنێ کە لەگەڵ ئەمدا یەك شت ئەگرێتەوەو جۆرو شێوەکەیان جیاوازە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾ لەگەڵ خوایە کە ناوی ﴿الله﴾ یە هیچ پەرستراوی تر مەپەرستە ئەو بە گرنگ گرتنەش بەهۆی ئەوەیە کە ئەم یاسایە پایەو بنەڕەتە بۆ هەموو ئەم ئاین و باوەڕو شەریعەتە، هەموو کاروباری لەسەر ئەو بنەڕەتەدا داڕێژراوەو

وەستاوەو ڕاگیراوە، هەموو داب و ڕەوشت و تەمێ و ڕژێم و یاساکانی تری بە دەوری ئەم یاسا گرنگەو ئەم بنەڕەتەدا ئەسوڕێنەوە، کەواتە ئەم بنەڕەت و یاسایە دوو ڕێگانەو جێگا جیابوونەوەی باوەڕی خواپەرستییە لە هەموو بیرو باوەڕی تر، هەرکەس بە ڕێکی لەسەر ئەو بنەڕەتە وەستا و دامەزرا لە هەموو کاروبارێکی دا ئەو کەسە خوا پەرستەو هەرکەس ترازا و بە موو لای دا ئەو کەسە لە خواپەرستی لای داوە، مەبەست ئاڕاستەکردنی ئەم جۆرە ڕستانەیە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) هەڵگێرساندن و بەهێزکردنی سۆزو پەرۆشی خواپەرستییەتی، یان بە دیمەن و ڕواڵەت ئاڕاستەی ئەم کراوەو مەبەست خەڵکی ترە، بەڵام ئاڕاستە کردنیان بە پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕێوە هۆی بێدارکردنەوەو دڵ داچڵەکان و پێکهێنانی زیادە بیم و ترسە لە دڵی خەڵکی تردا، یەکێ لەم دووبارە مەبەستە کە باسمان کرد ئەگینا شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە پێغەمبەر(ﷺ) ئێرە تا ئاسمان دوورە لە هاوبەش بڕیاردان و پەرستنی هیچ پەرستراوی تر جگە لە خوایەك کە لێرەدا ئەم چەند سیفەت و نیشانەیەی بۆ باس فەرمووە:

أ- ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نییە جگە لەو خوایەی کە ناوی ﴿الله﴾ یە، کەواتە مل کەچی ڕاست نییە بۆ ئەو نەبێ، پەرستنی ڕاست نییە بۆ ئەو نەبێ، هیچ هێزو توانایەك نییە جگە لە هێزو توانای ئەو، هیچ پەنا نییە جگە لە پەنای ئەو.

ب- ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ﴾ هەموو شتێك لەناو ئەچێ و شایانە و دەست ئەدات بۆ لەناوچوون جگە لە زاتی پاکی ئەو. بە خوا ڕاستە هەموو شتێ ئەڕواو لەناو ئەچێ، سامان و ڕێزو قەدر، دەسەڵات و هێز، ژیان و خۆشی و ڕابواردن، ئەم زەوییە هەرچی وا بەسەرییەوە. ئەو ئاسمانانەو هەرچی و هەرکەس ها لە ناویاندا، ئەم بوونەوەرە هەمووی، ئەوەی ئێمە پێی ئەزانین و ئەوی نایناسین و پێی نازانین، ئەمانە هەموو لەناوئەچن و تەنیا خوا ئەمێنێتەوە کە مانەوەی بێ بڕانەوەی ڕاستەقینە تەنها بۆ ئەوە.

ج- ﴿لَهُ ٱلۡحُكۡمُ﴾ تەنیا بۆ ئەوە بڕیاری هەموو شتێك و لە هەموو شتێكدا، هیچ كەس هاوبەش نییە لە بڕیارەكانیدا، خۆ لادان و دەرچوون و ڕاكردن نییە لە بڕیاری، هیچ پەنا نییە بەرگری بكات لە بڕیاری ئەو.

د- ﴿وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ بۆ لای ئەو ئەگەڕێنەوە لە ڕۆژی دواییدا، هەموو ئەگەڕێنەوە لای بۆ حیساب و پرسیارو تۆڵەو پاداشت، هەموو ئەچنە بەردەم دادگای گەورەی ئەو، كەواتە هیچ سایەو پەنایەك نییە جگە لە سایە و پەنای ئەو، پەرستن و گوێڕایەڵی تەنیا بۆ ئەو شایەنە، ئا بەم جۆرە ئەم سورەتە دوایی پێهێنرا، ئەم سورەتەی كە بەئاشكرا دەستی قودرەتی دەرخست بۆ پاراستن و پارێزگاری كردن و بانگ كردن بۆ لای خوا، بۆ لە ناوبردن و بەربادكردنی هێزە سەركەشە مل هوڕەكان. ئەم سورەتە دوایی پێ هێنرا بە دامەزراندنی یاسای بانگ كردن بۆ لای خوا: تاكو تەنیایی خواو تایبەتی پەرستن و مانەوەو بڕیارو حوكمڕانی تەنیا بەوە، كەواتە خاوەن بانگەوازەكانی خوا با ڕێگای خۆیان بدەنە بەر لەسەر ڕووناكی دڵ و ڕێنموونی، بە دڵنیایی و ئارام و هێزی باوەڕو دەروونەوە، خوا بە بەزەیی خۆی بمانخاتە سەر ڕێگای ڕاست و دامەزراومان بكات لەسەری – آمین.

**و صلى الله و سلم على سيدنا محمد و آله و صحبه و سلم**

**ڕۆژی سێ شەممە**

**١ی ذی الحجة یان ٣٠ ذی القعدة ١٤١٠**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ﴿٢﴾

## سورەتی (العنكبوت)
## مەككەییە و (٦٩) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

هەندێ ڕیوایەت باس ئەكات كە یانزە ئایەتی یەكەم جاری مەدینەییە، چونكە باسی جیهاد و مونافیقانی تێدایە كە لە مەدینەدا پەیدا بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕ لەسەر مەككەیەتی بەهێزترە، چونكە ترمزی حەدیسێ ئەهێنێ هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی هەشتەم لەم یانزە ئایەتە مسوڵمان بوونی سەعدی كوڕی ئەبو وەققاصە كە لە مەككە مسوڵمان بوو لە نزیكی سەرەتای هاتنی ئیسلامدا، وەكو لە شوێنی خۆیدا باس ئەكرێ، وشەی جیهاد لە چەرخی مەككەیشدا بووە، مەبەست پێی هەوڵو تێكۆشانی دەروونییە بۆ ئەمەی خۆگرو دامەزراو بێت و لانەدات لە ڕێگای خوا بە هۆی سزادان و دەستدرێژی لێكردن، هەروەها باسی مونافیق لە بارەیەوە ئەیەوێ شێوەی نموونەیەك لە ئادەمی بخاتە پێش چاو، ئەم سورەتە هەمووی بەستراوە پێكەوە داڕێژراوە لەسەر یەك هێڵ لە سەرەتاوە تا دوایی، مەبەستی سەرەكی و بنەڕەتی لەم سورەتەدا بریتییە لە باسی باوەڕی دامەزراوی ڕاستەقینە و دانگرتن بەسەریدا و خۆگرتن و خۆڕاگیر كردن لە ژێر باری تاقیكردنەوەو سزاو ئازارێ كە ڕوو ئەكاتە باوەڕدار لەسەر عەیدەو باوەڕەكەی، بە كورتی تێگەیشتن لە مەبەستی سورەتەكە، ئینجا با گوێ بگرین بۆ سورەتە بەفەڕەكە كە بە درێژیی مەبەستی خۆی بدات بە گوێچكەمانداو بیخاتە ناو دەروونمان، ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * الٓمٓ﴾ لە بارەی ئەم جۆرە پیتانەوە لە چەند سورەتێكدا دواین بە درێژی و بە كورتی، كەواتە با لەوە گەڕێین، پاش ئەم قاپی و سەرەتایە ئینجا دەست پێئەكات بە باسی ئەوەی كە وتمان

مەبەستی سەرەکی و بنەڕەتییە لە سورەتەکەدا، ئەفەرموێ: ﴿ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ﴾ ئەگێڕنەوە کە کۆمەڵێ لە مەککە لە ئیمانداران بێزار بوون و بێ ئارامییان دەربڕی بەهۆی سزاو ئازارێکی زۆر بەتین کە دووچاری بوون لەلایەن بت پەرستەکانەوە، ئینجا بەو بۆنەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە دژی ئەو بێزاری و بێ ئارامی ئەو کۆمەڵەو پێی فەرموون: ئایا خەڵکی وا گومان ئەبەن کە تەنیا لەبەرئەوە ئەڵێن باوەڕمان هێناوەو باوەڕدارین ئیتر وازیان لێ ئەهێنرێ بەبێ ئەمەی تاقیبکرێنەوە؟ واتە نەخێر شتی وا نابێ و گومانەکەیان ناڕەوایە، بەڵکو ئەبێ تاقیبکرێنەوە تا دەرکەوێ کێ ڕاست و ڕێك دامەزراوەو کێ لارو ناڕێك و تەڵەکەبازە؟ تاقی ئەکرێنەوە بە چەند باری گران و ئەرکی قورس، وەکو تێکۆشان و لێ بڕان و بەخت کردنی هەموو هێزو لێهاتنی لە ڕێگەی خوادا، خۆگرتنەوەو بەرگری لەو شتە ناڕەوایانەی قەدەغە کراون، هەڵسان بە گوێڕایەڵی و فەرمانبەری لەو شتانەدا کە داواکراوە، دەست هەڵگرتن و دەست نان بە هەرشتێك کە ئارەزوو ئەکرێ و دڵ پێی خۆشە لەم جیهانەدا، هەروەها هەموو بەڵاو بەسەرهاتی خراپ لە هەر بارێکی ترەوە، ئەم تاقیکردنەوەی پێویستە تا ڕاست و ناڕاست جیا ببنەوە، تا ڕاستان بگەن بە پاداشتی گەورەی خۆگری لای خواو لە ڕێگەی خوادا، چونکە باوەڕو عەقیدەی تەنیا با پاك و خاوێنیش بێت پاداشتی ئەوەیە خاوەنەکەی هەمیشەیی نابێ لە ئاگردا ئیتر ڕزگاری لە ئاگرو گەیشتن بە ڕادەو پلەی بەرزی بەهەشت بەهۆی دەرچوونی باوەڕدارەوە لەو تاقیکردنەوانەدا، بێگومان عەقیدەو باوەڕو وشەو وتارێ نییە بە تەنیا بە دەم بوترێ، بەڵکو شتێکی ڕاستەقینەن ئەرکیان هەیەو سپاردەیەکن بە زەحمەت و ناڕەحەتی پارێزگاری ئەکرێن، کۆشش و تێکۆشان و بەربەرەکانێیەکیان ئەوێ کە خۆگری و دامەزراوی ئەوێ، کەواتە تەنیا وتنی ڕووت، بەس نییە تەنیا بە وتن وازناهێنێ، هەتا بەو شتانە خەڵکی تاقی نەکرێنەوە، ئەبێ بەو تاقیکردنەوە پاڵفتە بکرێن لە هەموو چڵك و چەپەڵییەك بە وێنەی ئاڵتون و زیو کە بە ئاگر پاڵفتە ئەکرێن،

ئەو تاقیکردنەوە شتێکی دامەزراو و بەکارهێنراوە هەر لە کۆنەوە، شتێکی ڕەفتار پێکراو و باوە لە ترازووی خوادا وەکو بۆمان ڕوونئەکاتەوە بەم فەرموودەیە ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْۖ﴾ ئایا خەڵکی ئەو گومانە ئەبەن لە کاتێکدا بێگومان ئێمە بڕوادارانی پێش ئەوانمان تاقیکردەوە، باوی ئێمە هەروابوو، کەواتە ئەبێ ئەمانیش تاقیبکرێنەوەو گومانی تاقینەکردنەوە ناڕاستەو گومانبەر هەڵەیە، بێگومان خوا زانایەو ئاگادارە بە هەموو شتێ لە پێش بوون و ڕوودانیدا، هەرچۆنێ زاناو ئاگادارە پاش بوون و ڕوودانی، بەڵام خوای گەورە باوی وایەو وا هاتووە کە بە پێی تەنیا زانیاری خۆی ڕەفتار نەکات لەگەڵ بەندەکانیدا، پاداشت و تۆڵەی نەبێ بۆیان تا خۆیان بە خواهیش و مەیلی خۆیان ئەو کردەوانە نەکەن کە پاداشت و تۆڵەیان لەسەرە، بەکورتی ئەوەی خوا ئاگادارە پێی ئەبێ ڕووبدات و بەدی بێت، ئینجا پاداشت و تۆڵەی ئەبێ، کەواتە مەبەست لە تاقیکردنەوەکە ئەوە نییە بۆ خوا دەرکەوێ، بەڵکو مەبەست ڕوون بوونەوەو دەرکەوتنە بۆ خەڵکی، ئەو تاقیکردنەوە شتێکی زۆر بەجێیەو پێویستە، چونکە لە بارێکەوە لوتف و میهرەبانییە کە لەگەڵ بەندەکاندا و لە بارێکی ترەوە دادپەروەرییەو لە ڕویەکیشەوە تەمێ و پەروەردە کردنە بۆ بەندەکان کە بەو جۆرە بجوڵێنەوە لە نێوان خۆیانداو لە خۆیانەوە نەنیشنە مل و تا کابرا کردەوە نەکات و کردەوەکەشی دەرنەبڕێو دەرنەکەوێ بە هیچ ڕەنگ ملی نەگیرێ، لە جێیە خوا تەنیا بە گوێرەی زانینی خۆی ڕەفتار نەکات و تۆڵە لە کەس نەسێنێ کابرا تا کردەوە نەکات ئەبێ خەڵکی چۆن لا بدەن لەو باوی خواو ئەو ڕێگا ڕاستە نەدەنە بەر؟ ئینجا ماتۆڵ خوا زانایەو ئاگادارە بە بێ تاقیکردنەوەش دەی ئەبێ مەبەست چی بێت لەو زانینەی کە دوای تاقیکردنەوەو بە هۆی تاقیکردنەوەوە پەیدا ئەبێ بۆ خواو لە پێشەوە نەبووە وەکو دیمەن و ڕواڵەتی چەند ئایەتێ ئەگەیەنێ لە چەند شوێندا،

یەکێ لەوانە ئەمەیە لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾ کەواتە سوێند بە خوا بەهۆی تاقیکردنەوەوە خوا ئەزانێ و ئاگادار ئەبێ بەو کەسانەی کە ڕاستیان کرد لە باوەڕو دەربڕینی باوەڕەکەیان، زانا و ئاگادار ئەبێ بە درۆزنەکان. کە بە درۆو دەلەسە وتیان: باوەڕمان هێناو باوەڕمان هەیە، زانایانی ئیسلام بە چەند جۆرێ وەڵامی ئەم پرسیارەیان داوەتەوە لەو جۆرانە لێرەدا باسی دوانیان ئەکەین کە بەسن بۆ هەرکەسێ بە دوای ڕاستیدا بگەڕێ و نەیەوێ لە خۆڕایی درێژە بدات بە قسەو باس، ئەو دوو جۆرە وەڵامەش ئەمەیە:

١- مەبەست بەو زانینە کە پەیدا ئەبێت بە هۆی تاقیکردنەوەوە زانینی ئەو زانراوەیە بە ڕووداوی و بە بەدی هاتویی کە لە پێشەوە نەبووە.

٢- مەبەست دەرخستنی ئەو شتەو بەدیهێنانیەتی لە واقیعی ژیاندا.

ئینجا با بگەڕێینەوە بۆ ڕوون کردنەوەی تاقیکردنەوەی خواو باسی چەند جۆرو شێوەیەکی. عەقیدەو باوەڕ سپاردەیەکی خوایە لەم زەوی جیهانەدا، کەسێ هەڵگریەتی کە شایان بێت بۆی، توانا بێت بەسەر هەڵگرتنیدا، دڵی خۆی بە ڕاستی و پاك و خاوێنی یەکبار کردبێتەوەو دایڕنیبێ لە هەموو شتێ تر لە پێناوی ئەو عەقیدەو باوەڕەدا، کەسێ هەڵگریەتی کە لە پێناویدا دەست هەڵگرێ لە ئارامیو ڕەحەتی و ڕابواردن، لە ئاسایش و ئاشتی و بێ ترسی، هەڵنەخەڵەتێ بە هیچ شتێ کە لەم جیهانەدا هۆی هەڵخەڵەتاندنە، ئەو سپاردەیە سپاردەی جێنشینییە لە زەویدا، پێشەوایی و ڕابەرییە بۆ ڕێگای خوا، بەدیهێنان و پێکهێنانی ووشەو بڕیاری خوایە لە جیهان و ژیاندا، کەواتە سپاردەیەکی ئێجگار گرنگ و بە نرخە، ئێجگار قورس و گرانە، جا لەبەرئەوە پێویستی هەیە بە جۆرە هەڵگرێکی تایبەتی کە خۆگرو بەئارام و دامەزراو بێت لە تاقیکردنەوەدا، هەندێ لەو تاقیکردنەوە بەمە ئەبێ کە دووچاری سزاو ئازار ببێ لە لایەن بەتاڵ و ناهەق و هەڵگرەکانییەوە، ئینجا هیچ یارمەتیدەرو پشتیوانێك نەبێ کۆمەکی بکات و بەرگری لێ بکات، خۆیشی بە خۆی توانا

نەبێت بەسەر خۆ ڕزگارکردن و بەرگری لە خۆی و هەروا بە داماوی بکەوێ لە ژێر دەست دوژمنداو هێزێکی دەست نەکەوێ بەرەنگاری ستەم و سەرکێشی پێبکات، یەکەم شێوەی ئاشکرا بۆ تاقیکردنەوەی خاوەن عقیدەو باوەڕ ئەمەیە کە باس کرا. کاتێك کە باسی تاقیکردنەوەی بڕوادار کرا. بەڵام وە نەبێ ئەمە بەتێن ترو سەخت ترینی شێوەکانی بێت، بەڵکو چەند جۆری تر هەیە، لە چەند شێوەی تردا کە لەوانەن ئەوانە سەخت ترو تاڵ ترن، یەکێ لەوانە ماڵ و خێزان و کەس و کارو دۆست و خۆشەویستانە کە لە ڕێگای باوەڕو عەقیدەکەی ئەمدا دووچاری سزاو زیان بێن و ئەمیش هیچ دەسەڵاتی نییە ناتوانێ بەرگرییان لێ بکات، زۆر جار لەوانە بێزاری و تاڵی دەرئەبڕن و هاواری لێ ئەکەن کە واز بێنێ‌و ئاشتی بەکاربێنێ لەگەڵ ستمکارەکاندا، لێی ئەلاڵێنەوەو خوای تێر نەحاجەت کە وازبێنێ و ڕزگاریان بکات و ڕەحم و بەزەییەکی بێتەوە پێیاندا و ئەوانەش بە هۆی ئەمەوە دووچار بوون، جا وەرە کابرای خاوەن عەقیدەو باوەڕ خۆت پێ بگیرێ و گوێ نەدەیت بەو شتە سەختە گرنگە. یەکێ تر لەو شێوە سەختانە ئەمەیە کە ستەمکارو گومڕاکەر وا لە ئەوپەڕی بەخت و چارەی گرنگداو لە هەموو بارو ڕوویەکی ئەم جیهانەوە تێرو تەواوەو خەڵکی زۆر بەسەرکەوتوویی سەیر ئەکەن و بە جارێ هەموو ڕووی تێئەکەن و گۆرانی بە باڵادا ئەڵێن و چەپڵەی بۆ لێ ئەدەن، هیچ قۆرت و گرێیەك نایەتە ڕێگاو بەرپێی و ڕائەبوێرێ بە ژیانێکی بەرزو بەرێزو کامەرانییەوە، باوەڕداریش بۆ خۆی کەوتووەو نە کەس گوێی پێئەدات و نە کەس ئەیناسێ و هیچ کەس نییە بە شتی سەیر بکات مەگەر ژمارەیەك داماو و بێ نرخ و پەك کەوتووی وێنەی خۆی کە هیچیان بە دەست نییەو ناتوانن داماوییەکەی دەرکەن، جا وەرە بەو شێوە سەختە بژی و بەو جۆرە تاقیبکرێتەوە بەڕاستی مەگەر خوا یارمەتی بدات ئەگینا بەرگەی ناگرێ و لە ڕێگا ئەترازێ، جۆرێکی تر لەو تاقیکردنەوانە ئەمەیە کە ئیماندار ئەکەوێتە ناو گەل و کۆمەڵێك کە هەمووی لەسەر دژو پێچەوانەی باوەڕی ئەمن ئەو کاتە وەکو غەریبێکی نەناسراوی لێ دێت کە بکەوێتە ناو گەل و کۆمەڵێکی دڵ ڕەقی بێبەزەیی کە داخ لە دڵ و بێزارن لێی، جا وەرە بتوانە بژی و خۆڕاگر و دامەزراوبەو گوێت نەبێ لەو هەموو خەڵکە دان بگرە بە خۆتدا و دەست بگرە بەسەر باوەڕەکەی خۆتدا!! شێوەیەکی تری بەتێن لەو تاقیکردنەوانە ئەمەیە کە لەم چەرخەدا ئەبینرێ و ئەو هەموو میللەت و میریە بێ

باوەڕانە کە خنکاون لە ناو بەد خویی و بەد کرداریی و بێناموسیدا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پیسە بۆگەنانە لەم جیهانەدا بەرزو پێشکەوتوو و سەرکەوتوون و ئەژین بەو پەڕی ڕابواردن لە پۆپەی هەرە بەرزی شارستانی دان بە دیمەن و ڕواڵەت هەموو یەکێ بە پێی ڕادەو پلەی خۆی چارەسەری هەموو قۆرت و گرێیەکی ژیان کراوەو پێویستییەکی نەماوە!!

تاقیکردنەوەی گرانتر لەمانە هەموو بریتییە لە حەزو ئارەزووی نەفس و ئەم هەموو خۆشی و ڕابواردنە لەم جیهانەدا و ئارەزووی ڕابواردن و دەسەڵات و سەرۆکایەتی، یان سەرکردنە عەیش و نۆشێك کە بە هەوەس دەست بدات، ئینجا دامەزراوی و نەگۆڕان لەسەر ڕێگای ڕاستی عەقیدەو باوەڕ لەگەڵ ئەو هەموو شتە هەڵخەڵەتێنەرەدا، شوێن نەکەوتنی باوی گەل و وڵات و کەس و کار.

ئینجا کاتێ سزاو مەینەت و ژێر دەستەیی و سەر شۆڕیی ئیماندار درێژە بکێشێ و یارمەتی خوا دوا بکەوێ و بە هاوارەوە هاتن دیارنەبێ، لەم کاتەدا بە تایبەتی تاقیکردنەوە کە زۆر بەتین ترەو خۆگرتن لە ژێر باریدا زۆر گرانترە بە ڕاستی لەو کاتەدا کەس خۆی پێ ناگیرێ بێجگە لەوانەی خوا ئەیانپارێزێ، ئەوانەی لەو کاتە سەختەدا خۆگرو دامەزراون تەنیا ئەوانن کە بە ڕاستی ئیمانی ڕاستەقینەیان بەدی هێناوەو، بە ڕاستی سپاردە گەورەکەی خوایان پاراستووەو هەڵساون بە ئەرك و مافی.

خوای خاوەن بەزەیی پێویستی نییە بە سزادانی ئیمانداران بۆ تاقیکردنەوەیان، بەڵکو مەبەست پاڵفتەکردن و ئامادەکردنی ئەوانە بۆ هەڵگرتنی ئەو سپاردە گەورەیە کە بێ ئەو پاڵفتە کردن و ئامادەکردنە بەجێ نایەت، بەجێ نایەت بە بێ بەرزبوونەوەو زاڵ بوون بەسەر هەموو حەزو ئارەزوویەکداو بە بێ خۆگری و دامەزراوی لەسەر هەموو ئێش و ئازارێ، بەبێ دڵنیایی و دڵ دامەزراوی لەسەر هەموو ئێش و ئازارێ، بەبێ دڵنیایی و دڵ دامەزراوی لەسەر یارمەتی خوا یان پاداشتی خوا لە ڕۆژی دواییدا، سزاو مەینەت و بەسەرهاتی ناخۆش دڵ و دەروون پاڵفتە ئەکات و چڵك و چەپەڵی لێ دوور ئەخاتەوە، هێزو وزەی ئەخاتە سۆزو پەرۆش و بێداری ئەکاتەوە. کەواتە ئەو کەسانەی لە تاقیکردنەوەدا دەرچن هەر ئەوانە بەکاردێن و پشتیان پێ ئەبەسترێ و ئەکرێن بە ئەمیندار و ئاڵای ئایینی خوایان ئەخرێتە دەست، ئەوانە ڕێزو نرخی ئەو سپاردەیە ئەزانن، چونکە لە خۆڕایی دەستیان نەکەوتووە،

بەڵکو بە نرخێکی زۆر گران دەستیان کەوتووە، سزاو ئێش و ئازاریان چەشتووە لە ڕێگایدا، هێزو خوێن و دەماری خۆیانیان بۆ بەخت کردووە، دەستیان هەڵگرتووە لە هەموو خۆشی و ڕابواردن و ئارامی و ئاسایش و ئارەزوویەکی دڵ و دەروون لە پێناویدا، کەواتە بە هەموو هێز پارێزگاری ئەکەن و لە خۆڕایی دەستی لێ هەڵناگرن و نایفرۆشن بە کەس. ئینجا لە پاش ئەمانە سەرکەوتن و زاڵ بوونی ئیمان و کۆمەڵی ئیمانداران لە دواڕۆژ کۆتایی کاردا ئەوە شتێکی مسۆگەرە، چونکە خوا بەڵێنی پێداوە، کەواتە ئەبێ بە دی بێت و هیچ ئیمانداریێ گومانی نییە تیایدا، ئەگەر درەنگ هاتوو دواکەوت ئەوا لەبەر بەرژەوەندی و لێزانی و کاردروستی خوایەو کاتی نەهاتووە، بێگومان ئەو دواکەوتنە چاکە بۆ ئیمان و خاوەن ئیمان و هەڵگرانی ئاڵای ئایین و ئیمان. ئەبێ بزانین کە خوا بە غیرەت ترە لە هەموو کەس بۆ ئەو ئایین و ئیمانەی کە سپاردەی کردووە، بە ڕاستی بەسە بۆ ئەو ئیماندارانە کە سزاو مەینەتیان درێژە ئەکێشێ بۆیان، کە ئەوانە کۆمەڵێکی هەڵبژێردراوی خوان، بۆ ئەمەی ئەمیندار بن بەسەر مافی خواوە، بەسە بۆیان کە خوا شایەتە لەسەر ڕاستی و دامەزراوی یان بە هۆی ئەوەوە هەڵی بژاردوون بۆ تاقیکردنەوە، لە حەدیسی سەحیحدا هەیە: ﴿أشد الناس بلاء الأنبياء، ثم الصالحون، ثم الأمثل فالأمثل، يبتلى الرجل حسب دينه، فإن كان في دينه صلابة زيد له في البلاء﴾[1] لە یەکەم ئایەتدا بێزاری دەربڕی و تەشەریدا لە خەڵکی کە گومان وا بەرن باوەڕداران تاقیناکرێنەوە، ئینجا لەوە واز ئەهێنێ و ئەگوێزێتەوە بۆ بێزاری دەربڕین و تەشەرێکی بەتین لە تاوانباران کە گومان وا بەرن لێپرسینەوەیان نابێ و تۆڵەی تاوانەکانیان ناچەژن،

[1] بەتین ترینی خەڵکی لە تاقیکردنەوەدا پێغەمبەرانە، لە پاش ئەوان پیاوچاکان و ساڵحان، ئینجا چاك لە دوای چاك، مەردوم تاقیدەکرێتەوە بە پێی ئایینی خۆی، ئەگەر ئایینەکەی بەهێز و بەتین بێ تاقیکردنەوەکەی بۆ بەهێزو بەتین ئەکرێ.

أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسۡبِقُونَاۚ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴿٤﴾ مَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ
فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَأٓتٖۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٥﴾ وَمَن جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفۡسِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ
ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسۡبِقُونَاۚ﴾ ئایا ئەو کەسانەی کردەوە خراپەکان ئەکەن کە پیسترینیان بەرگری ئاینی خوایەو سزادانی باوەڕداران و هەڵگرانی ئاڵای خوایە، ئایا ئەوانە گومانیان وایە کە لە ئێمە یاخی ئەبن و لە دەستمان دەرئەچن؟ واتە شتی وا نابێ و هەموو ئەوانە ئەگەڕێنەوە بۆ لامان، چونکە ئەو خوایەی کە باوی وایە باوەڕداران تاقیدەکاتەوە باویشی وایە کە ئەو تاوانبارانە بگەیەنێ بە تۆڵەو سزای خۆیان، کەواتە ئەوانەی ئەو گومانە ناڕەوا ئەبەن ﴿سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ﴾ ئەو بڕیارەیان بڕیارێکی زۆر خراپە، بەڵێ باوەڕێکی زۆر خراپە، چونکە دژو پێچەوانەی دادو لێزانی خوایە، هەموو ژیرییەك بە ناڕەوایی سەیر ئەکات، ئینجا باوەڕداران دڵنیاو ئارام ئەکات بەو پاداشت و بەهرەی کە ئومێدو چاوەڕوانی ئەکەن لای خوا ئەفەرموێ: ﴿مَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ﴾ هەر کەسێك بە ئومێدەوە چاوەڕوانی گەیشتنە بە ئەجرو پاداشتی خوا یان چاوەڕوانی گەیشتنە بە حوزوری خواو بینینی خوا ئەو کەسە دڵنیاو دڵ ئارام بێت کە ئەوەی چاوەڕوانە بۆی دەست کەوتی ئەبێت ﴿فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَأٓتٖۚ﴾ چونکە بێگومان ئەو کات و ماوەی خوا بەڵێنی پێ داوەو دیاری کراوە دێت، کەواتە با ئەو باوەڕدارانە دڵشاد و بە ئارام بن بە هەموو هێزو باوەڕیان بەتین بێت و بە سۆزو پەرۆشەوە بەتەمای هاتنی ئەو بەهرەو بەخششە بن، ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ تەنیا خوا بە ڕاستی بیسەرەو ئاگادارە، ئینجا ڕوونی ئەکاتەوە کە هەر ئەرکێ خستوویەتی سوودو بەرهەمی بۆ خۆی ئەگەڕێتەوەو خوا هیچ پێویستی پێی نییە، کەواتە هەرچاکەو هەوڵو

تێکۆشانێك ئەکات منەت لە خوا بزانێ‌و چاو لەبەری بۆ خوا پتەو تر بێت، نەك کەشخە بنێ لە خۆیی و وا دابنێ چاکەی لەگەڵ خوا کردووەو ئەم ئاسمانی بۆ خوا داگیرکردووە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَن جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفۡسِهِۦٓۚ﴾ هەرکەسێ تێکۆشانی کردووە لەم جیهانەدا و هەر هەوڵ و تێکۆشانێك ئەکات ئەوا هەوڵ‌و تێکۆشان بۆ خودی خۆی ئەکات، چونکە کاروبارو ژیانی خۆی پێ چاك ئەکات لە هەردوو جیهاندا، هەر ئەرك و تاقیکردنەوەیەك خوا دایناوەو نوسیویەتی لەسەر باوەڕداران ئەوا هەمووی بۆ ئەمەیە پاڵفتەیان بکات لە هەموو چڵك و چەپەڵی و خوو و کرداری ناڕەواو تێرو تەواویان بکات و بیانڕازێنێتەوە بە هەموو سیفەت و ڕەوشت و کرداری ڕەواو شیرین، ئەمە هەمووی بۆ خودی خۆیان بێجگە لەو هەموو پیت و فەڕەی ئەڕژێ بەسەر وولاتدا لە بەرهەمی ئەو کۆشش و تێکۆشانەی ئەکرێ لە ڕێگای خوادا لە پێناوی بەرزکردنەوەی ئالاَی خوادا، لە پێناوی سەرخستن و زاڵکردنی چاکەو خێرو بێر بەسەر خراپەو شەڕدا، کەواتە هەر کەس هەر کۆشش و تێکۆشانێکی کرد لەو ڕێگا ڕاستەدا با بە کەشخەوە سەرنجی خۆی نەداو منەت بنێ بەسەر خەڵکدا، بە شانازییەوە داوای پاداشت و کرێی تێکۆشانەکەی بکات لە خوا، با پاداشت دانەوەی خوا بە دواکەوتوو درەنگ ئاخێز نەزانێ‌و لای وا بێ ئەم هیچی نەهێشتووەتەوەو پێویستە ئەمەی ئەم ئەیەوێ بەپەلە بێت بە پیریەوە، چونکە ئەو تێکۆشەرە ئەگەر ڕاست دەکات هەرچی ئەکات بۆ خۆی ئەکات و خوا هیچ پێویستی نییە نە بە ئەم و نە بە تێکۆشانەکەی، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ چونکە دەوڵەمەندە لە هەموو ئەم عالەم و جیهان و پێویستی بە هیچ کەس و کردەوەی هیچ کەس نییە، بەڵکو خوا بە لوتف و بەزەیی دارە کۆمەکی ئەکات لە تێکۆشانی تێکۆشەرانداو سەریان ئەخات و ئەیانکات بە کاربەدەست و لە ڕۆژی دواییشدا پاداشتی گەورەیان ئەداتەوە،

وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَحۡسَنَ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعۡمَلُونَ
(٧) وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حُسۡنٗاۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَآۚ إِلَيَّ
مَرۡجِعُكُمۡ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ (٨)

**بەم جۆرە کە ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ﴾ ئەو کەسانەی کە لەم جیهانەدا باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیشیان بەجێهێناوە بێگومان گوناهو خراپەکانیان ئەسڕینەوە لێیان و دایان ئەشارینەوە بە هۆی ئەو باوەڕو کردەوە چاکانەیانەوە ﴿وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَحۡسَنَ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ پاداشتیان ئەدەینەوە لە ڕۆژی دواییدا بە چاکتر لەوەی کردوویانە، بەم ڕەنگە چەند چەندانە ئەکرێتەوە کە لای خوارووی دە قاتە و لای ژووری خوا ئەیزانێ، تا حەوت سەد، تا هەزارو چوار سەد قات و تا زیاتر بە گوێرەی پاکوخاوێنی نیازو کردەوەکە، بێگومان ئەم بەڵێنە گەورەیە بۆ ئەوانەیە کە لە تاقیکردنەوەدا دەرئەچن و بە گوێرەی ئیمان و باوەڕەکەیان ئەجوڵێنەوەو تێکەڵو پێکەڵی ناکەن، دەی نۆشی گیانتان بێت ئەم بەڵێن و موژدەیە و شادمان و دڵ ئارام بن پێی، ئینجا جۆرێ لە تاقیکردنەوە ئەخاتە پێش چاو لەوانەی لە سەرەتاوە دەستنیشانمان کرد. تاقیکردنەوە بە کەس و کارو خۆشەویستان، ئەفەرموێ: ﴿وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حُسۡنٗاۖ﴾ فەرمانمان داوە بە ئادەمی لە بارەی باوك و دایکییەوە بە فەرمانێکی چاك و شیرین، بەم ڕەنگە سەرپەرشتی و چاودێرییان بکەن و بە سۆزو بەزەیی بن دەربارەیان و خزمەتیان بکەن وهیچ جۆرە ئازارێکی ناڕەوایان نەبێ بۆیان، بێگومان باوك و دایك نزیکترین کەسن لە ئادەمییەوەو منەت و چاکەیان هەیە بەسەریەوە، سۆزو بەزەیی بەهێزیان هەیە، پێویست کراوە لەسەر ڕۆڵەکانیان خۆشەویستی و بچوکی و خزمەت کردن و ڕێزگرتنیان، بەختکردنی توانایان لە خزمەتکردن و چارەسەر**

کردن و هەموو قۆرت و گرێی ژیانی ئەو باوك و دایکە مافدارەیان، بەڵام مافی گوێڕایەڵیان نییە لە ژێرپێکردن و بەجێهێنانی مافی خوادا، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿وَإِن جَاهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا﴾[1] ئەگەر باوك و دایکت هەوڵ تێکۆشانیان لەگەڵ کردیت بۆ ئەمەی شتێك بکەیت بە هاوبەشی من کە هیچ جۆرە ئاگاو زانینێکت نییە بە خوایەتی ئەو شتە ئەوە بە گوێیان نەکەیت و گوێڕایەڵیان نەبیت. هەرگیز مافی خوا ژێر پێناکرێ و دەستی لێهەڵناگیرێ، پەیوەندی خوا ناپچڕێ لە پێناوی ماف و پەیوەندی هیچ کەسی تردا با ئەو کەسە باوك و دایکیش بێت کە لە هەموو کەسێکی کە مافدار ترن، کەواتە ئەگەر باوك و دایك بت پەرست بوون و کافر بوون مافی چاکە لەگەڵ کردن و سەرپەرشتییان هەیە بەسەر ڕۆڵەکانییەوە، نەك گوێڕایەڵی و شوێنکەوتن، ئەو چاکەش تەنیا بۆ ئەم ژیانی ئێستایە، وەکو لە سورەتی(لقمان)دا دێت، ﴿إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ﴾ تەنیا بۆ لای منە گەڕانەوەتان لە ڕۆژی دواییدا، چ ئەوانەتان باوەڕدارو خواپەرستە بە تاك و تەنیاو چ ئەوانەتان بێبڕوایەو هاوبەش بڕیار ئەدات و بت پەرستە. ئەوەتا چاکە ئەکات لەگەڵ دایك و باوکی، ئەوەی تاوانبارو خراپەکارە لەگەڵیان، کەواتە ئەبێ بەندەکان ئاگادارو وریا بن و خۆیان بپارێزن لە ڕەفتارکردن بە پێچەوانەی ڕەزامەندی خواو بترسن لەمەم کە ئەفەرموێ: ﴿فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئینجا لە ڕۆژی دواییدا هەواڵتان ئەدەمێ بە هەر کردەوەیەك کە کردووتانە لەم جیهانەدا، کەواتە بە پێی کردەوەتان تۆڵەو پاداشتتان لێ ئەسێنم و ئەدەمەوە، ئینجا جیاوازی ئەخاتە نێوان باوەڕداران کە سەرنج ئەدەین باوەڕداران هەموو یەکن و یەك کۆمەڵن، با هیچ پەیوەندی خوێن و تیرە و خزمایەتی و نەژاد نەبێ لە نێوانیاندا،

---

[1] باش وایە بڕیاری ڕستەی ﴿قلنا﴾بدرێ لەپێش وشەی ﴿إن﴾ تاعەتفەکە ڕێك و پێك تر بێ بۆ سەر ڕستەی ﴿ووصينا﴾ هێنانی ڕستەی ﴿ماليس لك به علم﴾بۆ ئەمەیەکەهەر شتێك زانا نەبویت بە ڕاست و ڕەوانی دروست نییە شوێنی کەوی لەبارەی باوەڕو عەقیدەوە، ئیتربازانا نەبیت بە ناڕاستی و بەتاڵیشی، چ جای ئەوە زانای بیت بە ناڕاستی و ناڕەوایی.

وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُدۡخِلَنَّهُمۡ فِي ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٩﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ جَعَلَ فِتۡنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ

---

ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُدۡخِلَنَّهُمۡ فِي ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ کەسانێ کە لەم جیهانەدا باوەڕیان هێنا بەوەی خوا پێویستی کردووە باوەڕ کردن پێ ی، لەگەڵ ئەو باوەڕەدا کردەوە چاکەکانیان بەجێهێنا ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا ئەیانخەینە ناو کۆمەڵێ چاکان و لە ڕیزی ئەواندا ئەیانژمێرن، پێکەوە هەموویان ئەخرێنە بەهەشت: وشەی سالحان لە قورئان و حەدیسدا زۆرتر مەبەست پێغەمبەرانەو ئەبرێ بەسەر ئەواندا، هەرچۆنێ ببێ سالحی و پیاو چاکی ڕادەو پلەیەکی بەرزە هەندێ لە پێغەمبەران داوایان کردووە لە خوا، خوا سەنای هەندێ لە پێغەمبەرانی پێ کردووە. ئیمامی ترمزی لە تەفسیری ئەم ئایەتی ﴿و وصینا﴾ دا ئەگێڕێتەوە کە هاتووەتە خوارەوە لە بارەی سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص و حمنەی دایکی، سەعد – خوا لێی ڕازی بێ – زۆر چاك بووە لەگەڵی، ئینجا کاتێ مسوڵمان بوو دایکی پێ ی ووت ئەم ئایینە چییە دات هێناوە؟ سوێند بە خوا ئاو و نان ناخۆم هەتا ئەگەڕێیتەوە لەمەی کەوتویتە سەری یان ئەبێ بمرم، ئەو کاتەش ئەوە ئەبێ بە لەکەیەك بەسەرتەوە تا دنیا دنیایە، ئەوترێ پێت: ئەی کەسێ کە دایکی خۆی کوشت، ئینجا شەو و ڕۆژێ لەسەر ئەوە مایەوە بەبێ خواردن و خواردنەوە لە پاشان سەعد – خوا لێی ڕازی بێ – هاتە لای و پێی ووت: ئەی دایکی خۆم ئەگەر سەد گیانت پێ بێو یەکە یەکە دەرچن من واز لە ئایینی خۆم ناهێنم، کەواتە ئەگەر دەتەوێ بخۆو ئەگەر ناتەوێ مەخۆ، ئینجا کاتێ نائومێد بوو لێی نان و ئاوی خوارد، ئینجا خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە فەرمانی دا بە چاکە لەگەڵ دایك و باوکدا و شوێن نەکەوتن و گوێڕایەڵی نەکردنیان لە کوفرو بت پەرستییاندا، هەروەها هەموو گوناه و تاوانێ تر، وەکو لە حەدیسی سەحیحدا هاتووە: ﴿لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق﴾ واتە هیچ گوێڕایەڵی نییە بۆ هیچ دروستکراوێك لە هەر کارێکدا کە گوناه بێت و خوا قەدەغەی کردبێت. ئا بەو جۆرە باوەڕ بەخوا سەرکەوت و زاڵ بوو لە تاقیکردنەوەی خزم و نزیکترین کەس لێی لە نەسەب و خزمایەتییدا، هەموو کات باوەڕدار لەوانەیە دووچاری

تاقیکردنەوەی وا بێت، هەر کات دووچار بوو ئەم بڕیاری خواو کردەوەی سەعدە با بکرێن بە ئالای ڕزگاری و دووچار نەبوونی خەشم و ناڕەزایی خوا، ئینجا وێنەیەك لە ئادەمی نەخشەی ئەکێشێ بە نەخشەیەکی تێرو تەواو لە کاتی تاقیکردنەوە بە سزاو ئازاردان لەسەر عەقیدەو باوەڕ. ڕوونی ئەکاتەوە کە لەو کاتەدا بێ ئارام و خۆ نەگرە، بەڵام لە کاتی خۆشی و بێترسیدا بە دەم هیچ نالێتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾ هەندێ کەس هەیە لە ئادەمی ئەڵێ باوەڕمان هێناوەو هەیە بە خوا، ئەم وشە پیرۆزە ئەڵێ و دەری ئەبڕێ لە کاتی ئارامی و خۆشیداو لای وایە هیچ ئەرکێکی نییە و هیچی تێ ناچێ و هەر ئەو ووتنە بەسە، ﴿فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ﴾ ئینجا کاتێ سزا بدرێ لەبەر خواو لە ڕێگای خوادا، بەم ڕەنگە کافرەکان سزای بدەن لەسەر ئەو باوەڕ هێنانە، کاتێ ئەوەی بەسەر بێت ﴿جَعَلَ فِتۡنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ﴾ سزای ئادەمی وەکو سزای خوا لێ ئەکات و ئەیباتە ڕیزی ئەو، واتە ئارامی لێئەبڕێ و خۆی بۆ ناگیرێ‌و باوەڕەکەی لەق ئەبێت و ئەکەوێتە لەرزەو لە دەروونی خۆیدا ئەڵێ: ئەمە ئەوپەڕی سزایە، کەواتە لەسەر چی خۆم بگرم، سزای خوا لەمە بەتین تر نییە، یان مەبەست ئەوەیە هەرچۆنێ مەترسی لە سزای خوا خەڵکی ئەگێڕێتەوە لە کوفرو باوەڕ لە دڵدا جێگیر ئەکات هەروەها سزای ئادەمی ئەو جۆرە کەسانە لە ئیمان و باوەڕ ئەگەڕێتەوە و تۆوی بێ باوەڕی لە دەروونیاندا ئەڕوێنێ، هەرکام مەبەست بێت ئەو جۆرە کەسانە بە هۆی ئەو سزاوە بە دڵ گوێڕایەڵ ئەبن بۆ کافرە سزادەرەکەیان و شوێنیان ئەکەون نەك بە وێنەی زۆر پێهێنراو کە بە دەمی ڕووت و ڕواڵەت گوێڕایەڵ ئەبێت کە ئەو ڕەوا دراوەو زیانی نییە کاتێ سزاکە لە توانا دەرچوو، پێویستە لەسەری خۆی بگرێ و دڵ ئارام بێت بەو باوەڕەی کە هەیەتی و دامەزراو بێت، بزانێ کە سزای خوا زۆر جیاوازە لە سزای خەڵکی و هیچ کەس توانای نییە بەسەر وێنەی سزای خوادا سزای خوا کە هات بەرگری کەری نییە، سزای ئادەمی بەرگری کەری هەیەو سزای ئادەمی پاداشتی هەیە لەلایەن خواوەو سزای خوا لە ڕۆژی دواییدا تۆڵەی سەختی لە شوێنە، هەر سزایەك پاشەڕۆژی سەری لە چاکییەوە دەرچێ مافی ئەوەی هەیە دڵ پێی خۆش بێ و بە سزای سەیر نەکات، ئەم جۆرە کەسانە هەڵوێستیان بەرامبەر سزا ئەوە بوو کە باس کراوە لە کاتی تەنگیدا بەو جۆرە بوون،

وَلَئِن جَآءَ نَصۡرٞ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمۡۚ أَوَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ ٱلۡعَٰلَمِينَ
﴿١٠﴾ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ ﴿١١﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ
ءَامَنُواْ ٱتَّبِعُواْ سَبِيلَنَا وَلۡنَحۡمِلۡ خَطَٰيَٰكُمۡ وَمَا هُم بِحَٰمِلِينَ مِنۡ خَطَٰيَٰهُم مِّن شَيۡءٍۖ إِنَّهُمۡ
لَكَٰذِبُونَ ﴿١٢﴾

---

بەڵام لە کاتی خۆشی و بێترسی و بێ ئازاریدا بەم شێوەن کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَئِن جَآءَ نَصۡرٞ مِّن رَّبِّكَ﴾ ئەگەر لەلایەن پەروەردگارتەوە یارمەتییەك بێت بۆ باوەڕداران ﴿لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمۡۚ﴾ بێگومان ئەوانە دەڵێن بە ڕاستی ئێمە لەگەڵ ئێوە بووین و شوێنتان کەوتووین لە ئایین و باوەڕدا، واتە بەشدارمان بکەن لەوەی کە بۆ ئێوە هەیە، ئەو بێ نرخانە لە کاتی خۆشی و سەرکەوتندا دێنە پێشەوەو خۆیان ئەکەن بە شێرو چالاکی دەرئەبڕن ﴿أَوَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ ئایا خوا بە ئەوپەڕی ڕادە ئاگادارو زانا نییە بە هەر ڕاستی و ناڕاستییەکدا کەوا لە دڵ و دەروونی هەموو کەسدا؟ بەڵێ بێگومان خوا لە هەموو کەس ئاگادارترە بە هەموو کەس، خوا زانا ترە لە هەموو خاوەن دڵەکان بەوەی وا لە دڵەکانیاندا، کەواتە ئەوانە ئەیانەوێ کێ بخەڵەتێنن؟ ﴿وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ﴾ سوێند بە خوا خوا زانایە بەوانەی باوەڕیان هێناوە بە ڕاستی و پاکی‌و زاناو ئاگادارە بەوانەی مونافیق و دووڕوون و دڵیان باوەڕی ڕاستی تیا نییە، ئەمانە هەردوو دەردەخات و ئاشکرایان ئەکات تا بناسرێن، ئەو تاقیکردنەوە بۆ ئەوەیە ئەو دوو کۆمەڵە ڕوون ببنەوەو جوێ ببنەوە، بێگومان پاداشتی پاکان ئەداتەوەو ناپاکان و دڵ نەخۆشەکانیش بە سزاو تۆڵەی خۆیان ئەگەن، ئینجا لە کۆتاییدا باسی تاقیکردنەوە ئەکات بە سەرلێتێکدان و گومڕاکردن و هاندان لەسەر کوفرو بێبڕوایی لەلایەن هەندێ کەسەوە کە بەوێنەی شەیتان ئەچنە بن کڵیشەی خەڵکی و بەرگرییان ئەکەن لەوەی ڕێگەی ڕاست بدەنە بەر، لەگەڵ ئەوەدا ناڕەوایی تێگەشتنی کافرەکان ڕوون ئەکاتەوە لە بارەی بەرهەم و تۆڵەی کردەوەدا، بیرو باوەڕو یاسایەکی

ئیسلامی لەو بارەیەوە ڕوون ئەکاتەوە کە ئەوپەڕی دادو ڕاستی پێیە، ئەو بیرو باوەڕەش بەناوبانگە بە(فردية التبعة) و(شخصية الجزاء) واتە هەموو کەسێ پرسیاری کردەوەی خۆی ئەکرێ و تۆڵەی هەموو کردەوەیە لە پێی خاوەنەکەیەتی و ناچێ بۆ یەکێکی تر، ئەو بیرواوایانە بە گوێرەی باو و یاسای تائیفەگەری خۆیان خوێن و کوشتنی کە ڕووی بدایە لە ناو تیرەکاندا ئەگیرایە گەردن لەلایەن تیرەی بکوژەوە یا یەکێکی گوساغی دەم ڕاست لە تیرەکەو ئەو خوێنە ئەدراو ئیتر واز ئەهێنرا لە بکوژو دەست درێژ نەئەکرا بۆ تۆڵە لێسەندنی جا وا دەرئەکەوێ گومانیان وا بوو کە ئەتوانن بچنە ژێر تاوانی کوفرو بت پەرستی لە ڕۆژی دواییداو هەر تۆڵەیەکی هەبێ بیگرنە ئەستۆی خۆیان ئەگەر ڕۆژی دوایی هاتنی ڕاست بێ، بێجگە لەو گومانە نارەوا مەبەستیان گاڵتەو لاقرتی کردن بوو بە هاتنی ئەو ڕۆژەو تۆڵەو حساب و پرسیاری ئەو ڕۆژە، ئەو کافرانە ئەیانویست بەم جۆرە باوەڕداران بخەڵەتێنن و هەڵیانگێڕنەوە لە ئایینەکەیان، ئینجا ئەوا قورئان ئەو کردەوە ناڕاست و نارەوای ئەوانمان بۆ باس ئەکات و بەرپەرچ و دەم کوتیشیان ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانەی کە کافر بوون وتیان بەوانەی باوەڕیان هێنابوو ﴿ٱتَّبِعُواْ سَبِيلَنَا﴾ شوێنی ڕێگاکەی ئێمە بکەون و ڕێبازی ئێمە بدەنە بەر لە ئاییندا ﴿وَلۡنَحۡمِلۡ خَطَٰيَٰكُمۡ﴾ با ئێمەش گوناە و تاوانتان هەڵگرین و بیگرینە گەردن و ئەستۆ، واتە ئەگەر ئێوە شوێنی ئێمە بکەون گوناە و تاوانتان ئەگرینە ئەستۆی خۆمان ئەگەر ئەو شوێنکەوتنە گوناە بوو، یان ئەگەر زیندوبوونەوەو تۆڵەسەندن ڕاست بوو، ئەوانە ئەوەیان وت و خوایش ئەفەرموێ: ﴿وَمَا هُم بِحَٰمِلِينَ مِنۡ خَطَٰيَٰهُم مِّن شَيۡءٍ﴾ ئەوانە نین بە هەڵگری هیچ شتێ لە گوناە و تاوانی ئەوان، واتە هیچ کەس گوناهی هیچ کەسێکی تر ناگرێتە ئەستۆ، بەڵکو هەموو کەسێ پرسیاری کردەوەی خۆی لێ ئەکرێ و گوناهی خۆی لە ئەستۆی خۆیەتی و تۆڵەی گوناهی خۆی کە سزا لە خۆی ئەسەنرێ: ﴿إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾ بەڕاستی ئەوانە بێگومان درۆزنن و درۆ ئەکەن لەو بەڵێنەی کە ئەیدەن و درۆ ئەکەن کە بڵێن بە توانان بەسەر بەجێهێنانی ئەو بەڵێنەدا، ئەوانە بەو هاندانە باری خۆیان گرانتر ئەکەن، بەبێ ئەوەی باری هیچ فریو دراو و هەڵخەڵەتێنراوێ سوک بکەن،

﴿وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالٗا مَّعَ أَثۡقَالِهِمۡۖ وَلَيُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَمَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ١٣﴾

وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ﴾ سوێند بە خوا ئەو فریودەرو هاندەرانە باری گرانی خۆیان هەڵئەگرن باری گرانی کوفرو گوناهێك کە خۆیان کردیان ﴿وَأَثۡقَالٗا مَّعَ أَثۡقَالِهِمۡۖ﴾ چەند باری گرانتر هەڵئەگرن، باری هاندانی و فریودان و گومڕاکردنی شوێنکەوتووەکانیان، ئابەم جۆرە قورئان ئەم قاپییەی داخست، خەڵکی تێگەیاند کە خوا یەکە بە یەکە حساب و پرسیاریان لەگەڵ ئەکات و هەموو کەسێ بەستراوە بە کردەوەی خۆیەوە ﴿وَلَيُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَمَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾ بێگومان پرسیاریان لێئەکرێ لە ڕۆژی دواییدا لەو درۆو دەلەسەی کە لەم جیهانەدا هەڵیان بەست و خەڵکیان پێ فریو داو گومڕا کرد، پرسیاریان لێدەکرێ بۆ تەشەر لێدان و دەم کوت کردن و سزادانی دەروونیان، لەم ئایەتانی ڕابردوودا چەند جۆرێ لە تاقیکردنەوەی باس فەرموو بە کوێچکەماندا، ئینجا چەند نمونەیەك لە تاقیکردنەوە ئەهێنێ و ئەیخاتە پێش چاو کە کەوتنە بەر ڕێگای بانگ و بانگەوازی ئیمان و باوەڕ لە مێژووی درێژی ئادەمیدا لە چەرخی نوح پێغەمبەرەوە – علیه السلام – ئەم نمونەیان پشان ئەدات لەو هەموو گرێ و سزاو بەسەرهاتە ناخۆشانەی کە پێغەمبەران دووچاری بوون هەر لە بەرەبەیانی ئادەمێتییەوە، باسەکە لەم سورەتەدا درێژەی پێئەدات لە سەرگوزشتەی ئیبراهیم – علیه السلام – بە کورتی تێپەڕ ئەکات لە سەرگوزشتەی ئەوانی تردا، لەم سەرگوزشتانەدا چەند جۆرێ لە سزاو پلەی سەخت و گرێیەك نیشان ئەدات وەکو وتمان لە ڕێگای ڕاگەیاندنی پەیامەکەی خوادا، لە سەرگوزشتەی نوحدا– علیه السلام – کۆشش و تێکۆشانی زۆرو فراوان نیشان ئەدات لەگەڵ ئەوەدا بەرهەم زۆر کەم بووە، ئەوەتا هەزار ساڵ پەنجا کەم مایەوە لە ناو گەلەکەیدا لە پێش لافاو و تۆفاندا هەوڵیداو دووچاری ئەشکەنجەو

ئازار بوو کەچی ژمارەیەکی کەم باوەڕی پێهێنا ئەڵێن دوانزە کەس بوون، لەسەرگوزشتەی ئیبراهیم لەگەڵ گەلەکەیدا هەڵوێستی زۆر خراپ و ئەوپەڕی سەرکێشیو یاخی بوونی ئەو گەلەی ئەخاتە بەرچاو، ئەوەتا لە پاش ئەو هەموو هەوڵە کە دایو ئەو هەموو بەڵگەو نیشانەی ڕێنمونی بۆ کردن کە بەری لێبڕینەوەو بە تەواوی دەم کوتی کردن، ئینجا کە ڕێگای تەك و جمی نەهێشتەوە لە باتی ئەوە هەر هیچ نەبێ مل داخەن و بێدەنگ بن، ئەو یاخیە مل هوڕانە فەرمانیان دا بە کوشتن یان بە سوتاندنی ئەو پێغەمبەرە دڵسۆزەیان. لە سەرگوزشتەی(لوط)دا- علیه السلام - دەرئەکەوێ کەشخەو شانازی ئەو گەلە بەکاری ناڕەواو بێناموسی بە جۆرێ بەبێ شەرم و سەرلێکردنەوە دەربڕین و جاڕپێدانی، تا ئەو ڕادەیە پەستییان بوو، ئەوپەڕی پلە لادانیان لە ڕێگای ئادەمێتی لەگەڵ ئەوەدا بەبێ شەرمانە لاقرتیان ئەکرد بەو ترسێنەرەیان و بەو سزاو ئازارەی کە ئەیترساندن پێی، ئەوەتا ئەیانووت ئەگەر تۆ ڕاست ئەکەیت دەی ئەو سزای خوامان بۆ بێنە؟؟ لە سەرگوزشتەی شوعەیب- علیه السلام - لەگەڵ دانیشتوانی مەدیەندا ڕەوشتی خراپ و یاخی بوون لە دادو ڕاستی و بە درۆخستنەوەی ئەو پێغەمبەرە لەلایەن ئەو گەلەوە ڕوون و ئاشکرا ئەبێ تا بوو بە هۆی لە ڕیشە هێنان و لەناوبردنیان. لە بارەی تائیفەی عاد و سەمودەوە دەستنیشان ئەکات بۆ لەخۆگۆڕانی ئەو دوو گەلە بە هۆی هێزو دەستەڵاتی کە خوا پێی دابوون، کەشخەو یاخی بوونیان بەو نازو نیعمەتەی کە بە فراوانی پێیان درابوو، هەروەها لە بارەی قارون و فیرعەون و هامانەوە دەستنیشان ئەکات بۆ یاخی بوون و لە سنور دەرچوون بە هۆی سامانی زۆرەوە، هەروەها بۆ ستەمکاریو ناڕەوایی حکومڕانی و خراپەکاری و دەستدرێژی لە وڵاتدا، ئینجا با بێینەوە بۆ لای قورئان بە شێوە نایابە بێ وێنەکەی خۆی ئەو بەسەرهاتانەمان بدا بە گوێچکەدا یەك لە دوای یەك،

وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمۡ أَلۡفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمۡسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمۡ
ظَٰلِمُونَ ﴿١٤﴾ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَأَصۡحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلۡنَٰهَآ ءَايَةً لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٥﴾ وَإِبۡرَٰهِيمَ إِذۡ قَالَ
لِقَوۡمِهِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُۖ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿١٦﴾ إِنَّمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ
ٱللَّهِ أَوۡثَٰنٗا وَتَخۡلُقُونَ إِفۡكًاۚ

---

ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ﴾ سوێند بەخوا نوحمان ناردو ڕەوانە کرد بە پێغەمبەری بۆ لای گەلەکەی ﴿فَلَبِثَ فِيهِمۡ أَلۡفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمۡسِينَ عَامًا﴾ ئینجا ئەویش مایەوە لەناویاندا هەزار ساڵ مەگەر پەنجا ساڵ کەم واتە نۆسەدو پەنجا ساڵی تەواو مایەوە لەناو ئەو گەلەدا بانگی کردن بۆ لای خواو هەوڵی لەگەڵ دان بەشەو و بەڕۆژ بە ئاشکراو بەنهێنی، کەچی تا ئەهات یاخی ئەبوون و لەو ئاینە ڕاستە ڕایان ئەکرد و دوور ئەکەوتنەوە و پشتیان تێئەکرد، ژمارەیەکی کەم نەبێ باوەڕی پێ نەهێنا ﴿فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمۡ ظَٰلِمُونَ﴾ ئینجا کە کاتی سزایان هات خوا قاری لێگرتن و لەناوی بردن، بەم ڕەنگە لافاو و تۆفان دای بەسەریاندا لەکاتێکدا بەردەوام بوون لەسەر کوفر و بێبڕوایی، کەواتە وەکو خنکێنراون چوون بۆ ناو ئاگرو سەریان لەئاگرەوە دەرچوو، وەکو لە سورەتی(نوح) دا ﴿أُغۡرِقُواْ فَأُدۡخِلُواْ نَارٗا﴾[1] خوا پەنامان بدات لە خەشم و سزای خۆی ﴿فَأَنجَيۡنَٰهُ وَأَصۡحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ﴾ ئینجا نوح و ئەوانەی لەگەڵ نوح بوون چوونە کەشتیەکە ڕزگارمان کردن ﴿وَجَعَلۡنَٰهَآ ءَايَةً لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ ئەو کەشتیەیان ئەو بەسەرهاتەمان گێڕا بە پەندو تەمێ خواریەو نیشانەیەکی ڕوون بۆ هەموو عالەم و جیهان، ئەوەتا بەناوبانگە لە هەموو جیهاندا بە دەماودەم ئەگێڕێتەوەو سەرچاوەی ڕاستی کە قورئانە دای بە گوێچکەی هەمواندا، چەند ڕایەك هەیە لەبارەی تەمەنی نوح پێغەمبەرەوە

---

[1] خنکێنران و ئینجا خرانە ناو ئاگرێکی گەورە.

– عليه السلام – بەهێزترینیان ئەمەیە: کە ئەم نۆسەد ساڵە ماوەی پێغەمبەرێتیەکەیەتی لەناو گەلەکەیدا پێش تۆفان و خنکانیان، پێش پێغەمبەرێتی ماوەیەکی تر ژیاوە، هەروەها لەپاش تۆفان و نیشتنەوەی و هاتنە سەر زەوی ماوەیەکی تریش ژیاوە بەلام ئەم دوو ماوەیە لە قورئاندا دیاری نەکراون، چەند ڕیوایەتێکی تر هەیە لە دیاری کردنیاندا دژو پێچەوانەی یەکترن، ڕادەی هیچ کام ناسراو و زانراو نییە تا پشت ببەسرێ بەوەیان کە ڕاسترو بەهێز ترە، کەواتە ئێمەیش لێی بێدەنگ بین و تەنها شوێنی قورئانەکە بکەوین، بەهەر حاڵ ئەو تەمەنە زۆر دوورو درێژەو پێچەوانەی باوەو بەدژی سروشت و سەرنج ئەدرێ، زۆرکەس لەوانەی کە بێ باوەڕن سەریان سوڕ ئەمێنێ لەشتی واو لایان وایە ناگونجێو تەمەنی وا درێژ دەست نادات، بەلام ئێمە ئەم هەواڵە وەرئەگرین لە ڕاست ترین سەرچاوەوە، تەنیا ئەوە بەسەو ڕابەری تێرو تەواوە لەسەر ڕاستی هەواڵەکە، ئەم هەواڵە وەرئەگرین لە کەسێ کە ئەم بونەوەرە خواهیش و توانای بێ سنوری ئەوە، کەواتە بێگومان و دوودڵی و سەر لێکردنەوە لە قولایی دڵمانەوە وەری ئەگرین دڵنیاین بە ڕاستیەکەی، ئەگەر بمانەوێ ئەندازەێ تێبگەین لە هۆی ئەو تەمەنە درێژە ئەتوانین بڵێین: لەو کاتەدا ژمارەی ئادەمی کەم بووە، کەواتە دوور نییە کە خوا قەرەبووی ئەو کەمییەی کردبێتەوە بەو تەمەنە درێژە، بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی و درێژەکێشانی ژیان، ئینجا لەپاشان ئادەمی پەرەی سەندو زۆر بوون و ولات ئاوەدان بوویەوە ئیتر پێویست نەما بە تەمەنی درێژو ئەمە شتێکی تێبینی کراوە لە تەمەنی زۆر لە گیانلەبەراندا، ئەوەتا هەر گیانلەبەرێك ژمارەو بێچوی کەم بێت ماوەی ژیانی زۆرو تەمەنی درێژە، وەکو داڵو قەلەڕەشی گەورەو کیسەڵو هەروەها تەمەنی هەندێکیان چەند ساڵ درێژە ئەکێشێ، لە کاتێکدا مێش کە ملیۆنەها بێچوی هەیەو ئەبێ لە دوو حەفتە زیاتر ناژی، وەکو شاعیریش ئەڵێ:

بغات الطير اكثرها فراخا أم الصقر مقلات نزور[1]

خوای گەورە لە هەموو شتێکدا ئەوپەڕی کاردروستی و بەرژەوەندی بەکارهێناوە، هەموو شتێ ڕادەو کات و ئەندازەی خۆی هەیە: لەبارەی هەڵبژاردنی: ﴿الف سنة إلا خمسين عاما﴾ بەسەر ﴿تسعماة و خمسين عاما﴾ زانایان چەند شتێکیان فەرمووە:

١- ژمارەکەی قورئان دەست نادات بۆ زیاد و کەم، چونکە ئەو ڕستەیە حەسرو کورت هەڵهێنان ئەگەیەنێ، بەڵام ئەمی تر ژمارەی ڕووتەو ژمارەی ڕووتیش بەکارئەهێنرێ لە زیادو کەمدا.

٢- وشەی هەزار زیاتر درێژەی ماوەکە ئەخاتە دەروون کە ئەوەش زۆر پێویستەو سامی زیاتر لێ ئەکرێ لەم شوێنەدا، چونکە مەبەست دڵنەوایی و دڵخۆشی دانەوەی پێغەمبەرە(ﷺ) کە ئارامی خۆگری ببێ، ئەوەتا نوح ئەو ماوە زۆر درێژە خۆی گرت.

٣- قورئانەکە پێویستی نییە بە دووبارە کردنەوەی وشەی(عام) بەڵام ئەمی تر پێویستی هەیە بە بڕیاردانی، چونکە ﴿تسعماة﴾ بەتەنیا ئەیەوێ و ﴿خمسين﴾ ەش ئەیەوێ، بێگومان بەبێ هۆیەك دووبارە کردنەوە و تیکرار جوان نییە.

لەپاش کورتەیەك لەسەر گوزەشتەی نوح – عليه السلام – ئیتر باسی هیچ کەس و هیچ چەرخ و تاقمێ تر ناکات و هەمووی ئەپێچێتەوە تا ئەگاتە پەیام و فروستادەی گەورە. پەیام و فروستادەیی ئیبراهیم – عليه السلام –، ئەفەرموێ: ﴿وَإِبْرَٰهِيمَ﴾[2] ئەی پێغەمبەر باسی ئیبراهیم بکە بۆ گەل و ئومەتەکەت، ئەو ئیبراهیمەی کە بانگی گەلەکەی خۆی کرد بە بانگ

---

[1] واتە باڵدارو پەلەوەرە لاوازەکان لە هەموویان بێچوویان زۆرترە، بەڵام(صقر) کە باڵدارێکی بەهێزو گەورەیە بێچوی زۆر کەم و کورە.

[2] بە پێی تەفسیر(إبراهيم) مەفعولە بۆ(اذكر) ی بڕیار دراو، هەڵئەگرێ عەتف بێت بۆ سەر(نوح) واتە ئیبراهیممان ڕەوانە کرد کاتێ لە تەمەن و زانیندا گەیشتە ڕادەیەك کە شایان بێت بۆ ئەمێ و مۆچیاری گەلەکەی و ڕێموونییان بکات بۆ ئایینی ڕاست و فەرمان پێدانیان بە خواپەرستی و خۆپارێزەری لە هۆی سزای خوا.

کردنی ئاسان و ڕوون و ڕەوان و بێ قۆرت و گرێ، لە بانگ کردنەکەیدا چەند شتێکی خستە پێش چاو بەڕێز و زۆر بە وردی پێویستە لێی ورد بوونەوەی بۆ هەر کەس بیەوێ بانگی خەڵکی بکات بۆ لای خوا﴿إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە ئیبراهیم وتی بە گەلەکەی ئەم چەند شتە:

١- بە ڕوونی باسی ئەوەی بۆ کردن کە بانگیان ئەکات بۆی ﴿اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ﴾ خوا بپەرستن و لێی بترسن و خۆتان بپارێزن لە هۆی خەشم و سزای و خۆتان بپارێزن لەو شتانەی قەدەغەی کردوون.

٢- ئەو شتە ڕاستەی لە پێش چاو خۆشەویست و شیرین کردن فەرموی: ﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەوە چاکترە بۆ ئێوە لە هەموو شتێك، لەوەی وان لەسەری ولاتان وایە چاکە، ئەگەر ئێوە چاك و خراپ ئەزانن و جوێ یان ئەکەنەوە لە یەکتر، یان ئەگەر ئێوە شت ئەزانن و سیفەتی زانینتان هەیە، ئینجا هەنگاوی سێیەم ئەنێ لە چەند بارو ڕوویەکەوە نارەوایی و نەشیاوی ئەو ئایینە باس ئەکات کە ئەوان وان لەسەری:

أ- ئەوانە هەیکەل و وێنەیەك ئەپەرستن کە لەدار تاشیویانە، بێگومان بە پەرستنی شت وایش ئەوپەڕی نەفامییە، بەتایبەتی کە لەباتی پەرستنی خوایەو ئەیخەنە جێگای پەرستنی ئەو، فەرموی: ﴿إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ أَوْثَانًا﴾ واتە ئێوە کە تێپەڕ ئەکەن لە خواو لە پەرستنی خوا هیچ شتێك ناپەرستن مەگەر چەند وێنەیەك کە تاشراون.

ب- ئەوانە هیچ بەڵگەو ڕابەرێکیان بە دەستەوە نییە لەو پەرستنەدا، بەڵکو شتێکی درۆی دەست هەڵبەستی خۆیانەو لە خۆیانەوە دایان هێناوە بەبێ بنەڕەت و پاڵ پشتێك، فەرموی: ﴿وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا﴾ ئێوە بە پەرستنی ئەمانە هیچتان نەکردووە مەگەر درۆو دەسەلەیەك کە خۆتان دەست هەڵبەستتان کردووە، درۆیەکی پەتییە ئەیکەن کە ئەوانە ناو ئەبەن بە پەرستراو و لاتان وایە تکاتان بۆ ئەکەن لای خوا.

إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ لَكُمۡ رِزۡقٗا فَٱبۡتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزۡقَ وَٱعۡبُدُوهُ وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥٓۖ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن تُكَذِّبُواْ فَقَدۡ كَذَّبَ أُمَمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡۖ

ج- ئەو بتانە هیچ سودێك ناگەیەنن و ناتوانن هیچ ڕۆزییەكتان بدەن، فەرموی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ لَكُمۡ رِزۡقٗا﴾ بێگومان ئەوانەی كە ئێوە ئەیانپەرستن جگە لە خواو لە خوا تێپەڕ ئەكەن بۆ پەرستنیان، ئەوانە ناتوانن و خاوەنی هیچ جۆرە ڕۆزییەك نین بۆ ئێوە.

ئینجا هەنگاوی چوارەمی ناو ڕوی وەرگێڕان بۆ لای خوا كە داوای ڕۆزی لەو بكەن. كە ئەو ڕۆزییەش مەبەستی ئەوانەو دڵیان بەستراوە پێیەوەو پێویستیان هەیە پێی، فەرمووی: ﴿فَٱبۡتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزۡقَ﴾ كەواتە داوای ڕۆزی بكەن لە خوا، واتە خوا خاوەنی شتێكە، كەواتە داوای ڕۆزی لەو بكەن، ئەو ڕۆزییەی كە دڵ و دەروون بەستراوە پێیەوەو هەمیشە خەریكەو چاوی تێبڕیوە، بە تایبەتی ئەو دڵ و دەروونەی كە ئیمان و باوەڕ داگیری نەكردبێ، ئینجا بانگی كردن بۆ پەرستن و سوپاسی پەروەردگارو بەخشندەی ڕۆزیدەرو فەرموی ﴿وَٱعۡبُدُوهُ وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥٓۖ﴾ ئەو بپەرستن و گوێڕایەڵی ئەو بن، سوپاسی بكەن و سوپاسی چاكەو بەهرەكانی بكەن كە ڕشتویەتی بە سەرتاندا بە هۆی ئەوەوە بۆتان زیاد بكات بە پێی بەڵێنی خۆی. ئینجا ڕوونی ئەكاتەوە كە دەرچوون نییە لە دەستی ئەو خوایەو ڕاكردن نییە لێی، كەواتە چاك هەر ئەوەیە كە فریای خۆیان كەون بگەڕێنەوە بۆ لای بە باوەڕو پەرستن و سوپاسەوە، فەرموی: ﴿إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ تەنیا بۆ لای ئەو ئەگێڕرێنەوە، لە پاش ڕوونكردنەوەی ڕێگای ڕاستی ڕزگاركەر بۆ گەلەكەی، لە پاش ئەو شێوە شیرینەی بەكاری هێنا لەگەڵیان وەكو چوو بە گوێچكەماندا، لە پاش ئەوانە هەموو پێی فەرموون: ﴿وَإِن تُكَذِّبُواْ فَقَدۡ كَذَّبَ أُمَمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡۖ﴾ ئەگەر باوەڕ ئەهێنن و بڕوام پێ ئەكەن لەم هەواڵانەی پێم دان ئەوە ڕزگار ئەبن و ئەگەن بە خۆشبەختی هەردوو جیهان، ئەگەر باوەڕ ناهێنن و بڕوام پێناكەن ئەو بڕوا پێنەكردنە هیچ زیانێ ناگەیەنێ بە خواو پێغەمبەرەكەی، خۆتان ڕەنجەڕۆ و زیان دار ئەبن لە هەردوو جیهاندا، چونكە چەند گەل و ئوممەتێكی تر پێش ئێوە باوەڕیان نەهێنا و بڕوایان نەكرد بە پێغەمبەرەكانیان بەهۆی ئەوەوە دووچاری خەشم و سزای خوا بوون،

وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٨﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ كَيْفَ يُبْدِئُ ٱللَّهُ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿١٩﴾ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ ۚ

﴿وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ﴾[1] پێغەمبەر لە بارەی پێغەمبەرێتییەکەیەوە هیچی لەسەر نییە، جگە لە ڕاگەیاندنێکی ڕوونی ئاشکرا کە ڕوونکەرەوە بێت بۆ ئەوەی ڕای ئەگەیەنێ، ئا بەو جۆرە هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵیان ڕۆیشتو چووە ناو دەروونیان لە قاپی تایبەتی خۆیەوەو بە ووردی دای لە قاپی دڵیان، ئەم ڕەوشتەی ئەم بەکاری هێنا بە نمونەو سەرمەشق ئەژمێرێ بۆ ڕێگای بانگکردنی مردوو، بۆ لای خوا، شایانە بۆ هەموو شوێنکەوتووەکانی پێغەمبەران - سەلامی خوایان لێ بێ - کە ئەم جۆرە ڕەوشتە لە بانگ کردن و لێکۆڵینەوەی دڵ و دەروونەکاندا، ئینجا پێش ئەمەی بگاتە دوایی سەرگوزەشتەکە، وەستانێ ئەکات و واز ئەهێنێ لە سەرگوزشتەکەو سەرنجی هەموو بێباوەڕێ ڕائەکێشێ، بێ باوەڕ بە خوا و بێ باوەڕ بە ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوەو گەڕانەوە بۆ لای خوا ئەم پێنج ئایەتە ئاڕاستە ئەکرێ ئەدرێ بە گوێچکەی هەموو بێبڕوایەکدا بە شێوەیەکی گشتی، ڕابەرو نیشانەکەی ئەم بوونەوەرەیە، شوێن و جێگای بیرلێکردنەوەکەی ئاسمان و زەوییە، ئەوەش بە گوێرەی باوی قورئان کە ئەم بوونەوەرە هەمووی ئەکات بە پێشانگا بۆ نیشانەو بەڵگە ڕوونەکانی ئیمان و باوەڕو ڕابەرە بەهێزە دڵنیاکەرەکانی وە ئەیکات بە کتێبێکی کراوە بە هەمیشەیی بۆ هەست و دەروون، کە وورد ئەبێتەوە تیایداو بگەڕێ بە دوای ئەو هەموو نیشانەو ڕابەرە ڕوونانەدا کە ڕابەرێکی زۆر بەهێزن لەسەر بوونی خواو تاک و تەنیایی، لەسەر ڕاستی بەڵێن و هەڕەشەکانی ئەم پێشانگا گرنگە هەرچەند هەمیشە ئامادەیە و لە چاو کلا نابێت، بەڵام بەهۆی زۆر دیتن و دەق پێوەگرتنەوە لە پێش چاو کۆن ئەبێ و نایابییەکەی لەبیر ئەچێت، کارکردنی لە دڵ بێ هێزو لاواز ئەبێت، جا بە هۆی ئەوەوە هەموو جارێ قورئان چاوو دڵ و دەروون وەرئەگێڕێتەوە بۆ جوانی و شیرینی ئەم دروستکراوانە، بۆ نایابی و هێزی ئەو هەموو ڕابەرو نیشانانە، وەریانئەگێڕێتەوە بۆ ڕێگاو شێوە بێ وێنەی خۆیە کە خەڵکی بێدار دەکاتەوە لە خەوی بێهۆشیو بێئاگایی، دایان ئەچڵەکێنێ و

---

[1] بە پێی تەفسیرەکە لە ئایەتی(١٩) تا سەری(٢٤) وتراوی ئیبراهیم پێغەمبەر نییە، بەڵکو لە تێهەڵکێشانی قورئانەکە لە زۆر شوێندا باوی وایە ئەو جۆرە تێهەڵکێشانە نەخاتە نێوان، ڕایەکی تر هەیە کە ئەم(٥) ئایەتە لە سەرگوزەشتەکەیە، بەڵام دڵ بە هێنی تەفسیرەکە بەهێزترە.

ئەیانخاتە سۆزو پەرۆش بۆ چاو هەڵخستن و وریا بوونەوە تا هەست بکەن بە نایابی و ڕێك و پێکی و گونجاوی ئەو هەموو شتە نهێنیانەی کە خوا ئەم بوونەوەرە فراوانەی بەسەردا ڕشتووە، ئا بەو جۆرە ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوون و ئاشکرایانە ئەخاتە پێش چاو و تەڕو تازەیان ئەکاتەوەو بە جۆرێ خەڵکی سەرسام ئەکات وەکو ئەوە یەکەم جار بێت ئەو شتانە ئەبینێت، بەڵگەو نیشانەکان بەو شێوە شیرینە پیشان ئەدات، نەك بە شێوەی لێکۆڵینەوەیەکی دەروونی ساردو وشك کە گیان و بزووتنەوەی تیا نییە، ئەو شێوەی کە لە دەرەوەی جیهانی ئیسلامییەو هات و چووە ناو دەروون و مێشکی مسوڵمانانەوە تا خەریکی کردن و لای دان لە ڕۆیشتن بە ڕێبازە سوك و ئاسانە دڵنیاکەرو ئارام دەرەکەی قورئاندا کە بەبێ ئەرك و زەحمەت عەقیدەو باوەڕ جێگیرو دامەزراو ئەکات لە قوڵایی دڵو دەرووندا.

ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ كَيۡفَ يُبۡدِئُ ٱللَّهُ ٱلۡخَلۡقَ﴾ ئایا سەرنجیان نەداوەو نەیانزانیوە بە زانینێکی وەکو دیتن کە چۆن خوا لە یەکەم جارەوە خەڵکی دروست ئەکات و دای ئەهێنێ؟ بێگومان ئەزانن و ئەبینن لە تۆم و هێلکەو بێچووی ناو سکدا، لە هەموو شتێکدا کە لە پێشەوە نەبووە ئینجا پەیدا ئەبێت، لە هەموو ئەو شتانەی کە ئادەمی بەیەکە یەکەو بە کۆو یەکسەر ناتوانن فەراهەمی بێنن و دای بهێنن یان بڵێن ئێمە دروستمان کردووە، بە تایبەتی گیان بە تەنها شتێکە کە هەموو کەس لە ئاستی دەستە پارچەیەو ناتوانێ هیچی لێ بڵێ: چییەو لە چی پەیدا ئەبێ؟ ئیتر لەوە بگەڕێ کە هیچ کەس هەوڵ بدات بۆ فەراهەم هێنانی یان بتوانێ بڵێت: فەراهەمی ئەهێنم، هیچ کەس ناتوانێ هیچ بڵێ: جگە لەوە کە پەروەردگار ئەیناسێ و ئەزانێو فەراهەمی ئەهێنێ، دەی کاتێ کە خەڵکی ئەزانن ئەم شتانە خوا دائەهێنێ و فەراهەمی ئەهێنێ، کەواتە ﴿ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓ﴾ لەپاشان دووبارەی ئەکاتەوە، هەرچۆنێك یەکەم جار دروستی کرد، ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ﴾ بێگومان ئەو دووبارە کردنەوە لەسەر خوا ئاسانە، بەڵێ زۆر ئاسانە و هیچی تێ ناچێ جگە لەوە مەیل و خواهیشی ڕووی تێ بکات، ئیتر بەبێ تەفرە شتەکە ئەبێ، کەواتە هیچ شتێ لای خوا نارەحەت و گران نییە، دووبارە کردنەوەو داهێنانی یەکەم جار وەك یەك وایەو یەکسانن بۆ خوا، بەڵێ بەڕاستی ئەم ڕابەرو بەڵگە قورئانییە ئێجگار سوك و ئاسان و ڕوون و ڕەوان و بەهێزەو دەروون بەتەواوی فێنك ئەکاتەوە، هەتا بیری لێبکرێتەوە تام و لەزەی خۆشی ڕون تر ئەبێتەوە،ئەم شتانە بە پێش چاومانەوە هەن، دەی ئاشکرایە کە لە خۆیانەوە نەبوون، کەواتە ئەبێ کەسێ دایهێنابن، دەی ئەو کەسە چۆنی داهێنان هەر بەو جۆرە دووبارەیان ئەکاتەوە، تەنانەت بە

پێی دەسەڵاتی ئێمە دووبارە کردنەوە ئاسان ترە لە داهێنانی یەکەم جار، هەرچەند بۆ خوا – وەکو ووتمان – یەکسانە، کەواتە ئەبوایە بێ برواکان هیچ سەریان نەکردایەتەوە لە دووبارەکردنەوە، ئینجا بانگ ئەکات بۆ گەڕان و گەردش لە زەوی وڵاتدا، سەرنجدان و بیرکردنەوەو بەدواداگەڕانی بەرهەمەکانی توانین و دەسەڵاتی خوا، تا هەست بکەن بەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوونانە کە بڵاوبوونەتەوە لە هەموو شتێکدا، گیانلەبەرو بێ گیان، بە هۆی ئەوەوە تێبگەن کە ئەو کەسەی دایهێنان بە بێ ئەرك و زەحمەت ئەتوانێ دووبارەشیان بکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: بڕۆن بگەڕێن بە زەویدا، ئینجا سەرنج بدەن کە چۆن لە یەکەم جارەوە خەڵکی دروستکردو دای هێنا بەو هەموو جیاوازییانەوە، لەبەر ئەو سروشتە جیاجیاییانە، گەڕان بە وڵاتاندا چاوو دڵ ئەکاتەوە لە ئاستی چەند شتێکی تازە کە چاو دەقی پێوە نەگرتووەو دڵ لێی بێ تاقەت و بێزار نەبووە، بێگومان ئەوە شتێکی ڕاست و ئاشکرایە، چونکە مەردووم کاتێ ژیا لە ناوچەیەکداو بە درێژی مایەوە تیایدا ئەو ناوچەیە لە پێش چاوی کۆن ئەبێت و هەرچەند شتی نایاب و سەرسوڕهێنەری تیا بێ بیری لێ ناکاتەوەو لە پێش چاوی ئەکەوێ، دەروونی بێدار نابێتەوە بەو شتە نایابانە، هەست و ژیری لەو بارەیەوە وەکو خەوتوی لێ دێ هەتا کاتێ کە ئەو ناوچەیە بەجێدێڵێ و ئەڕوات بۆ وڵاتێ ترو شتی تری تازە ئەبینێ، لەو کاتەدا هەست و دڵ و دەروونی بێدارو وریا ئەبنەوەو ئەکەونە سۆزو پەرۆش لە بینینی ئەو شتە تازانەی کە لەوەو بەر وێنەی ئەوانە بەڵکو زۆر نایاب تریان دیوە لە ناوچەکەی خۆیانداو بە هۆی ئولفەت و دەق پێوەگرتنەوە بێ ئاگا بوو بوو لێی و بیری لێ نەئەکردەوە، لە پاش بەجێهێشتنی ناوچەکەی خۆی و گەڕان بە وولاتاندا هەست و ژیریو دەروونی کە کول بوو بوون تیژ ئەبنەوە، وەکو دەمە زەرد کرابن، ئینجا کە گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیان وەکو بەهەست و ژیرییەکی تازەوە هاتبنەوە وایە بە جۆرێ ئەکرێنەوەو بێدار ئەبنەوە لە ئاستی نایابی ئەو شتانەی کە لە پێش گەڕان و سەفەرەکەیاندا گوێی نەبوو لێیان و بە شتێکی گرنگی دانەئەنان!! پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایە کە ئەم قورئانەی هێنایە خوارەوە کە ئاگادارە بە هەموو کاروباری دڵو دەروون و خۆی ئەزانێ چی کاریان لێ ئەکات و بە چی چارەسەر ئەکرێ هەر دڵو دەروونێك کە زیندوو بێت و تەڕایی تیا بێت، خوای گەورە فەرمانی دا بە بیرکردنەوە لە بەرهەمی دەسەڵات و توانینی خوا لە داهێنانی یەکەمجاری خەڵکیدا، تا بە هۆی ئەوەوە بزانن باوەڕبێنن،

ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾ يُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَيَرْحَمُ مَن يَشَاءُ ۖ وَإِلَيْهِ تُقْلَبُونَ ﴿٢١﴾

---

﴿ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ﴾ له پاش ئەوه خوا دروست کردنی دوایی و دووەم دائەهێنێ، چونکه ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بە ڕاستی خوا تواناو دەسەلات داره بەسەر هەموو شتێکدا، کەواته هەرچۆنێ بەو توانین و دەستەلاته له یەکەمجارەوه گیان ئەدات و ئەیکات بە بەری کەرەسە بێگیانەکاندا، هەروەها بەو توانین و دەستەلاته گیان دووباره ئەکاتەوه بە بەری کەرەسەو لەشە بێ گیانەکاندا، بەو توانینە بێ سنورەی که نەبەستراوه بە یاساو قانونەی کە ئادەمی بەراوردی شتی گونجاو و نەگونجاوی پێ بکەن، ئەوەش بە پێی تاقیکردنەوەی سنورداری خۆیان، ئینجا با بزانین کە ئەم ئایەتەو ڕابەرەی کە دەستنیشانی بۆ ئەکات جیاوازه لەگەڵ ئایەتی پێشوو ڕابەرەکەی له چەند ڕوویەکەوه:

١- ڕابەرو بەڵگە لە ئایەتی پێشوودا نەفسی داهێنانی یەکەمجار بەبێ تێبینی و سەرنجدانی جیاوازی دروستکراوەکان و تێپەڕکردنی چەند بارێ بەسەریاندا بە گۆڕان و برینی چەند قۆناغێك، بەڵام مەبەست بە ڕابەرو بەڵگەی ئێره داهێنانی دروستکراوەکانه بەو هەموو جیاوازی و جیاجیایی و برینی ئەو هەموو قۆناغەو تێپەڕکردنی ئەو هەموو بارو گۆڕانه بەسەر دروستکراوەکاندا، بەڵگە لەسەر ئەو دوو مەبەسته جیاوازه ئەمەیه لە ئایەتی پێشوودا هەر ئەوەندە ئەفەرموێ: ئایا نەیانزانیوه کە خوا چۆن لە یەکەمجارەوه دروستکردنی داهێنا، لێرەدا ئەفەرموێ بڕۆن بە وڵاتاندا و سەرنج بدەن، دەی گەڕان و سەرنج دانەکە لەبەر ئەو هەموو شتە جیاوازەیە کە هەر یەکە سروشتێکی هەیەو لەسەر بارێکی تایبەتییە.

٢- ڕابەری پێشوو نەفسی و دەروونییەو زانینە دەروونیەکەی خۆیان ئەکات بە نیشانەو بەڵگە، بەڵام ڕابەرەکەی ئێره لە دەرەوەی دەروونەو ئافاقییە.

٣- زانین لە ئایەتی پێشوودا پێی ئەوترێ – حەدەس – واته بەبێ وردکردنەوەو هەوڵو تێکۆشان فەراهەم دێ.

٤- ڕابەری پێشوو پێی ئەوترێ - عیلمی - چونکە زانینی یەکەمجار دروستکردن کراوە بە ڕابەری زانینی دوبارەکردنەوەی دروستکراوەکان، ڕابەری ئێرە پێی ئەوترێ - عینی - چونکە عەینی شتە دروستکراوەکان ڕابەری دووبارەکردنەوەیە، ئەگەر ئەم نەگونجایە ئەویش نەئەگونجا، ماتوڵ گونجاو و بەدی هات، ئەبێ دووەمیش بگونجێ بە دی بێت.

بەڵێ بەڕاستی قورئان قورئانە، ئەم دوو ئایەتە بە ڕواڵەت وەك یەك وان، کەچی ئەوەتا ئاوا جیاوازن لەو چەند بارەوە کە ئێجگار قوڵ و دوورن، پاکی و بێ عەیبی بۆ خوای تاك و تەنیا، بیرکردنەوە لە شێوەی ئەم ئایەتە و سەرنج دانی ڕواڵەتی مەبەستێ نەخاتە دەروون کە جێگای باوەڕە و دەست نیشان کردن بۆ ئەو مەبەستە تێبینی کرابێت، بەگوێرەی ئەوە ئەم ئایەتە جوێ ئەبێتەوە لە ئایەتی پێشوو لە مەبەستیشدا، لە ئایەتی پێشوودا ئەفەرموێ: ﴿کیف یبدئ﴾ بە کردەوەو ئێستا و داهاتوو، لەم ئایەتەدا فەرمان ئەدات بە گەڕان بە وڵاتانداو ئینجا بەکردەوەی ڕابردوو ئەفەرموێ: ﴿کیف بدء﴾ دەی لەم دوو هۆنینەوە جیاوازە دوو مەبەستی جیاواز ئەکەوێتە دڵەوە، لەئایەتی پێشوودا نیشان ئەدات کە مەبەست ئەوەیە سەرنج بدەن کە بە پێش چاریانەوە لە شتی بێگیان گیاندار پەیدا ئەبێت بەو شێوە کە لە تەفسیرەکەدا باسمان کرد، بەڵام ئەم ئایەتی دووەمە وا ئەگەیەنێ کە مەبەست تەمێی خەڵکی بێ بە جوست و جۆکردن و گەڕان بەشوێنی ئەو شتانەی کە بەڵگە و نیشانەن لەسەر پەیدابوونی یەکەم جاری گیان لەم سەر زەویەدا - ئەوە تاکو زانایانی تازە - ماوەیەکە ئەگەڕێن و خەریکی پشکنینن لە هەموو لایەکەوە لە وڵاتان زەوی هەڵئەدەنەوەو سەرنجی دروشم و ئاساری کۆن ئەدەن تا بزانن گیان یەکەم جار چۆن پەیدا بووەو چۆن بڵاو بووەوەو پەرەی سەندو بەرز بووەوە، خەریکن بە هەموو هێز و تواناوە ئەیانەوێ بەباشی تێ بگەن لەو شتە نهێنیە نەناسراوە کە چییە؟ لە کوێوە هاتووە بۆ سەر ئەم زەویە؟ چۆن یەکەم گیانلەبەر پەیدا بووە؟ ئەوانە لەو بابەتەوە هیچ دەستکەوتێکیان نەبووە، ئەگەر چی زۆر ئایابی سەرسوڕهێنەریان دۆزیوەتەوە، جا وەکو وتمان گومان ئەبرێ کە ئەم ئایەتە دەستنیشان بکات بۆ ئەو مەبەستە گرنگەو تەمێی خەڵکی بکات کە بگەڕێن بەدوای دۆزینەوەی ئەو شتە گرنگانەدا لەم زەویەدا، تا بەهۆی ئەوە زانا بن و باوەڕیان بەهێز بێ

بەدەسەڵات و هێزی بێ سنوری خوا لەیەکەم جاری فەراهەم هێنانی گیان و گیانلەبەران، بەهۆی ئەوە باوەڕ بێنن بە زیندوو بوونەوە و گیان بەبەردا کردنی دووەم جار. ئینجا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە کە ئەم مەبەستە نەهاتووەو گوزەری نەکردووە بەدڵی یەکەم چیندا، بەڵکو تا ئەم چەرخی دواییە کە بیری لە شتی وا نەکردوەتەوە، کەواتە چۆن خوا فەرمان ئەدات و داوای شتێ ئەکات لە بەندەکان کە بەهیچ ڕەنگێ ئاگادار نین پێی و بێ ئاگان لە بەرو دوای، خوایش داوایەکی نەکردووە لەتوانادا نەبێ؟ لەوەڵام دا ئەڵێین: ئێمە ناڵێین ئەمە مەبەستی سەرەکی و ڕاستەقینەیە لە ئایەتەکە، بەڵکو وتمان گومان ئەبرێ کە ئەم ئایەتە دەست نیشانی بۆ بکات، ئەگەر مەبەستی سەرەکیش بێت تەنیا ئەم مەبەست نییە، بەڵکو ئایەتەکە دوو بەر هەڵئەگرێ:

١- بەپێی ڕواڵەت ئایەتەکە تەفسیر کراوەتەوە پێی لەکتێبەکانی تەفسیرا، ئەگەڕێتەوە بۆ مەبەستی ئایەتی پێشوو.

٢- ئەم مەبەستەش ببێ، مەبەستە پێشووەکە بۆ تاقمێ و ئەمی تریش بۆ تاقمێ تر، لەقورئاندا وێنەی ئەمە هەیە لە چەند شوێن و ئایەتێکدا.

شوێنەکە دەست نادات بۆ ئەودرێژە پێدانە، هۆی دوانەهاتنی مەبەستە نایابەکانی قورئان ئەم جۆرە شتانەیە کەدەست ئەدا بۆ چەند ماناو مەبەست هەر تاقمێ مەبەستێکی لێ وەرئەگرێ. آمنا بالقرآن الكريم المنزل من عند اللطيف الخبير. بەم ئایەتە ڕابووردووانە ڕابەرو بەڵگەی هێنایەوە لەسەر دووبارە کردنەوەو زیندووکردنەوە، ئینجا هەواڵمان ئەداتێ بەوەی ڕوو ئەدات لەو ڕۆژەدا، ئەفەرموێ: ﴿يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرۡحَمُ مَن يَشَآءُ﴾ خوا سزای کەسێك ئەدات کە خواهیش و مەیلی سزادانی بکات ئەو سزادراوانەیش کەسانێکن کە لەم جیهانەدا ڕێگای گومراییان داوەتە بەر بە خواهیش و هەڵبژاردنی خۆیان، ڕەحم و بەزەیی ئەکات بە کەسێ کە خواهیش و مەیلی بەزەیی کردبێ ئەوانەش کەسانێکن کە لەم جیهانەدا ڕێگای ڕاست و ڕێنموونی خوایان داوەتە بەرو بە حەزو ئارەزووی خۆیان ﴿وَإِلَيۡهِ تُقۡلَبُونَ﴾ تەنیا بۆ لای خواوەرئەگێڕرێنەوە،

وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ (٢٢)
وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يَئِسُواْ مِن رَّحۡمَتِي وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ (٢٣)

﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ ئێوه نین به یاخی و لەدەست دەرچوو لەخوا نە بە ڕاکردن و خۆشاردنەوە لە زەویدا، نە بە خۆپەنادان و پاراستن لە ئاسماندا، ئەگەر بتوانن بەرز ببنەوە بۆی، کەواتەئەبێ هەر بگەڕێنەوە بۆلای و هیچ چارەتان نییە، یان مەبەست ئەوەیە: هیچ هێزو دەسەڵاتێکتان نییە کە بەرگری خۆتانی پێ بکەن و پێی یاخی ببن لە گەڕاندنەوەتان بۆلای خوا، هیچ هێزێکتان نییە نە لەلایەن خۆتانەوە لە زەویدا، نە لەلایەن مەلائیکەو جنۆکەوە کە ئەیان پەرستن و لاتان وایە کە هێزو دەسەڵاتیان هەیە لە ئاسماندا ﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ﴾ نییە بۆ ئێوە لەلایەن غەیری خواوە هیچ دۆست و خۆشەویست و کاربەدەستێک کە پاستان بکات لە هیچ بەسەرهاتێکی خراپ، هیچ یارمەتیدەرێکتان نییە کە بەرگری هیچ سزایەکتان لێ بکات، بێگومان پشت بە هەرکەسێک ببەسترێ جگە لە خوا ئەو کەسە بەندەی خوایەو مل کەچە لە ئاستی هێزو دەسەڵاتی خوا، توانای نییە بۆ ڕاکێشانی هیچ سودو قازانجێ بۆی، دەسەڵات دار نییە بەسەر بەرگری هیچ زیانێ لەخۆی، بۆ خۆی وایە چ جای بۆ خەڵکی تر، ئینجا لەکۆتایی باسەکەدا، ئەم هەڕەشە سامناکە ئاڕاستە ئەکات: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ﴾ ئەوانەی بکە بڕوایان نییە بەو ڕابەرو نیشانە ڕوونانە، چ ڕابەرو نیشانە بونەوەریەکان، چ قورئانییەکان کە هەموو شایەتن خوایەتی خوا بەتەنیا، بڕوایان نییە بە گەڕانەوەیان بۆلای خواو گەیشتنیان بە حزوری خوا لە ڕۆژی دواییدا، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يَئِسُواْ مِن رَّحۡمَتِي﴾ ئا ئەوانە بێگومان بێبەش و نا ئومێد ئەبن لە بەزەیی من لە ڕۆژی دواییدا، یان لەم جیهانەدا نائومێد بوون و چاوەڕوانیان نەبووە بۆی، چونکە بڕوایان نەبووە بە ڕۆژی دوایی و بە بەزەیی خوا لەو ڕۆژەدا ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ ئەوانە سزایەکی زۆر ئێش و ئازاردەر هەیە بۆیان، – خوا پەنامان بدات لێی – لەپاش ئەم چەند ئایەتە کە تێهەڵکێش کرا لەنێوان سەرگوزەشتەی ئیبراهیم دا –علیه السلام– وەکو لە پێشەوە وتمان، لە پاش ئەوە ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ باسی هەڵوێست و وەڵامی گەلەکەی ئیبراهیم، ئەو هەڵوێست و وەڵامە زۆر ناڕەوایە کە بەڕاستی سەر سوڕ ئەمێنێ لێی،

فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ
لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٢٤﴾ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَاۖ

---

ئەفەرموێ: ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ﴾ ئیبراهیم بەو جۆرە ڕێك و ڕاستە هەوڵی دا کەچی وەڵامی گەلەکەی هیچ نەبوو جگە لەوە وتیان: بیکوژن بە شمشێر یان هەر شتێ کە گیانی دەربکات بیسوتێنن بە ئاگر، زۆر زۆر سەیرە ئەو وشەیە پیسە ناڕەوایە بەرامبەر ئەو بانگ کردنە شیرینەی کە ئیبراهیم پێی هەڵسا بەو شێوە شیرینەی کە تێپەڕی کرد، لە کاتێکدا کە سەرکێشی ڕووی تاڵ و ناشیرینی خۆی بەو شێوە ئاشکرا دەرخست، ئیبراهیمیش تەنیا کەسێکە لە ناو ئەو گەلە ستەمکارەدا بەرگری پێناکرێ و هیچ هێزو دەسەڵاتێکی نییە، لەو کاتەدا دەستی قودرەت بە ئاشکرا هاتە پێشەوە و بەرگری لێ کرد، ئەوە بوو ئەوان پیس ترین باریان بەکار هێناو بە کوشتنی ڕووت ڕازی نەبوون، بەڵکو مەنجەنیقیان بۆ چنی و بە هەموو هێز ئاگریان تیا تاودا و خستیانە ناو ئاگرەکەوە، ﴿فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ ئینجا خوایش ڕزگاری کرد لەو ئاگرە گەورەیە وەکو لە سورەتی ﴿الأنبياء﴾ دا باس کرا بە درێژی. بێگومان ڕزگارکردنی ئیبراهیم لەو ئاگرە سەختەو بەرگری کردنی ئەو ئاگرەو لەکار خستنی لە ئاستی ئیبراهیم نیشانە و بەڵگەیەکی زۆر ڕوون بوو بۆ هەرکەس دڵو دەروونی ئامادە بووبێ بۆ ئیمان و باوەڕهێنان، بەڵام ئەو گەلە ئامادە نەبوون بەهۆی ئەوەوە هەر باوەڕیان نەهێنا لەگەڵ بینینی ئەو موعجیزە زۆر گرنگە، کەواتە دەرئەکەوێ ئەو جۆرە موعجیزانە دڵو دەروون ڕزگار ناکەن لە کوفرو بێبڕوایی، بەڵکو ئەوەی ڕزگاری بکات بریتییە لەو ئامادەییەی کە باسکرا، وەکو ڕوونیش ئەبێتەوە لەم فەرموودەیەوە: ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ بێگومان لەو ڕزگارکردنی ئیبراهیمەدا چەند نیشانەو بەڵگەیەکی ئاشکرا هەیە بۆ گەل کۆمەڵێ کە باوەڕ ئەهێنن و ئامادەن بۆ باوەڕهێنان: یەکەم نیشانەو بەڵگە

ڕزگارکردنی لەو ئاگرە سەختەو لەکارخستنی لەو ئاگرە. دووەم: دەستەپارچەیی ستەم و سەرکێشی لە سزادانی تەنیا پیاوێ کە خوا بیەوێ ڕزگاری بکات. سێیەم: ئەمەیە کە موعجیزەو خارقە ئەو دڵە ڕەقە بێبڕوایانە چارەسەر ناکات، لەپاش باسی ڕزگاربوونی ئینجا ئەچێتەوە سەر گێڕانەوەی ئەندازەیەکی تر لە سەرگوزشتەکە، بێگومان نائومێد بوو لە باوەڕهێنانی گەلە دڵ ڕەقەکەی، لەپاش ئەوە ئەو موعجیزە گەورەیان بینی و هەر باوەڕیان نەهێنا، جا پێش ئەوەی لەناویان دەرچێ و دوورکەوێتەوە لێیان ئەم چەند شتە ڕاستەی ئاڕاستە کردن کە بۆمان ئەگێڕێتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ إِنَّمَا اتَّخَذْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ أَوْثَانًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾[1] ئیبراهیم وتی پێیان: ئێوە چەند وێنەو بتێکتان بڕیارداوە بە پەرستراوی خۆتان و لە پەرستنی خوا لاتان داوەو تێپەڕتان کردووە، ئەو بڕیارەتان لە دڵنیایی و باوەڕی دڵەوە نەهاتووە، بەڵکو هیچ هۆیەکی نییە جگە لە خۆشەویستی نێوان خۆتان لە ژیانی ئەم جیهانەدا، ئەتانەوێ هەمووتان لەسەر ئەو پەرستنە کۆ ببنەوەو ببێتە هۆی پەیوەندی و نەپچڕانتان لە یەك، یان مەبەست ئەوەیە خۆشەویستی هەندێکتان بۆ هەندێکی ترتان پاڵی پێوە ناون بۆ ئەو پەرستنە، بەم ڕەنگە هەندێکتان ئەیکردو ئەوانی تریشتان لەبەر دڵی ئەوان و ڕاگیرکردنی خۆشەویستی نێوانتان هەڵئەستان بەو پەرستنە، ئەو دڵ ڕاگیرکردن و خاترو خۆتریە زۆر جار ڕوو ئەدات لەناو گەل و کۆمەڵدا، گوێ نادرێ بە عەقیدەو باوەڕو دژو پێچەوانەی ڕەفتار ئەکرێ لەبەر دڵی هاوڕێو دۆست، ئەو کەسانەی کە ئاوان تێنەگەشتوون لە عەقیدەو نرخی عەقیدە، نازانن کە عەقیدەو باوەڕ ئەبێ بە گرنگترین شت سەیر بکرێ و دەست بنرێ بە هەموو شتێکەوە لە پێناویدا، ئینجا لاپەڕەی ڕۆژی دوایی هەڵئەداتەوە کە ئەبینن ئەو خۆشەویستی و پەیوەندی ئەم جیهانەیان ئەگۆڕێ بە دوژمنایەتی و کینەو پچڕان و نەفرینکردن لە یەکتر،

---

[1] ووشەی(مودة) بە چوار جۆر خوێندراوەتەوە، وشەی(بینکم) بە دوو جۆر بە پێی جیاوازی خوێندنەوەکان شێوەی تەفسیرەکە جیاواز ئەبێ، بەڵام مەبەست لە هەموو هەر یەك شت ئەگرێتەوە.

ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٥﴾ ۞ فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ

ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا﴾ لە پاشان لە ڕۆژی دواییدا یەکتر باوەڕ ناهێنن بە یەکترو دانی پیا نانێن یەقەی لێ هەڵئەتەکێنن و یەکتر نەفرین ئەکەن لە یەك، پێشەواو سەرۆك و پەرستراوەکان دەربارەی شوێنکەوتوو ژێر دەستەکانیان بەو جۆرەیان لێ دێ، هەروەها ئەمانیش دەربارەی ئەوان، لە نێوان خۆیاندا یەکتر تاوانبار ئەکەن، ئینجا تازە ئەو بێزاری و پەشیمانییە هیچ سودێکیان پێ ناگەیەنێ بەرگری هیچ سزایەك ناکات لە هیچ کەس، ئەوەتا پێی فەرموون: ﴿وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ﴾ جێ و شوێن و جێگـای نیشتەجێتان ئـاگرە، ﴿وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾ نییە بۆتـان هیچ یارمەتیدەرانێ ڕزگارتان بکات لەو ئاگرە، ئەوانە ویستیان بیسوتێنن بە ئاگر لەم جیهانەدا ئینجا خوا یارمەتی داو ڕزگاری کرد بەڵام خوا کە ئەمان ئەخاتە ئاگری دۆزەخ نە یارمەتیدەریان هەیەو نە ڕزگاربوون – خوا پەنامان بدات – بانگ کردنی ئیبراهیم – علیه السلام – هەموو هەوڵو تەقالاکەی و ئەو موعجیزە گەورەیە کە بە چاوی خۆیان بینیان – واتە ڕزگاربوون لە ئاگرەکە – ئەمانە هەمووی دوایی هات و بەرهەمەکە باوەڕهێنانی تەنیا کەسێ بوو کە ژنەکەشی باوەڕی نەهێنا لەگەڵی، ئەو تەنیا پیاوەش(لوط) بوو کە برازای خۆی بوو، لە هەندێ ڕیوایەتدا ئەفەرموێ: لەگەڵ ئیبراهیم کۆچی کرد لە(ئـور) کەلدانییەکانی عێراقەوە بۆ لای ئوردن و لەوێ نیشتەجێ بوون، ئەفەرموێ: ﴿فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ﴾ ئینجا لوط باوەڕی هێنا بە ئیبراهیم، باوەڕی هێنا بە پێغەمبەرەکەی، نەك باوەڕی هێنا بە خوا چونکە(لوط) بە پاکی هاتووەو باوەڕی هەر هەبووە بە تاك و تەنیایی خوا،

وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّيٓ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٦﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَجَعَلۡنَا فِي ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلۡكِتَٰبَ وَءَاتَيۡنَٰهُ أَجۡرَهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾

---

﴿وَقَالَ﴾ ئیبراهیم ووتی: ﴿إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّيٓ﴾[1] بە ڕاستی من کۆچ ئەکەم لە وڵاتەکەم و بەجێیان ئەهێڵم و ئەڕۆم بۆ لای پەروەردگارم، بەم ڕەنگە ئەڕۆم بۆ شوێنێ کە ئەو فەرمانم پێ بدات بە کۆچ کردن بۆ لای، یان بۆ شوێنێك کە بەرگری ئەکرێم لە پەرستنی خواو فەرمانبەری ئەو ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ بێگومان تەنیا پەروەردگارم زاڵە بەسەر هەموو کارێکدا، کەواتە بەرگریم ئەکات، لێزان و کاردروستە هەرچی بکات ڕێك و ڕاستە، کەواتە فەرمانم پێ ئەدات بۆ شوێنێ کە بەرژەوەندی تێدایە ئەوێ چاکترە لە هەمو شوێنێکی تر، با هەندێك بیر بکەینەوە لەم فەرموودەیە تا بزانین مەبەست لەو کۆچ کردنە چی بوو؟ کۆچ کردن بۆ لای خوا ئەبێ چۆن بێت؟ ئەوەتا کۆچی ئەکرد بۆ ئەمەی پزگاری ببێ و سەری خۆی دەربکات، کۆچی ئەکرد بۆ لای خاك و وڵات یا دەسکەوت و بازرگانی، بەڵکو کۆچی کرد تەنها بۆ لای خوای خۆی، کۆچی کرد لەبەر نزیك کەوتنەوە لە بەزەیی و ڕەزامەندی خواو پەنا بردن بە سایە و پەنای خوا، بە دڵ و باوەڕو عەقیدەیەکەوە کۆچی کرد پێش ئەمەی بە لەش و خوێن و گۆشتەوە کۆچ بکات. کۆچی کرد بۆ ئەمەی ئایین و پەرستنەکەی خاوێن بکات بۆ خواو دڵ و هەست و هەموو گیانی و هەموو شتی پاك وخاوێن بکات بۆ خواو هەموو شتێ لە خۆی داڕنێ جگە لە خوا لەو شوێنەی کە کۆچی بۆ ئەکات، کۆچی کرد تا دوورکەوێتەوە لە شوێن و نیشتمانی کوفرو بت پەرستی و گومڕایی، لە پاش ئەوەی هیچ ئومێدی نەما بە گەڕانەوەی گەلەکەی بۆ لای خواو پەرستن و مل کەچی بۆی، ئیبراهیم – علیه السلام – لەبەر خواو لە ڕێگای ڕەزامەندی خوادا دەستی هەڵگرت لە هەر شتێك کە لەم جیهانەدا دڵ پەیوەندی هەیە پێیەوە، هۆی خۆشی و ڕووناکی دڵە، خوایش قەرەبوی ئەمانەی بۆ کردەوە، لە باتی ئەوانەدا شتێکی پێ بەخشی کە هۆی خۆشبەختی هەردوو جیهانە، پیت و فەڕی هەرگیز دوایی

---

[1] تەفسیرەکە لەسەر ڕای(قەتادە) و(نەخعی)ە، هەندێ ئەفەرموون ئەمە وتراوی(لوط) ە ئەمیش هەر ئەگونجێ، بەڵام بە ئارام ترە، چونکە باسەکە هێشتا باسی ئیبراهیمەو نەبڕاوەتەوە، زانین لای خوایە.

نایــەت، وەکــو دەستنیــشانی بــۆ ئــەکات لــەم فەرموودەیــەدا: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ﴾ بەخشیمان بە ئیبراهیم ئیسحاقی کوڕی یەعقوبی کوڕەزای ﴿وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ﴾ لە پاش خۆی پێغەمبەرێتی و فروستادەیی خواو کتێبی خۆمان بڕیاردا لە ناو ڕۆڵەو نەوەی ئەودا، واتە لە پاش ئیبراهیم هەر پێغەمبەرێك ڕەوانە کرابێ لە ڕۆڵەو نەوەی ئەوە، هەر کتێبێ لە ئاسمانەوە هاتبێتە خوارەوە بەوان دراوە کە ڕایگەیەنن بە خەڵکی ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ أَجْرَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا﴾ پاداشتی خۆیمان پێ بەخشی لەم جیهانەدا لەسەر ئەو کۆچ کردن و خۆ ڕووت کردنەوەی بۆ ئێمە، بە بەخشینی ڕۆڵە لە پاش تێپەڕینی کاتی خۆیو پیر بوونی خۆیو خێزانــی، وەچــەو نــەوەی پــاكو خاوێنمــان پــێ بــدا، لەگــەڵ هەمیــشەییو نەبڕانــەوەی پێغەمبەرێتی لە نێوانیاندا، کارێکی وای بۆ کرا هەموو ئەهلی ئایینەکان لە پاش خۆی پەیوەندییان هەیە پێیەوە، وەسفو سەناو سوپاسی ئەکەنو سڵاوی لێ ئەکەن تا دنیا دنیایە، ﴿وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ بێگومان لە ڕۆژی دواییدا لە ڕیزی ئەوانەیە کە تێرو تەواون لە چاکیدا، کەواتە پیتو فەڕی هەردوو جیهان کۆ بوەتەوە بۆی، ئینجا بە دوای سەرگوزشتەی ئیبراهیمدا سەرگوزشتەی(لوط) دێت، پاش ئەمەی کۆچی کرد لەگەڵ ئیبراهیم – علیه السلام – ئەڵێن کۆچیان کرد لە(کوسا) لە سەواد العراقەوە چوون بۆ(حەڕڕان) ئینجا لەوێوە بۆ(شام)، ئینجا ئیبراهیم لەگەڵ خێزانی سارە کە ئامۆزای بوو لە فەلەستیندا دانیشتن،(لوط)یش نیشتەجێ بوو لە(سەدوما) بە دەوری دەریای(مییت) دا یا دەریا بچکۆلەکەی(لوط) وەکو لەمەو پاش بەمە ناوبراو بەهۆی ژیانی لە ناو ئەو گەلەو ژنخوازی لێیان بە یەکێ لەو گەلە دانراو سەیرکرا. ئینجا لە ناو ئەو گەلەدا کردەوەیەکی زۆر پیس بوو بوو بە باو کە قورئان ئەفەرموێ:

١- کردەوەیەکی وایە کە یەکەم جار ڕووی دا لەناو ئەو گەلەدا لە هەموو مێژووی ئادەمیدا، ئەوەش بریتی بوو لە نێربازی لە باتی ئافرەتان کە دروست کران بۆ پیاوان، بۆ ئەمەی بکەونە یەك و ژیانێکی ڕێك و پێك ببنە سەرو لەو ڕێگا سروشتییەوە ئارەزووی سروشتی بەجێبێنن و پەرە بسێنن و بەرەی ئادەمیش بمێنێتەوە، ئەو گەلە پیسە لەو ڕێگا سروشتییە ڕاستە لایانداو ئەو کردەوە پیسەیان کرد بە باو، لەبەرئەوە کردەوەکەیان ئیجگار زیاندارە،

وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ
ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ

---

بەرگری لێ کردنیان لێ بوو بە بەندێکی گرنگ لە پەیام و پێغەمبەرێتییەکەی(لوط) وەکو بۆمان دەرئەکوێ کە ئەفەرموێ: ﴿وَلُوطًا﴾ ئەی پێغەمبەر باسی(لوط) بکە ﴿إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە ووتی بە گەلەکەی: ﴿إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ﴾ بێگومان ئێوە کردەوەیەکی ناشیرین ئەکەن کە دڵو دەروونی پاك و خاوێن بێزی لێ ئەکاتەوە ﴿مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ لە هەموو جیهاندا هیچ کەس پێش ئێوە ڕێی نەکەوتووە بەو کردەوەیە، لە فەرموودەیەکەوە دەرئەکەوێ کە تێکچوون و خراپەکاری بڵاوبووبێتەوە لە ناو ئەو گەلە سەرلێتێکچووەدا بە هەموو جۆرو شێوەیەك کە لە دەستیان بهاتایە، ئەوەتا یەکەم ئەو کردەوە پیسە کەس نەدیوەیان کرد، نێربازییان ئەکرد کە نیشانەی لادان و ترازانی سروشتی ئادەمییەو تێك چوون و ڕزانی بە تەواوی، بەڵێ سروشت زۆر جار ئەترازێ لە سنوری ڕاست و زیادەڕەوی ئەکات و داوێن پیسی بەکار ئەهێنێ لەگەڵ ئافرەتاندا، ئەوە بێگومان تاوانێکی گەورەو خراپە، بەڵام هێشتا لە چوارچێوەی سروشت دەرنەچووە بە تەواوی، بەڵام نێربازی ڕادەی زۆر پەسترەو دەرپەڕینە لە سنوری سروشتی هەموو گیانلەبەرێك نەك تەنها ئادەمی، وەکو لە چەند شوێنی تردا بە درێژی باسمان کردووە.

٢- لە تاوانەکانیان ئەمەیە کە پێی فەرموون: ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ﴾ ئێوە دەچنە لای پیاوان و تێپەڕدەکەن لە ئافرەتان و ئەو کارە پیسە دەکەن و ڕێگا ئەبڕن و ئەگرن لە ڕێبوارو گوزەرکەران بە ترساندن و داچڵەکاندنیان و وە بە تاڵانی شت و مەکیان و دەستدرێژی بۆ سەریان بە تایبەتی کە زۆریان پێ ئەهێنان و سواریان ئەبوون و نێربازییان لەگەڵ ئەکردن، کە لە هەمو شت سەخت ترەو هیچ دەستدرێژییەك لەوە خراپ تر نییە، ئێش و ئازاری زیاتر نییە بۆ خەڵکی.

وَتَأْتُونَ فِي نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ

إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٣٠﴾

٣- ﴿وَتَأْتُونَ فِي نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ﴾ له جێگای كۆڕو كۆبوونەوەتاندا كاری ناڕەواو بێزراو ئەكەن بە ئاشكراو بە شێوەی گشتیو هیچ شەرمو تەقێ ناكەن لە یەكترو تەریق نابنەوە لە ئاستی یەكتر، كە ئەوە ئەوپەڕی بێناموسیو بێ شەرەفییەو شانازیو كەشخەكردنە بە ناپیاوییەوە، دەنگو باسو سەرگوزشتەكە كورتكراوەتەوە، دیارە(لوط) – علیه السلام – لە یەكەم جارەوە بە شێوەیەكی ڕێك و شیرین فەرمانی پێ داونو بەرگری كردوون، ئەوان هەر سووربو بەردەوام بوون لەسەر بارە لارەكەی خۆیان، ئینجا ئەویش ترساندنی بە سزای سەختی خوا ئەگەر كۆتایی نەهێنن، ئەوانیش بەرامبەر بەو پێغەمبەرە دڵسۆزەیان ئەمە وەڵامیان بوو كە ئەفەرموێ ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ لە پاش هەوڵو مۆچیاری(لوط) هیچ شتێ وەڵامی گەلەكەی نەبوو جگە لەوە نەبێ كە پێیان ووت: سزای خوامان بۆ بێنە ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانی لەوەی كە ئەیڵێیت بە ئێمەو هەڕەشەمان لێئەكەیت، ئەم وەڵامە ناڕەوا كەشخەو شانازی ئەگەیەنێ بە تاوانو خراپەكاریو ئەوپەڕی بێشەرمییە بەرامبەر بە ترساندنێ كە بە شێوەی مۆچیاریو دڵسۆزی بێت، بە درۆخستنەوەو بەرگریو یاخی بوونە لەو پێغەمبەرە بە جۆرێ چاوەڕوانی گەڕانەوەیان لێ ناكرێ، لە كاتێكدا كە هیچ بەهانەیەكیان بۆ نەماوەتەوە، كەواتە هیچ نەمایەوە بۆ ئەو پێغەمبەرە جگە لەوە بپاڕێتەوەو نزا بكات لای خوای خۆی و داوای یارمەتی لێ بكات، لەبەرئەوە ﴿قَالَ﴾ ووتی: ﴿رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ ئەی پەروەردگارم یارمەتیم بدەو زاڵم بكە بەسەر ئەو گەلە خراپەكەرو شێوێنەری وڵاتەدا بە داهێنانی ئەو سزا گەورە یانەی كەباس كران، نەك بینەرەچەوڕێبازی خراپ بەجێهێشتن بۆگەلانی پاش خۆیان.

ئینجا لێرەدا كۆتایی ئەهێنێ لە باسی نزاكەی(لوط) و پەردەیەك ئەهێنێ بەسەری دا، بۆ ئەمەی وەرگرتن و بەجێهێنانی نزاكە دەربخات بەم ڕەنگە هەواڵ ئەدات لەو كۆمەڵە مەلائیكەی كە سزای ئەو گەلەیان پێ سپێردراوە، وان بەڕێوە بۆ بەجێهێنانی و كاری تریشیان پێ سپێردراوە كە مژدە دانە بە بەخشینی كوڕێكی صالح بە ئیبراهیم لە خێزانە نەزۆكەكەی كە هەرگیز منداڵی نەبووە،

﴿وَلَمَّا جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ قَالُوٓاْ إِنَّا مُهۡلِكُوٓاْ أَهۡلِ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِۖ إِنَّ أَهۡلَهَا كَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطٗاۚ قَالُواْ نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَن فِيهَاۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهۡلَهُۥٓ إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَلَمَّآ أَن جَآءَتۡ رُسُلُنَا لُوطٗا سِيٓءَ بِهِمۡ وَضَاقَ بِهِمۡ ذَرۡعٗا﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ﴾ کاتێك مەلائیکە نێردراوەکانمان چوون بۆ لای ئیبراهیم بەو موژدەیەوە -موژدەی بەخشینی ئەو کوڕە کەلەئایەتی تردا باس کراوە و ڕوون کراوەتەوە- ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا مُهۡلِكُوٓاْ أَهۡلِ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِۖ﴾ ئەو مەلائیکانە هەواڵیان دا بە ئبراهیم و وتیان پێ ی: بێگومان لەناو بەر و بەرباد کەری دانیشتوانی ئەم شارە ئەبین، واتی سەدوم کە گەورەترینی شارەکانی گەلەکەی(لوط)، یەکەم جار ئەو بێناموسی و کردەوە پیسانە لەوێ هەڵقولا، لەبەر ئەوە بەتایبەتی باسی ئەو شارە ئەکات ئەگینا هەموو شارەکان وێران کران و لەناو بران. هۆی ئەو وێران کردن و لەناو بردنەش ئەمە بوو کە فەرموویان: ﴿إِنَّ أَهۡلَهَا كَانُواْ ظَٰلِمِينَ﴾ بێگومان دانیشتوانی ئەو شارە بێ بڕوا و ستەم کار بوون و سەریان کردە خراپەکاری و کۆڵنەدەر بوون لێ ی. موژدە دان بە ئیبراهیم وتووێژی لەو بارەیەوە لەگەڵ ئەو کۆمەڵە مەلائیکەدا بەدرێژی لە شوێنی تردا باس کراوە بە تایبەتی لە سورەتی ﴿إبراهيم﴾دا، لێرەدا بەکورتی تێپەڕی بەسەریدا، چونکە ئەوە لێرەدا مەبەستێکی سەرەکی نی یە، ئەوەی مەبەستی سەرەکی و بنەڕەتی یە بەسەر هات و سەرگوزەشتەی(لوط)(درودی خوای لەسەر بێت) کەواتە هەر ئەوەی باس فەرموو: کە ڕابووردنی ئەو مەلائیکانە بەلای إبراهیم دا بۆ ئەو موژدەیە بوو، لەپاشان ئەو هەواڵە گرنگەیان داو فرمانە سەرەکیەکەی خۆیانیان پێ ڕاگەیاند إبراهیم(درودی خوای لێبێت) لەو هەواڵە دڵ گەرم بوو و بەزەیی هاتەجۆش و غەمی(لوط) ی لێ هات لەبەر ئەوە ﴿قَالَ﴾ وتی بە مەلائیکەتەکان: ﴿إِنَّ فِيهَا لُوطٗاۚ﴾ بێگومان(لوط) کە

پیاوێکی ساڵحە و ستەمکار نی یە لەو شارەدایە، ئەوانیش وەڵامیان دایەوە بە جۆرێ دڵخۆش و دڵنیایان کرد لە بارەی(لوط)ە وە بەم جۆرە ﴿قَالُواْ﴾ وتیان بە ئیبراهیم: ﴿نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَن فِيهَاۖ﴾ ئێمە زانا ترین و باشتر ئاگادارین بە هەرکەس لەو شارەدایە. ﴿لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهۡلَهُۥٓ إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ﴾ سوێند بە خوا ئێمە(لوط) و خێزان و کەسە تایبەتی یەکانی ڕزگار ئەکەین لەو سزایە جگە لە ژنەکەی کە ﴿كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ﴾ لە زانین و بڕیاری خوادا تێپەڕی کرد بوو کە یەکێ ئەبێ لەوانەی ئەمێنێتەوە لەو شارەدا و لە سزای ئەو شارەدا، ئەو ئافرەتە دڵ و ئارەزووی لەگەڵ ئەو گەلە تاوانبارە بوو، لادان و کردەوە پیسەکانی بە چاك دائەنان!! ئینجا ئەگوێزێتەوە بۆ شێوەی

سێ یەم: شێوەی(لوط) لەکاتێك دا کە ئەو کۆمەڵە مەلائیکە هاتن بۆ لای لە دیمەن و شێوەی کۆمەڵێ کوڕی گەنجی جوان دا کە ئاگادار بوو بە باوی پیسی ئەو گەلە بە تایبەتی کۆمەڵە میوانێکی وەکو ئەمانە کەلای وابوو بە باوی پیسی ئەو گەلە بە تایبەتی کۆمەڵە میوانێکی وەکو ئەمانە کە لای وا بوو تەماعیان تێ ئەکەن و ئەویش بێ دەسەڵاتە و ناتوانێ بەرگری دەست درێژیی ئەو گەلە پیسەیان لێ بکات، بە هۆی ئەوەوە زۆر تەنگە تا و دڵ تەنگ بوو لە هاتنەکەیان، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَمَّآ أَن جَآءَتۡ رُسُلُنَا لُوطٗا سِيٓءَ بِهِمۡ وَضَاقَ بِهِمۡ ذَرۡعٗا﴾ لە کاتێك دا نێردراوەکانما چون بۆلای(لوط) غەم و ناخۆشی هات بۆی بە هۆی ئەوانەوە و دەستە پاچە بوو لە تەگبیر کردن و چارەسەر کردنیان و تەنگەتاو بوو پێ یان. باسەکە لێرەش داکورت ئەکاتەوە لە بارەی پەلاماردانی ئەو گەلە بێ ناموسە بۆ سەر ماڵی(لوط) و ئەو میوانانە، هەوڵدان و وت و وێژی(لوط) لەگەڵیان و گوێ پێ نەدانی ئەوان، کە ئەو ئارەزووە ناڕەوا بێ هۆش و سەرخۆشی کردبوو، باسی ئەوانە ناکات و دێتە سەر دوایی باسەکە کە مەلائیکەکان خۆیان لە ئاستی(لوط) ئاشکرا کرد و هەواڵیان دایە بەو کارە گرنگەی بۆی هاتوون، دڵخۆشیان کرد لەو کاتە زۆر سەخت و تەنگەدا،

وَقَالُواْ لَا تَخَفْ وَلَا تَحْزَنْ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا
مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ ﴿٣٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَا
مِنْهَآ ءَايَةَۢ بَيِّنَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٣٥﴾

---

﴿وَقَالُواْ﴾ پێ یان وت: ﴿لَا تَخَفْ﴾ نەترسی ﴿وَلَا تَحْزَنْ﴾ غەمبار نەبی ﴿إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ﴾ چونکە بێگومان ئێمە ڕزگار کەری تۆ و خێزان و کەسە تایبەتی یەکانت ئەبین جگە لە ژنەکەت کە ﴿كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ﴾ کە لە زانین و بڕیاری خوادا تێپەڕی کردووە کە یەکێ ئەبێ لەوانەی ئەمێننەوە لە سزادا و سزدا و ئەبن لە پاش موژدە دان بە ڕزگار کردنیان، ئنجا پێ یان وت: ﴿إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ﴾ بێگومان ئێمە ئەهێنینە خوارەوە سزایەکی داچڵەکێنەر و دڵ داتەکێنەرە بۆ سەر دانیشتوانی ئەم شارە لەلایەن ئاسمان و لای سەروویانەوە بەهۆی ئەوەی دەرچوون لە سنور و فەرمانی خوا. ئەو سزا سەختە ئەو شار و وڵاتەی وێران و وژێراو ژوور کرد و بەرد بارن کران، ئیتر بە هەر جۆر خوا ویستی. گومانی بەهێز وایە کە بومەلەرزە و بورکانێکی بەهێز لێ یدان و بردنی بە ناخی زەوی دا و ئەو بارن و بەردە وردە و قوڕاوی یەی بەسەردا باراندن، ﴿وَلَقَد تَّرَكْنَا مِنْهَآ ءَايَةَۢ بَيِّنَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ بێگومان هێشتمانەوە لەو شارە وێران کراوانەدا بەڵگە و نیشانەیەکی ڕوون بۆ گەل و کۆمەڵێ کە ژیرن و تێ ئەگەن لە بەڵگە و ڕابەرە ڕوونەکانی خوا لە چەرخ و چینەکان دا. ئەو نیشانە ڕوونەی کە هێشتی یەوە هەواڵ و دەنگ و باشە بە ناوبانگەکەیانە کە ئەگێڕرێتەوە لەناو گەلان دا، یان دروشم و نیشانەی وڵاتە وێران بووە کەیانە کە پاش خۆیان مایەوە وەکو ئیبن و عەباس ئەفەرموێ. یان ئەو ئاوەڕەش و تاریکە یە کەلە شوێنەکەیان دا پەیدا بوو وەکو(قتادة) ئەفەرموێ.گومان بۆ ئەمە بەهێز ترە چونکە ئەوەیان ئێستا هەیە و بووە بەدەریایەك کە ناو ئەبرێ بە(البحر الميت). لەم دوایی یەش دا شتی ئاشکرا دۆزرایەوە کە بەڵگە بێ لە سەری. ئنجا دەست نیشان ئەکات بۆ بەسەرهاتی شوعەیب و مەدیەن،

وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱرْجُوا۟ ٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى
ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٣٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٣٧﴾
وَعَادًا وَثَمُودَا۟ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ
فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُوا۟ مُسْتَبْصِرِينَ ﴿٣٨﴾ وَقَٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَلَقَدْ جَآءَهُم
مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانُوا۟ سَٰبِقِينَ ﴿٣٩﴾ فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦ

---

ئەفەرموێ: ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا﴾ واتە ڕەوانەمان کرد بە پێغەمبەری بۆلای-دانیشتوانی مەدیەن برای خۆیان کە شوعەیب بوو ﴿فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ﴾ ئنجا ئەویش وتی پێیان: ئەی گەلەکەم خوایەك کە ناوی ﴿الله﴾یە بیپەرستن ﴿وَٱرْجُوا۟ ٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ﴾[1] چاوەڕوانی هاتنی ڕۆژی دوایی بکەن و هەموو ڕودا و بەسەرهاتەکانی، ئەمڕۆ شتێ بکەن کە هۆی ڕزگاری بێت لە سزای ئەو ڕۆژە، ﴿وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ خراپەکاری مەکەن لە زەوی و وڵات دا بەدەست درێژیی کردنبۆ خەڵکی و سەنگ و مەزن گۆڕین و ترازوو بازی و ڕێ گرتن لە خەڵکی، ﴿فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ﴾ بەهۆی ئەوەوە بو مەلەرزە بەتینەکە گرتنی و لێ ی دان، یان پیا هەڵشاخانی جوبرەئیل ﴿فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ﴾ بەهۆی ئەوەوە لە شوێن و خانوی خۆیان دا گەڕان بە کەوتوو بەسەر ئەژنۆی خۆیان دا بە مردوویی، ئنجا بەکورتی دەست نیشان ئەکات بۆ لەناوچوونی عاد و سەمود، ئەفەرموێ: ﴿وَعَادًا وَثَمُودَا۟﴾ گەلی عاد و سەمودمان لە ڕیشە هێنا و لەناومان بردن ﴿وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمْ﴾ بێگومان ئەو بەرباد کردن و لەناو بردنەیان بە باشی ڕوون بووەتەوە بۆتان لەجێگا و شوێنەکەیانەوە، بەمەی کە ڕائەبوورن بەلایان دا و بەچاوی خۆتان دروشم و نیشانەیان ئەبینن. تائیفەی عاد

---

[1] مەبەست لە وشەی ﴿ وارجوا ﴾ بەچەند جۆرێکی تریش باس کراوە جگە لەوەی لە تەفسیرەکەدایە، لەسەر ئەمەی مەبەست پێ ی چاوەڕوانی و ئومێد بێت، ڕایەتر هەیە کە مەبەست ترساندنە لەو ڕۆژە.

نیشتەجێ بوون لە ﴿الأحقاف﴾ دا لای خواروی نیوە دورگە لەنزیکی ﴿حضرموت﴾ەوە، تائیفەی سەمود نیشتەجێبوون لە ﴿حجر﴾ دا لەلای سەرووی نیوە دوورگەوە لە نزیکی ﴿وادی القری﴾ دا تائیفەی عاد لەناو چوون و لەڕیشە هات بەو با سەختەی کە لەشوێنی تردا باس کراوە، سەمود بەدەنگ و پیا هەڵخشانە گەورەی کە وەك بومەلەرزە لێ ی دا، جێ و شوێنەکەیان ناسراو بوون لای ئەو یەکەم تاقمەی کە ئەو قورئانەی چوو بە گوێچکەدا، لەکاتی ڕۆشتنیان بۆ بازرگانی زستان و هاوین ڕائەبوردن بەلای ئەو جێگا و شوێنەدا کە دروشم و نیشانەی وێران بوونیان بە چاوی خۆیان ئەبینن، ئەم دەست نیشانە کورتە هۆی گومڕایی یان ڕوون ئەکاتەوە کە ئەوەیش هۆی گومڕایی هەموو گەلەکانی ترە، ئەفەرموێ: ﴿وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ﴾ شەیتان کردەوە خراپەکانی خۆیانی ڕازاندبوەوە و لەپێش چاویان جوان و شیرینی کردبوون، ﴿فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ بە هۆی ئەوەوە بەرگری کردن لە ڕێگای خوا و کەوتنە سەر ئەو ڕێگا ڕاستە، ﴿وَكَانُوا۟ مُسْتَبْصِرِينَ﴾ ئەونە ژیر بوون و ئەیانتوانی بیر بکەنوە و بە هۆی ئەوەوە ڕێگای ڕاست بدۆزنەوە و بیدەنە بەر، بەڵام وایان نەکرد، کەواتە هیچ بەهانەیەکیان نی یە، ئنجا دەست نیشانێکی کورت ئەکات بۆ فیرعەون و هامان ئەفەرموێ: ﴿وَقَـٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ﴾ قارون و فیرعەون و هامانیشمان لەناوبرد ﴿وَلَقَدْ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَـٰتِ﴾ بێگومان موسا هات بۆلایان بەچەند موعجیزە و نیشانەیەکی ڕوونەوە کە بەناو بانگن، ﴿فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ کەچی خۆیان بەزل زانی لە زەوی دا و یاخی بوون و مل پێچی یان کرد لە باوەڕ هێنان و گوێ ڕایەڵی و پەرستی خوا، ﴿وَمَا كَانُوا۟ سَـٰبِقِينَ﴾ ئەوانە لەدەست خوا دەرنەچوون و ڕزگار نەبوون لە سزا و تۆڵەی خۆیان. ئا ئەوانە کە باس کران و خاوەنی هێز و سامان و هۆی مانەوە و زاڵ بوون، خوا لەناوی بردن و هەرکانی دووچاری سزای شایانی خۆی کردن، وەکو بەڕێز دەست نیشان ئەکات بە سزا و تۆڵەکانیان، ئەفەرموێ: ﴿فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦ﴾ ئینجاهەرکام لەعادوسەمودو قاروون وفیرعەون وهامان ئێمە قارمان لێگرت وسزامان داو تۆڵە مان لێ سەند بەهۆی گوناهی خۆیەوە،

فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ
وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٠﴾ مَثَلُ
ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا ۖ

---

بەم جۆرە: ﴿فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا﴾ هەندێ لەوانە کەسێکە بایەکی بەهێزی بەتەوژمان نارده سەر کەبەردە وردەی لەگەڵ بوو، واتە تائیفە وگەلی عاد ﴿وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ﴾ هەندێ تر لەوانە کەسێکە کە نەعرەتە وپیا هەڵشاخانێکی گەورە گرتی ولە ریشەی هێنا، واتە سەمود هەروەها مەدیەنیش ﴿وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ﴾ هەندێ تر لەوانە کەسێکە کە ئێمە بردمان بە ناخی زەوی دا، واتە قارون، ﴿وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا﴾ هەندێ تر لەوانە کەسێکە کە خنکاندمان لەناو دەریادا، واتە فیرعەون و هانان، ئەمانە هەموو بە تۆڵەی خۆیان گەیشتن و هەرکان سزای تایبەتی خۆی درا ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ خوا جەور و ستەمی لێ نەکردن، بەڵکو ئەوانە خۆیان جەور و ستەمیان کرد لە خۆیان، واتە بە خواهیش و مەیلی خۆیان تاوانی زۆر زلیان کرد، بە ئارەزوو و هەڵبژاردنی خۆیان رێگای سزا و دۆزەخیان دایە بەر، کەوتە خۆیان جەور یان لە خۆیان کرد. لەپاش باسی لەناو بردن و لە ریشەهێنانی یاخی و مل هوڕە تاوانبارە بێ بڕواکانی گەلەکانی ڕابوردوو کە جەور و ستەمیان کرد لە وڵاتان دا و لایان دا لەپەرستن و گوێ ڕایەڵی خوا بۆ پەرستنی شتی تر کە هیچی بەدە ست می یە و زیانی زۆرە و هیچ سوودی نی یە لەپاش باسی ئەوانە ئنجا وێنە و مەتەڵی ئەهێنێتەوە بۆ ئەو بت پەرستانە و پشت بەستنیان بە بتە بێ نرخەکانیان، مەتەڵیان بۆ ئەهێنێتەوە بە جاڵجاڵۆکە و وەو دەوار و خانووە بێ سوودەکە دروستی ئەکات بۆ خۆی و پشتی پێ ئەبەستێ، ئەفەرموێ: ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا﴾ وێنەی نایابی کەسانێ کە بڕیار ئەدەن

بێجگە لە خوا چەند خۆشەویست و پەرستراوێکی تر بۆ خۆیان و پشتی پێ ئەبەستن، وەکو وێنەی جاڵجاڵۆکە وایە کە خانوو و ماڵێکی بۆ خۆی فەراهەم هێناوە، بەڕاستی وێنە و شێوەیەکی نایابی ڕاست نیشان ئەدات بۆ ئەو هەموو هێزەی لەم بوونەوەرەدا هەیە و خەڵکی پشتی پێ ئەبەستێ و بەدیمەن و ڕواڵەت شتن و کەچی لە ڕووی ڕاستی دا هیچیان تیا بەسەر نی یە و شایانی پشت پێ بەستن نین، زۆربەی خەڵکی بێ ئاگان لەم بارە ڕاستە، جا لەبەر ئەوە بڕیاری هەڵەیان زۆرە، بە ترازوویەکی خوار و خێچ کێشانە و بەراوردی شت ئەکەن، نرخ دان و ترخ پێ نەدانیان لە جێگای خۆی دا نی یە، نازانن بۆ چ شوێنێ بڕۆن و ڕوو بکەن، ئایا چی وەرگرن و چی واز لێ بێنن؟ لەم کاتەدا هەڵە ئەکەن و هەڵنەخەڵەتێنرێن، هێزی حوکمڕانی و کاربەدەستی ئەیانخەڵەتێنێ و لایان وایە دەسەڵات و دارە و ئەتوانێ شت بکات لە وڵات دا، لەبەر ئەوە ئومێد و نائومێدی یان ئەبەیتێ پێیەوە، بیم و ترسی لێ ئەکەن و دائەچڵەکێن لێ ی، بە هەموو جۆر ئەیانەوێ ڕازی بکەن لە خۆیان، بەڵکو دووچاری سزا و ئازاریان نەکەن، یان سایە و پەنایەك بۆ خۆیان مسوگەر بکەن و باکیان لە هیچ شتێ نەبێ!! هەروەرها هێزی سامان و دارایی هەڵیان ئەخەڵەتێنێ، بێگومان وا ئەبەن کە هێزێکی زاڵە بەسەر ئادەمی و ژیان دا، ئەچن بە پێشوازی یەوە، بە هەموو سۆز و هێزێکی زاڵە بەسەر ئادەمی و ژیان دا، ئەچن بە پێشوازی یەوە، بە هەموو سۆز و هێزەوە تێ ئەکۆشێن بۆ دەست کەوتنی تا بەرز ببنەوە و زاڵ ببن بەسەر خەڵك دا و ژێر دەستیان بکەن، هێزی زانین و زانیاری ئەیانخەڵەتێنێ و گومان وا ئەبەن کە ئەم هێزە بنەڕەتە بۆ هەموو هێزی تر، بەمە هەموو شتێ دەست کەوت ئەبێ لەم جیهانەدا، لەبەر ئەوە بە هەموو ملکەچی یەکەوە بە دڵ ئەوەستن بەرامبەری. ئەو هێزە ڕواڵەتی یانە خەڵکی ئەخەڵەتێنن لە هەر شوێنێك دا بن و لای هەرکەس بن، لای گەل و کۆمەڵ بن، یان لای یەکەیەکە، یان لای میری دەوڵەت، خەڵکی ئەگەڕێت و چەرخە ئەکەن بە دەوری ئەم هێزانەدا، تەپ و کۆ پەلامالای بۆ ئەدەن و خۆیان بۆ فڕێ ئەدەن و ئەخەن بەسەری دا، بە وێنەی پەپولە کە چەرخە ئەکات بە دەوری ڕووناکی

چرادا، پەلامار ئەدات و خۆی ئەهاوێ بۆ ناو ئاگر!! خەڵکی بەم هێزانە هەڵئەخەڵەتێن و تاقانە هێزی ڕاستەقینەیان لە بیر ئەچێ کە تەنها ئەوە شتە لە ڕووی ڕاستی دا و دروست کەر و داهێنەری هەموو هێزەکانی ترە و ئەو خاوەنیانە و، ئەو ئەیاندا، ئەو ڕاگیریان ئەکات و بەکاریان ئەهێنێ، ئەو ژێربار و ژێر دەستییان ئەکات هەرچۆن بیەوێ و لە هەرکوێ ویستی، خەڵکی نازانن و لەبیریان نی یە کە پەنا بردن بەم هێزە بچووکە دروست کراوانە ئیتر لای هەرکەس بن و لەدەستی هەرکەس دا بن، پەنا بردن بەمانە بە وێنەی پەنا بردنی جاڵجاڵۆکەیە بە ماڵە بێ هێزە لاوازەکەی خۆی، ئەو گیانلەبەرە بێ هێزە لاوازە کە نە لەلایەن خۆیەوە پارێزەری هەیە و نەلەلایەن خانوو و دەوارەکەیەوە، بێگومان لەم بوونەوەرەدا هیچ پاراستنێ نی یە جگە لە پاراستنی خوا، هیچ پەنا و قەڵایەکی نی یە جگە لە پەنا و قەڵای خوا کە هیچ شتێك کاری لێ ناکات. ئەم شتە ڕاستەقینەیە کە قورئان زۆر بە گرنگ گرتوویەتی و ئەیەوێ جێگیر و دامەزراوی بکات لە دەروونی ئیمانداردا، تا بەهۆی هەموو هێزێ بوەستێ لە ڕێگای دا، بەهۆی ئەوەوە بتوانێ هەموو کەشخە و مل هوڕی و سەرکێش و زۆردار و ستەمکارەکان پێ شێل بکات، هەموو قەڵا و بەندی خانەکان بڕوخێنێ و لێ یان دەرچێ ئەم باوەڕ و شتە ڕاستەقینە جێگیر بووە لە دەروونی خواناسان و پیاوە هەڵکەوتووەکانی ئەم ئوممەتەدا، دڵەکانی ئاوەدان کردنەوە، تێکەڵی خوێنیان بوو، لەگەڵیان گەڕا بە هەموو ڕەگ و دەمارانی دا، وشە و وتارێ نەبوو کەبەدەم و زمانی ڕووت بوترێ، لە شێوەی ڕاستەقینە جگە لە هێزی خوا، خاوەن دارایی و کار بەدەستی تەنها هینی خوایە، جگە لەوە هەمووی بۆش و بێ هێز و بێ نرخ و لاوازە، هەرچەند بەدیمەن و ڕواڵەت بەرز و زاڵو بلند و سەرکەوتوو بێت، هەرچەند و هەر ئەنداز هۆی هێز و زۆر داری بەلاوە بێت، بێگومان هەموو خاوەن هێزەکان لەم بوونەوەرەدا بە وێنەی جاڵجاڵۆکەن، هەموو هێز و هۆی هێزەکان بە وێنەی دەوار و دەزوی دەوارەکانی یەتی،

﴿وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِۖ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٤٢﴾﴾

**﴿وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِۖ﴾ بێگومان بێ هێز و لاواز تری هەموو ماڵەکان ماڵی جاڵجاڵۆکەیە ﴿لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر بت پەرستەکان زانا بوونایە و شتیان بزانی یابە، ئەیانزانی کە کاری ئایینەکەیان و بێ سوودی و بێ نرخی لەو ڕادەدایە، یان ئەگەر زانا بوو نایە بت پەرستی یان نەئەکرد و ئایینی وایان نەئەگرتە گەردن، ئەو کەسانەی کە ڕێبازی پێغەمبەران ئەدەنە بەر و بانگی خەڵکی ئەکەن بۆ ڕێگای خوا و ئینجا دووچاری سزا و مەینەت دێن و بە هەموو جۆرە هێزێ بەرگری ئەکرێن و هەوڵیان لەگەڵ ئەدرێ بۆ کۆتایی هێنان و ترازانیان لەو ڕێگا ڕاستەی داویانەتە بەر، زۆر شایانە بۆ ئەو کەسانە کە بوەستن لەبەر دەم ئەم شتە ڕاستە گرنگەدا، هەموو کات لە بیریان بێت و چرکەیەك لە دڵی دەرنەکەن، زۆر شایانە بۆ ئەوانە، لە کاتێك دا بەو هەموو هێزی جیاوازانە بەرەنگاری و بەرگری ئەکرێن، هێزێ پەلاماری ئەداتێ و ئەیترسێنێ، یەکێ تر ئەیەوێ لێ ی دا و ژێر پێ و پێشێلی بکات، یەکێ تر ئەیەوێ هەڵی خەڵەتێنێ و بیکڕێ، ئەو هەموو هێزانە لە حیسابی خوادا و لای خوا بەوێنەی دەزووەکانی ماڵی جاڵجاڵۆکەن، هەروەها کاتێ عەقیدە و باوەڕ ڕاست و دامەزراو بێت، کاتێ خاوەن عەقیدە تێگەیشتبێ لە هێزی ڕاستەقینە و لە هێزە ڕواڵەتی بێ نرخەکانی تر، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍۚ﴾ بێگومان خوا کە ناوی ﴿الله﴾ یە ئەزانێ ە ئاگادارە بەهەر شتێك ئەوانە هاواری لێ ئەکەن و ئەیپەرستن جگە لە خوا و لەو تێپەڕ ئەکەن بۆ پەرستنی..**

**ئەوانە چەند بتێکیان بڕیار داوە جگە لە خوا، خوایش حەقیقەت و بارە ڕاستەقینەکەی ئەوانەی ڕوون کردەوە لەم وێنە و چیرۆکەدا ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ تەنیا خوا خاوەنی هێز و توانایە و زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و لێزان و کاردروستە و هەرچی ئەکات لە جێگا و شوێنی خۆی دایە، تەنیا ئەو بەڕێوەبەری ئەم بوونەوەرەیە و کاروباری ئەبا بەڕێوە، کۆمەڵێ لە بت پەرستەکان کە مل هوڕ و نەفامونەزان بوون گاڵتەولاقرتی یان ئەکرد بەم جۆرە وێنە و وچیرۆکانە کە خوا لەقورئان دا ئەیانفەرموێ بۆ تێگەیاندن ونزیك خستنەوەی شتی دوور وگران لە هۆش وژیریی و دەروونەوە، ئەو نەفامانە ئەیانوت: خوا کەی محمد باسی مێش وجاڵجا لۆکە ئەکات،**

﴿وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ﴾

---

**خوایش فەرموی: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِۖ﴾ ئەووێنە وچیرۆکانە باس ئەکەین بۆ خەڵکی تابەهۆی ئەوەوە تیٚ بگەن لەوشتانەی کەپێویستی هەیە بەڕوون کردنەوەیان، بەڵام ئەو لاقرتی کەرانە لەیەکەم چێن کەئەم قورئانە یان بیست،هەروەها وێنەی ئەوان لەهەموو چەرخ وچینێك داسوودوەر ناگرن لەم وێنەو چیرۆکانە وهەست ناکەن بەسوود وشیرینی یان چونکە نەزانن وخوایش ئەفەرمویٚ: ﴿وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ﴾ هیچ کەس تیٚ ناگات لەو مەتەڵ وچیرۆکانە ولە نرخ و جوانی یان بێجگە لەزانایان، ئینجا لەپاش باسوگێرانەوەی هەندیٚ لە سەر گوزەشتەی ئەوپێغەمبەرانە -سەلامی خوایان لیٚ بێت - کەهەق وڕاستیان پیٚ ڕوون بووەوە، لەپاش هێنانی ئەو چیرۆك ومەتەڵە شێوەی هێزی ڕاستەقینەی نیشان داین لەم بوونەوەرەدا، لەپاش ئەوانەو بەبۆنەی ئەوانەوە باسی دروست کردن وداڕشتنی ئەم زەوی وئاسمانانە ئەکات کەلەسەر بنەڕەتی حەق وڕاستی دامەزراوە، هەمووکاروباری بەحەق وڕاستی ئەڕوا بەڕێوە.ئەوئاسمان وزەوی یەی کەڕژێم ویاسایەکی زۆرورد وڕێك وڕاست ڕەوایان هەیە کەدوا وبەر وپەك کەوتن و وەستانی نی یە، دامەزراو ونەگۆڕاوەو دژی بەگژدا چوون نی یە لەو بوونەوەرە فراوانەدا، بەڵکو یارمەتی وکۆمەکی تێر وتەواوهەیە لەنێوان هەموو بش وپارچە یەکی دا و تەواو کەری یەکترن وپێویستن بەیەکتر، چونکە هەمووی هەق وڕاستە وبەخوا هیش وزانین ولێزانی خوای حەق وڕاست فەراهەم هاتووەو ڕاگیرە، ئەفەرمویٚ: ﴿خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ﴾ خوا ئاسمانەکان وزەوی دروست کرد بەحەقیانەت ونیازی حەق وڕاستی کردووە لەدا هێنان ودروست کردنی، حەق وڕاستی چاودێری کراوە لەهەموو کارو بارێکی دالەگەڵ هەموو بەش وپارچەیەك دا هەق وڕاستی هەیە، ئەو ئاسمان و زەوی یەبە وجۆرە وبەو نیازە دروست کراون نەك بیٚ نیازو بیٚ هودە یان نیازی شتی بیٚ سوود وبیٚ نرخ و ناڕەوا،**

إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٤﴾ اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ وَأَقِمِ الصَّلَاةَ ۖ إِنَّ
الصَّلَاةَ تَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴿٤٥﴾

---

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ بێگومان لەوەدا هەیە بەڵگە وڕابەرێکی ڕوون وگرنگ لەسەر توانین وزانین ولێزانی وکاردروستی خوا، بەڵام ئەو بەڵگە وڕبەرە ڕوونە بۆ هەمووکەس نی یە،بەڵکو بۆ باوەڕ دارانە، ئەوانەی کەدڵیان کراوەتە وەبۆ ئەوهەموو نیشانە وبەڵگە ڕوونانە کەپرژ وبڵاو بووتەوە لەم بوونەوەرەدا بۆ هەرکوێ چاو هەڵخەن بەزۆر وفراوانی دێتە بەرچاویان، ئەوانەی کە دەروونیان ڕووناکە بەڕووناکی باوەڕی ڕاستە قینە هەست ئەکەن بەو بەڵگە ونیشانانە، هەروەها ئەوانەش کە ئامادەن بۆ باوەڕ هێنان و تەنیا داگیرسانێکیان ئەوێ بە وێنەی چرایەکی ڕیك وپێك کە تەنیا داگیرساندنی بمێنێ، ئەوانەش ڕووناکی ئەو بەڵگە ونیشانانە هەست پێ ئەکەن، ئینجا لەدوا دوای ئەوچەرخە وگەڕانە دا فەرمان ئەدات بە پێغە مبەردرودی خوای لێبێت بەدووشت:

١- بە بەردەوامی وهەمیشەیی لەسەر خوێندنی قورئان کە سەرچاوەی شەریعەتە گشتی یە جیهانی یەکەیەتی وهۆی بانگەواز و ڕاگەیاندنی پەیامەکەیەتی وچەك و قەڵغانی بەرگری نەکراو و چار نەکراویەتی بەبەجێ هێنان وڕاگەیاندنی ئەو فرمان وکارە گەورەو گرنگەی کەخراوەتە سەرشانی.

٢- فەرمان دانەبەجێ هێنانی نوێژ بەڕێك وڕاستی کەتو ێشووی بەهێزی ئەوڕێگایە کە داویەتی یەبەر.

ئەفەرموێ: ﴿اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ﴾بەردەوام بە لەسەر خوێندنی ئەوەی کە سروش کراوەتە لات لەو کتێبە گرنگە کە قورئانە تا بەهۆی ئەوەوە نزیك ببیتەوە لەخواوە، تا ئەو سروش کراوە ڕاگیر بکات و بیپارێزێ بۆ هەموو جیهان و ئادەمی هەتا هەتایە، بۆ ئەمەی تا بێت مەبەست و نهێنی یەکانی قورئانی بۆ ڕوون ببێتەوە کە هەرگیز دوایی نایەت، ﴿وَأَقِمِ الصَّلَاةَ﴾ بەردەوام بە لەسەر بەجێ هێنانی نوێژ بە ڕێك و ڕاستی، ﴿إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَىٰ عَنِ

﴿الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ﴾ چونکه بە ڕاستی نوێژی ڕێك و ڕاست بەرگری نوێژ کەر ئەکات لەکاری زۆر ناشیرین وخراپ و لەو کردەوەی کە بێزراوە لەلایەن شەرعەوە لای هەموو ژیری و سروشتێکی تێك نەچوو و ساغ، چونکە نوێژی ڕاستەقینە هۆی یادی خوایە و پەیوەندی یە بەخواوە کە خاوەنەکەی شەرم ئەکات و تەریق ئەبێتەوە لەوەی خۆی چەپەڵ و قیزەون بکات بەو گوناهە پیسانەوە، ئەو نوێژە ڕاستەقینە خۆپاك خاوێن کردنە بۆ خوا و لێبڕانە بۆ خوا کە ئەوەش ناگونجێ لەگەڵ چڵك و ژەنگ و باری ڕەشی قورسی تاوان و بێ شەرعی دا، ئەو وەستان و ڕکوع و سوژدە و هەموو یادو زیکرەی کە لەنوێژ دا بەجێ دەهێنرێت بۆ خوا وەکو چاودێر و پاسەوانێکی بەهێزی لێ دێت و پاسەوانی خاوەنەکەی ئەکات و بەوریای لەگەڵی دەبێت لەهەموو کات و لەگەڵی ئەبێت لەهەمووکات و بارێك دا، ئەوکەسانەی کە بەرداوامن لەسەر نوێژ و خۆیشیان ناپارێزن لە خراپەکاری، ئەوانە نوێژی ڕاستەقینە بەجێ ناهێنن، بەڵکو هەڵئەسن بەدیمەن و ڕواڵەت و شێوەیەکی ڕووتی بێ گیانی نوێژ، ئەوانە – خوا پەنامان بدات – لەوانەن بەو نوێژە دوورتر بکەونەوە لەخواوە وەکو لەم حەدیسەدا کە ئیبن و جەریر ئەیهێنێ لە حەسەنەوە کە پێغەمبەر درودی خوای لێبێت ئەفەرموێ: ﴿من صلى صلاة لم تنه عن الفحشاء والمنكر لم يزد بها من الله إلا بعدا﴾ [1] نوێژی ڕستە قینە بریتی یە لەزیکرو یادی خوا ﴿وَلَذِكْرُ اللهِ اكبَرُ﴾ [2] بێگومان زیکرو یادی خوا گەورەترە لەهەموو شتێك، بەڵکو مەبەست لەهەموو جۆر پەرستن و هەڵسان بەکردەوەی چاك زیکرو یادی خوایە، ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ﴾ خوا ئەزانێ وئاگادارە بەهەر کردەوەیەك کە ئێوە ئەیکەن، هیچ شتێ شاراوە وپۆشیدە نابێ لی ی هیچ شتێکی لێ نا شێوێ وناگۆڕێ، هەموو ئەگەڕێنەوە بۆلای ئەو لە ڕۆژی دوایی دا، کەواتە بەگوێرەی خواهیشی خۆی پاداشت وتۆڵەی کردەوەکانمان ئەداتەوە.

و صلى الله و سلم على سيدنا محمد و آله و صحبه و سلم

---

[1] هەر کەس نوێژێك بکات وبەرگری نەکات لەگوناهی زۆر خراپ و بێ شەرعی ئەوکەسە بەونوێژە دوورتر ئەکەوێتەوە لەخواوە جگە لەدوری هیچ شتێ تر زیاد ناکات.

[2] ئەم ڕستە بەفەرە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە. هەمووشیرینە ئەگونجێن.

ئینجا به بۆنەی فەرماندان بە خوێندنی قورئانەوە ئەڕوات بۆ گەیاندنی پەیوەندی لە نێوان ئەم قورئانە و کتێبە پێشووەکان دا، فەرمان ئەدات بە موسڵمانان کە بە شیرین ترین شێوە بکۆڵنەوە لەگەڵ ئەهلی کیتاب دا - واتە جولەکەو گاور - جگە لەوانەیان کە لایان داوە لە ڕێبازی ڕاستەقینەی تەورات و ئینجیلی ئەسڵی، بوون بە هاوبەش بڕیار دەر بۆ خوا، هەروەها فەرمان ئەدات کە موسڵمانان ئیمان و باوەڕی خۆیان دەربڕن بەهەموو ئایین و کتێبەکانی تر کە لەلایەن خواوە هاتوون، چونکە لەگەڵ قورئان دا یەکن و لە یەك سەرچاوە هاتوون، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ﴾ واتە مەکۆڵنەوە و موجادەلە مەکەن لەگەڵ ئەهلی کیتاب دا مەگەر بە شیرین ترین ڕێگا و شێوە، بەم ڕەنگە توند و تیژیی و ڕەقی بەکار نەهێنن، بەڵکو بەرامبەر ڕەقی و زەبری ئەوان نەرمی بەکار بێنن، بەرامبەر خەشم و ڕقیان ئارام و خۆگرتن و ڕق خواردنەوە بەکار بێنن، لەباتی دەمەدەمێ و ئاژاوەی ئەوان پەند و ئامۆژگاری بکەن. بێگومان بانگ کردن و بانگەوازێك کە نوح - سەلامی خوای لێ بێت - پێی هەڵسا، هەروەها هەموو پێغەمبەرو نێرراوەکانی تری خوا لەپاش ئەو هەتا گەیشتە دواترینی هەمووان پێغەمبەرمان محمد - سەلامی خوا لەهەمووان بێت - ئەو بانگ کردن و بانگەوازانە هەموو یەك شتن لەلایەن تەنها خوایەکەوە هاتوون، یەك مەبەست و ئامانجیان بووە، کە گێڕانەوەی بەندە گومڕا ڕاکردووەکانی خوایە بۆلای خوای خۆیان، نیشاندان و ڕێنموونی یان بۆ تاکە ڕێگا ڕاستەکەی، پێگەیاندن و پەروەردە کردنیان بە پێی ڕاو فەرمانی ئەو و لەسەر بەرنامەکەی ئەو، ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە بە ڕاستی بە هەر پەیام و پێغەمبەرێتی یە بران بۆ هەموو باوەڕداران بە پەیام و پێغەمبەرێتی یەکانی تر، بەم ڕەنگە: هەموو یەك ئوممەت و یەك میللەتن، تەنیا یەك خوا ئەپەرستن، ئادەمی بە هەموو

چەرخ و چینەکانی یەوە دوو تاقمن: تاقمی باوەڕداران کە کۆمەڵی خوان، تاقمی دژ و بێ باوەڕان کە هەموو کۆمەڵی شەیتانن، بەبێ گوێ پێدان بە جیاوازی و دووری چەرخ و شوێنیان، هەموو چین و تاقمێ لەو باوەڕدارانە ئەڵقەیەکن لەو زنجیرە درێژەی کە هاتووە لەگەڵ پەیدا بوون و تەمەنی درێژی ئادەمی دا. ئەمەی کە باس کرا بەندێکی گەورە و گرنگە کە ئیسلامی پێ هاتووەو لەسەری راگیرە، ئەم ئایەتە بڕیارێ ئەدات و بە رێکی دانی پیا ئەنێ، ئەم بەندە گرنگەی لە بیرو باوەڕەکانی ئیسلام پەیوەندی نێوان ئادەمی بەرزتر ئەکاتەوە لەوەی کە تەنیا بریتی بێت لە خوێن یان نەژاد، یان تیرە، یان نیشتمان، یان ئاڵ و گۆڕی سوود و قازانج و بازرگانی و هەر شتێکی تری ئەم جیهان و زەوی یە. بەرزی ئەکاتەوە لەمانە هەموو بۆ گەیاندن و پەیوەندی بەخواوە، کە دەرئەکەوێ و هەستی پێ ئەکرێ لەو عەقیدە و باوەڕەکە رەگەزایەتی و تیرە و بەرەو رەنگی تیا ئەتوێتەوە، نەتەوایەتی و نیشتمانی تیا ون ئەبێت و خۆی ئەشارێتەوە، کات و چەرخ و جێگا و شوێنی تیا چاو نادەن. هیچ نامێنێتەوە جگە لە پەیوەندی بەهێزی نەپچڕاو بە پەروەردگارەوە، جا لەبەر ئەوە ئیمانداران لائەدات و دووریان ئەخاتەوە لە لێکۆڵینەوە و موجادەلەی ئەهلی کیتاب بەو شێوە شیرینە نەبێت کە باس کرا. بۆ روون کردنەوەی بەرژەوەندی و هۆی هاتنی ئەم دواترین پێغەمبەرێتی و پەیامە دوایی یە، بۆ روون کردنەوەی پەیوەندی نێوان ئەم و هەموو پەیام و پێغەمبەرێتی یەکانی پێش ئەم، بۆ تێگەیاندن و دڵنیا کردن لەسەری و پێویستی دەست گرتن بەو شێوە پەیام و بەرنامە دوایی یەی خوا کە رێك و پێکە لەگەڵ هەموو پەیام و بەرنامە رابوردووەکانی تری خوادا، تێرو تەواو کەری ئەوانە بە گوێرەی لێزانی و کاردروستی خوا و ئاگاداری بە پێویست و بەرژەوەندی بەندەکانی، فەرمانی دا بە رەفتار کردن لەگەڵ ئەهلی کیتاب دا بەو جۆرەی کە باس کرا،

إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ ۖ وَقُولُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَأُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَـٰهُنَا وَإِلَـٰهُكُمْ وَٰحِدٌ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿٤٦﴾

---

﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ﴾ جگە لەوانەیان کە ستەمکاری یان کرد، بەم ڕەنگە دەستیان خستە کتێبەکەیان و گۆڕان و لادانیان تیا کرد. لە تاك و تەنیایی خوا لایان دا بۆ بڕیاردانی هاوبەش و ڕۆڵە بۆ خوا، ئەو بەرنامەی ژیانیان تێك دا کە خوا ناردبووی بۆیان، ئەوانەیان کە ئاوا ستەمکاری یان کرد و کۆتایی ناهێنن لەو بارە لارەی وان لەسەری، ئەوانە شایانی ئەوە نین دەمە دەمی یان لەگەڵ بکرێ و شێوەی شیرینیان بۆ بەکار بهێنرێ، ئەوانەن کە ئیسلام جەنگی لەگەڵ کردن، لەپاش دا لە مەدینە کاتێ کە دەوڵەتی ئیسلام پێك هات. بێگومان هەندێ لە دوژمنانی ئیسلام دەم درێژیی یان کرد و فاك و فیکیان خستە ناو دەربارەی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) کە گوایا کاتێ کە لە مەککەدا بوو بت پەرستەکان هەموو لێ ی هەڵسا بوون و دژی وەستا بوون لەو کاتەدا نەرم و نیانی و کردەوەی شیرینی بەکار ئەهێنا لەگەڵ ئەهلی کیتاب دا، ئینجا کاتێ هێزو دەوڵەتی بۆ پەیدا بوو تێ ی پێچان و جەنگی لەگەڵ کردن، بە پێچەوانەی بڕیارو کرداری چەرخی مەککەی!! بێگومان ئەوە درۆیەکی زلی ئاشکرایە دەست هەڵبەستیان کرد، ئەم ئایەتە مەککەیی یە شایەتە لەسەر دەلەسەکەیان، ئەوەتا ئەو لێکۆڵینەوە و موجادەلە شیرینەی کورت هەڵهێناوە، تەنیا بۆ ئەوانەی کە ستەمکار نەبوون و لایان نەداوە لەو ئایینەی خوا بۆی ناردن، لەو تاك و تەنیایی یە پاك و خاوێنەی خوا کە هەموو پەیام و پێغەمبەرەکانی خوا هێنایان و پێ ی هاتن ﴿وَقُولُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَأُنزِلَ إِلَيْكُمْ﴾ ئەوە بڵێن بە ئەهلی کیتاب: ئێمە باوەڕمان هێناوەو باوەڕمان هەیە بەو قورئانەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆلای ئێمە و بەو تەورات و ئینجیلەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆلای ئێوە، ﴿وَإِلَـٰهُنَا وَإِلَـٰهُكُمْ وَٰحِدٌ﴾ خواو پەرستراوی ئێمە و خواو پەرستراوی ئێوە تەنیا یەکێکە، ﴿وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ﴾ ئێمە تەنیا بۆ ئەو خوایە مل کەچین بە پەرستن و گوێ ڕایەڵیی، کەواتە لە ڕووی ڕاستی دا هیچ هۆی بەربەرەکانێ و ئاژاوەو شەڕە قسە نی یە، هەموو تەنیا خوایەکیان هەیە، موسڵمانەکان باوەڕیان هەیە بە کتێبەکەی خۆیان و کتێبەکانی ئەوان کە خوا بۆی ناردن، هەردوو یەك مەبەست و ناوەڕۆکیان هەیە، هەموو بەرنامەکانی یەك زنجیرەیە و هەموو ئەڵقەکانی نووساون پێکەوەو جوێ نین.

﴿وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ﴾ ئەو کتێبەی کە قورئانە ئێمە ناردمانە خوارەوە بۆلای تۆ ئا بەو شێوە گرنگە نایابە کە ڕێك و پێکە لەگەڵ کتێبە پێشووەکان و ناردنە خوارەوەیان لەلایەن ئێمە. بەڵێ لەسەر یەك بارە، هەروەها لەسەر یەك ڕەوشتی نەگۆڕاوە، لە تەنیا ڕێگایەکەوەیە کە خوا سروشی پێ کرد بۆلای پێغەمبەرەکانی[1].

ئینجا خەڵکی بەرامبەری بوون بە دوو تاقم: تاقمێ باوەڕی هێنا، تاقمێك باوەڕی نەهێنا و کافر بوون پێی. وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ﴾ ماتوڵ ئەم قورئانە بەو جۆرە هاتووەتە خوارەوە کە ڕێکە لەگەڵ کتێبە پێشووەکان دا، کەواتە کەسانێك کە کتێبمان پێداون، واتە زانایانی ئەهلی کیتاب لە هەردوو تائیفەکە کە بە ڕێکی باوەڕیان هێنا بەو تەورات و ئینجیلەی کە خوا ناردی، لایان نەدا لەو ڕێگا و بەرنامەی کە خوا بۆی ناردن، کە تەنیا ئەوانە سوودیان وەرگرت لە تەورات و ئینجیل و تەنیا ئەوانە شایانن ناو ببرێن بە ئەهلی کیتاب و کیتاب پێ دراو، ئەو زانایانە ﴿يُؤْمِنُونَ بِهِۦ﴾ باوەڕیان هەیە بەو کتێبەی تۆ و باوەڕ ئەهێنن پێی، چونکە بەهۆی کتێبەکانی تری خواوە بۆیان ڕوون بووەوە کە کتێبی تری خوا دێتە خوارەوە، ئینجا کە قورئان هات ڕێك و ڕاست بوو لەگەڵ کتێبەکانی تردا و بەوە دەرچوو کە هەواڵیان پێ درا بوو ﴿وَمِنْ هَـٰٓؤُلَآءِ﴾ هەروەها لەوانەش – واتە قورەیش یان عەرەب –، ﴿مَن يُؤْمِنُ بِهِۦ﴾ کەسی وا هەیە باوەڕی هەیە پێی و باوەڕ ئەهێنێ

[1] هەندێ لە زانایان ئەفەرمون: وشەی ﴿ذلك﴾ دەست نیشانە بۆ ڕەوانە کردنی پێغەمبەرانی لەوەوپێش و هاتنەخوارەوەی کتێبەکانی تری خوا. واتە هەرچۆنێ ئەوەمان کرد هەروەها تۆیشمان ڕەوانە کرد و کتێبمان ناردە خوارەوە بۆت، ئینجا ئەم ئایەتە بە چەند جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، ئەوانە دەست ئەدەن، بەڵام تەفسیرەکە بە بەهێزتر ئەزانم.

﴿وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَۖ إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴿٤٨﴾

---

﴿وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **هیچ کەس سەرکێشی ناکات و بێ بڕوا نی یە و نابێ بە ئایەتەکانی ئێمە کە روون و رەوان و ئاشکران مەگەر ئەوانەی کە رۆچوونەتە خوارەوە لە کوفر و بێ بڕوایی دا و حەق و راست دائەشارن و نایانەوێ سەرنجی ئایەتەکانی ئێمە بدەن و بیری لێ بکەنەوە تا دانیان پیا بنێن و باوەڕیان پێ بێنن. ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ بەڵگە و نیشانەیەکی روون و زانراوی خۆیان و ئەیخاتە پێش چاویان تا دەرکەوێ بۆیان راستی هاتنی قورئان لەلایەن خواوە و گومانی دەست هەڵبەستی لە دەروون دەرکرێ، ئەفەرموێ:** ﴿وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ﴾ **تۆ ئەی پێغەمبەر لە پێش ناردنی ئەم قورئانەدا هیچ کتێبێکت نەخوێندووەو نەت نووسیوە بە دەستی راستت، واتە نەت توانیوە و باوت نەبووە خوێندنی کتێب و نووسینی، کەواتە ئەگەر تۆ بخوێن و نووسەر بویتایە لەوەو بەر** ﴿إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ﴾ **ئەو کاتە بێ بڕوا دەم بەتاڵ و ناحەق بێژەکان ئەگونجا گومانیان پەیدا بکردایە و دوو دڵ بوونایە و بیان گوتایە: تۆ ئەم قورئانەت لە کتێبی خەڵکی یەوە هێناوە و فێری بووی، بەڵام ئێستا رێگای ئەو گومانەیشیان نی یە، چونکە هەموو ئاگادارن ئەم پێغەمبەرە (ﷺ) ماوەیەکی دوور و درێژ ژیاوە لە ناویان دا بە نەخوێندەواری و بێ ئەمەی بزانێ بخوێنێ و بنووسێ، ئینجا لەپاش ئەوە کتێبێکی وەکو قورئانیان بۆ بێنێ کە هەموو خوێندەوار و نووسەری تیا سەرگەردانە و لەئاستی دەستە پاچەیە، بەڵکو ئەگەر نووسەر و خوێندەواریش بوایە هەر مافی ئەو گومان و دوو دڵی یەیان نەبوو، چونکە ئەم قورئانە خۆی بۆ خۆی شایەتە کە دەست کردو وتاری ئادەمی نی یە و لە سنووری زانین و توانینی ئادەمی دا نی یە، هەرچۆنێ کتێبی بوونەوەرەکەی خوا دەستی هیچ کەس پیای دا ناگات. هەروەها ئەم کتێبەیشی دەستی کەس پیای دا ناگات، بەهیچ رەنگ ناگونجێ لە ئادەمی یەوە دەرچێ، شایانی ئەوە نی یە گومانی وای پێ ببرێ.**

بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾
وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾

---

**﴿بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ﴾ بەڵکو قورئان چەند رابەر و نیشانەیەکی روون و ئاشکران لەدڵ و دەروونی کەسانێ کە زانینیان پێ دراوە لەلایەن خواوە، هیچ شێوان و تێکەڵ و پێکەڵی و گرێ یان تیا نی یە، گومان و دوو دڵییان نی یە تیایان دا.**

**چەند رابەر و نیشانەیەك کە ئەو زانایانە هەستی پێ ئەکەن لە دڵ و دەروونیان دا بە روونی و رەوانی، دڵ و دەروونیان بە ئارامە پێ یان بۆ خۆیان رابەر و نیشانەیەك داوا ناکەن لەسەر راستی ئەو ئایەتانە چونکە خۆیان بۆ خۆیان رابەر و نیشانەن، زانینی راستەقینە کە شایان بێت ناو ببرێ بە زانین، ئەو زانینەیە کە جێگیر و دامەزراو بووە لەو دڵانەدا کە ئەو ئایەتانەی تیایە و جێگیرن، ﴿وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ هیچ کەس بێ بڕوا نییە بە ئایەتەکانی ئێمە و سەرکێشی ناکا لێ یان جگە لە ستەمکاران کە لائەدەن لە حەق و رێگای راست. ئەوانەی کە رۆچوونە خوارەوە لە جەورو ستەم دا و نایانەوێ دان بنێن بە شتی راست دا، هەرچەند روون و ئاشکرا بێت و بەڵگە و نیشانەی بەهێزی هەبێ.**

**ئەم قورئانە بەو جۆرە روون و ئاشکرایە بەڵام ئەو ستەمکارانە کە دەستە پاچە و پەك کەوتوو بوون لە ئاستی هەر سەرکێشی و ملە جەڕەیان بەکار ئەهێنا و هەردەمە بیانوویەکیان ئەگرت. یەکێ لە بیانووەکانیان ئەمە بوو داوای هەندێ موعجیزەی بینراویان ئەکرد وێنەی موعجیزەی پێغەمبەرەکانی پێشوو وەکو دەست و دار دەستەکەی موسا و ئەوانی تر. داوای ئەو جۆرە موعجیزانەیان ئەکرد کە شتێکی کاتی بوون و هەمیشەیی نەبوون تا بەکاری هەموو چەرخ و چینێك بێن، بەڵکو بەریان پێ ئەبڕایەوە و بەرابەری ئەو تەنیا تاقمەیان پێ ئەکرا کە بەچاوی خۆین ئەیان بینین. کەواتە ئەو جۆرە موعجیزانەی شایانی پەیام و پێغەمبەرێتی یەکی کاتین بە وێنەی خۆیان، نە شایانی ئەم پەیام و پێغەمبەرێتی یە دوایی یەن کە شتێکی هەمیشەیی یە هەتا هەتایە، بۆ ئەم پەیامە موعجیزەیەکی هەموو کاتی پێویستە وەکو قورئان کە هەمیشە وا بە پێش چاوەوەو**

ئەخوێنرێتەوە و لەبەر ئەکرێ. ئەم قورئانەی کە هەموو کات تەڕ و تازەیە و نایابی یەکەی هەرگیز دوایی نایەت و دەروازەی غەزنەکەی لەسەر پشتە بۆ هەموو کات و چەرخ و چینێ، لە چەند بارو روویەکەوە موعجیزەیە، چەند رابەرو بەڵگە و نیشانەیەکی روون و رەوانە لە دڵ و دەروونی ئەوانەی کە هۆش و زانینی راستەقینەیان پێ دراوە، هەتا بیریان لێ بکەنەوە باشتر هەست ئەکەن بە نایابی و موعجیزەیی یان، هەست ئەکەن بەو سەرچاوەی کە پێی هاتوون و ئەم زۆر و دەسەڵاتەیان لێ وەرگرتووە. ئینجا با بێینە سەر ئایەتەکە و ئەو بڕو بیانووە بێ جێ یەمان بدا بە گوێ دا، ئەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ﴾ واتە بێ بڕوا و سەرکێشەکانی مەککە وتیان و ئەڵێن: کاشکێ بهێنرایەتە خوارەوە بۆ سەر محمد لەلایەن خوایەکەوە چەند موعجیزەیەك لە وێنەی ئەو موعجیزە ئاشکرایانە کە بەچاو ئەبینرێن. لە وەڵامی ئەوانەدا خوا فەرموی بە پێغەمبەر: ﴿قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ﴾ بڵێ پێ یان: کاری موعجیزەکان و هێنانە خوارەوەیان لای هیچ کەس نی یە جگە لای خوا و بە دەست کەس نی یە بێجگە لە خوا... خوا خۆی ئەزانێ لەکاتی پێویستی پێ یان نیشان ئەدات و دەریان ئەخات بە پێی زانین و بڕیاری خۆی. من بۆم نی یە و رێگام نی یە تەگبیر و راوێژی هیچ شتێك بکەم بۆ خوا. ئەو جۆرە شتانە کارو فرمانی من نییە. ﴿وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ من هیچم بەدەست نی یە جگە لەوەی ترسێنەرێکی ئاشکراو روون کەرەوەم و کارو فرمانی من ئەوەیە و ئەوەم لێ داوا کراوە، من ئەوە بەجێ ئەهێنم و ئیتر خوا خۆی ئەزانێ چی ئەکات...

ئەم فەرمودەیە عەقیدە و باوەڕ پاك و خاوێن ئەکاتەوە لە هەموو تەم و گەرد و گومانێکی ناڕەوا، سنووری توانا و دەسەڵاتی پێغەمبەر روون ئەکاتەوە کە ئادەمی یەکی خواهێش دارو سەربەستە. کەواتە ناشێوێ لەگەڵ توانا و دەسەڵاتی بێ سنووری خوادا، پێغەمبەرێتی کە بەرزترین پلەی ئادەمی یە نزیکی ناکاتەوە لە سنووری خوایەتی یەوە، وەکو زۆر کەس لە گەل و ئوممەتە پێشووەکان دووچاری ئەو دەردە کوشندە بوون بەهۆی ئەو جۆرە موعجیزانەی کە لەسەر دەستیان دا دەرکەوتن و بێ بڕواکانی ئەم ئوممەتە پەلپیان پێ ئەگرت. ئەو سەرکێشانە کە داوای ئەو جۆرە موعجیزانەیان ئەکرد بێ ئاگا بوون لە نرخ و رێزی ئەو چاکە و بەهرەی خوا بەسەریانەوە بەهۆی ناردنی ئەم قورئانەوە بۆ سەریان،

ئەگەر نەفام و نەزان نەبوونايە بەسەر ئەم قورئانەدا داوای ئەو جۆرە موعجیزانەیان نەئەکرد و ئەیانزانی ئەم قورئانەیان بەسە وەکو بەم فەرمودەیە دەست نیشانی بۆ ئەکات کە بە شێوەی پرسیار ئاراستەی ئەکات و مەبەست تانە و تەشەر دانە لەو نەفامە داواکەرانە: ﴿أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ﴾ ئایا ئەوانە کە ئەوەندە نەفام و نەزانن بەسیان نی یە بە رابەر و موعجیزە کە ئێمە ناردومانەتە خوارەوە بۆ سەر تۆ ئەو کتێبە گەورەیە کە قورئانە لە کاتێك دا ئەخوێنرێتەوە بەسەریان دا؟ ئایا بەسیان نی یە کە هەمیشە ئەخوێنرێتەوە بەسەریان دا و تیِّ ئەگەن و بەریان لیّ ئەبڕێتەوە و داماو و دەستەپاچەشن بەرامبەری؟ بەڕاستی قورئان بێجگە لەوە کە موعجیزەیەکی ئێجگار گەورەیە، ناردنەکەی بۆ سەریان چاکە و بەهرە و خەلاّتێکە هەرگیز سوپاسی دوایی نایەت کەواتە ئەوپەڕی بەد نەمەکی و خراپی یە کە ڕێزی شایانی نەزانن و چاولەبەری دەرنەبڕن بۆی و بە گەورەترین بەهرەو چاکەی سەیر نەکەن. ئایا بەسیان نی یە کە بەهۆی ئەم قورئانەوە ئەژین لەگەلّ ئاسمان دا؟ ئەم قورئانە هاتە خوارەوە بۆ سەریان هەوالّی ئەدانیّ بەوەی لە دلّ و دەروونیان دا بوو، وە ئەوەی بە دەوریان دا بوو و بۆی دەرئەخستن، وە ئاگاداری ئەکردن بەوەی کە وان لە ژێر چاودێری خودا، خوا بە گرنگ گرتوونی ئەوەتا هەوالّی کاروباری پێویستی خۆیانیان ئەداتیّ، سەرگوزەشتەیان بۆ ئەگێڕێتەوە. لە کاتێك دا کە ئەمان ئەم خەلّکە لاوازە بیّ هێزە بچووکەن لەناو ئەم مۆلّکە گەورە و فراوانەدا. ئەوان و زەوی و کۆمەلّەی خۆری یەکەیشیان شتێکی وا نین کە چاو بدەن و گرنگ بن لەچاو ئەو بوونەوەرە گەورەی کە مەگەر خوا ئەوپەڕو ئەم پەڕی بزانیّ و بناسیّ... وە هەموو چەند پارچە و زەڕەیەکن ئەسوڕێنەوە لەم چۆلّ و بۆشایی یە گرنگەدا و تەنیا خوا هێشتوونیەتەوە،

إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلْ كَفَىٰ بِاللَّهِ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ شَهِيدًا

ئینجا ئەم بەندە لاوازە بێ هێزانە خوا ئەوەندە رێزی پێداون فەرمودەی خۆی بنێرێتە خوارەوە بۆسەریان و کەچی ئەوان ئەوەیان بەس نەبێ و بەوە دانەمەزرێن!! ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ بێگومان لەم کتێبە گەورەدا هەیە بەهرە و بەزەیی و چاکەی گەورە و گرنگ و پەند و مۆچیاری بەکار بۆ گەل و کۆمەڵێ کە باوەڕدارن و باوەڕ ئەهێنن. بەڵێ تەنیا باوەڕداران و ئەوانەی ئامادەن بۆ باوەڕهێنان بەرهەمی ئەو چاکە و بەهرە و بەزەیی یەیان دەست کەوت ئەبێ لە دەروونی خۆیان دا، تەنیا ئەوان پەند وەرئەگرن و بیر ئەکەنەوە لە لوتفی خوا و منەتی گەورەی خوا بەسەر ئادەمی یەوە بەهۆی ناردنی ئەم قورئانە گەورەیە، تەنیا ئەوان هەست ئەکەن بە کەرەم و دەست گوشایی خوا کە بانگی بەندەکانی خۆی ئەکات بۆ سەر ئەم خوان و زیافەتە گەورە و فراوانەی کە رازاندویەتیەوە بۆیان لە کاتێك دا کە ئەو بەرز و بڵند و گەورەیە و هیچ پێویستی بە هیچ کەس و بە هیچ شتێك نی یە... تەنیا ئەوانە سوودی راستەقینە وەرئەگرن لەم قورئانە، چونکە ئەژی لەدڵ و دەروونیان دا، وە قاپی غەزنە و گەوهەرەکەی خۆیان بۆ ئەکاتەوە و بەشداریان ئەکات لێ ی، شوعلە ئەداتەوە لەناو گیان و رۆحیان دا بە ناسین و زانین و رووناکی. بەڵام ئەوانەی کە باوەڕیان نی یە و بێ بڕوان و هەست ناکەن بە هیچێ لەوانەی کە باس کران، بەهۆی ئەوەوە قورئان بەسیان نی یە و چارەسەریان ناکات، کەواتە داوای بەڵگە و نیشانە ئەکەن تا باوەڕ بێنن بەم قورئانە!! ئەو دڵ کوێرە سەمەسا بڕاوانە دڵیان ناکرێتەوە بۆ رووناکی. هیچ سوودی نییە لە هەوڵ و تێکۆشان لەگەڵیان، کەواتە با پێغەمبەر بڕیاری نێوان خۆی و ئەوان واز لێ بێنێ بۆ خوا وەکو بەو جۆرە فەرمانی دا و پێ ی فەرمو: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێ یان: ﴿كَفَىٰ بِاللَّهِ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ شَهِيدًا﴾ بەسە خوا بە شایەت و ئاگادار لە نێوان من و ئێوەدا. خوا ئاگادار و شایەتە بە راگەیاندنی من بە ئێوە ئەوەی پێ ی سپاردووم، شایەت و ئاگادارە بە سەرکێش و بێبڕوایی ئێوە.

يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ وَكَفَرُواْ بِٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ
ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٥٢﴾ وَيَسۡتَعۡجِلُونَكَ بِٱلۡعَذَابِ وَلَوۡلَآ أَجَلٞ مُّسَمّٗى لَّجَآءَهُمُ ٱلۡعَذَابُ

---

چونكه ﴿يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ﴾ ئەزانىٚ و ئاگاداره بە هەرچى وا لە ئاسمانەكان و زەوى دا، شايەتى كەسىٚ كە ئاوا ئاگادار و زانا بێت لە هەموو شايەتى يە گەورەتر و بە نرخ ترە. ئەو خوايە ئەزانىٚ كە ئەوانە لەسەر ناهەق و بەتاڵن، ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ وَكَفَرُواْ بِٱللَّهِ﴾ كەسانىٚ كە باوەڕيان هێناوە بە بەتاڵ، واتە هەموو پەرستراوىٚ جگە لەخوا، وە كافر بوون بە خواو باوەڕيان پىٚ نەهێنا بەو جۆرو شێوەى خوا ئەيەوىٚ و پێغەمبەر (ﷺ) رايگەياندووە. ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾ تەنيا ئەوانە زيانكەر و رەنجەڕۆن. ئەوانەن زيان كەرى راستەقينەن، زيان كەرى هەموو شتێكن، زيان كەرى هەردوو جيهانن. زيان كەرى خۆيانن و خۆيان لە كيس چوو. زيان كەرى بەرهەمى رێنموونى پەند و مۆچيارى خوان، زيان كەرى رێك راوەستان و دامەزران و ئارامى دڵ و رووناكى گيان و دەرونن.

بەڕاستى بڕوا بە خوا بەو شێوەى خوا ئەيەوىٚ دەست كەوتێكى زۆر گەورە و گرنگە. ئەجرو پاداشتى خوا لەسەرى زيادە منەت و چاكە و بەهرەيەكە لەلايەن خواوە، چونكە ئەو باوەڕە خۆى هۆى ئارامى دڵ و دەروونە و رێك راوەستان و دامەزران لەسەر رێگاى راست و دامەزراوى لەكاتى رووداو و بەسەرهات دا، باوەڕە بە پشتيوان و دڵنيا بوونە بە پەنا و يارمەتى پاشە رۆژى چاك و كامەرانى. بێگومان دەست كەوتى گەورە و گرنگ ئەم هەموو بەرهەمەيە، بىٚ بڕواكان بىٚ بەشن لەم هەموو خێرو بێرو پيت و فەڕە بێجگە لە دوا رۆژى رەش و سزاى ئاگرى نەبڕاوە و بەدبەختى، كەواتە ئاشكرايە تەنيا ئەوان زيانكەرو رەنجەڕۆن. ئينجا هەميتر ئەدوىٚ لەو بىٚ بڕوايانە لەبارەى پەلەنانەوەيان بەو سزاى كە پێغەمبەر (ﷺ) هەڕەشەى لىٚ كردن پێى، ئەفەرموىٚ: ﴿وَيَسۡتَعۡجِلُونَكَ بِٱلۡعَذَابِ﴾ ئەوانە كە تۆ ئەياترسێنى بە سزاى خوا پەلە ئەنێنەوە لە تۆ بە هاتنى ئەو سزايە.

ئەو بىٚ بڕوايانە هەڕەشە و ترساندنيان ئەبيست و هيچ سزايش نەئەهات و دووچار نەئەبوون، نەيانزانى كە مۆڵەت دراون و هۆى مۆڵەت دانەكەيشيان چى يە؟ بەهۆى ئەوەوە بە

لاقرتی یەوە و بە شێوەی بەر لێ برینەوە پەلەیان ئەنایەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) و ئەیانگوت: کوا بۆ ئەو سزایە نەمات، ئەگەر راست ئەکەیت ئەو سزایەمان بۆ بێنە. خوای گەورە خۆی باش ئەزانێ هۆی مۆڵەت دان و دواخستنی سزاکەیان چی بووە؟ بەلاَم ئێمەیش ئەزانین بەچەند شتێ کە شایانە بکرێن بەهۆی ئەو مۆڵەت دان و دواخستنە:

١- ئەو کەسانەی کە سەرکێشی بەکار ئەهێنن بەرامبەر ئایین و فەرمانی خوا و پشتی تێ ئەکەن و بە هیچ رەنگ ناگەڕێنەوە بۆلای خوا، ئەو کەسانە ئەبن بە جێگای خەشم و قاری خوا، ئەو کاتە بە مەرام و ئارەزووی خۆیان خوا بۆیان رێك ئەخات لەم جیهانەدا و هۆی گومرایی یان بۆ رێك ئەخات. لە زمانی شەرع دا ئەو بۆ رێك خستن و دواخستنە پێی ئەوترێ: (استدراج).

٢- ئەوە ئەبێتە تاقی کردنەوە بۆ باوەڕداران و هەرکەس لەو تاقی کردنەوەدا دەرچێ پاڵفتە ئەبێ و هەموو ژەنگ و چڵك و چەپەڵی ئادەمی یانەی نامێنێ، ئەوانەی کە دەرناچن و قەڵبن یا دەرکەون و ئاشکرا بن.

٣- لەناو ئەو بێ بڕوایانەدا هینی وا هەیە خێرو چاکەی تیا هەیە، پاش ئەوە راست و درۆ و هەق و ناهەقی بۆ دەرکەوت ئەگەڕێتەوە. کەواتە ئەو سزایە ئەبێ تەفرە بخرێ و دوا کەوێ تا ئەوانە بگەڕێنەوە.

٤- هەرچەند ئەو تاقم و چینە هەڕەشە لێ کراوە شایان بن بۆ سزا و لەناو بردن، بەلاَم رۆڵە و نەوەیان رێبازی ئەوان نادەنە بەر و ئەچنە ریزی کۆمەڵی خوا. کەواتە سزای ئەوان دوا ئەخرێ و لە ریشە ناهێنرێن تا ئەم رۆڵە و نەوەیانە پەیدا بن، ئیتر جگە لەم هۆیانە خوا ئەزانێ رەنگە چەند هۆی تر هەبێ ئەو ئەزانێ و ئێمە نازانین. بەکورتی هەمو کارو فرمانی خوا دەست نادات بۆ دواو بەر و هەموو شتێ لای خوا کات وماوەی دیاریی کراوی خۆی هەیە. ﴿وَلَوۡلَآ أَجَلٞ مُّسَمّٗى لَّجَآءَهُمُ ٱلۡعَذَابُ﴾ ئەگەر ئەو ماوە ناوبراو و دیاریی کراوە نەبوایە بۆ سزای ئەوانە بێگومان سزاکەیان بۆ ئەهات... واتە ئەو سزایە هەر دێت بەلاَم لەکاتی دیاریی کراوی خۆی دا. لەکاتێك دا دێت کە ئەوان ئاگایان لێ ی نی یەوچاوەڕوانی ناکەن و هەست بە هاتنەکەی ناکەن، چونکە لەناکاو و کوتوپڕێکا دێت،

وەكـو ئەفـەرموێ: ﴿وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ سـوێند بـەخوا ئـەو سـزايەيان بـۆ دێ لەناكاودا و بە كوتو پڕی لەكاتێك دا كە هەست بە هاتنی ناكەن پێش هاتنەكەی.

ئەو يەكەم چینە كە پەلەيان ئەنايەوە بە هاتنی سزای خوا و بەدی هاتنی هەڕەشەی لەپاش ماوەیە سزای ئەم جیهانەیان بەچاوی خۆیـان بینی لە (بدر) دا و بینی یان كە چۆن خـوا بەڵێنی خـۆی بـەدی هێنـا و هێـزی ئیسلامی سەرخـست و هێـزی كـوفرو بت پەرسـتی شكاند و سەربەرە و ژێری كرد.

لەپاش هەڕەشە لێ كردنیان بە سزای ئەم جیهانەیان كە كوت و پڕ ئەدات بەسـەریان دا، ئینجا بێزاری دووبارە ئەكاتەوە لەسەر پەلە نانەوەیان بە هـاتنی سزا لـە كاتێك دا كە ئـەوان ئاگایان لە خۆیان نی یە و دۆزەخ لە كەمینایە بۆیان و دەوری داون، ئەفەرموێ: ﴿يَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ﴾ پەلـەت لـێ ئەنێنـەوە بە هـاتنی سزای ڕۆژی دوايـی كـە ئەیانترسـێنێ پـێی. ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ﴾ [1] لەكاتێك دا كە بە ڕاستی دۆزەخ چوار دەوری كافرەكـانی داوە. واتـە چوار دەوریان ئەدا لە ڕۆژی دوايی دا بەڵام بە شێوەی ئێستا فـەرموی بە پـێی بـاوی قورئان كە وێنەی شتی ڕابردوو یان داهاتوو حازر و ئامادە ئەكات و وێنەو پۆشاكی ئێستای ئەكات بە بەرا و ئەیخاتە بەرچاو، وەكو ئێستا ببێ و ئامادە بێت. بەڕاستی ئـەوەش زۆر بەنرخ و پڕ سوودە بۆ كاركردن لەدڵ و دەروون دا، بەڕاستی لەوانەیە لێرەدا بە بیستنی ئـەم ڕستەیە بیم و تـرس دەروون داگیر بكـات و دڵ داچڵەكێ و ئـەم لاو لای خـۆی بكـات بـۆ بینـینی دۆزەخ، هەروەها پەلە نانەوەكەی ئەوان بە ناڕەواتر و بێزار تر نیشان ئەدات، هەڵخەڵەتاوی و نـەفامی یـان ڕوون تـر ئەكاتـەوە، واتـە ئەوەنـدە نـەفام و بـێ ئاگـان دۆزەخ چـوار دەوری داون و ئـەو خەریكە هەڵیان لوشێ و كەچی ئەوان پەلە ئەنێنەوە بۆ سزاكەی، بێجگە لـەوەش ڕابـردوو و داهاتوو بۆ ئێمەیە و بە پـێی فام و زانینی ئێمەیە، بۆ خوا و بەلای خـواوە و بە پـێی زانینی خوا هەموو شت حازرو ئامادەیە بێ جیاوازی.

---

[1] شوێنەكە شوێنی ڕاناوە، واتە (بهم) لەباتی (بالكافرين) دا بەڵام بەم جۆرەی فەرمو لەبەر لەكەدار كردنیـان بـە پـیس ترین لەكە كە كوفرە و جاڕی ئەو سیفەتە پیسەیان لێ بدات. هەندێ ئەفەرمون مەبەست چوار دەور گرتنی داهـاتوو نـی یە، بەڵكو مەبەست ئەوەیە: دۆزەخ ئێستا وەكو چوار دەورگریـان وایـە چـونكە هـۆی سـزاكەی دەوری داون. بـەجۆرێ تریش وتراوە هەموو ئەگونجێن.

ئینجا شێوەیەکی نێجگار سامناکیان ئەخاتە پێش چاو. شێوەی هاتن و داگیر کردنی سزای ئەو دۆزەخەی کە دەوری داون و ئەمانیش لەبەر نەزانی و بێ هۆشی یان پەلە ئەنێنەوە بۆی. ئەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ يَغۡشَىٰهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِن فَوۡقِهِمۡ وَمِن تَحۡتِ أَرۡجُلِهِمۡ﴾ دۆزەخ دەوریان ئەدات لە رۆژێك دا کە سزا ئەدات بە سەریان دا و داگیریان ئەکات لەلای سەروویانەوە و لەژێر پێ یانەوە. واتە لە هەموو تەرەف و لایەکیانەوە. جا با بیریٚ بکەینەوە لەو کات و رۆژە سەختە کە زمان ناگات بە روون کردنەوەی رادە و پلەی سەخت و بەتینی دا. خوا پەنامان بدات بە بەزەیی خۆی لە سزای ئەو رۆژە. سەرباقی ئەو ئاگر و سزایە کە لە هەموو لایەکەوە روویان تیٚ ئەکات و لەو کاتەدا کە ئەسوتێنرێن تەشەریان لیٚ ئەدریٚ و بیٚ ئابروو ئەکرێن ﴿وَيَقُولُ﴾ خوا ئەفەرمویٚ پیٚ یان، یان ئەو مەلائیکانەی کە کارو فرمانیان بەدەستە: ﴿ذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ بچەژن سزاو تۆڵەی ئەو کردەوەی کە لە دنیادا کردتان... ئەمە بوو دوا رۆژ و بەرهەمی پەلە نانەوەکەیان و لاقرتی کردنیان بە ترسێنەر.

لێرەدا واز ئەهێنیٚ لەو سەرکێشە بیٚ بڕوا و بیٚ شەرمانە بەو شێوە سزا سەختەوە: بۆ ئەمەی لایەك بکاتەوە بۆلای باوەڕدارەکان کە ئەو بیٚ بڕوایانە سزایان ئەدان لەسەر باوەڕ هێنانەکەیان و ئەیانویست بەرگری یان بکەن لە پەرستنی خوای خۆیان... لایەك ئەکاتەوە بۆلای ئەوانە و بانگیان ئەکات بۆ ئەمەی بە ئایینەکەیانەوە هەڵبێن و راکەن لەدەست ئەو بیٚ بڕوایانە و لە وڵاتەکەیانەوە بڕۆن بۆ وڵاتێکی تر، عەقیدە و ئایینەکەیان رزگار بکەن. بانگیان ئەکات بە بانگ کردنێك کە بارانی سۆز و بەزەیی و خۆشەویستی و چاودێری لیٚ ئەباریٚ، بە شێوەیە کە دەماری دڵیان ئەهێنێتە جۆش و لەرزە.

ئەفەرموێ: ﴿يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی بەندەیانێکم کە باوەڕتان هێناوە. ئەو خوایە کە پەروەردگاری دڵ و دەروونەکانە و ئاگادارە بە هەموو کاروباریان و زانایە بە هەموو پەنهانی و ئاشکرایان... ئەو خوایە بانگ ئەکاتە ئەو دڵ و دەروونانە بەم شێوە نەرم و ناسك و شیرینە، ئەم بانگە خۆشەویستەیان ئاراستە ئەکات: ئەی بەندەکانم کە باوەڕتان هێناوە: بانگیان ئەکات بەو جۆرە لەکاتێك دا کە داوایان لێ ئەکات بۆ دەرچوون و کۆچ کردنیان بە ئاین و عەقیدەکەیانەوە، بۆ ئەمەی لە یەکەم جارەوە خۆیان و رادەی خۆیان بناسن و بزانن کە بەندەی تایبەتی خوای خۆیانن. ئینجا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ﴾ بێگومان خاك و وڵاتی من پان و فراوانە. واتە ئێوە بەندەی خۆمن و خاك و وڵات هینی خۆمە. پان و فراوانە بۆتان. کەواتە چی ئێوەی راگیر کردووە لەو شوێنە تەنگ و دڵ تەنگەی کە وان تیای دا، سزا و ئازار ئەدرێن لەسەر ئاین و عەقیدەکەتان، ناتوانن خوای خۆتان بپەرستن تیای دا؟ ئەو شوێنە تەنگ و دڵ تەنگە بەجێ بێڵن ئەی بەندەکانم و بێن بۆ خاك و وڵاتە فراوانەکەی تری من، کە بەهۆی ئەوەوە خۆتان و ئاینەکەتان رزگار ئەبن، ئازاد و سەربەست ئەبن لە خواپەرستی یەکەتان دا ﴿فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ﴾ خاك و وڵاتی من زۆر و فراوانە کەواتە ئەگەر لە شوێن و وڵاتێك دا پەرستنی منتان بۆ تایبەتی و پاك خاوێن ئەکرێ دەی دەرچن بۆ خاك و وڵاتێکی ترو لەوێ بە تایبەتی و پاك و خاوێنی من بپەرستن. بێگومان بەجێ هێشتنی نیشتمان زۆر گرانە لەسەر دڵ و دەروون. داخ و دڵتەنگی یەکی بەتینی هەیە لەبەر ئەوە کاتێ کە داوای کۆچ کردنیان لێ ئەکات بەو شێوە شیرینە بانگیان لێ ئەکات ، خۆشی و فراوانی وڵاتیان ئەخاتە پێش چاو، واتە ماتوڵ وڵات هەمووی هینی خوایە، کەواتە باشترین وڵات و شوێن ئەوەیە کە بە ئاسانی خواپەرستی تیا بکرێ، کەواتە نەبێ دڵتەنگ نەبن لە بەجێ هێشتنی وڵات و نیشتمانێ کە رێگای پەرستنی خوای تیا نەبێ بە خۆشی و ئازادی. ئینجا ئەو کەسەی بیەوێ کۆچ بکات لەو جۆرە وڵاتانە بێگومان مەترسی مردن رووی تێ ئەکات لە دوو لاوە: یەکەم: لە لایەن ستەمکارانەوە کە دژی خواپەرستی و خوا پەرستانن و بێگومان بەرگری ئەکەن لەو کۆچ کردنە.

كُلُّ نَفْسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ
ٱلۡجَنَّةِ غُرَفٗا تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ نِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ
يَتَوَكَّلُونَ ﴿٥٩﴾ وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٖ لَّا تَحۡمِلُ رِزۡقَهَا ٱللَّهُ يَرۡزُقُهَا وَإِيَّاكُمۡۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦٠﴾

---

**دووەم:** مەترسی لە ڕێگا و بان تا ئەگاتە ولاتی کۆچ بۆ کراو و لەبەر ئەوە ئەم فەرمودەیە ئاراستە ئەکات: ﴿كُلُّ نَفْسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۖ﴾ هەموو کەس مردن ئەچەژێ ﴿ثُمَّ إِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ﴾ لەپاش ئەوە ئێوە تەنیا بۆلای ئێمە ئەگەڕێنەوە. واتە مردن شتێکی حەتمی یە و ئەبێ هەر ببێ، لەهەر شوێن و ولاتی، هیچ کەس نازانێ مردنەکەی چۆن ئەبێ، کەواتە ماقی ئەوەی نی یە ئەوەندە سەری لێ بکرێتەوە و بە بگیرێ. خەڵکی کە کۆچ بکەن بۆلای خوا ئەڕۆن، وان لە زەوی و خاکی فراوانی خوادا و هەموو ئەگەڕێنەوە بۆلای خوا لە دواترین گەردش و چەرخدا، هەموو بەندەی خوێنی هەمووشیان ئەگەڕێنەوە بۆلای خوا لە هەردوو جیهان دا.

لەپاش ئەم هەموو دڵنەوایی یە ئیتر باوەڕدار چی ئەوێ و چی داوا ئەکات؟ بێگومان باوەڕداری راستەقینە زۆر دڵخۆش و دڵئارامە و مەترسی و دڵە لەرزەی نامێنێ. بەڕاستی باوەڕداری راستەقینە ئەبێ چی بوێ؟ خوا بەڵێنی پێداوە کە کاتێ لەبەر خوا نیشتمانێکی بەجێ هێشت و کۆچی کرد شوێنی خۆش و فراوانی ئەداتێ لە زەوی دا، ئەو خانوو و ماڵەی بەجێ ئەهێڵێ لەباتی ئەوەش پاداشتی ئەداتەوە بەو جێ و شوێن و کۆشکەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ غُرَفٗا تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کردەوە باشەکانیان بەجێ هێناوە بێگومان ئەوانە دائەنێین و نیشتەجێیان ئەکەین لە بەهەشت دا لە چەند کۆشك و قەسرێکی گرنگ دا کە رووبارەکان هاتوچۆ ئەکەن و دێن و ئەچن بە ژێریاندا، ئەوانە دائەنێین و نیشتەجێیان ئەکەین لەو بەهەشت و کۆشکانەدا کە هەمیشەیی ئەبن تیایان دا بێ بڕانەوە. ئینجا دەست نیشان ئەکات بە چەند سیفەتێکی بەرز بۆیان کە هۆی ئەو پاداشتە گەورەیە، ئەفەرموێ: ﴿نِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ﴾ ئای چەند چاکە ئەجرو پاداشتی ئەوانەی کردەوە چاکەکانیان بەجێ هێناوە، کە ئەجرو پاداشتەکەیان ئەو

بەهەشت و کۆشکانەیە ﴿ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ کە ئەوانە کەسانیٚ بوون خۆیان گرت لەسەر سزاو ئازار و تەنگی یە کە دووچاریان بوو لە ریٚگای خوادا و لەسەر ئایینی خوا. لە هەموو کاروبار و بەسەرهات و رووداویٚك دا پشتیان تەنیا بە پەروەردگاری خۆیان بەست و هەموو شتیٚکی خۆیان حەواڵەی ئەو کرد. بە دەربڕینی ئەو سیفەتانەی بوویان هانیان ئەدات و دامەزراویان ئەکات. بەڕاستی باوەڕداری راستەقینە بەو مەدح و سەنایە ئەکەویٚتە سۆز و پەرۆشیٚکی بەتین، دڵ و دەروونیان بەهیٚزتر و دامەزراوتر و سوور تر ئەبیٚ لەسەر فیداکاری و خۆ بەخت کردن لە ریٚگای خوادا. بیٚگومان لەپاش کۆچ کردن و بەجیٚ هیٚشتنی هۆی رۆزی و ژیان و غەم و خەتەرەی نەبوونی و برسیٚتی و تەنگ و گوزەرانی روو ئەکاتە دڵ کەواتە با کۆچ کەران دڵ خۆش و دڵ ئارام بکریٚن بەم فەرمودە بەفەڕە: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٍ لَّا تَحْمِلُ رِزْقَهَا ﴾ زۆر گیان لەبەر هەیە کە تواناى هەڵگرتنی رۆزی خۆی نی یە لەبەر بیٚ هیٚزی ولاوازی، یان کۆی ناکاتەوە و زەخیرەی ناخا بۆ لەمەو دوای، بە گرنگ نایگریٚ، نازانیٚ چۆن فراوانی بکات بۆ خۆی، نازانیٚ چۆن دەستی پیٚوە بگریٚ و پاریٚزگاری بکات. لەگەڵ ئەوەیش دا: ﴿ ٱللَّهُ يَرْزُقُهَا ﴾ خوا رۆزی ئەدات و لیٚ ی ناگەڕیٚ تا لە برسا بمریٚ. ﴿ وَإِيَّاكُمْ ﴾ هەروەها رۆزی ئیٚوەش ئەدات ئەی ئادەمی یەکان. ئەگەر ئادەمی لای وابیٚ کە خۆی رۆزی خۆی فەراهەم ئەهیٚنیٚ و ئەیدا بیٚگومان زۆر هەڵەیە چونکە رۆزی چەند هۆیەکی هەیە کە بە هیچ رەنگ ئادەمی ئاگای لە پەیدا بوونیان نی یە،چ جای دەسەڵات بەسەریان دا و فەراهەم هیٚنانیان، کەواتە هیچ هۆیەك نی یە بۆ کۆچ کەران بیٚ ئارام بن و غەمی رۆزی بخۆن لەکاتی کۆچ کردن، چونکە ئەوانە بەندەی خوان و کۆچ ئەکەن بۆ خاك و ولاٚتیٚ خوا رۆزییان ئەدات لە هەر شویٚنیٚ بن. هەرچۆنیٚ رۆزی ئەو هەموو گیانلەبەرە بیٚ هیٚزو لاوازانە ئەدات. ﴿ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾ تەنیا خوا بەڕاستی بیسەر و زانایە. کەواتە هەموو لە ژیٚر چاودیٚریی و سەرپەرشتی خوان و هەروا بەرەڵلاٚ ناکریٚن بیٚ کەس و بیٚ دەر. ئا بەم جۆرە چارەسەری دەروونی ئەو کۆچ کەرانەی کرد و بەدەم هەموو نیاز و خەتەرەیەکیانەوە چوو. بۆ هەموو مەترسی یە ئارامی دا بە دەروون. بۆ هەموو ماندوویی یەك رەحەتی و ماندوو دەرچوونی دا. باڵی چاودیٚریی و سەرپەرشتی و ئارامی کیٚشا بەسەریان داو خستنیە پەنای بەزەیی خۆی.

وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٦١﴾ ٱللَّهُ
يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٦٢﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّن نَّزَّلَ
مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً

---

لەپاش ئەم گەردش و گەڕانە لەگەڵ باوەڕداران دا ئینجا ئەگەڕێتەوە سەر هاوبەش بڕیار دەر و بت پەرستەکان، ناڕەوایی هەڵوێست و تێکەیشتنی خۆیان ئەداتەوە بە ناوچاویان دا. ئەوان دان ئەنێن بە پەروەردگاری خوا بۆ ئەم بوونەوەرە و هەموو کاروباری. لەکاتی تەنگانەدا هاوار و لاڵە ئەکەنە لای... کەچی دوای ئەوانە هەموو هاوبەش بۆ ئەو خوایە رەوا ئەدەن، سزاو ئازاری ئەوانە ئەدەن کە تەنیا خوا ئەپەرستن، بە هەموو جۆر ئەیانەوێ هەڵیان گێڕنەوە لەو ئاین و عەقیدە رێك و راستە، چاکە و بەهرەی فراوانی خوایان لەبیر نی یە بەسەریانەوە، بە تایبەتی ئەو یەکەم تاقمە کە ئەم قورئانەیان چوو بە گوێدا، کە ئەوانە بێ باك و بە ئارامەوە لە پەنای ماڵی خوادا بوون و خەڵکی تر بە دەور و بەریان دا ئەتارێنران و بە سزا و تاڵان و بڕۆ. کەچی لە پەنای ئەو ماڵی خوادا ئیمانداران و خواپەرستانیان سزا ئەدا و بێ ئارامیان ئەکردن!! ئەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم﴾ ئەگەر پرسیار بکەیت لە دانیشتوانی مەککە کە بەختەوەر و کامەران بوون لە پەنای ماڵی خوادا. پرسیاریان لێ بکەیت: ﴿مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ ئایا کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کرد، ﴿وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ﴾ خۆرو مانگی ژێر بار کردووە؟ ﴿لَيَقُولُنَّ﴾ بێگومان لە وەڵام دا ئەڵێن: ﴿ٱللَّهُ﴾. واتە خوایە کە ناوی ﴿ٱللَّهُ﴾ یە دروستی کردن و ژێر باری کردن. ئەوانە لە لایەکەوە ئەویان ئەوت و دانیان ئەنا بەو شتە رێك و راستەدا، کەچی لە لایەکی ترەوە – وەکو وترا – بت و دار و بەردیان ئەپەرست، یان مەلائیکە، یا جن و شەیتانەکان، یان مانگ و رۆژ، ئەم پەرستراوانەیان ئەکرد بە هاوبەشی خوا لە پەرستن دا هەرچەند نەیان کردن بە هاوبەش لە دروست کردن و داهێنان دا... دەی ئەم دوو شتە زۆر دژ و پێچەوانەی یەکترن و بە هیچ کلۆج یەك کەوتنیان نی یە، کەواتە زۆر جێگای سەرسوڕمانن. لەبەر ئەوە بە بێزاری و شێوە سەر سوڕمانەوە ئەم پرسیارە ئاراستە ئەکات: ﴿فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾ کەواتە ئایا چۆن ئەوانە لادراون لە پەرستنی خوا بە

تاك و تەنیا لەپاش ئەوە باوەڕیان هەیە و دان ئەنێن بەوەدا کە خوا پەروەردگارە بۆ هەموو شتێك؟!! چۆن لادراون بۆ ئەم باوەڕە تێکەڵ و پێکەڵە سەرسوڕهێنەرە؟!

ئەم چەند ئایەتە شێوەی باوەڕو عەقیدەی ئەو کاتەی عەرەب پیشان ئەدات، وا ئەگەیەنن کە لە بنەڕەت دا لەسەر ئایینی خواپەرستی بوون و لە پاشا لایان داو ئەو تێکەڵ و پێکەڵی یە فەراهەم هات، بێگومان ئەوە راستە چونکە ئەوانە لە نەوەی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم بوون – سەلامی خوایان لێ بێت – باوەڕیان وابوو کە لەسەر ئایینی ئیبراهیمن، بەهۆی ئەوەوە شانازی یان ئەکرد بە باوەڕ و عەقیدەکەی خۆیان، گوێ یان نەئەدا بە ئایینی موسایی و عیسایی یەکان کە لەگەڵیان بوون لە نیوە دورگەدا، لەبەر ئەوە خۆیان بە شوێن کەوتوی ئیبراهیم دائەنا. بێ ئاگا بوون لەو لادان و پڕوپووچی یەی کە تێکەڵیان کردبوو.

ئینجا بۆ ئەمەی بیگەیەنێ کە ئەو خوایەی ئەم داهێنەرە ئەبێ تەنیا ئەو داهێنراو و دروست کراوەکەی بهێڵێتەوە و درێژە بدا بە بوون و مانەوەکەی. بۆ گەیاندنی ئەو مەبەستە گرنگە بە تێهەڵکێش فەرموی: ﴿ ٱللَّهُ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُ لَهُۥٓۚ ﴾ خوا کە ناوی ﴿الله﴾ یە رۆزی فراوان ئەکات بۆ هەرکەس لە بەندەیانی کە خوا خۆی مەیل و خواهیشی ببێ، تەنگ و کەم و کورپشی ئەکات بۆ ئەو کەسەی فراوانی کردووە بۆی، واتە هەندێ جار بە لێشاو پێی ئەداو هەندێ جار کەمی ئەکاتەوە بۆی، یان مەبەست ئەوەیە رۆزی هەندێ کەس فراوان ئەکات و هینی هەندێ کەسی تر کەم و کورت ئەکات. ئەو زۆر و کەم کردنە وەکو هەموو شتی تر بە گوێرەی زانین و ئاگاداری خوایە بەسەر هەموو شتێك دا. خۆی ئەزانێ بەرژەوەندی لە چی دایە و چ کاتێ کاتی چی یە، خۆی ئەزانێ کێ شایانی چی یە؟ چونکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ﴾ بێگومان خوا بە هەموو شتێك زانایە بە تەواوی. شتێکی ئاشکرایە کە رۆزی بەستراوە بە ئاسمانەکان و خۆرو مانگ و ئەستێرە و گەردش و خولانەوەکەیانەوە، هەروەها بەستراوە بەو ئاوەی کە لای سەرەوە دێتە خوارەوە. کەواتە ئەو تێهەڵکێشە هەرچۆنێ ئەو مەبەستە گرنگەی گەیاند کە باس کرا، هەرچۆنێ بەستراوە و پەیوەندی هەیە بە ئایەتی پێشەوە هەروەها بەستراوە و پەیوەندی هەیە بەم ئایەتە پاشەوە کە ئەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ ﴾ ئەگەر پرسیار بکەیت لەو بت پەرستانە ئایا کێ لەلایەن ئاسمان و لای ژوورەوە ئاوێکی هێنایە خوارەوە،

فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ مَوْتِهَا لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٦٣﴾ وَمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ ۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ لَهِىَ ٱلْحَيَوَانُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٦٤﴾

فَإِذَا رَكِبُوا۟ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ

---

﴿فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ مَوْتِهَآ﴾ ئینجا بەو ئاوە زەوی زیندوو کردەوە لەپاش بوون و مردنی ﴿لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ﴾ بێگومان ئەڵێن خوایە کە ناوی ﴿الله﴾ یە ﴿قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: هەموو سوپاس و سەنایە بۆ خوا لەسەر ئەمەی تۆی پاراست لە ون بوون و گومڕایی یە کە ئەو خەڵکەی تێ کەوتووە، یان لەسەر ئەوەی کە قسەت زاڵ و سەرکەوتووە بە مل ئەوان دا و ناچارن ئەبێ وەڵامی ئەم پرسیارانە بە رێکی بدەنەوە و ئەبێ دان بنێن بە پەروەردگاری خوادا، کەواتە هەر بە دەمی نەفامی خۆیان ئاشکرایان کرد، چونکە کردەوەیان پێچەوانە و دژی وتاریانە. ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ وازبێنە لە نەفامی و نەزانی یان لەم بارو رووە تایبەتی یە کە باس کرا، زۆربەی ئەوانە هیچ نافامن و لە هیچ تێ ناگەن بەهۆی ئەوەوە کردەوەیان دژو پێچەوانەی وتاریانە.

ئینجا بەبۆنەی باسی ژیان لەم زەوی یە و رۆزی و هۆی ژیان لەم جیهانەدا. بەم بۆنەیەوە تەرازوویەکی راست و ورد لەبەردەمیاندا دائەنێ بۆ کێشانە و روون کردنەوەی قورس و سووکی هەموو شت. بە پێی ئەو تەرازووە سەرنج ئەدەین لە هەموو ژیانی ئەم جیهانە بە هەموو رۆزی و رابواردنیەوە وەکو گاڵتە و ماقلەی منداڵان وایە لەچاو ژیانی ئەو جیهان دا، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ﴾ ژیانی ئەم جیهانە یەکسەر و بە تێکڕایی هیچ نی یە جگە لە خۆش و رابواردنێکی کەم و کورت کە بە زوویی دوایی دێت و بەجێ ئەهێڵرێ بە وێنەی گەمە و گاڵتەو ماقلەی منداڵان کە بە گرنگ ئەیگرن و شانازی پێوە ئەکەن و کۆ ئەبنەوە لەسەری کەچی ئەوەندەی پێ ناچێ بڵاوەی لێ ئەکەن و بەجێی ئەهێڵن، ﴿وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ لَهِىَ ٱلْحَيَوَانُ﴾ بەڕاستی و بێگومان ماڵ و جیهانی دوایی تەنیا ئەو ژیانی

راستەقینەیە. ﴿لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ﴾ ئەگەر ئەوانە زانا بوونایە ژیانی ئەم جیهانەیان هەڵنەئەبژارد بەسەر ئەودا و دەستیان لەو بەرنەئەدا. بەڵێ بەڕاستی کاتێ تێبینی و سەرنجی ئەو جیهانی تیا نەدرێ. کاتێ تەنیا ئەم مەبەست بێت و ئامانجی هەرە بەرز بێت بۆ خەڵکی. کاتێ کە رابواردنی رووت مەبەست بێت لە ژیان دا. بەڵام ژیانی ئەو جیهان هەر ئەو ژیانی راستەقینەیە. ئەوەندە رێك و پێکە وەکو تەنیا هەر ئەوە ژیان بێت و ئیتر بەس.

مەبەستی قورئان ئەمە نی یە هان بدا لەسەر پشت کردن و واز هێنان لە ژیان و خۆشی ئەم جیهانە کە خوا دروستی کردووە بۆ ئەم ئادەمی یە تا خێرو بێری وەرگرێ. مەبەستی ئەوە نی یە خەڵکی راکەن لەم ژیان و جیهانە و توڕی دەن. بێگومان ئەوە دوورە لە رۆحی ئیسلامەوە، ئیسلام دژی ئەوەیە. بەڵکو مەبەستی قورئان ئەوەیە کە چاودێری و تێبینی ئەو جیهان بکرێ لە ژیانی ئەم جیهانەدا، ئەیەوێ لەم جیهانەدا سنوورو قەدەغەی خوا نەشکێنرێ ئیتر جگە لەوە کابرا چۆن رائەبوێرێ، هەروەها قورئان ئەیەوێ بەندە ئازاد و سەربەست و زاڵ بێت بەسەر ئارەزووی خۆی دا، نەك بەندە و دیلی چوار پەل بەستراوی ئارەزووی ناڕەوای نەفسی خۆی بێت تا لە کەڵکی هەموو پیاوەتی یەك بکەوێ. مەبەستی قورئان ئەوەیە هەرکام لەم دوو جیهان و ژیانە نرخی خۆیان بۆ دابنرێ و زیادە رەوی و کەم و کوڕی بۆ هیچ کام نەکرێ: ئەم جیهان رابواردن و گاڵتەیە، ئەو جیهان ژیانی راستەقینەیە و پڕە لە ژیان.

ئینجا ئەگەڕێتەوە سەر باسی وتارو کرداری دژ و پێچەوانەی بت پەرستەکان. ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا رَكِبُواْ فِي ٱلۡفُلۡكِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ ئەوانە لادراون لە پەرستنی خوا بە تاك و تەنیا و هاوبەشی بۆ رەوا ئەدەن تا لەکاتی خۆشی دا بن مەترسی رووی دا لەو کاتەدا هاوار ئەکەنە خوا بە جۆرێ مل کەچی و ئایینی بۆ پاك و خاوێن ئەکەن و ئەچنە شێوەی ئەو کەسانە کە خواپەرستی راستن و بە تەنیا ناوی خوا ئەبەن و یادی ئەو ئەکەن و هەر لاڵە و نزا لەو ئەکەن.

فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴿٦٥﴾ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا۟ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾

﴿فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ﴾ ئینجا کاتێ خوا رزگاری کردن و له ناو دەری کردن بۆ وشکی و بەر کتوپڕ ئەچنەوە سەر رێگا چەوتەکەیان و هاوبەش بڕیار ئەدەن بۆ خوا.

ئەو لادان و گەڕانەوەیانە سەری لەوەوە دەرئەچێ کە بەدنمەك بن و دان نەنێن بە چاکەی خوا بەسەریانەوە، بە پێی سروشت نەجوڵێنەوە کە تەنیا داوای خواپەرستی ئەکات و رەوای بت پەرستی و هاوبەش بڕیار دان نادا، هەروەها بە گوێرەی ئەو هەموو بەڵگە و نیشانە روونانە رەفتار نەکەن کە هەموو شایەتن لەسەر تاکی و تەنیایی خوا، بەرهەمی لادانەکەیان ئەوانە بوون، هەروەها خەریك بوون تەنیا بەم ژیانی ئێستا و رابواردن بەخۆشی و لەزەتی ئەم جیهانەوە، کەواتە وەکو مەبەستیان لەو لادان و بت پەرستی یە تەنیا ئەوانە بووبێت کە باس کران، جا لەبەر ئەوە ئەو بەرهەمانە بە شێوەی هۆی لادانەکەیان نیشان ئەدات و ئەفەرموێ: ﴿لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ﴾ ئەوانە دوای رزگار کردنیان ئەچنەوە سەر بت پەرستی یەکەیان بۆ ئەمەی کافر بن و دان نەنێن بەو چاکە و بەهرەی ئێمە پێمان دان کە یەکێ لەوانە چاکە و بەهرەی رزگار کردنیان بوو لە خنکان و بیم و ترسی بەهێزی ناو دەریا ﴿وَلِيَتَمَتَّعُوا۟﴾[1] بۆ ئەمەی بە خۆشی رابوێرن بەهۆی کۆبوونەوەیان لەسەر پەرستنی ئەو بتانە و خۆشەویستی نێوانی خۆیان بەهۆی ئەو یەکێتی و کۆبوونەوە و پەرستنە. ﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ ئینجا بەهۆی ئەوەوە لەمەو پاش ئەزانن دوا رۆژی ئەو کردەوە خراپانەیان. ئەزانن چی یان بەسەر دێت کاتێ کە رۆژی دوایی دێت و کاتی تۆڵە و سزادان دێتە پێشەوە.

---

[1] بە پێی تەفسیرەکە (ل) لە هەردوو شوێنەکەدا پێی ئەوترێ: (لامي عاقیبەت). هەندێ تر لەسەر ئەوەن کە هەردوو بۆ فەرماندانە و مەبەست خەشم و هەڕەشەیە، دروستە تەنیا یەکەم بۆ عاقیبەت و دوا رۆژ بێت، دووەم بۆ فەرمان بێت وەکو بەوەش خوێنراوەتەوە. ﴿ولیتمتعلو﴾ هەموو جۆرەکان باشن و ئەگونجێن.

أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ ۚ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَكْفُرُونَ ﴿٦٧﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓ

---

ئینجا چاکەیەکی زۆر گرنگی خوا ئەخاتە پێش چاوی ئەو یەکەم تاقمە کە ئەم قورئانەیان بیست و ئەو چاکەیەش تایبەتی بوو بەوانەوە لەو کاتەدا، ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا﴾ ئایا ئەوانە کوێرن و سەرنجیان نەداوە کە ئێمە شوێنێکی بێ ترس و بەرێزمان بڕیار داوە و فەراهەممان هێناوە کە زۆر شت قەدەغەیە لەوێدا و لە شوێنەکانی تردا قەدەغە نین. واتە شاری مەککە کە ئەوانی تیایە گێڕاومانە بە شارێکی پارێزراو لە تالآن و کوشتن و بڕین و هەموو جۆرە دەست درێژیی یەك، کەواتە دانیشتوانی بە کامەرانی و بێ ترس و بیم ئەژین ﴿وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ﴾ خەڵکی تر بە چوار دەوریان دا ئەفڕێنرێن بە کوشتن و گرتن و تالآن و بڕۆ. بەڵێ دانیشتوانی شاری مەککە بە ئارام و ئاسایش و بێ ترس و بیم ئەژین لە پەنای یەکەم ماڵەکەی خوا لەسەر زەویدا و خەڵکی رێزی لێ ئەگرتن، چونکە هاوسێی خوا بوون، تیرەو تائیفەکانی تر بە دەوریان دا بەر ئەبوونە یەکتر. پەنایان نەبوو لە سایەو پەنای ئەو ماڵەدا نەبێ. کەواتە زۆر جێگای سەرسوڕمانە ئەوانە ئەو ماڵی خوا بکەن بە جێگای بت پەرستی و لەباتی پەرستنی خوا تیای دا دار و بەرد و هەرشتێ تر بپەرستن!!! ﴿أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ﴾ ئایا لەپاش ئەم چاکە ئاشکرای خوا و ئەو بەهرە گەورەیە هێشتا ئەوانە باوەڕ ئەهێنن بە بت و شەیتان و شتی بەتاڵ و پڕوپووچ ﴿وَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَكْفُرُونَ﴾ باوەڕناهێنن و دان نانێن بە چاکە و بەهرەی خوا بەسەریانەوە؟ ئەوانە شتی درۆیان دەست هەڵبەست و رەوایان ئەدا بۆ خوا، ئەوەتا رۆڵە و هاوبەشیان بۆ رەوا ئەدا و چەند سیفەت و نیشانەی ناشایستە و ناشایانیان بۆ دائەنا، ئەوانە ئایین و بیرو باوەڕی راستیان بۆ هات و بڕوایان پێ نەهێنا و دانیان پیا نەنا ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓ﴾ ئایا کێ خاوەن جەور ترو ستەمکارترە لەو کەسەی درۆ هەڵبەستێ دەربارەی خواو بۆی رەوا بدا، یان بڕوا نەهێنێ و دان نەنێ بە ئایینی راستی دا کاتێ هات بۆی، واتە ئەوەندە نەفام و نەزان بوون هەر لەگەڵ ئەو ئایین و پێغەمبەرە راستەیان بۆ هات بە بێ سەر لێ کردنەوە و بیر لێ کردنەوە بڕوایان پێ نەکرد و بە درۆیان دانا و خستەوە.

أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٦٨﴾ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾

﴿أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ﴾ ئایا جێگای نیشتەجێی و مانەوە نی یە لە دۆزەخ دا بۆ ئەو بێ بڕوا ستەمکارانە؟ بەڕێ واللە بێگومان هەیە و بۆیان تاودراوە. ئایا ئەوانە شایانی ئەو جێگا و شوێنە سەختە نین؟ بەڕێ واللە شایانن و هەر ئەوە شایانە بۆیان، چونکە تاوانەکەیان لە سنوور دەرچووە. خوا پەنامان بدات بە بەزەیی خۆی، پەنا ئەگرین لە خوا لە کوفرو ستەمکاری.

ئینجا بەرامبەر باسی سیفەت و نیشانەی خراپان و ستەمکاران و هەڕەشەی سامناك و دوا رۆژی بەدبەختی یان، بەرامبەر ئەوانە باسی هەندێ سیفەت و نیشانەی چاکان ئەکات لەگەڵ بەڵێنی بەرهەم و دوا رۆژی بەرز و بەڕێزی چاکان و پاکان، بەم باسە سورەتەکە دوایی ئەهێنێ و کۆتایی سورەتەکە ئەبەستێتەوە بە یەکەم جار و سەرەتاکەیەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا﴾ کەسانێ کە تێکۆشان ئەکەن لەبارەی ئێمەوەو لە ڕێگای رەزامەندی ئێمەدا سوێند بەخوا ڕێنماییان زیاد ئەکەین و ئەیانخەینە سەر ڕێگا و ڕێبازەکانی خۆمان ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ بەڕاستی و بێگومان خوا بە یارمەتی و کۆمەکی لەگەڵ چاکە کەران دایە، ئەوانەی کە چاکە بە جۆرێ ئەکەن وەکو بە چاوی سەر خوا ببینن، چونکە ئەزانن کە خوا ئەمان ئەبینێ و هەموو کات وان لەبەر زانین و بینینی خوادا.

ئەوانە کە لەم جیهانەدا تێکۆشان ئەکەن بۆ ئەمەی بگەن بە خواو پەیوەندی بکەن پێ یەوە. ئەوانەی کە ئەو ئەرکە گەورەیان خستووەتە سەرشان و هیچ کات نائومێد نەبوون، ئەوانە کە خۆگر بوون لەسەر سزا و ئازاری دەروونی یان و لەسەر بەربەرەکانێ و سزاو ئازاردانی خەڵکی بۆیان، ئەوانەی کە ڕۆیشتوون بەو ڕێگا دوورو درێژە سەختەدا، کۆڵیان نەداوە لە تێکۆشان و بەربەرەکانێ لەگەڵ نەفسی خۆیان دا تا رامیان کردن و جڵەویان دانە

دەستی شەریعەتەکەی پێغەمبەر (ﷺ)، لەگەڵ دوژمنەکانی ئایینەکەیان دا بە جەنگ و کوشتار یان بە بەرگری کردنیان بە هەر جۆر و شێوەیەکی تر، یارمەتی ئایینی خوایان دا بۆ چەسپاندن و بەرزکردنەوەی ئالآکەی... ئەوانە خوا لێیان ناگەڕێ بە تەنیا لە مەیدان دا و رەنجیان زایە ناکات و تێکۆشانەکەیان ون ناکات... بەچاوی لوتف و بەزەیی سەرنجیان ئەدات و رەزامەندی خۆی ئەڕژێنێ بەسەریان دا، سەرنجی تێکۆشانەکەیان ئەدات و بەهۆی ئەوەوە رێنموونی یان زیاتر ئەکات و سەرنجی هەوڵ و تێکۆشانەکەیان ئەدات بۆ گەیشتنیان پێی بەهۆی ئەوەوە دەستیان ئەگرێ و ئەیان گەیەنێ بە خۆی. سەرنجی خۆگرتن و چاکەکانیان ئەدات و بەهۆی ئەوەوە چاکترین پاداشتیان ئەداتەوەو زانایان ئەکات بەوەی نایزانن و پێویستی یان هەیە پێی وەکو لە حەدیس دا ئەفەرموێ: ﴿من عمل بما علم ورثه الله علم مالم يعلم﴾ واتە هەرکەس کردەوە بکات بەوەی کە ئەیزانێ خوا زانای ئەکات بەوەی نایزانێ. عمری کوڕی عبدالعزیز – خوا لێ ی رازی بێت – چاکی فەرمووە: کەم و کوڕی زانینمان بەهۆی کەم و کوڕیمانە لە کردەوەکانمان دا، ئەگەر رەفتارمان بکردایە بە هەندێ لەوەی زانراین پێی زانینێکمان پێ ئەدرا کە لەشمان نەتوانێ هەڵسێ پێی و لە رادەی خۆمان دا نەبێ. خوا بە بەزەیی خۆی بە پێی خراپی خۆمان رەفتارمان لەگەڵ نەکات، دەستمان بگرێ و بمانخاتە سەر رێگا راستەکەی خۆی، آمین.

و صلى الله و سلم على سيدنا محمد و على آله و صحبه.

لێ بوومەوە لە تەفسیری ئەم سورەتە بەفەڕە رۆژی سێ شەممە ١٤٠٢/١/١٧ هەر لەم رۆژەدا دەستم کرد بە سورەتی (الروم) خوا یارمەتی بدات بۆ ئەوەی کە ماوە. آمین.

# سورەتی (الروم)
## مەککەیی یە و (٦٠) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

چەند ئایەتێ لە سەرەتای ئەم سورەتەوە هاتووەتە خوارەوە بە بۆنەی ڕووداوێکی تایبەتی یەوە. ئەوەش ئەمە بوو کە فارس لە جەنگ دا زاڵ بوو بەسەر ڕۆم دا. لەو کاتەیش دا بەربەرەکانێ و دووبەرەیی زۆر بەهێز بوو لەبارەی عەقیدە لە نێوان موسڵمانەکانی مەککە و بت پەرستەکان دا... لەبەر ئەوەی ڕۆم لەو کاتەدا نەسرانی بوون و خاوەن کتێب، وە فارسەکان مجوس بوون و باوەڕیان بەتاکی خوا نەبوو بەڵکو دوو پەرستراویان بڕیار ئەدا، کەواتە لە بیرو باوەڕدا ڕۆمەکان لە موسڵمانەکانەوە نزیك تر بوون و فارسەکانیش لە بت پەرستەکانەوە، لەبەر ئەوە بت پەرستەکان ئەو زاڵ بوونەیان بە هەلێك دانا بۆ پڕو پاگەندە کردن، کردیان بە هۆسە و فاك و فیك کە ئەبێ پاشە ڕۆژ زاڵ بوون و سەرکەوتن هەر بۆ ئەوان و عەقیدە و باوەڕەکەیان بێت بەسەر موسڵمانان و عەقیدە و باوەڕەکەیان دا. لەبەر ئەوە بەو بۆنەوە ئەم چەند ئایەتە لەسەرەتای ئەم سورەتەوە هاتنە خوارەوە موژدەیان دا بە زاڵ بوونی ڕۆمەکان لەماوەی چەند ساڵێکی داهاتوودا بە زاڵ بوونێك کە باوەڕداران پێی کەیف خۆش ئەبن. ئەو باوەڕدارانە کە ئەیانەوێ زاڵ بوونی کۆمەڵی باوەڕ بەسەر بێ باوەڕدا لە هەموو گەل و کۆمەڵێ.

قورئان ئەو بەڵێن و موژدەیەی دا بەڵام تەنیا بەوە نەوەستایەوە. بەڵکو بەو بۆنەیەوە ئەڕوا بۆ چەند شتی گرنگ تر و گەورەتر، ئەو جۆرە زاڵ کردنە ئەکات بە باوو شتێکی دامەزراوی نەگۆڕاوی خوا لە زاڵ کردنی ئاین و عەقیدەی ڕاستی ئاسمانی و یارمەتی دانی لە هەموو چەرخ و چینێك دا لە دوا ڕۆژدا. دیارە بە مەرجێ باوەڕداران هەڵسابن بە ئەرك و فرمانی سەرشانی خۆیان. پەیوەندی یەکێتی ئەخاتە نێوان ئەم باوەی لەگەڵ باوی نەگۆڕاوی لەو باوە ڕاستەی کە ئەم بوونەوەرەی لەسەرە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ﴿٣﴾ فِي بِضۡعِ سِنِينَ

لە یەکەم جاری سورەتەکەوە ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ئینجا قاپی ئەکاتەوە بەم سێ پیتە: ﴿الٓمٓ﴾ کە لەبارەی ئەم جۆرە پیتانەوە لە چەند سورەتێکی تردا دواین و کەواتە بە پێویستی نازانین لێرەدا هیچ بڵێین و بە بێ دەنگ و قسە تێپەڕ ئەکەین بەسەریان دا. ئینجا دەست ئەکات بەو موژدە و هەواڵە راستە کە ئەفەرموێ: ﴿غُلِبَتِ ٱلرُّومُ * فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ﴾ رۆم شکێنران و فارس زاڵ بوو بەسەریان دا لە نزیک ترین خاکیان لە مەککەوە، یان لە وڵاتی فارسەوە ﴿وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ﴾ رۆمەکان لەپاش تێك شکانەکەیان لە داهاتوودا زاڵ ئەبنەوە بەسەر فارسەکان دا ﴿فِي بِضۡعِ سِنِينَ﴾ لە چەند ساڵی لەمەولا کە تێپەڕ ناکات لە دە ساڵ. ئەم هەواڵە غەیبی یە درا و گرەویشی لەسەر کراو لەپاشان بەدی هات و گرەوەکە برایەوە لە بێ بڕواکان. چەند ریوایەتێك هاتووە لەبارەی ئەو گرەوەوە، لە نێوان ئەو ریوایەتانەدا ریوایەتی (ئیبن و جریر) مان هەڵبژارد کە لە ابن مسعودەوە ئەگێڕێتەوە. ئەفەرموێ: فارس زاڵ بوو بەسەر رۆم دا، بت پەرستەکان ئەو زاڵ بوونەیان پێ خۆش بوو. موسڵمانەکان زاڵ بوونی رۆمیان پێ خۆش بوو، چونکە خاوەن کتێب بوون، نزیك تر بوون لە ئاینەکەیانەوە. ئینجا کە ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە بت پەرستەکان وتیان: ئەی ئەبوبەکر هاورێکەت ئەڵێ: لە چەند ساڵی داهاتوودا رۆم زاڵ ئەبێ بەسەر فارس دا. ئەویش فەرموی: راست ئەکات. ئەوانیش وتیان: ئەتەوێ گرەو بکەین لەسەری؟ ئەویش وتی بەڵێ گرەو بکەین، ئینجا ئەوانیش گرەویان لەگەڵ کرد لەسەر چوار حوشتر تا حەوت ساڵ، واتە ئەگەر تا حەوت ساڵی تر ئەو هەواڵەی بەدی هات ئەوان حەوت حوشتر بدەن

پێ ی، ئەگەر بەدی نەهات ئەم ئەو چوار حوشترە بدات بەوان. ئینجا حەوت ساڵەکە تێپەڕی کردو بەدی نەهات، بەهۆی ئەوەوە بت پەرستەکان کەوتنە خۆشی و موسڵمانەکان دڵ تەنگ بوون، ئینجا باسەکەیان کرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش فەرموی: وشەی ﴿بضع﴾ لای ئێوە چی یە؟ ئەوانیش وتیان کەمترە لە دە، ئەویش فەرموی: گرەوەکە زیاد بکە و دوو ساڵی تر لەماوەکە بدەرە دەمی، ئەبوبەکریش – خوای لێ رازی بێت – بەو جۆرە مامەڵەی لەگەڵ کردن، ئینجا دووساڵەکە دوایی نەهات هەتا هەواڵ هات بەزاڵ بوونی رۆم بەسەر فارس دا، بەهۆی ئەوەوە موسڵمانەکان کەوتنە خۆشی و دڵشادی.

ئینجا با لێرەدا بوەستین لەبەردەم هەندێ شتی گرنگ و مەبەستی بەنرخ کە لەم رووداوە وەری ئەگرین.

یەکەم: ئەو پەیوەندی و یەکێتی یەی کە هەیە لە نێوان بت پەرستی و هەموو جۆرە کوفرو بێ بڕوایی یەك دا بەرامبەر باوەڕ بە تەنیایی خوا و بانگ کردن بۆی لە هەموو کات و چەرخ و شوێنێك دا. ئەوەتا لەگەڵ ئەوە لە نێوان دەوڵەت و گەل و ئوممەتەکانی کۆن و لەمەوبەردا پەیوەندی و گەیشتن بە یەك تر بەتین نەبووە بە وێنەی ئێستا لەم چەرخی ئێمەدا. لەگەڵ ئەمەدا بت پەرستەکانی مەککە زاڵ بوونی فارسەکانی ئەو کاتەیان بە زاڵ بوونی خۆیان سەیر ئەکرد چونکە ئەوانیش وەکو خۆیان هاوبەشیان بۆ خوا دائەنا و باوەڕیان بە تەنیایی خوا نەبوو، هەروەها موسڵمانەکانیش هەستیان ئەکرد بە هۆی پەیوەندی و نزیکی لە نێوان خۆیان و ئەهلی کیتاب دا، پێ یان ناخۆش بوو کە بت پەرست و هاوبەش بڕیاردەر زاڵ ببێ لە هەر لایە و لە هەر شوێنێك، ئەیانزانی کە بانگ و بانگەوازەکەیان و کارەکەیان کەنار گیر نی یە لەوەی روو ئەدا لە جیهان دا، رووداوەکانی جیهان پەیوەندی و دەخلیان هەیە بە ئیمان و کوفر و باوەڕ و بێ باوەڕی یەوە.

ئەم مەبەستە گرنگە ئاشکرایە کە لەم رووداوە وەرئەگیرێ لەم چەرخ و کاتی ئێمەدا زۆر کەس لێ ی بێ ئاگان و بە دڵیشیان دا گوزەر ناکات، بێدار نابنەوە بۆی هەرچۆنێ

موسڵمانانی چەرخی پێغەمبەر (ﷺ) بێدار بوون بۆی چوارده چەرخ لەمەوبەر. جا بەهۆی ئەوەوە کورت هەڵهاتوون و ماونەتەوە لەناو چوار چێوەو سنوورێکی جوگرافیایی یان تیرە و بەرە و رەگەزی دا و بەستراونەتەوە بەوەوە و چاویان بەرزتر ناڕوانێ و نازانن کە مەسەلەکەیان ئەبێ مەسەلەی ئیمان و کوفر بێت، تیّ هەڵچوون و بەربەرەکانی لە راستی دا ئەبێ لە نێوان کۆمەڵی خوا و کۆمەڵی شەیتان دا ببێ. ئای موسڵمانانی ئەمڕۆ لە هەموو ناوچەکانی زەوی دا چەند پێویستن بەمە تیّ بگەن لەم شتە راستە. بزانن کە ئاژاوە و بەربەرەکانیّ لە رووی راستی دا لە نێوان کوفرو ئیمان دایە، لە نێوان کۆمەڵی خواو کۆمەڵی شەیتان دایە، ئەگەر موسڵمانان ئاوا تێگەیشتوو بن ئەو کاتە بیّ ئاگا نابن لەو هەموو پیلانەی کە کۆمەڵی کوفر ئەیگێڕن، هەڵناخەڵەتێن بەو هەموو ئالاّ پڕو پووچە جیاوازەی کە کۆمەڵەکانی کوفر هەڵیان کردووە و بەرزیان کردووەتەوە هەریەکە بە ناوێك و بۆ مەبەستیّ لە رووی راستیش دا مەبەستەکەیان یەك شتە و یەك ئامانجە کە بریتی یە لە بەرگری ئیسلام و لەناوبردنی ئیسلام.

دووەم شتی بەنرخ و گرنگ کە لەم رووداوەوە وەرئەگیریّ ئەو باوەڕە بەهێزە بیّ سنوورەیە بە بەڵێنی خوا کە دەرکەوت و هەڵئەقوڵا لە دەروونی پڕ باوەڕی ئەبوبەکرەوە – خوای لیّ رازی بێت – ئەوە بوو بت پەرستەکان لاقرتی یان لیّ ئەمات لەو بەڵێنە و ئەویش بیّ گیرو گرفت ئەیوت: راستە، ئەوان گرەویان لەگەڵ کرد و ئەویش بە هەموو بڕواو دڵنیایی یەوە گرەوی لەگەڵ کردن و لەپاشان بەڵێنەکەی خوا بەدی هات لەو ماوەی دیاریی کرد: ﴿فِي بِضۡعِ سِنِينَ﴾. ئەو باوەڕو دڵنیایی یە بەهێزە بیّ سنوورە دڵ و دەروونی موسڵمانانی پڕ کرد لە هێزو دامەزراوی بەرامبەر ئەو هەموو پلەی سەخت و بەسەرهاتی گران و ئێش و ئازاری بەتینەدا کە دووچاریان بوو لە رێگای خوادا، هەتا وشەی خوا بەرز بووەوە و ئایینی پاکی سەرکەوت. ئەو بەڵێنی خوا بەڵێنە بۆ هەموو خاوەن عەقیدە و باوەڕێك لە هەموو تێکۆشانی سەخت و دوور و درێژدا.

سێ یەم شتی بەنرخ ئەمەیە کە بەم رستە تێهەڵکێشە تێمان ئەگەیەنێ: ﴿لِلَّهِ ٱلْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِنۢ بَعْدُ ۚ﴾ واتە تەنیا بۆ خوایە و تایبەتی یە بە خواوە هەموو کارێکیان لە پێش زاڵ بوونیان و لە پاش زاڵ بوونیان، واتە تێکشکان و ژێر کەوتن و زاڵ بوون و سەرکەوتنیان تەنیا بەدەست خوایە و بە پێ ی زانین و بریاری خوایە. جێگیر بوون و دامەزرانی بڕوا بەوەی لەم رستەدا هەیە زۆر پێویستە تا بکرێ بە تەرازوویەك بە دەست باوەڕدارەوە لە هەموو هەڵوێست و رووداوێك دا. کەواتە سەرکەوتن و زاڵ بوون و تێك شکان، هێزو زۆری زۆرداران و لاوازی و بێ هێزیی یەك کەوتووە دەستە پاچەکان. ئەمانە هەموو وەکو هەرچی بەسەرهات و رووداوی تر لەم بوونەوەرەدا گەڕانەوەیان بۆلای خوایە و هەموو بەدەست خوایە و بە پێ ی زانین و خواهیش و دەسەلآتی خوایە، ئەمانە هەموو بەرهەمی ئەو خواهیشە بەرگری نەکراو و دەسەلآتە بێ سنوورەی خوان، هیچ کەس دەسەلآتی نی یە بەسەریان دا و هیچ کەس ئاگادار نی یە بەسەر ئەو هەموو بەرژەوەندی و حیکمەتەی کە لەوانەدا هەیە، کەواتە بەرامبەر هەموو رووداو و بەسەرهاتی باوەڕدار جگە لە مل کەچی بۆ خوا و باوەڕ بە لێزانی و کاردروستی خوا و رێك و راستی هەموو کارەکان هیچی تری بۆ نامێنێتەوە، بۆ هەموو شتێك بە باوەڕی بەهێزەوە لە ناخ و قوڵایی دڵیەوە ئەڵێ: ﴿لِلَّهِ ٱلْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِنۢ بَعْدُ ۚ﴾.

خوای گەورە ئەو بەڵێن و موژدەیەی داو فەرموی: ﴿وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ ٱلْمُؤْمِنُونَ * بِنَصْرِ ٱللَّهِ ۚ﴾ لەو رۆژەدا کە رۆمەکان زاڵ ئەبن بەو یارمەتی و سەرخستن و زاڵ کردنەی خوا کە ئەیدا بە رۆمەکان. چونکە ئەمان خاوەن کتێبن و کەمتر دوور بوون لێ یانەوە لە فارسەکانی ئەو کاتە کە بت پەرست و هاوبەش رەوا دەر بوون بۆ خوا و خاوەن کتێبیش نەبوون و زۆر دوور بوون لە ئیسلام و موسڵمانانەوە و بێجگە لەوەش بەدی هاتنی ئەم بەڵێن و هەواڵە موعجیزە بوو، رابەر و بەڵگەیەکی روون بوو لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەر (ﷺ) هۆی گرمو بردنەوە و لوت شکان و دەم کوت کردنەوەی بت پەرستەکان بوو، کەواتە ماڧ خۆیان بوو دڵخۆش و کەیف خۆش ببن بەو سەرخستن و زاڵ کردنە کە هۆی سەرکەوتن و زاڵ بوونی قسەی باوەڕدارەکانیش بوو بەسەر بت پەرستەکان دا.

﴿يَنصُرُ مَن يَشَآءُ﴾ خوا يارمەتی هەركەس ئەدات و سەری ئەخات كە بیەوێ و مەیلی یارمەتی و سەرخستنی بكات. هەموو كارێ ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا، مەیل و خواهیشی هەركەس بكات یارمەتی ئەدات و زاڵی ئەكات. هیچ بەرگری كەرێ نی یە بۆ ویست و خواهیشی خوا، ئەو ویست و خواهیشەی كە بەرهەم پێك ئەهێنێ هەر ئەوەیە كە سەرەتا و هۆكانیش فەراهەم ئەهێنێ و رێك و پێكیان ئەكات، كەواتە بەستنەوەی یارمەتی و زاڵ كردن و هەموو شتێكی تر بە خواهیش و مەیلی خواوە نابێتە دژو پێچەوانە لەگەڵ بوونی ئەو شتانەی كە كراون بە سەرەتا و هۆی بەسەرهات و رووداو و پەیدا بووەكان. ئەو رژێم و یاسای كە ئیش كەرە لەم بوونەوەرەدا بە مەیل و خواهیشی خوا پێك هاتووەو پەیدا بووە. ئەو مەیل و خواهیشە بێ سنوورە چەند رەوشتێكی نەگۆڕاوی داهێنا، چەند رژێمێكی دامەزراوی دامەزراند لەم بوونەوەرەدا كە هەموو شتێ بە پێی ئەو رەوشت و رژێمە بەدی بێت. بۆ وێنە زاڵ كردن و تێكشكان كە لێرەدا جێگای باسن دوو بەسەرهاتن پەیدا ئەبن لە چەند هۆ و ئیش كەرێ بە پێی ئەو رەوشت و رژێمەی كە خواهیش و مەیلەكەی خوا فەراهەمی هێنان.

بیرو باوەڕ و عەقیدەی ئیسلام زۆر روون و رەوانە و رێكە لەگەڵ ژیریی دا. بەم رەنگە هەموو كاروبار و رووداوێك ئەگێڕێتەوە بۆلای خوا، بەڵام لە هەمان كات دا داوا ئەكات لە خەڵكی كە هەوڵ و تێكۆشان بكەن و دەست بگرن بەو هۆ سروشتی یانەی كە لەوانەن بەرهەمیان لێ پەیدا ببێ، ئیتر ئەو بەرهەمانە پێك بێن و بەدی بێن یان نە ئەوە شتێ نی یە داوا بكرێن لە خەڵكی، لە سنووری دەسەلاَتی ئەوان دا نی یە، چونكە ئەو پێك هێنان و فەراهەم هێنانە ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا، ترمزی لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە حەدیسێ ئەهێنێ كە عەرەبێكی كۆچەر حوشترەكە بەرەلاَ ئەكات و لەبەر قاپی مزگەوتی پێغەمبەردا (ص) ئینجا ئەچێتە ژوورەوە نوێژ بكات و ئەڵێ حوشترەكەم بەرەلاَ كرد و پشتم بەخوا بەست، پێغەمبەریش پێی ئەفەرموێ: بیبەستەوە ئینجا پشت بەخوا ببەستە. كەواتە پشت بەستن بە خوا لە ئایینی پاكی ئیسلام دا بەمە ئەبێ ئەوەی كە هۆیە بەكار بهێنرێ و ئینجا دوای ئەوە كارو بەرهەم هەواڵەی خوا بكەیت.

وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَعۡدَ ٱللَّهِۖ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٦﴾
يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾

---

﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ تەنیا خوا زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و بەزەیی دارە بە زۆری و فراوانی. کەواتە ئەو سەرخستن و زاڵ کردنەکەی دەورە دراوە بە هێزو دەسەڵاتێکی فەراهەم هێنەر، بە بەزەیی یەکی پێك هێنەری بەرژەوەندی بەندەکانی، ئەو بەزەیی یە روو ئەکاتە سەرکەوتوو و تێکشکاوەکان پێکەوە بە یەکسانی، چونکە ولاّتی پێ چاك بوو، چاك بوونی ولاّتیش بەزەیی یە بۆ هەردوو تاقمەکە لە پاشەڕۆژدا. ﴿وَعۡدَ ٱللَّهِ﴾ خوا ئەو بەڵێنەی دا، ئەو زاڵ کردنەی رۆمە بەڵێنێك بوو لەلایەن خواوە کەواتە ئەبێ بەدی بێت چونکە ﴿لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥ﴾ خوا بەڵێنی خۆی ئەباتە سەر و نایگۆڕێ. بەڵێ ئەبێ بەڵێنی خوا بەدی بێت و نەگۆڕێ، چونکە بەڵێنەکەی لە زانین و خواهیش و لێزانی و دەسەڵاتی بێ سنوورەوە دەرئەچێ، هیچ کەس ناتوانێ بەرگری بکات، لەم بوونەوەرەدا هەرچی ئەو بیەوێ ئەبێ ببێ و هەرچی ئەو نەیەوێ نابێ نەبێ، بەدی هێنانی بەڵێنی خوا بەشێکە لەو یاسا و رژێمە هەرە گەورەی کە ئەم بوونەوەرەی لەسەرە و بە هیچ کلۆج دەست نادات بۆ گۆڕان، کەواتە ئەبێ بیباتە سەر و نەیگۆڕێ ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەلاّم زۆربەی ئادەمی نەزانن و نازانن هەرچەند بە رواڵەت بە زانا ئەبینرێن و ئەناسرێن، زۆر شت ئەناسن و ئەو زانین و ناسینەیان تێپەڕ ناکات بۆ ناوکە و ناوەڕۆکی ژیان. لە قوڵایی یەوە هەڵناقوڵێ، بێ ئاگان لە یاسا بنەڕەتی یەکان و رژێمی هەرە گەورەی ژیان و پەیوەندی بەهێزی نێوانی هەموو شتەکان، بەس ﴿يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ ئەزانن شتێکی ئاشکرا و دیاریی لە ژیانی ئەم جیهانە. ئەوەی کە هەستی پێ ئەکەن و ئارەزووی ئەکەن و پێویستن پێی، وەکو ئیبن و عەباس – خوایان لێ رازی بێت – ئەفەرموێ: زانان بە سوود و قازانج و زیانەکەی، ئەزانن کەی بچێنن و کشتوکاڵ بکەن؟ کەی دروێنە بکەن؟ چۆن کۆی بکەنەوە؟ چۆن خانو و کۆشك دروست بکەن؟ هەروەها هەموو شتەکانی تر وێنەی ئەوان باس کران، ئیتر تێپەڕ ناکەن لەم شتە ئاشکرایانە و بە چاوی دەروون دیوی ئەو دیویان نابینن، ژیانی ئەم جیهانە هەرچەند بە زۆر

و فراوان سەرنج بدرێ و دەرکەوێ، بەشێکی کەمی بچووکە، هەر ئەنداز تێکۆشان بکرێ بەش و پارچەیەکی زۆر کەمی دەست کەوت ئەبێ لەم ژیانە کەمەدا.

ئەو کەسەی کە زانینی راستەقینەی نەبێ و تەنیا ئەم دیوی دەر و توێکڵە ببینێ، بە وێنەی ئاژەڵ و گیان لەبەرانی تر، ئەو کەسە بە چاو ئەڕوانێ وەکو نەبینێ وایە، دیمەن و شێوەو گەڕان و بزووتنەوە چاو ئەکات، بەلاٌم زانا نی یە بە شتە نایابە نهێنی یەکان، کەواتە تام و بۆنی ژیانی راستەقینە ناکات، زۆربەی ئادەمی بەم جۆرەیە، چونکە باوەڕی راستەقینە مەردوم بە شتە نهێنی یەکان و نایابەکانی ئەم بوون و بوونەوەرە، ئەو ئیمان و باوەڕە راستە روحێکی ئاوا زانا پێك ئەهێنێ لە خاوەنەکەی دا. خاوەنی ئەو باوەڕە راستەقینەش کۆمەڵێکی کەمن لەناو هەموو ئادەمی دا لەبەر ئەوە زۆربە بێ بەشە لەو زانین و ناسینە راست و گرنگە. ﴿وَهُمْ عَنِ ٱلْآخِرَةِ هُمْ غَٰفِلُونَ﴾ئەم زۆربەیە بێ ئاگان لە رۆژی دوایی. بێگومان رۆژی دوایی هەڵقەیەکە لە زنجیرە بوون و پەیدا بوون، لاپەڕەیەکە لە لاپەڕەکانی. جا ئەو کەسانەی کە تێنەگەیشتبوون لە هۆی پەیدا بوون و نەگەیشتوون لە رژێم و یاسای بوون. ئەوانەی بێ ئاگان لە رۆژی دوایی، گوێی پێ نادەن و رێزی خۆی نادەنێ، حیسابێکی بۆ ناکەن، نازانن کە نوختەیەکە لە هینی گەردش و گەڕانی بوون، کە ئەبێ ببێ و دوانەکەوێ لە کاتی خۆی و لانەدا لێ ی بە هیچ کلۆج.

بێ ئاگایی لەو رۆژە هەموو بەراوردێکی بێ ئاگاکان ئەشێوێنی، تەرازووی دەستیان خوار ئەکات بە جۆرێ رێزدارانی پێ نادۆزێتەوەو هیچ شتێکی پێ دیاریی ناکرێ لە رادە و پلەی خۆی دا، کەواتە بەرێکی تێ ناگەن لە ژیان و رووداوەکانی ژیان، زانین و ناسینیان سەبارەت بە ژیان و رووداوەکانی ناتەواو و سەتحی یانەیە، چونکە بێ بڕوایی و بێ ئاگایی لەو رۆژە تێڕوانین و تێبینی گۆڕیون بەرامبەر هەرچی وا لەم زەوی و جیهانەدا. نازانێ و بێ ئاگایە لەوە کە ژیانی بەسەر ئەم زەوی یەوە قۆناغێکی کورتە لە کاروان و گەڕانە درێژەکەی لەم بوونەوەرەدا. بەش و دەستکەوتی لەم زەوی یەدا هەر ئەنداز زۆر بێت کەم و کوڕ و بێ نرخە لەچاو بەش و دەست کەوتی زۆر و فراوانی لە بوون و مانەوەدا. ئەو رووداو و بەسەرهاتانەی کە لەم جیهان و زەوی یەدا تەواو ئەبێ شتێکی زۆر بچووکە و بەشێکی کەمە بە وێنەی باسێکی زۆر کەم و کورتە لە پەڕاوێکی زۆر قەڵەو و گەورە. بێگومان هەر زانین و

تێڕوانین و تێگەیشتن و بڕیاری بنەڕەتەکەیان ئەو شتە کەم و کوڕ و ناتەواوانە بن کە باس کران. بێگومان ئەو زانین و تێڕوانین و بڕیارانە نارەوا و ناڕاست ئەبن. لەبەر ئەوە هەر ئادەمی یە کە باوەڕی هەبێ بە ڕۆژی دوایی هەرگیز یەك ناکەون و یەك ناگرن لەگەڵ کەس کە بژی تەنها بۆ ئەم جیهانە و چاوەڕوانی دوا ڕۆژ و ڕۆژی دوایی نەبێ. ئەم دووانە هەرگیز یەك ناکەون لە هیچ بڕیارێك دا، چونکە هەرکام تەرازوویەکی هەیە و هەرکام بۆ شتێك ئەڕوانێ و هەرکام جۆرە ڕووناکی یەکی هەیە شتی لەبەر ئەبینێ... یەکێکیان تەنها دیوی دەر و شتێکی ئاشکرای هەست پێکراو ئەبینی لە ژیانی ئەم جیهانەدا، ئەوی تریان ئەمیش ئەبینی و دیوی ناویش ئەبینی، هەست ئەکات بە هەست پێ کراو و هەست پێ نەکراو، بە هەردوو جیهان، بە مردن و ژیان، ڕابوردوو ئێستا و داهاتوو، بە جیهانی ئادەمی و جیهانی هەرە گەورە کە زیندوو و زیندەوەر و بێ گیانیش ئەگرێتەوە... ئا ئەم مەیدانە زۆر پان و فراوانە و ئا ئەو کەنارە و لوتکە هەرە بەرزەیە کە ئیسلام تیرەی ئادەمی بۆ ئەگوێزێتەوە و پێی ئەگەیەنێ، بەرزی ئەکاتەوە بۆ رادە و پلەیەکی بەرز و بەڕێز کە شایان بێت بۆ ئەم ئادەمی یە کە کراوە بە جێنشین لەم زەوی یەدا بەهۆی ئەو ڕۆحەی تێکەڵی لەش کراوە و پێی جوێ بووەتەوە لە دروست کراوەکانی تر، ئەو ڕۆحەی کە لە نێوان ئەم بوونەوەرەدا ئەوەندە تایبەتی یە بەخوای خۆیەوە، ئەو خوایە ناوی بردووە بە هی خۆی، ئەوەتا فەرموی بە مەلائیکەکانی سەبارەت بە ئادەم: ﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾ واتە: کاتێ کردم بە بەری ئادەم دا لەو ڕۆحەی کە ڕێزی هەیە لام و تایبەتی یە پێمەوە، ئەی مەلائیکە بکەون بە ڕودا بۆی بە سوژدە بردنەوە، ئینجا بە بۆنەی بەدی هاتنی ئەو بەڵێنی خوا، بە بۆنەی باسی ڕۆژی دوایی کە ئەم دووانە دوو شتی حەق و ڕاستن و بەشێکن لە حەق و ڕاستی گەورە کە ئەم بوون و بوونەوەرەی لەسەر دارێژراون و ڕاگیرن. بە بۆنەی ئەم پەیوەندی یە بەهێزە گەردش و گەڕانێ ئەکات بە بەندەکانی لەناو دەروونی بوونەوەردا. ئەیانگێڕێ بە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی وا لە نێوانیان دا و ئەیانگێڕێتەوە بۆلای دەروونی خۆیان کە لە قوڵایی یەوە سەرنج بدەن و بیر بکەنەوە، بەڵکو هەست بکەن بەو حەق و ڕاستە گەورەیە، کە بێ ئاگان لێ ی بێ ئاگا ئەبن لە ڕۆژی دوایی، بێ ئاگا ئەبن لەو بانگ و بانگەوازەی کە دەستیان ئەگرێ و چاویان ئەکاتەوە بۆ بینینی ئەو حەقە و بیر کردنەوە لێی،

ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنفُسِهِمْ﴾ ئایا ئەوانە تەنها ئەم ژیانی ئاشکرای ئەم جیهانەیان ئەزانی و تێڕوانینیان کورت هەڵهاتبووە سەر ئەوە و بیرێکیان نەکردەوە لە دەروونی خۆیان دا تا بەهۆی ئەوەوە بزانن ﴿مَا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ﴾ کە خوا ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی وا لە نێوانیان دا دروستی نەکردوون لەسەر هیچ بارو شێوەیەك، بۆ هیچ مەبەستێ مەگەر ئەوانە هەموو راستن و تەنها ئەو بارو شێوەو مەبەستە رێکن و شایانن بە بوون و تەنها ئەوەی خوا کردوویە دروست و رەوا و بەجێ یە و جگە لەوە ناڕاست و ناڕەوا و بێ جێ و نادروستە. بێگومان سروشتی پێك هاتنی خەڵکی و سروشتی پێك هاتنی ئەو بوونەوەرەی خەڵکی تیا ئەژی بەڵگەو نیشانەیەکی روونن و شایەتێکی راستن لەسەر ئەوە کە ئەم بوون و بوونەوەرە پێك هاتووە و دامەزراوە و داڕێژراوە لەسەر ئەو بارو شێوە راست و رەوایە، هەموو شتێك لەسەر یاسایەکی نەگۆڕاو و رژێمێکی زۆر وردە، هیچ شتێکی بە کوێرانە و رێکەوت نی یە، هەموو بەش و پارچەکانی کۆمەك و یارمەتی دەری یەکترن، لە هیچ گەردش و خولانەوەو بزووتنەوەیان دا دژی یەکتر نین، جێ و شوێنی هەموو شتێ لەم بوون و بوونەوەرەدا لە رادەی ناوەڕاستی تەرازوویەکی راست دایە و دەست نادات بۆ ترازاندن بە هیچ بارێکی تردا، کەواتە هەرکەس دڵ مردوو نەبێ بەو بیر کردنەوە راستی بۆ دەردەکەوێ و زانین و ناسینی نابەسرێتەوە تەنها بەم توێکڵ و دیوی دەری ئەم ژیان و جیهانەوە، بە پێی ئەو حەق و راستی یەی کە ئەم بوون و بوونەوەرەی لەسەر دامەزراوە بۆی روون ئەبێتەوە کە پێویستە هاتنی رۆژی دوایی، کە پاداشت و تۆڵەی کردەوەی تیا بەجێ بهێنرێ، چاکە و خراپەکاران بگەن بە چارەنووس و دوا رۆژی خۆیان، کەواتە ئەم جیهانە خوا دروستی نەکردووە بۆ ئەمەی هەرگیز نەڕوا و هەتا هەتایی بێت، بەڵکو ئەبێ بڕوا و نەمێنێ بە پێی زانینی خواو ﴿وَأَجَلٍ مُسَمًّى﴾ بە گوێرەی ماوەیە کە ناوبراوە و دیاریی کراوە کە لەو کاتەدا تەمەنی ئەم ژیان و جیهانە دوایی دێت و ئیتر نامێنێ، جیهان و رۆژی دوایی دێت و دەست پێ ئەکات،

وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآيِٕ رَبِّهِمْ لَكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ
ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُواْ ٱلْأَرْضَ وَعَمَرُوهَآ أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا
وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾ ثُمَّ كَانَ
عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ ٱلسُّوٓأَىٰٓ

---

**﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآيِٕ رَبِّهِمْ لَكَٰفِرُونَ﴾ زۆر لە ئادەمی بێ بڕوان بە گەیشتن بە حوزوری خواو گەیشتن بە بەرهەمی کردەوە لای خوا لەو ڕۆژی دوایی یەدا و گومانیان وایە ئەو ڕۆژە نایەت و ئەم جیهانە هەتا هەتایی یە و بڕانەوەی نی یە. لەپاش ئەوە گەردش و گەڕانێکی کرد بە دڵ و دەروون بەناو ئاسمانەکان و زەوی دا، ئینجا گەڕان و خولانەوەیەکی پێ ئەکات بەناو کات و چەرخەکانی ڕابردوو و مێژووی گەلەکانی لەمەو پێش و سەرنج ڕائەکێشێ بۆ باو و ڕەوشتی خوا لەناو ئەو گەلانەدا، ئەو باو و ڕەوشتەی کە هیچ کات لادان و گۆڕانی بۆ نی یە. ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ ئایا ئەو بێ باوەڕانە لە جێگا و شوێنی خۆیان دا دانیشتوون و نەگەڕاون بە وڵات و زەوی دا تا بەهۆی ئەوەوە سەرنج بدەن ئایا چۆن بوو پاشە ڕۆژ و چارەنووسی ئەو گەلانەی کە لە پێش ئەوانەوە بوون؟ مەبەست لەم جۆرە فەرمودەیە بانگ کردنە بۆ بیرکردنەوە لە بەسەرهات و پاشە ڕۆژی ئەو گەلە ڕابوردووانە، کە ئەوانە بەشێك بوون لە ئادەمی، بەندە و دروست کراوێك بوون لە بەندە و دروست کراوەکانی خوا، کە لەناوبران و لە ڕیشە هێنران، دوا ڕۆژ و چارەنووسی ڕابردووی ئەوان پاشە ڕۆژ و چارەنووسی جێگرەکانی ئەوان لە گەل و چینەکانی داهاتوو ڕوون ئەکاتەوە، چونکە باو و ڕەوشتی خوا باو و ڕەوشتە بۆ هەمووان. باو و ڕەوشتی خوا شتێکی ڕاست و دامەزراوە و بوون و بوونەوەری لەسەر ڕاگیرە. جیاواز و لایەنگیری نی یە لە باو و ڕەوشتەکەی دا، بە هەوا و ئارەزوو کاری نی یە. هەروەها ئەمە بانگ کردنە بۆ تێگەیشتن لە حەقیقەتی ئەم ژیانە و هۆی پەیوەندی هەموو تاقم و چینەکانی بە درێژایی هەموو کات و چەرخەکان، بانگ کردنە بۆ تێگەیشتن لە حەقیقەتی ئەم تیرەی ئادەمی یە کە لە پەیدا بوون و پاشە ڕۆژدا یەك شتە بە درێژایی هەموو تاقم و تاقم و چینێ لە هەموو چەرخەکان دا، ئەو بانگە ئەکرێت تا هیچ تاقم و چینێك خۆی کەنار گیر نەکات و خۆی جوێ**

نەکاتەوە لە تاقم و چینەکانی تر. بیٚ ئاگا نەبیٚ لەو یەکیٚتی و پەیوەندی یە بەهیٚزەی کە هەیە لە نیٚوان هەموو تاقم و چینەکانی ئادەمی دا، هەروەها بیٚ ئاگا نەبیٚ لەو باو و رەوشتەی کە بۆ هەمووان هەیە و لە هەمووان دا کار نەکات. ئەوەتا ئەو گەلانەی رابردوو چەند گەلیٚ بوون ژیان لە زەوی دا پیٚش تاقمی بت پەرستەکانی مەککە ﴿كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً﴾ ئەوانەی رابوردو لەبارەی هیٚزو دەسەلاٚتەوە بەتین تر بوون لەمانەی دانیشتوانی مەککە ﴿وَأَثَارُوا۟ ٱلْأَرْضَ﴾ زەوی یان هەلٚگیٚرایەوەو ئەم دیو و ئەو دیویان کرد بۆ کیٚلاٚن و کشت و کالٚ و ناوسکیان لەت کرد بۆ گەڕان بە شویٚنی ئەوەی شاراوە بوو لەناوی دا، ﴿وَعَمَرُوهَآ أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا﴾ زەوی و خاکی خۆیان ئاوەدان کردبووەوە بە خانو و کۆشك زۆرتر لەوەی دانیشتوانی مەککە ئاوەدانیان کردبووەوە... چونکە شارستانیەتی ئەوان زۆرتر بوو لە مەککەیی یەکان، ئەوان بە دەسەلاٚت تر بوون لەمان... ئینجا ئەوانە هەلٚخەلٚەتان بە دیمەن و روالٚەتی ژیانی ئەم جیهانە و بیٚ ئاگا بوون لە رۆژی دوایی ﴿وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ پیٚغەمبەرەکانیان هاتن بۆیان بە موعجیزە و رابەرە روونەکانیانەوە کەچی چاوی دلٚیان نەکرایەوە بەو موعجیزە روونانە، باوەڕیان نەهیٚنا تا دەروونیان ئەو نوور و رووناکی یە ببینیٚ و بەهۆی ئەوەوە ریٚگا دەرکەن و بکەونە سەر ریٚگا راستەکەی خوا. بەهۆی ئەوەوە باو و رەوشتی خوا لە بارەی بیٚ بڕوایانەوە لەسەریان جیٚگیر بوو، هیٚزو دەسەلاٚتەکەیان هیچ سوودی پیٚ نەگەیاندن، ئیش و کارو شارستانی یەکەیان بەرگری هیچی لیٚ نەکردن. دووچاری تۆلٚە و سزای راست و شایانی خۆیان بوون ﴿فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ ئینجا خوا جەور و ستەمی لیٚ نەکردن و بە ویٚنەی ستەمکاران رەفتاری لەگەلٚ نەکردن بەم رەنگە بە بیٚ تاوان و بە بیٚ ترساندن و ئاگادار کردنەوە سزایان بدات، بەلٚکو خۆیان جەور و ستەمیان کرد لە خۆیان. چونکە یاخی بوون لە خواو گویٚ یان نەدا بە ترسیٚنەری خواو دلٚیان نەرم نەبوو بە پەند و ئامۆژگاری پیٚغەمبەرەکانی – درودی خوایان لیٚ بیٚت – ئەو بەد بەخت و سیا چارانە هەر تاقمیٚ دووچاری سزای تایبەتی خۆیان بوون لەم جیهانەدا ﴿ثُمَّ كَانَ عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔوا۟ ٱلسُّوٓأَىٰٓ﴾ ئینجا لەپاش سزای ئەم جیهانە سەخت ترین سزاو تۆلٚە و دوا رۆژ چارەنووسی کەسانیٚ ئەبیٚ کە لەم جیهانەدا تاوان و خراپەیان کرد. ئەو تۆلٚە سەختەیش ریٚك و راستە و کالاٚی بالاٚیانە

أَن كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ بِهَا يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١٠﴾ ٱللَّهُ يَبْدَؤُاْ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ثُمَّ إِلَيْهِ
تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُبْلِسُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿١٢﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمْ شُفَعَٰٓؤُاْ
وَكَانُواْ بِشُرَكَآئِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿١٣﴾

---

﴿أَن كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ لەسەر ئەوە بڕوایان نەهێنا بە ئایەتەکانی خوا و بە درۆیان دانەنان، ﴿وَكَانُواْ بِهَا يَسْتَهْزِءُونَ﴾ [1] هەمیشە لاقرتی یان پێ ئەکردن.

قورئان بانگی بێ بڕواکانی ئەم ئوممەتەی کرد کە بڕۆن و بگەڕێن بە وڵاتان دا و لە شوێن و وڵاتی خۆیان دا نەبەسرێنەوە و بیر بکەنەوە لە دوا ڕۆژ و بەسەرهاتی گەلە رابردووەکان و چاوەڕوانی وێنەی تۆڵە و بەسەرهاتەکەی ئەوان بکەن. تێ بگەن کە باوی خوا یەك باوە و گۆڕانی نی یە، بیر کردنەوەیان پان و فراوان بکەن تا تێ بگەن لە یەکێتی ئادەمی و یەکێتی بانگ و بانگەوازی خواو یەکێتی تۆڵە و سزای خوا لە هەموو تاقم و گەلەکانی جیهان دا بە تێکڕایی، ئەم تێگەیشتنە مەبەستێکە کە ئیسلام زۆر سوورە لەسەری و ئەیەوێ دڵ و دەروون و ژیریی باوەڕدارانی پێ ڕەنگ و مۆر بکات.

لەپاش ئەم دوو چەرخە و گەردشە کە قورئان کردی بە دڵ و دەروون ئینجا ئەیانگێڕێتەوە بۆ شتێکی راستەقینەی زۆر گرنگ کە بریتی یە لە زیندوو بوونەوە و دوا ڕۆژ کە بێگومان بەشێکە لەو حەق و راستی یە هەرە گەورەی کە بوون و بوونەوەری لەسەر دامەزراوە و راگیرە. ئەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ يَبْدَؤُاْ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ خوا کە ناوی ﴿الله﴾ یە لە یەکەم جارەوە خەڵکی داهێناو دروست کرد. ئینجا لەپاش مراندنی دووبارەی ئەکاتەوە

---

[1] تەفسیرەکە لەسەر ئەوەیە کە وشەی (عاقبة) خەبەر بێ بۆ (کان) و ئیسمەکەی (السوأي) بێت، (أن کذبوا...) هۆی بڕیارەکەیە، بێجگە لەوە بە چەند جۆرێکی تریش ئەم ئایەتە تەرکیب کراوە و بە پێی ئەوانە تەفسیرەکەی جیاوازە و هەموو ئەگونجێن و ڕێکن.

و دروستی ئەکاتەوە. لەپاش زیندوو کردنەوەی ئەگێڕێنرێنەوە تەنیا بۆلای ئەو خوایە بۆ بەرهەم و پاداشت و تۆڵەی کردەوەکەتان.

بەڕاستی ئەم مەسەلەیە زۆر رێك و روون و بێ گرێ یە، دووبارە کردنەوە وەکو پێك هێنانی یەکەم جار ماق سەر لێ کردنەوە نی یە، چونکە ئەوا ئەم ئادەمی یە بە پێش چاومانەوە هەیە و پەیدا ئەبێ، دەی خۆی خۆی دروست کرد؟! دەی هیچ کەس ئاگادار و دەخلی هەیە لە دروست کردنی دا؟ دەی ئەم شتە نایابە سەر سوڕهێنەرە کە هەموو شتێ بە رژێم و یاسایەکی نەگۆڕاوە بە رێکەوت و لەخۆیەوە پەیدا بوو؟!! بێگومان هەرکەس بێبەش نەبێ لە ژیریی و رێزی خۆی بەلاوە بێت هەرگیز هیچ کام لەم سێ بارە نالێت و رووی نایەت بیلێت، کەواتە ئەبێ کەسێ دروستی کردبێ، هەرچۆنێ دروستی کرد، هەروەها دووبارەیشی ئەکاتەوە، ئەبێ هەر دروستیشی بکاتەوە بۆ ئەمەی ئەم هەموو چاکە و خراپەیە هەر وا بێ سەرو شوێن و بە هەدەر نەڕوا.[1] ئینجا بە بۆنەی هەندێ لە بەسەرهات و شێوەی ئەو رۆژە باس ئەکات لەگەڵ دوا رۆژ و چارەنووسی باوەڕداران و بێ باوەڕان کاتێ کە ئەگێڕێنرێنەوە بۆ لای خوا، بێ کەڵکی و بێ سوودی بتەکان و پڕو پووچی عەقیدە و باوەڕی بت پەرستان. ئەفەرموێ: ﴿ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُبۡلِسُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴾ لە رۆژێك دا رۆژی دوایی دێت و کاتی دووبارە کردنەوەو گەڕانەوەی خەڵکی دێتە پێشەوە. لەو رۆژەدا تاوانبارەکان داخ و غەمی نائومێدی داگیریان ئەکات و بێ دەنگ ئەبن و هیچ وتەیەکیان نی یە بەرگری خۆیانی پێ بکەن، بەڵکو سەرگەردان و نائومێدن ﴿ وَلَمۡ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمۡ شُفَعَـٰٓؤُاْ ﴾ بێگومان لەو بت پەرستراوانەدا هیچ تکاکەرێ نابێ بۆ ئەو تاوانبارانە، کەواتە لەو رۆژەدا بۆیان دەرئەکەوێ بێ نرخی پەرستنەکەیان، بەڵکو بوو بەهۆی سزاو زیانیان لەبەر ئەوە پەشیمان ئەبنەوە ﴿ وَكَانُواْ بِشُرَكَآئِهِمۡ كَـٰفِرِينَ ﴾ بێ بڕوا ئەبن بە بتەکانیان کە کردنیان بە هاوبەشی خوا.

وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوۡمَئِذٖ يَتَفَرَّقُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
فَهُمۡ فِي رَوۡضَةٖ يُحۡبَرُونَ ﴿١٥﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآيِٕ ٱلۡأٓخِرَةِ فَأُوْلَٰٓئِكَ
فِي ٱلۡعَذَابِ مُحۡضَرُونَ ﴿١٦﴾

---

لەو ڕۆژەدا خەڵكی دووبەش ئەبن وەكو ئەفەرموێ: ﴿ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوۡمَئِذٖ يَتَفَرَّقُونَ ﴾ لە ڕۆژێك دا ڕۆژی دوایی دێت لەو ڕۆژەدا خەڵكی دووبەش ئەبن و خوا جیاوازی ئەخاتە نێوان چاكان و تاوانباران بەم جۆرە كە ئەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَهُمۡ فِي رَوۡضَةٖ يُحۡبَرُونَ ﴾ بەم جۆرە ئەوانەی كە باوەڕیان هێناوە و كردەوە چاكەكانیان بەجێ هێناوە ئەوانە بە باغچە و زەویەكی سەوزی و گوڵ و گوڵزار و ئاوداری بەهەشت دان كە كەیف خۆش ئەكرێن تیای دا بە جۆرێ ناوچاویان ئەدرەوشێتەوە لە خۆشی دا، ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآيِٕ ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ كەسانێ كە بێ بڕوا و كافر بوون و بڕوایان نەبوو بە ئایەتەكانی ئێمە و گەیشتن بە حوزوری خوا و پاداشت و تۆڵەی خوا ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡعَذَابِ مُحۡضَرُونَ﴾ ئەوانە ئامادەكراو ئەبن لە سزادا. سزای ئاگری دۆزەخ، بە هەمیشەیی. ئەوەیە دوایی گەڕان و كردەوەی ئەم جیهانە، ئەوەیە دوا ڕۆژ و چارەنووسی چاكان و خراپان.

لەپاش ئەوە سەرنجی ڕاكێشاین بۆ ڕۆژی دوایی و بە كورتی شێوەی پاداشت و تۆڵە و سزای ئەو جیهانەی خستە پێش چاو ئینجا ئەمان گێڕێتەوە بۆ ئەم جیهان بۆ سەرنج دان و بیر كردنەوە لە بوونەوەر و ژیان , لەو هەموو شتە نایابە سەر سوڕهێنەرانە و ئەو گشت ڕابەر و نیشانە ئاشكرایانە كە هەركام موعجیزەیەكن هەموو كەس دەستە پاچەیە لەئاستیان. ئەمان گێڕێتەوە بۆ ئەم جیهان بۆ سەرنج دان و بیر كردنەوە تا بەهۆی ئەوەوە خوای خۆمان باش بناسین و گوێ ڕایەڵ بین بۆی و تا بەهۆی ئەوەوە بەشدار ببین لەنازو ڕێزی باخچەو گوڵ و گوڵزارەكەی بەهەشت و پارێزراو بین لە ئاگری دۆزەخ. لە یەكەم جارەوە دەست پێ ئەكات بە باسی پاكیی و بێگەردی خواو سەنا و سوپاسێ كە بەندەكانی هەڵسن پێ‌ی لە چەند كاتێكی دیاریی كراودا كە بەهرە و چاكە ئاشكراكانی خوایان تیا تازە ئەبێتەوە،

﴿فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمۡسُونَ وَحِينَ تُصۡبِحُونَ ﴿١٧﴾ وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَعَشِيّٗا وَحِينَ تُظۡهِرُونَ ﴿١٨﴾﴾

ئەفەرموێ: ﴿فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمۡسُونَ وَحِينَ تُصۡبِحُونَ﴾ کاتێ دەرکەوت و روون بووەوە دوا رۆژ و حاڵی ئەو دوو کۆمەڵە، کەواتە خوا بە پاکی و خاوێن راگرن و بەوە یاد و باسی بکەن کاتێ ئەکەونە ئێوارەو کاتێ ئەکەونە بەیانی. ئەو کاتە دیاریی کراوانە چوارن و دوانی باس کردن و ئینجا لە نێوان ئەم دوانە و دوانەکەی تردا تێهەڵکێش ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ تەنیا بۆ خوایە و تایبەتی یە بەوەوە هەموو سەنا و سوپاسێ لە ئاسمانەکان و زەوی دا، بەم رستە تێهەڵکێشە دەست نیشان ئەکات بەمە کە یاد و پەرستنی خوا چاکەیەکە خوا فەراهەمی ئەهێنێ بۆ بەندەکانی، کەواتە پێویستە سوپاسی خوا بکەن لەسەری، هەروەها ئەوە نیشان ئەدات کە پێویستە لەسەر هەموو خاوەن فام و ژیریی یەك کە هەڵسن بەو سوپاسە، بێجگە لەوە ئەو پەرستنە پاڵ پێوەنەرێکی گرنگە بۆ هەڵسانی بەندەکان بەو یاد و پەرستنە لەو کاتانەدا بە سۆز و پەرۆشەوە چونکە هەر فامدارێ کە بیری کردەوە لەوەی خوا سوپاس کراوە لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەرگیز رووی نایە و شەرم ئەکات لەمەی یاخی ببێ و خۆی بەشدار نەکات لە پەرستنی خوادا و نەچێتە ریزی خواپەرستانی ئاسمانەکان و زەوی.

لەپاش ئەم رستەیە ئەم دوو کاتەکەی تریش لەناو ئەبات و ئەفەرموێ: ﴿وَعَشِيّٗا وَحِينَ تُظۡهِرُونَ﴾ خوا بە پاکی راگرن و باس و یادی بکەن لە شێوان دا و لە کاتێك ئەکەونە نیوەڕوان. هەندێ لە زانایان ئەفەرمون: مەبەست بەم ئایەتە فەرمان دانە بەم پێنج فەرزە نوێژە کە ئەکرێ لەگەڵ دیاریی کردنی کاتەکانیان دا، بەم رەنگە مەبەست بە وشەی ﴿تمسون﴾ کاتی مەغریب و عیشایە، مەبەست بە ﴿تصبحون﴾ کاتی نوێژی بەیانی یە، ﴿وعشیا﴾ کاتی نوێژی عەسرە، ﴿تظهرون﴾ کاتێ نوێژی نیوەڕۆیە، بێگومان را و فەرمودەیەکی رێك و گونجاوە بەڵام رای یەکەم لە دڵ دا جێگیر ترە چونکە گشتی یە و هەموو جۆرە یاد و پەرستنێکی رەوا ئەگرێتەوە، تایبەتی کردنی بە نوێژەوە بە بێ رابەرێکی شەرعی رەوا نی یە، ئەو رابەرەش لێرەدا ئەبێ حەدیس بێت یان بڕیاری هەموو زانایان، خاوەنی ئەم رایەش هیچ کامی نەکردووە بە رابەر بەڵکو ئەڵێ: لە ئیبن و عەباسەوە

ئەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ئەم ئایەتە هەر پێنج فەرزەکان ئەگرێتەوە، دیارە تەنها ئەوە ناکرێ بە بەڵگە و رابەر، کەواتە چاکتر ئەوەیە کە لە کاتی تەفسیری ئایەتەکەدا وتمان کە ئەوەش مانا و مەبەستە بە پێی زمانی عەرەب و شتێکی ئاشکرایشە قورئان ئەبڕێ بەسەر مانا و مەبەستە عەرەبی یەکەیدا مەگەر رابەر و بەڵگەیەکی شەرعی ببێ بۆ لادانی لەو مەبەستە.
بەڵێ بەلامەوە شتێکی جوانە رای یەکەم بکرێ بە تەفسیری و لەهەمان کات دا بڵێین: ئەم ئایەتە دەست نیشانی تیایە بەو پێنج فەرزە و کاتەکانیشیان، هەڵئەگرێ ئەوەی ئەگێڕنەوە لە ئیبن و عەباسەوە مەبەست ئەم دەست نیشانە بێت. بەهەر حاڵ و لەسەر هەر بار دەرئەکەوێ کە ئەم کاتە دیاریی کراوانە نرخێکی تایبەتی یان هەیە لای خوا و یاد و پەرستنی خوا تیایان دا گەورەتر و پێویست ترە، ئیتر بەهۆی ئەوەوە بێ کە بەرهەمی دەسەڵات و بەزەیی و چاکەکردنی خوا لەم کاتانەدا ئاشکرا تر و بەتین تر و گەورەترە یا لەبەر هەر هۆیە تریشە کە خوا خۆی ئەزانێ. هەروەها دەرئەکەوێ کە پێویست نەکراوە لەسەر ئادەمی هەمیشە سەر بکاتە خواپەرستی و هەر ئەوە کارو پیشەی بێت بە وێنەی مەلائیکە کە کار و پیشەیان تەنیا خواپەرستی یە و بە بێ ئەوە گوزەران ناکەن.
ئادەمی وا دروست کراوە ببێتە جێنشین لەم جیهان و زەوی یەدا و کاروباری ژیان بگرێتە دەست و تێکۆشان بکات بە گوێرەی بەرنامەی خوا پیت و فەڕ و خێرو بێری ئەم جیهانە فەراهەم بێنێ و دەست کەوتی بکات، دیارە لەگەڵ ئەم هەموو ئەرك و کارو فرمانەدا ناگونجێ هەمیشە سەر بکاتە خواپەرستی، بەڵام خوای خاوەن بەزەیی ئەوەندە بە لوتفە هەموو تێکۆشان و هەوڵ و تەقالای ئەم جیهان و ژیانە بە خواپەرستی وەرئەگرێ و پاداشتی ئەداتەوە لەسەریان لە رۆژی دوایی دا ئەگەر هەوڵ و تێکۆشانەکەی بە پێی بەرنامەی خوا بێت و رەوا و شەرعی بێت. ئەم ئایەتە یاد و تەسبیح و سوپاسەکەی پێکەوە باس کرد و پەیوەندی دان بەو کاتانە و بە ئاسمانەکان و زەوی یەوەو بەهۆی ئەوەوە دڵ و دەروونی بەستەوە بە یادی خواوە لە هەموو شوێن و کاتێك دا، هەست داری کرد بە بەسترانەوە و پەیوەندی بوونەوەر و رووداوەکانی بە خوای پەروەردگارەوە... ئینجا بەهۆی ئەوەوە هەمیشە دڵ و دەروون کراوە و بێدار و وریا ئەبێت، هەرچی ئەبینێ و ئەیبیستێ هەستی پێ ئەکات، هەموو یاد و سوپاسی خوای بیر ئەخەنەوە، پەیوەندی پێ ئەکەن لەگەڵ پەروەردگاری خۆی و ئەو هەموو بینراوو بیستراوە و هەست پێ کراوانەدا.

﴿يُخْرِجُ ٱلْحَيَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَيِّ﴾ خوا زیندوو له مردوو دەرئەهێنێ، مردوو له زیندوو دەرئەهێنێ، ﴿وَيُحْيِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَاۚ﴾ زەوی زیندوو ئەکاتەوە لەپاش مردن و وشک بوونی... ئەو کردەوە گرنگە شتێکی هەمیشەیی یە بێ وەستان و بەرگری لە هیچ کاتێ لە کاتەکانی شەو و رۆژ و لە هیچ شوێن و جێگایەك دا، بەسەر ئەم زەوی یە و لەناو و لە کاتەکانی شەو و رۆژ و لە هیچ شوێن و جێگایەك دا، بەسەر ئەم زەوی یە و لەناو و لەلای سەرویەوە و لە بیخ و ناخی دەریاکان دا... لە هەموو کاتێك دا ئەو گۆڕان و ئاڵ و گۆڕە روو ئەدات و بەدی دێت، بەڵکو ئەو موعجیزە گەورەیە کە هەموو کەس لە ئاستی دەستە پاچە و داماوە هیچ کەس نازانێ چۆن پەیدا ئەبێت و لە کوێوە دێت و بۆ کوێ ئەڕوا و چۆن فەراهەم دێت؟ ئەم موعجیزە گرنگە و ئەم شتە سەر سوڕهێنەرە هەمیشە روو ئەدات و بەدی دێت و کەچی بەهۆی زۆری ئولفەت پێوە گرتنەوە لێ ی بێ ئاگا ئەبین و سەرمان سوڕ نایەت لێ ی، لە هەموو کاتێك دا زیندوویە لە مردوو دەرئەچێ و مردوویە دەرئەچێ. لە هەموو کاتێك دا چەکەرەیەکی وەستاو ئەکەوێتە بزووتنەوە لە سکی دانەوێڵە یان ناوکە تۆمەیە دەرئەپەڕێ و دێتە دەرەوە و لەتی ئەکات و گیانی ئەکرێ بە بەردا، لەهەموو کاتێك دا چڵە گیا یان پەلکە گەڵایەك یان لقە دارێ یان درەختێ ئەمرێ و وشك ئەبێت و ئەگۆڕێ بە شتێکی پەل پەل و داڕزاو، لەناو ئەو پارچە و پەلە وشك و داڕزاوانەدا دانەوێڵەیەکی تازەی وەستاوی بێ بزووتنەوە دەست ئەکەوێ کە ئامادەیە بۆ روان و سەوز بوون و گیان وەرگرتن، لە هەموو کاتێك دا نوختەیەك گاز و هەڵمێ هەیە کە بەرز ئەبێتەوە بە حەوادا یان ئەبێتە خۆراك بۆ پارچە گڵ و خۆڵێ بە هۆی ئەوەوە ئامادە ئەبێ بۆ رواندن، لە هەموو کاتێك دا گیان ئەچێ بە بەری بێچوویەك دا، هینی ئادەمی یان چوار پێ یان باڵدار یان هەر گیاندارێ تر، ئەو لەش و تەرمە بێ گیانە کە ئەکەوێتە ناو زەوی و تێکەڵی خۆڵ ئەبێت و شەحن ئەبێتەوە بە گاز و هەڵم، ئەوانە ئەبن بە کەرەسەیەکی تازە بۆ گیان و خۆراکێکی تازە بۆ دانەوێڵە و گیان درەخت و سەوزە، ئینجا بۆ ئاژەڵ و چوار پێ و ئادەمی و گیا و لەبەران!! وێنەی ئەمە روو ئەدات لەناو بێخی دەریا و لە بۆشایی لای سەرومان دا. بەڕاستی ئەو چەرخە و کردەوە دەورەیەکی نایابی هەمیشەیی سامناکی سەرسوڕهێنەرە بۆ هەرکەسێ بیری لێ بکاتەوە بە هەستێکی وریا و بە دڵ و دەروونێکی رووناکی بیناوە، سەرنجی بدا بە پێ ی رێنموونی قورئان و نوور و رووناکی قورئان.

وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١٩﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ﴿٢٠﴾
وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً

﴿وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ﴾ هەر بەو جۆرە دەرئەهێنرێن لە گۆڕەکانتان و زیندوو ئەکرێنەوە. واتە هەرچۆنێ لەم جیهانەدا ئەزانن و ئەبینن خوا لە مردوو زیندوو دەرئەهێنێ هەروەها لە ڕۆژی دوایيش دا ئێوە زیندوو ئەکرێنەوە و لەو خاك و زەوی یە مردووە دەرئەهێنرێن، کەواتە زیندوو کردنەوە شتێکی باوی ڕووداوە و شتێکی تازەگی نەناسراو نی یە، بەڵکو لە هەموو کاتێکی شەو و ڕۆژ و لە هەموو شوێنێك دا بە زۆری ڕوو ئەدا و بەدی دێت. ئینجا چەند ڕابەرێکی ڕوون و بەهێز ئەهێنێ لەسەر ڕاستی زیندوو کردنەوە و دووبارە کردنەوە لە ڕۆژی دوایی دا، هەرکام لەو ڕابەرانە شایەتن لەسەر دەسەڵات و زانینی بێ سنووری خوا و کاردروستی خوا، ئەفەرموێ: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ﴾ هەندێ لە ڕابەر و نیشانە ڕوونەکانی خوا ئەمەیە کە ئێوەی دروست کردووە لە خاك ﴿ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ﴾ ئینجا لەپاش ماوەیەك و بڕینی چەند قۆناغێ ئیتر کوت و پڕ ئێوە ئادەمی یەکن بڵاو ئەبنەوە بە زەوی دا و خەریکی کارو فرمان و پێك هێنانی مەبەستی خۆتان ئەبن. لە شوێنێ تردا ئەفەرموێ ﴿مِّن طِينٍ﴾ واتە لە قوڕ، لە شوێنێ ترا ئەفەرموێ: ﴿مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾ واتە قوڕێکی ڕەشی ترشاو، لە شوێنێ ترا ئەفەرموێ: ﴿مِّن طِينٍ لَّازِبٍ﴾ لە قوڕێکی مچ. لە شوێنێ تردا ئەفەرموێ: ﴿مِن صَلْصَٰلٍ كَٱلْفَخَّارِ﴾ لە قوڕێکی وشك و ڕەق بووەوە ئەگەر تەقەی لێ بدرێ دەنگ ئەداتەوە و زرنگەی دێت بە وێنەی سواڵەت. لە شوێنێکی تردا ئەفەرموێ: ﴿مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ﴾ لە خولاسەو پاڵفتەیە لە قوڕ. ئەمانە هەموو ڕاستە و هەریەکە قۆناغێکە تێپەڕی کرد بەسەر ئادەم و ئادەمی دا، لەهەر شوێنێ باسی قۆناغێ ئەفەرموێ کە پەیوەندی بەو شوێنەوە پتر و بەهێزترە، بۆ وێنە لێرەدا ئەفەرموێ: لە خاك کە دوورترین قۆناغە و مردوویەکی بێ جوڵە و بزووتنەوەیە و کەچی وان نیشان ئەدات لە پڕێکا ئەبێ بە ئادەمی یەکی زیندووی گەڕۆکی بزووتنەوەدار، کە بەم جۆرە بەرامبەریی ئەم دوو قۆناغە بەتین ترە و

گواستنەوە لە قۆناغی خۆڵی وشکی مردووی بێ جوڵە بۆ قۆناغی ئادەمی یەکی زرت و زیندووی تێرو تەواو، ئەم گواستنەوە زۆر دوور و زۆرتر جێگای سەرسوڕمانە، رێك ترە لەگەڵ سەرەتای ئایەتی پێشوودا کە فەرموی: ﴿يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ﴾.

ئەم گۆڕان و گواستنەوەیە موعجیزەیەکە هەموو کەس لە ئاستی سەرسامە، رابەرو نیشانەیەکی روونە لە رابەر و نیشانە روونەکانی زۆر و دەسەلاتی بێ سنووری خوا، بێدار کەرەوەمانە بەو پەیوەندی یە بەتینەی کە هەیە لە نێوان ئادەمی و ئەو زەوی یەی کە بەسەریەوە ئەژی، لە بنەڕەت دا لەشی لەو پێك هاتووە، کەواتە ئەبێ یەك دەستی قودرەت ئیش کەر بێت لە ئێمەیش و لەویش دا، بێگومان هەرکەسێ دڵ مردوو نەبێ بە بیرکردنەوە لەم جۆرە شتانە دەروونی دێتە سۆز و پەرۆش بۆ گوێ رایەڵی و سوپاس و سەنای ئەو پەروەردگارە و چاولەبەری ئەو هەموو چاکە و بەهرەیە کە نایەتە ژمارە.

ئینجا رابەر و نیشانەیەکی روون و بەهێزی ترمان ئەخاتە پێش چاو لە بارەی دوو جۆری ئادەمی ویەك خستنی ئەو دوو جۆرە و هاوبەشی یان لە ژیان دا بە سۆزو پەرۆش و خۆشەویستی و ئەفەرموێ: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا﴾ هەندێ لە رابەر و نیشانە روونەکانی خوا ئەمەیە کە دروستی کردووە بۆ ئێوە لە خۆتان و تیرەی خۆتان حەڵاڵ و هاوسەران ﴿لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا﴾ بۆ ئەمەی مەیلتان بچێ بۆلایان و ئارامی دڵتان ببێ پێ یان، چونکە ئاشکرایە یەکێتی و هاوتیرەیی هۆی ئەو ئولفەت و ئارامەیە، هەرچۆنێ جیاوازی تیرە هۆی یەك نەگرتن و بێزرانە. ﴿وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾ گێڕاویەتی لە نێوانتان دا خۆشەویستی و سۆز و بەزەیی پێتان دەربارەی یەکتر. خەڵکی هەست ئەکەن و ئاشنان بەو پەیوەندی یە بەهێزەی کە هەیە لەنێوان پیاو و ئافرەت دا بەو خۆشەویستی و سۆزە بەتینەی کە دڵ و دەروون و دەماری داگیر کردوون، بەڵام کەم جار بیر ئەکەنەوە لەو دەستە قودرەتەی کە ئەو کردەوە گرنگەی کردووە، نێرو مێ ی بەو جۆرە یەك خستووە و بەستوونی پێکەوە و کردوونی بە هۆی خۆشی و ئارامی دڵی یەکتر و مانەوەو پەرەسەندنیان، زۆربەی خەڵکی بیر لەو شتە گرنگە ناکەنەوە لەبەر ئەوە قورئان سەرنج رائەکێشێ و بەو جۆرە نەرم و ناسکە ئەو بەهرە و چاکە گەورەیە ئەخاتە بەرچاو،

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بەڕاستی لەو کردەوە گرنگەی خوادا چەند بەڵگەو نیشانەی روون هەیە بۆ ئەوانەی بیر ئەکەنەوە و بەهۆی ئەوەوە تێ ئەگەن لە لێزانی و کاردروستی خوا لە دروست کردنی ئەم دوو تیرە – پیاو و ئافرەت – بە جۆرێ هەرکام رێکن لەگەڵ ئەوی تردا، پێویستی سروشتی یەکتر پێك ئەهێنن: دەروونی و ژیریی و لەشیی، بە جۆرێ ئارام و دامەزراوی و رەحەتی یان هەیە لای یەکتر، لە کۆبوونەوە و یەك گرتنیانا سۆز و بەزەیی و خۆشەویستی هەیە تا ببێتە هۆی ژیان و مانەوەیان پێکەوە و حەوانەوەیان لە لانەو یانەیەك دا کە پێویستە بۆ خۆیان و بۆ رۆڵەکانیان تیای دا بژین و پێ بگەن و پەروەردە بکرێن. چونکە ئادەمی بە وێنەی گیان لەبەرانی تر نی یە تەنها ئارەزووی نێرو مێی بەس بێت و مەبەست لە یەك گرتنیان تەنیا زاوزێ و پەرەسەندن و مانەوەی تیرەکە بێت بەهۆی بەجێ هێنانی ئەو ئارەزووە نێرو مێی یەوە، ئادەمی ئاشکرایە جۆری ترە و دروست کراوێکی تایبەتی یە، بۆ مەبەستێکی گرنگ دروست کراوە، کەواتە ئەبێ ژیان و گوزەرانێکی تایبەتی هەبێ. ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ هەندێ تر لە رابەر و بەڵگە روونەکانی خوا دروست کردن و فەراهەم هێنانی ئاسمانەکان و زەوی یە، ئەم نیشانە و بەڵگە روونە زۆر جار قورئان دەست نیشانی بۆ ئەکات و سەرنجی بۆ رائەکێشێ، زۆرجار ئێمە ئەو ئایەتانە ئەخوێنین و بە چەسپانی تێپەڕ ئەکەین بەلایان دا و بێ وەستان و بیرکردنەوە لێ یان... بێگومان زۆر شایانن بە بیر لێ کردنەوەو بە درێژیی وەستان لە بەردەمیان دا.

مەبەست بە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و داهێنانی ئەم بوونەوەرە گرنگە گەورەیە کە ئەوپەڕی وردە کاری کراوە لە هەموو بەش و پارچەیەکیدا، بەجۆرێ کە بە هیچ کلۆج دەست نادات بۆ گۆڕان و دەست تێ خستن، ئەم بوونەوەرە کە ئێمە بەشێکی زۆر کەم نەبێ لە هیچی حاڵی نین و تێ نەگەیشتووین، ئەم کۆگا و کۆمەڵە ئەستێرە و مانگ و رۆژ و سەدیم و مەجەڕەکانیشی ئایەتە ژمارە بۆ ئێمە، ئەم کۆگا گەورەیە کە ئەم زەوی یە گەورەی

ئێمە هیچ چاو نادا لەناوی دا مەگەر بە وێنەی ئەو زەر رانەی هەناسەوە پرژ و بڵاو دەبنەوەو لەناو تیشکی خۆردا دەرئەکەون کاتێ لە کون و دەلاقەی خانوو سەرنج ئەدرێن. واتە ئەم زەوی یە گەورەی ئێمە لەناو ئەو بوونەوەرەدا بە وێنەی ئەو زەڕانەیە لەناو ئەم زەوی یەدا!! لەگەڵ ئەم هەموو گەورەیی یەدا زۆر بە وردی ئەوپەڕی رادە یەکێتی و گونجاوی و رێك و پێکی تێبینی و چاودێریی کراوە لە نێوان هەموو بەش و پارچەیەکی دا لەبارەی قەبارە و خولگە و خولانەوە و بزووتنەوە و رادەی دووری و نزیکی یان لە ئێمەیش و لە خۆیشیانەوە، هەروەها لە هەموو بار و روویەکی ترەوە. ئەمانە هەموو لەبارەی شێوە و رژێمی گشتی یەوە و لەبارەی ئەو هەموو وردەکاری و ئەو شتە نهێنی یانە و ئەو هەموو هێزە جیاوازانەی کە تیای دا داشاراوە... لەم بارەیانەوە لە سنووری زانین و تێگەیشتنی ئێمە بەدەرن، شتێك زۆر زۆر کەم نەبێ ئێمە ئاگادار نین پێی، تەنانەت لەبارەی ئەم زەوی یەیشەوە کە بەسەریەوە ئەژین تا ئێستا شتێکی زۆر کەمی لێ تێگەیشتووین و زانا بووین پێی. ئەمانەی کە وتمان و دەست نیشانمان بۆ کردن وەکو چاو پیا هەڵخشانی وابوو سەبارەت بە گرنگی و نایابی ئەم بوونەوەرە کە هەموو شتێ رابەرو نیشانەیەکی زۆر روون و ئاشکرایە و کەچی ئێمە تێپەڕ ئەکەین بەسەریان دا و بیریان لێ ناکەینەوە. بەڵام زۆر بە درێژیی ئەکۆڵینەوە بە سەرسامی یەوە ئەدوێین و سەرنجی ئامێر و کۆئەندامی ئەدەین کە ئادەمی ئەم زەوی یە پێکی هێناوە لە کەرەسەکانی ئەم زەوی یە و کۆی کردوونەتەوە و لکاندوونی پێکەوە و بۆ ماوەیەکی کەم ئیش ئەکەن و لەپاش دا لەکار ئەکەون. ئینجا سەیر تر ئەمەیە کە هەندێ سەر لێ شێواو و گومڕا و نەفام هەن لایان وایە ئەم بوونەوەرە گرنگە نایابە وردەکاری تیا کراوە و هەروا لە خۆیەوە پەیدا بووە و بە بێ داهێنەرێکی زانای لێزانی دەسەڵات داری کاردروست، ئەم رژێمە رێك و راستە نەگۆڕاوە لە خۆیەوە ئەڕوا بەڕێوە، بەڵام ئەو نەفامانە کە بێ بەشن لە ژیریی هەرگیز بڕوا ناکەن ئەم ئامێر و کۆئەندامانە لە خۆیانەوە پەیدا ئەبن و کاروباریان ئەڕوا!!

خوا پەنامان بدات لە نەفامی و گومڕایی.

وَٱخۡتِلَٰفُ أَلۡسِنَتِكُمۡ وَأَلۡوَٰنِكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡعَٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيۡلِ
وَٱلنَّهَارِ وَٱبۡتِغَآؤُكُم مِّن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ
يُرِيكُمُ ٱلۡبَرۡقَ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَيُحۡيِۦ بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ

**ئینجا لەگەڵ ئاسمان و زەویدا نایابی جیاوازی زمان و ڕەنگ ئەخاتە بەرچاو ئەفەرموێ: ﴿وَٱخۡتِلَٰفُ أَلۡسِنَتِكُمۡ وَأَلۡوَٰنِكُمۡ﴾ هەندێکی تر لە بەڵگە و نیشانە ڕوونەکانی خوا جیاوازی زمان و ڕەنگتانە. بێگومان ئەبێ ئەو جیاوازی یە پەیوەندی ببێ بە دروست کردنی ئاسمانان و زەوی یەوە، چونکە جیاوازی ئاو و هەوا و جەو و بیئە بەسەر ئەم زەوی یەوە کە پەیدا ئەبێ لە سروشتی باری زەوی لەگەڵ ئاسمان دا، ئەو جیاوازیانە پەیوەندی یان هەیە بە جیاوازی زمان و ڕەنگەوە. زۆربەی زانایانی ئەم چەرخە جیاوازی زمان و ڕەنگ ئەبیستن و ئەبینن، ئینجا تێپەڕ ئەکەن بەسەری دا بە بێ ئەمەی بە چاوی دڵیان دەستی قودرەتی خوا ببینن لەو کارەدا، هەرچۆنێ کوێرن لە ئاستی بەڵگە و نیشانە ڕوونەکانی ئاسمان و زەوی، هەندێ جار ئەکۆڵنەوە لەو شتە گرنگە سەرسوڕهێنەرانە، هەست ئەکەن بە نایابی یەکەیان. بەڵام بیر ناکەنەوە و ناوەستن لەبەردەمیان دا بۆ ئەمەی ئەو پەروەردگارە گەورەیە بناسن و سەری بەندەیی بۆ داخەن، ئەوەش لەبەر ئەوەیە زۆربەی ئادەمی نەزانن. زانان بە تەنیا توێکڵ و ڕواڵەتی ئەم ژیانی دنیایە، ئەو نیشانە و ڕابەرانە هەرچەند زۆر ڕوون و ئاشکران ئەوانە هەستیان پێ ناکەن و زانا نابن پێ یان، بەڵکو زانایانی ڕاستەقینە هەستیان پێ ئەکەن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡعَٰلِمِينَ﴾ بێگومان لەوەی کە باس کرا چەند ڕابەرێکی ڕوون هەیە بۆ زانایان، ئەو زانایانەی کە بیر ئەکەنەوە لە دروست کراوەکانی خوا، بەهۆی ئەوەوە ئەزانن ئەوانە لە خۆڕ دروست نەکراون، بەڵکو بۆ مەبەستێکی گرنگ دروست کراون، بە ئەوپەڕی لێ زانیوە و فەراهەم هێنراون. ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱبۡتِغَآؤُكُم مِّن فَضۡلِهِۦٓ﴾ هەندێ لە نیشانە و بەڵگە ڕوونەکانی خوا خەوتنتانە لە شەو و ڕۆژدا و داوا کردن و هەوڵدانتان بۆ هەندێ لە ڕزق و ڕۆزی کە بە لوتفی خوا فەراهەم دێت و دەست کەوت ئەبێ. خەوتنتان لەو دوو کاتەدا بۆ حەوانەوە و ماندوو دەرچوونی هێزو وزەکان، هەروەها کۆششتان بۆ هۆی**

ژیان و گوزەران لەو دوو کاتەدا. چونکە خەو و تێکۆشان لە هەردوو کاتەکەدا ئەکرێن بە تایبەتی لەم چەرخەدا. یان مەبەست ئەوەیە خەوتن بۆ شەو و تێکۆشان بۆ ڕۆژ چونکە خەوتن مافی شەوە و شایانترە بۆی، وەکو تایبەتی بێت پێ یەوە، هەروەها تێکۆشان سەبارەت بە ڕۆژ، بەلام بە جۆرێ فەرمودەکەی هۆنیوەتەوە هەردوو کاتەکە بۆ هەردو مەبەستەکە دەست ئەدا چونکە بێگومان لەکاتی پێویست دا هەردو لە هەردو کاتەکەدا بەجێ ئەهێنرێن. بێگومان هاتنی شەو و ڕۆژ بەم شێوە نایابە و بەو ڕژێمە ڕاستە نەگۆڕاوە و ئینجا فەراهەم هێنانی خەوتن و هۆی تێکۆشان و گونجانی باری زەوی و بوونەوەر لەگەلْ ئەم شتە پێویستانەدا و ئەم هەموو هۆی ژیان و گوزەرانە کە خوا ڕێك و پێکی کردووە بۆ ئەم بەندەیانە، هەرکام لەمانە کە باس کران ڕابەرو نیشانەیەکی ئاشکران بەلام کەسانێ هەستی پێ ئەکەن و سوودی لێ وەرئەگرن کە بیسندە و گوێ گرن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾ بەڕاستی لەوانەدا کە باس کران چەند ڕابەر و نیشانەیەك هەیە بۆ ئەوانەی کە ئەبیستن، واتە بە بیستنی تێگەیشتن و وەرگرتن. ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا﴾ هەندێ تر لە ڕابەرو نیشانە ڕوونەکانی خوا ئەمەیە کە چەخماخەتان نیشان ئەدات لە کاتێك دا مەترسی ئەکەن لە هەورە تریشقە و ئومێدی بارانیش ئەکەن کە هۆی ژیانە، ﴿وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً﴾ ئەهێنێتە خوارەوە ئاوێك لەلایەن ئاسمان و لای ژوورەوە، ﴿فَيُحْيِي بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ ئینجا بەو ئاوە زەوی زیندوو ئەکاتەوە بە ڕواندنی ڕوواوەکان لەپاش مردن و وشك بوونیان. چەخماخە پەیدا ئەبێ بە پێی ڕژێمێکی ئەم بوونەوەرە و هۆکەی بەلای هەندێ کەسەوە ئەمەیە کە پزیسکەیەکی کارەبایی دەرئەچێ و بەرەو بنەوە لە نێوان هەردوو پارچە هەورەکەوە کە کارەبای زۆریان پێوەیە، یان لە نێوان پارچە هەورێك و قەبارەی شتێکی ئەم زەوی یە بۆ وێنە پۆپە و سەری شاخێ. بەهۆی ئەوەوە هەوا لەو شوێنەدا لەت ئەبێت و دەنگێ پەیدا ئەبێت کە پێی ئەلێن هەورە گرمە. زۆرجار لەگەلْ ئەوەدا باران ئەبارێ هۆی ئەو چەخماخەیە ئەوە بێت یان هەرشتێ تر ئەو ئاگرو چەخماخەیە پەیدا ئەبێ بە پێی ڕژێمێکی ئەم بوونەوەرە بەو جۆرە خوا دروستی کردووە و بڕیاری داوە.

قورئانی بەفەڕ بە پێی سروشت و باوی خۆی زۆر درێژە نادا بەم جۆرە شتانە لەم بارەوە کە چین؟ بەهۆی چی یەوە پەیدا ئەبن؟ بەڵکو لەبارێکەوە لێ یان ئەدوێ کە بیانکات بەهۆی پەیوەندی و بەستنەوەی دڵ بە پەروەردگاری یەوە، جا لەبەر ئەوە ئەوەتا لێرەدا ئەو روون ئەکاتەوە و ئەیخاتە بەرچاو کە ئەو چەخماخەی نیشانیان ئەدات نیشانە و بەڵگەیەکە لە نیشانە و بەڵگە روونەکانی خوا، هەروەها دوایی ئایەتەکە ئەمێنێ بەم رستەیە: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ بێگومان لەوانەی کە وترا چەند بەڵگە و نیشانەیەکی روون و گەورە هەن بۆ ئەوانەی کە ژیرن و ژیریی خۆیان بەکار ئەهێنن لە چۆنێتی پێك هاتنی ئەو جۆرە شتانەدا، لە دۆزینەوە و ناسینی هۆی پەیدا بوونیان تا بۆیان دەرکەوێ ئەوپەڕی دەسەڵات و توانای بێ سنووری خوا. ئاشکرایە کە ژیریی بەری بەرەڵایە بۆ تێڕوانین و بیرکردنەوە ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ تَقُومَ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ بِأَمْرِهِ﴾ هەندێ لە بەڵگە و نیشانە روونەکانی خوا ئەمەیە کە ئاسمان و زەوی راوەستاون و راگیرن بە فەرمان و خواهیشی خوا، لەسەر ئەو باری خۆیانە ئەمێننەوە تا ماوەی دیاریی کراویان. بەڵێ بەڕاستی راگیر بوون و مانەوەی ئەم ئاسمان و زەوی یە بەم رێك و پێکی و نەگۆڕانە، بزووتنەوە و گەردش و خولانەوەی ئەو هەموو شتە گەورانە بە بێ وەستان و دوا و بەر، لەسەر ئەو بار و شێوە تایبەتی یە و دیاریی یە ئەم راگیر بوون و مانەوە نیشانەیەکی زۆر روون و ئاشکرایە کە نابێ و ناگونجێ بە بێ زۆر و دەسەڵات و لێزانی یەکی بێ سنوور، هیچ کەس لەم بوونەوەرەدا ناتوانێ بڵێ: من ئەوە ئەکەم و ئەوەم بەدەستە. هەرکەس خۆی بە خاوەن ژیریی دابنێ و رێزی خۆی بەلاوە بێت هەرگیز ناڵێ: لە خۆیەوە راگیرە و بە بێ کەس. واتە هەموو خاوەن فام و ژیریی یە ناچارە ئەبێ بڵێ: ئەو کاروبارە هەمووی بەدەست خوایە و بەو راگیرە. ئینجا کاتێ ئەم ئاسمان و زەوی و بوونەوەرە گەورەیە نەتوانێ سەرپێچی و ملە جەڕێ بکات لە فەرمان و خواهیشی خوا ئەی مردووەکان چۆن ئەتوانن سەرپێچی بکەن لە فەرمان و خواهیشی خوا بۆ زیندوو کردنەوەیان؟ بێگومان بە هیچ رەنگ سەرپێچی ناکەن و بە چەسپانی دێن بەدەم ئەو فەرمان و بانگ کردنەیانەوە وەکو ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ﴾ ئینجا لەپاش دواهاتنی ماوەی راگیر کردنی ئاسمان و زەوی کە کاتی نەمانی ئەم جیهانەیە و هاتنی رۆژی دوایی، کە لەو کاتەدا ئەم ئاسمان و زەوی یە تێك ئەشێوێن و وێران ئەبن،

إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ إِذَآ أَنتُمْ تَخْرُجُونَ ﴿٢٥﴾ وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿٢٦﴾

---

پاش دواهاتنی ئەو ماوەیە ﴿إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ﴾ کاتیٚ بانگتان ئەکات بە بانگ کردن لە زەوی یەوە، بەم رەنگە ئێوە هەموو وان لەناو زەویدا و بانگتان لیٚ ئەکات ئەی مردووەکان وەرنە دەرەوە ﴿إِذَآ أَنتُمْ تَخْرُجُونَ﴾ لەگەڵ ئەو بانگەی لیٚ کردن ئیتر دەست بەجیٚ ئێوە دێنە دەرەوە لەناو زەوی و لە گۆڕەکانتان بە زیندوویی.[1] ئەگەر ئەو بانگ کەرە ئیسرافیل بێت وەکو لە چەند ریوایەتێکی حەدیس دا هەیە ئەوە هیچ جێگای لێکۆڵینەوە و قسە و باس نی یە، ئەگەر مەبەست خوا بیٚ بوونی مردووەکان لە زەوی دا بەسە بۆ راستی و گونجاوی فەرمودەکە و پێویست ناکات بە بوونی بانگ کەر لەسەرینی شاخەکە و ئەویش دەست بەجیٚ هاتە خوارەوە، یان بانگم لیٚ کرد لە خوارەوە و بە گورجی هات و بەرز بوویەوە بۆ سەر شاخەکە. دەی لە هەردوو وێنەکەدا تەنیا بانگ لیٚ کراو هەیە لەسەریان لەخواری شاخەکە.

ئینجا بەدوای ئەو هەواڵ و بڕیارەدا ئەم فەرمودەیە ئەهێنیٚ: ﴿مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾ هەرکەس لە ئاسمانەکان و زەوی دایە هەمووی هینی خوایە و تایبەتی یە بە خواوە بە دروست کردن و موڵکایەتی و راگیر کردن و چاودێریی و بەڕێوە بردنی هەموو کاروبارێکیان، هەموو ئەوانە مل کەچن بۆ خواهیش و بڕیار و کردەوەی خوا تیایان دا ناتوانن سەرپێچی بکەن و یاخی بن لە هیچ کردەوە و خواهیشیٚ، ئیتر با زۆر لە جن و ئادەمی گویٚ رایەڵی فەرمانی نەبن و ژێریی و دڵیان یاخیی بن لە ناسین و باوەڕ پیٚ ی. ئینجا باسی داهێنان و دروست کردنی یەکەم جار و زیندوو کردنەوە و دووبارە کردنەوە دووبارە ئەکاتەوە بەهۆی بیٚ ئاگایی زۆربەی خەڵك لەوە و بەتینی و دامەزراوی یان لە بیٚ بڕوایی بەو شتە راستانە کە ژێریی تێرو تەواو بڕوادارە پیٚ یان،

---

[1] بە پیٚ ی تەفسیرەکە وشەی (ثم) بۆ گەیاندنی دواکەوتنی کاتی بەدی هاتنی هەواڵێکە کە لە پاشەوە دێت لەوەی کە وتراوە لە پێشی یەوە. هەندیٚ ئەفەرمون: بۆ گەیاندنی دواکەوتنی هەواڵدانە بە رستەی پاشی لە هەواڵدان بە رستە پێشووەکان. واتە پاش هەواڵ دان بەو هەموو بەڵگە و نیشانانە ئینجا هەواڵ ئەدەین بە زیندوو بوونەوەتان، ئەمەیش جوان و رێکە. هەندیٚ تر ئەڵێن: بۆ گەیاندنی جیاوازی رادە و پلەیە. رایە تر ئەڵیٚ: بۆ گەیاندنی دووری یە ئیتر کاتی یان پلە و رادە.

﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِۚ وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٧﴾﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾ تەنها خوا کەسێکە لە یەکەم جارەوە خەڵکی دروست ئەکات و لە پاشان دوای مراندنی دووبارەی ئەکاتەوە و زیندووی ئەکاتەوە. دووبارە کردنەوەی ئەو مەبەستە ئەم رستەیەی تیایە کە لە پێشەوە نەبوو: ﴿وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِۚ﴾ دووبارە کردنەوە ئاسانتر و سووك ترە لەسەر خوا لە دروست کردنی یەکەم جار. بێگومان هەموو شتێك سووك تر یان گرانتر نی یە لە شتی تر لەسەر خواو بەلای خواوە. بەڵکو هەموو شتی یەکسان ئاسانە، دروست کردنی سێڵێ یەکسانە لەگەڵ دروست کردنی هەموو بوونەوەر بۆ خوا، هەموو وەك یەك هیچی پێ ناوێ جگە لە روو کردنی مەیل و خواهیشی خوا بۆی ئیتر بێ دواکەوتن ئەبێت. بەڵام ئەم فەرمودەیە ئاراستەی خەڵکی کراوە بە پێی فام و تێگەیشتنیان، بە تێگەیشتن و زانین و دەسەڵاتی خەڵکی داهێنان و پێك هێنانی یەکەم جار گران و قورس ترە لە دووبارە کردنەوە، کەواتە بۆ ئەبێ دووبارە کردنەوە بۆ خوا بە قورس و گران سەیر بکەن، بەڵکو بە شتێکی نەگونجاوی دابنێن؟[1] ﴿وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ﴾ تەنها بۆ خوا هەیە سیفەت و نیشانەی نایابی زۆر بڵند جگە لەو کەسی تر وێنەی ئەوانەی نی یە بەڵکو سیفەتێکی نی یە نزیك بکەوێتەوە لە سیفەتی خوا. بەو سیفەتە نایابە بەرزانە ناسراوە و باس کراوە بە وتن یان بە نیشان دان و گەیاندن،﴿فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ لە ئاسمانەکان و زەوی دا، واتە بوونەوەر شایەتە لەسەر ئەو سیفەتانە و ئەیانگەیەنن و نیشانی ئەدەن و بە وتنیش ئەو سیفەتانە باس ئەکرێن بۆ خوا ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ تەنها ئەو خوایە زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و دەسەڵات دارێکە هەرچی ویست لێ ی یاخی نابێ و لێزان و کاردروستە و هەموو شتێکی لە جێگای خۆی دایە و بەرژەوەندی تیایە.

---

[1] ئەم گرێ یە کە ئەبینرێ لە وشەی ﴿أهون﴾ دا بە چەند جۆری تر تەفسیر کراوەتەوە: ١. وشەی ﴿أهون﴾ بە پێی دیمەن و رواڵەتەکەی مەبەست نی یە بەڵکو بە مانای ﴿هین﴾ مەبەستە و هیچ زیادەیەك ناگەیەنێ. ٢. داهێنان و دروست کردنی یەکەم جار فەزڵ و چاکەیەکە وەکو هیچ پێویست نەبێ کردنی، بەڵام دوای دروست کردن دووبارە کردنەوە وەکو پێویستی و واجبی لێ دێت. چونکە بە پێی سیفەتی عەدلی خوا تۆڵەو پاداشت پێویستە. کەواتە ئەبێ ئەم باشتر بکرێ و چەند جۆری تریش وتراوە.

ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِي مَا رَزَقْنَٰكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ

ئینجا ئەگەڕێتەوە سەر باسی تاك و تەنیایی خوا، وێنە و چیرۆكێ ئەهێنێتەوە بۆ بت پەرست و هاوبەش بڕیار دەرەكان سەبارەت بە ناڕاستی و ناڕەوایی ئەو بیرو باوەڕە ناڕاستەیان. بەڕاستی ئەگەر هۆشیان لای خۆیان بێت ئەبێ بە بیستنی ئەو وێنە و چیرۆكە شەرم بیانگرێ و كۆتایی بێنن لە بیرو باوەڕە پڕو پووچەكەیان، ئەفەرموێ: ﴿ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ﴾ ئەی كەسانێ كە هەندێ لە دروست كراوەكانی خوا ئەكەن بە هاوبەش بۆی و لەباتی ئەو ئەیپەرستن. خوا باس ئەكات بۆتان و وێنە و چیرۆكێكتان بۆ ئەهێنێتەوە و لە خۆتانی دائەڕنێ، دوور نی یە لە خۆتان و بە شوێن دا گەڕانی ناوێ بۆ دۆزینەوە و بیر لێ كردنەوەی... ﴿هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ﴾ ئایا هەیە بۆ ئێوە لە بەندەكانتان كەسانێ كە هاوبەش بن بۆتان ﴿فِي مَا رَزَقْنَٰكُمْ﴾ لەو سامان و دارایی و شتانەی كە ئێمە پێمان داون و كردوومانە بە ڕۆزیتان. ﴿فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ﴾ كەواتە ئێوە و ئەوان تیای دا یەكسان ئەبن ﴿تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾ تەقێ و ترێز و سام و بیمیان لێ ئەكەن بە وێنەی سام و بیمی خۆتان لە یەكتر لەنێوان خۆتان دا كە تاقمی ئازاد و خاوەن بەندەن؟ واتە ئایا ئێوە ڕەوا ئەدەن و ڕێگا ئەدەنە بەندەكانتان كە ئادەمی یەكن وەكو ئێوە ببن بە هاوبەشتان لەو شتانەی كە خوا پێی داون، ڕازین ئەوانە بێنە ڕیزی ئێوە و مەترسی بكەن لەمەی جەور و ستەمتان لێ بكەن و بیم بكەن لێ یان و زاتتان نەبێ شتیان داگیر بكەن؟ ئایا لەناو ناوچەی ئێوەدا شتی وا ڕەوا ئەدرێ؟ دەی كە لەناو ئێوەدا شتی وا ئەگونجێ و ڕەوا نەدرێ ئایا چۆن بۆ خوای ڕەوا ئەدەن لەكاتێك دا كە هیچ كەس و هیچ شت وێنەی خوا نی یە و سیفەت و نیشانەكانی بەرز و بڵند ترە لەوەی هیچ نزیكی سنووریان بكەوێتەوە؟ بەڕاستی وێنە و چیرۆكێكی ڕوون و ئاسان و ڕەوانە و شتێكی براوەیە و هیچ جێگای سەر لێ كردنەوە و دەمبازی نی یە، هەموو ژیریی یەكی ساغ و ڕاست وەری ئەگرێ.

كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْأَيَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَهْوَآءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍۖ فَمَن يَهْدِى مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًاۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَاۚ

**تەنها ئەو ژیرانەش سوود وەرئەگرن كەواتە تەنها ئەوانیش مەبەستن بۆ ئەم بەیان و باسانە وەكو ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْأَيَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ ئا بەو جۆرە ئێمە ئایەتەكان بە درێژیی و بە روونی باس ئەكەین بۆ گەل و كۆمەڵێ كە ژیرن و ژیریی خۆیان بەكار ئەهێنن لە بیر كردنەوە لەو مەبەستانەی ئاراستەیان ئەكرێن بە تایبەتی ئەم وێنە و چیرۆكانە.**

**دوای روون كردنەوە پڕو پووچی باوەڕە داڕزیوەكەیان، ئینجا هۆی سەرەكی و بنەڕەتی روون ئەكاتەوە ئەفەرموێ: ﴿بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَهْوَآءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ [1] ئەو بت پەرستانە كە ستەم كارن و كارو فرمانیان لە جێگای خۆی دا نی یە دەست درێژیی یان لە خۆیان كردووە بەمەی خستووتانەیە بەر سزای نەبڕاوە. ئەو ستەمكارانە شوێنی ئارەزوو و هەوای نەفسی خۆیان كەوتوون بە نەزانی و نەفامی كەواتە بەرگری كەرو جڵەوگیریان نی یە و هۆی گەڕانەوەیان نی یە. چونكە نەزانن و ئەگەر زانا بوونایە لەوانە بوون رۆژێ لە رۆژان زانینەكەیان بەرگری بكردنایە و جڵەوی بگرتنایە. ئەوانە بە پێی زانین شوێنی ئارەزووی نەفسی خۆیان كەوتوون، ئارەزووی نەفسیش هیچ یاسا و رژێم و بەراورد كەری نی یە، بەڵكو شتێكی دانەمەزراوی وەرگەڕاو هەردەمە بە بارێك دا، بێگومان هەركەس بەوجۆرە جڵەوی كاروباری خۆی بدا بە دەست ئەو ئارەزووە ناڕەوایەوە خوا گومڕای ئەكات، ﴿فَمَن يَهْدِى مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ﴾ دەی ئایا كێ هیچ كەس ئەخاتە سەر رێگای راست كە خوا گومڕای كردبێ؟ بێگومان هیچ كەس ناتوانێ چارەسەری ئەو گومڕاكراوانە بكات ﴿وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾ نی یە بۆیان هیچ كەس لە یارمەتی دەران كە بەرگری یان بكات لە دووچار بوونی پاشەڕۆژ و چارەنووسی بەدبەختی و نائومێدی، خوا بە بەزەیی خۆی گومڕامان نەكات و جڵەومان نەدات بەدەست ئارەزووی ناڕەوای نەفسمانەوە. ئینجا رووی فەرمودە ئەكاتە پێغەمبەر (ﷺ) كە بە رێكی راوەستێ لەسەر ئایینی راستی دامەزراوی نەگۆڕاوی خوا كە پاڵپشتە لەسەر**

---

[1] وشەی ﴿بل﴾ بۆ وازهێنانە لە لێكۆڵینەوە لەگەڵ ئەو بت پەرستانە و هەوڵدانی رێنموونی یان بەو جۆرە پێشووە، ئینجا روون كردنەوەی هۆی لادان و نەگەڕانەوەیان بۆ رێگای راست.

سروشتیٚ کە خوا ئادەمی لەسەر دارشتووە، ئەو ئایینەش تەنها عەقیدە و باوەڕێکە دامەزراو و تەنها ڕێگایەکی ڕاستە و هیچ تولە ڕێگای لیٚ نابێتەوە. کەواتە خاوەنی ئەو ئایین و عەقیدەیە تەنیا کۆمەڵێکە و نابن بەچەند گەل و تاقم و کۆمەڵیٚ بە وێنەی شوێن کەوتووەکانی ئارەزووی نەفس. ئەفەرمویٚ: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ﴾ کاتیٚ بەو هەموو بەڵگە و نیشانانە روون بووەوە تاك و تەنیایی خوا و هاتنی رۆژی دوایی، دەرکەوت راستی ئایینی خوا، بیٚ بڕواکان کە باوەڕ ناهێنن دڵیان مۆر کراوە بە هۆی شوێن کەوتنیان بۆ ئارەزووی نەفسی خۆیان، کاتیٚ کار بەو جۆرەیە کەواتە خۆت رێك و راست بکە بۆ ئایینی خوا و ئەوپەڕی رادە بە گرنگ بیگرە و رووی تیٚ بکە بە رێك و راستی و بە بیٚ لاکردنەوە بە هیچ لایەکی تردا، چونکە ئایینی خوا پەناو پارێزەرە لە شوێن کەوتنی ئارەزووە ناڕەواکانی نەفس کە بەش بەش و جیاوازن و حەق و راستی پاڵپشتیان نی یە و لە زانینەوە وەرنەگیراون و هیچ یاسا و رژێمیان نی یە و بیٚ بەشن لە رابەر و نیشانەی راستی یان. ﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا﴾[1] مەبەستەم بەو ئایینە سروشتی داهێنراوی خوایە کە ئادەمی داهێناو دروستی کرد لەسەری، بەم رەنگە ئەگەر ئادەمی وازی لیٚ بهێنریٚ و لانەدریٚ جگە لە ئایینی ئیسلام و خواپەرستی بە تاك و تەنیا هیچ ئایین و بیرو باوەڕێك ناگرێتە گەردن. چونکە هەست و فام و ژیریی یەکەی شتیٚ تر وەرناگریٚ، بێجگە لە ئایینی خوا هیچ شتیٚ تریش ناگونجیٚ لەگەڵ ئادەمی دا و پەیڕەوی ناکەویٚ، ئەو خوایەی کە دڵی ئادەمی دروست کردووە ئەو خوایە ئایینی بۆ ناردووەتە خوارەوە بۆ تیمار و چارەسەر کردنی لە هەموو دەرد و نەخۆشی یەکی دەروونی، بۆ راست کردنەوەی هەرکات لار و چەوت بوو، بۆ گێڕانەوە و هێنانەوەی بۆ سەر رێگای راست هەرکات ترازا و لایدا، ئەو خوایە ئاگادار تر و زانا ترە بە دروست کراو و داهێنراوی خۆی. ئەو بارەی ئادەمی لەسەر دروست کراوە شتێکی دامەزراوی نەگۆڕاوە، هەروەها ئایینەکەش دامەزراو و نەگۆڕاوە

---

[1] وشەی ﴿فطرت﴾ بە سیٚ جۆر تەفسیر کراوەتەوە:

١. ئایینی ئیسلام و تاك و تەنیایی خوا. ٢. ئامادەیی و گونجاوی بۆ ئایینی ئیسلام. ٣. پەیمانیٚ کە وەرگیراوە لە رۆح لە پێشەوە.

بەرەکام ئەگونجیٚ و دەست ئەدات، بەڵام لە تەفسیرەکەدا لەسەر رای یەکەم رۆیشتم چونکە چەند حەدیسی لەسەرە، دڵیشم بڕوای بەهێزتر بوو پێی و بەلامەوە گونجاو تر بوو، ئینجا ئەم وشەیە یان (مفعول) ە بۆ فیعلێکی لابراو: ﴿الزموا﴾ یا ﴿اتبعوا﴾ یان حاڵە یان مفعول مطلقە.

لَا تَبۡدِيلَ لِخَلۡقِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ۞
مُنِيبِينَ إِلَيۡهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ
دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗاۖ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾ وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرّٞ دَعَوۡاْ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ
إِلَيۡهِ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنۡهُ رَحۡمَةً

---

﴿لَا تَبۡدِيلَ لِخَلۡقِ ٱللَّهِۚ﴾ راست و شایان نی یە گۆڕاندنی داهێنراوی خوا، هەرچۆنێ هیچ کەس نایشتوانێ و دەسەلاتی نی یە بەسەر گۆڕینی دا، کەواتە هەرکاتێ دڵ و دەروون ترازا و لایدا لەو بارەی لەسەری دروست کراوە هیچ شتێ نایگێڕێتەوە بۆلای جگە لەو ئایینەی کە رێکە لەگەڵ سروشتی ئادەمی و سروشتی بوون و بوونەوەردا. ﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ﴾ ئەو ئایینەی کە فەرمان درا بە خۆ رێك و راست کردن بۆی و بە گرنگ گرتنی، تەنیا ئەوەیە ئایینی زۆر راست کە بە هیچ کلۆج لاری و لادانی تیا نی یە: ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەلام زۆربەی خەلکی نازانن... بەهۆی ئەوەوە شوێنی هەواو ئارەزووی ئارەوای نەفس ئەکەون بە نەفامی و نەزانی و گومرا ئەبن و لائەدەن لە رێگای راستی گەیەنەر. ئەو فەرمانە هەرچەند بە دیمەن و رواڵەت تەنها بە پێغەمبەر درا (ﷺ) بەلام مەبەست ئوممەتەکەیشی بوو چونکە فەرماندان بە ئەو فەرماندانە بەمانیش بێجگە لە هەندێ کار کە تایبەتە بە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەوانەش هەموو دیاریی کراوە لە شەریعەت دا جا لەبەر ئەوە بە شێوەی کۆ نیشانی ئەدات لێرەدا و ئەفەرموێ: ﴿مُنِيبِينَ إِلَيۡهِ﴾ هەمووتان خۆتان رێك و راست بکەن بۆ ئایینی خوا ئەوپەڕی رادە بە گرنگ بیگرن لە کاتێك دا گەڕاوە بن بۆلای خوا لە هەموو کارێك دا ﴿وَٱتَّقُوهُ﴾ بترسن لەخواو خۆتان بپارێزن بەهۆی خەشم و نارەزایی خوا، ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ نوێژ بە رێك و راستی بەجێ بێنن ﴿وَلَا تَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ لە هاوبەش بڕیار دەران نەبن کە لایانداوە لە سروشتەکەی خوا ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ﴾ [1]

---

[1] لەباتی ﴿فرقوا﴾ کە ئێستا باوە ﴿فارقوا﴾ خوێنراوەتەوە. لەسەر ئەو خوێندنەوە تەفسیرەکەی بەم جۆرەیە: ئەوانەی کە جیا بوونەتەوە لەو ئایینەیان کە هینی خوایە و فەرمانی دلوە بەمەی لەسەری بن... هتد.

لەوانە مەبن کە ئایینەکەی خۆیان بەش بەش کرد و گێڕایان بە چەند جۆر و شێوەیەك ﴿وَكَانُواْ شِيَعًا﴾ خۆیشیان بوون بە چەند تاقم و کۆمەڵێ. هەر تاقم و کۆمەڵێ شوێنی پێشەوا و گومڕاکەرەکەی خۆی کەوت... تاقمی جنۆکەی ئەکرد بە هاوبەشی خوا و ئەیپەرست، تاقمی مەلائیکە، تاقمی باوك و باپیر، تاقمی پادشا و سەرۆك، تاقمی زانا ئایینی یەکان و ئەوانەی کە خۆیان دائەنا بە غەیب زان، تاقمی دار و بەرد، تاقمی ئەستێرە و مانگ و رۆژ، تاقمی ئاگر، تاقمی شەو و رۆژ، هەروەها لە کۆن و تازە چەند جۆر و شێوەی تریش هەیە و شوێن کەوتووەکانی هەر بەو جۆرو شێوەیە کۆمەڵێکی جیاوازە، ﴿كُلُّ حِزْبِۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ﴾ هەرکام لەو کۆمەڵانە کەیف خۆش و شادمانە بو ئایین و عەقیدەی لایەتی و وا لەسەری چونکە تەنها باوەڕەکەی خۆی بە راست ئەزانێ و ئەوانی تر بە درۆ، هەرکام لەوانە و وێنەیان تاقم و شوێن کەوتووی شەیتانن و عەقیدە و باوەڕەکەیان دەستیان ئەگرێ تا ئەیانکات بەناو بەهەشت دا، ئەبێ بەهۆی لێ بوردن و رەزامەندی خوا لێ یان. بەڵێ – وەکو وتمان – بت پەرستی و هاوبەش رەوادان جۆر و شێوەی زۆری هەیە، سامناك تر و ئەوەی زۆر تر جێگای مەترسی یە بریتی یە لە جۆر و شێوەیە کە لەم چەرخی تازە و دوایی یەدا بلاو بووەتەوە تەنانەت لە ولاتی ئیسلام و لە نێوان گەلی موسڵمانیش دا، ئەو جۆر و شێوەش شوێن کەوتنی ئەو هەموو بیرو باوەڕو یاسا و رژێمانەیە کە دەست کردن و لەلایەن خواوە نەهاتوون بە تایبەتی ئەو بیرو باوەڕو یاسایانە کە دوژمنی ئایینی ئیسلام و بێگانەکان لە دەورو بەر و لای ئیسلام دا دایان هێنا بۆ لادانی رۆڵەکانی ئیسلام لە ئایین و شەریعەتە پاك و بێگەردەکەیان، خوا بە بەزەیی خۆی موسڵمانان لە خەوی بێ ئاگایی بێدار بکاتەوە تا دوژمن نەتوانێ هەڵیان خەڵەتێنێ آمین.

ئینجا باسی هەندێ نیشانە و سیفەتی هاوبەش بڕیار دەرەکان ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْاْ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ﴾ کاتێ تەنگی و زیانێ بکەوێ لەو خەڵکە کە هاوبەش بۆ خوا بڕیار ئەدەن هاوار و نزا ئەکەن لە پەروەردگاریان بە لالە و گەڕانەوە بۆلای و کۆتایی هێنان لە نزاو هاوار لە بتەکانیان ﴿ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنْهُ رَحْمَةً﴾ ئینجا لەپاش ئەوە کاتێ لەلایەن خۆیەوە و بە لوتفی خۆی بەزەیی یەکیان دەربارە بکات بەم رەنگە رزگاریان بکات و دەرویان لێ بکاتەوە و خۆشی بهێنێ لە جێگای تەنگی و ناخۆشی دا کاتێ ئەو لوتفەیان لەگەڵ بکات،

إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ فَتَمَتَّعُوا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ سُلْطَانًا

﴿إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ﴾ دەست بەجێ تاقمێ لەوانە هاوبەش بریار ئەدەن بۆ پەروەردگاریان کە رزگاری کردن. بە کورتی لەکاتی تەنگی دا تەنیا خوایان بیر ئەکەوێتەوە و پەنا ئەبەن بە کەسێ جگە لەو پەنادەری تری نی یە، لەکاتی خۆشی دا ناچارییان نامێنێ و تەنگی و ناڕەحەتی یەکەیان لەبیر ئەچێ، لەباتی سوپاسی خواو دامەزراوی یان لەسەر گەڕانەوەکەیان بۆلای. لەباتی ئەوە بەم جۆرە بوون کە ئەفەرموێ: ﴿لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ﴾[1] پاشە رۆژ و بەرهەمی کردەوەی ئەو تاقمە دانەمەزراوە ئەمەیە: کە دان نەنێن بەو رێنموونی و بەزەیی و چاکەی ئێمە بەخشیمان پێ یان، کەواتە شایانن ئەم هەڕەشە سامناکەیان ئاراستە بکرێ: ﴿فَتَمَتَّعُوا﴾ بەهۆی ئەوەوە رابوێرن بە خۆشی و بە ئارەزووی خۆتان لنگ بدەن و تاو بدەن ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ ئینجا لەمەوپاش ئەزانن چیتان بەسەر دێت؟ ئەزانن دوا رۆژی ئەم تاوان و بەدکرداریەتان چۆن ئەبێ و چارەنووستان چی ئەبێت؟ بەڕاستی دڵی بێدار ئەبێ داچڵەکێ و بکەوێتە لەرزە لەم هەڕەشەیە. مەردوم لە هەڕەشەی کاربەدەست و سەرۆکێك دنیای لێ دێتە یەك خۆ ئەم هەڕەشەیە لەلایەن داهێنەری ئەم ئاسمان و زەوی یەوە هاتووە، لەپاش ئەو هەڕەشە سامناکە ئەگەڕێتەوە سەر بت پەرستەکان و بە بێزاری یەوە پرسیار ئەکات لە رابەر و پاڵپشتیان لەو بت پەرستی و هاوبەش رەوادانەیان کە پێ ی هەڵئەسن بەرامبەر ئەو هەموو چاکە و بەهرەی خوا بەسەریانەوە. ئەفەرموێ: ﴿أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ سُلْطَانًا﴾[2] ئایا ئێمە ناردوومانە خوارەوە بۆ سەریان رابەر و نیشانەیە،

---

[1] بە پێ ی تەفسیرەکە ئەم (ل) ە پێ ی ئەوترێ (ل) ی عاقیبەت. هەندێ ئەفەرمون: (ل) ی فەرماندانە، ئەو کاتە مەبەست لە فەرمانەکە هەڕەشە کردنە لێ یان وەکو فەرمانەکەی تر کە دێت.

[2] وشەی (أم) مونقەتیعەیە بە مانا (بل) و (أی) پرسیارە. (بل) بۆ وازهێنانە لە مەبەستی پێشوو بۆ ئەم مەبەستەی کە دێت.

فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُوا۟ بِهِۦ يُشْرِكُونَ ﴿٣٥﴾ وَإِذَآ أَذَقْنَا ٱلنَّاسَ رَحْمَةً فَرِحُوا۟ بِهَا ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا
قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ إِذَا هُمْ يَقْنَطُونَ ﴿٣٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ
لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣٧﴾

﴿فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُوا۟ بِهِۦ يُشْرِكُونَ﴾ تا رابەری یان بکات و شایەتی بدات بە راستی و گونجاوی ئەو هاوبەشەی کە بڕیاری ئەدەن؟ بێگومان شتی وا نی یە، واتە هیچ کەس رەوا نی یە لەبارەی بڕوا و عەقیدەیە لە هیچ کەسێکەوە هیچ شتێ وەرگرێ و بیگرێتە گەردنی بێجگە لەلایەن خواوە، بڕوا و عەقیدە ئەبێ رابەر و نیشانەی لەگەڵ بێت، ئەو باوەڕەی ئەوان بەو جۆرە نی یە کەواتە پڕو پووچ و ناڕاستە.

ئەم پرسیارە لەلایەکەوە بۆ بێزاری دەربڕین و لاقرتی پێ کردنە و پڕ و پووچی و بێ بنەڕەتی عەقیدە و باوەڕەکەیان دەرئەخات، لەلایەکی ترەوە بۆ هاندانە لەسەر دان نان بەوە کە هەر بیرو باوەڕو عەقیدەیە لەلایەن خواوە نەهاتبێ و لەلایەن ئەوەوە رابەرو نیشانەی بەهێزی نەبێ ناڕاست و ناڕەوایە. ئینجا لاپەڕەیەکی تر لە لاپەڕەکانی دڵ و دەروونی ئادەمی نیشان ئەدات ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَآ أَذَقْنَا ٱلنَّاسَ رَحْمَةً فَرِحُوا۟ بِهَا﴾ کاتێ بەزەیی یەك دەربارەی ئادەمی بکەین بەم رەنگە سامان و دارایی و هۆی خۆشی پێ بدەین کەیف خۆش ئەبن پێ ی بە جۆرێك فیز و کەشخەی پێوە ئەکەن، ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ إِذَا هُمْ يَقْنَطُونَ﴾ ئەگەر تەنگی و ناخۆشی یەك دووچاریان ببێ بەهۆی کردەوەی ئەوەو پێشیانەوە ئیتر دەست بەجێ ئەوانە نائومێد ئەبن لە بەزەیی خوا. بەڵێ ئەو شێوە و سیفەتی تاقمێکە لە ئادەمی کە خۆیان نەبەستبێتەوە بە بەرنامەیەکی دامەزراو کە هەموو کاروباری خۆیانی پێ بەراورد بکەن، تەرازوویەکی راستی سەرنەکەریان نەگرتبێ بە دەستەوە کە نەگۆڕێ لەگەڵ هیچ گۆڕان و بەسەرهاتێکی ژیان و چەرخ دا. جا ئەو تاقمە وەکو ئایەتەکە نیشانیان ئەدا نە بەرگەی خۆشی ئەگرن و نە ناخۆشی. لەکاتی دەسەلات و خۆشی دا لە پەت بەرەلا ئەبن و باڵیان لێ پەیدا ئەبێ لە باتی سوپاس و چاولەبەری بۆ خوا فیز و کەشخە ئەکەن و لوت ئەکەن بە کەڵە شاخ، خوای خۆیان لەبیر نامێنێ و نازانن تاقمی کراوەن، هەر بەو جۆرە بێ ئاگا و بێ هۆش ئەبن هەتا بەهۆی بەد کرداری خۆیانەوە خوا دووچاریان ئەکات. لەم کاتەیش بەم بارا لە

سنوور تێپەڕ ئەکەن و دنیایان لێ دێتە یەك و بە تەواوی نائومێد ئەبن لە بەزەیی بێ سنووری خوا. ئەو دڵانە ئەوە شێوە و بەشیانە لە ژیانی ئەم جیهانەدا، چونکە ئەوانە نەزانن. تەنیا توێکڵ و دیمەنێکی ژیانی ئەم جیهانە ئەناسن و بەس. بێگومان خۆشی و ناخۆشی یاسایەکی دامەزراوی هەیە، ئەگەڕێتەوە بۆ ویست و خواهیشی خوا. تەنیا خوا خۆشی ئەدات و تەنگی ئەکاتەوە بە پێی باوی خۆی، بە گوێرەی لێزانی و کاردروستی خۆی، ئەوە شتێکە لە هەموو کاتێك دا روو ئەدات، بەڵام ئەو جۆرە ئادەمی یانە نای بینن و بە چاوی ناکەن.کەواتە ماڤ خۆیانە تەشەریان لێ بدرێ و ئەم شێوە پرسیارەیان دەربارە بوترێ کە مەبەست بێزاری دەربڕینە و سەرسام کردنی خەڵکی یە لێ یان: ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُ﴾ ئایا ئەوانە سەرنجیان نەداوە و نەیان دیوە کە خوا رۆزی فراوان ئەکات بۆ هەرکەسێك کە خوا بیەوێ، تەنگیشی ئەکاتەوە لەسەر هەرکەسێ مەیلی ببێ... کەواتە لە راستی دا هیچ هۆ و پاڵدەر نی یە نە بۆ فیز و کەشخە لەکاتی دەسەڵات و خۆشی دا، نە بۆ داماوی و نائومێدی لە کاتی تەنگی و نەبوونی و ناخۆشی دا، چونکە ئەوانە هەموو بەسەرهاتێکن روو ئەکەنە خەڵکی بە پێی مەیل و لێزانی و کاردروستی خوا، دڵی باوەڕدارانی راستەقینە رابەر و بەڵگە و نیشانە وەرئەگرن لەو بەسەرهاتانەوە لەسەر گەڕانەوەی هەموو کاروبارێ بۆلای خوا، لەسەر دامەزراوی و نەگۆڕاوی باو و رەوشتی خوا، لەسەر دامەزراوی و نەگۆڕاوی رژێم و یاسای خوا. وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾ بێگومان لەوانەدا کە باس کران چەند بەڵگە و رابەری روون هەیە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هەیە و ئەهێنن. ئینجا ئایا مەبەست بەم تاقمە ئادەمی یە لەم ئایەتەدا هەر ئەو تاقمەیە کە لە ئایەتی پێشوو باس کران؟ یان ئەمانە تاقمی ترن جیاواز لەوانەی پێشوو؟ هەردوو هەر ئەگونجێ و دەست ئەدات، بەڵام ئەگەر یەك تاقم بن ئەبێ بڵێین: هاوار و لاڵە و گەڕانەوەیان بۆلای خوا لەکاتی بەسەرهاتێکی سەختی تایبەتی دایە کە سەرسام و سەرگەردانیان بکات، نائومێدی یەکەیان لێرەدا بۆ کاتێکی ناخۆش ترە کە نەگاتە ئەو رادەیە، یان ئەڵێین: هاوار و لاڵەکەیان بە دەم و زمانە و نائومێدی یەکەیان لەدڵ دایە، کەواتە ئەو دوو سیفەتەیان لەو دوو ئایەتەدا دژی یەکتر نین و هیچ رێگای نی یە بەرگری و ئیشکال سەرنجیان بدات. ئینجا کاتێ کە خوا رۆزی فراوان ئەکات و کەم و کوڕی ئەکات، ئەو شت ئەدات و ئەیگرێتەوە، کاتێ کە ئەوە ئەکات رێگای روون کردووەتەوە بۆ بەندەکانی کە سامان ودارایی ودەرامەتی پێ زۆرببێ وپەرە سێنێ وپیشانی داون ورێنموونی بۆ کردوون.

فَـَٔاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٣٨﴾

وەكو ئەفەرمویٚ: ﴿فَـَٔاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ﴾ كەواتە خزم و خویٚشت ماف خۆی بدەریٚ، هەروەها هەژار و داماو لە سەفەرو ریٚگا و بان دا. ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ﴾ ئەو ماف دانە شتیٚكی چاكە بۆ ئەوانەی كە مەبەستیان خوایە و رەزامەندی خوا لەو چاكەدا كە ئەیكەن ﴿وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ ئەوانەن گەیشتوون بە ئامانج، ئەوەتا بەو سامان و رۆزی یەی كە خوا پیٚ ی داون نازو نیعمەتی نەبراوەی رۆژی دوایی یان دەستی خۆیان ئەخەن. بیٚگومان سامان و رۆزی هینی خوایە و خوا خاوەنی راستەقینەیە و یەكەم خاوەنە و ئەیدات بە هەندیٚ لە بەندەكانی، بەشیٚكی بریار داوە بۆ چەند تاقمیٚك لە بەندەیانی تری كە ئەوانەی سامانەكەیان لە ژیٚر دەست دایە ئەو بەشە بریار دراوەیان پیٚ بدەن، جا لەبەر ئەوە ناوی برد بە ماف خۆیان. لیٚرەدا ئەو تاقمانە ئەو سیٚ تاقمەی باس كرد، كە زەكات هیٚشتا دیاریی نەكرابوو و نە خۆی و نە ئەوانەی پیٚ یان ئەدریٚ. بەلاّم ئەم یاسا و بیرو باوەرە شتیٚكی دامەزراو و جیٚگیر بوو، یاسا و بیرو باوەرەی ئەمە كە مالّ و سامان هینی خوایە، بۆ چەند تاقمیٚ لە پیٚویستان بەشیٚكی بریار دراو هەیە لەو مالّ و سامانەدا لەلایەن خاوەنی راستەقینە و یەكەم خاوەنەوە كە پیٚ یان بكات لە ریٚگەی ئەو بەندەیانەوە كە خوا سامانەكەی خستووەتە ژیٚر دەستیان... بیرو باوەری ئیسلام لەمالّ و سامان دا بەو جۆرەیە. هەموو كاروبار و لق و پۆی رژیٚمی ئابووری لە ئیسلام دا لەسەر ئەو بنەرەتەیە. ماتولّ مالّ و سامان لە یەكەم جار و لە ریٚوە هینی خوایە، كەواتە ئەبیٚ مل كەچ بیٚت بۆ هەر بریاریٚ كە رووی تیٚ بكات لەلایەن خاوەنی راستەقینەیەوە، ئیتر سەبارەت بە دەست بەسەردا گرتن و ژیٚر دەست كردنی، یان لەبارەی زۆر كردن و پەرە پیٚدانی، یان لەبارەی دابەش كردن و بەخت كردن و سەرف كردنی، ئەو كەسەی دەستی گرتووە بەسەری دا ئازاد و سەربەست نی یە لەمەدا بە ئارەزووی خۆی رەفتار بكات و بجولّیٚتەوە تیای دا. هەندیٚ لە خەلّكی ئەیانویست سامان و مالّیان پەرە پیٚ بدەن لە ریٚگای ناردنی دیاریی بۆ دەولّەمەندان و سامان داران بە نیازی ئەوە پاداشتیان بدەنەوە بە پتر لە دیاریی یەكەیان، ئینجا ئەوا قورئان روونی كردەوە بۆیان كە ئەوە ریٚگای راستەقینە نی یە بۆ پەرە پیٚ دان،

وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن رِّبٗا لِّيَرۡبُوَاْ فِيٓ أَمۡوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرۡبُواْ عِندَ ٱللَّهِۖ وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن زَكَوٰةٖ تُرِيدُونَ وَجۡهَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُضۡعِفُونَ ﴿٣٩﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ ثُمَّ رَزَقَكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡۖ

فەرموی: ﴿وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن رِّبٗا لِّيَرۡبُوَاْ فِيٓ أَمۡوَٰلِ ٱلنَّاسِ﴾ هەر دیاریی و بەخشینی کە داوتانە بە خەڵکی بۆ ئەمەی زیاد بکات و پەرە بسێنێ لەماڵ و سامان پێ دراوەکان دا بەم رەنگە لە دیاریی و بەخششەکەی خۆتانتان بدەنەوە ﴿فَلَا يَرۡبُواْ عِندَ ٱللَّهِۖ﴾ ئەوە پاك و خاوێن و پیت و فەڕدار نابێ لای خوا. بە پێی چەند حەدیسێ مەبەست لەم ئایەتە ئەوەبوو کە باس کرا هەرچەند دیمەن و رواڵەتی ئایەتە هەموو جۆرە رێگایەکی سوود خۆریش ئەگرێتەوە بەشی ئەو رێگایەی کردمان بە تەفسیر هەرچەند لای خوا پاك و خاوێن نی یە، بەلاّم قەدەغە نەکراوە و حەرام نی یە تەنها بۆ پێغەمبەر نەبێ (ﷺ) بە تایبەتی ئەوی لێ بەرگری کرا هەر لە یەکەم جارەوە بەم فەرمودەیە: ﴿وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ﴾[1] ئەو شێوە پەرە پێدانەی لە پێش چاو بێزراو و ناشیرین کرد، ئینجا شێوەو هۆی پەرە پێدانی راستەقینەیان پیشان ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن زَكَوٰةٖ تُرِيدُونَ وَجۡهَ ٱللَّهِ﴾ ئەو خێرو سەدەقەی کە داوتانە و ئەیدەن بە پێویستان و مەبەستتان تەنها خوایە و پاداشتی خوا ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُضۡعِفُونَ﴾[2] ئەوە ئەو کەسانەن خاوەنی دوو چەندانەن، یان ئەوانەن کە پاداشت و سامانیان دوو چەندانە ئەکەنەوە.

---

[1] واتە شت مەدە بە خەڵك بە نیازی ئەوەی پاداشتت بدەنەوە بە زۆرتر. المدبر.

[2] بە پێی تێگەیشتنی ئێمە ئەبولیە بەرامبەر ئایەتی پێشوو لێرەدا بیفەرمولیە: ﴿فیربوا عندالله﴾ بەلاّم کە بیر بکەینەوە تێ ئەگەین کە ئەوەی ئێمە ناڕێکە و ئەوەی قورئان رێك و بێ لەکەیە و هەر ئەبێ ئەوە بێت کە فەرموی ﴿فأولئك هم المضعفون﴾ لەبەر چەند هۆیەك بە کورتی روونی ئەکەینەوە:

١. ئەو رستەیە زیادەی رووت ئەگەیەنێ، بەلاّم رستەی ئێستا و ئایەتەکە چەند قات نیشان ئەدات. ٢. ئەو رستەی فیعلی یە و ئایەتەکە رستەی ئیسمی یە کە لە چەند بارو روویەکەوە بەهێزتر و جوانترە:

أ. مبتدلکەی بۆ دەست نیشانی دوورە کە ئەوەش پلە و پایەی بەرزی خێر کەرەکان نیشان ئەدات. ب. ئەم رستەیە حصر و کورت هەڵهێنان ئەگەیەنێ کە ئەوەش زیادە رەوی یە لە مەدح و سەنای خاوەن خێر و چاکەکان دا. ج. رستەی

ئا ئەمەیە هۆ و ڕێگای مسۆگەر بۆ پەرە پێدان و زۆر کردنی ماڵ و سامان: بەخشینی بە خۆڕایی و بێ هیچ و بێ چاوەڕوانی دانەوە و پاداشت دانەوە لەلایەن خەڵکی یەوە، بەڵکو تەنها لەبەر خوا و چاوەڕوانی ڕەزامەندی و پاداشتی خوا. ئایا سامان و ڕۆزی خوا فراوان و کەم و کوڕی ناکات؟ ئایا ئەو کەسەی ئەیدا و ئەیگرێتەوە تەنها خوا نی یە؟ دەی کەواتە تەنیا ئەو خوایە چەند چەندانەی ئەکاتەوە بۆ ئەو بەندەیانەی کە ئەیدەن تەنها لەبەر خوا و لە ڕێگای خوادا، تەنها ئەو خوایەش کەم و کوڕی و بێ پیت و فەڕی ئەخاتە سامانی ئەوانەی کە لەسەر سامانی خەڵکی پەرە ئەدەن بە سامانی خۆیان و مەبەستیان خوا نی یە و نیازی خەڵکی یان هەیە... ئەمە بۆ ئەم جیهانە، لەو جیهانیش حیسابی خۆی هەیە و لەوێ بە لێشاو و چەند چەندانە پاداشت هەیە، کەواتە کڕین و فرۆشتن و بازرگانی یەکەیان قازانج ئەکات لێرەیش و لەو جیهانیش. ئینجا لەبارەی ڕۆزی و دەرامەتەوە ئەدوێ لە ناڕەوایی و بێ نرخی هاوبەش بڕیار دان و بت پەرستی، هەروەها ئەدوێ لە بەرهەمی خراپی ئەو باوەڕە ناڕاستە و کارکردنی لە شێوانی ژیانی بت پەرستەکان دا چ ئەو چین و تاقمەی سەرەتای ئەم ئوممەتە و چ هەموو چین و تاقمەکانی تریش لە پێش ئەوان دا، ئەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ ﴿الله﴾ کەسێکە کە ئێوەی دروست کرد، لەپاش ئەوە ڕۆزی دان، لەپاش ئەوە ئەتان مرێنێ، لەپاشان زیندووتان ئەکاتەوە،

---

ئیسمی یە، بە تایبەتی ئەم جۆرە ستەیە تاکید و دڵنیا کردن نیشان ئەدات لەسەر ئەو هەوڵ و بڕیارە کە لەم جۆرە شوێنانەدا زۆر پێویستە.

٣. ئەو ڕستەیە لە یەکەم جارەوە وەسف و سەنا و گەورەیی کردەوە و خێرەکە نیشان ئەدات بەلام ئایەتەکە هەر لە یەکەم جارەوە هێنی خاوەن چاکەکان نیشان ئەدات کە ئەمەش جوانترە، چونکە ئایەتەکە بۆ ئەم مەبەستە هاتووە.

٤. لە ئایەتەکەدا گواستنەوە هەیە لە خیتابەوە بۆ غەیبەت کە ئەوەش پێی ئەوترێ: التفات لە زمانی عەرەب دا و شتێکی شیرینە بە تایبەتی لێرەدا وەکو بیەوێ جاڕ بدا و بە گوێی مەلائیکە و بەندە تایبەتی یەکانی خوادا ئەو مەدح و سەنایە و ئەو چاکە کەرانەیان پێ بناسێنێ.

**﴿هَلۡ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَفۡعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَيۡءٖۚ﴾ ئایا لە هاوبەش بڕیار دراوەکانتان کەس هەیە هیچ شتێ لەوانە بکات؟ چاوەڕوانی وەڵامی ئەم شێوە پرسیارە ناکات، چونکە مەبەست تانە لێ دانە و هاندانیانە لەسەر کۆتایی هێنان لە باوەڕی بت پەرستی، کەواتە وەڵام دانەوە پێویست نی یە، بەڵکو هەر ئەمە شایانە کە ئەفەرموێ: ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ خوا پاك و بێگەردە و بەرز و بڵندە لە هاوبەش و هاوبەش بڕیار دانی ئەوانە.**

**خوای گەورە بەرەنگاری ئەو بت پەرستانەی کرد بە حاڵ و بار و بەسەرهاتی خۆیان کە ناتوانن دەمە دەمێ و دەم بازی تیا بکەن و ناچار ئەبن ئەبێ بڵێن: خوا داهێنەری ئەوانەیە، ناتوانن بە هیچ کلۆج بڵێن: ئەو بتانەیان هیچ جۆرە بەشداری و دەسەڵاتێکیان هەیە تیایان دا، یەکەم دروست کردن و داهێنانیان شتێکە و خۆیشیان باوەڕیان پێ‌ی بوو بە رێکی دانیان پیا ئەنا، هەروەها بە باشی دانیان ئەناو باوەڕیان بوو کە خوا رۆزی یان ئەدات، هەرگیز نەیان ئەتوانی بڵێن ئەو بتانە هیچیان پێ ئەدەن. مراندنەکەشیان هیچ رابەر و بەڵگەیەکیان نەبوو بەدەستەوە کە بێجگە لەخوا کەسی تر هەبێ ئەوەیان بەسەر بێنێ. ماوەتەوە زیندوو کردنەوەیان کە بڕوایان نەبوو بە رووداوو بەدی هاتنی، ئەمیشی هێنا لەگەڵ ئەو سیانە باوەڕ پێ کراوەدا و تێکەڵی ئەوانی کرد تا بیچەسپێنێ لە دەروونیان دا لەگەڵ ئەوان دا بەو شێوە نایابە تاکانە کە هەر لەدەست قورئان دێت کردنی بەو شێوەی ئاراستەی ئەو سروشتەیان ئەکات کە ترازاوە لە تەوەرەی خۆی، سروشتیش ناتوانێ دژی زیندوو بوونەوە و دووبارە کردنەوە بێت.**

**ئینجا روونی ئەکاتەوە پەیوەندی بەسترانی بار و حاڵی ژیانیان بە کردەوەی خەڵکی یەوە، هەروەها ئاشکرای ئەکات لە خراپی و شێوانی دڵ و ناڕاستی باوەڕ و کردەوە وڵات پڕ ئەکات لە تێك شێوان و ترازانی کاروباری ژیان، ئەفەرموێ: ﴿ظَهَرَ ٱلۡفَسَادُ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ﴾ شێوان و دەرد و زیان بەسەرهاتی خراپ و بێ ئارامی زۆر بووە و پەرەی سەندووە لە دەریا و لە بەڕ و وشکی دا،**

بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ
فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلُ ۚ كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ ﴿٤٢﴾ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ
ٱلْقَيِّمِ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۖ يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ ﴿٤٣﴾

---

﴿بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ ٱللَّهَ﴾[1] بەهۆی کردەوەی خراپی خەڵکی یەوە. واتە بەهۆی کردەوەی خراپی خۆیان و نەحسی و شومی کردەوەکانیانەوە خوا ئەو هەموو بارە گرانەی داوە بەسەریان دا ﴿لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟﴾ بۆ ئەوەی پێ یان بچەژێ هەندێ لە تۆڵە و سزای ئەو تاوان و خراپەی کردیان ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ بەڵکو بەهۆی ئەو سزا و تۆڵەوە بگەڕێنەوە و کۆتایی بێنن لە تاوان و خراپەکاری. فەرموی هەندێ لە تۆڵە و سزا چونکە هەرچی ئەو بەسەرهاتانەیە هەمووی بەشێکە لە تۆڵەی کردەوەی خراپ، تۆڵە و سزای تەواو ئەوەیە لە ڕۆژی دوایی دا کە بە ئاگری دۆزەخ ئەدرێ کە هەرچی سزا هەیە لەم جیهانەدا چاو ناداو بە سوك سەیر ئەکرێ لەچاو ئەو سزادا، خوا پەنامان بدات لێ ی. آمین. ئایا مەبەست بەو کات و چەرخەی کە شێوان و دەرد و سزا تیای دا زۆر و پەرەی سەند چەرخی پێش ڕەوانەکردنی بێت کە کافرەکانی قورەیش ئەو هەموو تاوان و خراپەکاری یەیان کرد دەربارەی پێغەمبەر و یارەکانی و ئەویش نزای کردە لای خوا و خوایش ئەو قاتی و گرانی یە سەختە و ئەو دەرد و بەڵای دان بەسەرا؟ وەکو هەندێ لە زانایان ئەیڵێن بەسەر ئەو کات و چەرخەدا یان مەبەست چەرخەکانی کۆن و تازەی پێش ڕەوانەکردنە؟ وەکو هەندێ تر ئەفەرمون. بە بۆنەی هەرکام ئەم ئایەتە هاتبێ بێگومان حوکم و بڕیارەکەی گشتی یە بۆ هەموو چەرخ و کاتی لەمەو بەر و لەمەو دوا تا ڕۆژی دوایی. لەهەر کاتێك دا تاوان و خراپەکاری پەرەی سەندبێ بێ بەرگریی خوا دەرد و زیان و بەسەرهاتی خراپی ڕشتووە بەسەر خەڵکی و جیهان دا، لەبەر ئەوە وتراوە: هەرکەس هەر گوناهێ بکات لە ڕۆژی دوایی دا یان هەموو گیان لەبەران یەخە و بەرۆکی ئەگرن و ئەڵێن بەهۆی ئەو گوناهی تۆ ئێمە دووچاری سزا بووین، کەواتە هەموو گوناهێ لە هەر شوێنێ بکرێ زیان ئەگەیەنێ بە هەموو گیان لەبەرێك، چ دەریایی و چ بەڕی

---

[1] بە جۆرێ تریش ئەم ئایەتە تەفسیر کراوەتەوە بەم ڕەنگە مەبەست لە وشەی (فساد) تاوان و خراپەکاریی یەکەیە کە بە دەستی خۆیان ئەیکەن. ئەو کاتە ئەبێ بڵێین: وشەی (ل) لە ﴿ليذيقهم﴾ دا بۆ هۆ نی یە بەڵکو بۆ ڕوون کردنەوەی سەرەنجام و بەرهەمی کردەوەکانە. واتە ئەوەیە کە پێ ی ئەوترێ: (ل) ی عاقیبەت.

و وشکی. ئەگێڕنەوە لە خواناس شەقیقی بەڵخی: فەرمویەتی هەرکەس شتی حەرام بخوات ئەو کەسە غەش و خیانەتی کردووە لە هەموو ئادەمی، چونکە بەوە زیانیان بەرئەکەوێ، گوناهو تاوان تا ئەو رادەیە هۆی شومی و بەدبەختی یە بەلاَم زۆربەی ئێمە کە نەفام و نەزانە شتی وای بە خەیاڵیش دا نایەت.

بەڕاستی ئەم ئایەتە ئەڵێی تەنیا بۆ ئەم چەرخ و کاتی نالەباری ئێمە هاتووەتە خوارەوە کە لە هەموو لایەکەوە کوفرو تاوان و خراپەکاری و خوانەناسی و بێ باکی لە خوا وەکو هەوری رەش و تاریك لاسەری جیهانی گرتووە، ئینجا لە تۆڵەی ئەوەدا خوایش لافاوی لێڵ و چەپەڵی ئاژاوە و ناڕێکی و شەڕ و شۆڕ و کوشتن و بڕین و تالاَن و بڕۆ و وێران کردن و هەموو جۆرە دەرد و بەسەرهاتێکی خراپی هێناوە بەسەر جیهان دا و دەریا و وشکی داپۆشیوە و ئارامی بۆ هیچ کەس نەهێشتووەتەوە!! ئینجا بت پەرستەکانی ئەم ئوممەتە و هاوبەش بڕیار دەرەکان ئەترسێنێ لە دووچار بوونیان بە وێنەی سزای وێنەکانی خۆیان لە گەلە پێشووەکان. ئەفەرموێ بە پێغەمبەر (ﷺ) ﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ﴾ بڕۆن و بگەڕێن و گەردش بکەن لە زەوی و ولاَت دا ﴿فَانْظُرُوا﴾ ئینجا سەرنج بدەن ﴿كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلُ﴾ ئایا چۆن بوو پاشە ڕۆژی ئەو گەلانەی کە لە پێش ئێوەوە بوون؟ ﴿كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُشْرِكِينَ﴾ زۆربەی ئەوانە هاوبەش بڕیار دەر بوون بۆ خوا و باوەڕیان بە تاك و تەنیایی خوا نەبوو، ئەوانە بە هۆی ئەوەوە تاوانبار بوون خوا بە سزای سەخت لەناوی بردن لەم جیهانەدا و بێگومان لە ڕۆژی دواییش دا جێگایان دۆزەخە. کەواتە با تاوانبارەکانی ئەم ئوممەتە تەمێ خوار بێن لەوانەوە. ئینجا بەرامبەر بەو ڕێگە چەوتەی تاونبارانە دەست نیشان ئەکات بۆ ڕێگایەکی تر کە ڕێبوارەکەی ون نابێ، بۆ ئامانجێکی بەرز کە نیاز کەرەکەی زیاندار و رەنجەڕۆ نابێ، ئەفەرموێ: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ الْقَيِّمِ﴾ کەواتە خۆت ڕێك و ڕاست و یەك بار بکە بۆ ئایینێ کە زۆر ڕاستە. واتە ئەی پێغەمبەر – بێگومان ئوممەتیش مەبەستە – زۆر بە گرنگ ئایینی ئیسلام بگرە و بەوە خەریك ببە ﴿مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ يَوْمٌ﴾ لە پێش ئەوەی ڕۆژێ بێت ﴿لَا مَرَدَّ لَهُ مِنَ اللَّهِ﴾ [1] کە گێڕانەوە نی یە بۆ ئەو ڕۆژە لەلایەن خواوە و ئیتر مۆڵەت دان نامێنێ بۆ هیچ کەس. ﴿يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ﴾ لەو ڕۆژەدا خەڵکی لە نێوان خۆیان دا ئەپچڕێن لە یەك و ئەبن بە دوو کۆمەڵ: کۆمەڵی کافر و بێ باوەڕ و کۆمەڵی باوەڕدار وەکو دەست نیشانی بۆ ئەکات،

---

[1] تەفسیرەکە لەسەر ئەوەیە کە وشەی (من الله) ی بەسترابێ بە وشەی (مرد) ەوە، زۆر کەس لەسەر ئەوەیە کە بەستراوە بە (يأتي) ەوە بەو جۆرەش جوانە ئەگەر چی بە چەسپانی دڵ بۆی ناڕوا، بێجگە لەو دوو بارە چەند جۆرو باری تریش وتراوە لە ترکیبی ئەم رستەیەدا.

مَن كَفَرَ فَعَلَيۡهِ كُفۡرُهُۥۖ وَمَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا فَلِأَنفُسِهِمۡ يَمۡهَدُونَ ﴿٤٤﴾ لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٤٥﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن يُرۡسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٖ وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ وَلِتَجۡرِيَ ٱلۡفُلۡكُ بِأَمۡرِهِۦ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٤٦﴾

---

که ئەفەرموێ: ﴿مَن كَفَرَ فَعَلَيۡهِ كُفۡرُهُۥ﴾ هەرکەس لەم جیهانەدا کافر بووبێ ئەوە تۆڵە و سەرەنجامی کوفرەکەی لەسەریەتی کە بریتی یە لە سزادان و سوتاندنی بەئاگری دۆزەخ بێ برانەوە، ﴿وَمَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا﴾ هەر باوەڕدارێك کردەوەی چاکی کردبێ ﴿فَلِأَنفُسِهِمۡ يَمۡهَدُونَ﴾ ئەوە ئەوانە بۆ خۆیان جێ و شوێنی ئارام و حەوانەوەیان فەراهەم هێناوە و ئامادە کردووە ﴿لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ﴾[1] بۆ ئەمەی خوا ئەجرو پاداشتی ئەوانە بداتەوە کە باوەڕیان هێناو کردەوە چاکەکانیان کرد. ئەجرو پاداشتیان بداتەوە بە لوتف و چاکەی خۆی بەبێ ئەمەی هیچ مافێکیان ببێ بەسەرخواوە، چونکەهیچ کەس- تەنانەت پێغەمبەریش(ﷺ) - بە کردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشت بەڵکو بە لوتف و بەزەیی خوا ئەچێت وەکو لە حەدیسێکی سەحیح دا هاتوە کە پەڕاوە باوەڕ پێکراوەکان هێناویانە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بێگومان ئەجرو پاداشت، هەروەها لوتف و خۆشەویستی تایبەتی نی یە بەم تاقمەوە ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ چونکە بێگومان خوا کافرانی خۆش ناوێ و نایەوێن. واتە خەشمی هەیە دەربارەیان، ئەوەیش هۆی سزا و تۆڵەیە بۆیان، کەواتە ئەمە هەڕەشەیەکی بەتین و سامناکە، خوا پەنامان بدات. ئینجا هەندێ تر سەرنج ڕائەکێشێ و گەردش ئەکات بە دڵ و دەروون لەناو هەندێ لە ڕابەر و نیشانەکانی خوا لەم بوونەوەرەدا: هەروەها هەندێ لە بەهرە و بەزەیی خوا ئەخاتە بەرچاو، بەڵکو خەڵکی چاولەبەر بن و سوپاسی خوا بکەن، ئەفەرموێ:

---

[1] تەفسیرەکە لەسەر ئەوەیە کە (لیجزی) بەستراوە بە (یمهدون) ەوە، ڕایەکی تری ئەمەیە کە بەستراوە بە (یصدعون) ەوە، دەست نیشانە بۆ هۆی دابەش بوون و پەیدا بوونی ئەم کۆمەڵ و تاقمە، واتە خەڵکی بوون بە دوو بەشەوە تا خوا پاداشتی ئەوانە بداتەوە و تۆڵەش بسێنێ لەم تاقمە، چونکە خۆشی ناوێن، بەم جۆرەش جوان و گونجاوە، چەند بارو ڕوویەکی تریش وتراوە هەموو ئەگونجێن و مەبەست لە هەموو هەریەکە.

﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ ﴾[1] هەندێ لە رابەر و نیشانە روونەکانی خوا ئەمەیە ناو بەناو چەند جۆرە بایەك رەوانە ئەکات ﴿مُبَشِّرَٰتٍ﴾ بە موژدە دەر بە بارینی باران، خەڵکی ئەو جۆرە بایانەیان ئەناسی بە دروشم و نیشانە و بەراورد کردن بەهۆی ئەوەوە کاتێ ئەو بایانە هەڵیان ئەکرد موژدە بەخش ئەبوون. ﴿وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ﴾ ئەو بایانە رەوانە ئەکات بۆ موژدە پێدانتان، بۆ ئەمەی هەندێ لە بەرهەمی بەزەیی خۆیتان پێ بچەژێ کە بەهۆی ئەو بایانە فەراهەم دێت وەکو باران و هەرزانی و ئەو هەموو شتانەی کە بە هۆی بارانەوە دەست کەوت ئەبن، هەروەها پێگەیین و وشك بوونەوەی ئەو هەموو بەر و میوە و دانەوێڵە و پاك کردن و شەن کردنی ئەوانەی کایان پێوەیە کە ئەم شتانە هەموو پێویستی یان هەیە پێ ی. با هۆیەکی گرنگ و سەردەستەیە لە فەراهەم هێنانیان، ﴿وَلِتَجْرِيَ ٱلْفُلْكُ بِأَمْرِهِۦ﴾ بۆ ئەمەی کەشتی بگەڕێ بە فەرمانی خوا بەهۆی هێزو پاڵ پێوە نانی با، یان بەهۆی پەیدا بوونی رووبارەکان لە بارانەوە و ئەویش لەباوە. ﴿وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ﴾ بۆ ئەمەی هەندێ لە بەخشش و بەهرە و فەزڵی خواتان دەست کەوت ببێ بەهۆی گەڕان و هاتوچۆی ناو دەریاکان و گوزەر کردن پیایان دا بۆ بازرگانی، ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بۆ ئەمەی سوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەو چاکە و بەهرەیانەی لەوانەدا هەبوون، ئەمە تەمێ کردنە لەلایەن خواوە بۆ ئەوەی کە شایانە بەرامبەری چاکە و بەهرەی خوای پێ بکرێ.

لەپاش پیشاندانی ئەو هەموو رابەر و نیشانە ئاشکرایانە و لەگەڵ ئەوەدا سەرکێشەکان هەریاخی ئەبوون و گوێ رایەڵ نەبوون، ئینجا دڵخۆشی و دڵنەوایی پێغەمبەر(ﷺ) ئەکات بەمەی کە ئەو یەکەم کەس نی یە کە دووچاری ناخۆشی و دڵئازاریی بووبێ لەلایەن خەڵکەوە، بەڵکو پێش ئەو پێغەمبەرانی تری رەوانە کردووە بە موعجیزە و بەڵگە و نیشانەی ئاشکراوە کەچی گەلە مل هوڕەکانیان یاخی تر بوون و لەپاشان خوا ئەو دوژمنانەی لەناو برد و پێغەمبەر و شوێن کەوتووەکانیانی سەرخست. کەواتە با ئەمانیش خۆگر بن و دڵگران نەبن و موژدە بەخش بن بە یارمەتی دانی خوا و سەرخستنی بۆیان،

---

[1] لەناو خەڵك دا بەناوبانگە کە چوار جۆر با هەیە سیانیان پیت و فەڕی پێ یە و یەکێکیان سزای پێ یە. سیانە چاکەکە لەناو عەرەب دا ناونراون بە (شمال، جنوب، صبا)، خراپەکەش ناونراوە بە (دبور) لە قورئانیشەوە دەست نیشان هەیە بۆ ئەوە ئەوەتا لەکاتی چاکە و بەهرەدا وشەی (رياح) بەکار ئەهێنێ، بۆ سزا (ريح) بەتاك، لە چەند حەدیسێك دا هەیە کە کاتێ با هەڵی بکردایە ئەیفەرمو: ﴿اللهم اجعلها رياحا لا ريحا﴾.

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ ۖ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾

**ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ﴾ واتە سوێند بەخوا ئێمە لە پێش تۆ چەند پێغەمبەرێکمان نارد و رەوانەمان کردن بۆلای گەلەکانیان ﴿فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ ئینجا ئەوانیش چوونە لای ئەو گەلانە بە موعجیزە و رابەر و بەڵگەی روونەوە، ئەو گەلانە هەموو باوەڕیان نەهێنا بەڵکو بوون بە دوو تاقم: تاقمی باوەڕدار، تاقمی بێ بڕوا و تاوانبار، ﴿فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟﴾ ئینجا ئێمەیش تۆڵەمان سەند لەوانەی تاوانیان کرد و یارمەتی پێغەمبەر و باوەڕدارەکانمان دا و سەرمان خستن ﴿وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ یارمەتی دانی باوەڕ داران و سەرخستنیتان شتێکی راستی رەوا و بڕیار دراو بوو لەسەر ئێمە، مافێك بوو شایانی ئەوان و ئێمە بە بەزەیی و بەخشندەیی خۆمان پێویستمان کرد لەسەر خۆمان.**

**سوپاس و پاکی و بێگەردی لە هەموو لەکەیەك بۆ ئەو خوایە کە یارمەتی دانی باوەڕدارانی بڕیار دا لەسەر زاتی پاك و بڵندی خۆی، گێڕای بە مافی خۆیان بە لوتف و بەزەیی خۆی، بەم رستە و شێوە گرنگە دڵنیا کەرە کە دەست نادات بۆ گومان و دوو دڵی ئەو بەهرە و بەخششەی دەربڕی و جاڕی پێدا لە قورئانی بەفەڕ و پیرۆزی دا، ئایا چۆن گومان و دوو دڵی رووی تێ ئەکات لەکاتێك دا کە خاوەنی ئەو بڕیارە خوای بە دەسەڵاتی بەهێزە و زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و هیچ کەس و هیچ شتێك ناتوانێ یاخی ببێ و سەرپێچی بکات لە مەیل و خواهیشی. ئەم بڕیارە نوێنەر و دەرخەری مەیل و خواهیشەکەیەتی کە بەرگری ناکرێ، نوێنەری باویەتی کە هەرگیز ناگۆڕێ، رێك و پێکە لەگەڵ یاسا و رژێمە دامەزراوەکەی کە کار ئەکات لە بوون و بوونەوەردا. ئەو یارمەتی دان و سەرخستنە هەندێ جار - بە گوێرەی فام و تێگەیشتنی ئادەمی - دوا ئەکەوێ و درەنگ ئاخیزە، چونکە کاروبار لای ئادەمی جۆرێکی ترە جیاوازە لەگەڵ ئەوەی لای خوایە، بڕیاری ئەمان جیاوازە لەگەڵ بڕیاری خوا، خوا خۆی لێزان و ئاگادار و کار دروستە. بەڵێنی خۆی بەدی ئەهێنێ، لەکاتێك دا خوا ئەزانێ و ئەیەوێ، بە پێی خواهیش و باری خۆی، هەندێ جار هۆی دواکەوتنی دەرئەکەوێ بۆ ئادەمی و هەندێ جار دەرناکەوێ. بەڵام مەیل و خواهیشەکەی ئەو چاك و راست و رەوایە و کات دیاریی کردنەکەی ئەو رێکە. هەموو بەڵێنی ئەبێ بەدی بێت، خۆگرەکان چاوەڕوانی ئەکەن بە هەموو ئارامی دەروون و باوەڕەوە.**

ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُۥ فِى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ يَشَآءُ وَيَجْعَلُهُۥ كِسَفًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ ۖ فَإِذَآ أَصَابَ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٨﴾

ئینجا ئەندازەیە بە درێژیی باسی با ئەکات سەبارەت بە پێکهێنانی هەور و باران و زیندوو بوونەوەی زەوی پیَ ی و گێرانی ئەو زیندوو کردنەوە بە بەڵگە و نیشانە لەسەر زیندوو کردنەوەی مردووەکان لە رۆژی دوایی دا، ئەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ ﴾ خوا کە ناوی ﴿الله﴾ یە کەسێکە ئەو بایانە رەوانە ئەکات، ئەوەش بە گوێرەی یاسا و رژێمێك کە دایناوە لە پێك هێنانی ئەم بوونەوەرە و هۆنینەوەی کاروباری و بەرێوەبردنی، ﴿فَتُثِيرُ سَحَابًا﴾ ئینجا بەو هەڵم و تەمەی کە هەڵیان گرتووە لە ئاوی زەوی و بەرزیان کردووەتەوە بۆلای سەرو بەو هەڵم و تەمە هەور فەراهەم ئەهێنن و ئەیخەنە گەڕان و بزووتنەوە ﴿فَيَبْسُطُهُۥ فِى ٱلسَّمَآءِ ﴾ ئینجا خوا ئەوهەورە بڵاو ئەکاتەوە و رای ئەخات لەلای سەرو بە رووی ئاسمان دا ﴿كَيْفَ يَشَآءُ ﴾ چۆن مەیل و خواهیش بکات، بە زۆری یان بە کەمی، بە وەستاوی یان نەوەستاوی، نەوەستانەکەی بە چەسپانی یان سستی، ئینجا هەندێ جار هەمووی پێکەوەیە بێ پچڕان و ﴿وَيَجْعَلُهُۥ كِسَفًا﴾ هەندێ جار ئەیگێڕێ بە چەند پارچەیەك، ﴿فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ ﴾ ئینجا ئەبینی باران دەرئەچێ لەناو بەناوی هەورەکەدا لە هەردوو جارەکەدا. ﴿فَإِذَآ أَصَابَ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ ﴾ کاتێ خوا ئەو بارانە ببارێنێ بەسەر خاك و وڵاتی هەرکەس لە بەندەکانی کە خوا مەیلی ببێ و بیەوێ ﴿إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ ئیتر دەست بەجێ ئەو خەڵکە ئەکەونە خۆشی و موژدە بەخش ئەبن، هیچ کەس نرخ و رێزی باران نازانێ بە وێنەی ئەو کەسانەی کە وڵاتیان دێمە و ژیانیان لەسەر بارانە و هیچ کانیاو و ئاوی تریان نی یە، ئەو تاقم و چینەی کە یەکەم جار ئەم قورئانەیان چوو بە گوێچەکەدا، زۆربەی دانیشتوانی نیوە دوورگە لە هەموو کەس باشتر رێز و نرخی بارانیان ئەزانی و بەراستی تێ ئەگەیشتن لە رادە و شادمانی و موژدە بەخشی بە بارینی باران، چونکە ژیانیان لەسەر ئاوی باران بوو،

وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِۦ لَمُبْلِسِينَ ﴿٤٩﴾ فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ
يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا رِيحًا
فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا لَّظَلُّواْ مِنۢ بَعْدِهِۦ يَكْفُرُونَ ﴿٥١﴾ فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا
وَلَّوْاْ مُدْبِرِينَ ﴿٥٢﴾

---

﴿وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِۦ لَمُبْلِسِينَ﴾ بێگومـان ئەوانـە پـێش باراندنی باران بەسـەریان دا بەڕاستی نائومێد بوون. ﴿فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ﴾ سەرنج بدە و چاوی دڵ هەڵخە بۆ بەرهەمەکانی چاکە و بەزەیی خوا بە باراندنی باران، ﴿كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ﴾ ئایا چۆن زەوی زینـدوو ئەکاتـەوە پاش مردن و وشك بوونی؟ زینـدووی ئەکاتـەوە و ئـەو هـەموو گیـا و سـەوزی و گـوڵ و گـوڵزارو دانەوێڵـە و ئـەو هـەموو بەر و میوەجاتـەی لـێ دەرئـەهێنێ!! بێگومـان ئەمانـە شـتێکی راسـتی رووداوی بـەدی هـاتووی بەچـاو بینـراون، پێویست نی یە بە هیچ جگە لـە سـەرنج دان و بیر لـێ کردنـەوە، لەبەر ئەوە ئەوا ئەیکات بە رابەر و نیشانەیەکی روون لەسەر زیندوو بوونەوەی رۆژی دوایی، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ بەڕاستی ئەو خوایە کە زەوی زینـدوو کـەرەوەی مردووەکانـە، ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ ئەو خوایە ئەوپەڕی رادە توانایە بەسـەر هـەموو شتێك دا، ئـەوە هـەموو بەرهـەمی بـاو باران شایەتن لەسەر راست و گونجاوی بەڵێنی خواو هاتنی رۆژی دوایـی. ئەوانـە لـەبارەی بارینی بارانـەوە بـەو جـۆرە شـادمان و مـوژدە بەخشن، لـەکاتی ناخۆشـی و دووچار بوونی زیـان دا بەرگە ناگرن و ئەکەونە پەلە و زەلە وەکو روونی ئەکاتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا رِيحًا فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا لَّظَلُّواْ مِنۢ بَعْدِهِۦ يَكْفُرُونَ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر بایەکی زیاندەر بنێرین، بەم رەنگە هـەور و ئاوی پێ نەبێ، بەڵکو خۆڵ و تۆز و لمی هەڵگرتبێ بەهۆی ئەوەوە هەورەکە بە زەرد ئـەبینن، یان شینایی و کشتوکاڵەکەیان ئەبینن بە زەردی بەهۆی ئەو با زیاندەرەی کە لـێ ی هـەڵکرد.

ئەگەر بای ئاوا بنێرین بێگومان لەپاش ئەوە هەمیشە سپڵەیی و ناشکوری ئەکەن. بێزاری و نائومێدی دەرئەبڕن لە باتی ترسان لە سزای خوا و مل کەچی بۆ بڕیاری خوا و گەڕانەوە بۆلای، نزاو لاڵە بۆ لابردنی ئەو سزا و زیانە. خوای گەورە ئەو کافرانەی لەکەدار کرد بەمە کاتێ بێ بارانی روو بدات نائومێد ئەبن لە بەزەیی خوا و مل شۆڕ ئەکەنەوە و بە داماوی، ئینجا کاتێ بارانیان بەسەردا ببارێنێ ئەکەونە خۆشی و شادمانی یەکی زیاد لە ئەندازە، ئینجا باو نەبوونی بنێرێ و بدا لە کشتوکاڵەکەیان و وشکی بکات ئەکەونە بێزاری و سپڵەیی و ناشکوری و چاکەکانی خوایان لەبیر نامێنێ، کەواتە لە هەموو حاڵ و بارێك دا لەکەدارن و لە رێگای راست لایانداوە، بێگومان ئەو کەسانەی کە خوا نەناسن و باوەڕیان نی یە بە بڕیاری خوا، بێ ئاگان لە لێزانی و کار دروستی خوا، نازانن کە هەموو شتێك بە دەستی خوایە، خوایش هەموو کردەوە و بڕیاری راست و رەوایە، ئەو کەسانەی کە بێ بەشن لەم باوەڕو زانینە بێگومان بەرگەی هیچ خۆشی و ناخۆشی یەك ناگرن، بە بێ ئارامی ئەژین لە پاش روون کردنەوەی ئەم هەموو شتە راستە گرنگانە، لە دوای هێنانەوەی ئەو هەموو رابەر و بەڵگە روونانە لەسەر تاك و تەنیایی خوا و راستی پێغەمبەرێتی پێغەمبەران و راستی و بەجێ یی هاتنی رۆژیی، کەچی لەگەڵ ئەوەدا بێ بڕواکان تا بێت یاخی و سەرکێش تر ئەبون، لەپاش ئەوانە ئینجا رووی فەرموده ئەکاتە پێغەمبەر (ﷺ) دڵخۆش و دڵنەوایی ئەکات و روونی ئەکاتەوە کە باوەڕ نەهێنانی ئەو مل هوڕانە سوچی ئەمی تێدا نی یە و بەڵکو سوچەکە لە خۆیانەوەیە. ئەفەرموێ: ﴿فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ﴾ دڵ غەمگین مەبە لە باوەڕ نەهێنانی ئەوانە، چونکە ئەوانە وەکو مردوو وان، تۆ ناتوانی مردووەکان بکەیت بە بیسەر و شتیان پێ ببیستی، ﴿وَلَا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاءَ﴾ ئەوانە وەکو کەڕ وان و تۆ ناتوانی بانگ کردنت ببیستی بە کەڕان بە تایبەتی ﴿إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ﴾ کاتێ روو وەرگێڕن لێت بە پشت تێکردنەوە کە لەو کاتەدا هەرچۆنێ نابیستن هۆی تێگەیشتن و وەرگرتنیشان نامێنێ، بەڵام ئەگەر روو بە روون لەوانەیە بە دەست نیشان و جوڵانەوەی لێو تێ بگەن، ئەوانە وەکو کوێر وان،

﴿وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِ ٱلْعُمْيِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ﴾ تۆ نیت بە ڕێگا نیشان دەری کوێران و ڕزگار کەریان لە ون بوون و گومڕایی یان. بێگومان ئەوانە هەرچەند بە ڕواڵەت ئادەمی یەکی زیندووی بیسەری بینان بەڵام بیٚ بەشن لە بەرهەمی گیان و ڕەوشتی بوون، کەواتە گیانەکەیان گیانێکی ئاژەڵی و حەیوانی بوو، بەڵکو گومڕاتر و کەمتر لەو گیان لەبەرانی ترە، چونکە ئەوان بە سروشت ڕێگای تایبەتی خۆیان ئەدەنە بەر بە دەگمەن لائەدەن لیٚ ی!! ئەو کەسەی ئەم ئایەتە بەهێزانە بدریٚ بە گوێچکەی دا و کاری لیٚ نەکات و نەیەت بە دەمیانەوە ئەوە کەڕە و بیسەرێکی ئادەمی نی یە هەرچەند جوتیٚ گوێچکەی هەبیٚ و دەنگی پیٚ ببیستیٚ! هەرکەس سوود وەرنەگریٚ لەو هەموو ڕابەر و بەڵگە ڕوونانە کە پرژ و بڵاو بوونەتەوە بەسەر لاپەڕەکانی بوون و بوونەوەردا ئەو کەسە کوێرە با جوتیٚ چاوی زیتی پێوە بێت وەکو ئەو هەموو گیان لەبەرانی ترە!! ﴿إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ تۆ نابیستی بە هیچ کەس بێجگە ئەو کەسەی کە باوەڕ ئەبیستن، چونکە دڵیان زیندووە و چاویان کراوەیە و هەستیان ڕێك و ساغە ﴿فَهُم مُّسْلِمُونَ﴾ کەواتە ئەوانە مل کەچ و گویٚ ڕایەڵ ئەبن بۆ بانگ و فەرمانی تۆ، بەکورتی کار و فرمانی پێغەمبەر (ﷺ) پێویستە بۆ وریا کردنەوەی دڵ و دەروونیان وێنەی ئەم ئایەتە لە سورەتی ﴿النمل﴾ دا تێپەڕی کرد، لەکاتی تەفسیریدا دواین – ئەندازەیەك بە درێژیی – لەبارەی بیستن یان نەبیستنی مردووە، کە مەسەلەیەکە زانایانی ئیسلام دووبەرەکین تیایان دا، لێرەشدا بە کورتی ئەڵێم: هەردوو تاقم بەڵگە و ڕابەریان بەدەستەوە هەیە بۆ بەهێزکردنی هەرکام بۆ ڕای خۆی، ڕەخنە و پینە و پەڕۆ و پرسیار و کاری زۆر و زەبەنە ڕووی داوە لە نێوان ئەو دوو کۆمەڵەدا، هیچ ڕابەر و بەڵگەیەکی بەهێزی دڵنیاکەری دەم کوت کەری بەدەستەوە نی یە، مەسەلەکەش شتێکی بنەڕەتی و سەرەکی نی یە لە ئایینی ئیسلام دا، بەڵکو شتێکی پەل و پۆ و فەرعی یە، کەواتە نابیٚ بکریٚ بەهۆی ئاژاوە و دووبەرەکی، بەڵکو هەرکەس باوەڕی بە ڕاو ڕابەری هەر تاقم و هەر باریٚ هەیە ئەوە بڵێت و باوەڕی خۆی لەسەر دامەزرێنیٚ، هەرکەس هەردووی بەلاوە یەکسانە بەو جۆرە یەکسان بوەستیٚ و بیٚ دەنگ بێت.

﴿ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ ﴾

**ئینجا قورئان گەردشێکی تر ئەکات بە دڵ و دەروونی بێ بڕواکان لە نەفسی خۆیان دا، لەو بار و تەور و قۆناغانەی کە بەسەر پەیدا بوونی دا تێپەڕ ئەکات لەم جیهان و زەوی یەدا تا سەریان ئەکات بەو جیهان دا، ئەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ﴾ خوایە کە ناوی ﴿الله﴾ یە کەسێکە کە لە یەکەم جارەوە ئێوەی دروست کرد بە لاوازی و بێ هێزیی، لاوازیی کرد بە بنەڕەتی کاروبارتان بەجۆرێ وەکو لاوازی یەکەم کەرەسەتان بێت و لەوەوە دروست کرابن... ئەو لاوازی یەی کە ئەم ئایەتە دەست نیشانی بۆ ئەکات چەند جۆر و شێوەیەکی جیاوازی هەیە لە پێك هێنانی ئەم ئادەمی یەدا، یەکەم لاوازی لەش و قەبارە کە لە سێلێکەوە هاتووە بە چاوی سەر نابینرێ تا بوو بەو بێچووە بچکۆلە لەناو منداڵداندا بە چەند قۆناغ و گۆڕانێ کە هەمووی سەرانسەر پڕە لە بێ هێزیی و لاوازیی، هەروەها بە بێ هێزیی و لاوازی ئەژی ماوەی مانەوەی لە سکی دایك دا، کاتێ دێتە ئەم جیهانە بە کۆرپە و ساوایی و منداڵی هەتا ئەگاتە تەمەنی هێزو گەنجی، لەپێش ئەمانە هەموو لاوازی ئەو خاکەی کە کەرەسە و بنەڕەتی یەکەمیەتی. ئینجا بێ هێزیی و لاوازیی بەرامبەر ئەو هەموو هێزو وزە و مەیل و ئارەزووەی کە تیایدا دروست کراوە و پاڵ پێوەنەریەتی هەردەمە و بە بارێك دا. ﴿ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً﴾ ئینجا لەپاش لاوازی هێزی داوە، هێز بەرامبەر هەموو جۆرە بێ هێزیی و لاوازی یەك، هێز لە لەش و قەبارەدا، لە داڕشتنی ئادەمێتی تیای دا، لە پێك هێنانی هێزیی دەروونی و ژیریی و خواهیش و مەیلی ئازاد و سەربەست و ئامادەیی و لێ هاتن. ﴿ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً﴾ لەپاش هێزو لاوازی و مووی سپی بڕیار داوە کە نیشانەی پیری یە. بێ هێزیی و لاوازی لە هەموو بار و رووبەکەوە، کەواتە پیریی هاتنە خوارەوەیە بۆ رادە و پلەی منداڵی لە هەموو بارو رووبەکەوە، ﴿يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ﴾ ئەو خوایە دروست ئەکات و فەراهەم ئەهێنێ هەرچی خۆی مەیل و خواهیش بکات، کە هەندێ لەوانە ئەوا لاوازی و هێز و گەنجی و پیریی یە کە باس کرا،**

وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْقَدِيرُ ﴿٥٤﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا۟ غَيْرَ سَاعَةٍ ۚ كَذَٰلِكَ كَانُوا۟ يُؤْفَكُونَ ﴿٥٥﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَٰنَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْبَعْثِ

﴿وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْقَدِيرُ﴾ تەنها ئەو زۆر زانایە و توانا و دەسەلات دارە، ئەو هەموو بار و گۆڕانە کە ڕوو ئەدات لەم دروست کراوانەدا نیشانە و بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەو زانین و دەسەلات و توانایە. بێگومان ئەم دروست کردن و داهێنانە و ئەم هەموو گۆڕانە ئەبێ دواهاتنی ببێ کە وەکو ئەم هەموو شتی ترە زانراوە و دیاریی کراوە، هەروەها ئەم داهێنانی یەکەم جارە بەڵگەیەکی ڕوون و ڕەوانە لەسەر ڕاستی و گونجاوی دووبارە کردنەوە، جا بەو بۆنەیەوە لە پاش داهێنانی یەکەم جار باسی دووبارە کردنەوە ئەکات لە نیشاندانی شێوەیەك لە شێوەی بەسەرهاتەکانی ڕۆژی دوایی، ئەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا۟ غَيْرَ سَاعَةٍ﴾ ڕۆژی دوایی کە ڕۆژی زیندوو کردنەوە دێت و هەموو لە گۆڕەکان دێنە دەرەوە تاوانبارەکان کە بێ بڕوا بوون لەم جیهانەدا سوێند ئەخۆن کە لەمەو پێش نەماونەتەوە جگە لە ساتێ، ئیتر مەبەست بەو ڕابوردووە ژیانی ئەم جیهانە بێت، یان ماوەی مانەوەی لە گۆڕدا و پاش مردن بێت، یان ماوەی پاش وێران کردنی ئەم جیهانە تا زیندوو کردنەوە کە لەم ماوەدا سزای گۆڕ هەڵنەگیرێ، هەرکام مەبەست بێت سوێند و وتەکەیان ناهەق و درۆیە، ئیتر لەبەر هەر هۆیەك ئەوە بڵێن، واتە بحەپەسێن لە سام و بیمی ئەو کاتە یان زۆر بە کەم بێتە پێش چاویان، لە چاو سزای دوور و درێژی ئەو ڕۆژەیان، یان بە گۆترەکاری بیڵێن، یان هەر فێری درۆن و بیانەوێ بە درۆ بیڵێن، بە هەر بارو بە هەر حاڵ ئەو تاوانبارانە لا ئەدرێن لەو کاتەدا لە ناسین یان وتنی ماوەکە بە شێوەیەکی ڕاست و ڕاستەقینە، ﴿كَذَٰلِكَ كَانُوا۟ يُؤْفَكُونَ﴾ هەر بە وێنەی ئەوانە لە دنیادا لادران لە ڕاستی و دان نان و وتنی حەق و ڕاست. ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَٰنَ﴾ ئەوانەی کە زانین و ئیمان و باوەڕیان پێ دراوە لەم جیهانەدا لە مەلائیکە و ئادەمی، ئەوانە ئەڵێن بە تاوانبارەکان و بەرپەرچیان ئەدەنەوە و بە درۆیان ئەخەنەوە: ﴿لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْبَعْثِ﴾ [1] سوێند بەخوا ئێوە مانەوە لە زانین و بڕیاری خوادا و بە پێی ئەوە تا ڕۆژی زیندوو کردنەوە و ئەو ڕۆژە کاتی دواهاتنی ماوەکە بوو، ئیتر کورتی و درێژیی گرنگ نی یە.

---

[1] دیمەن و ڕواڵەتی ئەم فەرمودەیە وا نیشان ئەدات کە مەبەست بەو مانەوەی کە سوێندیان خوارد تەنها ساتێ بووە لە مردنەوە تا زیندوو بوونەوە، نەك مەبەست ژیانی ئەم جیهانە یان تەنها مانەوە لە وێران کردنەوە تا زیندوو بوونەوە.

فَهَـٰذَا يَوْمُ ٱلْبَعْثِ وَلَـٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٥٦﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَعْذِرَتُهُمْ
وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٥٧﴾ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِى هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ

**﴿فَهَـٰذَا يَوْمُ ٱلْبَعْثِ﴾ دەی ئەمە رۆژی زیندوو کردنەوەیەکە کە هەڕەشەتان لێ ئەکرا پێی و ئێوە باوەڕتان پێی نەبوو، ئەوەتا راست بوو و بەدی هات. ﴿وَلَـٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ بەڵام ئێوە لە دنیادا نەزان بوون و نەتان ئەزانی کە راستە و باوەڕتان پێی نەبوو. ئینجا بە شێوەیەکی کورت باسەکە دوایی پێ ئەهێنێ بە روون کردنەوەی بەرهەم و سەرەنجامی بێ بڕوایی بێ بڕواکان. ئەفەرموێ: ﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَعْذِرَتُهُمْ﴾ لەو رۆژەدا عوز و بەهانەی ئەوانەی کە لە دنیادا ستەم کار و بێ باوەڕ بوون هیچ سوودیان پێ ناگەیەنێ و هیچ گوناهو تاوانیان بۆ پەڕۆ ناکات، ﴿وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ﴾ داوایان لێ ناکرێ خەشم و غەزەبی خوا بەسەر خۆیانەوە نەهێڵن بە تۆبە کردن و گەڕانەوە بۆلای خوا، یان داوای عوزر و بەهانە هێنانەوەیان لێ ناکرێ، چونکە کاتی ئەوانە لەم جیهانەدا بوو کە تازە لە دەست دەرچوو، ئەو رۆژە رۆژی کردەوە نی یە بەڵکو رۆژی تۆڵە سەندن و پاداشت دانەوەیە.**

**ئینجا لەو وێنە و شێوە سامناکەی رۆژی دوای یەوە ئەیانگێڕێتەوە بۆ ئەو بێ بڕوایی و سەرکێشی یەی کە ئێستا وان تیای دا، سەرەنجام و دوا رۆژی ئەو بارو رێگا چەوتەی ئەوانە ئەبێ هەر ئەوە بێت کە نموونەیەکی خرایە بەرچاو، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِى هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ﴾ سوێند بەخوا بە روونی باسمان کرد لەم قورئانەدا بۆ خەڵکی لە هەموو جۆرە باسێکی نایاب لەبارەی تاکی و تەنیایی خوا راستی پێغەمبەر و هاتنی رۆژی دوایی، لە هەموو بارێکی بەکارەوە کە پێویست بێت لەگەڵیان دواین بۆ بێدار کردنەوەی دڵ و دەروونیان، بۆ ئەمەی ژیریی یان بکەوێتە کار، بەڵام ئەوانە هیچ سوودیان نەبوو بۆ ئەو سەرکێشانە و هەر باوەڕیان نەهێنا، تەنیا بە باوەڕ نەهێنانەوە ناوەستن، بەڵکو بە ئەوپەڕی بێ شەرمی یەوە دەم درێژی ئەکەن،**

وَلَئِن جِئْتَهُم بِـَٔايَةٍ لَّيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ
ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٩﴾ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ﴿٦٠﴾

**وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَئِن جِئْتَهُم بِـَٔايَةٍ لَّيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر ئایەتێکیان بۆ بێنی بێگومان ئەو کافرانە ئەڵێن دەربارەی تۆ و باوەڕداران ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ﴾ ئێوە هیچ نین جگە لەوەی سەر تێك دەر و خەڵەتێنەرن و درۆزن و تەڵەکە بازن، ﴿كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ ئا بەو جۆرە خوا مۆر ئەنێ بەسەر دڵی ئەوانەی نەزانن و داوای زانین ناکەن و بە شوێنی راست و هەق دا ناگەڕێن و بەڵکو دان ئەگرن بەسەر شتی پڕ و پووچ دا کە باویان پێوە گرتووە، ئەوانە خۆیان بەو جۆرەن، کەواتە شایانی ئەوەن خوایش بەو شێوە بەدبەختیان بکات تا بێ بەش ببن لە هەموو خێرو فەڕێ. لەپاش ئەو هەموو دوان و لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەو بێ باوەڕانە و ئەو هەموو گەردشە پێ یان لە بوونەوەر و لە مێژوو بەسەرهاتی گەلە رابوردووەکان و پێش چاو خستنی ئەو هەموو رابەر و نیشانە روونانەی لەم زەوی ئاسمان و لەخودی خۆیان و بەسەرهات و گۆڕانی ژیانیان، کەچی ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن و تا بێت مل هوڕ تر ئەبن و دەم درێژیی ئەکەن، لەپاش ئەوانە هەموو ئینجا پەند و مۆچیاری ئاراستەی دڵی بەفەڕی پێغەمبەر ئەکات (ﷺ) بە خۆگرتن و ئارام و دامەزراوی دڵ.**

**ئەفەرموێ: ﴿فَٱصْبِرْ﴾ کاتێ حاڵ و باری ئەوانەتان زانی، کەواتە خۆگر بە لەسەر وتارو کرداری ناڕەوا و نالەباریان، لەسەر مل پێچی و ئازاریان بۆت، ﴿إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ﴾ بێگومان بەڵێنی خوا راستە و بەدی بێت، بەڵێنی داوە پێت بە یارمەتی دان و سەرخستنی خۆت و ئایینەکەت و بەرز کردنەوەی وشەی حەق، ﴿وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ﴾ با ئەوانەی باوەڕیان نی یە و باوەڕ ناهێنن بێ ئارام و دڵ دانەمەزراوت ئەکەن، بەهۆی ئەوەوە سست و دڵ سارد ببی لە هەڵسان بە کارو فرمانی خۆت و گەیاندنی پەیامەکەت. بەڵکو دەروون دار بە و با سینگت فراوان بێت.**

**وصلی الله و سلم علی رسوله محمد و آله و صحبه**

**لەرۆژی ۱۴۰۲/۲/۲۹ دوایی هات تەفسیری ئەم سورەتە، خوا یارمەتی بدات بۆ لەمەو دوایش تا ئەم تەفسیرە دوایی ئەهێنین. آمین.**

## سورەتی (لقمان)
## مەککەیی یە و (٣٤) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

ئـەم قورئانـە هـات بـۆ ئـەوەی بـدوێ لەگـەڵ سروشـتی ئـادەمی دا بـە پـێی زانـین و تێگەیشتنی، ئەو کەسەی ئەم قورئانەی نارد کەسێکە کە ئەم سروشتەی داهێناو دروستی کرد، کەسێکە کە زانایە بە هەر شتێك کەچاك و شایانە بۆ ئەم سروشتە و هەرشتێ چاکی ئەکات و چارەسەرە بۆی، ئەزانێ چۆن بدوێ لەگەڵی، ئەزانێ لە کوێوە بۆی بڕوا و بدوێ لەگەڵی، ئەم قورئانە هات بۆ ئەمەی شتێ راگەیەنێ بەم سروشتە و نیشانی بدات کە رووداو و داڕێـژراوە تیـای دا، پـێش ئەمـەی قورئـان نیشانی بـدات و پـێی بڵـێ خـۆی ناسیویەتی ئەوشتەش بریتی یە لـە بـاوەڕ و دان نـان بە بوونی پـەروەردگارێکی تـاك و تـەنیا، روو کـردن بۆلای بە پەنا پێ بردن و گەڕانـەوە و پەرستن لەگـەڵ ئەم بوونەوەرەدا کە بە تێکڕایـی رووی تێ کردووە بە سوپاس و وەسف و سەنا و مل کەچی... ئەم سروشتە خۆی لە خۆی دا ئەو پـەروەردگارە بـێ وێنـە ئەناسـێ بـەڵام چـەند پەردەیـەك لـەم تـەم و دووکـەڵی ئـەم زەوی یـە ئەکەوێ بەسەری دا و لاسەری ئەگرێ، چەند بێ هۆشی یەك رووی تێ ئـەکات بـەهۆی سـۆز و ئارەزووەکانی لەش و خوێن و گۆشتەوە، چەند پاڵ پێوەنـەرێك لەلایـەن نـەفس و شـەیتانەوە پاڵی پێوە ئەنێ و لە رێگا راستەکەی خۆی ئەیترازێنێ، لەبەر ئەوە قورئـان دێتـە پێشەوە بۆ ئەمەی لەگەڵ ئەو سروشتە بدوێ بە پـێی زانین و ژیریـی خـۆی، ئـەو شـتە راسـتەی نیشان بدات کە لێ ی بێ ئاگا بووە بە شێوە و رەوشتێ کە شایانە و رێك و گونجاوە لەگەڵی، لەسەر

ئەو بنەڕەتە راستە بەرنامەیەکی ژیانی تێرو تەواوی بۆ ئەخشە ئەکێشێ، کە رێك و گونجاوە لەگەڵ عەقیدە و باوەڕەکەی، لەگەڵ هەست و ژیریی دا، لەگەڵ ئەو رێگای کە ئەیداتە بەر بۆلای خوا. ئەم سورەتە نموونەیەکە لەو نموونە قورئانی یانە لە دووان و وت و وێژ لەگەڵ دڵ و دەروونی ئادەمی دا. هەوڵ و تێکۆشان ئەکات بۆ چاندن و رواندنی عەقیدەی رێك و راست لە دەروونی ئەو بت پەرستانەی کە لایانداوە لەو عەقیدە و باوەڕە راستە. ئەم مەبەستە گرنگە سورەتە مەککەیی یەکان خەریك ئەبن بۆ چارەسەر کردنی بەچەند رێگا و رەوشتی جۆر بەجۆر، لە چەند بارو روویەکەوە، لە هەموو ناوچە و لایەکەوە خەریك ئەبێ لەگەڵ دڵ و دەروون بە چەند شتێکی بەکاری ئیش کەر لە بێدار و وریا کردنەوەی سروشت و لابردنی پەردەی تەم و دووکەڵ بەسەری یەوە.

ئەم مەسەلە و مەبەستە گرنگە – عەقیدە و باوەڕ – لەم سورەتەدا کۆشش کردنە بۆ چەسپاندنی باوەڕ بە تاك و تەنیایی خوا و پەرستنی بە تەنها و باوەڕ بە رۆژی دوایی و حیساب و پرسیار و پاداشت و تۆڵەی رێك و راست، پەیڕەوی ئەو ئایین و شەریعەتەی خوا ناردوویەتی و خۆ داڕنین وخاوێن کردن لە هەموو بیرو باوەڕی تر.

ئەم سورەتە ئەو مەسەلە و مەبەستە نیشان ئەدات لە رێگایەکەوە کە سەرنج رائەکێشێ بۆ ورد بوونەوە و تێگەیشتن لە رەوشتە نایابەکەی قورئان لە دواندنی لەگەڵ دڵ و دەروون و سروشت دا، هەموو بانگ کەرێ بۆ رێگای خوا پێویستە بە ورد بوونەوە لەو رەوشتە بۆ ئەمەی لەبەر رووناکی یەکەیەوە هەڵسێ بە کار و فرمانی خۆی. بەم کورتەیە ئەندازێ تێگەیشتن لە سروشت و ئامانج و مەبەستی سورەتەکە،

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٢﴾ هُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾

**ئینجا با گویٚ شل کەین بۆ ئەم سورەتە بەفەڕە ئایەتەکانی بخوێنیتەوە بەسەرمان دا:**

**﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *الٓمٓ﴾ لەم تەفسیرەدا راڤە و تەفسیری ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ مان نەکرد، چونکە زۆر بەناوبانگە و نەخوێندەواریش تیٚ ئەگات لە مەبەستەکەی، بەجۆریٚ هەر بەم پیت و وشەی خۆیەوە بەکار ئەهێنریٚ و ئەوتریٚ لە لایەن هەموانەوە لە سەرەتا و لەپێش هەموو وتار و کردەوەیەکی چاك و بەنرخەوە، لەبارەی ئەم سیٚ پیتە: ﴿الم﴾ و وێنەیانەوە لە چەند سورەتێك دا دووایـن، کەواتە با لێرەدا بیٚ دەنگ بین و هەرکەس ئەیەویٚ با تەماشای گەلیٚ لەو سورەتانە بکات کە ئەم جۆرە پیتانە لە سەرەتایانەوە هەن.**

**﴿ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ﴾[1] ئەم ئایەتە گرنگانە کە لەم سورەتەدا هەن چەند ئایەتێکن لە کتێبێك کە لێزانە و کار دروستە و هەموو شتێکی لە جێگای خۆی دایە، بێگومان وشەی ﴿حکیم﴾ لە خۆی دا بۆ شتیٚ بەکار ئەهێنریٚ کە زیندوو و خاوەن هەست و نیاز بێت، کاتیٚ بەکارهێنرا بۆ قورئان و ئەم کتێبە ئەبیٚ لەبەر ئەوە بێت کە خاوەن و نێرەکەی ﴿حکیم﴾ ە. یان لەبەر ئەوەیە هەرچی تیا وتراوە هەمووی رێك وبەجیٚ یە و بەرژەوەندی تەواوی تیایە، یان هەر لەبەر ئەوەیە کە قورئان گیان و هەست و نیازێکی تایبەتی هەیە، سۆز و بەزەیی دارە لەگەڵ ئەوانەی ئەژین لەگەڵی و ژیان ئەبەنە سەر لە سایە و پەنای دا و قاپی دڵ و دەروونی خۆیانی بۆ ئەکەنەوە و هەمیشە چاوەڕوانی تەمیٚ و ئامۆژگاری و فێرکردنی ئەون،**

---

[1] وشەی (تلك) بۆ دەست نیشانی دوور دانراوە بەڵام لێرەدا بەکار هێنراوە بۆ نزیك و مەبەست روون کردنەوەی گرنگی یەتی لەبەر ئەوە تەفسیرەکەم بەو شێوە کردەوە.

ئەو کەسانە کە بەو جۆرەن لەگەڵ قورئان دا هەست ئەکەن بە سۆز و بەزەیی یەکەی بۆیان، مەبەست و ئامانجی خۆیانی لێ وەرئەگرن و فێری هەموو پێویستی یەکی خۆیان ئەبن لێ یەوە، بە وێنەی دوو دۆستی بەسۆزی گیانی بە گیانی ئەژین لەگەڵی!!

ئەو کتێبە ﴿حكيم﴾ ە یان ئایەتەکانی ﴿ هُدًى وَرَحْمَةً لِّلْمُحْسِنِينَ ﴾ [1] رێنموونی و بەزەیین بۆ چاکە کاران و ئەوانەی خاوەنی چاکەن. ئەم دوو سیفەتە شتێکی بنەڕەتی و هەمیشەیین بۆ ئەم کتێبە... نیشاندەری رێگایەکە بۆیان کە گەیەنەرە و رێبوارەکەی هەرگیز ون نابێ، بەزەیی دارە پێ یان ئارام و دامەزراوی و ئاسایش ئەگەیەنێ بە دڵ و دەروونیان، پیت و فەڕ و خێرو گەیشتن بە ئامانجیان پێ ئەدات، بەزەیی و پەیوەندی و یەکێتی ئەخاتە نێوانیان، ئینجا لە نێوان ئەوان و ئەو بوونەوەرەی تیای دا ئەژین. ئەو چاکە کەرانە ئەمانەن: ﴿ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَوٰةَ وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴾ کەسانێکن نوێژ بە رێکی بەجێ ئەهێنن و زەکات ئەدەن، ئەوانە بڕوا ئەهێنن بە رۆژی دوایی، بڕوایەکی بەهێزو بە هەموو ئارامی دڵەوە.

بێگومان نوێژ کە بە رێکی و شێوە راستەقینەکەی بەجێ بهێنرێ کار ئەکات لە هەست و دەروون و رەوشت دا، هەست بە بەرهەمی ئەکرێ، پەیوەندی بەهێزی پێ پەیدا ئەبێ لە نێوان دڵی بەندە و پەروەردگاری دا، نوێژکەر بە تەواو دڵی بەخوای خۆی ئەکرێتەوە، شیرینی ئەو دڵکرانەوە دڵی ئەبەستێتەوە بەو نوێژەوە... زەکات دان هۆی بەرزی و زاڵی دەروونە بەسەر چروکی و بەرچاو تەنگی یەك کە شتێکی سروشتی یە، هۆی بەدی هێنان و راگیر کردنی رژێمی ژیانێکی کۆمەڵایەتی یە کە بنەڕەتی لەسەر کۆمەڵی و قوڵ گیری و بەزەیی و یەکێتی یە، دەست دار و بێ دەست، دەوڵەمەند و بێ نەوا لەو رژێمەدا جێگای

---

[1] ئەم دوو وشەیە خوێندنەوەیان بەسەرە باوە کە ئەو کاتە حاڵن، بە بۆرەش خوێنراوەتەوە ئەو کاتە خەبەرن بۆ بڕیار دراوێ یان خەبەری دووەمن. لەسەر هەردوو مەبەستەکە هەر یەکە.

باوەڕ و دڵ ئارامی و خۆشەویستیی بۆ یەکتر کە ئەو بوون و نەبوونی و فراوانی و بێ بەشی یە هۆی بێزاری و بێ بڕوایی و کینە بەرین لە رژێم و گەلەکانی تردا... باوەڕی بەهێزی بە ئارام و بە رۆژی دوایی هۆی بێدار بوونەوەو وریایی دڵ و دەروونی بەندەیە، چاوەڕوانی و چاو بڕینی بۆ ئەوەی لای خوایە، زاڵ بوونی بەسەر شت و مەکی ئەم زەوی یەدا و سەردانەخستن و یەخسیر نەبوون بۆ ژیانی ئەم جیهانە، چاودێریی خوا لە ئاشکرا و نهێنی دا بۆ هەموو شتێك، گەورە و بچووك. ورد و درشت، بە بڕوا بەهێزە بەندە ئەگاتە رادە و پلەی بەرزی ﴿الإحسان﴾ کە پرسیار کرا لە پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەیەوە و ئەویش لە وەڵام دا فەرموی: ﴿الإحسان ان تعبد الله كأنك تراه فإن لم تكن تراه فإنه يراك﴾ [١] ئەم چاکە کەرانەن کە ئەم کتێبە رێنموونی و بەزەیی یە بۆیان ، چونکە بەهۆی کرانەوە و رووناکی دەروونیانەوە ئارام و ئاسایشیان دەست ئەکەوێ لە هاوڕێ یەتی ئەم کتێبە، ئەگەن بە نوور و رووناکی یەکەی، تێ ئەگەن لە مەبەست و ئامانجە راستە بەجێکانی، دەروونیان یەك ئەکەون و یەك ئەگرن لەسەر ئەم کتێبە. ئەم قورئانە بەهرە و بەخششی خۆی ئەدا و ئەیڕێژێ بەسەر هەموو دڵێکی بڕوا داردا هەر کام بە ئەندازەی هەست و کرانەوە و رووناکی خۆی، هەرکام بە پێی روو کردنی بۆ ئەم کتێبە بە سۆز و چاوەڕوانی و شانازی کردن پێ یەوە، ئەم قورئانە زیندووە و گیان و رۆحێکی تایبەتی هەیە و سۆز و بەزەیی بەکار ئەهێنێ لەگەڵ ئەو دڵانەی کە دۆستی لەگەڵ ئەکەن، لا ئەکاتەوە و ئەچێ بەدەم ئەوانەی کە بەسۆز و خۆشی یەوە رووی تێ ئەکەن!!

---

[١] واتە: ئیحسان ئەمەیە خوا بە جۆرێ بپەرستی وەك بەچاو ببیبینی، چونکە ئەگەر تۆ ئەو نابینی بێگومان ئەو تۆ ئەبینێ. بوخاری و موسلیم لەباسی ئیمان دا.

أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٥﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ
لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿٦﴾

**﴿ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾ ئەو چاکە کەرانەی کە ئەو نیشانە و سیفەتانەیان بۆ باس کرا لەسەر ڕووناکی و ڕێنوومایین لەلایەن پەروەردگاریانەوە، ئەوانەن ڕزگار و گەیشتوو بە ئامانج، ئەو کەسەی کە خرابێتە سەر ڕێگای ڕاست ئەو کەسە لەبەر ڕووناکی ئەڕوا و ئەگەڕێ، ئەگات بە مەبەست، ڕزگارە لە گومڕایی و ون بوون، لە دوا ڕۆژی خراپی گومڕایی لەو جیهان دا، بە ئارامەوە ژیان ئەباتە سەر لەم جیهانەدا و لە گوزەر کردنی بەسەر ئەم زەوی یەدا. ئەو خوا پێداوە بەختیارانە تاقمێکن... لە بەرامبەر ئەوانەوە تاقمێکی تر هەیە کە بەم فەرمودەیە ڕوونیان ئەکاتەوە: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ ﴾ هەندێ لە ئادەم قسە و باس و وتارێ ئەکڕێ و پەیدای ئەکات کە مەردوم خەریك و بێ ئاگا ئەکات لەکاری مەبەست و گرنگ. ئەوەش وەکو ئەو قسە و باس و درۆ و دەلەسە و شتە پڕو پووچە زۆرەی کە بڵاو بوونەتەوە و نووسراونەتەوە لە کتێب دا، هەروەها هەر وتە و وتارێك کە کات بکوژێ وا لەدەستی دەربکات، هیچ خێرێکی تیا نەبێ و بەس مەبەست ڕابواردنێکی ناڕەوا بێت، هیچ بەرهەمێکی نەبێ کە شیاو و شایان بێت لەگەڵ کار و فرمانی ئادەمی کە کراوە بە جێنشین لەم زەوی یەدا بۆ ئاوەدان کردنەوە و ڕازاندنەوەی بە خێرو چاکە و دادپەروەری، ئەو کار و فرمانەی کە بڕیار دراوە لەسەر ئادەمی و ئایینی پاکی ئیسلام شێوە و سروشت و سنووری دیاریی کردووە، نەخشەی کێشاوە و هۆکانی ڕوون کردووەتەوە.**

**لە کتێبەکانی تەفسیردا ناوبانگ وایە کە ئەم ئایەتە بە بۆنەی (نضری کوڕی حاریث) ەوە هاتووەتە خوارەوە کە ئافرەتێکی گۆرانی بێژی کڕی بوو کاتێ بیزانیایە بە هەرکەس ئەیەوێ موسڵمان ببێ ئەچوو بۆلای و ئەیهێنا بۆلای ئەو ئافرەتە و پێی ئەوت خواردەمەنی بدەرێ و ئارەقی دەرخوارد بدە و گۆرانی بۆ بڵێ، ئینجا ئەیوت بە کابرا: ئەمە چاکترە لەوەی محمد بانگت ئەکات بۆی، یان ئەڕۆیی بۆ بازرگانی لە وڵاتی فارس، لەوێ کتێبی ئەوانی ئەکڕی و**

ئەهاتەوە ئەیخوێندەوە بۆ قورەیش و ئەیوت: محمد هەواڵی عاد و سەمودتان بۆ ئەگێڕێتەوە و منیش هەواڵ و بەسەرهاتی رۆستەم و ئەسفەندیارتان بۆ ئەگێڕمەوە، ئەوانیش ئەو قسە و باسە پڕو پووچەیان بەلاوە خۆش بوو، بەو جۆرە خەریکی ئەکردن لە گوێ گرتن لە قورئان.

ئەم ئایەتە هەرچەند بەم بۆنەیەوە هاتبێتە خوارەوە تایبەتی نی یە بەو ڕووداوەوە و بەو تەنیا کەسەوە، بەڵکو شتێکی گشتی یە و هاتووە بۆ نەخشە کێشان و نیشاندانی تاقمێ لە ئادەمی کە لە هەموو کات و چەرخێك دا بووە و هەیە و هەر ئەیشبێ، لە یەکەم چەرخ دا یەکەم جار لەناو مەککەیی یەکان دا بوو، ئەو تاقمە بەد کردارە ئەو شتە بێ نرخەی ئەکڕی بە ماڵ و سامانی و ئەیکڕی بە کاتە بە نرخەکەی ژیانی، ئەیکڕی بە ژیانی و ئەو ژیانە گرنگەی تیا بەخت ئەکات، ئەو هەموو شتە بە نرخە دەست لێ هەڵئەگرێ و بەخی ئەکات لە پێناوی ئەو شتە بێ نرخەدا، ئەو شتە بێ نرخە ئەکڕێ بەم نیازە پیسە ناڕەواوە. ﴿لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ بۆ ئەمەی خەڵکی گومڕا بکات و لایدا لە ڕێگای خوا، لە ئایینی خوا لە قورئانی خوا کە تەنها ئەوە ڕاستە و هۆی ڕزگاری یە لە هەردوو جیهان دا، ئەو سیا چارەیە ئەیەوێ خۆیشی و خەڵکیش بەوجۆرە بەش بڕاو و بەد بەخت بکات، کەواتە نیاز و مەبەستێکی زۆر پیس و ناڕەوای هەیە، ئەو شتە بێ نرخە ئەکڕێ ﴿بِغَيۡرِ عِلۡمٖ﴾ بە بێ هیچ جۆرە زانینێك بە حاڵ و باری ئەو کڕراوە، واتە نەزانە و کردەوەکەی لە نەفامی یەوە هاتووە ﴿وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا﴾ هەروەها نیاز و مەبەستی بەو شتە بێ نرخانە ئەمە کە ڕێگاکەی خوا بکات بە جێگای گاڵتە و لاقرتی پێ بکات، بەڕاستی ئەوە ئەوپەڕی بێ شەرمی یە کە بە سووکی و لاقرتی یەوە سەرنجی بەرنامەی خوا بدرێ کە دایناوە بۆ ژیان و بۆ ئادەمی، جا لەبەر ئەوە ئەم هەڕەشە سامناکەیان ئاراستە ئەکات لە پێش تەواو کردنی نیشانە و شێوەکەیان، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ ئەو تاقمە کە باس کران بۆیان هەیە سزایەکی ئابروو بەر و ڕیسوا کەر لە ڕۆژی دوایی دا، سزای سووتانیان هەیە بە ئاگری دۆزەخ لە تۆڵەی ئەو کردەوە پیسەیان دا، ڕیسوا و بێ ئابڕوویش ئەکرێن لە تۆڵەی بێ شەرمی یان دەربارەی ڕێگا و ئایەتەکانی خوا، خوا بە بەزەیی خۆی بمانپارێزێ لە خەشم و تۆڵە و سزای خۆی.

وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا كَأَنَّ فِىٓ أُذُنَيْهِ وَقْرًا ۖ فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٧﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ
ٱلْحَكِيمُ ﴿٩﴾

---

ئینجا دێته سەر تەواو کردنی نیشانە و شێوەکەیان، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسْتَكْبِرًا﴾ کاتێ ئایەتەکانی ئێمە بخوێنرێتەوە بەسەری دا روو وەرئەگێڕێ و پشتیان تێ ئەکات بە لوت بەرزی و خۆ بە زل زانی یەوە، هیچ گوێی لێ ی نی یە ﴿كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا﴾ وەکو هەر نەیبیستبێ ﴿كَأَنَّ فِىٓ أُذُنَيْهِ وَقْرًا﴾ وەکو لە هەردوو گوێچکەی دا کەڕی ببێ، ﴿فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ بەهۆی ئەوەوە ئەی پێغەمبەر موژدەی بدەرێ بە سزایەکی ئێش و ئازار دەر. مەبەست لە موژدە لێرەو لە هەموو وێنەی ئێرەدا لاقرتی پێ کردنە بۆ سزادانی دەروونیان، ئەم ریسوا کردن و لاقرتی یە کالاّی بالاّی ئەو لوت بەرزە خۆ بە زل زانانەیە.

ئینجا بە بۆنەی باسی تۆڵەی ئەوانەی کە باس کران دێتە سەر باسی پاداشتی باوەڕدارانی چاکەکاران، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ﴾ بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوە کردەوە چاکەکانیان بەجێ هێنا بۆ ئەوانە هەیە بەهەشتانی نازو نیعمەت، واتە نازو نیعمەتی بەهەشتیان هەیە، بەلاّم ئەم پێچەوانەیە زۆر جوانترە، چونکە وا نیشان ئەدات کە ناز و نیعمەتەکەی زۆر و فراوانە تا رادەیەك ئەو ئەسڵەو بەهەشتەکان بەو ئەناسرێن و جوێ ئەکرێنەوە. لە بارێکی ترەوە ئەم شێوە پێچەوانە ئەمە ئەگەیەنێ کە بەهەشتەکان موڵکیانە کەواتە ناز و نیعمەتەکەشیان، بەلاّم ئەو بارەکەی تر تەنها موڵکایەتی نازو نیعمەتەکە ئەگەیەنێ نەك بەهەشتەکان. بەڕاستی قورئان قورئانە. باوی قورئان وایە بەڵێنی پاداشت بە باوەڕدارانی ئەدات کە خاوەنی کردەوە چاکەکان بن، چونکە سروشتی ئەم ئایین و پەیامە لەسەر ئەوەیە کە ئیمان و باوەڕ نابێ شتێکی رووتی وەستاوی بێ کار

بێت و شاراوە لە دڵ دا. بەڵکو ئەبێ شتێکی زیندووی ئەوەستاوی ئیش کەر بێت، هەر لەگەڵ جێگیر بوو لەدڵ دا ئیتر دەست بەجێ بکەوێتە بزووتنەوە و ئیش کردن تا خۆی دەرخات لە رەوشت و کرداری خاوەنەکەی دا. هەر ئیمان و باوەڕێ ئەگەر ببێ لە دڵ دا و بەو جۆرە نەبێت شایانی ئەوە نی یە بەڵێنی پاداشت بدرێ بە خاوەنەکەی، پاداشتی ئەو باوەڕە رووتە ئەگەر نەڕواو بمێنێتەوە ئەمەیە کە خاوەنەکەی هەمیشەیی نابێ لە سزاو ئاگردا.

ئەو خاوەن باوەڕو کردەوە چاکانە ئەو بەهەشتانەیان پێ ئەدرێ ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ﴾ بەجۆرێ ئەمێننەوە تیایان دا بە هەمیشەیی و بێ بڕانەوە. ﴿وَعۡدَ ٱللَّهِ﴾ ئەو بەڵێنەی پێ یان درا بەڵێنی خوایە و خوا بەڵێنی پێداون ﴿حَقًّا﴾ بەڵێنێکی راستە و بەدی دێت، ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ ئەو خوایە کە ئەو بەڵێنەی داوە تەنها ئەو زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و هیچ کەس و هیچ شتێك ناتوانێ سەرپێچی بکات و بەرگری هیچ بڕیارێکی بکات و تەنها ئەو لێزان و کاردروستە و هەموو کارێکی لە جێگای خۆیەتی، کەواتە بەڵێنێك کە دای بەوانە ئەبێ بەدی بێت، نیشانە و بەڵگەی بەهێز لەسەر ئەو توانا و زاڵی و کاردروستی یە ئەم بوونەوەرە گەورە و گرنگەیە کە هیچ کەس لە ئادەمی ناتوانێ بڵێ دەخل و دەسەڵاتی تیا هەیە، یان دەسەڵاتی هیچ کەسی تری تیا هەیە بێجگە لە خوا، ئەم بوونەوەرە ئێجگار وردەکاری تیا کراوە و رژێم و یاسایەکی راست و نەگۆڕاوی هەیە، ئێجگار هەموو بەش و پارچەکانی رێك و گونجاو و شیاون لەگەڵ یەکتر، تەواوکەر و بەدی هێنەری مەبەست و ئامانجی یەکترن بە تایبەتی و مەبەست و ئامانجی گشتی بە شێوەی گشتی، بە جۆرێ دڵ ڕفێن و هۆش و ژیریی داگیر کەرن، ئەمانە هەموو روو بەڕووی سروشت و ژیریی رائەوەستن و رێگای لێ ئەبڕنەوە، بەجۆرێ ناتوانن خۆیانیان لێ قوتار بکەن و روویان لێ وەرگێڕن وناچاریان ئەکەن بە مل کەچ کردن و داننان بە تاك و تەنیایی پەروەردگاری گەورە، بە گومڕایی و لە رێگا ترازانی هەرکەسێ هاوبەش و وێنە بۆ ئەو خوایە بڕیار بدات،

ئەفەرموێ ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ ﴾ ئاسمانەکانی دروست کردوو راگیری کردووە بە بێ پایە و ئەستوون. مەبەست ئەو ئاسمانانە کۆمەڵە ئەستێرە و کاکەشان و ئەو شتانە بێت کە گەردش ئەکەن بەلای سەرەوە، یان مەبەست ئەو شێوە گومەزە بێت کە چاو ئەیبینێ و هیچ کەس لە رووی راستی یەوە نازانێ چی یە؟ مەبەست هەرکام بێ ئەوە شتێکی ئاشکرایە و بەچاو ئەبینرێ ئەو هەموو شتە گەورە و گرنگە راگیرە بێ هیچ ئەستونێ ﴿تَرَوۡنَهَاۖ﴾ ئەوەتا ئەیانبینن راگیرن بە بێ هیچ، خەڵکی بەو جۆرە ئەیانبینن بە شەو و بە رۆژ تا چاو بڕ ئەکات سەرنج ئەدەن لە هەر شوێنێ بن و بۆ هەر لایەك بڕۆن. تەنها ورد بوونەوەو سەرنج دان بە چاوی رووت لەو دروست کراوە گرنگەدا بەسە بۆ ئەمەی ئادەمی بکەوێتە دڵە لەرزە و موچرکەی پیا بێت و بکەوێتە دڵە تەپە لەبەردەم گرنگی و نایابی ئەم دروست کراوانەدا، لە ئاستی ئەو رژێمە بەهێزەی کە ئەو هەمووەی هۆنیوەتەوە و راگیری کردوون بەو رێك و پێکی یە، لە ئاستی ئەو جوانی و شیرینی یەی کە سەرنجی چاو رائەکێشێ بۆ تەماشا کردنی بە بێ تێر بوون، دڵ ئەرفێنێ و راینەکێشێ بۆ بیر کردنەوە بە بێ ماندوو بوون، هەست دائەگرێ و لەوانەیە نەگەڕێتەوە بۆلای خاوەنی!! ئەمە ئەگەر بە چاوی رووت و سەرنجی تەنها ئەو دیمەن و رواڵەتە بدرێ، ئەی ئەگەر بزانرێ کە هەر نوختە و خاڵێ لەو نوختە و خاڵە وردانە کە بە شەو چاو ئەکرێن. هەرکام لەوانە قەبارەی چەند قاتی قەبارەی ئەم زەوی ئێمەیە؟ ئەگەر ئەوە بزانرێ ئەبێ سەرسامی بگاتە چ رادەیەك!!

لەپاش ئەو گەردش و چاو پیا خشانەی کە کردی بە دڵ و دەروونی ئادەمی لە ئاسمانەکان دا ئینجا دڵ ئەگێڕێتەوە و ئەیهێنێتەوە بۆ ئەم زەوی یە بچکۆلەیە، کە وەکو خاڵ و نوختەیەکی زۆر ورد و بچووك وایە لەناو ئەم بوونەوەرەدا، ئەیگێڕێتەوە بۆلای ئەم زەوی یەی کە ئادەمی بە گەورە و فراوانی سەیر ئەکات، هیچ کەس ئاگات بەم پەڕو ئەو پەڕی دا بە ماوەی تەمەنی، هەرچەند هەوڵ بدات و تەمەنی خۆی بەخت بکات لە گەڕان و هاتوچۆی هەمیشەیی تیای دا ئەیگێڕێتەوە بۆ ئەم زەوی یە بۆ ئەمەی بەچاو و دڵێکی کراوە سەرنجێکی داتەوەو لێ ی ورد ببێتەوە، ئەو تەم و پەردەی دراوە بەسەریان دا لایدا کە بەهۆی ئولفەت و دەق پێوە گرتنەوە فەراهەم هاتوون. ئەو تەم و پەردەیە نەمێنێ و ئینجا بە وردی سەرنجێکی ئەم زەوی یە سەر سوڕهێنەرە بدات، ئەفەرموێ: ﴿وَأَلْقَىٰ فِي ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾ لە زەوی دا چەند شاخ و چیایەکی قورسی دامەزراوی داناوە بۆ ئەمەی تاسە و لەنگەرەتان پێ نەکات. زانایانی تەبەقەکانی زەوی ئەڵێن: ئەم شاخانە لوتکە و ددانەو بەرزی یەکن لە پێستی زەوی دا پەیدا ئەبن لە ساردی ناوسکی زەوی و بەستنی ئەو گارانەی کە تیایەتی، کەم و کوڕی قەبارەیان، بەهۆی ئەوەوە پێستی زەوی قرچ هەڵدێ و بەرزی و نزمی تیا پەیدا ئەبێ بە پێ ی ئەو قرچ هەڵهاتننانە کە روو ئەدەن لە قەبارەی ئەو گارانەدا. جا هۆی پەیدا بوونی شاخەکان ئەوە بێت کە ئەو زانایانە ئەڵێن یان نە ، ئەمە کتێبی خوایە ئەفەرموێ: بوونی ئەو شاخانە پارێزەری هاوتایی زەوی ئەکات و بەرگری ئەکات لە لەرزە و تاسە و لەنگەرە. هەڵئەگرێ ئەوەی ئەو زانایانە ئەڵێن راست بێت و پەیدا بوونی شاخەکان لەو شێوەیە پارێزەر بێت بۆ هاوتایی و هاوکێشی زەوی، بەرزی ئەمان لە شوێنێك دا هاوتایی نزمی و چاڵی بکات لە شوێنێکی تری زەوی دا، بەهەرحاڵ لە هەموو کات دا وشەی خوابەرزەبەمل هەمووبڕیاروشەیەك دا، خواراستەووتارو بڕیاری راست ترین وتار و بڕیارە.

وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍۚ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿١٠﴾ هَٰذَا خَلْقُ ٱللَّهِ
فَأَرُونِى مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦۚ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١١﴾

---

﴿وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍۚ﴾ دروستی کرد و بڵاوی کردەوە لە زەوی دا لە هەموو جۆرە گیان لەبەرێك. بوونی گیان لەبەران لەم زەوی یەدا یەکێکە لە شتە نایابەکانی ئەم بوونەوەرە. گیان شتێکی نهێنی یە هەتا ئەمڕۆ هیچ کەس نی یە بڵێ: تێی گەیشتووم و ئەزانم چی یە؟ گیان لە یەکەم شێوەی دا، لەتەنها سێڵێکی سادەی بچووك دا چ جای ئەم شێوە گەورە و گرنگە کە تیرە تیرە و جۆر بە جۆر بووە تا رادەیەك ئادەمی بۆی نایەتە ژمارە؟ لەگەڵ ئەوەدا زۆربەی خەڵك گوزەر ئەکەن بەلای ئەم شتە سەر سوڕهێنەرەدا و چاوی لێ ئەنووقێنن و هیچ بیرێکی لێ ناکەنەوە وەکو شتێکی وا نەبێ کە شایانی بیر لێ کردنەوە بێت، کەچی لە لایەکی ترەوە بە ئەوپەڕی سەر سوڕمانەوە ئەوەستن بەرامبەر جیهاز و ئامێرێك لە دەست کردی ئادەمی کە شتێکی سادەیە و پێك هێنانی زۆر سووك و ئاسانە ئەگەر بەراورد بکرێ لەگەڵ تەنیا سێڵێك لە سێڵە زیندووەکان، کردەوەی ورد و هۆنراوە و نایابی، ئیتر واز بێنە لەو زیندەوەرانەی کە گرێ و گوتاڵی زۆر و زەبەنەی تیا فەراهەم هێنراوە، چ جای ئادەمی کە لەشی سەدان کارگەی کیمیاوی تیایە و سەدان مەخزەنی هەیە بۆ کۆکردنەوە و دابەش کردن، سەدان دەزگای بێ تەلی هەیە بۆ ناردن و وەرگرتن، هەڵئەسێت بە سەدان کارو فرمانی گرنگ کە کەس ئاگای لە سیررو نهێنی یەکانیان نی یە بێجگە لە خوای زانای باخەبەر!!! ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ هێنامانە خوارەوە لە ئاسمان و لای سەرەوە ئاوێك کە بارانە.

بەڕاستی بارانیش یەکێکە لە شتە گرنگە سەر سوڕهێنەرەکانی ئەم بوونەوەرە هەرچەند ئێمە بە بێ ئاگایی هەروا تێپەڕ ئەکەین بەسەری دا، ئەم ئاوە کە رووبارەکانی پێ ئەڕوا و دەریا بچکۆلەکانی پێ پڕ ئەبێت، ئەوەی کە کانی و چەشمەکانی پێ هەڵ ئەقوڵێ... ئەمە هەمووی لای سەرەوە دێت بە پێی رژێمێکی ورد کە بەستراوە بە رژێمی ئاسمان و زەوی یەوە، بە رادەو ماوەیەکە کە هەیە لە نێوانیان دا. ﴿فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ﴾ بەهۆی ئەو ئاوەوە رواندمان لە زەوی دا لە هەموو جۆرێکی زۆر پیت و سوود دار. بەڵێ رواندنی ئەو هەموو رواوە لە زەوی دا لەپاش بارینی باران جێگای سەرسوڕمانە و هەرگیز سەرسوڕمان لێ ی دوایی نایەت، گیانەکەیان، جۆر جۆری و دابەش بوونیان بەو هەموو جۆرە جیاواز

لەگەڵ ئەوەدا بە یەك جۆر ئاو ئەدرێن و لە زەوی یەكان!! هەروەها ئەگۆڕان و لا ئەدانی هەموو جۆریێ ناگۆڕێ بە جۆرێكی تر، ئینجا ئەو هەموو رەنگی جیاوازە و دابەش كردنیان بەسەر ئەو رواوانەدا، بەڵكو دابەش كردنی چەند رەنگی جیاوازە و دابەش كردنیان بەسەر ئەو رواوانەدا، بەڵكو دابەش كردنی چەند رەنگی بەسەر بەش و پارچەكانی تەنیا گوڵێك دا، بەڕاستی هەر دڵێ دانەخرابێ بە بیر كردنەوە لەم جۆرە شتانە پاراو و روناك ئەبێتەوە بە باوەڕێكی بەهێز بە پەروەردگاری كە داهێنەری ئەو هەموو شتە نایابەیە.

ئەم ئایەتە دەست نیشان ئەكات بۆ ئەمە كە رووەكان دوو جۆریان هەیە: نێرو مێ. ئەوەش شتێكی زۆر گرنگە كە لەم چەرخی دوایی یەدا رێی پێ براو دەركەوت كە رووەكان چەند سێڵێكی نێری و چەند سێڵێكی مێ بیان تێدایە، ئیتر پێكەوە لە تەنیا پەلك و گوڵێك دا، یان لە دوو پەلك و گوڵ لە تەنیا لق و بنێك دا، یان بە جیا جیا لە دوو لق و پەل یان دوو درەخت، بەرو میوە پەیدا نابێت مەگەر دوای گەیشتن بەیەك لەنێوان نێرو مێ یەكان و پێون بوونیان، بە وێنەی گیانداران. ئینجا ئەو دروست كراوە نایابانە بەرز ئەكاتەوە و ئەیانخاتە بەرچاو و ئەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا خَلْقُ ٱللَّهِ ﴾ ئەمە كە باس كرا دروست كراوی خوایە، ئینجا بەریان لێ ئەبڕێتەوە بەم فەرمودەیە: ﴿فَأَرُونِى مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ﴾ كاتێ كە زانرا ئەمەی هەیە دروست كراوی خوایە دەی نیشانم بدەن و هەواڵم بدەنێ ئایا چی یە و كامەیە ئەوەی كە بت و پەرستراوەكانی تر دروستیان كردبێ؟ بێگومان هیچ كەس نیێە لەم جیهانەدا ئەوەندە نەفام بێت بڵێ: بێجگە لەخوا هیچ كەس و هیچ شتێكی تر هیچ شتێكی لە نەبوون داهێناوە یان دایئەهێنێ، بە تایبەتی ئەو بت پەرست و هاوبەش بڕیار دەرانە بەڕێكی دانیان ئەنا بەمەی خوا داهێنەر و پەروەردگاری هەموو شتێكە، كەواتە هەر ئەمە چاكە واز بهێنرێ لە دەم كوت كردنی بێ بڕواكان و جاڕی گومڕایی و سەر لێ شێوانیان لێ بدرێ. وەكو ئەفەرموێ: ﴿بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾ ئەو بێ بڕوا ستەمكارانە كە شت لە جێگای خۆی دانانێن و لە سنوور تێپەڕ ئەكەن و دەست درێژیی لە خۆیان ئەكەن، ئەوان وان لەناو گومڕایی یەكی روون و ئاشكرادا. چ ون بوون و گومڕایی و ستەمكاری و دەست درێژیی یەك ئەگاتە بت پەرستی و هاوبەش بڕیاردان لەناو ئەو پێشانگا گرنگە روونەی بوونەوەردا. ئینجا هەمیتر ئەدوێ لەبارەی عەقیدە و باوەڕەوە بە شێوە و رەوشتێكی تر جیاواز لە شێوە و رەوشتی لەمەوبەری سورەتەكە وەكو بۆمان روون ئەبێتەوە،

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿١٢﴾

ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ﴾ سوێند بەخوا حیکمەتمان دا بە لوقمان و پێمان بەخشی. ئەم لوقمانە کە قورئان هەڵی بژارد بۆ ئەمەی بە زمانی ئەو مەسەلەی تاك و تەنیایی خواو مەسەلەی رۆژی دوایی راگەیەنێ و نیشانی بدات، سەبارەت بەم لوقمانە چەند ریوایەت و رایەك هەیە کە کێ بووە؟ لە چ چەرخێك دا بووە؟ لە چ تیرە و گەلێکە؟ ئایا پێغەمبەر بووە یان خواناس و پیاو چاکێ بووە؟

بەهێزترین را کە زۆربەی لەسەر ئەمەیە کە لە گەل و تیرەی بەنی ئیسرائیلە، پیاو چاکێکی خواناس بووە و پێغەمبەر نەبووە، هەروەها چەند رایەك هەیە لەبارەی مەبەست بە وشەی ﴿حکمة﴾: ژیریی و تێگەیشتن و زیرەکی، ژیر و زانین و رێ بردن و بە قسە و وتەی بەجێ. ناسینی هەرشتێ کە هەیە لە کردەوەی چاك دا. لێزانی و کاردروستی. ناسینی هەرشتێك لەسەر بارو شێوە راستەقینەکەی. بێجگە لەمانە چەند شتی تریش وتراوە کە هەموو نزیکن لەیەکەوە. بەهەرحاڵ لێرەدا قورئان دەست نیشانمان بۆ ئەکات بە مەبەست پێی. دەست نیشان ئەکات بۆ شتێ کە هەموو سیفەت و کردەوەی چاك ئەگرێتەوە و سەرچاوەی هەموو پیت و فەرێکە لە هەردوو جیهان دا، ئەفەرموێ: ﴿أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ﴾ حیکمەتمان پێ بەخشی بەم رەنگە وتمان پێی: سوپاس و وەسف و سەنای خوا بکە بە زمان بەو جۆرەی کە شایانە، لەگەڵ باوەڕی دڵ و بەجێ هێنانی کردەوەی چاك دا. یان هەرچی چاکە و بەهرەی خوا هەیە بەسەرتەوە بەکاری بێنە لە رەزامەندی خوادا. بە هەرکام مەبەست بێت گرنگ ترین شت بۆ بەندە ئەوەیە کە بەو جۆرە بێت لەگەڵ پەروەردگاری دا، بێگومان حیکمەتیش ئەوەیە کە بەندە گرنگ ترین شت هەڵبژێرێ و خەریك بێت پێ یەوە. ﴿وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ﴾ هەرکەس شوکر و سوپاس بکات بۆ خوا ئەوە شوکرو سوپاس هەر بۆ خۆی ئەکات، چونکە سوود و بەرهەمی بۆ خۆی ئەگەڕێتەوە، ﴿وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ﴾ هەرکەس ناشکوری کردبێ لەم جیهانەدا ئەوە خۆی زیان ئەکات و خوا هیچ زیانێ رووی تێ ناکات، چونکە خوا بێ پێویستە بە هیچ شتێك، شایانە بە سوپاس با هیچ کەس سوپاسی نەکات، یان سوپاس کراوە لەلایەن هەموو دروست کراوەکانی یەوە. هەموو بە زمانی حاڵیان سوپاسی ئەکەن با بە دەم هیچ نەڵێن... کەواتەشوکر زەخیرە و دەست کەوتێکەبۆبەندە، لەهەموونەفامێ نەفامترئەوکەسەیەکەلەودەست کەوتە خۆی بێ بەش بکات.

﴿وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾

ئینجا مەسەلەی عەقیدە و باوەڕەکە ئەمێنێ لە شێوەی پەند و ئامۆژگاری یەك لەلایەن لوقمانی حەکیمەوە بۆ کوڕەکەی. ئەفەرموێ بە پێغەمبەر (ﷺ) ﴿وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە لوقمان وتی بە کوڕەکەی ﴿وَهُوَ يَعِظُهُۥ﴾ لەکاتێك دا ئامۆژگاری ئەکرد: ﴿يَٰبُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ﴾ ئەی کوڕی خۆشەویستم هاوبەش بۆ خوا ڕەوا نەدەیت و هیچ شتێك نەکەیت بە هاوبەشی ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ چونکە بێگومان هاوبەش دانان بۆ خوا بە ڕاستی ستەم و دەست درێژیی و ناڕەوایی یەکی زۆر گەورەیە. بەڵێ ڕاستە و تاوان لەوە گەورەتر نی یە، چونکە ئەو بەندە هاوبەش بڕیاردەرە کە هەموو شتی بەدەست خوایە و شەو و ڕۆژ لەناو نازو نیعمەتی خوادا ئەتلێتەوە، ئەو بەندە بەد نمەکە شەرم ناکات شتێك ئەکات بە هاوبەش کە هیچ شتی بەدەست نی یە و سوود و نرخی نی یە بۆ خۆی و نە بۆ خەڵکی تر. ئەو پەند و ئامۆژگاری یە ئەبێ زۆر جێگای بڕوا بێت و بەد گومانی لێ نەکرێ، چونکە باوك بێجگە لە چاکە هیچی تری ناوێ بۆ کوڕی خۆی، هەموو کات نیازی خێری پێ ی هەیە. ئەوە لوقمانی حەکیم بەرگری کوڕی خۆی ئەکات لە بت پەرستی و هاوبەش دانان بۆ خوا، هۆکەشی بۆ باس ئەکات بەمە کە ناڕەوایی و دەست درێژیی یەکی زۆر گەورەیە، زۆر بەهێز دڵنیایی ئەکات لەسەر خراپی ئەو تاوانە. ئیتر کوڕەکەی ئەو تاوانەی بووبێ ویستبێتی کۆتایی لێ بێنێ، یان هەر ویستبێتی ئاگر بڕی بۆ بکات... ئەوەی لوقمان وتی بە کوڕەکەی و ئەو شتە ڕاستەی کە پەند و مۆچیاری گەلەکەی پێ کرد هەر ئەوە بوو کە پێغەمبەرمان (ص) مۆچیاری گەلەکەی پێ کرد. کەچی کردیان بە هۆسە و دەمبازی، خەڵکی یان دوودڵ و بەدگومان ئەکرد لە ئاستی، بە پڕو پاگەندە مەترسی یان ئەخستە ناو بەمە کە نیازی سەرۆکی و داگیر کردنی هەیە! ئەی لوقمانیش بەو نیازەوە لەگەڵ کوڕەکەی خەریك ئەبوو؟ بێگومان ئەو گومانە بە لوقمان نابرێ چونکە ئامۆژگاری باوك بۆ کوڕی خۆی - بە تایبەتی باوکی وەکو لوقمانیش - پاك و خاوێنە لە هەموو بەد گومانی یەك. با بزانرێ ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕایگەیاند شتێکی ڕاستە و هەر لە کۆنەوە هاتووە لەسەر زمانی هەرکەسێ خوا حیکمەتی پێ دابێ، نیازی تەنیا خێرو چاکەی پێ کراوە، جگە لەوە هیچ نیازێکی تری لێ نەکراوە.

وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا

**ئینجا بەبۆنەی لوقمان و کوڕەکەیەوە پەیوەندی نێوان باوك و دایك و ڕۆڵەیان نیشان ئەدات بە شێوە و ڕەوشتێکی نەرم و ناسك، ئەو پەیوەندی یە بە شێوەیەکی پڕ لە سۆز و بەزەیی و کاریگەر نەخشە ئەکێشێ، لەگەڵ ئەوەدا عەقیدە و باوەڕ ئەبێ بەتین تر و پێش خراو بێت لەو پەیوەندی یە بەهێزو پڕ لە سۆزە. ئەفەرموێ: ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ﴾ بە گرنگی فەرمانمان داوە بە ئادەمی بە چاکە کردن لەگەڵ باوك و دایکی و گوێ ڕایەڵی بۆیان و هەڵسان بە مافیان.**

**ئینجا بە تایبەتی ئەرك و مەینەتی دایك ئەخاتە بەرچاو ئەفەرموێ: ﴿حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ﴾ دایکی هەڵی ئەپێچێ لەناو سکی دا باری گرانی هەڵئەگرێ و پێی لاواز ئەبێ لاوازی لەسەر لاوازی. چونکە بەرە بەرە تا بێت لاواز ئەبێ ﴿وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ﴾ بڕینەوەی شیر لە ماوەی دووساڵ دایە، لەو ماوەی شیر دانەدا ئەو دایکە هەژارە تووشی چەند ئەرك و مەینەت ئەبێ بە دەست ئەو ڕۆڵەیەوە کە هیچ کەسی تر بەو شێوەیە پێی نابرێ بەڕێوە.**

**فەرماندان بە چاکە لەگەڵ باوك و دایکی و هەڵسان بە مافیان لە قورئان و لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (ﷺ) چەند بارە بووەتەوە، بەڵام فەرمان دان بە باوك و دایك لەبارەی ڕۆڵەیانەوە زۆر کەمە، چونکە سروشت بە تەنها ئەو کارە ئەگرێتە ئەستۆ و باوك و دایکی بە سروشت بە بێ پێویست بە پێ وتن خۆیان ناچارن بە پەروەردە کردن و چاودێریی ڕۆڵەیان لەبەر نەبڕانەوەی خۆیان و درێژەدان بە ژیانی خۆیان، بەو جۆرەی خوا ویستی و بڕیاری دا، باوك و دایك هێزو توانا و تەمەن و کاتی خۆیان و هەرچی لە دەستیان بێت بەختی ئەکەن لە ڕۆڵەکەیان دا، بە بێ ئۆف و بێزاری، بەڵکو بە بێ ئەمەی هەست بکەن بەوەی هیچیان کردبێ! بەڵکو هەرچی یان بۆ بکەن ئەوەندە بە خۆشی و کەیف خۆشی یەوە ئەیکەن وەکو بۆ خۆیان کرابێ و ئەو خزمەت و دەست کەوتە بۆ خۆیان بووبێ! کەواتە باوكو دایك زیاد لەوەی پێویستە لەسەریان بەجێی ئەهێنن سەبارەت بە ڕۆڵەیان لەبارەی بەرژەوەندی ژیانیەوە،**

بەڵام ئەولاد پێویستی زۆرە بەمەی فەرمان و وەسیەتی بۆ چەند بارە بکرێتەوە بۆ ئەمەی هەر سەرنجی بەردەم و پاشەڕۆژی و داهاتووی خۆی نەدات و لایەك بكاتەوە بۆ دوای خۆی بۆلای ئەو باوك و دایكەی كە بەرەو پێچ كردنەوە ئەڕۆن، هەرچی یان بوو هەڵیان رشت بۆ تاقم و چینی تازەی پاش خۆیان، گیان و لەش و هەموو لێ هاتنیان بەخت کرد لە بەرژەوەندی یان.
بەڕاستی ئەولاد بە هیچ رەنگ ناتوانێ و ناگاتە ئەو رادەیە پاداشتی باوك و دایكی بداتەوە، با تەمەن و ژیانی خۆی ببەستێتەوە بە دیاریانەوە بە تایبەتی دایك كە ئەرك و مەینەتی ئێجگار گران و گەورەترە. پیاوێك لە كاتی حەج دا دایكی گرتبوو بە كۆڵەوە تەواف پێ ئەكرد. ئینجا پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (ﷺ)ئایا مافی دایكم بەجێ هێناوە؟ ئەویش لە وەڵام دا فەرموی: ﴿لا ولا بزفرة واحدة﴾ [١]. ئینجا فەرمان ئەدات بە سوپاسی خوا كە یەكەم خاوەنە بۆ هەموو چاكە و بەهرەیەك و لەپاش ئەو سوپاسی باوك و دایك كە لە پاش خوا خاوەن بەهرە و چاكەن بەسەر رۆڵەیانەوە، ئەفەرموێ: ﴿أَنِ ٱشۡكُرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيۡكَ﴾ فەرمانمان دا بە ئادەمی و وەسێتمان بۆ کرد بە باوك و دایكی بەم رەنگە وتمان پێی سوپاس بكە بۆ من و بۆ باوك و دایكت ﴿إِلَيَّ ٱلۡمَصِيرُ﴾ تەنها بۆ لای منە گەڕانەوە. كەواتە پرسیار و موحاسەبەت ئەكەم لەسەر شوكر و ناشكوریت. بەڵام پەیوەندی نێوانی باوك و دایك و رۆڵەیان لەگەڵ ئەو هەموو هێزو بەتینی یەدا ئەبێ رادە و پلەی نزم تر و بێ هێز تر بێت لە رادە و پلەی عەقیدە.
وەكو روون ئەبێتەوە كە ئەفەرموێ: ﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَاۖ﴾ ئەگەر باوكو دایكت هەوڵ و تەقەلایان لەگەڵ دای لەسەر ئەمەی شتێ بكەیت بە هاوبەشی من كە هیچ جۆرە زانین و ئاگاداریت نی یە بە راست و رەوایی ئەوەی بیكەی بە هاوبەش، ئەگەر هەوڵی شتی وایان دا ئەوە لە گوێ یان نەكەیت و گوێ رایەڵیان مەبە. كەواتە لەم كاتەدا گوێ رایەڵی دروست نی یە، چونكە پێویست كراوە لەلایەن یەكەم خاوەن مافەوە كە ئەبێ خۆی یەكەم گوێ رایەڵی كراو بێت. بەڵام جیاوازی و دووبەرەكی لە عەقیدە و باوەڕدا، قەدەغەكردنی گوێ رایەڵی بۆ عەقیدە و باوەڕ نابێتە هۆی نەمانی مافیان لە كردەوە و رەفتاری شیرین لەگەڵیان و هاوڕێ یەتیان بە جوانی،

---

[١] نەخێر بە قەت هەناسە دانەوەیەك مافت نەداوەتەوە الحافظ أبوبكر لە مسندەكەی دا.

وَصَاحِبْهُمَا فِي ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًاۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّۚ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾

---

ئـەوەتا ئەفـەرموێ: ﴿وَصَاحِبْهُمَا فِي ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًاۖ﴾ هـاوڕێ یـەتیان بکـە لـەم جیهانـەدا و لەبارەی ژیانی ئـەم جیهانـەوە بـە شێوەیەك كە شـەرعی و ڕێك و پێكە لەگەڵ مرۆڤایـەتی و پیاوەتی دا، بە چاكە و پیاوەتی ئـەم ژیانـە كەمـەیان لەگـەڵ ببـەرە سـەر ﴿وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّۚ﴾ لـە بـارەی ئاییـنـەوە شـوێنی ڕێگـای كەسێكە بكـەوە كـە بـە ڕاسـتی و پـاكو خـاوێنی گەڕاوەتـەوە بـۆلای مـن ﴿ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ﴾ ئینجـا لـەپاش گـوزەر كـردن بـە قۆنـاغی ئـەم جیهانەدا گەڕانەوەتان بەوەی بۆلای منە ﴿فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئینجا هەواڵتان ئەدەمێ بەوەی لەوەو پێش كردووتانە لـەم جیهانـەدا، هـەموو كـەس ئـەگات بـە بەرهـەمی كـردەوەی خۆی و پاداشت و تۆڵەیەك كە شایان بێت دەست كەوتی خاوەن كردەوەكان ئەبێت.

ئـەم دوو ئایەتـە تێهەڵكێشە لـە ناوەنـدی پەنـد و ئامۆژگـاری یەكـەی لوقمـان دا بـۆ بەهێزكردنی بەرگری و قەدەغـە كردنەكـەی لە بڕیـاردانی هاوبەش بۆ خـوا، دڵنیـا كـردن لـە ڕاست و بەجێی ئەو قەدەغە كردنە وەكو فەرمویێتی: ئێمـەیش فـەرمانمان دا و وەسێتمان كردووە بە وێنەی فەرمان و وەسێتەكەی لوقمان، باسی باوكو دایك بۆ موبالەغە و نیشاندانی ئەوپەڕی ڕادەی ئەو قەدەغە كردنەیە، چونكە ئەو دووانە خوا پێویستی كردووە و ڕێزی لێ گرتن و چاكە لەگەڵیان و دڵ ڕاگیر كردنیان. لە جێ یە گوێ ڕایەڵی و بەرگری كردنی ئەو دووانە دروست نەبێ ئیتر ئەبێ باشتر بە گوێی كەسی تر نەكرێ.

ڕای بەهێز لەسـەر ئەوەیـە كـە ئـەم دوو ئایەتـە بـە بۆنـەی سعدی كـوڕی ئـەبو وەقـاص و دایكی یەوە هاتە خوارەوە، وەكو لە سورەتی ﴿العنكبوت﴾ دا باسمان كرد لە وێنەی ئەم دوو ئایەتـەدا. بـەڵام وەكـو لـەوێ وتمـان تایبـەتی نـاكرێن بـەو ڕووداوەوە بـەڵكو مەبەسـت و بڕیارەكەیان گشتی یە.

﴿يَـٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي ٱلسَّمَـٰوَٰتِ أَوْ فِي ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ﴾

لەپاش ئەم تێهەڵکێشە ئینجا ئەچێتەوە سەر پەند و ئامۆژگاری یەکان و باسی ڕۆژی دوایی و حیساب و لێپرسینەوە و تۆڵە و پاداشت ئەکات بە بەندی دووەم و ئەیهێنێ بەدوای یەك دا کە گەورەتر و گرنگ ترین بەندە لە هەموو پەیام و شەریعەتەکانی خوادا، فەرموی: ﴿يَـٰبُنَيَّ﴾ ئەی کوڕی خۆشەویستم ﴿إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ﴾ بەڕاستی قسە ئەمەیە کردەوە چاك بێت یان خراپ ئەگەر لە بچووکی و سووکی دا کێشی دانەوێڵە بێت لە خەرتەلەیە ﴿فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي ٱلسَّمَـٰوَٰتِ أَوْ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ ئینجا لەگەڵ ئەو زۆر وردی و بچووکی یە لە پۆشیدە و شاراوە ترین شوێن دا بێت وەکو ناو سکی بەردێ یان لەناو ئاسمانەکان دا بێت یان لە زەوی دا، ئەو کردەوەیە هەرچەند ئەوەندە بچووك بێت و بەو جۆرە داشارڕێ ﴿يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ﴾ خوا ئەیهێنێ و ئامادەی ئەکات. ئەوەی ئەم ئایەتە ئەیگەیەنێ و نیشانی ئەدات لەبارەی زانین و ئاگاداری و توانین و دەسەڵاتی خواوە، لەبارەی حیساب و لێپرسینەوە و دادپەروەری و تەرازووی ڕاستی یەوە هیچ وتە و وتارێکی تر نایگاتێ و جێگای ناگرێتەوە، سەرنج بدە دانەوێڵەیەك لە خەرتەلەیە کە وێنەیە بۆ ئەوپەڕی وردی و بچووکی. ئەو دانەوێڵەیە داشارڕێ لەناو بەردێکی ڕەق دا کە دەرناکەوێ و نابینرێ و دەست پێ ی ناگات. یان بخرێتە ناو ئەو ئاسمانە فراوانە کە ئەو هەموو ئەستێرە گەورە گەورانە وەکو خاڵ و هەڵمات دەرنەکەوتن تیایان دا، یان لەناو زەوی دا یان تێکەڵی خۆڵ و بەرد و ڕیزەکەی ببێ. بە هەر جۆر ببێ زانین و توانین و دەسەڵاتی خوای لەگەڵ دایە و لە خوا شاراوە نابێ،

إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿١٦﴾ يَـٰبُنَىَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾

---

**﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ﴾ چونكه بەڕاستی خوا زانایه له هەموو پۆشیده و شاراوەیەك، ئاگاداره به دیوی ناوی هەموو شتێ هەرچۆنێ ئاگایه به دیوی دەرێ. مرۆڤی دانا خەیاڵی ئەڕوا ئەكەوێته شوێنی ئەو دانەوێڵەیه و ئینجا بیر ئەكاتەوه لەو زانین و ئاگاداری یه بێ سنوورەی پەروەردگاره كه هیچ شتی لێ ون نابێ، له دەروونی خۆی دا ئەو بیره ئەكاتەوه هەتا سام و بیم و شەرم له خوا دڵی داگیر ئەكات و سەری بەندەیی دائەخات بۆ ئەو خوای زانای بەدەسەڵاته.**

**لەپاش ئامۆژگاری به باوەڕهێنان به خوای تاك و تەنیا، به بڕوا هێنان به ڕۆژی دوایی، دڵنیایی بەڕاستی حیساب و لێپرسینەوه و پاداشت و تۆڵه... لەپاش ئەوه فەرمانی دا به ڕووكردنه خوا به نوێژ، ڕوو كردن بۆلای بەندەیانی خوا به بانگ كردنیان بۆلای، به خۆگری لەو ڕێگایەدا. فەرموی: ﴿يَـٰبُنَىَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ ئەی كوڕی خۆشەویستم نوێژ بەجێ بێنه به ڕێك و ڕاستی ﴿وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ فەرمان بده به چاكه و بەرگری بكه له خراپه ﴿وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ﴾ خۆت بگره به ئارام به لەسەر ئەوەی دووچارت ئەبێ لەبەسەرهاتی ناخۆش و خراپ، ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ﴾ بێگومان ئەو خۆگرتنه، یان هەموو ئەوانەی باس كران لەو كارانەن كه خوا بڕیاری لەسەر داوه و پێویستی كردووه به بێ سەر لێ كردنەوه و دوو دڵی. ئەمەیه نەخشه كێشراوی عەقیده و باوەڕ... باوەڕ به تاك و تەنیایی خوا، هەست كردن به ئاگاداری و چاودێریی خوا، چاوەڕوانی ئەوەی لای خوایه، دڵنیایی بەداد و ڕاستی كردەوەی خوا، ترسان له تۆڵه و سزای، ئینجا خۆ بەهێزكردن به توێشووی خواپەرستی به تایبەتی نوێژ. ئینجا بانگ كردنی خەڵكی بۆلای خوا و فەرمان پێدانیان به چاكه و بەرگری یان له خراپه. ئینجا ئەو خواپەرسته بانگ كەره خۆگر و به ئارام بێت لەسەر هەڵسانی به ئەركی سەرشانی، به تایبەتی لەسەر سزا و ناڕەحەتی یەك دووچاری ئەبێ له ڕێگای بانگ كردنی خەڵك دا و لەسەر هەموو تاقی كردنەوەیەك كه دێته ڕێگای باوەڕداران.**

﴿وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾ وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ ۚ إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ ﴿١٩﴾﴾

**ئینجا بەرگری ئەكات لە هەندێ كردەوەی ناشیرین كە زیانی كۆمەڵایەتی زۆرە، فەرمانی پیا ئەدات بەهەندێ كردەوەی شیرین كە سوودی كۆمەڵایەتی هەیە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ﴾ [1] رووت وەرمەگێڕە لە خەڵكی بە فیز و خۆ بە زل زانی یەوە، ﴿وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا﴾ مەگەڕێ بە زەوی دا بە كەشخە و فیز و لارە و لەنجەوە، ﴿مَرَحًا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾ چونكە خوا خۆشی نایەت لەهەركەس كە خۆ بەزل زان بێت و كەشخە و شانازی كەر بێت بە مل خەڵك دا، واتە خەشمی هەیە بەرامبەریان ﴿وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ﴾ میانە و ناوەڕاست بەكار بێنە لە رۆیشتن و گەڕانت دا نە بە پەلە و جرپن بە، نە زۆر لەسەر خۆ و بە هێواش وەكو باوی خۆ بە زل زان و فیزداران، بەڵكو رۆیشتن و گەڕانێكی سووكو سۆڵ و ئاسان ﴿وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ﴾ كەمێ دەنگت نزم بكەرەوە و بە دەنگی بەرز گفتو گۆ مەكە ئەگەر پێویست نەبوو. بێگومان دەنگ بەرز كردنەوە لە گفت و گۆكردن دا زیاد لە پێویست شتێكی زۆر ناشیرینە و ئازار دەرە بە گوێ گران و پێویستە بەرگری كردنی. لەبەر ئەوە قورئان دژیەتی و بە جۆرێ قیزەون و بێزراوی ئەكات هەركەس خاوەن هەست و فام بێت خۆی لێ ئەپارێزێ. ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ﴾ بەڕاستی بێزراو ترینی هەموو دەنگەكان دەنگی زەڕەی گوێ درێژانە. واتە بێزراو ترینی هەموو دەنگێ كە بە بێ پێویست بەرز بكرێتەوە دەنگو زەڕەی كەرە. هەركەس بە بێ پێویست دەنگ بەرز بكاتەوە ئەوەی خۆی ئەباتە ریزی كەر و دەنگەكەی ئەكات بە وێنەی زەڕەی كەر. جا لەبەر ئەوە زەڕەی كەر كراوە و ئەكرێ بە چیرۆك و مەتەڵ بۆ ئەو جۆرە دەنگە بەرزانە لەناو خەڵك دا، ئەوەتا ئەڵێن: فلان ئەڵێی كەرە ئەزەڕێنێ، چی یە فلان بە سەڕ و هوڕ هاتووەتە سەرمان.**

---

[1] وشەی (صعر) دەرد و نەخۆشی یەكە دووچاری حوشتر ئەبێت و ملی وەرئەگێڕێ و ناتوانێ بە رێك و راستی رایگرێ، جا قورئان بەو جۆرە فەرمووی لەبەر ناشیرین كردن و بێزراندنی ئەو مل وەرگێڕانە كە هەندێ كەس بەكاری ئەهێنێ بە فیزو دەمارەوە.

ئینجا ئەگەڕێتەوە سەر بت پەرستەکان و ڕووی فەرمودەیان تێ ئەکات بە تانە و تەشەر لێ دانیان لەسەر کۆتایی نەهێنان و دان گرتنیان بەسەر ئەو ئایینە بەتاڵ و پوچەی کە وان لەسەری، لەگەڵ ئەوەدا ئەو هەموو رابەر و نیشانەی تاك و تەنیایی خوا ئەبینن، ئەو هەموو شتە گرنگە ژێر بار کراون بۆیان و فەراهەم هێنراون بۆ هۆی ژیانی ئەوان و بەرژەوەندی ئەوان، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَٰوَٰتِ﴾ ئایا نەتانزانیوە بە زانینی وەکو بینین بە چاو کە خوا ژێر باری کردووە بۆ ئێوە هەرچی وا لە ئاسمانەکان دا بەم رەنگە کردوویەتی بە هۆی فەراهەم هاتنی سوود و بەرژەوەندیتان، ﴿وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ ژێر باری کردووە هەرچی وا لە زەوی دا بەم رەنگە رێگای داون و دەسەڵاتی پێداون بە سوود لێ وەرگرتن و بەکار هێنانی لە پێویستی خۆتان دا، هەندێکی یەکسەر لە رێوە بەکاری ئەهێنن و ئەوی تری هۆ و کەرەسەیە بۆ ئەوەی بەکاری ئەهێنن، ﴿وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ﴾ بە فراوانی رشتوویەتی بەسەرتان دا چاکە و بەهرەکانی خۆی، ﴿ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً﴾ [1] ئەوەی ئاشکرایە و هەستی پێ ئەکەن، ئەوەی نهێنی یە و بە ژیریی پێی ئەزانن، ئەوەی ئەیناسن و ئەزانن و ئەوەی نایزانن و نایناسن.

چەند جار سەرنج راکێشراوە بۆ ئاسمان و زەوی و ئەم دروست کراوانی خوا بە چەند شێوە و رەوشتێکی جیاواز کە هەموو جارێ بە شتێکی تازە دەرئەکەوێ. چونکە ئەم بوونەوەرە خوا ئەوەندە بە نایاب و شیرین دروستی کردووە تا بە دڵ سەرنج بدرێ و بیر بکرێتەوە لە شتە نایاب و نهێنی یەکانی کە هەرگیز بۆ ئێمە دوایی نایەت و پێیدا ناگەین، تا بەو جۆرە لێ ی ورد ببینەوە هەموو جارێ لە هەست و لە پێش چاو تەڕ و تازە ئەبێتەوە، لە هەموو جارێك دا دەرئەکەوێ بە رەنگ و شێوەیەکی تیابەتی تازە. لەم شوێنەدا باسی ئەکات و ئەیخاتە بەرچاو لەبارەی رێکی و گونجاوی دروست کردون و داڕشتنی لەگەڵ هەموو پێویستی یەکی ئادەمی لەم سەر زەوی یەدا!! رێکی و گونجاوی یەکی وا کە هەموو خاوەن ژیریی یە بە بێگومان و دوو دڵی دڵنیا ئەبێ کە ناگونجێ فەراهەم هاتنی شتی وا بە شێوەی

---

[1] ئەم دوو وشەیە بەچەند شتی تریش تەفسیر کراون، بەڵام ئەم شێوە گشتی یەی لە تەفسیرەکەدایە بەهێزترە و زۆربەی لەسەرە. خوا خۆی باش ئەزانێ.

ڕێکەوت، هیچ چارە نی یە ئەبێ باوەڕ بهێنرێ و مل کەچی بکرێ بۆ پەروەردگارێ کە بە نیاز و خواهیشێکی تێرو تەواو و بە زانین و لێزانی ئەم گونجاوی و ڕێك و پێکی یەی خستووەتە نێوان ئەم بوونەوەرە گەورە و گرنگە و پێویستیاتی ئەم ئادەمی یە لاوازە بەسەر ئەم ئەستێرە بچکۆلەیەوە، زەوی...!! بێگومان ئەم زەوی یە هەمووی بەش و پارچەیەکی ئێجگار بچووکە لە داڕشتنی ئەم بوونەوەرەدا، ئادەمی لەم زەوی یەدا دروست کراوێکی زۆر بچوك و لاوازە و هیچ چاونادات بۆ بەراورد کردن لەگەڵ قەبارەی ئەم زەوی یەدا، لەگەڵ ئەو هەموو هێزو دروست کراوانی ترەدا بێ گیان و گیاندار، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا بەهرە و منەتی خوا بەسەر ئەم ئادەمی یەوە لە رادەیەك دایە بەرزی کردووەتەوە و ڕێز و نرخی پێداوە و ئەم بوونەوەرەی بۆ ژێر بار کردووە بە جۆرێ هەموو خێرو بێر و بەرهەمی ئەگەڕێتەوە بۆ سوود و بەرژەوەندی ئەم ئادەمی یە بچووکە لاوازە، ئەوەتا سوود وەرئەگرێ لە تیشکی خۆر و رووناکی مانگ و ڕێنوومایی ئەستێرەکان، سوود وەرئەگرێ لە بەفر و باران و هەواو باو پەلەوەر و باڵندە کە ئەگەڕێ لە حەوادا. سوود وەرگرتن و دەست کەوتی خێرو بێری زەوی شتێکی ئاشکرا ترە. ئەوەتا خوا ئادەمی کردووە بەکار بە دەست و جێنشین لەم زەوی یە پان و فراوانەدا، بەری مەرەخەس کردووە بە ئارەزووی خۆی سەری تێ بکات و ئەو هەموو ناز و نیعمەت و هێز و وزەی خوا دایناوە تیای دا بەکاری بێنێ، چاکەو بەهرەی خوا بەسەر ئادەمی یەوە تەنیا ئەوانە نی یە کە باس کران، بەڵکو چاکە و بەهرەکانی نایەنە ژمارە بۆ ئێمە وەکو قورئانیش ئەفەرموێ. دروست کردنی ئادەمی و گیان بە بەردا کردنی چاکە و بەهرەیەکی گرنگە، ئەو هەموو هێزو وزە و لێ هاتنەی بەهرەیەکە، ناردنی پێغەمبەران و ئایین و کتێبی خوا گەورەترین و بەفەڕترینی هەموو چاکە و بەهرەکانی یەتی، بەخشینی ئەم گیانە تایبەتی یە کە هۆی جیا بوونەوەیەتی لە گیان لەبەرانی تر بەخشش و بەهرەیەکە، هەموو هەناسەدانێك بەهرەیەکە. زۆر لە نیعمەت و بەهرەکان هەن ئادەمی هەر نازانن و نایاننناسن، بە کورتی لە هەموو کاتێك دا بە شەو و بە ڕۆژ ئادەمی ئەم دیو و ئەو دیو ئەکات لەناو نازو نیعمەتی خوادا لەگەڵ ئەوەدا زۆربەی ئادەمی سوپاسی ناکەن و چاو لەبەری خوا نین و بیر ناکەنەوە و ورد نابنەوە، بەڵکو هەر بە دڵیشیان دا نایە بیر کردنەوە لەو هەموو چاکە و بەهرە و یادی خاوەن و بەخشندەکەی.

وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ
أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلۡ نَتَّبِعُ مَا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۚ أَوَلَوۡ كَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ يَدۡعُوهُمۡ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ
﴿٢١﴾ ۞ وَمَن يُسۡلِمۡ وَجۡهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ

---

بەڵکو هێنی وا هەیە دەم بازی ئەکات و چەلان بەرچەلان ئەوەستێ لەبارەی خواوە وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ﴾ هەندێ لە ئادەمی ئاژاوە و دەمبازی ئەکات لەبارەی تاك و تەنیایی خوا و سیفەتە بەرزەکانی، ئەم دەمبازی یەش کە ئەیکەن: ﴿بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَجۡهَهُۥٓ﴾ بە بێ هیچ زانینێ کە بەهۆی ژیریی و رابەرێکەوە بۆی پەیدا ببێ، ﴿وَلَا هُدٗى﴾ بە بێ هیچ رێنموونی یەك لەلایەن پێغەمبەرێکەوە، ﴿وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ﴾ بە بێ کتێبێکی روونی رەوان کە روون کەرەوە بێت و لەلایەن خواوە هاتبێ، واتە عەقیدە و باوەڕ ئەبێ پاڵپشت و رابەرێکی بەهێزی هەبێ، لە یەکێ لەو سێ رێگایەوە وەرگیرابێ، ئاشکرا و روونە کە عەقیدە و باوەڕەکەی ئەوان بێ بەش و رووت و قووتە لە هەموو جۆرە پاڵپشت و رابەرێك. کەواتە عەقیدە و باوەڕێکی بێزراو و جێگای سەرسوڕمانە بە تایبەتی لەگەڵ ئەو هەموو رابەر و بەڵگە ژیریی یانەی بوونەوەر کە روون و رەوانن و هەموو دڵێکی زیندوو پڕ ئەکەن لە باوەڕ بە تاك و تەنیایی و سیفەتە بەرزەکانی تری خوای تاك و تەنیا، بە تایبەتی لەگەڵ ئەو هەموو ناز و نیعمەت و بەهرەی فراوانی خوای تاك و تەنیا، بەڵێ بەڕاستی ئەو عەقیدە پڕو پووچەی ئەوانە ئێجگار پیس و قیزەون و ناشیرینە، سروشت قزی لێ ئەکاتەوە، ویژدان مووی گرژ ئەبێ لێ ی، ئەو تاقمەی کە دەمبازی ئەکەن سروشتیان تێك چووە، بەدنمەك و بێ شەرمن، چاولەبەری ئەو هەموو نازو نیعمەت و بەهرە فراوانەی خوای تاك و تەنیا نین، ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ ئەگەر بوترێ بەوانە: شوێنی ئایینێ بکەون کە خوا ناردی یە خوارەوە ﴿قَالُواْ﴾ ئەڵێن: ﴿بَلۡ نَتَّبِعُ مَا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآ﴾ نەخێر شوێنی ئەوە ناکەوین بەڵکو شوێنی ئایین

و باوەڕیٚ ئەکەوین کە زانیومانە باوك و باپیرمان لەسەری بوون و لەوانەوە بۆمان هاتووە و پێمان گەیشتووە، ئەوەیە تاقانە پاڵپشتەکەیان، ئەوەیە رابەر و بەڵگە بەمێزەکەیان!! شوێن کەوتنی کوێرانە بە بیٚ زانین و بە بیٚ بیر لیٚ کردنەوە، ئەو شوێن کەوتنە کوێرانەی کە ئیسلام ئەیەویٚ ئازادیان بکات لیٚ ی، ژێریی یان بەرەلاٚ بکات لەو کۆت و زنجیرە تا هۆش و بیر بکەنەوە، بێداری و بزووتنەوە و رووناکی تیا هەڵگرێنن، کەچی ئەوان نایانەویٚ بەرەلاٚ بوون لەو دیلی و یەخسیری یە، نایانەویٚ نەهێشتن و لابردنی ئەو کۆت و زنجیرە، بێگومان ئیسلام بریتی یە لە ئازادی دەروون، بزووتنەوەی هەست، چاو هەڵخستنە بۆ رووناکی، بەرنامەیەکی تازەیە بۆ ژیان کە پاك و خاوێن بێت لە لاسایی و شوێن کەوتنی کوێرانە بە بیٚ جوڵە و بزووتنەوە، لەگەڵ ئەوەدا ئەو تاقمە دەمبازە بە بیٚ زانین و بە نەفامی ئەو ئازادی و سەربەستی یەیان ناویٚ. لەبەر ئەوە قورئان لاقرتی یان پیٚ ئەکات و دەست نیشان ئەکات بۆ دوا رۆژی خراپ و سەختی ئەو هەڵوێستە ناڕەوایان، ئەفەرمویٚ: ﴿أَوَلَوْ كَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ﴾ ئایا هەر شوێنی ئەکەون با شەیتان بانگیان بکات بۆ سزای ئاگری هەڵگڕاوی دۆزەخ، واتە ئەو هەڵوێستی ئەوانە بەهۆی هاندان و بانگ کردنی شەیتانەوەیە؟ بێگومان ئەوەش سەری لە ئاگری بەتینی دۆزەخەوە دەرئەچیٚ، دەی ئایا ئەوانە هەر سوورن لەسەر ئەو عەقیدە و باوەڕە با رایانکێشیٚ بۆ ئەو دوا رۆژ و چارەنووسە سامناکە؟

ئینجا بەبۆنەی ئەم دەمبازی و نەفامی و سەرکێشی ئەو تاقمەوە دەست نیشان ئەکات بۆ رەوشت و کردەوەیەك کە پێویستە بەرامبەر ئەو هەموو رابەر و بەڵگە بوونەوەری یانە و ئەو هەموو نیعمەت و بەهرە فراوانەی خوای تاك و تەنیا ئەفەرمویٚ: ﴿وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ هەرکەس بە رێکی خۆی و هەموو کاروباری حەواڵە بکات بۆلای خوا و بە تەواوی روو بکاتە خوا – لەکاتێك دا گویٚ رایەڵی خوا بێت لە فرمان و بەرگری یەکانی دا –

﴿فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ﴾ ئەو کەسە دەستی گرتووە بە بەتین ترین و بەهێزترین دەست گیر کە ناپچڕێ و لاواز نابێ و دەست پێوە گرەکەی بەرەلاَ ناکات لە خۆشی و ناخۆشی دا، ونی ناکات لە ڕێگای سەخت و شەوی تاریك دا، لەناو ئەم هەموو تەرزە و بای بە تەوژم و بەهێزانەدا.

ئەو ڕوو کردنە خوا مل کەچی تەواوە بۆ خوا لە هەموو بار و ڕوویەکەوە، ڕەزامەندی و ئارامی دڵە بە هەموو بڕیارو فرمانێکی خوا، لەگەڵ باوەڕو دڵنیایی بە بەزەیی خوا و دڵخۆشی بە چاودێریی خوا، ئەو دەست گیرە بەهێزە نەپچڕاوە پەیوەندی یەکی بەتینی دامەزراوی بە ئارامە لە نێوان دڵی بڕواداری مل کەچ و خوای خۆی دا، ئارام و ڕەزامەندی دڵە بە هەموو حوکم و بڕیاری خوا، ئارام و ڕەزامەندی یە کە پارێزگاری دڵ و دەروون ئەکات لە هەڵە و پەڵە و تێك چون بەرامبەر ڕووداو و بەسەرهاتی خراپ، بەڵکو بە ئارام و لەسەرخۆ و بەهێز و دامەزراوی ئەچێ بەپیری هەموو بەسەرهاتێکەوە. کەواتە لەکاتی خۆشی دا لە خۆی ناگۆڕێ و لە پەت بەرەلاَ نابێ، لەکاتی ناخۆشی دا هاواری لێ هەڵناسێ و دنیای لێ نایەتە یەك، هەرکات لە ناکاو و کوت و پڕا کەوتە تەنگی و تەنگانە لە هۆش و ئاگاداری خۆی ناکەوێ، هەمیشە زاڵ و سەرکەوتوو ئەبێ بەسەر هەموو گرێ و پلەی سەخت و دڕك و داڵێ لە ڕێگای عەقیدە و باوەڕدا. ڕێگای عەقیدە و بڕواو ژیان زۆر سەخت و پڕ لە مەترسی یە و ڕێبواری ئەو ڕێگایە پێویستی بەتینی هەیە بە پاڵپشتێکی بەهێز کە هەرگیز لاواز نەبێ و هەمیشە پێویستە بە دەسگیرێ کە نەپچڕێ و لە دەست بەرنەبێ، ئەو دەست گیرەش بریتی یە لە پەیوەندی دڵ بە خوا و ڕوو تێ کردنی بە تەواوی و حەواڵە کردنی هەموو کاروبار بۆلای ئەوومل کەچی تێروتەواوبۆی وگوێ ڕایەڵی وفەرمانبەری بەبێ سەرپێچی وملەجەڕێ،

وَإِلَى ٱللَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٢٢﴾ وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُۥٓ ۚ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟ ۚ إِنَّ
ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٣﴾ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٢٤﴾

﴿وَإِلَى ٱللَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ﴾ تەنها بۆ لای خوا ئەگەڕێتەوە دوا ڕۆژ و گەڕانەوە و چارەنووسیی هەموو کارێك، کەواتە چاکتر لە هەموو شتێ بۆ مرۆڤ ئەمەیە هەر لە یەکەم جارەوە هەموو کاروباریێ حەواڵەی خوا بکات و بە ڕێك و ڕاست ڕوو بۆ لای ئەو بکات، ڕێگا بداتە بەر بۆ لای ئەو و ڕێبازی بگرێ کە ئەو نەخشەی کێشاوە. ئینجا دڵنەوایی پێغەمبەر (ﷺ) ئەکات و دڵخۆشی ئەداتەوە لەسەر سزا و ناخۆشی یە کە دووچاری ئەبوو لەلایەن بت پەرست و بێ بڕواکانەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُۥٓ﴾ هەرکەس بێ بڕوایە و مل پێچی ئەکات با بێ بڕوایی و مل پێچی یەکەی دڵ غەمگینت نەکات، چونکە ﴿إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ﴾ تەنها بۆلای ئێمەیە گەڕانەوەیان لە ڕۆژی دوایی دا ﴿فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟﴾ ئینجا ئێمە هەواڵیان ئەدەینێ بە هەر کردەوەیەك کە کردوویانە لەم جیهانەدا هەواڵیان ئەدەینێ بێگومان سزا و تۆڵەی ئەو کردەوانە ئەچەژن. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ هەواڵیان پێ ئەدەین چونکە بەڕاستی خوا بە باشی زانا و ئاگادارە بەو نیاز و خەتەرە و خەیاڵانەی کە لە دڵ دایە. زانا و ئاگادارە بەو شتە پۆشیدە و شاراوانە چ جای شتی تر، ﴿نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا﴾ مۆڵەتیان ئەدەین ماوەیەکی کەم لەم جیهانەدا ڕابوێرن بە خۆشی و شادمانی ﴿ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە ناچاریان ئەکەین بۆلای سزایەکی قورس و سەخت کە سزای سوتاندنە بە ئاگری دۆزەخ و ئەوانیش هیچ بەرگری یەکیان پێ ناکرێ، خوا پەنامان بدات.

دوا ڕۆژی ئەوانە کە مل کەچن بۆ خواو بەڕاستی ڕووی تێ ئەکەن ئەوە بوو باس کرا لە پێشەوە، دوا ڕۆژی بێ بڕوا و مل پێچی کەرانیش ئەمەیە کە بە کورتی باسی کرد لەم دوو ئایەتە کورتەدا، لەم جیهانەدا بێ نرخی و ریسوایی نیشاندان کە بە هیچ جۆر سەرنج نەدرێن و گوێ یان پێ نەدرێ... دوا ڕۆژیشیان لە ڕۆژی دوایی دا ئەوەیە کە بە ناچاری ئەبرێن بۆ ئاگری دۆزەخ بە بێ چارە و پەناو یارمەتی دەر و ڕزگار بوون، جا لە دەروونی خۆمان دا ئەم دوو دوا ڕۆژ و چارەنووسە بەراورد بکەین و باش بیر بکەینەوە لە هەردوو.

**ئینجا بێ بڕواکان ئەوەستێنێ لە بەردەم تێگەیشتنی سروشتیان دا، کاتێ کە ئەم بوونەوەرە ئەبینن و ئینجا چارەیش نی یە و ئەبێ دان بنێ بە داهێنان و پەروەردگاریی خوا بۆی، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا لائەدەن لە ڕێگای ڕاست و بە پێی ئەو تێگەیشتن و دان نانە ڕەفتار ناکەن، ئەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر پرسیار بکەیت لێ یان ئایا کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە؟ ﴿لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۚ﴾ بێگومان لە وەڵامدا ئەڵێن: ﴿الله﴾ دروستی کردوون. ناچار بوون دان بنێن بەو شتە ڕاستەدا، چونکە هەرکەس بگەڕێتەوە بۆلای ویژدان و سروشتی خۆی هەر ئەبێ مل شۆڕ بکات و ئەو وەڵامە ڕاستە بداتەوە، چونکە ئەوە ئاسمان و زەوی یە کەوان بە پێش چاوەوە بەو هەموو ڕێك و پێکی و ڕژێمە تێرو تەواوە کە ئاشکرایە هەموو کاروباری لەسەر نیاز و زانین دامەزراوە و زۆر بە وردی و لێزانی کاروباری ئەڕوا بەڕێوە. لەم بوونەوەرەدا کەس نەیوتووە و نالێ: من دروستم کردووە. ناگونجێ خۆی بە خۆی بووبێ و خۆی خۆی داهێنابێ، هەروەها ناگونجێ بە ڕێکەوت پەیدا بووبێ و ئەم کارە گرنگە بە ڕێکەوت و بە بێ کەس ڕاگیر بێت و بەڕێوە بڕوا. هەرکەس شتی وا بڵێت و ڕەوای بدات ئەو کەسە بێ بەشە لە تێگەیشتن و ژیریی و شایان نی یە بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکرێ. کەواتە چار نی یە ئەبێ بڵێین داهێنەر و بەڕێوەبەری ئەم بوونەوەرە گرنگە کەسێکە جیاواز لەم بوونەوەرە و بێ هاوبەش و بێ وێنەیە و خاوەنی توانین و زانینی بێ سنوورە کە ئەویش ناوی ﴿الله﴾ یە.**

**ئەوانەی کە بەرەنگاری عەقیدەی تاك و تەنیایی یان ئەکرد بە هاوبەش بڕیار دان، بەرامبەری بانگ و بانگەوازەکەی پێغەمبەریان (ﷺ) ئەکرد بەو سەرکێشی و دەمبازی یە بەتینە، ئەو دوژمنە مل هوڕانە نەیان ئەتوانی لادەن لە ڕێگای سروشتیان کاتێ کە بەرەنگاری ئەکرا بەو ڕابەر و بەڵگە بوونەوەری یانە، لەبەر ئەوە لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا هیچ دەمە پێچەیان نەئەکرد و بێ پێچ و پەنا ئەیانوت: خوا دروستی کردوون جا لەبەر ئەوە تەمێی پێغەمبەری کرد (ﷺ) کە سوپاسی خوا بکات لەسەر ئەو وەڵامە و ناچاریی یان بۆ ئەو وەڵامە ڕاستە.**

قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ
﴿٢٦﴾ وَلَوْ أَنَّمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ
كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٧﴾ مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ ۗ

**فەرموی: ﴿قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ هەموو سوپاس و وەسف و سەنایەك بۆ خوایە کە ناوی ﴿الله﴾ یە لەسەر روونی ئاین و عەقیدەی راست، سوپاس و وەسف و سەنا بۆ خوا لەسەر ناچاری بێ بڕواکان و دان نانیان بە ناچاری بەرامبەر ئەو رابەر و بەڵگە بوونەوەری یە، سوپاس بۆ خوا لەسەر هەموو بارێك.**

**ئینجا واز ئەهێنێ لەوەی رابوردوو و رستەیەکی تر ئەهێنێ بەدوای وەڵامەکەیان دا هەواڵی ئەوپەڕی نەفامی و نەزانی یان لێ ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ زۆربەی ئەوانە نازانن و نەزانن، بەهۆی ئەوەوە دەمبازی ئەکەن و هەڵەن لە رێگا و رێبازی سروشت، لە رابەریی و رێنوومایی ئەم بوونەوەرە گەورە و گرنگە بۆ پەروەردگاری بەرز و بڵندی، زۆربەی ئەوانە نەزانن و بێ ئاگان لەوە کە بەو وەڵامە عەقیدە و باوەڕەکەی خۆیان لە ریشە ئەهێنن و بەربادی ئەکەن. ئینجا بە بۆنەی داننانی سروشتیان بە دروست کردنی خوا بۆ ئاسمانەکان و زەوی، بەو بۆنەوە دێتە باسی خاوەنی و موڵکایەتی تێرو تەواوی خوا بۆ هەرچی وا لە ئاسمانەکان و زەوی دا، لەگەڵ ئەوەدا بێ پێویستە بە هەرچی وا لە ئاسمانەکان و زەوی دا و خۆی لە خۆی دا سوپاس کراوە با ئادەمی سوپاسی نەکەن. ئەفەرموێ: ﴿لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ بۆ خوایە و تایبەتی یە بە خواوە و موڵکی خوایە هەرچی وا لە ئاسمانەکان و زەوی دا، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ﴾ بێگومان تەنها خوا بێ پێویستە لە هەموو شتێ و سوپاس کراوە و شایانە بۆ سوپاس. ئینجا دوایی باسەکە ئەهێنێ بە شێوەیەکی بوونەوەریی کە دەست نیشان ئەکات بۆ دوانەهاتن و بێ سنووری زانین و توانینی خوا و دەسەڵاتی نەبڕاوەی. ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ﴾**

ئەگەر هەرچی درەخت وا لە زەوی دا پێنووس بێت ﴿وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ﴾ [1] هەموو دەریای زەوی مەرەکەب بێت ﴿مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ﴾ [2] لە پاش دوا هاتن و نەمانی چەند دەریای تری زۆری وێنەی خۆی ببیّ بە مەرەکەب و یەك لە دوای یەك تیّ ریّژن، ئینجا بەو هەموو پێنووس و مەرەکەبانە نوسەران دەست بکەن بە نووسینی وتە زانراوەکانی خوا ﴿مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ﴾ وتە زانراوەکانی خوا دوایی نایەن، ئەو هەموو پێنووس و مەرەکەبە دوایی دیّت، چونکە وتە و زانراوەکانی خوا بیّ سنوور و دوایی نەهاتوون، ئەو هەموو دارو درەخت و دەریایانە هەرچەند زۆر زۆرن بەلاّم سنوور دار و دوا هاتوون.

ئەمە وێنە و شێوەیەکە دارێژراوە لە زانراو و بینراوەکانی ئادەمی کە سنووردار و دواهاتوون، بۆ نزیك خستنەوەی مەبەست لە بیّ سنووری و دوا نەهاتنی وتراو و زانراو خواهیش کراوەکانی خوا. نزیك خستنەوەی ئەوانە لە زانین و تێگەیشتنی ئێمە کە شتێکی سنووردار و دواهاتووە، بەڵکو زۆر کەم و کورە، کە بەم وێنە و چیرۆکە نەبیّ زانین و تێگەیشتنی ئێمە تیّ ناگات و پیای دا ناگات.

بەڕاستی وێنە و چیرۆکێکی زۆر نایابە و ئەم جۆرە شتانە هەر لە دەست قورئان دیّت، با هەندیّ ورد ببینەوە و بەراوردیّ بکەین: خەڵکی وتراو و زانراوی خۆیان هەرچەند زۆر و فراوان بێت ئەینوسنەوە بەم پێنوسانە کە باون، ئەو مەرەکەب و شتەی کە بەکاری ئەهێنن بۆ پێنووسەکە شتێکی کەمە و پڕی شووشەیەکە، ئینجا وەرە سەرنج بدەین و بیر بکەینەوە کە هەرچی دارو درەخت وا لە زەوی دا هەمووی ببیّ بە پێنوس و هەرچی ئاوی دەریاکانی زەوی هەیە ببیّ بە مەرەکەب و هێشتا حەوت ئەوەندەی تری بێتە سەر ئەمانە هەمووی دوایی دێن و وتەو زانراوەکانی خوا هەر دوایی نایەت!! بەڵیّ بێگومان دار و درەخت و ئاوی دەریاکان دوایی دێن چونکە ئەگەر ئەو هەموو دەریا دابەش بکرێن بە دڵۆپە دڵۆپە و هەموو درەختەکان بکرێن بە پێنووسی بچووك و ورد بەرامبەر هەر دڵۆپەیە پێنووسیّ، بێگومان

---

[1] ئەم وشەیە بە چەند جۆر خوێنراوەتەوە، لەگەڵ رستەکەی دوایی دا بە چەند جۆر ترکیب کراون بە پیّی زمانی عەرەبی، بەلاّم مەبەست لە هەموو هەر ئەوە ئەگرێتەوە کە لە تەفسیرەکەدایە.

[2] بە پیّی باوی عەرەب ژمارە (٧، ٧٠، ٧٠٠) بەکار ئەهێنریّ و مەبەست ژمارەی تایبەتی نی یە بەڵکو مەبەست زۆری یە، جا لەبەر ئەوە لە تەفسیرەکەدا بەو جۆرەم وت.

هەموو پێنووس و دڵۆپەکان دوایی دێن تەنها بە نووسینی کار و بەسەرهاتی خۆیان کە ئەو کاروبارو بەسەرهاتانە بە هەموویان بەشێکی زۆر کەمن لە زانراو و خواهیش کراوەکانی خوا، کەواتە ئەوانە هەموو دوایی هاتن و زانراو و خواهیش کراوەکانی خوا دوایی نەهات!! بەڵێ بێگومان هەموو باوەڕدارێك ئەبێ بۆی روون بێت کە زانراو و خواهیش کراوەکانی خوا دوایی نایەن، چونکە ئەبێ باوەڕی ببێ بەو دوا نەهاتن و بێ سنووری بەهەشت و نازو نیعمەتەکەی، هەروەها دۆزەخ و سزا و ئازارەکەی، بێگومان ئەو هەمووە دوا نەهاتوو نەبڕاوانە زانراو و خواهیش کراوی خوان!! کەواتە هەموو دار و درەخت و دەریاکان ون ئەبن و خۆیان دائەشارن لە مەیدانی وتراو و زانراوە نەبڕاوەکانی خوادا، دڵی باوەڕداری راستەقینە ئەوەستێ بە مل کەچی و سام و ترسەوە لەبەردەم بەرز و بڵندی و گەورەیی بێ هاوتا و بێ وێنەی خوا، لەبەردەم هێزو دەسەڵات و لێزانی و کاردروستی خوادا، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ بێگومان خوا زاڵە و هیچ کەس و هیچ شتێ سەرپێچی پێ ناکرێ لە ئاستی دەسەڵات و خواهیشی، لێزان و کاردروستە.

ئینجا لەو شێوە و چیرۆکە گرنگەوە کە بێ سنووری زانین و خواهیشی خوای نیشان دا دێت بۆ باسی سووك و ئاسانی دروست کردن و زیندوو کردنەوە کە هۆی ئەو سووکی و ئاسانی یە ئەو زانین و خواهیشە نەبڕاوە و بێ سنوورەیە. ئەفەرموێ: ﴿ مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ ﴾ دروست کردن و داهێنانی هەمووتان و زیندوو کردنەوەی هەمووتان سووك و ئاسانە بۆ خوا بە وێنەی دروست کردن و زیندوو کردنەوەی تەنیا کەسێك. ئەو خوایەی کە بۆ دروست کردن و نەهێشتنی هەرشتێ هیچی ناوێ بێجگە لە ئاراستە کردنی ویست و خواهیشی، جگە لەوە بفەرموێ: ببە یان مەبە. بۆ ئەو خوایە یەکسانە یەك و زۆر، چونکە پێویست نی یە بە هیچ هەوڵ و تێکۆشانێ لە پێك هێنان و بەدی هێنانی هەرشتێك، ئەو کاتە یەکسانە دروست کردنی تەنیا کەسێ و دروست کردنی چەند هەزار ملیۆن کەس. زیندوو کردنەوەی کەسێ و زیندوو کردنەوەی چەند هەزار ملیۆن کەس، لەگەڵ ئەو توانین و دەسەڵاتە بێ سنوورەدا زانین و ئاگاداری و لێزانی تەواوی هەیە کە پێویستن بۆ دروست کردن و زیندوو کردنەوە و حیساب و پرسیار و پاداشت و تۆڵەی پاش زیندوو کردنەوە،

وەکو دەست نیشانی بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ﴾ بەڕاستی خوا بیسەر و بینایە بۆ هەموو شتێك، هەروەها ئەم دوو سیفەتە سیفەتێکی تەنیایە و بە یەکسانی هەموو شت ئەبیستێ یان ئەبینێ و بیستن یان بینینی هیچ شتێك خەریکی ناکات لە شتێکی تر، هەروەها بەو وێنەیە داهێنان و زیندوو کردنەوەی هەموو یەکسانە و هیچ داهێنان و زیندوو کردنەوەیەك خەریکی ناکات لە هینی یەکێکی تر و لە هەمووان. لەمەو پێش لەم سورەتەدا چەند مەبەستێکی گەورە و گرنگی روون ئەکردەوە و ئەیچەسپان:

١- تەنیا خوا پەرستراوێکی راستە و هەموو پەرستراوەکانی تر پووچ و ناڕاست و ناڕەوان.

٢- پاك و خاوێن کردنی پەرستن تەنها بۆ خوا.

٣- راستی هاتنی رۆژی دوایی و رووداوەکانی.

ئینجا ئەوا هەمیتر لە دوایی سورەتەکەدا ئەگەڕێتەوە بۆ باسی ئەو سێ مەبەستە گرنگە و روون کردنەوەیان بە جۆر و شێوەیەکی تری تازە کە زۆر بەهێز و بەکارە لە هەر دڵ و دەروونێ کە زیندوو بن، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيْلِ﴾ ئایا نەتزانیوە کە خوا شەو ئەبا بەناو رۆژدا و رۆژ ئەبات بەناو شەودا، بەم جۆرە بەرە بەرە شەو کورت ئەکاتەوە و ئەیخاتە سەر رۆژ، رۆژ کورت ئەکاتەوە ئەیخاتە سەر شەو، یان بەم رەنگە شەو ئەهێنێ بەدوای رۆژدا و جێ و شوێنەکەی داگیر ئەکات، هەروەها رۆژ ئەهێنێ بەدوای شەودا و ئەیخاتە جێگا و شوێنێ کە شەوی تیا بووە. بەهەرکام مەبەست بێت شێوەیەکی نێجگار نایاب و سەرسوڕهێنەرە، بەڵام هەرشت و هەر رووداوێك هەرچەند گرنگ و سەرسوڕهێنەر بێت کە زۆر بینرا لە پێش چاو کۆن ئەبێت و بە جێگای سەر لێ کردنەوە و سەرسوڕمان نامێنێ. بەهۆی ئەوەوە ئەو دوو رووداوە زۆر گرنگە بەم رژێمە زۆر ورد و نەگۆڕاوەوە زۆربەی خەڵك بیری لێ ناکاتەوە تا بە چاوی دڵ ئەو دەستە قودرەتە ببینێ کە ساڵ دوانزەی مانگ ئەو شتە گرنگە فەراهەم ئەهێنێ. بێگومان ئەو دوو رووداوە گرنگە پەیوەندی یەکی ئاشکرایان هەیە بە خۆر و مانگەوە و داهێنان و دروست کردنی ئەو دوو چرایە و ژێر بار کردنیان شتێکی نایابتر و سەرسوڕهێنەر ترن لە رووداو و بەسەرهاتی شەو و رۆژ.

وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِيٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ

---

**کەواتە زۆر بەجێ یە کە ئەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ﴾ خۆر و مانگی ژێر بار کردووە ﴿كُلٌّ يَجْرِيٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ هەموو یەکێ لەم دووانە ئەگەڕێ هەتا کات و ماوەیەکی ناوبراو و دیاریی کراو بۆ ئەو گەڕان و گەردشە، دەی بێگومان هیچ کەس هیچ دەخل و دەسەڵاتێکی نی یە بەسەر ئەو ژێر بار کردنەدا جگە لە خوایەك کە توانا و ئاگادارە. ئەو خوا بە دەسەڵاتە ئەیانخاتە ئیش و بڕیاری داوە و زانایە بە ماوەی ژیان و گەڕان و خولانەوەیان. ئینجا لەگەڵ ئەو دوو شتە راست و ئاکرا بوونەوەری یانە کە بردنی شەو و رۆژە بەناو یەك دا و ژێر بار کردنی خۆر و مانگە. لەگەڵ ئەو دوو شتە گرنگەدا کە بە زانین و ئاگاداری خوا دەورە دراون، لەگەڵ ئەوانەدا و لەم کاتەدا ئەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ ئایا نەتزانی کە خوا ئاگادار و زانایە بە هەرشتێك ئێوە ئەیکەن. هەواڵمان ئەداتێ و ئاگادارمان ئەکات بەسەر ئەم شتەدا کە غەیبی یە و ئێمە هەستی پێ ناکەین، بەڵام ئەو دووانە هەست پێکراوەکەی کە لە پێشەوە فەرموی بەڵگە و نیشانەیەکی روون لەسەری، چونکە کەسێ ئەوەندە زانا و توانا بێت بە یاسا و رژێمێکی تێرو تەواو شەو و رۆژ ببا بەناو یەك دا و خۆر و مانگ بەو شێوە ژێر بار بکات ئەبێ ئەو کەسە زانا و ئاگادار بێت بە ئێمە و هەموو کردەوەکانمان کە بەشێکین و واین لەناو ئەم کۆمەڵەی خۆریمانەدا. بێگومان هەواڵ پێدان و ئاگادار کردنەوەمان بەو ئاگاداری و زانایی خوا مەبەستێکی زۆر گرنگە، ئیش کەرێکی بەهێزە بۆ راست بوونەوە و روو کردنمان بۆ خێرو چاکە و هۆی رەزامەندی خوا. ئینجا بەدوای ئەو مەبەستەدا شتێ ئەهێنێ کە هۆی ئەو سێ شتەیە و هەموو شتێ راستی و دامەزراو لەسەری راگیر و دامەزراوە، ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ﴾ ئەوەی کە باس کرا لەو ئایەتە پێشووانەدا لەبارەی توانین و زانینی فراوانی خواوە، ئەو رژێمە بوونەوەری یە دامەزراوە هەمیشەیی یە کە ئەوپەڕی رادە ورد و رێك و پێکە. ئەوانە هەموو هەیە و راست و دامەزراون بەهۆی ئەوەوە کە تەنها خوا هەیە و خوایەتی یەکی راستە و نەگۆڕاوە،**

وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَٰتِهِۦٓ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣١﴾

---

﴿وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلْبَٰطِلُ﴾ هەرچی خەڵکی هاواری لێ ئەکەن و ئەیپەرستن جگە لە خوا هەموو ناڕاستە و بەتاڵە و بێ کەڵکە و هیچی بەدەست نی یە. بێگومان ئەم دەست کردە گرنگە و ئەو رژێمە تێرو تەواوە بە بێ داهێنەر و بەڕێوەبەرێ ناگونجێ، ئەگەر جگە لەخوای تاك و تەنیا کەسێ تریش دەخلی ببێ و کاربەدەست بێت رژێمی نامێنێ و تێك ئەشێوێ بە مل یەك دا، کەواتە تەنها خوا راگیری کردووە، تەنها خوا پارێزەریەتی، تەنها خوا بەڕێوەبەریەتی، تەنها خوا دامەزراوی و جێگیر بوون و پێکەوە لکان و رێك و پێکی راگیر ئەکات تا ئەو کاتەی بڕیاری داوە و ئەیەوێ ببێ.

هەموو شتێك بێجگە لەخوا ئاڵ و گۆڕ رووی تێ ئەکات، هەموو شتێك بێجگە لەخوا زیادە و کەمو کوڕی بۆ ئەبێ، هێزو لاوازی و هات و نەهاتی بۆ ئەبێ بێجگە لە خوا. هەموو شتێك جگە لەخوا لەپاش نەبوون پەیدا بووە و نایشمێنێ دوای بوون، تەنها خوا نەبوون بەسەری دا نەهاتووە و بەسەری دا نایەت و گۆڕان و نەمان رووی تێ ناکات ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ﴾ تەنها خوا بەرزو بڵندە بەسەر هەموو شتێك دا و گەورەیە و زاڵ و دەسەلات دارە بەسەر هەموو شتێك دا، ئینجا شێوەی شتێکی تر ئەخاتە پێش چاو کە ناسراو و زانراو و ئولفەت لەگەڵ دا کراوە، شێوەی گەڕانی کەشتی لە دەریادا کە چاکە و بەهرەیەکی گەورەیە لەگەڵ بەندەکانی خوادا، چەند نیشانە و بەڵگەیەکی روونی تیا هەیە بۆ ئەو باوەڕدارانەی کە خۆگر و چاولەبەری چاکەی خوان، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ﴾ ئایا نەتزانیوە کە کەشتی ئەگەڕێ لە دەریادا بەهۆی چاکە و لوتفی خواوە کە هۆی گەڕانەکەی فەراهەم هێناوە. بێگومان کەشتی بەو هەموو قورس و گەورەیی و باری گرانەوە کە ئەگەڕێ بە هۆی چەند شتێکی تایبەتی یە کە خوا فەراهەمی هێناوە لە دەریاو کەشتی یەکە و باو

زەوی و ئاسمان دا، دروست کردنی ئەمانە بەو شێوە تایبەتی یانەی کە هەیانە بوون بەهۆی گەڕانی کەشتی و نەوەستان و نەنیشتنی، ئەگەر هەرکام لەوانە هەر جۆرە خەلەل و ناڕێکی تیادا روو بدات کەشتی ناگەڕێ لە دەریادا. ئەگەر ئاو وەکو هەوا بوایە یان وەکو زەوی. ئەگەر رادەی زەخت و زۆری هەوا بەسەر ئاوی دەریاکانەوە زۆرتر بوایە، ئەگەر رادەی گەرمی کەمتر بێت تا ئاو بیبەستێ، ئەگەر، ئەگەر.. هەرکام لەمانەی باس کرا و ئەوانەی باس نەکراون هەر گۆڕان و زیاد و کەمی یەك رووبدات تیایان دا کەشتی ناگەڕێ، لەدوای ئەو هەموو هۆیە خوا ئەو کەشتی یانە راگیر ئەکات و ئەیانپارێزێ لەناو ئەو هەموو بای بەهێز و شەپۆلە گەورانەدا کە وەکو شاخی گەورە گەورە راست ئەبنەوە، هیچ پەنایە نی یە جگە لە پەنای بەزەیی خوا. کەواتە بە هەموو جۆر گەڕانی کەشتی بە لوتف و چاکەی خوایە، ئینجا ئەو کەشتی یانە ئەو هەموو خۆراك و شت و مەك و نیعمەتە گرنگانە هەڵئەگرن لە وڵات و ناوچەیەکەوە بۆ وڵاتێکی تر کە زۆربەیان زۆر دوورن لە یەکەوە و بەهۆی ئەو کەشتیانە نەبێت ژیان ناڕوات و تاڵ ئەبێت. کەشتی بە چاکە و بەهرەی خۆی ئەگێڕێ ﴿لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَٰتِهِۦٓ﴾ بۆ ئەمەی هەندێ لە نیشانە و بەڵگە روونەکانی خۆیتان نیشان بدات کە رابەرێکی بەهێزن لەسەر خوایەتی خۆی ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ چونکە بێگومان لەوەی کە باس کرا چەند رابەر و نیشانەیەکی گەورە و گرنگ هەیە بۆ هەموو کەسێکی زۆر خۆگر لەکاتی بەسەرهاتی خراپ دا و زۆر سوپاس کەر و چاولەبەری خوا لەسەر چاکە و بەهرەکانی، مەبەست بەو کەسە باوەڕداری راستەقینەیە کە ئەم دوو سیفەتە گرنگە هەندێکە لە بەرهەمەکانی، بەڵکو هەموو بەرهەمەکانی ئەگرێتەوە چونکە بەرهەمی ئیمان و باوەڕ و خۆگرتنەوە لە قەدەغە و بەجێ هێنانی کردەوەی چاك و رەوا، ئەم دوو شتەش بەرهەمی ئەم دوو سیفەتەیە، لەبەر ئەوە لە حەدیس دا هەیە کە ئیمان دوو بەش و نیوە: خۆگرتن و سوپاسە، صبر و شکر و لەبارێ ترەوە هێنانی ئەم دووانە لەم شوێنەدا زۆر رێك و بەجێ یە چونکە هات و چۆ و گەڕان بە کەشتی بێ بەش نین لە هۆی ئەم دوو سیفەتە یان یەکێکیان.

ئینجا باسی بیّ باری زۆر له بیّ بڕواکان ئەکات بەم ڕەنگە کاتیّ وان لەناو کەشتی یەك دا و ئەکەونە تەنگانە وسام و ترس روو ئەدات، لەو کاتەدا ئەچن بەدەم بانگی سروشتەوە و جگە لەخوا هیچ هەس کە بە فریاد ڕەس دانانێن. بەڵام کاتی ڕزگار بوون و کەوتنە خۆشی هەموو ئەوەیان لەبیر نامێنیّ، ئەفەرمویّ: ﴿وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَالظُّلَلِ﴾ کاتیّ داگیریان بکات و بەرز ببێتەوە بەلای سەرووەوە یان شاخێکی گەورە لە بێخ و لای خوارویەوە بن، لەو کاتە تەنگی یەدا ﴿دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ هاوار و نزا ئەکەنە خوا بە خاوێن کردنی ئایین و مل کەچی بۆی، چونکە بەهۆی بیم و ترسەوە دژو بەرهەڵستەکانی سروشت نامێنیّ و دڵ و دەروون رووت ئەبن لە هێزو دەسەلاتی خەڵەتێنەر، کە لەکاتی ئارام و خۆشیدا ئەبن بە پەردە بەسەر سروشتەوە و سەری لیّ تێك ئەدەن. تا وان لە بیم و ترسا بەو جۆرە پەنا ئەهێنن بەخوا ﴿فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ﴾ ئینجا کاتیّ ڕزگاری کردن و لە دەریا دەری هێنان بۆ وشکی ئەبن بە دوو تاقم ﴿فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ﴾ بەم جۆرە هەندیّ لەوان بە ڕێگای ڕاست دا ئەڕوا و لەسەر باوەڕ بە تاك و تەنیایی خوا ئەمێنێتەوە، ئەو ئاسایش و خۆشی یەی کە تێی ئەکەویّ رای ناکێشیّ بۆ لەبیرچوون و چاو لەبەر نەبوونی چاکەی خوا. یان هەندیّ لەوان مینانەیە و سەرکێشی تەواو بەکار ناهێنیّ بەم ڕەنگە خوای لەبیرە و سوپاسی ئەکات و ئەو تاقمە بەو جۆرەن و تاقمێکی تریان سەرکێشە و دان نانیّ بە چاکە و بەهرە و ئایەتەکانی خوادا.

وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَـٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ ﴿٣٢﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْا۟ يَوْمًا لَّا يَجْزِى وَالِدٌ

عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا

---

﴿وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَـٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ﴾ هیچ كەس بێ بڕوا ودان نەنێرنیە بە ئایەتەكانی ئێمە مەگەر هەموو كەسێ كە زۆر بێ بار و پەیمان شكێن و زۆر بەدنمەك و پێ لەچاكە نەنێر بێت.

ئینجا بە بۆنەی بیم و ترس و سامناكی ناو دەریا كە باس كرا خەڵكی ئەترسێنێ لە بیم و ترسی هەرە گەورە كە بیم و ترسی ناو دەریا و هەموو بیم و ترسەكانی تری ئەم جیهانە هیچ چاو نادەن لە چاو ئەودا. بیم و ترسی رۆژی دوایی كە پەیوەندی خزمایەتی ئەپچڕێ، باوك خەریك و بێ ئاگا ئەكات لە رۆڵەی و هەموو كەس تاق و تەنیا ئەكات، بە رووت و قوتی لە هەموو كۆمەكی و پاڵپشتێ، بەبێ كەس و دەر، ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ﴾ ئەی ئادەمی بترسن لە تۆڵە و سزای پەروەردگارتان و خۆتان بپارێزن لێ ی بە بڕوا هێنان و گوێ رایەڵی، ﴿وَٱخْشَوْا۟ يَوْمًا﴾ بترسن لە رۆژێك ﴿لَّا يَجْزِى وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ﴾ كە هیچ باوكێ لەو رۆژەدا بەرگری هیچ شتێكی خراپ ناكات لە رۆڵەی و هیچ شتێكی لە كۆڵ ناخات و سوودی هیچی پێ ناگەیەنێ ﴿وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا﴾ هیچ رۆڵەیەك بەرگری كەری هیچ شتێكی خراپ نی یە لە باوكی و هیچ شتێكی لە كۆڵ ناخات و هیچ سوودێكی پێ ناگەیەنێ. هەموو كەس خەریكە بە خۆیەوە و هۆشی بەلای كەسی ترەوە نی یە، بەڵكو گوریز و رو وەرگێڕن لە یەكتر با نزیك تر و خۆشەویست تر بووبن لەم جیهانەدا، پەنا ئەگرن بە خوا لە رۆژی وا سەخت و سامناك كە پەیوەندی خوێن و رەحم و بەزەیی هەڵگرێ لە نێوان باوك و كوڕا!!

ئەم ئایەتە كە بە دیمەن و رواڵەت گشتی یە هەندێ لە زانایان تایبەتی ئەكەن بە كافرانەوە، چونكە بێگومان تكا و شەفاعەت شتێكی راستە و ئەبێ لە رۆژی دوایی دا لە نێوان باوەڕداران دا، بەلاّم پێویست نی یە بەو تایبەتی كردنە، چونكە تكا و شەفاعەت بە تەنها نابێت و سوودی نی یە،

بەڵکو بەستراوە بە ئیزن وەرگرتنی خواوە کەواتە لە راستی دا کەس هیچی بەدەست نی یە و هەموو کاروبارەکە بە دەست خوایە و بەس ﴿إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ﴾ بێگومان بەڵێ خوا راستە و بەدی دێت. بەڵێنی داوە بە هاتنی ئەو رۆژە سامناکە و حیساب و پرسیار و پاداشت و تۆڵە و هەموو رووداوەکانی تری ئەو رۆژە. ﴿فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا﴾ کەواتە با هەڵتان نەخەڵەتێنێ ژیانی ئەم جیهانە و خۆشی و شیرینی یەکەی، بەهۆی ئەوەوە دڵ ببەستن پێ یەوە و واز بێنن لە خۆ ئامادە کردن بۆ هۆی رزگاریتان لە سزا و تۆڵەی ئەو رۆژە.

﴿وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ﴾ با فریو دەر تەفرەتان نەدا بە خوا لە گوێ رایەڵی و پاڵتان پێوە بنێ بۆ تاوان و خراپەکاری، ئیتر ئەو فریو دەر و خەڵەتێنەرە شەیتان بێت کە شتی خراپ ئەخاتە دڵ و دەروون، تاوان و خراپە لە پێش چاو شیرین ئەکات، لێ بوردن و بەزەیی و فراوانی خوا بیر ئەخاتەوە، یان ئەیباتە دڵەوە کە گوناهو تاوان زیان ناگەیەنێ ئەگەر خوا بە بەهەشتی نووسیبیتی، دوورکەوتنەوە لە خراپەکاری هیچ سوودی نی یە ئەگەر خوا بە دۆزەخی بڕیاری دابی. هەروەها فڕ و فێڵی تری زۆر و زەبەنە، ئەو فریب دەرە شەیتان بێت و بەو جۆرە تەفرەمان بدات یان هەرشتێ تر کە خەڵەتێنەر بێت وەکو خۆشی و نازو ڕێزێکی فراوان و رابواردن بە ئارەزوو کە خەڵکی بێ هۆش و بێ ئاگا ئەکات، یان دەست گیران و خەریك بوون بە کارێ کە هەموو شتێ تر لەبیر ئەباتەوە، یان دارایی و سامانێکی زۆر، یان زانین، یان تەمەنی درێژ بە ئارام و ئاسایشەوە، یان هێزو دەسەڵات، هەروەها هەر شتێ کە بەندە بێ ئاگا بکات لەخوا، ئەوانە هەموو جۆرە شەیتانێکن، پەنا دەر لەوانە ترسانە لە خوا و بیر کردنەوە و چاو برینە رۆژی دوایی.

ئینجا دوایی سورەتەکە ئەهێنێ بە باسی زانینی خوا کە هەموو شت ئەگرێتەوە، دەست نیشان ئەکات بۆ کەم و کوڕی ئادەمی کە بێ ئاگایە لە شتە غەیبی یەکان، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ﴾ بێگومان تەنها لای خوایە زانینی کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی.

خوای گەورە زانینی ئەو کاتەی بە کەس نەداوە، تەنانەت بە جوبرەئیل کە ئەمین داری سروشی خوایە بۆلای پێغەمبەران، هەروەها بە پێغەمبەرمان (ﷺ) کە گەورەترین و چاکترینی هەموو دروست کراوی خوایە، وەکو روونی ئەکاتەوە لە حەدیسە سەحیحەکەی بوخاری و موسلیم دا کە لە عومەری فاروقەوە ئەیهێنن – خوا لێ یان رازی بێت – بەڵکو ئەو زانینەی تایبەتی کردووە بە خۆیەوە، وەکو لە چەند ئایەتێك دا ئەیگەیەنێ بە روون و رەوانی، نەدانی ئەو زانینە بە خەڵکی بەرژەوەندی تیایە و خوا خۆی باش ئەزانێ و بەلاّم بەشێ لەو بەرژەوەندی یە بۆ ئێمەیش روونە: با خەڵکی ژێر هەمیشە لەسەر ترس و بیم و خۆپارێزی بن، هەمیشە لەسەر چاوەڕوانی بن، بان هەمیشە هەوڵ وتێکۆشان بکەن بۆ پێش خستنی توێشوو و هۆی رزگاری لە تەنگ و چەڵەمەی ئەو رۆژە سەختە. ﴿وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ﴾ خوا باران ئەبارێنێ و لای سەرووەوە ئەیهێنێتە خوارەوە بە پێی لێزانی و کاردروستی خۆی، بە ئەندازەیە خۆی مەیلی ببێ، خەڵك بەهۆی زانینی رادەی گەرما و سەرما و هەڵکردنی باو چەند شتی ترەوە زۆر جار ئاگادار ئەبن بە نزیکی کاتی بارینی باران، بەلاّم ئەوەش ناگاتە رادەی زانینی راستەقینە کە دەست نادات بۆ گۆڕان و هیچ جێگای گومان و دوو دڵی نی یە، بێجگە لەوەش ئایەتەکە باراندنی بارانی تایبەتی کردووە بە خواوە و باسی زانینی کاتی بارینی ناکات، دەی بێگومان تەنها خوا باران و هۆکانی فەراهەم ئەهێنێ و هیچ کەس ناتوانێ بڵێت: هیچ کەسی تر دەخلی هەیە لەوەدا، کەواتە بە هیچ رەنگ ئەمەیش جێگای قسە و باس و دەمبازی نی یە. ﴿وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ﴾ تەنها خوا ئەزانێ بەوەی وا لە منداڵدان دا لە هەموو کاتێك و لە هەموو بار و قۆناغێك دا، تەنانەت لە کاتێك دا کە هیچ لەش و قەبارەیەکی نی یە هەستی پێ بکرێ. تەنها خوا ئەزانێ لە چ جۆرێکە؟ نێرە یان مێ یە. تێرو تەواوە یان ناتەواوە، شێوە و نیشانە و بەسەرهات و کاروباری تایبەتی هەرسك و بێچوویەك بە تایبەتی، زانینی ئەمانە هەموو تایبەتین بە خواوە.

﴿وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا﴾ هیچ کەس چاك بێت یان خراپ نازانێ سبەینێ و لەمەوپاش و لە داهاتوودا چی ئەکات و چی دووچار ئەبێت؟ چاکە یان خراپە، قازانج و سوود یان زیان. رەحەتی و خۆشی یان تەنگی و ناخۆشی، تەندروستی یان ناساغی، گوێ رایەڵی یان تاوان و خراپەکاری، ئەمانە هەموو جگە لە خوا کەس نایانزانێ. ئەمە لەو جۆرە غەیب و نادیارانەیە کە تایبەتین بە خواوە وەکو بە درێژیی باسمان کرد لە سورەتی ﴿النمل﴾ دا با تەماشای بکرێ. ﴿وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ﴾ هیچ کەس نازانێ لە چ شوێن و خاکێك دا ئەمرێ. بەڵکو تەنها خوا ئەزانێ و پەردەی غەیب هاتووە بە مل ئەمانەدا هەموو، ئادەمی هەموو بە مل کەچی و دەستە پاچەیی ئەوەستێ لە دیوی دەری ئەم پەردەیانەوە، تێ ئەگات کە هەر ئەنداز زانینی هەبێ شتێکی کەم و سنوور دارە، دەستە پاچەیی خۆی بۆ دەرئەکەوێ، لە خۆگۆڕان و هەڵخەڵەتانی نامێنێ بەو ئەندازە زانین و فێر بوونەی کە هەیەتی، بە باشی تێ ئەگات کە هەموو ئادەمی بەشێکی زۆر کەمی لە زانین و ناسین پێ دراوە و بەشی زۆری دوانەهاتوو ئەوەیە لەو دیوی پەردەی غەیبەوە کە ئادەمی هیچی لێ نازانێ، مەگەر کەمێ لە بەندە هەڵبژێرراوەکانی خوا کە خۆی بە لوتف و میهرەبانی خۆی ئاگاداری کردبن بە هەر ئەنداز خۆی مەیلی کردبێ بە پێی لێزانی و کاردروستی خۆی. ئەگەر ئادەمی هەموو شتێکی تری بزانیایە هەر ئەبوو داماو و دەستە پاچە دانیشێ بەرامبەر هەرکام لەمانەی باس کران، ئەبێ نەزانێ لە ئێستا بەدواوە چی روو ئەدات و پەیدا ئەبێت، جا ئەو کاتە کە خۆی ناسی ئیتر ئەو لوت بەرزی و خۆ لێ گۆڕانەی نامێنێ و بە سام و ترسەوە مل کەچ ئەبێ بۆ پەروەردگاری.

ئەم چەشنە غەیبی یە نەزانراوانە هەرچەند بەشێکی زۆر کەمن و بە وێنەی دڵۆپێ ئاون لەناو دەریا لوشی بێ پەیی زانراوە غەیبی یەکانی خوادا. هەرچەند لەگەڵ ئەوەدا چاو نادەن بەلام لە زاتی خۆیان دا زۆر زۆر پان و فراوانن، پەیوەندی یەکی بەتینیشیان هەیە بە ئادەمی یەوە و کەچی قاپی زانینیان داخراوە لێ ی، کەواتە با ئادەمی تێ بگات کە بەشێکی زۆر کەم زانینی پێ دراوە و زانینی راستەقینە بۆ خوایە و لای خوایە،

﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴾ بێگومان خوا ئەوپەڕی رادە زانایە، کەواتە هیچ شتێ لە زانینی ون نابێ و ئاگادارە بەسەر هەموو شاراوە و پۆشیدەیەك دا وەکو هەموو ئاشکرا و نەشاراوەکان لە سورەتی ﴿النمل﴾ دا ئەندازێ بە درێژیی باسی شتی غەیبیمان کرد، روونمان کردەوە کە مەبەست بەو غەیبی یانەی کە زانینیان تایبەتی یە بە خواوە و هەستیان پێ ناکرێ و بە ژێریی رووت نازانرێن و بەڵگە و نیشانەش نی یە لەسەریان، بێگومان مەبەست بە زانینیش زانینی راستەقینەیە کە گومان و دوو دڵی رووی تێ ئەکات و دەست نەدات بۆ گۆڕان، کەواتە زانینی مانگ و رۆژ گیران و هەرشتێکی تری وێنەیان ئەو زانینە نین کە مەبەستە، بێجگە لەوەش ئەو جۆرە شتانە لەو غەیبی یانە نین کە تایبەتین بە خواوە و بە بێ ئاگادار کردنی خوا بە هیچ رەنگ نازانرێن، چونکە ئەوانە هەموو بەڵگە و نیشانە هەیە لەسەریان، ئەکەونە ژێر تاقی کردنەوە و بەراورد کردن.

**وصلى الله و سلم على سيدنا و مولانا محمد و على عبد مصطفى و الحمد لله أولا و آخرا.**

# سورەتی (السجدة)
## مەككەیی یە (٣٠) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتە مەككەیی و نموونەیەكی ترە لە نموونەكانی گفت و گۆی قورئان كە رووی ئەكاتە دڵ و دەروون سەبارەت بەو عەقیدە گرنگەی كە هێنای بۆ ئەمەی هەڵیگیرسێنێ لە سروشت دا، بینێژێ لە دڵ و دەروون دا، عەقیدەی مل كەچی و گوێ رایەڵ بۆ خوای تاك و تەنیا، كە داهێنەر و پەروەردگاری بوونەوەر و ئادەمی یە، بەڕێوەبەر و كار بەدەستی ئاسمانەكان و زەوی یە و ئەوەی وا لە نێوانیان دا ئەوەی كە زانراو و ناسراوە و ئەوەی كە بێجگە لە خوا هیچ كەس نایزانێ، باوەڕی بەهێز بە پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمان (ﷺ) كە ئەم قورئانەی بە سروش بۆ هات بۆ رێنموونی بەندەیانی خوا بۆلای خۆیان، هەروەها عەقیدە و باوەڕی رێك بە زیندوو بوونەوە و رۆژی دوایی و حیساب و پرسیار و پاداشت و تۆڵە. ئەم عەقیدەیە كە ئەم سورەتە ئەیەوێ بیچەسپێنێ هەر ئەوەیە كە سورەتە مەككەیی یەكانی تریش ئەیانەوێ بیڕوێنن و جێگیری بكەن لە دڵ و دەروون دا، هەركام لە رێگا و رەوشتێكی تایبەتی یەوە، بە چەند شێوەیەكی بەكاری ئیش كەر، هەموویان كۆ ئەبنەوە و هاوبەشن لەمەدا كە فەرمودەی خوای زانا و ئاگادارە و ئاراستەی دڵی بەندەكانی ئەكات، خوایە كە ئاگادارە بەسەر نهێنی و شاراوە و پۆشیدەكانی دڵان دا، بەسەر هەموو كون و قوشبن و گرێ و كۆتاڵ و لاری دا، سروشتیان ئەناسێ و زانایە بە هەموو كاروباریان لە هەمووكات و بەسەر هاتێكیان دا.

ئەم سورەتە خەریكی مەسەلە و مەبەستەكەی خۆی ئەبێ لە رێگا و رەوشتێ ترەوە جیاواز لە رێگا و رەوشتی سورەتی ﴿لقمان﴾ وەكو بۆمان دەرئەكەوێ لە سەرنج دان و بیر كردنەوە لە ئایەتەكانی هەردوو سورەتەكە، ئینجا با گوێ بگرین لە سورەتە بەفەڕەكە و دڵ و دەروونمانی بۆ بكەینەوە بەڵكو پشت بەخوا بە تیشكێ لە رووناكی یەكەی تاریكیمان نەهێڵێ و پاراومان بكاتەوە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۚ بَلۡ هُوَ ٱلۡحَقُّ

له یەکەم جارەوە ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *الٓمٓ﴾ ئەم سێ پیتە لەو پیتانەیە کە ئەو تاقم و کۆمەڵە عەرەبەی یەکەم جار ئەم قورئانەیان چوو بە گوێچکەدا بە باشی ئەیانناسین. ئەیانزانی کە هەموو وتەو وتاریان لەم جۆرە پیتانە پێك ئەهێنن، بە جوانی تێ ئەگەیشتن کە جیاوازی یەکی زۆر و گرنگ هەیە لە نێوان ئەو وتە و وتارەی خۆیان لەگەڵ ئەو قورئانەی کە هەردوکیان پێك هاتوون و داڕێژراون لە یەك جۆرە پیت. ئەو جیاوازی یە ئەوەندە ئاشکرایە زانراو ناسراوە بۆ هەرکەسێ کە زانا و ئاگادار بێت بە وتە و وتار، هەرکەس کە زانا و ئاگادار بێت بە رێگا و رەوشتی وتەو وتار، هەروەها ئاشکرایە کە قورئان هێز و دەسەلاٌتی تایبەتی هەیە بەسەر دڵ و دەروون و هەست دا کە لە هیچ وتە و وتارێکی تردا ئەو هێزو دەسەلاٌتە نی یە. ئەو جیاوازی یە ئاشکرایە هەیە لە نێوان هەموو دەست کردەکانی ئەم نزیك ناکەوێتەوە لە سنووری دەست کردەکانی خوا و خەڵکی هەموو دەستە پاچە و داماون لە ئاستی دەست کردی خوا لە بچوکترین شتەوە بیگرە هەتا گەورە، بۆ وێنە دابەش کردنی چەند رەنگێکی جیاواز لە هەموو بەش و پارچەیەکی تەنیا گوڵێ هەموو وێنەگرێ دەستە پاچەیە لە ئاستی، هەروەها...

﴿تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾[1] هێنانە خوارەوەی ئەم کتێبە کە قورئانە بە وەجبە وەجبە لەلایەن پەروەردگاری هەموو عالەمەوەیە. هیچ گومان نی یە لەوەدا. واتە هاتنی ئەم قورئانە لەلایەن خواوە جێگای گومان و دوو دڵی نی یە و شایان نی یە هیچ کەس گومانی لەوەدا بێ، چونکە ئاشکرایە کە لە توانای هیچ کەس دا نی یە و هەموو کەس لە ئاستی داما و دەستە پاچەیە، کەواتە هەر گومان و دوو دڵی یەك ببێ ئەوەندە بۆش و بێ

---

[1] ئەم ئایەتە بەچەند جۆر ترکیب کراوە و هەموو هەر ئەگونجێن، تەفسیرەکە لەسەر جۆرێکە کە دڵ زۆر پێی بە ئارامە، ئەم جۆرەش ئەوەیە: وشەی ﴿تنزيل﴾ مبتدأ بێت و خەبەرەکەی ﴿من رب العالمين﴾ و ﴿لا ريب فيه﴾ رستەیەکی سەربەخۆی تێهەڵکێشە.

بنەڕەتە وەکو هەر نەبێ وایە و بوونەکەی بە نەبوون سەیر ئەکرێ، لەبەر ئەوە یەکسەر لێ ی دا لە ریشەوەو فەرموی: ﴿لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ هیچ گومان نی یە تیای دا.

هەرکات دڵ کراوە بێت، هەست بێگەرد بێت لە تۆز و چڵك و چەپەڵی بەسەریەوە، ئەوکاتە روونە کە هەموو سورەتێك لەم قورئانە بەڵکو هەموو ئایەتێکی هێزێکی نهێنی تیایە کە دڵڕفێن و سەرسام کەرە. هەتا رۆشنبیری و خوێندەواری فراوانتر بێ، ناسین و شارەزایی لەم بوونەوەرەدا پەرە بسێنێ ئەوهێزە ئاشکرا تر ئەبێت، ئەگەر سروشت رێك و راست و نەترازاو بێت، ئارەزووکاری بینایی لەکار نەخستبێ. ئەو هێزە تایبەتی یە هەیە کاتێ ئەدوێ و رووی فەرمودە ئەکاتە سروشت، کاتێ کە ئەدوێ لەگەڵ دڵی زانا و لێزان و ژیریی رۆشنبیر و دەروونی پڕ لە زانین و زانیاری، کەواتە هەموو خاوەن ژیریی یەکی لەکار نەکەوتوو دڵنیا ئەبێت کە ئەم قورئانە لە دەست کردی ئادەمی نی یە، بەڵکو هێنانە خوارەوەی لەلایەن پەروەردگاری هەموو عالەمەوەیە، جا لەبەر ئەوە لەو مەبەستە واز ئەمێنێ و بە بێزای یەوە ئەم شێوە پرسیارە ئاراستە ئەکات: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ﴾ ئایا بێ بڕواکان ئەڵێن: محمد ئەو قورئانەی وتوەو دەست هەڵبەستی کردووە بە دەم خواوە؟ واتە ئەو قسەی ئەوانە زۆر نارەوایە و جێگای بێزاری و سەرسوڕمانە و شایان نی یە هیچ کەس هی شتی وا بڵێ. چونکە لەبارێکەوە مێژووی راستی و پاکی محمد ئەو وتەیە بە راست و نارەوا دەرئەکات، لەبارێ ترەوە سروشتی ئەم کتێبە دژیەتی و بە درۆی ئەخاتەوە، هیچ ماوە نادات بۆ گومان و دوو دڵی و دڵ کرمێن کردن لەم قورئانەدا: ﴿بَلْ هُوَ الْحَقُّ﴾ نەخێر بەو جۆرە نی یە کە ئەو بێ بڕوایانە ئەڵێن، بەڵکو تەنها ئەو قورئانە حەق و راستە لە کاتێك دا کە لەلایەن پەروەردگارەوە هاتووە.

ئەم کتێبە حەق و راستە و سروشتی لەسەر راستی یە و لە راستی یەوە هاتووە، رێك و پێکە لەگەڵ راستی دا کە هەر بووە بە بێ سەرەتا، رێك و پێکە لەگەڵ راست و دامەزراوی یەك کە ئەم بوونەوەرەی لەسەر داڕێژراوە، چاودێریی کراوە لە هەموو بەش و پارچەکانی و رژێم و هەموو کاروباری.

ئەم کتێبە حەق و راستی یەکی وایە کە پەیوەندی ئەخاتە نێوان ئەوانەی شوێنی بەرنامە و یاساکەی ئەکەون و نێوان ئەو بوونەوەرەی تیای دا ئەژین، پەیمانی ئاشتی و کۆمەکی و دۆستی و یەك گرتن ئەبەستێ لە نێوانی ئەوان و هەموو هێزەکانی ئەم بوونەوەرەدا.

ئەم کتێبە حەق و راستێکی وایە کە سروشت گوێ رایەڵی ئەبێت و ئەچێ بە پیری یەوە بە سووک و ئاسانی، بە بێ ئەرک و نارەحەتی.

ئەم کتێبە حەق و راستێکە کە هەرگیز دژایەتی یەك نەگرتن رووی تێ ناکات کاتێ کە بەرنامەیەکی تێرو تەواو و گشتی نەخشە کێشاوە بۆ ژیانی ئادەمی لە هەموو چەرخ و چینەکانی دا لەو بەرنامەیەدا تێبینی هەموو هێزو وزەکانی کردوون هەروەها هەموو ئارەزوو و پێویستی یەکانیان، هەموو نەخۆشی و لاوازی و کەم و کوڕی و بەسەرهاتەکانی تر کە دووچاریان ئەبن.

ئەم کتێبە حەق و راستێکی وایە کە سروشت گوێ رایەڵی ئەبێت و ئەچێ بە پیری یەوە بە سووک و ئاسانی، بە بێ ئەرک و نارەحەتی.

ئەم کتێبە حەق و راستێکە کە هەرگیز دژایەتی یەك نەگرتن رووی تێ ناکات کاتێ کە بەرنامەیەکی تێرو تەواو و گشتی نەخشە کێشاوە بۆ ژیانی ئادەمی لە هەموو چەرخ و چینەکانی دا لەو بەرنامەیەدا تێبینی هەموو هێز و وزەکانی کردوون هەروەها هەموو ئارەزوو و پێویستی یەکانیان، هەموو نەخۆشی و لاوازی و کەم و کوڕی و بەسەرهاتەکانی تر کە دووچاریان ئەبن.

ئەم کتێبە حەق و راستێکی وایە کە جەور و ستەم ناکات لە هیچ کەس نە لەم جیهان و لەو جیهان دا، جەور و ستەم ناکات لە هیچ هێز و وزەیەك، جەور و ستەم ناکات لە هیچ بیرو باوەڕێ لەدڵ و دەروون دا و هیچ جوڵان و بزووتنەوەیەك لە ژیان دا، بەم رەنگە بەرگری یان بکات لە بوون و لەکاریان بخات، ماتوڵ ناڕێك و دژ نەبن و یەك بکەون لەگەڵ حەق و راستی گەورەدا کە سەرەکی و بنەڕەتە لە بوون و بوونەوەردا، فەرموی: لەلایەن پەروەردگارتەوە هاتووە لەبەر رێز پێدانی پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەو بێ بڕوایانە لەکەداریان کرد بە دەست هەڵبەست بە دەم خواوە، لەبەر گەیاندنی نزیکی و خۆشەویستی لەنێوان ئەو و پەروەردگاری دا کە پەروەردگاری هەموو عالەمە، ئەو رێز گرتنەش بۆ دەم کوت کردنی ئەو بێ بڕوایانەیە لەسەر ئەو دەم درێژیی یەی کە کردیان دەربارەی قورئان و ئەو پێغەمبەرە ئازیزە (ﷺ) بۆ روون کردنەوەی ئەو پەیوەندی یە بەهێزەی کە هەیە لە نێوان خوا و پێغەمبەرەکەی دا (ﷺ) کە ئەوەش بەهێزی و پاك و خاوێنی سەرچاوەی کتێبەکە نیشان ئەدات لەگەڵ پاك و راستی وەرگرتن و راگەیاندنەکەی پێغەمبەر (ﷺ).

لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٣﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ

**هۆی هێنانە خوارەوەی ئەم کتێبە ئەمەیە کە ئەفەرموێ:** ﴿لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾ **بۆ ئەمەی بترسێنی ئەی پێغەمبەر گەل و کۆمەڵێ کە هیچ ترسێنەرێکیان بۆ نەهاتووە لە پێش تۆوە، بەڵکو بەو ترساندنە رێنموونی وەرگرن و رێگای خوا بدەنە بەر. ئەو گەل و تاقمە عەرەبەی کە پێغەمبەریان تیا رەوانە کراو لە یەکەم جارەوە فەرمانی پێ درا بە ترساندنیان ئاشکرایە کە لە پێش ئەمەوە پێغەمبەری تریان بۆ رەوانە نەکراوە، بەڵکو مێژوو نەیبیستووە لەنێوان ئیسماعیل کە باپیرە گەورەی قورەیشە و لە نێوان محمد پێغەمبەردا – سەلامی خوا لە هەردوو – هیچ پێغەمبەرێکی تر بووبێ. پێغەمبەرێتی یەکەی هەرچەند هەر لە یەکەم جارەوە بۆ هەمووانە بەڵام ئەبێ لەو گەلەوە دەست پێ بکات و ئینجا لەوانەوە پەرە بسێنێ و بڵاوە بکات بۆ هەمووان، سروشتی فەرمانەکە هەر ئەبێ وا بێت و بێجگە لەوە بارێکی تر دەست نادات وەکو هەروایش بینرا و بەدی هات. ئەو گەلە لەو کاتەدا بت پەرست و هاوبەش بریار دەر بوون بۆ خوا. کەواتە با دەست بکات بە روون کردنەوەی سیفەت و نیشانەکانی تاك و تەنیایی خوا تا بەهۆی ئەوەوە بزانرێ کە خوایەتی و پەرستراوی تەنیا مافی پەروەردگارە و هەرچی و هەرکەس ئەم سیفەتانەی نەبێ خوا نی یە و شایانی پەرستن نی یە، ئەفەرموێ:** ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ **خوا کە ناوی** ﴿الله﴾ **یە کەسێکە کە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی وا لە نێوانیان دا – کە بریتین لەم هەموو دروست کراوە گەورە و گرنگ و فراوانە کە ئێمە بەشێکی زۆر کەمی لە ئەناسین و ئەزانین، نەزان و بێ ئاگاین لە زۆربەی... ئەم موڵك و مەملەکەتە پان و پۆرەیە، کە مەردوم سەرسام و**

سەرگەردانە لێ ی، بە سەرگەردانی یەوە ئەوەستێ بەرامبەر ئەم دەست کردە شیرینە رێك و پێکە دڵڕفێنە، کە چاو و هەست و دڵ و ژیریی هیچ کەم و کوڕیێ و ناتەواوی تیا نادۆزێتەوە سەرنج دەر و بیر لێ کەرەوەی هەرگیز نابێ لێ ی، کۆن و بێزراو نابێ لەبەرچاوی، ئەم هەموو دروست کراوە جۆر جۆرانە کە جیاوازن لە جۆر و تیرە و بەرە و قەبارە و شێوە و کار و فرمان دا، هەموویش بە یاسا و رژێمێکی تێرو تەواوە مل کەچی و گوێ رایەڵن بۆ یەك خواهیش و لە یەك سەرچاوە تەمێ و فەرمان وەرئەگرن. کەسێ کە ئەمانەی داهێناو و چاودێریی و سەرپەرشتی یان ئەکات تەنها ئەو کەسە خوایە و ئەبێ پەرستراو بێت، تەنها ئەو کەسە خوایە کە ناوی ﴿الله﴾ یە، بێگومان مەبەست بەو شەش رۆژە لە جۆری رۆژەکانی ئەم زەوی ئێمە نی یە، کە لەپاش دروست کردنی زەوی و مانگ و خۆر بەدی هاتوون، ئەم رۆژانی ئێمە بەراورد کەرێکی کاتی کەم و کورتن بۆ ئێمەی دانیشتووی ئەم زەوی یە بچوك و لاوازە دەست ئەدەن! ئینجا ئایا مەبەست بەو شەش رۆژە چی یە کە لە چەند شوێنێك دا باس کراون لە قورئان دا؟ بەڕاستی زانینی ئەوە تەنها لای خوایە و رێگا نی یە بۆ ئێمە لە خۆمانەوە دەم لە شتی وا بکوتین و سنوور و ئەندازەیان بۆ دیاریی بکەین. هەڵئەگرێ مەبەست بەو شەش رۆژە تەور و بار بێت کە تێپەڕی کردبێ بەسەر ئاسمانەکان و زەوی دا تا گەیشتە ئەم بارەی کە ئێستا لەسەرینی. یان شەش قۆناغ بێت لە پێك هێنان و پەیدا بوون دا، یان شەش چەرخ بێت کە بێجگە لە خوا کەس ماوەیان نازانێ، بەهەرحاڵ وەکو وتمان ئەم رۆژانی ئێمە نین، ئیتر زیاد لەوە هیچ ناڵێین و بەو شتە غەیبی یانەی سەیر ئەکەین کە نازانرێن لەلایەن خواوە نەبێ. بەس ئەوەندە ئەڵێین ئەم شتانە بە یەك جار و لە یەك کات دا دروست نەکراون، ئەوەش بە گوێرەی زانین و لێزانی و کاردروستی خوا

﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ [1] له ژوورو ئەوەوە كە ئەوانەی دروست كرد خوا خاوەن و پادشای بە دەسەلاتە و زاڵ و بەرز و بڵندە بەسەر هەموو شتێك دا بە بێ بەرگری و بەبێ سنوور. ئینجا شێوە و بەشێ لە دەسەلات و زاڵی و بڵندی یەكەی روون ئەكاتەوە و ئەفەرموێ: ﴿مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيٍّ وَلَا شَفِيعٍۚ﴾ نی یە بۆ ئێوە هیچ دۆست و كاربەدەستێك و هیچ تكاكارێ بۆتان لای خوا لەكاتێك دا تێپەڕ بكەن و دەرچن لە رەزامەندی و گوێ رایەڵی خوا. یان مەبەست ئەوەیە: هیچ دۆست و كاربەدەست و یارمەتی دەرتان نی یە بێجگە لە خوا، دەی ئایا لە كوێ یان بوو؟ كێ ئەتوانێ خۆی بكات بە خاوەن و یارمەتی دەریان؟ لەكاتێك دا كە خوا پادشا و بەدەسەلات و زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا، داهێنەر و پەروەردگاری هەموو ئاسمانەكان و زەوی و هەموو شتە. ئیتر دۆست و كاربەدەست و یارمەتی دەریان لە كوێ بوو دەست بخاتە كار و بڕیاری خوا؟ ﴿أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ﴾ ئایا ئەم پەند و ئامۆژگاری یانە نابیستن تا بەهۆی ئەوەوە بیر بكەنەوە و تەمێ وەرگرن؟ ببیستن و بیر بكەنەوە تا بەهۆی ئەوەوە باوەڕ بكەن و دان بنێن بەتاك و تەنیایی خواو تەنها ئەو بپەرستن و تەنها روو بكەنە ئەو.

ئینجا لەگەڵ ئەو دروست كردن و داهێنان و دەسەلات و بڵندی یەدا هەموو كاروباری خوا بڕیاری ئەدات و تەگبیری لێ ئەكات بە ئەوپەڕی لێزانی و رێك و راستی لە هەردوو جیهان دا، هەموو كارێ كە تەگبیری ئەكات و بڕیاری ئەدات لەم جیهانەدا تا رۆژی دوایی، ئەوانە هەموو ئەگەڕێتەوە بۆ حوزووری بڵند و پایە بەرزی خۆی لە رۆژی دوایی دا بۆ ئەمەی بڕیاری تیا دەركات،

---

[1] لە چەند شوێنێكی تردا بە درێژیی باسی مەبەست بەم رستەیە كراوە كە لە چەند سورەتێك دا هەیە و رای جیاوازی زانایان روون كراوەتەوە، كەواتە پێویست نی یە بە دووبارە كردنەوە، ئەمەی لێرەدا وتراوە رایەكە لەو رایانە، خوا خۆی باش ئەزانێ.

﴿ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ

وەکو ئەفەرموێ: ﴿ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ﴾[1] خوا تەگبیری هەموو کاروباری ئەم جیهانە ئەکات لە ئاسمانەوە بۆ زەوی تا رۆژی دوایی، ﴿ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ﴾ لەپاشان ئەو کار و بارە هەمووی ئەگەڕێتەوە بۆلای خۆی و بەرز ئەبێتەوە بە حوزوری پایە بەرزی ﴿فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾ لە رۆژێك دا کە ئەندازی ئەو رۆژە هەزار ساڵە لەو ساڵانەی کە ئێوە لەم جیهانەدا ئەیانژمێرن، واتە رۆژی دوایی ئیتر ئایا مەبەست ئەم هەزار ساڵە و پەنجا هەزار ساڵەکەی سورەتی ﴿المعارج﴾ دوو رۆژی تایبەتی بن کە زانینیان لای خوایە و ئەبێ حەواڵەی ئەو بکرێن وەکو ئیبن و عەباس ئەفەرموێ – خوایان لێ رازی بێت –؟ یان مەبەست یەکێ بێت لەوبار و را جیاوازانەی کەلە کتێبە تەفسیرەکان دا وتراون؟ بەرهەکام بێت دەست ئەدات و ئەگونجێ، وێنەی ئەمە لە قورئان دا زۆرە با سەرنج بدرێ کام بار لە دڵ دا جێگیر تر بوو ئەوە بگیرێ.

هەموو تەگبیرێ و هەموو بڕیارێك بە بەرهەم و بەرو بوومی یەوە ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوا لەو رۆژەدا کە بڕیاری داوە بۆ نیشاندان و خستنە پێش چاوی هەموو وتار و کردار و هەموو شتەکان... هیچ شتێك بێ سەر و شوێن ناڕوا و بێ پرسیار و لێ پرسینەوە، هیچ شتێك دروست نەکراوە لە خۆڕایی، بەڵکو هەموو بە فەرمانی خوایە و کات و ماوەی دیاریی کراوی خۆی هەیە لە هەموو بار و روویەکی یەوە. ﴿ ذَٰلِكَ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾ ئەو کەسەی کە ئەو سیفەت و نیشانانەی بۆ باس کرا زانایە بە هەرشتێ کە پۆشیدەیە و هەستی پێ ناکرێ و نی یە بە پێش چاوەوە، هەرشتێ کە هەستی پێ ئەکرێ و ئاشکرایە. کەواتە تەگبیری هەموو کردوون بە لێزانی و بە پێی بەرژەوەندی،

---

[1] ئەم ئایەتە بەچەند جۆرێ تەفسیر کراوەتەوە هەندێکیان نزیك و هەندێ دوور و لەناو نزیکەکان دا باوەڕم بەمە بەهێزتر بوو لەبەر ئەوە کردم بە تەفسیر.

﴿ٱلْعَزِيزُ﴾ كە ئەو زانایە زاڵ و بەهێز و بەدەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێك دا مەیلی بكات و بیەوێ. ﴿ٱلرَّحِيمُ﴾ بەزەیی دارە لە خواهیش و ویست و تەگبیری دروست کراوەکانی دا ﴿ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ﴾ کەسێکە کە هەر شتێکی دروست کردووە رێك و پێك و شیاو و گونجاوی کردووە، لە لێزانی و بە پێی بەرژەوەندی کاروباری هەموو شتێکی فەراهەم هێناوە کە شیاو و گونجاو بێت لەگەڵ کارو فرمانی و ئەو مەبەستەی بۆی دروست کراوە.

بێگومان ئەوە شتێکی راستە کە سروشت شایەتە لەسەری و چاوی دڵ و ژیریی ئەیبینێ، ئەوە شتێکی راستە کە دەرئەکەوێ لە وێنە و شێوەی دروست کراوەکان دا، لە کار و فرمانیان دا، لە سروشتی خۆیان دا بە تەنیا و لە رێکی و گونجاوی یان لەگەڵ یەکتر لە کاتی یەك گرتن و کۆبوونەوەیان دا، هەروەها لەهەر شتێکی تریان دا کە هۆی رێك و پێکی و پێکەوتن و شیرینی و جوانی یانە لە نزیك و لە دوور. پاکی و بێ لەکەیی بۆ خوای پەروەردگار! ئەمە کردەوە و دەست کردیەتی لە هەموو شتێك دا، ئەمە دەستی قودرەتییەتی کە بەرهەمی روون و ئاشکرایە لە دروست کراوەکانی دا، ئەوە هەموو دروست کراوەکانی رێك و پێکی و شیرینی و روون و رەوان و ئاشکرایە تیایان دا، ئەوەتا نە زیادەڕەوی هەیە و نە کەم و کوڕی، لە قەبارەو کۆدا، یان لە شێوەو کارو فرمان دا، هەموو شتێك هەموو بارێکی دیاریی کراوە بێ زیاد و کەم و بێ پێشکەوتن و دواکەوتن، هەموو شتێ لە بچووك ترین تا گەورەترین، لە سێلێکەوە تا گەورەترین لەش. هەموو رێك و پێکی و شیاوی تیا روونە...

هەروەها هەموو کردەوە و بزووتنەوە و رووداوی، هەموو ئەوانە لە دروست کراو و دەست

کردەکانی خوان. هەموو دیاریی کراون بە دیاریی کردنێکی دوور لە کات و شوێن و ماوە و بەرهەم و دوا ڕۆژیان دا، بە پێی ئەو ڕێگا و ڕێبازە تایبەتی یەی کە دیاریی کراوە لە زانین و خواهیش و بڕیاری خوادا.

هەموو شتێك، هەموو دروست کراوێك پێك هاتووە بۆ ئەمەی هەڵسێ بەو کارەی کراوە بە بەشی و بۆی دانراوە لەم بوون و بوونەوەرەدا، بە وردی ئامادە کراوە بۆ ئەوەی بۆی دانراوە، هەرچی هۆی پێك هێنانێتی پێی دراوە، هەر کرمێ، هەر ماسی یەك، هەر پەلەوەرێك، هەر گیان لەبەرێکی تر بۆچی دانراون و فرمانیان هەرچی ببێ هۆی ژیان و هەڵسان بەو مەبەست و فرمانەیان پێ دراوە، ئینجا ئەم ئادەمی یە زۆر گرنگە کە گەورەترین کارو فرمانی پێ سپێرراوە کە جێنشینی یە لەم جیهان و زەوی یەدا هەموو هۆ و پێویستی یەکی بۆ ئامادە کراوە و پێی دراوە... هەروەها هەموو ئەستێرەکان گەڕۆك و دامەزراویان، بەو هەموو بزووتنەوە و گەردش و خولانەوە ڕێك و پێکە، بەو یاسا و ڕژێمە نەگۆڕاوە کە سەرنجی هەرکام بدرێ و بیری لێ بکرێتەوە بە تەنیا تەنیاو بە کۆو لەگەڵ ئەوانی تردا سە سوڕ ئەمێنێ و سەرسامی پەیدا ئەبێ لە کاری خوادا!! هەرچاو و هەستێ کراوە بێت، هەر دڵێ بینا بێت جوان و شیرینی و ڕێك و پێکی ئەبینێ لەم بوونەوەرەدا بە شێوەی گشتی، لە هەموو بەش و پارچەکانی دا، خاوەنی ئەو چاو و دڵە بیناو ڕووناکە هەمیشە ئەژی لەم میهرەجانە پان و فراوانە بێ وێنەی کە خوا فەراهەمی هێناوە، هەتا باش تر سەرنج بدرێ و بیر بکرێتەوە چاکتر ڕوون ئەبێتەوە مانا و مەبەستی ئەم فەرمودەی کە ئێستا ئەژین لەگەڵی و خەریکین پێ یەوە: ﴿ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ﴾ پاکی و بێگەردی بۆ ئەو پەروەردگار و داهێنەرە.

ئینجا دێتە سەر باسی ئادەمی کە گرنگ ترین و نایاب ترینی دروست کراوەکانە، ئەفەرموێ: ﴿وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ﴾ دەستی کرد بە دروست کردنی ئادەمی و لە یەکەم جارەوە لە قوڕ دروستی کرد.

قورئان لە شوێنێك دا ئەفەرموێ: ئادەمی لە خۆڵ دروست کراوە، لێرەش ئەفەرموێ لە قوڕ، جارێ تر ئەفەرموێ لە قوڕی ترشاو و بۆن کردوو، جارێ تر لە قوڕی مچ، جارێکی تر ئەفەرموێ: لە قوڕی وشك بووەوە کە بە وێنەی سوالەت تەقەی لێ بکرێ دەنگ ئەداتەوە، ئەمانە هەموو راستن و بە پێی حەدیس ئەمانە چەند تەور و قۆناغێك بوون بە ریز تێپەڕیان کرد بەسەر دروست کردنی یەکەم کەس دا کە ئادەمە – درودی خوای لەسەر بێت –، بەم رەنگە بە فەرمانی خوا مەلائیکە خۆڵیان وەرگرت لە چەند شوێن و جێگایەك لە زەوی، ئینجا بە ئاو کردیان بە قوڕ، ئینجا ئەو قوڕەیان شێلاو لێ ی گەڕان تا ترشا، لەپاشان مایەوە هەتا بوو بە قوڕێکی مچ، ئینجا لەو قوڕە مچە شێوەو هەیکەلی ئادەمیان پێك هێنا و لێ ی گەڕان هەتا وشك و رەق و تەق بووەوە، ئینجا خوای گەورە گیانی کرد بە بەری دا و بوو بە یەکەم کەس و بنەڕەت و باوکی هەموو ئەم تیرە، جا بەم پێ یە هەڵنەگرێ مەبەست بەم قوڕە لێرەدا ئەو قۆناغی دووەمە بێت، بەڵام وەکو یەکەم وایە بۆ دروست کردنی چونکە لەوێ دا هەموو کەرەسەکانی لەشی کۆبوونەوە و یەکیان گرت، ئینجا بە پێی ئایەتی سورەتی ﴿المؤمنون﴾ کە ئەفەرموێ: ئادەمیمان دروست کرد ﴿مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ﴾ لە خولاسە و پاڵفتەیەك لە قوڕ. وا دەرئەکەوێ ئەو قوڕەش چەند تەور و بار و گۆڕانێکی بەسەردا هاتبێ ئیتر ژمارەیان هەرچەند بووبێت؟ چۆن پەیدا بووبن؟ کات و چەرخ و ماوەیان چەند بووبێت؟

هەڵنەگرێ ئەم فەرمودەی ئێرە دەست نیشان بێت بۆ یەکەم جاری پەیدا بوونی یەکەم سێڵی زیندوو لەم جیهان و زەوی یەدا، ئەو سێڵە لە قوڕ پەیدا بووبێ، قوڕ قۆناغێ بێت پێش گیان بە بەردا کردنی ئەو یەکەم سێڵە. لەو سێڵە زیندووە ئادەم و ئادەمی پەیدا بووبێت، ئیتر قورئان نافەرموێ: چۆن بە چ شێوەیەك ئەو کارە تەواو بوو، بە چەند چەرخ و گۆڕان

فەراهەم هات، کەواتە لەو بارەیەوە هیچ بەرگری کەریَ نی یە بۆ هەر لیَکۆڵینەوە و قسە و باسیَکی ریَك و راست کە دژ و پیَچەوانەی قورئان نی یە و ژیریش وەری ئەگریَ، هەر قسە و باس و لیَکۆڵینەوەیەك کە وتراوە و لەو قۆناغەوە هاتووە، بەلاَم بەم بۆنەیەوە چاك وایە هەندیَ بدویَین لە نەزەری یەکەی داروین کە ئەڵیَت: هەموو جۆرە زیندەوەرەکان بە ریز و بە یەك زنجیرە هاتن لە تەنیا سیَلیَکەوە تا گەیشتە ئەم ئادەمی یە بە چەند تەور و بار و گۆرانیَکی یەك لەدوای یەك، چەند ئەلْقەیەکی پەیدا بوون و پیَشکەوتن و بەرز بوونەوە لەو زنجیرەیەدا کە ئادەمی ئەهیَنیَ لە گیان لەبەریَکی ترەوە کە رادەی بەرز ترە لە بەرزترین مەیمون و پەست ترە لە ئادەمی.. چاك وایە لەمە بدویَین و روونی بکەینەوە کە ئەم نەزەری یە ناراست و ناڕەوایە و لەم نوختەدا هەڵەیە.

ئەم نەزەری یە راو قسەیەکی رووت بوو بە بیَ هیچ نیشانە و بەڵگەیەکی راست و بنەڕەتەکەی لەسەر بیَ بڕوایی بە خوای پەروەردگار کە هەرکەس بیَ بەش نەبیَ لە تیَگەیشتن و ژیریی هەرگیز شتی وا ناڕاست و نارِیَك بە دەروونی دا گوزەر ناکات، جا لەبەر ئەوە – پاش داروین و بلاَو بوونەوەی نەزەری یەکەی و شویَن کەوتنی هەندیَ لە نەزان و نەفام بۆی – هەر لە ئەورووپاوە زانا بەرزەکانیان دژی هەڵسان و بە درۆیان خستەوە و بیَزاریان دەربڕی لیَ ی، لەپاش ئەوان زانایان لە هەموو لایەکەوە دژی هەڵسان و بەدەیان رابەر و بەڵگەی ژیریی و بیری و زانیاری یان هیَنایەوە لەسەر ناڕاستی و ناڕەوایی ئەو راو نەزەری یەیە.

لەپاش هەڵدانەوەی گۆڕی فیرعەونەکانی میسر، هەروەها دۆزینەوەی ئیَسکە رزیوی مردووە کۆنەکان کە هیچ جیاوازی یان نەبوو لەگەڵ ئیَستادا، بۆ نموونە: یەکەم قەبارە و هەیکەلی ئیَسکی کە لە ﴿متحف الإنسان﴾ دایە لە پاریس، لەم دوایی یەدا بە پارە پارەیی دۆزرایەوە لە (ئەثیوبیا) لەلایەن تاقمیَکەوە لەوانەی ئەگەڕیَن بەدوای ئەوجۆرە شتانەدا، ئەو ئیَسکە رزیوانە بە هیَنی کۆنترین ئادەمی دانراوە، لەگەڵ ئەوەدا کە کۆکرانەوە و نووسیَنران بە جیَگای خۆیانەوە قەبارەیەکی ئیَسکی ئادەمی تیَرو تەواوی لیَ دەرچوو بە ویَنەی ئادەمی ئیَستا بە بیَ کەم و کوڕی و جیاوازی. ویَنەکەی لە رۆژنامەکان دا بلاَو کرایەوە، ئەو ویَنەیە

وەرگیرا لە هەندێ پەڕاودا، بۆ وێنە پەڕاوی ﴿الإنسان و الداروينية﴾ لاپەڕە ١٤٠ دانراوی محمد صالح خان.

لەپاش دۆزینەوەی ئەو جۆرە شتانە بە باشی روون بووەوە کە ئەو قسەی داروینە ناڕاست و هەڵەیە و مافی ئەوەی نی یە کەس پێی بخەڵەتێ. بەهۆی دۆزینەوەی ئێسکە رزیو و کەلەسەرێ کە بە هێنی کۆنترین ئادەمی دانرا و کەچی تێر و تەواو تر بوو لە هێنی ئێستا، بەهۆی ئەوەوە ئێزگەی لەندەن لە ساڵی ١٩٧٣ دا بلاوی کردەوە کە ئەو قسە و رای داروینە ناڕاست و بەتاڵە.

کاری داروین تەنها بەوە نەوەستا، بەڵکو خوا کارێکی وای کرد شتەکەی بە تەواوی روون کردەوە و لە رێگای زانیاری تازەوە. ئەوەتا روون بووەوە بۆ زانایانی زانیاری تازە کە سێڵی هەموو جۆرو نەوعێ – نەك تەنها ئادەمی – بەڵکو هەموو گیان لەبەرێکی تر هەموو جۆرێ لە رواو و سەوز بووەکان، هەموو جۆرێ لە هەموان پارێزەر و هەڵگری هەموو شتە تایبەتی یەکانی ئەو جۆرو نەوعەی لەگەڵە کە هۆی مانەوە و نەگۆڕانیەتی: کرۆمۆسۆمات (جینات)!! بەهۆی دۆزینەوەی ئەمانە زانایانی تازە بڕوایان وایە کە بە هیچ کلۆج ناگونجێ گۆڕانی هیچ جۆرێك بە جۆرێکی تر، رای داروین شتێکی ناڕاست و نەگونجاوە و مافی ئەوەی نی یە هیچ نرخێکی پێ بدرێ، کەواتە ئادەمی هەر ئادەمی بووە و هەر ئادەمیش ئەبێ، هەروەها ئەسپ و بزن و مەڕ و سەگ و پشیلە و هەموو جۆر و نەوعەکانی تر، بەڵێ ئەمە شتێکی راستە لەناو هەموو جۆر و نەوعێك دا جیاوازی هەیە لە نێوان ئەندامەکانیان دا، هەندێکیان هەڵکەوتوو تر و بەرزترن لە هەندێ تریان، بەڵام جیاوازی یەکەیان لە سنووری جۆر و تیرەکەیان تێپەڕ ناکات. ئەم رای داروینە ئاوا بە بۆش و بێ جێ و بێ بنەڕەت دەرچوو، لە وڵات و کانگاکەی خۆی دا تووڕ درا و خرایە سەر نوێلکی ئەفسانە و دەلەسە و پڕ و پووچەکانی مێژوو، بەڵام بەداخەوە – وەکو ئەبیسین – هێشتا لە هەندێ وڵاتە دواکەوتوو نەشارەزاکانی ئیسلامی دا بڕوا بەو قسە پڕ و پووچە هەر هەیە لەلایەن هەندێ لەوانەی کە بە رواڵەت بە خوێندەوار سەیر ئەکرێن!!

ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ

---

ئیتر زیاد لەمە درێژە نادەین بەو باسە و ئەگەڕێینەوە بۆلای قورئانەکە: ﴿ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ﴾ لەپاش یەکەم جار کە لە قوڕ ئادەمی دروست کرد ئینجا نەوە و وەچەی دروست کرد و فەراهەمی هێنا لە ڕێگای زاو زێوە لە پاڵفتە و خولاسەیە لە ئاوێکی نرخ پێ نەدراو و قیزەون کە دەرئەچێ لە پشتی پیاو و سنگی ئافرەت... دروستی کرد لەو ئاوە کە قۆناغی یەکەمە بۆ پەیدا بوون و پێك هێنانی بێچوو لە منداڵدان دا، ئینجا لەو قۆناغە گواستی یەوە بۆ قۆناغی خوێن پارە و لە پاشان کردی بە گۆشت پارە و ئینجا کردی بە ئێسك و قەبارەی ئێسکی، وەکو لە سورەتی ﴿المؤمنون﴾ دا بە درێژیی باس کرا. ﴿ثُمَّ سَوَّىٰهُ﴾ ئینجا ڕێکو پێکی کرد بە تەواو کردنی لەش و ئەندامەکانی و شێوە و وێنە کێشانی، ﴿وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ﴾ گیانی تێ کرد لەو گیانەی کە بەرێزە بەلایەوە و زیادە پەیوەندی هەیە پێ یەوە. ﴿وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ﴾ گێڕاویە و فەراهەمی هێنا بۆتان هێزی بیستن و چاو و دڵ بۆ بیستن و بینین و فام و تێگەیشتنتان.

پەنا بە خوا لەو گۆڕانە زۆر گرنگەی کە خوای گەورە ئەیهێنێ بەسەر ئەم ئادەمی یەدا، ئەو گواستنەوەو تێپەڕ پێ کردنە بەو هەموو قۆناغە جیاوازانە کە ئێجگار دوورن لە یەکەوە کە ئەگەر ئاوا بە ئاشکرا نەزانرایە و ڕووی نەدایە هەرگیز بڕوا نەئەکرا کە شتی وا ئەگونجێ، ئای لەم موعجیزە گەورەیە، کەچی خەڵکی لە ئاستی سەرسام و سەرگەردان نابن!! پاکی و بێگەردی بۆ خوای پەروەردگار.

ئەم نوختە بچووکە لەو ئاوە بێ نرخە قیزەونە لە کوێ و ئەم ئادەمی یە گرنگە سەر سوڕهێنەرە لە کوێ، ئەگەر ئەو دەستە قودرەتە نەبێت ئەو موعجیزە گەورەیە پێك بێنێ؟ ئایا کێ ڕێنموونی ئەو نوختە ئاوە ئەکات کە بە ڕێگای ڕاستی خۆی دا بڕوا و لەهەر قۆناغێك دا ماوەیە بمێنێتەوە و ئینجا لێ ی تێپەڕ بکات بۆ قۆناغێکی تر تا لە سەر ئەنجامدا لەو شێوە سادەیی یەی خۆیەوە بگۆڕێ بەم ئادەمی یە کە پێك هاتووە لە هەموو بەش و پارچە و

کۆئەندامە کە خاوەنی هەست و هۆش و ژیریی و بیر و ئەو هەموو هێزو وزەی تر؟ کێ ئەوە ئەکات بێجگە لەخوای بێ وێنەی پەروەردگار؟

ئەم بەش بەش بوون و زۆر بوون و پەرەسەندنە لە تەنیا سێلێك دا، ئینجا جۆر جۆر کردنی ئەو هەموو تاقمە سێلانە کە جیا ئەبنەوە و هەر تاقمی سروشت و کار و فرمانی تایبەتی جیاوازی خۆی هەیە، کە هەرکام لەمانیش بەرە بەرە زۆر ئەبن و پەرە ئەسێنن بۆ ئەمەی هەر کۆمەڵێ هەڵسێ بە پێك هێنانی پارچە و ئەندامێکی دیاریی تایبەتی کە ئیش و کارێکی تایبەتی خۆی هەیە. هەر پارچە و ئەندامێ کە کۆمەڵە سێلێکی دیاریی کراو و لە جۆرێکی تایبەتی پێك ئەهێنێ، هەرکام لەوانیش دابەش ئەبن بە چەند بەشێ کە سروشتی تایبەتی و کارو ئیشی تایبەتی خۆیان هەیە کە هەربەشێك تاقم و کۆمەڵە سێلێکی تایبەتی پێکی ئەهێنێ کە زیاتر تایبەتین پێ یەوە لەناو هەموو تاقمە سێلەکانی تردا، دەی ئەو بەش بەش بوون و زۆر بوونە لەگەڵ ئەو جۆر جۆر کردنە چۆن لە یەکەم سێلێ دا پێك هات کە تەنیا سێلێکە؟ چۆن ئەو هەموو شتە تایبەتی یانە داشارا بوون کە لە پاشان دەرئەکەوتن لەو هەموو کۆمەڵی سێلە تایبەتی یەکانی کە پەیدا بوون لە یەکەم سێل؟ ئینجا ئایا لەکوێ داشارا بوون ئەو سیفەت و نیشانە و شتە تایبەتی یانە کە پێك هێنەر و جیا کەرەوەی بێچووی ئادەمی بوون لە بێچووەکانی تری گیان لەبەرانی تر؟ ئینجا ئەو سیفەت و شتە تایبەتی یانەی کە پێك هێنەر و جیاکەرەوەی هەرکام لە بێچووی هەر ئادەمی یەکن لە هەر بێچوویەکی تر ئادەمەی؟ ئینجا ئایا لە کوێ بوو پارێزەر بۆ هەموو سیفەت و شێوەو نیشانە و کارو فرمان و هەر شتێکی تایبەتی تر کە لە پاشان دەرئەکەوێ لە هەر بێچوویەکەوە لەماوەی ژیانیدا؟!

ئەم موعیجزە گەورەیە ئەگەر ئاوا نەزانرایە بە ئاشکرا بەدی نەهاتایە ئایا کێ بڕوای ئەکرد و بەدڵی دا ئەهات کە شتی وا ئەگونجێ و روو بدات و بەدی بێت، پەیدا بوونی ئەم هەموو شتە لە تەنها سێلی؟!! بێگومان دەستی قودرەتی ئەم ئادەمی یە نایابە سەر سوڕهێنەرە پێك ئەهێنێ لەو تەنها سێلە، بەو گیان و رۆحە تایبەتی یە ئەم ئادەمی یە ئەبێ بەم گیان لەبەرە بەرزە جیاوازە... بێگومان ئەوەیە تاقانە شتێ کە بگونجێ و دەست بدات بکرێ بە هۆی ئەم شتە سەر سوڕهێنەرە کە هەمیشە روو ئەدات و بەدی دێت، خەڵکی لێ یان بێ ئاگان، ئینجا ئەو گیان و رۆحەیە هۆی بیستن و بینین و فام و هۆشی ئەم ئادەمی یە، هەر هۆیەکی تر بوترێ بێ جێ یە و ناڕەوایە و دژی ژیریی یە.

قَلِيلًا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴿٩﴾ وَقَالُوٓاْ أَءِذَا ضَلَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدِۢۚ بَلۡ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمۡ
كَٰفِرُونَ ﴿١٠﴾ ۞ قُلۡ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلۡمَوۡتِ ٱلَّذِي وُكِّلَ بِكُمۡ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ تُرۡجَعُونَ ﴿١١﴾ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ
ٱلۡمُجۡرِمُونَ نَاكِسُواْ رُءُوسِهِمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا

---

لەگەڵ ئەم هەموو چاکە و بەهرەیە کە خوا رشتویەتی بەسەر ئەم ئادەمی یەدا کە بەشێکی ئەوە بوو باس کرا و خرایە بەرچاو، لەگەڵ ئەو هەموو هۆی مل کەچی و چاو لەبەری یەدا ئادەمی سوپاس و چاولەبەری زۆر زۆر کەمە بۆ خوای بەخشندە و میهرەبانی، وەکو ئەیدا بە ناوچاوانمان دا کە ئەفەرموێ: ﴿قَلِيلًا مَّا تَشۡكُرُونَ﴾ زۆر کەم سوپاس ئەکەن و هەڵئەسن بە ماف ئەو چاکە و بەهرانەی وا بەسەرتانەوە.

لەپاش ئەوەی دەست نیشانی کرد و سەرنجی راکێشا بۆ ئەو دەستە قودرەتەی کە هەمیشە ئەو موعجیزە گەورەیە بەدی ئەهێنێ، ئینجا دێتە سەر باسی گومان و دوو دڵی بێ بڕواکان کە هەیانە لە زیندوو کردنەوەدا و ئەو رەخنە بێ جێ و پووچەی کە هەیانە ئەیخاتە بەرچاو کە ئەو گومان و دوو دڵی و رەخنەیە زۆر جێگای سەرسوڕمانە کاتێ کە دروست کردن و داهێنانی یەکەم جار خرایە بەرچاو، چونکە نابێ سەر بکرێتەوە لەوەو گومان ببێ لەوەدا کە داهێنەر ئەتوانێ داهێنراوەکەی دووبارە بکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُوٓاْ أَءِذَا ضَلَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەوانە وتیان: ئایا کاتێ ئێمە ون ببین لەناو زەوی دا بەم رەنگە لەپاش مردن لەشمان بڕزێ و بێ بە خۆڵ و تێکەڵی خاکی زەوی ببێ؟ ﴿أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدِۢ﴾ ئایا لەو کاتەدا ئێمە زیندوو ئەکرێینەوە لە دروست کردنەوەیەکی تازەدا؟ واتە نەخێر شتی وا زۆر دوورە و ناگونجێ، بێگومان ئەو جۆرە کەسانە ئەگەر ژیریی و بیریان تێك نەچووبێ و لەکار نەکەوتبێ و بەراوردێکی دووبارە کردنەوە بکەن لەگەڵ دروست کردن و داهێنانی یەکەم جاردا، ئەگەر تۆزێ بیر لەوە بکەنەوە ئەبێ هیچ سەریان سوڕ نەمێنێ لە زیندوو کردنەوە و بە دووری سەیر نەکەن، چونکە شتێکی ئاشکرایە لەیەکەم جارەوە لەشیان لە خاکەوە هاتووە، دەی بۆ دووبارە کردنەوەیان لە خاك دوورە و ناگونجێ؟ نەخێر دووبارە کردنەوەیان بە وێنەی یەکەم

جاره و جێگای سەرسوڕمان و سەر لێ کردنەوە نی یە، ﴿بَلۡ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمۡ كَٰفِرُونَ﴾ بەڵکو ئەوانە بێ بڕوان و دان نانێن بەڕاستی گەیشتنیان بە حوزووری خوای خۆیان و دادگای گەورەی ڕۆژی دوایی، بڕوایان بەوە نی یە بەهۆی ئەوەوە ئەوە ئەڵێن کە ئەیڵێن. ئەو بێ بڕوایی یە گومان و دوو دڵی خستووەتە دڵیانەوە لەو شتە ڕاستە گونجاوەی کە هەمیشە وێنەی ڕوو ئەدات بە پێش چاویانەوە لەم جیهانەدا. جا لەبەر ئەوە بەرپەرچی ڕەخنەکەیان ئەداتەوە، هەر بە باسی ڕاستی مردن و گەڕانەوەیان بۆلای خوا و هیچ رابەر و بەڵگەی لەسەر ناهێنێتەوە، بەهۆی ڕوونی و ئاشکرایی بەڵگە و رابەری بەهێزی پەیدا بوونی یەکەم جاریان لە خاک، ئەفەرموێ بە پێغەمبەر (ﷺ) ﴿قُلۡ﴾ بڵێ بەو بێ بڕوایانە: ﴿يَتَوَفَّىٰكُم﴾ ئەتانمرێنێ و گیانتان ئەکێشێ ﴿مَّلَكُ ٱلۡمَوۡتِ﴾ مەلائیکەی کاربەدەستی مردن ﴿ٱلَّذِي وُكِّلَ بِكُمۡ﴾ کە کراوە بە حەواڵە بۆ لا کراوی ئێوە و دیاریی کراوە بۆ گیان کێشانتان، ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ تُرۡجَعُونَ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە ئەگێڕێنرێنەوە بۆلای پەروەردگارتان لە ڕۆژی دوایی دا بە زیندوویی.

ئینجا ئەو مەلائیکە کێ یە؟ چۆن گیان ئەکێشێ؟ ئەوە شتێکی غەیبی یە و ماتوڵ قورئانەکە باسی نافەرموێ هیچ پێویست نی یە ئێمە لێ ی بدوێین، بەڵکو هەواڵەکە وەرئەگرین بە هەموو دڵنیایی یەکەوە لە قوڵایی دڵمان دا بە بێ زیاد و کەم.

ئینجا بە بۆنەی زیندوو بوونەوەوە کە ئەوانە ڕەخنەیان لێ ئەگرت یان گومان دار و دوو دڵ بوون تیای دا، بەو بۆنەیەوە وێنە و شێوەیەکی بەسەرهاتی زۆر سامناکی ئەو بێ بڕوایانە ئەهێنێتە بەرچاو، وەکو ئێستا ئەو کاتە بێت و بە چاو ببینرێ، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلۡمُجۡرِمُونَ نَاكِسُواْ رُءُوسِهِمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾ ئەگەر ئەبینی و سەرنج ئەدەیت لەو کاتەی کە تاوانبارەکان لە شەرم و خەجاڵەتی گوناهو تاوانیان سەریان شۆڕ ئەکەن لە حوزووری خوای خۆیان لەکاتی پرسیار و موحاسەبەدا، لە کاتێک دا ئەڵێن: ﴿رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا﴾ ئەی خوای پەروەردگارمان ئەوا بینیمان ئەوەی بەڵێنت پێ داین لە دنیادا، بیستمان لێت کە پێغەمبەرەکانت ڕاستیان کرد، یان ئەوا ئێستە بووین بە بینا و بیسەر لەپاش ئەوە لە دنیادا بە وێنەی کوێر و کەڕ بووین،

فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ﴿١٢﴾ وَلَوۡ شِئۡنَا لَأٓتَيۡنَا كُلَّ نَفۡسٍ هُدَىٰهَا وَلَٰكِنۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ
مِنِّي لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴿١٣﴾

---

**﴿فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا﴾ کەواتە بمانگێڕەوە بۆ دنیا کردەوەی چاك ئەکەین، لە دنیادا نەزان بووین و بێ بڕوا ﴿إِنَّا مُوقِنُونَ﴾ بەڕاستی ئێمە باوەڕدارین بە ڕێك و بە بێ گومان و دوو دڵی، ئەگەر ئەبینی لەو کاتەی ئەو تاوانبارانە ئەوەیان بەسەر دێت شتێکی وا ئەبینی کە ئێجگار سەخت و ترسێنەرە. پەنا ئەگرین بەخوا لەو ڕوو ڕەشی و شەرمەزاری یە کە دێت بەسەر ئەو تاوانبارانە، لەو بیم و ترس و دڵە لەرزەی کە داگیریان ئەکات، ئەو نائومێدی و بەش بڕاوی یە کە سزاو ئازاریان چەند چەندانە ئەکاتەوە. خوا بە بەزەیی خۆی بمانپارێزێ لەو بەدبەختی یە.**

**ئینجا پێش دەربڕینی وەڵامی لاڵە و کڕوزانەوەکەیان شتێ ڕوون ئەکاتەوە کە هەموو شتێ لە هەردوو جیهان دا بەستراوە پێ یەوە. ئەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ شِئۡنَا لَأٓتَيۡنَا كُلَّ نَفۡسٍ هُدَىٰهَا﴾ ئەگەر بمانویستایە هەموو کەسێ هۆی باوەڕ هێنان و ڕێگای ڕاست دانەبەری خۆیمان پێ ئەدا. بەم ڕەنگە بە جۆرێ دروستی ئەکردن تەنها بۆ ڕێگای ڕاست دەستیان بدایە بە وێنەی مەلائیکە کە دەست نادەن بۆ باوەڕ و گوێ ڕایەڵی نەبێت. بەڵام خواهیش و مەیلی خوا وابوو کە ئەم ئادەمی یە بە جۆرێ دروست بکات دەست بدات بۆ خێر و چاکە و بۆ شەڕ و خراپە بە ئارەزوو و مەیلی خۆی بتوانێ کام بار و ڕێگا هەڵبژێرێ، خوا خۆی زانیویەتی کە زۆر لە بەندەکانی لە جن و ئادەمی بە خواهیش و مەیلی خۆیان ڕێگای بێ باوەڕی و خراپە ئەدەنە بەر، لەبەر ئەوە بڕیاری دا کە دۆزەخ پڕ بکات لەو تاوانبارانە وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِنۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ مِنِّي لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ﴾ بەڵام لە لایەن منەوە بڕیار دامەزراو جێگیر بوو کە بێگومان دۆزەخ پڕ ئەکەم لە جن و ئادەمی بە کۆمەڵ و پێکەوە.**

فَذُوقُواْ بِمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَآ إِنَّا نَسِينَٰكُمْ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْ سُجَّدًا وَسَبَّحُواْ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ

ئەو تاوانبارانە کە بە شەرمەزاری و سەرشۆڕی ئەچنە حوزوری خوا و لە دادگای گەورەدا ئەوەستێنرێن، ئەو تاوانبارانە لەوانەن کە ئەو بڕیارەیان لەسەر دەرچووە و تێپەڕی کردووە. لەبەر ئەوە لەو کاتە سەختەدا سیخی سەر ژەهراوی ئەکرێ بە بەنوکەی دڵیان دا و ئەوتری پێ یان: ﴿فَذُوقُواْ بِمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَآ﴾ کەواتە بچەژن بەهۆی لەبیر چوون و لە بیر نەبوونتان بە گەیشتن و دووچار بوونی ئەم ڕۆژەتان، گوێ پێ نەدان و خۆ ئامادە نەکردنتان بۆی، ئێوە ماوە و مۆڵەت درا بوون، بچەژن ﴿إِنَّا نَسِينَٰكُمْ﴾ بەڕاستی ئێمەش وەکو لەبیرچوو ڕەفتارمان لەگەڵ کردوون و ئەیکەین بە بێ بەزەیی و گوێ پێدان، ﴿وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ بچەژن سزای نەبڕاوەی هەمیشەیی بەهۆی ئەوەی کردتان لە دنیادا.

ئینجا پەردەیەك ئەمێنێ بەسەر ئەو تاقمە بەد بەختەدا و لێ یان بێ دەنگ ئەبێت لەپاش ئەو وشە سامناکەی کە درا بە گوێچکەیان دا با بکەون لەناو سزای سەخت و چارەنووسی بەدبەختی خۆیان دا هەتا هەتایە بێ دەنگ بوو لەو تاقمە و شێوە و وێنەیەکی تر ئەخاتە بەرچاو لەبارێ ترەوە کە تام و بۆن و کردەوەیەکی تری تیایە بە شێوەی خواپەرستە لە خواترسەکان کە بە بیم و دڵە لەرزەو ئومێد و چاوەڕوانی یەوە خواپەرستی ئەکەن و خوایش پاداشتێکی بۆ داناون کە هیچ کەس رادە و پلەی بەرزی نازانێ لەم جیهانەدا. ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا﴾ باوەڕی تەواوی نی یە بە ئایەتەکانی ئێمە مەگەر ئەو کەسانەی کە کاتێ ئامۆژگاری بکرێن ﴿خَرُّواْ سُجَّدًا﴾ ئەکەون بەسەر ڕوودا بە سوژدە بردنەوە لەبەر مل کەچی و لە بیم و ترس لە سزا و تۆڵەی سەختی خوا و بیر کردنەوە لە گەورەیی و دەسەڵات و زۆری بێ سنووری ﴿وَسَبَّحُواْ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ﴾ یادو باسی خوای خۆیان ئەکەن بە پاکی و خاوێنی هەر شتێ کە شایان نی یە بۆی لە کاتێك دا شوکرو سوپاسی ئەکەن بەسەر چاکە وبەهرەکانی کە سەر دەستە و بەرز و گەورەتری هەمووان ئایینی پاکی ئیسلامە و ڕێنموونی یانە بۆی،

وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾

﴿وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ﴾ ئەوانە خۆیان بە زل نازانن و مل پێچی ناکەن لە باوەڕ و گوێ ڕایەڵی. ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ﴾ تەنیشتیان خۆی دوور ئەخاتەوە و بەرز ئەبێتەوە لە جێگا وبان و شوێنی خەوتنیان، واتە لە شەودا کە کاتی ئارام گرتن و ڕاکشان و خەوتنە ئەوانە هەڵئەسن و ڕاست ئەبنەوە لە ژێر جێگای خۆش و گەرم و نەرم بۆ شەو نوێژ کردن، ﴿يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا﴾ لەکاتێك دا نزاو پاڕە و لاڵە ئەکەن لە خوای خۆیان بە ترس و ئومێد و چاوەڕوانی یەوە، ترس لە خەشم و تۆڵەی، ئومێد و چاوەڕوانی ی بەزەیی و لێ بوردنی.

ئەوانە خۆشی خەو و ئارام و ئیسراحەت نایانگرێ و تەمەڵیان ناکات، چونکە بەهۆی باوەڕە ڕاستەکەیانەوە کاری خۆشتریان بە دەستەوەیە کە بریتی یە لە وەستان لە حوزوری خواو یاد و پەرستنی خواو ڕوو کردنە خوا، ئەوەندە ئەم کارەیان بەلاوە خۆش و بەتامە خۆشی ی خەو و ئیسراحەتی لە پێش چاو خستوون و بێزارن لێ ی، ئەوەتا تەنیشتیان خۆی دوور ئەخاتەوە وەکو زۆر بێزار بێت لە خەوتن و ڕاکشان! ئەو خوا پێداوانە بەو هەستە پاکە و بەو سۆز و پەرۆشەوە، بەو بیم و ترس و ئومێدەوە شەو نوێژ ئەکەن و پاڕە و لاڵە ئەکەن لە خوای خۆیان، سەبارەت بە بەندەکانی خوایش خاوەن بەزەیین و بەشداریان ئەکەن لە سامان و دارایی خۆیان دا، هەرچۆنێ بە لەش خوا پەرستی ئەکەن هەروەها بە سامان و دارایش ئەیکەن وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾ هەندێ لەو سامان و دارایی یەی پێمان داون و کردومانە بە بەش و ڕۆزی یان، هەندێ لەوە ئەدەن بە خەڵکی و سەرفی ئەکەن لە ڕێگای خوادا.

فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٧﴾ أَفَمَن كَانَ مُؤۡمِنٗا كَمَن كَانَ فَاسِقٗا

ئەو باوەڕدارانە کە خاوەنی ئەو کردەوە پەسەندە و ئەو خوو رەوشتە بەرزانەن شایانن بەو میهرەبانی و پاداشتە تایبەتی یە کە دەست نیشانی بۆ ئەکات بەم فەرمودەیە: ﴿ فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ﴾ کاتێ ئەو باوەڕدارانە بەو جۆرە بوون کە باس کران بەهۆی ئەوە هیچ کەس ئاگادار نی یە و نازانێ بە چۆنێتی و رادەو پلەی ئەوەی داشاراوە و ئامادە کراوە بۆیان لە بەهەشت دا لەو نازو نیعمەت و رێزەی کە هۆی خۆشی و رووناکی چاوانن چاوی تێ ئەبڕێ و بۆ هیچی تر ناڕوانێ و لا ناکاتەوە بۆ هیچی تر. ﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ ئەوانە پاداشت ئەدرێنەوە بە پاداشت دانەوەبە هۆی کردەوەیە کە لەوە و پێش کردیان.

بەڕاستی شێوەی بەڵێن و پاداشتەکە زۆر گرنگە و لوتف و میهرەبانی یەکە ئێجگار گەورەیە، شایانە بەمە باوەڕداران بە ئەوپەڕی مل کەچی و خاکەساری یەوە بوەستن بەرامبەری ئەو موژدە گەورەیە کە زمان و پێنووسی ئێمە کۆڵ و کولە لە ئاستی و نازانێ چی بڵێ و بنوسێ، ئایا بەندەکانی خوا بە خۆیان و کردەوەکەیانەوە ئەبێ چی بن تا خوا بەو رایەدە نازو رێزیان بگرێ و بدات ئەگەر لەبەر بەزەیی و میهرەبانی بێ سنووری خۆی نەبێ؟

ئینجا بەرامبەر ئەو دوو وێنە و شێوەیە کە خستی یە بەرچاو: وێنە و شێوەی تاوانبارە بێ بەشە سەر شۆڕەکان، وێنەو شێوەی نازو رێزی چاکان، بەرامبەر ئەوانە و بەدوای ئەوانەدا دەست نیشان ئەکات بەڕاستی دانانی پاداشت و تۆڵە و بەدی هێنانیان کە تاوانباران وچاکان جیا ئەکاتەوە لە یەکتر لەم جیهانەدا یان لەو جیهان، ئەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن كَانَ مُؤۡمِنٗا كَمَن كَانَ فَاسِقٗا﴾ دەی ئایا کەسێ کە باوەڕدار بووبێ لەم جیهانەدا بە وێنەی کەسێکە کە دەرچووبێ لە ئیمان و باوەڕ، واتە لەپاش روون بوونەوە و دەرکەوتنی دووری ئەو دووانە لە یەکتر لە رەوشت و کرداردا دەی ئایا گومان ئەبرێ باوەڕدار کە باسی کردەوە و رەوشتی پاك و خاوێن و شیرینی کرا بە وێنەی فاسقێ دەرچوو لە باوەڕەکە باسی سیفەت و نیشانەی بەد و پیسی کرا؟ نەخێر هەرگیز ئەو دووانە بە وێنەی یەك تر نابن و گومانی یەکسانی یان ناڕاست و ناڕەوایە،

لَا يَسْتَوُۥنَ ﴿١٨﴾ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْمَأْوَىٰ نُزُلًۢا بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ
﴿١٩﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُواْ فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخْرُجُواْ مِنْهَآ أُعِيدُواْ فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُواْ
عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٠﴾

﴿لَا يَسْتَوُۥنَ﴾ ئەو دوو تاقمە یەكسان نین، یەكسان نین لە سروشت و هەست و ڕەوشت دا هەتا یەكسان بن لە بەرهەم و پاداشت و تۆڵەی كردەوەكانیان دا، باوەڕدارانی ڕاستەقینە سروشتیان پاك و ڕاستە و ڕوو لە خوان و كردەوە و ڕەفتاریان بە پێی بەرنامەی خوایە، فاسقەكان لادەر و تاراون لە خوا و ڕێگا ڕاستەكەی خوا، خراپە و ئاژاوە ئەنێنەوە لە زەوی و وڵات دا، كردەوەیان پێچەوانەی فەرمان و بەرنامەی خوایە، كەواتە هەرچۆنێ لەم جیهانەدا جیاوازن ئەبێ لەو جیهانیش دا لە پاداشت و تۆڵەدا بەم جۆرە بن كە ئەفەرموێ: ﴿أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْمَأْوَىٰ﴾ ئەوانەی كە باوەڕیان هێنا لەم جیهانەدا و كردەوە چاكەكانیان كرد ئەوە بۆیان هەیە بەهەشتانێ كە جێگا و شوێنی مانەوە و نیشتەجێی ڕاستەقینەن و ئەیانگرنە خۆیان یان مەبەست بەهەشتانێكی تایبەتین. ئەو بەهەشتانەیان بۆ هەیە ﴿نُزُلًۢا بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ بەخشش و پاداشت بەهۆی ئەو كردەوە چاكەی كردیان، ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُواْ﴾ ئەوانەی كە دەرچوون لە باوەڕ و گوێ ڕایەڵی بۆ خوا و باوەڕیان نەهێنا ﴿فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ﴾ جێ و شوێنی ئەوان تەنها ئاگرە لەباتی جێ و شوێنی تاقمی یەكەم، ﴿كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخْرُجُواْ مِنْهَآ﴾ هەموو جارێك كە ئەیانەوێ دەرچن لێ ی ﴿أُعِيدُواْ فِيهَا﴾ دووبارە ئەخرێنەوە تێ ی و ئەكرێنەوە بەناوی دا. ئەگێڕنەوە كە بڵێسە و شەپۆلی ئاگر لێ یان ئەدات لە ژێرەوە و بەرزیان ئەكاتەوە هەتا نزیك ئەكەونەوە لە كەنارو قاپی یەوە، ئینجا ئەكرێنەوە بە قووتا، خوا پەنامان بدات. فضیلی كوڕی عیاض ئەفەرموێ: سوێند بەخوا دەستیان زنجیر كراوەو بڵێسەی ئاگر بەرزیان ئەكاتەوە و مەلائیكەش ئەدا بەسەریان دا و ئەیانكاتەوە بەناوی دا ﴿وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ﴾ پێ یان ئەوترێ: بچەژن سزای ئاگرێ كە ئێوە بڕواتان پێ ی نەبوو، بە درۆتان ئەزانی، سەرباقی ئەو سزا و ئاگرە ئاوا تانە و تەشەریشیان لێ ئەدرێ بۆ سزادانی تایبەتی دەروونیان.

وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَآ

---

ئەوەیە پاشە ڕۆژ و چارەنووسی ئەو فاسقە بێ بڕوایانە لە ڕۆژی دوایی دا، لەگەڵ ئەوەدا وازیان لێ ناهێنرێ تا ئەوکاتە، ئەوەتا هەڕەشەیان لێ ئەکات بە سزای ئەم جیهانە پێش سزای ئەو جیهان، ئەفەرموێ: ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ﴾ سوێند بەخوا پێی یان ئەچەژێن هەندێ لە سزای زۆر نزیك، یان کەمتر وسووك تر واتە سزای بەسەرهاتی خراپی ئەم جیهانە ﴿دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ﴾ پێش سزای هەرە گەورە. واتە سزای ئەو جیهان کە هیچ سزایەکی تر پێی ناگات. بەڵام ئەم سزا پێشووە بۆنی بەزەیی لێ دێ، چونکە خوا لە هەموو کەس بە بەزەیی ترە و پێی خۆش نی یە بەندەکانی سزا بدا کاتێ ئەوان خۆیان شایان نەکەن بەهۆی تاوان و کردەوەی خراپی خۆیانەوە، کاتێ خۆیان سوور نەبن لەسەر هۆی سزای خۆیان، ئەوەتا هەڕەشەیان لێ لەکات بە سزادان و سزایان ئەدا لەم جیهانەدا ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ بەڵکو بگەڕێنەوە بۆلای خواو کۆتایی بێنن لە تاوان و بێ بڕوایی... سروشتیان بێدار بێتەوە، ئێش و ئازاری سزا بیانگێڕێتەوە بۆ ڕێگای ڕاست، ئەگەر وا بکەن دووچاری ئەو پاشە ڕۆژو چارەنووسی فاسق و تاوانبارانە نابن کە وێنە و شێوەکەیمان بینی لە ئایەتی پێشوودا، بەڵام ئەگەر پەند و مۆچیاری بکرێن بە ئایەتەکانی خوای خۆیان و ئەوان پشتی تێ بکەن، سزای بچووك و نزیك بدرێن و هەر نەگەڕێنەوە بێگومان ئەو کاتە زۆر تاوانبارو ستەمکارن، ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَآ﴾ ئایا کێ ستەم کار ترە لەو کەسەی کە پەند و مۆچیاری بکرێت بە ئایەتەکانی خوای خۆی کەچی پاش ئەوە ئەو ڕووی لێ وەرگێڕێ و پشتی تێ بکات؟ بێگومان ئەو کەسانە ئەو کاتە شایانن بۆ سزادان و تۆڵە لێ سەندن لە هەردوو جیهان دا.

إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَـٰبَ فَلَا تَكُن فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآئِهِۦ ۖ
وَجَعَلْنَـٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٣﴾ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا۟ ۖ

﴿إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ﴾ بێگومان ئێمە تۆڵە سێنەرین لەو تاوانبارانە یان ئێمە تۆڵە سێنەرین لەو تاوانبارانە چ جای کەسێ کە لە هەموو ستەمکارێ ستەمکارتر بێت... ئای هاوار بۆ ئەو هەڕەشە سامناکە کە خوای گەورەی خاوەن تۆڵە و سزای هەرە گەورە هەڕەشە بکات لەو بەندە بێ هێز و لاواز و بێ دەسەلاتانە، هەڕەشەیان لێ بکات بەو تۆڵە سەخت و سامناکە. ئینجا بە کورتی باسێکی موسا و گەلەکەی و پێغەمبەرێتی یەکەی ئەکات و دەست نیشان ئەکات بە کتێبەکەی کە خوا کردی بە رابەری ئیسرائیلی یەکان، هەرچۆنێ قورئانی کرد بە رابەری باوەڕدارانی ئەم ئوممەتە، دەست نیشان ئەکات بۆ یەکێتی و یەك گرتنی خاوەنی ئەم دوو کتێبە لەسەر یەك بنەڕەت و یەك عەقیدەی راستی دامەزراو، هەروەها دەست نیشان ئەکات بۆ هەڵبژاردنی خۆگر و باوەڕدارەکانی گەلەکەی موسا تا ببن بە پێشەوا بۆ گەلەکەیان. بێگومان پەند و ئامۆژگاری یە بۆ موسڵمانەکان لەو کاتەدا بە خۆگرتن و باوەڕی بەهێزی دامەزراو، بە روون کردنەوەی ئەو سیفەتەی کە بوو بە هۆی پێشەوایی و دەسەلاتیان لە زەوی دا. ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَـٰبَ﴾ سوێند بەخوا کتێبمان داوە بە موسا ﴿فَلَا تَكُن فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآئِهِۦ﴾ کەواتە لە گومان دا مەبە لە گەیشتنی تۆ بە کتێب و پێدانی کتێبیش بە تۆ. ﴿وَجَعَلْنَـٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ کتێبەکەی موسامان گێڕا بە رابەر و رێگا پیشاندەر بۆ گەل و نەوەی ئیسرائیل، ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا۟﴾ لەوان چەند پێشەوایەکمان دانا کە رابەری و رێنموونی خەڵکی دەکەن بە پێی فەرمانی ئێمە پێ یان کاتێ کە خۆیان گرتو بە ئارام بوون لە گوێ رایەڵی و فەرمانبەری دا،

وَكَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٢٥﴾

---

﴿وَكَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا يُوقِنُونَ﴾ کاتیٚ باوەڕی بەهیٚزیان بوو بە ئایەتەکانی ئیٚمە بە دامەزراوی دڵ و بە بیٚ گومان و دوو دڵی، مەبەست لەم ئایەتانە بەهیٚزکردنی دڵی پیٚغەمبەرە (ﷺ) تا خۆگر تر و دامەزراو تر بیٚت بەرامبەر سەرکیٚشی و ناڵەباری بیٚ بڕواکان، هەروەها دەست نیشانە بە تەمیٚ و مۆچیاری ئوممەتەکەی بە تایبەتی ئەو تاقمە کەمەی مەککە لە کاتی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانەدا – کە ئەمانیش خۆگر و باوەڕ بەهیٚز بن تاوەکو هەڵبژیٚراوەکانی ئوممەتی تەورات بکریٚن بە پیٚشەوا و کاربەدەست. ئەم ئایەتە بە چەند جۆریٚ تریش تەفسیر کراوەتەوە و هەموو هەر باشە و ئەگونجیٚن بەلاّم دڵ بەمەی کە وترا بە ئارام ترە.

لەناو پیٚغەمبەرەکانی تردا کە خاوەن کتیٚب بوون بە تایبەتی موسای باس کرد – دروودی خوا لەسەر هەمووان بیٚت – یان لەبەر ئەوە کە کتیٚبەکەی گەورە و فراوان تر بووە، کەواتە پەیوەست ترە بە قورئانەوە کە گەورەتر و فراوان ترینی هەموو کتیٚبەکانی خوایە، یان لەبەر ئەوەیە موسا لە هەموو پیٚغەمبەران سزا و ئەرك و مەینەتی بەتین تر بووە، چونکە لەلایەن بڕوادار و بیٚ بڕواوە سزا و ئازار درا، کەواتە بۆ دڵ بەهیٚزکردن و دڵخۆشی دانەوە و باس کردنی موسا ریٚك تر و باشترە، یان لەبەر ئەوەیە چەرخی نزیك تر بووە لە چەرخی پیٚغەمبەرەوە و جوولەکەیش – کە خۆیان بە شویٚن کەوتووی موسا و تەورات دائەنیٚن – لەو خاکەدا بوون، کەواتە باسی موسا دەم کوت کردنی ئەوانی تیا بوو، عیسا – دروودی خوای لەسەر بیٚت – هەرچەند چەرخی نزیك تر بوو بەلاّم جوولەکە بڕوایان پیٚی نەبوو، کەواتە باسی موسا ریٚك ترە کە لەلایەن جوولەکەو نەسرانی و موسڵمانانەوە باوەڕ پیٚ کراوە. ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ [1] بیٚگومان خوای تۆ بڕیار ئەدات لە نیٚوان بەندەکانی دا لە ڕۆژی دوایی دا، ڕاستان جیا ئەکاتەوە لە ناڕاستان، لەوەی کە لە ئەم جیهانەدا دووبەرەکی بوون تیای دا لە کاروباری ئاییناندا.

---

[1] هەندیٚ ئەفەرموون: مەبەست بەم ڕاناوە ئیسرائیلی یەکانە کە لە پاش موسا بوون بە چەند بەش و کۆمەڵیٚکی جیاوازی ئاژاوە دلر.

لەپاش ئەو دەست نیشانە ئینجا ئەگەڕێتەوە سەر بێ بڕواکانی ئەم ئوممەتە سەرنجیان ڕائەکێشێ بۆ گەلە بێ بڕواکانی ڕابوردوو کە بەهۆی تاوانباری یانەوە لەناو بران. بەڵکو ئەمان تەمێ خوار بن و لادەن لە ڕێگای ئەوان، ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْقُرُونِ﴾ ئایا ئەوانە بێ ئاگان و ڕێگای ڕاست و پاشەڕۆژی ڕوون نەکردووەتەوە بۆیان کە ئێمە لە پێش ئەمان زۆرمان لەناو برد لە گەل و کۆمەڵی تاوانباری چەرخەکانی ڕابوردوو ﴿يَمْشُونَ فِى مَسَٰكِنِهِمْ﴾ لە کاتێك دا کە هاتوچۆ ئەکەن و ئەگەڕێن بە شوێن ماواکەیان دا؟ واتە بێ ئاگا نین و ئەبوایە لەوانەوە تەمێ خوار ببونایە، چونکە لەناوبردنی ئەو بێ بڕوا و تاوانبارانە باوی نەگۆڕاوی خوا نیشان ئەدات سەبارەت بە هەموو بێ بڕوا و تاوانباران لە هەرکات و چەرخێك دا بن، ئەم ئادەمی یە مل کەچە بۆ چەند یاسایەکی دامەزراو لە گەشە کردن و سیس بوونی دا، لە لاوازی و بەهێزی دا، قورئانی بەفەڕ ئاگاداری ئەکات لەسەر دامەزراوی ئەو یاسایانە و نەگۆڕاوی ئەو باو و ڕەوشتانی خواو لەناوبردنی چەرخەکانی ڕابردوو و دروشم و نیشانە و جێ و شوێنیان لەپاش وێران بوون و داڕزانیان، یان ئەوانەیان کە بە چۆڵی ماونەتەوە، لەوانە چەند پێشانگایە ئەخاتە بەرچاو بۆ تەمێ دادان و بێدار کردنەوەی دڵ و دەروون، بۆ هەڵگیرساندنی هەست کردن، ترسان لە سزا و دەست وەشاندنی خوا لە مل هوڕ و تاوانبار، هەروەها چەند پێشانگایە ئەخاتە بەرچاو لەبارەی دامەزراوی یاسا و باوی خوا، بەهۆی ئەوەوە ڕادەی تێگەیشتن و بەراوردی ئادەمی بەرز ئەبێتەوە، ئەو ڕژێمە دامەزراوەیان لەبیر ناچێ لە ژیانی ئادەمی دا. ئەگەرچی زۆر لە خەڵکی بیر لەوە ناکەنەوە و تەمێ خوار نابن هەتا تووشی ڕۆژی سەختی خۆیان دێن و دووچاری وێنەی چارەنووس و پاشەڕۆژی بەد بەختی چینە ڕابوردووەکانی خۆیان دێن. بێگومان شێوە و دروشمی شوێنی وێرانە دڵی ئاگا و هەستی بینا دائەچڵەکێنێ و دەمار و دەروون ئەهێنێتە لەرزە. ئەو تاقم و گەلەی کە یەکەم جار ئەم قورئانەی چوو بە گوێچکەدا هاتوو چۆو گوزەریان ئەکرد بە جێ و شوێن و وڵاتە وێران بووەکانی تائیفەی عاد و سەمود و شوێنەوار و دروشمی شارەکانی (لوط) یان ئەدی، کەچی لەگەڵ ئەوەدا دەروونیان نەئەهاتە جۆش و سام و ترسی خوا نەئەکەوتە دڵیان و بیمیان نەئەکرد لە دووچار بوونی وێنەی سزای ئەو گەلە لەناو براوانە، لەبەر ئەوە قورئان بەو شێوە پرسیارە بێزاری دەربڕی لێ یان کە تەمێ خوار نابن،

إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ ۖ أَفَلَا يَسْمَعُونَ ﴿٢٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاءَ إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ فَنُخْرِجُ
بِهِ زَرْعًا تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَامُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ ۖ أَفَلَا يُبْصِرُونَ ﴿٢٧﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ﴾ بەڕاستی لەو بەسەرهاتی ئەوانەدا چەند رابەر و نیشانەی روون و زۆر گەورە هەیە ﴿أَفَلَا يَسْمَعُونَ﴾ ئایا ئەوانە نابیسن ئەم هەموو ئایەت و پەند و ئامۆژگاری یەی کە ئێمە ئاراستەیان ئەکەین؟ واتە با ببیستن بە بیستنی تێگەیشتن و وەرگرتن و گوێ رایەڵی.

لەپاش ئەو هەموو بیم و ترس و لەرزەی کە خستی یە دڵ و دەروون بەهۆی پێشانگای لەناوبردن و وێران کردنەوە ئینجا دەماری گیان ئەخاتە بەرچاو کە لێ ئەدات و ئەکەوێتە جوڵان لەو شتانەی کە وشك و بێ گیانن، گەردش ئەکات بە خەڵکی لە وڵات و زەوی یە مردووەکان دا کە بەرە بەرە گیانیان تێ دێت، هەرچۆنێ گەردشی پێ کردن لە و وڵات و خاکانەی کە لە پێشەوە زیندوو بوون و لە پاشان مردن و رزان هات بەسەریان دا، ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاءَ إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ﴾ ئایا ئەوانە نەیان دیوە کە ئێمە ئاو ئەنێرین بۆ زەوی یە کە وشك و برینە و گیان و رواوی نی یە و بڕاوە، ﴿فَنُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا﴾ ئینجا بەهۆی ئەو ئاوەوە دەرئەهێنین رواو و کشت و کاڵێك ﴿تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَامُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ﴾ کە لێ ی ئەخوات چوار پێ و ماڵاتیان و خۆیشیان، ﴿أَفَلَا يُبْصِرُونَ﴾ دەی ئایا ئەوانە نابینان و بەهۆی ئەوەوە ئەو شتە سەر سوڕهێنەرە نابینن و بیکەن بە رابەر و بەڵگەی روون لەسەر دەسەڵاتی بێ سنووری خوا و چاکە و بەهرەی بێ شومار و فراوانی. با چو بدڕنەوە و ئەو زەوی یە وشك و برین و مردووە بەرچاو بکەن، بەهۆی ئەوەوە ئەو دەستە قودرەتە ببینن کە ئەو ئاوە زیندووکەرەوە ئەنێرێ بۆلای ئەو زەوی یە، لە پاش ئەوە ئەبێ بە زەوی یەکی شیرینی رازاوەی دڵڕفێن بەهۆی ئەو هەموو شینایی و کشت و کاڵ و گوڵ و گوڵزارەوە کە جگە لەو جوانی و شیرینی

به ژیان خۆیان و چوار پێ و ماڵاتەکانیشیان لەسەر راگیرە، بێگومان بینینی شتی وا نایاب و دڵبەرە و بیر کردنەوە لێ ی کون و کەلەبەری دڵ داخراوەکان ئەکاتەوە بە مەرجێ زیندوو بن بۆ هەست کردن بە شیرینی و تەڕی و ناسکی ئەو گیانەی کە کرا بە بەری ئەو زەوی یە مردووەدا، هەست کردن بە بەخشندەیی ئەو گیانە، بە هەستی خۆشەویستی و نزیکی و سۆزی دەروونەوە، لەگەڵ هەست کردن بەو هێزو دەسەلاتە داهێنەرە و ئەو دەستە لێزانە کاردروستە، کە گیان و شیرینی و جوانی بڵاو ئەکاتەوە و نەخشەی ئەکێشێ بەسەر لاپەڕەکانی بوون و بوونەوەردا.

ئا بەم جۆرە قورئان سەرنجی دڵ رائەکێشێ و چەرخەی پێ ئەکات و ئەیگێڕێ بە جێگا و شوێنی گیان و گەشە کردن دا، لەپاش ئەوە سەرنجی راکێشا و گێڕای بە جێ و شوێنی وێران بوون و کاول کردن دا، بۆ ئەمەی هەستیان بهێنێتە جۆش و سۆز و پەرۆش لێرە و لەوێ، بۆ بێدار کردن و خەبەر بوونەوە لەو بێ هۆشی یەی کە پەیدا بووە بەهۆی ئولفەت و دەق پێوە گرتنەوە. پاکی و بێگەردی لە هەموو لەکەیە بۆ ئەو خوایەی کە ئەم قورئانەی ناردە خوارەوە.

لەپاش ئەو هەموو رابەر و نیشانە روونانە کە لەم سورەتەدا خرایە بەرچاو، ئەو هەموو چەرخە و گەردشەی کە کردی بە دڵ و دەروون، ئینجا کۆتایی سورەتەکە ئەهێنێ بە باسی پەلە نانەوەی بێ بڕواکان بە هاتنی ئەو سزایەی کە هەڕەشەیان لێ ئەکرا پێ ی، باسی گومان و دوو دڵییان ئەکات لەڕاستی ئەو ترساندنەی کە ئاراستەیان ئەکرێ، بەرپەچیان ئەداتەوە و ئەیانترسێنێ بە بەدی هاتنی ئەو هەڕەشەیە، لە رۆژێك دا ئیمان و باوەڕ هێنانیان سوودیان پێ ناگەیەنێ، مۆڵەت نادرێن بۆ بەسەر و گرتنی ئەوەی لە دەستیان چووە، ئینجا سورەتەکە دوایی ئەهێنێ بە پەند و ئامۆژگاری پێغەمبەر (ﷺ) کە روویان لێ وەرگێڕێ و گوێ یان پێ نەدا و لێ یان گەڕێ بۆ چارەنووسی چار نەکراوی بەرگری نەکراوی خۆیان،

وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْفَتْحُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٨﴾ قُلْ يَوْمَ ٱلْفَتْحِ لَا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟
إِيمَٰنُهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَٱنتَظِرْ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ ﴿٣٠﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْفَتْحُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ [1] ئەوانە ئەڵێن: ئایا کەی ئەم بڕینەوەی ئاژاوەی ئێمە و ئێوە ئەبێت و کەی ئەم هەڕەشەی ئێوە ئەیکەن بەدی دێت ئەگەر ئێوە راست گۆن؟

ئەوانە هەڵخەڵەتا بوون بەهۆی مۆڵەت دران و دواخستنی بەدی هێنانی ئەو هەڕەشەی کە قورئان لێ ی ئەکردن، لەبەر ئەوە بە لاقرتی و بە نیازی بە درۆ خستنەوە و بەر لێ بڕینەوەپەلەیان ئەنایەوە و ئەو پرسیارەیان ئەکرد، نەزان و بێ ئاگا بوون لە لێزانی و کاردروستی خوا و هۆی دواخستن و مۆڵەت دانیان، نەیان ئەزانی کە بەدی هاتنی ئەو هەڕەشەیە کاتی دیاریی کراوی خۆی هەیە و بە لاقرتی کردن و پەلە نانەوەی ئەوانە نە پێش ئەکەوێ و نە دوا، لەو کاتەدا نە بەرگری ئەکرێت و نە رزگار بوون هەیە لێ ی، وەکو ئەفەرموێ: ﴿قُلْ يَوْمَ ٱلْفَتْحِ لَا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِيمَٰنُهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێ یان لە رۆژی ئەو بڕینەوە و بەدی هاتنەدا باوەڕ هێنانی ئەوانەی کە کافر و بێ باوەڕ بوون هیچ سوودیان پێ ناگەیەنێ، ئەوانە ئیتر مۆڵەت نادرێن، واتە ئەوانە لەو کاتەدا بە ناچاری باوەڕ ئەهێنن، بەڵام تازە هیچ کەڵکی لێ وەرناگرن و کار لە کارەگا ترازاوە و ئەو بەد بەختانە هەلیان لە دەست چوە، باوەڕ هێنانی ناچاری و کاتی نائومێدی خوا وەری ناگرێ، وەکو باوەڕهێنانەکەی فیرعەون کە خوا لێ ی وەرنەگرت. ئیتر ئەو رۆژە لەم جیهانەدا بێت کاتێ کە خوا ئەیانگرێ بە کافری کە ئیتر مۆڵەت دانی نی یە و باوەڕهێنان سوودی نی یە، یان ئەو رۆژە رۆژی دوایی بێت کاتێ کە داوای مۆڵەت دان و گەڕانەوە ئەکەن بۆ ئەم جیهانە و داواکەیان وەرناگیرێ.

ئەم وەڵامە رێکە لەگەڵ پرسیارەکەدا بە گوێرەی مەبەستەکەیان کە پەلە نانەوەیە بۆ لاقرتی کردن و بە درۆ خستنەوە، دەی مەبەست لە وەڵامەکەش ئەمەیە: پەلە مەکەن بێگومان

---

[1] وشەی ﴿فتح﴾ بە دوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە: زاڵ بوون و سەرکەوتن، گرتنی مەککە، بەڵام ئەوەی لە تەفسیرەکەدا بەهێزترە.

ئەو رۆژە دێت و ئێوەش باوەڕ ئەهێنن و سوودیشی نی یە بۆتان، داوای مۆڵەت ئەکەن و مۆڵەت نادرێن. لەڕاستی وەڵامێکی زۆر سامناکە بیم و ترس ئەخاتە ئەو دڵ و دەروونانەی کە ئاگادارن و بێ هۆش نین، خوا بە بەزەیی خۆی پەنامان بدات. ﴿فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾ ئەی پێغەمبەر کەواتە گوێ یان مەدەرێ و هیچ نرخێ دامەنێ بۆ لاقرتی و بێ بڕوایی یەکەیان و خۆت خەریك مەکە پێ یانەوە و لێ یان گەڕێ بۆ رۆژی خۆیان ﴿وَٱنتَظِرۡ﴾ چاوەڕوانی بکە، چاوەڕوانی زاڵ بوون و سەرکەوتن بەسەریان دا و ژێر کەوتن و لەناو چوونیان. ﴿إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ﴾ بێگومان ئەوان چاوەڕوانن بۆ سەرکەوتنیان و لەناو چوونی تۆ.

الحمد لله دوایی هات و لێ بوومەوە لە تەفسیری ئەم سورەتە گرنگە لە رۆژی ١٩٨٢/٢/١٧ هەر لەم رۆژەدا دەستم کرد بە سورەتی ﴿الأحزاب﴾ داوا ئەکەم لە خوای بەزەیی دار و میهرەبان وەری گرێ و یارمەتیم بدات بۆ ئەوەی کە ماوە آمین.

وصلی الله و سلم علی سیدنا و مولانا محمد و آله و صحبه آجمعین.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ

## سورەتی (الأحزاب)
## مەدینەیی و ۷۳ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتە بەشێکی گرنگ لە ژیانی گەلی موسڵمانی تیایە، لەماوەی پاش رووداو و غەزای بەدری گەورە تا پێش سوڵحی (حدیبیە) و شێوەیەکی رێك و راستی ژیانی ئەو ماوەی موسڵمانان دەرئەخات، رووداوی زۆری ئەو ماوەیە باس ئەکات کە ژیانی ئەو ماوەیە روون ئەکەنەوە، ئەو رێگا و رچەو رێبازەی کە دای هێنا دانی پیانا بۆ گەلی موسڵمانی تازەی داهاتوو وەکو لە کاتی تەفسیری ئایەتەکان روون ئەبێتەوە.

لەیەکەم جارەوە دەست پێ ئەکات بە تەمێ و ئامۆژگاری پێغەمبەر (ﷺ) بە لە خواترسان لەهۆی نارەزایی خوا و بە گوێ نەکردنی کافران و ناپاکان، شوێن کەوتنی ئەوەی خوا سروشی کرووەتە لای، پشت بەستنی تەنها بەخوا، ئەمەیە سەرەتایە کە هەرچی لە سورەتەکەدا هەیە پەیوەستی ئەکات پێ یەوە، ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ * يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ﴾ ئەی پێغەمبەر هەمیشەیی و بەردەوام بە لەسەر لەخوا ترسان و خۆپاراستن لەوەی هۆی نارەزایی خوایە.

ئایینی ئیسلام بریتی یە لە تەنها کۆمەڵێ رێنموونی و پەند و ئامۆژگاری، یان تەنها کۆمەڵێ ئاداب و خو و رەوشت، یان تەنها کۆمەڵێ یاسا و قانون، یان تەنها کۆمەڵێ رێگا و رچە و بار و باو... بێگومان ئەوانە هەموو ئەگرێتەوە و هەمووی تیایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیش دا ئیسلام بریتی نی یە لەوانە هەموو، بەڵکو ئیسلام بریتی یە لە مل کەچی، مل کەچی بۆ خواهیش و بریاری خوا، ئامادەیی هەر لە یەکەم جارەوە بۆ فەرمان بەری خوا و گوێ رایەڵی هەموو فەرمانێ، بۆ شوێن کەوتنی ئەو بەرنامەی کە دایناوە بە بێ لاکردنەوە بۆ لای هیچ

لایەکی تر و وەرگرتنی هیچ تەمێ و ئامۆژگاری یەکی تر، بە بێ پشت بەستن بە هیچ کەسی تر بێجگە لە خوا، ئەوەش هەست کردنە هەر لە یەکەم جارەوە بەمەی کە ئادەمی لەم زەوی یەدا ئەبێ گەردن کەچ بێت بۆ تەنها خواهیش و بڕیاری خوا کە داهێنەر و بەڕێوەبەری بوونی خۆیان و ئەم زەوی یە و هەموو ئەو بوونەوەرە گەورە و فراوانەیە. ئەوەش زانین و باوەڕی ڕێك و راستە بەمەی کە ئادەمی بە هیچ کلۆج هیچ ڕێگا و باری تری نی یە بێجگە لە شوێن کەوتن و بەجێ هێنانی فەرمانی خوا و وازهێنان و کۆتایی هێنان لە هەر شتێ خوا قەدەغە و بەرگری کردووە، دەست گرتن و بەکار هێنانی ئەو هۆیانەی کە خوا فەراهەمی هێناون، ئینجا چاوەڕوانی هەر بەرهەمێ کە خوا بڕیاری دابێ... ئەم هەست و باوەڕە بەو جۆرە کە باس کرا بناغە و بنەڕەتێکە کە هەموو شتی تری لەسەر راگیرە، ئیسلام عەقیدە و باوەڕێکە کە شەریعەت و هەموو بڕیارەکان لەو هەڵئەقوڵێ، لەسەر ئەو شەریعەت و بڕیارانە رژێمی پەیدا و راگیر ئەبێ، بەم سێ شتە کە پێکەوە کۆ بوونەوە و پەیوەست بوون و پێکەوە کەوتنە ئیش ئایینی پاکی ئیسلام بەدی دێت لە ژیان دا...

جا لەبەر ئەوە یەکەم تەمێ و فەرمان لەم سورەتەدا کە ژیانی کۆمەڵایەتی موسڵمانان ئەهۆنێتەوە بە دانانی چەند یاسا و ئادابێك، یەکەم تەمێ بۆ لەخوا ترسان و هەست کردن بوو بە ئاگاداری خوا، ئەو فەرمانە رووی کرایە پێغەمبەر (ﷺ) و ئاراستەی ئەو کرا کە راگەیەنەر و پارێزەرە بۆ ئەو شەریعەتەی پێ ی رەوانە کراوە، کەواتە ئەبێ ئەو یەکەم فەرمانبەر و گوێ رایەڵ بێت بۆ خوا، ئەبێ ئەو مامۆستای فێرکردن و پەروەردە کردن بێت و چاو لێ کراو و پەیڕەوی کراو بێت، فەرمووی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ﴾ کەواتە لە خوا ترسان و هەست کردن بە ئاگاداری خواو گەورەیی خوا بنەڕەتی یەکەمە، پاسەوانێکی وریا و ئامادەیە لە قوڵایی دڵ و دەروون دا بۆ گوێ رایەڵی و بەجێ هێنان، هەموو تەمێ و داوا و ئەرکێ کە خراوەتە سەرشان بەستراوە و پەیوەست کراوە بەو پاسەوانەوە. تەمێ و ئامۆژگاری دووەم قەدەغە کردن و بەرگری یە لە بەرگری کردن و گوێ رایەڵی کافران و ناپاکان، شوێن کەوتنی تەمێ و تەگبیر و راوێژیان،

﴿وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١﴾ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾

**گوێ گرتن بۆ راو هاندانیان:** ﴿وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ﴾ واته ئەی پێغەمبەر گوێ رایەڵ مەبە بۆ ئەوانەی ئاشكرا كەر و دەربڕی باوەڕی خۆیانن، ئەوانەی ناپاكن و داشاردەری بێ باوەڕی خۆیانن...

پێشخستنی ئەم بەرگری یە لە فەرماندان بە شوێن كەوتنی سروشتی خوا وا ئەگەیەنێ كە زۆرە زمایی كافر و مونافیقەكانی مەدینە و دەوروبەری لەو كاتەدا زۆر سەخت و بەتین بووە، لەبەر ئەوە پێویست بوو بەو بەرگری یە. ئینجا با بزانرێ كە ئەم بەرگری یە ماوەتەوە و هەیە و هەر ئەمێنێ لەناو هەموو گەل و تاقمێك و لە هەموو چەرخێك دا، باوەڕداران ئەترسێنێ لە شوێن كەوتنی ئەو كافر و مونافیقانە بەهیچ رەنگ، لەبارەی عەقیدە و یاسا و رژێمەوە بە شێوەی تایبەتی، تا بەرنامەكەیان بمێنێتەوە بە پاك و خاوێن بۆ خوا، بە بێ تێكەڵی هیچ شتێكی تر. نابێ هیچ باوەڕدارێ بخەڵەتێ بەو پێش كەوتنەی كە ئەوانە هەیانە لە زانیاری و بەراورد كردن و ئەو زانینە رواڵەتی یەی كە دەستیان كەوتووە، نابێ هیچ باوەڕدارێ بەوە بخەڵەتێ و بە هۆی ئەوەوە شوێنی ئەو كافر و مونافیقانە بكەوێ لە بەرنامەی ژیان دا و هیچ رژێم و باو و یاسایەكی ئەوان وەرگرێ وەكو زۆر لە بەناو موسڵمانەكان ئەو شوێن كەوتنە رەوا ئەدەن بۆ خۆیان، چونكە خوا بەرنامەی داناوە بۆ ژیان، بێگومان تەنها بەرنامەكەی خوا رێك و راست و شایانە بۆ شوێن كەوتن، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ بێگومان خوا هەمیشە زانا و لێزان و كاردروستە و هەموو كار و فرمانی پڕ لە بەرژەوەندی یە. تەمێ و ئامۆژگاری سێ یەم ئەمەیە: ﴿وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ ئەی پێغەمبەر شوێنی ئەوە بكەوە كە سروش كراوەتە لات لە لایەن پەروەردگارتەوە. كەواتە تەنها لەوتەرەفەوە تەمێ ومۆچیاری بێت، تەنها ئەو سەرچاوە شایانە بۆ پەیڕەوی و شوێن كەوتن.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا﴾ چونکە بێگومان خوا هەمیشە ئاگادار و زانایە بەوەی ئێوە ئەیکەن. کەواتە سروشتەکەی لە زانین و ئاگاداری یەوە هاتووە بە خۆیشتان و بە کردەوەکانیشتان، خوا زانایە بە کردەوەکانتان بە شێوە راستەقینەکەیان، زانایە بە هۆ و پاڵ پێوە نەرتان بۆ هەر کردەوەیەکتان، کەواتە شتێکی سروشت کردووە کە تەنها بەوە کردەوەتان رێك و راست ئەبێتەوە، بێ پێویستتان ئەکات لە هەر شتێکی تر. تەمێی چوارەم و دواترین لێرەدا ئەمەیە: ﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ﴾ پشت بەخوا ببەستە و هەموو کاروبارت حەواڵەی خوا بکە ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا﴾ بەسە خوا بە پارێزەری و حەواڵە بۆلاکراوی کاروباری... کەواتە با گوێت نەبێ لەوە ئەوانە لەگەڵت بن یان دژت هەڵسن، گوێت نەبێ لە پیلان و فڕ و فێڵیان... گێڕانەوەی هەموو کارێ بۆلای خوا و پشت بەستن تەنها بەو، بنەڕەتێکی پتەوی دامەزراوە بۆ ئارام و بەهێز بوونی دڵ، بەهۆی ئەوەوە سنووری خۆی ئەناسێ و لە هەموو شتێك دا لەسەر ئەو بنەڕەتە ئەوەستێ و دائەمەزرێ، بە هەموو باوەڕی بەهێز و ئارامەوە دوا رۆژی خۆی و کردەوەکانی واز لێ ئەهێنێ بۆ خاوەنی هەموو کارو فرمان و هەموو تەگبیر و چارەسەرێك.

ئەم سێ شتە گرنگە: لەخواترسان، شوێن کەوتن و پەیڕەوی سروشی خوا، پشت بەستن بە خوا و گێڕانەوەو حەواڵە کردنی کاروبار بۆلای خوا — لەگەڵ دوورە پەرێزی و جولانەوە بە پێچەوانەی کافران و منافیقان — ئەم سێ شتە گرنگە توێشووی دوا نەهاتووی بانگ کەرانی رێگای خوایە، وەرگێڕکەر و پارێزەری بانگ و بانگەوازەکەیەتی لەسەر بەرنامە روون و رەوان وپاك و خاوێنەکەی خوا. لەلای خواوە، بۆلای خوا، لەسەر خوا و بە پشتیوانی خوا. ئەم ئایەتانە هەرچەند بە بۆنەی رووداوێکی تایبەتی یەوە هاتبنە خوارەوە بەلام تایبەتی نابن بەو هۆیەوە، بەڵکو لەسەر شێوە گشتی یەکەی خۆیان ئەمێننەوە، وەکو هەموو وێنەکانیان، کەواتە پێویست نی یە بە باس کردنی ئەو هۆیە. ئینجا ئەو تەمێ گرنگانەی دوایی ئەمێنێ بە شتێکی براوە کە وەرئەگیرێ و هەستی پێ ئەکرێ بە روونی،

ئەفەرموێ: ﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ﴾ خوا دروستی نەکردووە بۆ هیچ پیاوێك دوو دڵ لەناو سکی دا، بەڵکو هەرکەس تەنیا دڵێکی هەیە، کەواتە پێویستی هەیە بە تەنیا بەرنامەیەك کە لەسەری بێت، پێویستە یەك تێگەیشتن و زانینی گشتی هەبێت بۆ ژیان و بوون کە لەو بەرنامەیە وەری گرێ، پێویستە یەك تەرازووی هەبێ کە نرخ دار و بێ نرخی پێ کێشانە بکات. رادە و پلەی هەموو شتی پێ بەراورد بکات و تاقی بکاتەوە، ئەگەر نا بەش بەش ئەبێت و لاری و ناپاکی بەکار ئەهێنێ، لەسەر یەك رێگا و بار راناوەستێ و دانامەزرێ.

هیچ کەس ناتوانێ ئاداب و خووڕەوشتی لە سەرچاوەیە وەرگرێ و یاسا و قانونی لە سەرچاوەیەکی تر، کاروباری کۆمەڵایەتی و ئابووری لە سەرچاوەیەکی تر، تێگەیشتن و بیر و باوەڕی لە سەرچاوەیەکی تر، ئەو تێکەڵ و پێکەڵی یە ئادەمی یەك فەراهەم ناهێنێ کە تەنیا دڵێکی هەبێ، بەڵکو بەش بەش و پارە پارە ئەبێت و هەر بەشێکی بۆلایەك ئەڕوا و هیچی بەسەر هیچەوە ناهێنێ. خاوەنی عەقیدە و باوەڕ ناتوانێ خۆی بە خاوەن عەقیدەی راستەقینە دابنێ و کەچی خۆی داڕنی لە پێویستیاتی عەقیدەکەی و ئەو شتانەی عەقیدەکەی ئەیەوێ و داوای ئەکات و بە نرخە بەلایەوە، ناتوانێ وشەیەك بڵێ یان بزووتنەوەیەك بکات، یان نیازێ بێنێ کە بڕیاری عەقیدەکەی لەسەر نەبێ – ئەگەر ئەو عەقیدەیە بەڕاستی بەدی هاتبێ لە دەروونی دا – چونکە خوا تەنها دڵێکی پێداوە، کە ئەبێ لە هەموو بار و رووبەکەوە تەنها لە سەرچاوەیەك هەموو شتێك وەرگرێ.

خاوەنی عەقیدەی راستەقینە سەبارەت بە کردەوەیەکی بڵێت: ئەمە لە لایەن خۆمەوە کردم و شتێکی خۆیی خۆمە، سەبارەت بە کردەوەیەکی تر بڵێت: ئەمە ئەکەم بە ناو و سیفەتی موسڵمانیم! وەکو باوە لەناو پیاوانی رامیاری و یان پیاوانی شەریکەکان، یان پیاوانی ئەو هەموو جەمعیەتانەی ئەمڕۆ کە ئەتوانن کردەوەکانیان دابەش بکەن بە دوو جۆر و دوو بەشی جیاواز!

خاوەن عەقیدە تەنها کەسێکە و تەنها دڵێکی هەیە، یەك عەقیدە و باوەڕی تیایە، یەك زانین و تێگەیشتنی هەیە بۆ ژیان، تەنیا تەرازوویەکی هەیە بۆ تاقی کردنەوە و بەراورد کردن. هەموو کردەوە و هەرشتێك روو بدات لێ یەوە ئەبێ بە پێی زانین و تێگەیشتنێ بێت کە لە عەقیدە و باوەڕەکەیەوە هەڵقوڵاوە و وەری گرتووە، لە هەموو کاتێك دا بە بێ جیاوازی. بەو تەنیا دڵەوە ئەبێ بژی بە تەنیا، لەناو ماڵ و خێزان، لەناو گەل و کۆمەڵ دا، لە دەوڵەت دا، لە جیهان دا، بەو تەنیا دڵەوە ئەژی لە پەنهانی و لە ئاشکرادا، بە کرێکاری و خاوەن کارگەیی، بە حاکمی و سەرۆکی و بەرایەت و ژێر دەستەیی، لە خۆشیو ناخۆشی دا... کەواتە بە هیچ رەنگ تەرازووی دەستی ناگۆڕێ، زانین و تێگەیشتنی ناگۆڕێ... چونکە تەنها دڵێکی هەیە...

جا لەبەر ئەوە یەك بەرنامەی هەیە و یەك رێگای هەیە، رووی بۆ تەنها لایەکە، یەك باری هەیە کە بریتی یە لە مل کەچی بۆ خوای پەروەردگار بە تاك و تەنیا، کەواتە تەنیا دڵی دوو خوا ناپەرستێ بەڵکو یەك خوا ئەپەرستێ، خزمەتی یەك گەورە ئەکات، بە یەك رێگادا ئەڕوات ئەگەر نا بەش بەش ئەبێت و سەر لێ شێواو و دڵ دانەمەزراوە!

لەپاش ئەو بڕیارە بەهێزە بڕاوە کە دای لەبارەیی دیاریی کردنی بەرنامە و رێگا، ئینجا دەست ئەکات بە هەڵوەشاندنەوە و نەهێشتنی دوو شت کە باو بووە لەوە و بەر لە چەرخی نەزانی دا، بۆ ئەمەی گەل دامەزرێنێ و راگیری بکات لەسەر بنەڕەتی ماڵ و خێزانی روون و راست و بێ گرێ. یەکێ لەو دوو شتە ناڕەوا کە باو بووە پێی ئەوترێ: ﴿ظهار﴾ واتە پیاو ئەیوت بە ژنەکەی: تۆ وەك پشتی دایکم وایت. واتە قەدەغەی لێم هەرچۆنێ دایکم قەدەغەیە لێم. لەو کاتەوە ئەوەی ئەوت ئیتر ئەو ژنە قەدەغە ئەبوو لە مێردەکەی هەتا هەتایە، لەپاش ئەوە هەروا ئەمایەوە بە بەسراوەیی نە تەڵاقی دەکەوت تا بچێ شوو بکات، بە ژنی پیاوەکەش نەئەمایەوە، ئەوەش ستەم و دڵ رەقی یەکی زۆر بەتینە، ئەوە بەشێ بوو لەو ستەمانەی کە لە چەرخی نەزانی دا بەکار ئەهێنرا دەربارەی ئافرەت، ئەو سزا و توند و تیژی یەی کە پێی ئەچەژرا.

وَمَا جَعَلَ أَزْوَاجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔي تُظَٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمْ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ

ئینجا کاتێ ئیسلام دەستی کرد بە ڕێك و پێك کردن و دانانی ڕژێمی کۆمەڵایەتی و لە چوار چێوەی خێزانەوە دەستی پێ کرد، خێزانی دانا بە بنەڕەت و یەکەم خشتی کۆشکی کۆمەڵ، بە گرنگی سەرنجی دا و چاودێریی ئەو پەروەردگاریەی کرد کە خەڵکی تیا پێ ئەگات. کاتێ دەستی کرد بەوە ئەو ستەم ناڕەوایی یەی لەسەر شانی ئافرەت بوو هەڵی گرت، ئەو پەیوەندی یانەی گۆڕی بە جۆرێ کە شایان بێت و دادی تیا بێت، یەکێ لەوانە دانانی ئەم یاسایە بوو. ﴿وَمَا جَعَلَ أَزْوَاجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔي تُظَٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمْ﴾ ژنەکانتان کە ﴿ظهار﴾ یان لەگەڵ ئەکەن خوا نەیگێڕاون بە دایکتان. چونکە ئەوەی کە ئەیڵێن بە ژنەکانیان: تۆ وەك پشتی دایکم وایت، قسەیەکی رووتە و قسەی رووتیش حەقیقەتی شتی پێ ناگۆڕێت، سروشتی پەیوەندی وەرناگەڕێ، کەواتە دایك هەر دایکە و ژن هەر ژنە، لەبەر ئەوە ﴿ظهار﴾ نەبوو بە هۆی قەدەغە کردنی هەمیشەیی و هەتا هەتایی بە وێنەی دایك وەکو لە چەرخی نەزانی دا ئەکرا بەهۆی ئەوەوە، بەم یاسایە ناڕەوایی ئەو باوەی دەرخست، هەڵوەشاندنەوەی ئەو باوە بە روونی و دانانی حوکم و بڕیاری خوا لە سورەتی ﴿المجادلة﴾ دا هاتە خوارەوە، کەواتە لێرە پێویست نیە بە باس کردنی.

دووەم باوی ناڕەوا ناو ئەبرێ بە ﴿تبني﴾ واتە گێڕان و وەرگرتنی بێگانە بە کوڕ بۆ کابرایەك و پەیوەست کردنی بە خۆیەوە، بە جۆرێك بە کوڕی ئەو کەسە بانگ ئەکرا. لەگەڵ ئەوەدا گەلی عەرەب لەو کاتەدا بەناو بانگ بوون بە شانازی کردن بە داوێن پاکی، شانازی بە نەسەب و نەژادی پاك و حەڵاڵ لەگەڵ ئەوەدا بێگومان لەناو ئەو گەلەدا چەند کەس و کوڕێ بوون باوکیان ناسراو نەبوون و کەس نەیئەزانی کوڕی کێن؟ هەرکەس هەرکام لەوانەی پێ خۆش بوایە ئەیکرد بە کوڕی خۆی، بە کوڕی خۆی بانگی ئەکرد، تێکەڵی نەسەب و نەژادی خۆی ئەکرد و ئەیکرد بە میرات بەری خۆی. هەروەها چەند کوڕێ تر هەبوون باوکیان ناسراو

بوون، بەڵام کابرایەکی تر یەکێ لەوانەی ئەکرد بە کوڕی خۆی، تاوای لێ ئەهات بە کوڕی ئەو کەسە ئەناسرا و بانگ ئەکرا. زۆرتر ئەم جۆرەیان لەو منداڵانە بوون کە لە جەنگ و تاڵان دا ئەگیران، ئینجا هەرکەس کامی پێ خۆش بوایە ئەیکرد بە کوڕی خۆی، ماف و پێویستی کوڕێتی بۆ رەوا ئەدرا ئەویش هەڵئەسا بە ئەرکی کوڕێتی.

زەیدی کوڕی حاریثە لەم بەش و تاقمە بوو، لە تائیفەی (کلب) بوو، بە منداڵی لە تاڵان دا گیرا، ئینجا حکیم کوڕی حزام کڕی بۆ خدیجەی کچی خویلد کە خوشکی باوکی بوو – خوا لێ ی رازی بێت – ئینجا کاتێ بوو بە خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) زەیدی بەخشی پێ ی: لە پاشان باوك و مامەی زەید هاتن بە شوێنی دا و داوایان کرد و پێغەمبەریش (ﷺ) سەربەستی کرد و رای دایە دەستی خۆی، زەیدیش – خوای لێ رازی بێت – پێغەمبەری هەڵبژارد بەسەر باوك و مامەی دا، ئینجا ئەویش ئازادی کرد و کردی بە کوڕی خۆی، خەڵکی پێ یان ئەوت: زەیدی کوڕی محمد. یەکەم کەس کە باوەڕی هێنا لە ئازاد کراوەکان دا زەید بوو – خوای لێ رازی بێت –، ئینجا کاتێ ئیسلام دەستی کرد بە دامەزراندن و داڕشتنی ماڵ و خێزان لەسەر بنەڕەتی سروشتی خۆی، پەیوەندی و پەیوەستی دیاریی کرد... ئەم باوەیشی نەهێشت و هەڵی وەشاندەوە، پەیوەندی و پەیوەستی گێڕایەوە بۆلای هۆ راستەقینەکانی خۆی... پەیوەندی خوێن و باوکی و کوڕی راستەقینە. فەرموی: ﴿وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ﴾ ئەوانەی بە قسەی رووت کردوتانن بە کوڕی خۆتان و بەناوی باوکی خۆیانەوە بانگیان ناکەن، ئەوانە خوا نەیکردوون بە کوڕی ئێوە، ﴿ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْ﴾ [1] ئەوانەی کە ئەیڵێن و باس کرا وتە و وتنی خۆتانەو بە دەمی رووتی خۆتان ئەیڵێن و لە راستی دا هیچ نی یە و هیچی تیا بەسەر نی یە، ﴿وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ﴾ خوا شتێ ئەڵێ کە راستە و هەیە. خوا شتێ ئەفەرموێ کە بە هیچ رەنگ ناڕەوا و ناحەق نزیکی ناکەوێتەوە. هەندێ لەو شتە راست و رەوایانە ئەوەیە کە بە قسەی رووت کەس ناکات بە کوڕی کەس و ئەو باوەی نەهێشت، بەڵکو کوڕێتی دامەزراندەوە لەسەر بنەڕەتی خوێن و گۆشت،

---

[1] دەست نیشان بۆ کراو هەر سێ شتە رابوردووەکەیە یان دووەمە یان سێ یەمە و بە هەر سێ جۆر وتراوە و هەرکام ئەگونجێ و باشە و بەڵام سێ یەم باشتر ئەچێتە دڵەوە.

وَهُوَ يَهْدِي ٱلسَّبِيلَ ﴿٤﴾ ٱدْعُوهُمْ لِآبَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ
فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ۚ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا
تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ

---

﴿وَهُوَ يَهْدِي ٱلسَّبِيلَ﴾ خوا ڕێنموونی ئەکات بۆ ڕێگای ڕاست، کەواتە با بەندەکانی خوا واز بێنن لە قسەی خۆیان و شوێنی قسە و بڕیاری خوا بکەون، یەکێ لە قسە و بڕیارەکانی خوا ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿ٱدْعُوهُمْ لِآبَآئِهِمْ﴾ ئەوانە کە بە قسەی ڕووت کراون بە کوڕی کەسێ تر و بەناوی یەوە بانگ ئەکرێن، ئەوانە بە ناوی باوکەکانی خۆیانەوە بانگیان بکەن، چونکە ﴿هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ﴾ بانگ کردنی بە ناوی باوکی ڕاستەقینەی خۆیانەوە زۆر ڕاستە بەلای خواوە، ڕاست و ڕێکە بۆ باوکەکە ئەو ڕۆڵەیە بەش و پارچەیەکە لەو. ڕاست و ڕێکە بۆ کوڕەکەش کە ناوی باوکی خۆی هەڵگرێ، میرات و کەلەپوری ئەو وەرگرێ، ڕێك و ڕاستە لەگەڵ حەق و ڕاستی دا کە هەموو شتێ لە شوێنی خۆی دائەنێت، هەموو پەیوەندی یە لەسەر بنەڕەتی سروشتی خۆی دائەمەزرێنێ و ڕاگیری ئەکات، باری هیچ لایەك بەرەلا ناکات و مافی هیچ مافدارێك ژێر پێ ناکات، ئەیەوێ باوکی ڕاستەقینە هەڵسێ بە ئەرکی باوکی، کوڕی ڕاستەقینە هەڵسێ بە ئەرك و پێویستی کوڕێتی.

ئای ئەمەیە ڕژێمێ کە زۆر بە گرنگی سەرنجی ماڵ و خێزان ئەدات و هەموو کاروباری ڕێك و پێك ئەکات... هەر ڕژێمێ دان نەنێ بە ماڵ و خێزان و خۆی بێ ئاگا بکات لە سروشتی ماڵ و خێزان ئەوە ڕژێمێکی لاواز و نەگەیشتووە بە ئامانج و گەل و کۆمەڵی بێ

بنەڕەتە و دەست نادات بۆ ژیانی کامەران و ژیانی ئادەمی یانە بەسەر نابات.[1] لەبەر ئەوەی لە سەردەمی نەفامی دا فەوزا و بێ سەر و پێی هەبووە لەبارەی پاك و خاوێن کردنی ماڵ و خێزان و کردەوەی مێردی، کە ئەوەش ئەبێتە هۆی تێکەڵ و پێکەڵی نەسەب و خێزان، هۆی دیاریی نەبوون و نەناسینی باوکی راستەقینە لە هەندێ کات دا، جا لەبەر ئەوە ئیسلام لەو بارەیشەوە کارەکەی ئاسان کرد، لەکاتێك دا کە خەریکی هۆنینەوە و رێك و پێك کردنی خێزان بوو، داهێنانی رژێمی کۆمەڵایەتی لەسەر بنەڕەتی ماڵ و خێزان، ئەو کارەشی ئاسان کرد بەم رەنگە بڕیاری دا سەبارەت بەوانەی باوکیان نەناسراوە بە برای ئایینی و دۆست و خۆشەویست بانگ بکرێن، ئەفەرموێ: ﴿فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ﴾ ئینجا ئەگەر باوکی ئەوانەتان نەناسی تا بانگیان بکەن بە ناویانەوە ﴿فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ﴾ ئەوانە براتانن لە ئایین دا ئەگەر باوەڕیان هێنا بێت و دۆست و خۆشەویستانن لە ئایین دا یان ئازاد کراوەکانتانن ئەوەش بۆ دڵخۆش کردنیان. واتە بە یەکێ لەو دوو سیفەتە بانگیان لێ بکەن و ناویان بەرن، قەدەغە کرا بەناوی باوکە دەست کردەکانیانەوە بانگیان لێ بکەن کە بە قسەی رووت کران بە باوك، یان هەرکەسێ تر کە باوکی راستەقینەی نەبێت، ﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ﴾[2] هیچ گوناهتان لەسەر نی یە لەو بانگ کردن و ناوبردنەی کە هەڵەتان پێ کردبێ و بە هەڵە و نەزانین گوتبێتتان لە پێش بەرگری کردنتان، یان لە پاش دا و لە بیرتان نەبێ یان زمانتان هەڵکەوتبێ ﴿وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ﴾ بەڵکو گوناهتان لەسەر لەوەی کە بە دڵ و دەست قەست و نیەتتان لەپاش ئەوەی بەرگری کەران،

---

[1] رژێمی شیوعی ویستی و هەوڵی زۆری دا کە دان نەنێ بە یاسای خێزان و نەیکات بە بنەڕەت بۆ گەل، بەهۆی ئەوەوە پێی هەڵکەوت و هەڵخلیسکا و کارەکەی بۆ نەڕۆی، لەگەڵ ئەوەدا یاسای ئەو رژێمە هەر هەیە بە یاوەرو بیر، بەڵام سروشت بەرگری ئەکات و بەرە بەرە خەریکە سەر ئەکەوێ و زاڵ ئەبێ بە تەواوی بەسەر ئەو رژێمەدا!!

[2] بە سێ جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام دڵ بەوە بە ئارام ترە کە لە تەفسیرەکەدا وتراوە، خوا باش ئەزانێ.

﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ خوا هەمیشە لێ بوردوو و داشاردەری گوناهە و بەزەیی دارە، کەواتە ئەبورێ لە هەڵە کەر و بەندەکانی تەنگەتاو ناکات، بەرهەمی ئەو دوو سیفەتەی لە ئاسمانی کەرەمی دێتە خوارەوە بە تایبەتی بەسەر ئەوانەدا کە ئەگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگاریان.

لەم ئایەتانەدا روون ئەبێتەوە کە هەرچۆنێ دروست نی یە کەس بکرێ بە کوڕی هیچ کەس کە باوکی راستەقینەی نەبێ، هەروەها دروست نی یە هیچ کەس خۆی دابنێ و ناو ببا بە کوڕی هیچ کەس بێجگە لە باوکی راستەقینەی خۆی، بەڵکو هەرکەس وا بکات دووچاری گوناهێ ئەبێت لە گوناهە گەورەکان، توند و تیژیی زۆر کراوە لەو بابەتەوە لە حەدیس دا، بێگومان ئەوەش شتێکی زۆر رێك و راست و شایانە لەگەڵ بە گرنگ گرتنی ئیسلام سەبارەت بە خێزان و نەسەب و نەژاد و پاك و خاوێن کردنیان لە هەموو گومان پێ بردنی ناڕەوا و دەخەڵی، پەرژین کردنیان بە هەموو هۆی رێك و راستی و دامەزراوی بەمێز، تا گەلێکی بەمێزی پاك و خاوێن و پەیوەست فەراهەم بێت کە دارێژراو بێت لەسەر بنەڕەتێکی بەتینی دامەزراو.

ئینجا هەرچۆنێ رژێمی ﴿تبني﴾ هەڵوەشاندەوە کە باس کرا، هەروەها رژێمی برایەتیشی هەڵگرت کە ئیسلام دای هێنا لە یەکەم جاری چەرخی مەدینەوە، بۆ چارەسەر کردنی داماوی و بێ نەوایی کۆچ کەرانی مەککە کە سامان و هەموو شتی خۆیان بەجێ هێشت بوو لە مەککە، ئینجا بە دانانی ئەو رژێمی برایەتی یە کۆچ کەران بوون بە هاوبەش لەماڵ و سامانی برا مەدینەیی یەکان، هەروەها نەمێشتن و سڕینەوەی ئەو رژێمی برایەتی یە بۆ چارەسەر کردن و بەرەنگاری حاڵەتی ناوخۆی موسڵمانەکانی مەدینە لەوانەی کە بەهۆی موسڵمان بوونیان پەیوەندی یان پچڕا بوو لەگەڵ خزم و خێزانیان، ئەوانە باس ئەکات لەگەڵ بڕیار دانی خۆشەویستی و دۆستایەتی گشتی بۆ پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) لەلای سەرووی هەموو خۆشەویستی و دۆستایەتی لەم جیهانەدا، لەگەڵ بڕیار دانی دایکێتی رۆحی حەرەمەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هەموو بڕواداران،

ئەفەرموێ: ﴿ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْۖ﴾ پێغەمبەر شایانترە بۆ بڕواداران لە خودی خۆیان بۆ خۆیان، ئەو خاوەن تر و ماف دار ترە بەسەریانەوە تا خۆیان بۆ خۆیان ﴿وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْۗ﴾ خێزانەکانی دایکی بڕوادارەکانن لە ڕێز و قەدردا. بێگومان کۆچ کەران لە مەککەوە هاتن بۆ مەدینە، هەموو شتێکیان بەجێ هێشت و دەستیان نا بە هەموو شتێکەوە لە پێناوی عەقیدە و ئایینەکەیان دا، ئایینەکەیان هەڵبژارد و باویان دا بەسەر خزمایەتی و دارایی و سامان و هەموو هۆی ژیان و یاد و بیرەوەری منداڵی و سۆز و خۆشەویستی هاوەڵ و هاوڕێ، ئاین و عەقیدەکەیان لەگەڵ خۆیان برد و بەس، ئیتر خۆیان رووت کرد لە هەموو شتێکی تر، ئەوانە بەو کۆچ کردنە لەسەر ئەو بار و شێوە کەس نەیدوە بوون بە وێنە و نموونەیەکی راستەقینەی بەدی هاتوو لە ژیان و زەوی دا بۆ پێك هاتنی عەقیدە لە شێوە تێر و تەواوەکەی دا، بوون بە ئاوێنەیەکی بێگەرد و بێ لەکە بۆ دەرکەوتن و ناسینی رادە و پلەی بەرزی عەقیدە، زاڵ بوون و داگیر کردنی دڵ و دەروون بە جۆرێ بەشی هیچ کەس و هیچ شتێکی تری تیا نەمێنێتەوە. هەروەها لە مەدینەدا بەشێ لەمە رووی دا لە شێوەیەکی تردا، ئەوە بوو چەند کەس لە چەند ماڵێ موسڵمان بوون، ئەوانی تر لەسەر بت پەرستی مانەوە بەهۆی ئەوەوە پەیوەندی موسڵمانەکان پچڕا لەگەڵ کەس و کار و خزم و خوێشە بت پەرستەکانیان، بەهەرحاڵ پەیوەستی بنەماڵە شێوا و گۆڕا، شێوان و گۆڕان بە فراوانتر رووی دا لە پەیوەندی و پەیوەستی کۆمەڵایەتی دا، گەلی ئیسلامی هێشتا تازە بوو، دەوڵەتی ئیسلام لە بیر و باوەڕێکی بەهێزەوە نزیك تر بوو تا ئەوەی ڕژێمێ بێت دامەزراو و دوایی نەهاتوو، ئینجا لەوێدا شەپۆل و رادەی هەست و سۆزی دەروون بەرز بوویەوە بەرامبەری ئەو عەقیدە تازەی، بەجۆرێ دای بەسەر هەموو سۆز و هەستێکی تردا و داگیری کردن بۆ

ئـەوەی تـەنها عەقیـدە و ئـایین بـبیٚ بـە هـۆی پەیوەسـتی دڵ و دەروون، جێگـری هـەموو خزمایەتی و خوێن و بەرژەوەندی و دۆستایەتی و تیرە و زمان بێت، ئینجا لەوخاوەن عەقیدە و ئایینە کۆمەڵێکی یەك دڵ و یەك بار فەراهەم هات کە نووسا بوون پێکەوە بە سۆز و بەزەیی و کۆمەکی و قۆڵگیری، ئەوەش نەك بەهۆی دانانی یاسا و فەرمانی دەوڵەت، بەڵکو بەهۆی پاڵ پێوە نەرێکی دەروونی وەسیەتێکی بەرزی پاك و خاوێن کە لە سنووری باوی ئادەمی دەرچوو بوو، بەرز بوو بووە لە ژیانی عادەتی یان. کۆچ کەران هاتنە ناو برا مەدینەیی یەکانیان، ئەوانیش چوون بە پێشوازیانەوە و جێگایان کردنەوە لە دەروون و نیشتەجێ ی خۆیان دا، لە سامان و دارایی یان دا، بە جۆریٚ بوو بە پچڕ پچڕ لەناویان دا، بە سەرە و بە قورعە دابەش کران، چونکە ژمارەی کۆچ کەران کەمتر بوون لە برا مەدینەیی یەکانیان کە بەشداریان کردن لە هەموو شتێك دا بە ڕەزامەندی و خۆشی دەروون، بەبیٚ چنگ قوچان، بەبیٚ شانازی و منەتنان و ڕووپامایی!!

پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) برایەتی خستە نێوان چەند پیاویٚ لە کۆچ کەران و چەند کەسیٚ لە مەدینەیی یەکان، ئەو برایەتی یە هۆی تاقانە و یەکێتی و پەیوەستی بوو لە مێژووی ئادەمی دا لە هێز و پاکی و ڕاستی دا، ئەو برایەتی یە بوو بە وێنە و جێگری برایەتی نەسەب و خوێن، لە میرات بەری و هەموو مافێکی تر کە لە برایەتی نەسەب و خوێنەوە روو بدات و پەیدا ببیٚ.

ئەو هەستە بەرزە لەناو موسڵمانەکان دا گەیشتە پۆپەی هەرە بەرز، موسڵمانەکان ئەو پەیوەندی یە تازەیان زۆر بە گرنگ گرت – وەکو هەموو کارو فەرمانێکی تری کە ئیسلام پێ ی بهاتایە – ئەو برایەتی و پەیوەندی یە تازە هەڵسا بە دامەزراندن و پێگەیاندنی گەلی ئیسلامی و پاراستنی لە هەموو ناتەواوی و ناڕێکی، باشتر و بە کەڵك تر و بەکار تر بوو لە دەوڵـەتێکی بـەهێزی دامـەزراو بـۆ بـەڕێوە چـوونی هـەموو کاروبارێکیـان، کەواتـە دانـان و داهێنانی ئەو پەیوەندی و برایەتی یە زۆری پێویست بوو لەو چەرخ و کاتە تایبەتی یەدا بۆ

پارێزگاری ئەو گەلە ساوا و تازەیە، بێگومان هەستی وا بەرز و بەتین زۆر پێویستە بۆ پەیدا بوون و راگیر بوونی هەموو گەل و کۆمەڵێك لەو جۆرە چەرخ و کاتە تایبەتی یانەدا، هەتا دەوڵەتێکی بەهێز و یاسا و قانونێکی دامەزراو پەیدا ئەبێت و جێگیر ئەبێت بۆ چارەسەر کردنی هەموو گیرو گرفت و پێویستی بێگومان ئیسلام زۆر بە گرنگ سەرنجی ئەو هەستە بەرزە ئەدات لەناو گەلەکەی دا، ئەیەوێ سەرچاوەی لە دڵ دا هەڵقوڵێ بە بێ وەستان، لەگەڵ ئەوەدا ئەیەوێ گەلەکەی هەڵسێنێ و راگیری بکات لەسەر بنەڕەتی توانین و لێ هاتنێ کە باوە بۆ ئادەمی نەك لەسەر بنەڕەتێکی تایبەتی کە بۆ کات و چەرخێکی تایبەتی بەکار دێت.

جا لەبەر ئەوە قورئان ئەو رژێمی برایەتی یەی هەڵوەشاندەوە و سڕی یەوە لەگەڵ تۆزێ حاڵەتی ژیان گۆڕا لە مەدینەدا لەپاش غەزای بەدر، کاروباری دەوڵەت دامەزرا، باری ژیانی کۆمەلایەتی رووی کردە چاك بوون، چەند هۆیەکی رەوا پەیدا بوو بۆ ژیان و رۆزی و گوزەران، هەموو کەس ئەندازێ چارەسەری ژیانی کرا، بە تایبەتی لە پاش دەرکردنی تائیفەی (بەنی قینقاع) و دەست کەوتی ماڵ و سامانەکەیان، قورئان تەنها بەو گۆڕانی باری ژیانی و بەو ئەندازە چارەسەر بوونە ئەو رژێمەی هەڵگرت و سڕی یەوە لەبارەی میرات بەری و گرتنە گەردنی ئەرکی بەخێو کردن و ئەو شتانەی تر کە بەهۆی برایەتی نەسەبەوە بەرپا ئەبوون، تەنها سۆز و بەزەیی و خۆشەویستی یەکەی هێشتەوە، بۆ ئەمەی هەرکات پێویستی و ناچاری روویدا ئەو رژێمە بکەوێتە ئیش، کەواتە میرات بەری و شتەکانی تری گێڕایەوە بۆ برایەتی نەسەبی کە ئەوە شتێکی سروشتی یە و شایان ترە و لە کتێبی خوادا ئەوە بڕیار دراوە بە ئەسڵ و بن چەق، وەکو ئەفەرموێ:﴿وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ ﴾[1] ئەوانەی خزمی یەکن بە مەرجێ موسڵمان بن بۆ میرات و هەر مافێ تر کە بە خزمایەتی وەرن گرن، لە کتێبی خوادا ئەوانە شایانتر و ماف دارن لە باوەڕداران و کۆچ کەرانی بێگانە کە تەنها بەهۆی ئیمان و باوەڕەوە ئەو مافانە وەرگرن.

---

[1] مەبەست بە کتێبی خوا (لوح المحفوظ) ە یان ئەم ئایەتە یان ئایەتەکانی میرات وەرگرتن یان بڕیاری خوایە.

إِلَّآ أَن تَفۡعَلُوٓاْ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِكُم مَّعۡرُوفٗاۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَسۡطُورٗا ﴿٦﴾ وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمۡ

ئینجا وەسیەت جیا ئەکاتەوە لەو مافانە بەمەی بۆ بێگانە و میرات نەبەر شایانترە تا خزمە میرات بەرەکان، ئەفەرموێ: ﴿إِلَّآ أَن تَفۡعَلُوٓاْ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِكُم مَّعۡرُوفٗاۚ﴾ [1] لە هەموو چاکە و مافێك دا خزمەکان شایان ترن مەگەر لە وەسێت کردن بە شتێ کە بیگەیەنن بەو دۆست و خۆشەویستانەتان کە براتانن لە ئایین دا بۆ ئەوە ئەمان شایانن، چونکە خوا بەشی میرات بەری دیاریی کردو ئیتر پێویست ناکات بە وەسێت بۆ کردن ﴿كَانَ ذَٰلِكَ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَسۡطُورٗا﴾ [2] ئەو حوکم و بڕیارەی کە لەم ئایەتەدا باس کرا لەلایەن خواوە هاتووە و نووسراوە لە کتێبی ئەودا کە ناگۆڕێ و ناسڕێتەوە، هەرچەند شتی تری بڕیار دابێ لە کاتێکی تایبەتی دا لەبەر هۆیەکی تایبەتی کە بەرژەوەندی تیا بێت لەو کاتەدا، خوا خۆی زانیویەتی کە ئەو حوکم و بڕیارە کاتی یە ناهێڵی و کارەکە ئەگێڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی تەرازووە ڕاستەکەی خۆی کە دەست نادات بۆ بژارە و دەست تێ خستن.

لە یەکەم جاری ئایەتەکەوە دۆستایەتی و خۆشەویستی و کاربەدەستی گشتی بڕیاردا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە رادەیەك دا کە بەهێز تر و پێش خراو بێت لە خزمایەتی گۆشت و خوێن، بەڵکو لە رۆح و گیان، ئینجا دایکێتی رۆحی و هەستی بڕیاردا بۆ حەرەمەکانی لە رێز و بە گەورە گرتن و قەدەغە کردن بە وێنەی دایکی نەسەبی و خوێن و گۆشت، ئەوەی بڕیاری دا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) شتێکی گشتی یە نەخشەی بەرنامەی ژیان ئەگرێتەوە بە تێکڕایی،

---

[1] تەفسیرەکە لەسەر ئەوەیە کە ئیستیسنای موتەسیل بێت، بە مونقەتیعیش تەفسیر کراوەتەوە و بە هەردوو رێك و جوانە، لەسەر هەردوو زۆریە لەسەر ئەوەن کە مەبەست بە وشەی ﴿معروف﴾ وەسێت پێ کراوە، تاقمێ ئەفەرمون: تایبەتی نی یە بەمەوە بەڵکو بەخشینی پێش مردنیش ئەگرێتەوە.

[2] هەندێ دەست نیشان بۆ کراو بە (ذلك) گشتی ئەکەن بۆ حوکم و بڕیاری پێش ئەم ئایەتەیش، هەروەها چەند رایەك هەیە لە مەبەست بە وشەی (الکتاب) ئایا (لوح المحفوظ) ە یان قورئانە یان تەوراتە.

لەوەدا کاروباری باوەڕدارانی گێڕاوەتەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگایان نی یە هیچ شتێك بۆ خۆیان هەڵبژێرن بێجگە لەوەی بۆی هێناون لە لایەن خواوە: ﴿لا يؤمن احدكم حتي يكون هواه تبعا لما جئت به﴾ ئەوەی بڕیاری داوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هەست و سۆزیشیان ئەگرێتەوە، کەواتە ئەبێ شەخسی ئەو خۆشەویست تر بێت بەلای باوەڕدارانەوە لە خۆیان، کەواتە نابێ دەست بنێن بەوەوە لە پێناوی گیانی خۆیان دا، نابێ لە دڵ و دەروونیان دا هیچ کەس و هیچ شتێ لەم جیهانەدا لە پێش تر بێت لە پێغەمبەر (ﷺ): ﴿والذي نفسي بيده لا يؤمن احدكم حتى اكون احب إليه من نفسه و ماله و ولده و الناس اجمعين، قال عمر يا رسول الله و الله لأنت احب إلى من كل شيء إلا من نفسي، فقال (ﷺ) لا يا عمر حتي اكون من نفسي، فقال (ﷺ): الآن يا عمر.[1] ئەوەش هەروا قسەیەکی رووت نی یە بەدەم بوترێ، بەڵکو پلە و پایەیەکی بەرزە دڵ نایگاتێ مەگەر بە لوتف و یارمەتی خوا، چونکە ئادەمی وا دروست کراوە زۆر زیاد لە حەد خۆی خۆش ئەوێ و هەرچی بەسترا بێ بە خۆی و ژیانی خۆیەوە هەر وا بە ئاسانی ئەو خۆشەویستی یە ژێر پێ ناکرێ لە پێناوی خۆشەویستی یەکی تردا! پیاوی وا هەیە لە دەروونی خۆی دا وا ئەزانێ کە نەفسی خۆی موچاندووە و جڵەوی گرتووەتەوە لەوەی زیادە ڕەوی بکات لە خود پەسەندی و خۆ گەرەك بوون دا، کەچی ئەگەر هەر شتێك رووی تێ بکات کە لەکەداری بکات، یان کەم نرخ و کەم رێزی بکات لای خەڵکی دەست بەجێ ئەچێت و رائەچڵەکێ وەکو دوو پشك یان مار پێوەی بدات و خۆی پێ ناگیرێ، ئەگەر زۆر بکات لە خۆی و لە پێش چاوی خەڵکی خۆی تێك نەدات، بێگومان لە دەروون دا ئەکوڵێ! بێگومان لەوانەیە خۆی رام بکات لەسەر فیداکاری و دەست نان بە گیان و ژیانی خۆیەوە، بەڵام زۆر قورس و گرانە رام کردن و موچاندنی نەفسی لەسەر خۆگرتن و گوێ پێ نەدانی ئەو جۆرە شتانە کە بدا لە شەخسیەت و پیاوەتی یەکەی و نرخ و رێزی ببات! ئەتوانین بڵێین فیداکاری و دەست نان بە گیانەکەیشیەوە ئەگەڕێتەوە بۆ خود

[1] ئەمانە هەمووی لە کتێبە سەحیحە باوەڕ پێکراوەکان دا هەیە.

پەسەندی خۆی و پاراستنی ڕێز و شەخسیەتی خۆی، بەڵێ بەڕاستی زاڵ بوون بەسەر نەفس و چارەسەر کردنی لەو خود پەسەندی یە زۆر قورس و بارێکی گرانە و قسەیەکی رووت نی یە بە زمان بوترێ، بە یارمەتی خوا و تێکۆشانێکی بەتین و دوور و درێژ نەبێ کەس ناگات بەو رادە و پلە بەرزە. هەروەها ئەوەی بڕیاری دا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هەڵسانی بە هەندێ ماف کە لە گەردنی باوەڕداران بووە و جێگیر بووە، وەکو بژاردنی قەرزێ کە لە گەردنی مردوویەك دا بووبێت و ماڵ و سامانی بەجێ نەهێشتبێت و بە خێو کەریان نەبووبێ، ئینجا بە بۆنەی باسی ئەوەی کە نووسراوە لە کتێبی خوادا، خواهیش و ویستی خوا لەسەری تێپەڕی کردووە، بۆ ئەمەی ببێتە بەرنامەیەکی هەمیشەیی بەو بۆنەیەوە دەست نیشان ئەکات بۆ پەیمانی خوا لەگەڵ پێغەمبەران بە شێوەی گشتی، پێغەمبەر و چەند کەسی تر لە پێغەمبەرە گەورەکان بە شێوەی تایبەتی، لە هەڵگرتنی سپاردەی ئەو بەرنامە، رێك راوەستان لەسەری و راگەیاندنی بە خەڵکی، هەڵسانیان بە ئەرك و چاودێری ئەو بەرنامەیە لەناو ئەو گەلانەی کە بۆی رەوانە کراون، ئەوەش تا خەڵکی خۆیان لێپرسراو بن لە رێنموونی و گومڕایی باوەڕهێنان و کوفری خۆیان، لە پاش راگەیاندنی پێغەمبەرەکان – سەلامی خوایان لێ بێت – هەروەها لە پێشەوە چەند حوکم و بڕیارێکی شەرعی باس کرد، لەناو ئەوانەدا چەند شتێ بوون لەباوی چەرخی نەزانی لابران و قەدەغە کران، چەند شتێك هەبوو لە پێشەوە ئیسلام دای هێنان و لە پاشان سڕینی یەوە، ئینجا بەدوای ئەوانەدا فەرمان ئەدات بە باسی پەیمان دانی پێغەمبەران بۆ بیر خستنەوە و هاندان و زیادە سوور کردن لەسەر راگەیاندنی ئایینی خوا و بانگ کردنی بۆی، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَـٰقَهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئەو کاتە بکە کە ئێمە وەرمان گرت لە پێغەمبەران پەیمانیان بە هەڵسان و راگەیاندنیان بەوەی سروشیان بۆ کرا و سپێررا پێ یان. بێگومان پەیمانەکەیان یەك پەیمانی نەگۆڕاوە لە یەکەم رەوانە کراوی خواوە تا دواترینی هەموویان – درودوی خوایان لێ بێت – پەیمانێکی تەنیا، بەرنامەیەکی تەنیا،سپاردەیەکی تەنیاکەهەموویان وەریان گرت تاگەیاندیان بەجێگای خۆی.

وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۖ وَأَخَذۡنَا مِنۡهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴿٧﴾ لِّيَسۡـَٔلَ ٱلصَّٰدِقِينَ عَن صِدۡقِهِمۡۚ

لەپێشەوە بە شێوەی گشتی ئەو پەیمان دانەی باس کرد، ئینجا بە تایبەتی باسی خاوەن قورئان و بانگ و بانگەوازی گشتی کرد و فەرموی: ﴿وَمِنكَ﴾ لە تۆمان وەرگرت، ئینجا گەڕاوە بۆلای خاوەنی پەیامە گەورەکان پێش دواترین پەیام و فەرموی: ﴿وَمِن نُّوحٍ وَإِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۖ﴾ لە نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسای کوڕی مەریەممان وەرگرت.

لەپاش باسی خاوەن پەیمان و پەیمان دەرەکان ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر پەیمانەکە و بە گەورە و گرنگ نیشانی ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿وَأَخَذۡنَا مِنۡهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا﴾ وەرمان گرت لێ یان پەیمانێکی گەورە و بەتین، بێگومان ئەو پەیمانە زۆر گەورە و بەهێز بوو کە دابەسترا لە نێوان خوا و بەندە هەڵبژێراوەکانی، لەسەر وەرگرتنی فەرمان و سروشتی خوا، ڕاگەیاندنی، هەڵسان بەو سپاردە و بەرنامەیە بە ئەوپەڕی ڕاستی و دامەزراوی و ئەمینی، بەجۆرێ خاوەن سپاردەکە ڕازی بوو، ئینجا هۆی وەرگرتنی ئەو پەیمانە و سپاردنی باس ئەکات. ئەفەرموێ: ﴿لِّيَسۡـَٔلَ ٱلصَّٰدِقِينَ عَن صِدۡقِهِمۡۚ﴾ بۆ ئەمەی خوا پرسیار بکات لە ڕاستان لەبارەی ڕاست و ڕاستگۆیی یانەوە، واتە پێغەمبەران کە ڕاستیان کرد لە پەیمانەکەیان دا و بە ڕێکی بردیانە سەر، یان باوەڕداران کە ڕاستیان وت و عەقیدە و ئایینی ڕاستیان گرتە گەردن، بێجگە لەوان درۆزنە، چونکە باوەڕی بە شتی درۆ هەیە و وشەی درۆ ئەڵێت، پرسیار لە ڕاستی و ڕاستگۆیی ڕاستان لە ڕۆژی دوایی دا بۆ ڕێز گرتنیانە، بۆ جاڕدانە لە ڕاستی یەکەیان و ڕوون کردنەوەیەتی لای هەموو کەس و لە پێش چاوی هەموو کەس، بۆ ڕوون کردنەوەی شایانی یانە بەو ڕێز و پاداشتەی کە دەست کەوتیان ئەبێت، بۆ وەسف و سەنایانە لەو ڕۆژە گەورەدا کە ئەوە هۆی ئەوپەڕی شانازی و شادمانی یە، بەڵام ئەوانەی کە درۆزن بوون لەم جیهانەدا باوەڕی پووچ و دەلەسەیان گرتە گەردن، لە گەورەترین مەسەلەدا درۆیان کرد. مەسەلەی ئایین و عەقیدە،

ئەوانە بەم جۆرەن کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَعَدَّ لِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ ئامادەی کردووە بۆ کافرەکان سزایەکی زۆر ئێش و ئازار دەر، کە سزای سووتانە بە ئاگری دۆزەخ، ئەو کافرانە کە لەم جیهانەدا شوێنی پێغەمبەران و راستان نەکەوتن، راستیان بە درۆ ئەزانی، خوا پەنامان بدات لە گومرایی و سەر لێ تێك چوون.

لەناو کۆڕی بەربەرەکانی ژیان و زۆرانبازی و شەڕە زۆران لەگەڵ رووداوە سەختەکانی جیهان دا شەخسی یەتی موسڵمانان داڕێژراو پاك و خاوێن کرا لە هەموو چڵك و ژەنگێ تاوەکو ئاڵتوونی تێزابی لێ هات کە لە بوتەوە دەرچووبێ. رۆژ لە دوای رۆژ رووداو لەدوای رووداو ئەو شەخسی یەتانە گەشەیان ئەکرد و پێ یان ئەگەیشتن، شێوە و نیشانە راستەقینەکانیان روون ئەبوونەوە و دەرئەکەوتن، گەل و کۆمەڵی موسڵمان کە پێك هات لەو شەخسی یەتە پاکیزەیانە فەراهەم هات بە هەموو سیفەت و نیشانە تایبەتی یەکانی یەوە.

ئەو بەسەرهات و رووداوانە زۆر سەخت و بە ئەرك و قورس بوون لەسەر دڵ و شانیان تا رادەیەك خەریك بوو گەلێ کەس بەهەدەر ببات، کەواتە ئەوانەی لەو تاقی کردنەوەو بەراوردەدا دەرچوون شایان بوون بەوەی قورئان لە وەسف و سەنایان دا بێتە خوارەوە. قورئان لەکاتی ئەو تاقی کردنەوە یان لەپاش دواهاتنی ئەهاتە خوارەوە و شێوەی رووداوەکانی ئەکێشا تیشکی رووناکی ئەخست بۆ هەر لاری و پێچ و پەنایەکیان، بەهۆی ئەوەوە هەموو هەڵوێست و هەست و نیاز و دەروونیان ئاشکرا ئەبوون و دەرئەکەوتن، ئینجا قورئان ئەدوا و رووی فەرمودەی ئەکردە ئەو دڵانە کە بە دەرەوە بوون لە رووناکی دا، بە بێ تەم و تۆز و پەردەیەك کە دایشاردبن، ئەو دڵانەی پێگەیاند و پەروەردەی ئەکردن رۆژ لە دوای رۆژ، رووداو لەدوای رووداو. واز نەهێنرا لە موسڵمانەکان و لێ یان نەگەڕان بۆ قورئانەکەیان، فەرمان و تەمێ و یاسا و ئامۆژگاری یان بۆ بێنێتە خوارەوە بە یەك جار، بەڵکو خوا خستی یە بەر تاقی کردنەوە و دانی لە بەراورد کردن، بە چەند رووداو و بەسەرهاتێکی سەخت و بەتین، چونکە خوا خۆی زانی کە ئەم ئادەمی یە پاك و خاوێن نابێتەوە بە رێکی ، پێ ناگات بە پێگەیشتنێکی تەواو، رێك راناوەستێ لەسەر رێگا و بەرنامەی بۆ دیاریی کراوی خۆی مەگەر بەو جۆرە پێگەیاندن و پەروەردە کردنە. کە دڵ و

دەروونی هەڵئەکۆڵیٚ، نەخش ئەبوو لە دەماردا، دەروونی ئەبرژاند و ئەم دیو و ئەو دیوی ئەکرد، قورئانیش ئەهاتە خوارەوە بۆ ڕێگا نیشان دانی و ڕێنموونی، بۆ ئەوەی پەند و تەمێی ئەو دلأنە بکات کە توابوونەوە بە ئاگری ئەو بەسەرهات و بەراورد کردنە ، سور بووبوونەوە بە گەرمی ئەو تاقی کردنەوانە، بەجۆرێ دەستیان ئەدا و ئامادە بوون بۆ چەکوش کاری، فەرمانبەری و مل کەچ و گوێ رایەڵ بوون بۆ زەرەنگەری ی لیٚ کردن و داڕشتنیان لە هەر قاڵبێك دا و شێوە و نەخشە کێشانیان بە هەر جۆر نیازیان لیٚ کرابیٚ.

بەڕاستی ئەو ماوە ژیانەی کە موسڵمانان بەسەریان برد لە چەرخ و ماوەی ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) ماوەیەکی ئێجگار نایابی کەس نەدیو بوو، ماوەی پەیوەندی و پەیوەستی ئاسمان بوو بە زەوی یەوە بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا هەستی پیٚ کرا و ئەبینرا لە رووداو و قسە و کردەوە و نیاز و خەتەرەی دەروون دا، هەموو موسڵمانیٚ بە جۆرێ ئەژیا هەستی ئەکرد کە هەمیشە چاوی قودرەتی خوا لیٚ یەتی و وا بە پێش چاوی یەوە، گوێچکەی قودرەتی خوا هەمیشە لیٚ یەتی، هەموو وشە و جولأن و بزووتنەوەی، بەڵکو هەموو نیاز و خەتەرە و چرکەی دڵی لەوانەیە دەرکەوێ و ئاشکرا ببیٚ لە خەڵکی، قورئان لەبارەیەوە بێتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ) کاتیٚ موسڵمان هەست بکات بەو پەیوەندی یە خودسەرە و لە رێوە لە نێوان خۆی و پەروەردگاری دا، کەواتە هەرکات دووچاری هەر شتیٚ ببوایە و هەرگریٚ یە بهاتایەتە رێگای، چاوەڕوانی ئەکرد کە بەیانی یان دوو بەیانی قاپی ئاسمان بکرێتەوە و چارەسەر بێتە خوارەوە بۆ گریٚ و کۆسپەکەی، فتوا و بڕیاری خوا بێت لەبارەیەوە، ئەو چەرخ و کاتە کاتیٚ بوو کە خوای گەورە بە زاتی بەرز و بڵندی خۆی روونی فەرمودەی ئەکردە بەندەکانی و ئەیفەرمو ئەی فلأن تۆ ئەوەت وت و ئەوەت کرد و لە دەروونت دا ئەوەت نیاز بوو، بەو شێوە و بەو جۆرە مەبە، وا بکە و ئاوا مەکە، ئای هاوار بۆ کات و چەرخی ئاوا! ئایا هاوار بۆ ئەو کات و چەرخە کە خوا فەرمودەی تایبەتی خۆی روو بکاتە بەندەیەکی دیاریی تایبەتی، کە ئەو کەسە و هەکەس وا بەسەر زەوی یەوە و هەرچی وا لە زەوی دا و هەموو زەوی زەرەێیکی زۆر بچووکە لەناو موڵك و سەڵتەنەتی گەورە و فراوانی بیٚ سنووری خوادا.

بەڕاستی ماوە و چەرخەکە زۆر سەیر و نایابە، کاتیٚ ئەمڕۆ بیری لیٚ بکرێتەوە و بیر بکرێتەوە لە رووداو و هەڵوێستەکانی، لەوانە نی یە گرنگی ئەو رۆژە بزانریٚ و پەیی پیٚ

ببرێ! بەڵام خوای گەورە نەگەڕا لە موسڵمانەکان کە بە هۆی ئەو هەست و باوەڕەوە پەروەردە ببن و پێ بگەن، بەڵکو دانیە بەر بەراورد کردن و تاقی کردنەوە، ئەوەش لەبەر هۆ و بەرژەوەندی یەکە کە خۆی ئەیزانێ، خۆی زانا ترە بە دروست کراوی خۆی، خۆی ئاگا و خەبەر دارە بە هەموو شتێك.

ئەو هەموو بەهرە و بەرژەوەندی یە شایانە بەوەی بە درێژی لەبەر دەمی دا راوەستین، تێ بگەین و بیری لێ بکەینەوە، رووداوەکانی ژیان و تاقی کردنەوەکانی وەرگرین لەبەر رووناکی ئەو تێگەیشتن و زانینە و ئەم تەگبیر و لێزانی یە. ئینجا لەم (١٩) ئایەتی داهاتووەدا ئەدوێ و ئەکۆڵێتەوە لە رووداوێکی زۆر گرنگ کە رووی دابێ لە مێژووی ئیسلام و کۆمەڵی موسڵمانان دا، هەڵوێستێ لە هەڵوێستەکان تاقی کردنەوەی زۆر سەخت باس ئەکات، کە ئەوەش بەناوبانگە بە غەزای ئەحزاب، یان غەزای خەندەق، لە ساڵی چوارەم یان پێنجەم دا رووی دا، هەرکەس تێفکرێ لەو ئایەتانە لە شێوە و رێگای باس کردنەکەی تێ ئەگات کە خوا چۆن ئەم ئوممەتەی پەروەردە کرد و پێ ی گەیاند بە رووداو و بەسەرهاتەکان و بە قورئانیش پێکەوە لە یەك کات دا. لەبەر ئەوەی لە شتەکە باش بگەین رووداوەکە لە پێشەوە ئەگێڕینەوە وەکو کتێبەکانی سیرەت بۆی باس کردوون، لەگەڵ ئەندازێ کورت کردنەوەدا:

محمدی کوڕی ئیسحاق ئەگێڕێتەوە لە کۆمەڵێکەوە کە چەند کەسێ لە جوولەکە: سەلامی کوڕی ئەبو الحقیقی، ئەزری وەحیی کوڕی اخطب، ئەزری و کنانەی کوڕی ئەبو الحقیق ی ئەزری و هوذەی کوڕی قیسی وائلی و ئەبو عمار وائلی لەگەڵ چەند کەس لە بنی نضیر و چەند کەسێ لە بنی وائل رۆیشتن بۆ مەککە بۆ ناو قورەیشی یەکان، بۆ بانگ کردن و هاندانیان لەسەر جەنگ کردن لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) پێ یان وتن: کە بەڕاستی ئێمە لەگەڵتان ئەبین هەتا لە رەگ و ریشەی ئەهێنین، ئینجا قورەیشی یەکان وتیان: ئەی کۆمەڵی یەهود ئێوە ئەهلی کیتابن و زانان بەوەی کە ئێمە و محمد دووبەرەکین تیای دا، دەی ئایا ئایینی ئێمە چاکە یان ئایینی ئەو؟ ئەوانیش وتیان: ئایینی ئێوە چاکترە لە ئایینی ئەو، ئێوە لەسەر حەقن، ئەم کۆمەڵە جوولەکە بوون کە لەم بارەیەوە چەند ئایەتێ هاتە خوارەوە بە درۆی خستنەوە و تانە و تەشەری لێ دان و هەڕەشەی لێ کردن، ئینجا کاتێ ئەوەیان پێ وتن قورەیشی یەکان شادمان بوون و دڵیان داهێنا بۆ ئەو جەنگ کردنەی کە ئەو کۆمەڵە

جوولەکە داوایـان لـێ کـردن و بـەڵێنیان پێـدان، ئینجـا ڕۆیـشتن بـۆ نـاو غطفـان و داوایـان لەوانیش کرد و بەڵێنی یارمەتی دانیان بەوانیش دا و وتیان کە قورەیش شوێنیان کەوتوون و بەرگری یان ئەکەن، ئینجا غطفانیش رازی بوون و بڕیاریان لەسەر دا، بەو جۆرە هەموو کۆمەڵـەکانیان بـۆ هانـدان و هـەموو یـەکیان گـرت لەسـەر ئـەو جەنگـە. ئینجـا قـورەیش بـە سـەرۆکایەتی ئـەبو سفیان، غطفـان بـە سـەرۆکایەتی عیینـەی کـوڕی حصن و حارثی کـوڕی عـوف، کۆمـەڵێ لـە اشجع بـە سـەرۆکایەتی مـسعری کـوڕی رخیلـە. ئەمانـە هـەموو دەرچـوون بەرەو مەدینە.

ئینجا کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) ئەو هەواڵەی بیست دەستی کرد بە خەندەق لێدان بە دەوری مەدینـەدا، خـۆی و موسـڵمانان دەسـتیان کـرد بـە ئـیش کـردن تیـای دابـە هەمیشەیی، چەند کەسێ لە مونافیقەکان سستی یان بەکار ئەهێنا لەو کارە گرنگەدا، بۆ فێڵ و تەڵەکە خۆیـان پێوە خەریك ئەکرد، خۆیان ئەدزی یەوە و ئەچوونەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵیان بە بێ ئاگایی پێغەمبەر (ﷺ) و ئیزن وەرگرتن لـێ ی، هـەرکام لە موسـڵمانان هـەر ئـیش و پێویـستی یـەکی ببوایە لە خۆیانەوە نەئەچوون بە دوای دا، بەڵکو ئەچوونە خزمـەتی و بۆیـان باس ئەکرد و ئیزنیـان ئەخواسـت و ئـەویش ئیزنـی ئـەدان، ئینجـا ئـەوانیش کـە لـێ ئەبوونـەوە لـە ئـیش و پێویستی یەکەیان ئەگەڕانەوە بۆ سەر ئیش و کارەکەی خۆیـان، ئینجـا دەربـارەی ئەمانیش ئایەت هاتە خوارەوە لە وەسف و سەنایان دا، هەروەها لەبارەی ئەو مونافیقانەیشەوە ئایـەت هاتە خوارەوە و ریسوا و بێ ئابڕووی کردن و نیاز و کردەوەی خراپی ئاشکرا کردن...

ئینجا کاتێ کە پێغەمبەر (ﷺ) لێ بوویەوە لە هەڵکەندنی خەنـدەق قورەیش هـاتن بـە دە هـەزار کەسـەوە لـە شـوێنێك دا خـستیان کـە پـێ ی ئـەوترێ مجتمع الأسـیاد، غطفـان و شوێن کەوتووەکانیان لە شوێنێك دا خستیان کە ناوبراوە بە (ذنب نقمی) لە لای احدەوە، پێغەمبـەر (ص) بـە سـێ هـەزار کـەس لـە موسـڵمانانەوە لـە بـەری (سـلع) دا خـستیان و کردیـان بـە ئوردوگایە و پشتیان کرد سلع، خەندەقەکە کەوتە نێوان ئەوان و لەشکی کوفر، فەرمانی دا کە ژن و منداڵ ببرێنە ناو قەڵاکانەوە.

ئینجا حیی کوڕی اخطب چوو بۆلای (کعب) ی کوڕی (اسد) ی قرەزی کە سـەرۆکی بـەنی قریظـە بـوو، ئـەو (کعـب) ە پـەیمانی دابـوو بـە پێغەمبـەر (ﷺ) کـە بـێ لایـەن بێـت و یارمـەتی جوولەکەکان نەدات لەو جەنگەدا، ئەو شەیتانە هات بۆلای و وازی لێ نەهێنا هەتا پەشیمانی

کردەوە و ئەو پەیمانەی پێ هەڵوەشاندەوە، لەسەر ئەوە کە ئەگەر قورەیش و غطفان گەڕانەوە و هیچیان نەکرد بە محمد کعب بچێتە ناو قەڵاکەی حیی و لەگەڵ ئەو بێت و هەرچی دووچاری ئەو بێت با دووچاری ئەویش ببێ، لەسەر ئەو بڕیارە کعب پەیمانی هەڵوەشاندەوە و خۆی دەرکرد لەو پەیمانەی دابووی بە پێغەمبەر (ﷺ).

ئینجا بەهۆی ئەوەوە بەڵاکە گەورەتر بوو، ترس و بیم بەتین تر بوو، دوژمن لای سەرویان و لای خوارویانەوە بۆیان هات، هەتا باوەڕداران هەموو گومانێکی خراپیان بە دەروون دا هات، ناپاکی سەری دەرکەوت لەلایەن هەندێ لە ناپاکەکانەوە، تەنانەت معتدی کوڕی قشیر وتی: محمد موژدە و بەڵێنی پێ ئەداین کە غەزنەی کیسرا و قەیسەر ئەخۆین، کەچی ئەمڕۆ هیچ کەسمان ئەمین نی یە لەخۆی بچێ دەست بەئاو بگەیەنێ! ئەوسی کوڕی قەیزی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ماڵ و منداڵەکانمان وا بە دەرەوە لەئاستی دوژمن کەواتە ئیزنمان بدە بڕۆینەوە بۆلایان، چونکە وان لە دەرەوەی مەدینەدا.

ئینجا لەسەر ئەو بار و حاڵە پێغەمبەر (ﷺ) مایەوە نزیکی مانگێ، بت پەرستەکانیش مانەوە بە دەوریان دا، هیچ جەنگ و کوشتارێ بەرپا نەبوو لە نێوانیان دا بێجگە لە تیری دوور بە دوور و ئەو حەسار و دەورە دانە.

ئینجا کاتێ بەڵا و نارەحەتی یەکە زۆر بەتین بوو لەسەر خەڵکی پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بۆ لای عیینە و حارث کە سەرۆکی غطفان بوون کە سێ یەکی بەر و میوەی مەدینەیان بۆ هەیە لەسەر ئەوەی کە خۆیان و دەست و پێوەندیان بگەڕێنەوە و وازیان لێ بێنن. ئینجا لەسەر ئەوە رێك کەوتن و نامەیان نووسی بەڵام هێشتا شایەت و بڕیارەکە تەواو نەبوو، بەڵکو هەر سەودا و مامەڵەکە تەواو بوو بوو، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بۆلای سەعدی کوڕی موعاز کە گەورەی ئەوس بوو و سەعدی کوڕی عوبادە کە سەرۆکی خەزرەج بوو باسەکەی بۆ کردن و پرسی پێ کردن لەوەدا، ئینجا ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە کارێکە خۆت پێت خۆشە و تا ئێمەیش بیکەین؟ یان شتێکە خوا فەرمانی پێ داوە و کەواتە ئەبێ بکرێ؟ یان ئەمە چاکە و پیاوەتی یە کە لەگەڵ ئێمەی ئەکەیت؟ ئەمیش فەرمووی: بەڵێ ئەمە چاکەیەکە لەگەڵ ئێوەی ئەکەم، سوێند بەخوا ئەمە ناکەم لەبەر ئەوە نەبێ کە عەرەب بە یەك جار پەلاماریان داون و لە یەك کەوانەوە تیرتان تێ ئەگرن، کەواتە ویستم بەمە تا رادەیەك شەوکەت و دەسەڵاتیان بشکێنم و کەمی بکەمەوە لێتان. ئینجا

سەعدی کوڕی موعاز وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە و ئەوان کە کاتێ هەردوو بت پەرست بووین و خوامان نەناسیوە ئەوانە نەیانتوانی و چاوەڕوان نەبوون بەر و سەمەری ئێمە بخۆن مەگەر بە میوانی یان بە کڕین، ئەی ئایا کاتێ خوا ڕێزی ئێمەی گرت بە موسڵمانێتی و ڕێنموونی کردین بۆی، خوا سەری بەرز کردینەوە بە تۆ و بە ئیسلام، لەم کاتەدا ماڵی خۆمانیان ئەدەینێ؟ سوێند بەخوا هیچ پێویست نین بەمەو هیچیان نادەینێ جگە لە شمشێر هەتا خوا بڕیاری خۆی ئەدات لە نێوان ئێمە و ئەوان دا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کەواتە وا بکە. ئینجا سەعد خوای لێ ڕازی بێت نامەکەی وەرگرت و ئەوی تیا نووسرا بوو سڕی یەوە، لەپاشان وتی: چی ئەکەن بیکەن. چیان لەدەست دێت بە دژی ئێمە بیکەن. پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ یارەکانی بەو شێوە مانەوە کە قورئان بۆمان باس ئەکات لەو تەنگی و ناڕەحەتی یەدا کە وێنەیان لەوەو بەر نەدیبوو، ئینجا نعیم کوڕی مسعود کە لە غطفان بوو هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) بە پەنهانی و عەرزی کرد کە من موسڵمان بووم گەلەکەم نەیانزانیوە کەواتە فەرمانم پێ بدە چۆن مەیل ئەکەیت، ئەمیش فەرمووی: تۆ لەناو ئێمەدا تەنیا پیاوێکی کەواتە بڕۆ ئەگەر ئەتوانی تێکیان بدە لەناو یەك دا و دڵیان سارد بکەرەوە و دووریان خەرەوە لێمان، چونکە جەنگ فڕو فێڵە، ئینجا ئەویش چوو کارێکی وای کرد دوو دڵ و بێ بڕوای کردن بەرامبەر جوولەکەی بنی قریظە کە پەیمانی یارمەتی یان لێ وەرگرتبوون، وەکو بە درێژیی لە کتێبی سیرەدا باس کراو ئێمە لێرەدا بە کورتی ئەیڵێین با باسەکە زۆر درێژە نەکێشێ...

خوای گەورە دڵی گۆڕین لە ئاستی یەك و باو تۆفانێکی زۆر بەهێزی لێ هەڵکردن، بە جۆرێ قاپ و قاچاخی نان و چێشتی قلْپ کردنەوە و خێوەتەکانی هەڵکەندن و خستنی و ترس و بیمی خستە دڵیان و سەری لێ شێواندن تا بڵاوەیان لێ کرد. پێش ئەمەی بڵاوەی لێ بکەن نعیمی کوڕی مسعود گەڕایەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی تێك چوون و رووخانی کۆمەڵەکەی عرض کرد، ئینجا ئەمیش حذیفەی کوڕی یمانی بانگ کرد و ناردی بۆ ناویان بە شەو و بە نهێنی تا بزانێ چی ئەکەن. (ئیبن ئیسحاق) ئەڵێ: پیاوێکی کوفەیی وتی بە حذیفە: ئایا ئێوە پێغەمبەرتان دیوە و هاوڕێ یەتیتان کردووە؟ ئەمیش وتی: بەڵێ، ئینجا کوفەیی یەکە وتی: چۆنتان ئەکرد و چۆن لەگەڵی ئەجوولانەوە؟ ئەمیش وتی: سوێند بەخوا هەوڵ و تێکۆشانمان ئەکرد لە خزمەتی دا، کوفەیی یەکەیش وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ئێمە

به خزمەتی بگەیشتینایە ئەمان دەهێشت بە پێ بەسەر زەوی دا بگەڕایە و ئەمان نا بەسەر ملمانەوە و بە قەلا دۆشکان هەڵمان ئەگرت. حذیفە فەرموی بە کوفەیی یەکە: ئەی کوڕی برام سوێند بەخوا خۆمان بینی لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) لە غەزای خەندەق دا پێغەمبەر (ص) ئەندازێ شەو نوێژی کرد، ئینجا لای کردەوە بەلامان دا و فەرموی: چ پیاوێ هەڵئەسێ و ئەڕوا تا بزانێ ئەو کۆمەڵە چی ئەکەن، لەپاشان ئەگەڕێتەوە، پێغەمبەری خوا بەڵێنی گەڕانەوەی پێ ئەدات، هەرکەس ئەوە بکات داوا ئەکەم لە خوا کە ئەو کەسە هاوڕێم بێت لە بەهەشت دا؟ دەی هیچ کەس هەڵنەسا پێغەمبەر (ﷺ) بانگی منی کرد، ئیتر منیش هیچ چارەم نەما کاتێ بانگی کردم، ئینجا فەرموی: ئەی حذیفە بڕۆ و بچۆرە ناویان و سەرنج بدە بزانە چی ئەکەن، هیچ شتێ نەکەیت هەتا دێیتەوە بۆلامان، ئەڵێ منیش چووم و چوومە ناو ئەو کۆمەڵەوە، باو لەشکری خوا ئەوە ئەکات پێ یان کە ئەیکات ماوە نادات نە دێزە و مەنجەڵ و نە ئاگر و نە خێوەتیان جێگیر ببێ، ئینجا ئەبو سوفیان هەڵسا و وتی: ئەی کۆمەڵی قورەیش با هەرکەس سەرنجی خۆی بدات بزانێ کێ دانیشتووە لەگەڵی، حذیفە ئەفەرموێ: منیش دەست بەجێ پیاوێك لاما بوو گرتم و وتم تۆ کێی؟ ئەویش وتی: من فلأنی کوڕی فلأنم – شەوەو سەرمایە و من ناناسێ، ئینجا ئەبو سوفیان وتی: ئەی کۆمەڵی قورەیش سوێند بەخوا ئێوە جێی دانیشتنتان نەماوە، حوشتر و ولأغی سواریتان فەوتا، بنو قریظە درۆیان لەگەڵ کردین، لە لایەنیانەوە ئەوەمان پێگەیشت کە پێمان ناخۆشە و دڵگرانین لێ ی، سەختی و بەهێزی بایش ئەوەیە ئەیبینن، کەواتە سوار بن و بگەڕێنەوە و من ئەوا ئەگەڕێمەوە... ئینجا بە پەلە پەڕی یە سەر پشتی حوشترەکەی و لێ ی دا و لەسەر سێ پەل راست بۆوە و بە پێوە پەتی ئەو پەلەکەی کردەوە، ئەگەر لەبەر فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) نەبوایە کە فەرموی: هیچ شتێك نەقەومێنی هەتا دێیتەوە، ئارەزووم بکردایە بە تیرێ ئەبو سوفیانم ئەکوشت. حذیفە ئەفەرموێ: ئینجا گەڕامەوە بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتێك دا نوێژی ئەکرد، کاتێ منی بینی خستمیە بەرپێی و بەشێ لەوەی نوێژی بەسەرەوە ئەکرد دای بە ملما، ئینجا رکوع و سوژدەی ئەبرد و منیش لەو جێگادا بووم کاتێ لە نوێژەکەی بووەوە هەواڵەکەم پێدا.... کاتێ غطفان هەواڵی قورەیش ئەبیستێ ئەوانیش بلأوەی لێ ئەکەن و ئەگەڕێنەوە بۆ ولأتی خۆیان، لە گێڕانەوەی ئەم رووداوەدا قورئان ناوی ئەو کەسانە نابات و کەسێکی تایبەتی دیاریی ناکات، بۆ ئەمەی چەند نموونەیەك لە ئادەمی

بخاته بەر چاو نەك چەند كەسێكی دیاریی و بە درێژیی نادوێ لە ڕووداوەكە و شتە جزئی و بچووكەكانی باس ناكات، بۆ ئەمەی نەخشەی ئەو شتانە پیشان بدات كە بەنرخ و بەسوودن، هەر ئەمێننەوە و بە نەمانی ئەو كەسانە و بە دواهاتنی ئەو ڕووداوە ئەو شتە بە نرخانە كۆتایی یان نایەت، بەهۆی ئەوەوە هەر ئەمێننەوە بە یاسا و بە مەتەڵ بۆ هەموو چین و تاقمێكی تری داهاتوو، هەموو هەڵوێست و ڕووداوی پەیوەست ئەكات و ئەیبەستێتەوە بە بڕیارو خواهیشی خواوە، دەستی قودرەتی خوا دەرئەخات و نیشانی ئەدات لە هەموو شتێك دا، لە هەموو قۆناغێك دا ئەوەستێ بۆ تەمێ و ئامۆژگاری یەك كە پێویست بێت. لەگەڵ ئەوەدا بەسەرهاتەكە ئەگێڕێتەوە و ئەیخوێنێتەوە بەسەر ئەو تاقمەی كە تیای دا ژیاون، بەچاوی خۆیان دیویانە، لەگەڵ ئەوەدا بێگومان بەو گێڕانەوە ئاگادار تر ئەبوون بە بەسەرهاتەكە، چەند بارو ڕوویەكی بۆ ڕوون كردوونەتەوە كە ئەوان زانا و ئاگادار نەبوون پێی، چەند كون و قوژبن و لاری و چاڵ و چۆڵی دڵ و دەروونی ئەخستە بەر ڕووناكی و دەری خست، هەروەها چەند شتی نهێنی و نیاز و خەتەرەی ئاشكرا كرد كە شاراوەبوون لە قوڵایی دڵ دا.

ئەوانە هەموو لەگەڵ شیرینی و هێزو گەرم و گوڕی یەك كە هەیە لە هۆنینەوەی وشە و ڕستەكان دا، لەگەڵ گاڵتە و لاقرتی كردن بە دڵ نەخۆش و ناپاكان كە ڕیسوا كەر و پشت شكێن بوو بۆیان، ئابڕو بردنیان بە شێوە كێشانی ترس و ترسنۆكی یان، لەگەڵ نیشاندانی شێوەی شیرینی چالاكی و ئارام و خۆگری و باوەڕی بەهێز لە دەروونی باوەڕداران دا.

ئایەتە بەرزەكانی قورئان ئامادەكراون بۆ ڕەفتار پێ كردن، نەك تەنها بۆ یەكەم تاقم و یەكەم چین كە ژیاون لەو بەسەرهات و ڕووداوانەدا، بەڵكو بۆ ڕەفتار پێ كردن لە هەموو چین و تاقمێ و لە هەموو مێژوو چەرخێك دا، ئامادە كراون بۆ كاركردن لە دەروونی ئادەمی دا بە تێكڕایی هەركام دووچاری ئەو جۆرە ڕووداوانە بێن، كار بكەن لە دڵ و دەروون دا بەو هێزەی كە كاری پێ كرد لە دەروونی یەكەم كۆمەڵ و تاقم دا.

بە جوانی تێ ناگات لەم ئایەتانە و مەبەستەكانی بە ڕێكی وەرناگرێ مەگەر كەسێ دووچاری وێنەی ئەو زروف و بەسەرهاتە بێت كە دووچاری یەكەم بوو و ئەو ئایەتانەی تیا هاتە خوارەوە، لەو كاتەدا ئەو ئایەتانە قاپی پیت و فەڕی خۆیان ئەكەنەوە، دڵ و دەروون ئەكرێنەوە بۆ وەرگرتن و تێگەیشتن لە مەبەست و ئامانجەكانی، لەو كاتەدا ئەو ئایەتانە

ئەگۆڕێن بە چەند هێزو وزەیەك، رووداو و بەسەرهاتەکانی ئەبن بە شتێکی زرت و زیندووی پاڵ پێوەنەر، کار ئەکات لە واقیعی ژیان دا.

قورئان کتێبێك نی یە تەنها بۆ خوێندنەوە و زانین و رۆشنبیری... ئیتر بەس، بەڵکو بەرنامەیەکی ئامادە کراوە بۆ هەموو کات و چەرخێ لەبارەی هەموو بەسەرهات و کاروباری ژیان دا!، بڕیارەکانی ئامادە کراوە بۆ پەیڕەوی کردن و رەفتار پێ کردن لە هەموو کاتێك دا، ئەگەر دڵێکی دەست کەوت کە بچێ بە دەمیەوە بە یەك بکەوێ لەگەڵی و سۆز و بەزەیی بەکار بێنێ لەگەڵی، کات و چەرخێکی دەست کەوێ کە هێز و وزەکەی خۆی بۆ بەرەڵا بکات، وا ئەبێ کەس ئایەتێ پتر لە سەد جار ئەخوێنێ، لە پاشان هەڵوێستێکی بۆ پەیدا ئەبێ، یان بەرانگاری رووداوێك دێت، کە سەرنج ئەدات ئەو ئایەتە شتێکی تەڕو تازەیە و وەکو هەر بەو بۆنەیەوە هاتبێ، شتێك ئەخاتە دڵیەوە کە لەوەو بەر بە دڵی دا نەهاتووە، وەڵامی پرسیارێکی دەست ئەکەوێ کە تیای دا سەرگەردان بووە، بڕیاری گرێ و موشکیلەیەکی سەختی بۆ روون ئەکاتەوە، ڕێگایەکی نەدیو و نەناسراوی بۆ دەرئەخات، نەخشەی مەبەستێکی بۆ ئەکێشێ، دڵنیا و دڵ ئارامی ئەکات لە کارێك دا کە دوو دڵ و بێ ئارام بووە تیای دا، ئەمانە چەند شتێکی تایبەتین بە قورئانەوە لە هیچ کتێبێکی تردا دەست نەکەوتووە و دەست ناکەوێ هەتا هەتایە.

لە گێڕانەوەی ئەم رووداوەدا دەست پێ ئەکات بە بیر خستنەوەی باوەڕداران بە چاکە و بەهرەی خوا بەسەریانەوە کە ئەو لەشکرە گەورەی گێڕایەوە لێ یان کە هاتبوون بۆ لەناو بردن و لە ریشە هێنانی ئەوان، ئەگەر کۆمەکی خوا نەبوایە و تەگبیر و چارەسەری نەکردایە. جا بەهۆی ئەوەوە لە یەکەم ئایەت دا سروشتی ئەو رووداوە و دەست پێ کردن و دواهاتنی بە کورتی ئەخاتە بەرچاویان، لە پێش درێژەی باسەکە و هەڵوێستەکانی، بۆ ئەمەی ئەو چاکە و بەهرەی خوا دەرکەوێ، کە بیری خستنەوە، داوای کرد لێ یان بیری لێ بکەنەوە، بۆ ئەمەی ئاشکرا ببێ ئەو خوایەی کە فەرمان ئەدات بە باوەڕداران بە پەیڕەو و شوێن کەوتنی سروشەکەی، بە پشت بەستنیان تەنها بەو، بە گوێ رایەڵی نەکردنی کافران و ناپاکان، تەنها ئەو خوایە ئەیانپارێزێ لە دەست درێژیی کافران و ناپاکان، ماتوڵ ئەمان هەڵساون بە بانگ و بانگەوازەکەی خوا و بەجێ هێنانی بەرمانەکەی خوا،

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ
وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ

ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ بیری چاکەی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە ﴿إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ﴾ کاتێ کە چەند لەشکرێکتان بۆهات: قریش، غطفان، جوولەکە، کە بە هەموویانەوە نزیکی دوانزە هەزار کەس بوون ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا﴾ ئینجا ئێمەش ڕەوانەمان کردە سەریان بایەك ﴿وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا﴾ لەشکرێك کە ئێوە نەتانبینی، واتە مەلائیکە. خوای گەورە لە شەوێکی زۆر سارددا بایەکی سەختی لێ هەڵکردن، خۆڵی کرد بەسەریان دا و سەری لێ شێوانن و مێخی خێوەتەکانی هەڵکەندن و گیرەکانی پچڕی و خێوەتەکانی خست و ئاگرەکانی کوژاندەوە و دیزە و مەنجەڵەکانی قڵپ کردنەوە و وڵاخی سواری و حوشترەکانی هێنان بەناو یەك دا و مەلائیکەتەکانیش دەستیان کرد بە ﴿الله اکبر﴾ کردن لەم لاو لای ئۆردوگاکەیانەوە، هەتا طلحەی کوڕی خویلدی ئەسدی وتی: ئەوا محمد هات و پەلاماری داین، کەواتە دەخیلتان بم فریاکەون. بەهۆی ئەمانەوە ترس و بیم داگیری کردن و خۆیان پێ نەگیرا و بڵاوەیان لێ کرد و بە چەسپانی گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا﴾ خوا هەمیشە بینایە بە هەرشتێ ئێوە ئەیکەن، بەهۆی ئەوەوە ئەوەی کرد کە کردی.

ئا ئاوا لەم سەرەتا کورتەدا نەخشەی دەست پێ کردن و دواهاتنی ئەو ڕووداوە ئەکێشێ... ئینجا لەپاش ئەم کورتەیە دەست ئەکات بە درێژە پێدان و شێوە کێشانی ڕووداوەکە، ئەفەرموێ: ﴿إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ﴾ واتە بیری چاکەی خوا بکەنەوە بە ڕزگار کردنتان کە ئەو کۆمەڵانە بۆتان هاتن لای ژووروتانەوە ﴿وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ﴾ لای خواروتانەوە، واتە لە سەرووی شیوەکە لە ڕۆژهەڵاتەوە غطفان هاتن، لای خواروی شیوەکە لە ڕۆژئاواوە قورەیش و کۆمەڵەکانی تر کە دوایان کەوتبوون هاتن،

﴿وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴿١١﴾﴾

﴿وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَٰرُ﴾ کاتیٚ چاو کلا بوو لای وابوو له راده و رەوشتی روانینی خۆی و حەوارە بوو بوو له بیم و ترس و سەرگەردانی دا ﴿وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ﴾ دلّ گەیشتبووه سەری گەروو بەهۆی زۆری ترسەوە، چونکه لەکاتی ترسی زۆر بەتین دا سی ئەئاوسیٚ و بەهۆی ئەوەوه دلّ بەرز ئەبیٚتەوه بۆلای گەروو، یان دلّ خۆی لەکاتی ترسی بەهیٚزدا قرچ هەلّدیٚت تا ئەنووسیٚ بەسەری گەرووەوە، جاری وا هەیه هەناسەی لیٚ ئەبریٚ تا کابرا ئەمریٚ، بەهەرحالّ مەبەست ئەوەیه بیم و ترسیٚکی زۆر داگیری کردبوون، ﴿وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠﴾ چەند جۆر گومانتان برد به خوا، گومانی جیاواز هەرکەس و هەر تاقمیٚ به پیٚی دلّ و دەروون و باوەڕی خۆی، بیٚگومان دلّه بەهیٚز و دامەزراوەکان گومانی خیٚرو چاکەیان بردووه که خوا بەلّیٚنی خۆی بەدی ئەهیٚنیٚ و ئایین و پیٚغەمبەری خۆی سەرئەخات، یان زانیویەتی که ئەو بەسەرهاته بۆ تاقی کردنەوەیه و مەترسی کردووه له خۆ نەگرتن و دەرنەچوون لەو تاقی کردنەوەدا، ئەوەی دلّ بیٚ هیٚزو دلّ نەخۆش بووه گومانی خراپ و پیٚچەوانەی بردووه وەکو لەمەو پاش له ئایەتەکانەوه دەرئەکەویٚ، بەهەرحالّ قورئان ئەو گومانانەی دیاریی نەکرد و روونی نەکردنەوه و به نادیاریی هیٚشتنی یەوه تا شیٚوەی بیٚ ئارامی و دانەمەزراوی دلّ و دەروون نەخشه بکیٚشیٚ و نیشانی بدات له هەست و خەتەره و خەیالّ دا، له رۆیشتنیان به هەموو لایەك دا، له جیاوازی تیٚگەیشتن و بیرو باوەڕی ئەو دلّه جیاوازانه.

ئینجا نیشانه و دروشمی سەختی ئەو رۆژو بەسەرهاتەیان ئاشکرا تر و روون تر ئەکاتەوه وەکو ئەفەرمویٚ: ﴿هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا﴾ لەویٚدا بڕواداران تاقی کرانەوه، بیٚ ئارام کردن به بیٚ ئارام کردنیٚکی زۆر بەتین، وەك بومه لەرزەیەکی بەهیٚز له دلّیان دا فەراهەم هیٚنرابیٚ، پەنا بەخوا ترس و ناڕەحەتی یەکه باوەڕداران بەو جۆره پیٚ بکات ئەبیٚ ئەوپەڕی راده سامناك و دلّ داچلّەکیٚنەر بیٚت!

محەمەدی کوڕی مسلمه ئەفەرمویٚ: ئیٚمه له خەندەق دا شەومان رۆژ بوو، واته خەو و خۆراسمان نەبوو، بت پەرستەکان زۆر بوون لەنیٚوان خۆیان دا نۆبەیان ئەکرد، بەم رەنگه رۆژیٚ ئەبو سوفیان لەگەلّ کۆمەلّەکەیدا، رۆژیٚ خالیدی کوڕی وەلید، رۆژیٚ عمروی کوڕی عاس، رۆژیٚ هبیرەی کوڕی ئەبو وەهەب، رۆژیٚ عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل، رۆژیٚ ضراری

کوڕی خطاب، هەتا بەلاّ و نارەحەتی یەکە گەورە بوو لەسەر شانی خەڵکی و بیم و ترس کەوتە ناویان. سەختی حاڵی موسڵمانان لەم رادەیەدا بووە مقریزی ئەیگێڕێتەوە لە کتێبی خۆی دا بەناوی ﴿امتاع الأسماع﴾ ئەڵێ: بت پەرستەکان پەلاماریان دا بەیانی یە زوو پێغەمبەریش (ﷺ) موسڵمانەکانی ئامادەکرد و بەرهەڵستیان وەستان ئەو رۆژە بێ وچان هەتا ماوەیە لە شەو تێپەڕی، پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و مەغریب و عیشای پێ نەکرا، موسڵمانەکان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا نوێژمان نەکرد! ئەویش فەرموی: منیش بەخوا نەمکرد! بەو جۆرە مانەوە هەتا خوا بلاّوەی کرد بە بت پەرستەکان و ئەوانیش و موسڵمانەکانیش هەرکام گەڕانەوە بۆ شوێن و مەنزڵی خۆیان، ئەسیدی کوڕی حضیر بە دووسەد کەسەوە لەسەر لێوار خەندەقەوە وەستان، ئینجا کۆمەڵێ لەوان بە سەرۆکایەتی خالیدی کوڕی وەلید پەلاماریان دا بۆ هەڵکەوت و ناکاوێ ئەگەڕان. ماوەیەك تێ جەنگان و لەوەدا وەحشی کە لە غەزای احددا حەزرەتی حەمزەی شەهید کرد لەو تێ هەڵچوونەیش دا طفیل ی کوڕی نعمانی شەهید کرد، لەو رۆژەدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: بت پەرستان خەریکیان کردین و نەمانپەرژایە سەر نوێژی عەسر، خوا سك و دڵیان پڕ بکات لە ئاگر.[1]

لە شەوێك دا دوو کەمین و کۆمەڵی موسڵمان دوور ئەچن و ئەگەن بە یەك و یەکتر ناناسن و هەرکام ئەویتر بە دوژمن ئەزانێ بەهۆی ئەوەوە تێ ئەجەنگن و زام و کوشتار لەنێوانیان دا بەرپا ئەبێ، ئینجا بە شیعاری ئیسلام بانگ ئەکەن ﴿حم لا ینصرون﴾ بەهۆی ئەوەوە واز ئەهێنن لە یەکتر، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی زامەکانتان لە رێگای خوادایە و هەرکەستان لێ کوژرا بێت بێگومان شەهیدە. بەتین ترین کاتی موسڵمانان کە چوار دەور درا بوون لە خەندەق دا ئەو کاتە بوو کە هەواڵی جوولەکەی بنی قریظەیان پێ گەیشت کە پەیمانیان هەڵوەشاندەوە وچوونە ریزی کافرەکانی تر، بەهۆی ئەوەوە چاوەڕوان بوون لە هەرکاتێك دا بە جارێ هەموو پەلاماریان بدەنێ، ئەمانیش ئەو کۆمەڵە کەمەن لەناو ئەو هەموو کۆمەڵە زۆرەدا، کە هاتوون بە نیازی لەناو بردن و لە ریشە هێنانیان. ئەوە هەموو با بوەستێ لەلایە و پیلان و فاك و فیکی ناپاك و دڵ نەخۆشەکانیش با بوەستێ لەلایەکی ترەوە بۆ ترس و بیم و خستنە ناو ریزی موسڵمانان و ناوخۆی مەدینە وەکو لەم ئایەتانەدا روون ئەبێتەوە،

---

[1] لە حەدیسی جابردا پێغەمبەر (ﷺ) لەو رۆژەدا لە نوێژی عەسر خەریك و بێ ئاگا کرا و ئەو نزا سەختەی کرد، وا دەرئەکەوێ شتەکە دووجار رووی دابێ، جاری یەکەم ئەو چوار فەرزەیان لە دەست چوویێ و ئەم جارە تەنیا نوێژی عەسر.

وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ يَٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟

---

﴿وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ واته بیری چاکەی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە کاتێ کە ناپاك و دوو ڕووەکان و ئەوانەی لە دڵیان دا نەخۆشی و لاوازی عەقیدە و باوەڕ هەبوو، ئەوانە ئەیانوت: ﴿مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا﴾ خوا و پێغەمبەرەکەی هیچ بەڵێنێکیان پێ نەدابین لەبارەی سەرکەوتن و زاڵ بوونەوە جگە لە بەڵێنێ کە بەتاڵ و ناڕاست بوو، بەڵێنی هەڵخەڵەتاندن بوو.

ئەوانە لەو کاتە تەنگ و سەختەدا هەلیان بۆ هەڵکەوت بۆ دەربڕینی نیازی پیسی خۆیان و بێ باك لەوەی کەس مەنع و لۆمەیان بکات، هەلیان بۆ هەڵکەوت بۆ سست کردنی دڵی خەڵك و ورە بردنیان و دوو دڵ و بەد گومان کردنیان لە بەڵێنی خوا و پێغەمبەردا (ﷺ)، بیمیان نەبوو لەوەی کەس لێ یان هەڵپەڕێ و دەم کوتیان بکات، چونکە بە دیمەن و ڕواڵەت ڕێگای دەمبازی یان هەبوو، لە دەروونی خۆیشیان دا باوەڕیان هەر نەبوو، یان ئەگەر بووبێ شتێکی بێ هێز و لاواز و بیم و ترس وای داچڵەکاندبوون هۆشیان نەمابوو بەلای هیچ شتێکەوە، بەهۆی ئەوەوە چی لە دڵیان دا بوو هەڵیان ڕشت، وێنەی ئەوانە لەناو هەموو کۆمەڵێکی موسڵمانان دا هەن، هەڵوێستیان لەکاتی تەنگانەدا ڕێك هەڵوێستی ئەو تاقمە ناپاکەیە کە ئەم ئایەتانە لەبارەیانەوە هاتنە خوارەوە، کەواتە بە درێژیی چەرخ و لە هەموو چینێك دا ئەوانە هەر ئەبن! ﴿وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ﴾ کاتێ کە کۆمەڵ و چەند کەسێ لەوانە ئەیانوت: ﴿يَٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ﴾ ئەی دانیشتوانی شاری یەسریب واتە مەدینەی منەوەرە کە لە پێشەوە بە (یثرب) ناوبراوە ﴿لَا مُقَامَ لَكُمْ﴾ شوێنی مانەوە نی یە بۆتان لێرەدا ﴿فَٱرْجِعُوا۟﴾ کەواتە بگەڕێنەوە بۆ جێ و شوێنی خۆتان و ناو ئەم خەندەقە بەجێ بێڵن. ئەو ناپاکانە هانی خەڵکەکەیان ئەدا لەسەر دەرچوون لە ئوردوگا و گەڕانەوە بۆ لای خانووماڵەکانیان، بەم هۆو بەڵگەیە کە مانەوەیان لەوێدا زۆر بێ جێ و ناڕێکە، لەکاتێك دا کە ماڵ و منداڵیان لە جێگای مەترسی دایە، بەڕاستی قسەکەیان زۆر شەیتانانەیە و کار ئەکات لە دڵ و دەروون، مەترسی کردنی ماڵ و خێزان لە دەست درێژیی کردنی دوژمنی وا گەورەو لەکاتی وا سەخت و سامناك دا،

وَيَسۡتَـٔۡذِنُ فَرِيقٞ مِّنۡهُمُ ٱلنَّبِيَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوۡرَةٞ وَمَا هِيَ بِعَوۡرَةٍۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارٗا ﴿١٣﴾ وَلَوۡ دُخِلَتۡ عَلَيۡهِم مِّنۡ أَقۡطَارِهَا

ئەو مەترسی یە دلّ داچلەکێنەرە و هێزی ئەژنۆ ئامێلێ و پیاوی ئەوێ خۆی پێ راگیر بکرێ ﴿وَيَسۡتَـٔۡذِنُ فَرِيقٞ مِّنۡهُمُ ٱلنَّبِيَّ﴾ [1] تاقمێ لەوانە ئیزنیان ئەخواست لە پێغەمبەر بۆ گەڕانەوە، ﴿يَقُولُونَ﴾ ئەیانوت: ﴿إِنَّ بُيُوتَنَا عَوۡرَةٞ﴾ بەڕاستی ماڵ و خانوەکانمان وا بە دەرەوە و نامحکەمن. بەجێمان هێشتوون بە بێ پارێزەر. قورئان لێرەدا بڕ و بیانووەکەی بە درۆ خستنەوە و هۆ راستەقینەکەی ئاشکرا کردن، فەرموی: ﴿وَمَا هِيَ بِعَوۡرَةٍ﴾ ئەو ماڵ و خانووانە نین بە دەرەوە و نامحکەم نین، ﴿إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارٗا﴾ ئەوانە نیازیان هیچ نی یە راکردن نەبێ و خۆ قوتار کردن. ئەگێڕنەوە تاقمی بنی حارثە ئەوسی کوڕی قیظی یان نارد بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) وتیان: خانوو ماڵەکانمان وان بە دەرەوە و نامحکەمن. هیچ خانویە لە خانوەکانی ئەنسار وەکو خانوەکانی ئێمە نین، لە نێوان ئێمە و لەشکری غطفان دا هیچ کەس نی یە بیانگێڕێتەوە لێمان، کەواتە ئیزنمان بدە با بگەڕێینەوە بۆ ناو خانووەکانمان، تا بەرگری بکەین لە ژن و خێزانمان، پێغەمبەریش (ﷺ) ئیزنی دان، ئینجا کە ئەو هەواڵە گەیشت بە سەعدی کوڕی معاذ – خوای لێ رازی بێت – وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئیزنیان مەدە، سوێند بە خوا ئێمە و ئەوان هەر تەنگانەیەکمان پێ گەیشتبێت ئەوانە ئەوە کردەوەیان بووە، ئینجا ئەویش گەڕاندنیەوە، ئا بەو جۆرە قورئان لە روویان دا وەستا و نیازەکەی دا بە ناوچاویان دا.

ئینجا لێرەدا ئەوەستێ لە باسی هەڵوێستی بێ ئارامی وسام و ترس و فڕ و فێڵ و تەڵەکەبازی یان ئەوەستێ بۆ ئەمەی شێوەی دەروونی ئەو ناپاك و دڵ نەخۆشانە نەخشە بکێشێ، شێوەی لاوازی عەقیدە و ترسنۆکی دڵ و ئامادەیی یان بۆ دەرچوون لە ریزی موسڵمانان بە بێ سەر لێ کردنەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ دُخِلَتۡ عَلَيۡهِم مِّنۡ أَقۡطَارِهَا﴾ ئەگەر لەلایەن خراپەکارانەوە هێرش بهێنرایەتە ناو ماڵەکانیان لە هەموو لایەکیانەوە

---

[1] ئەم کردەوە و چەند کردەوەیەکی تر لەم ئایەتانەدا لە راستی دا رابردوون لەبەر ئەوە بە رابردوو تەفسیرم کردنەوە، بەلاّم قورئان پۆشاکی ئێستا و داهاتووی کرد بەبەریان دا و ئەو وتەی بۆ بەکار هێنان لەبەر ئامادەکردنی شێوە رابردوەکەیان. کە ئەوەش باوە بە پێی عیلمی بەلاغە.

ثُمَّ سُئِلُوا۟ ٱلْفِتْنَةَ لَـَٔاتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا۟ بِهَآ إِلَّا يَسِيرًا ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ كَانُوا۟ عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ ٱلْأَدْبَـٰرَ ۚ وَكَانَ عَهْدُ ٱللَّهِ مَسْـُٔولًا ﴿١٥﴾

﴿ثُمَّ سُئِلُوا۟ ٱلْفِتْنَةَ﴾ ئینجا لەو کاتە زۆر تەنگەدا لەلایەن کەسێ ترەوە داوای جەنگ و کوشتاریان لێ بکرایە ﴿لَـَٔاتَوْهَا﴾ ئەو داوایانە بەجێ ئەهێنا و ئەیاندایە دەستی داواکەران بە چەسپانی ﴿وَمَا تَلَبَّثُوا۟ بِهَآ إِلَّا يَسِيرًا﴾ دوایان نەئەخست مەگەر دواخستنێکی کەم یان کاتێکی زۆر کەم ئەوەندە خۆیان رێك و ئامادە بکەن و بنەون لە چەکەکانیان، هیچ گوێ یان نەئەدا بەماڵ و خێزانیان چی یان بەسەر بێت، واتە ئەگەر کەسێ تر جگە لە تۆ ئەی پێغەمبەر ئەو داوای لێ بکردنایە لە کاتێك دا کە لە خەتەر و مەترسی یەکی وا گەورەدا بوونایە بە چەسپانی ئەچوون بە دەم داواکەرەوە، ئەم بەهانەی ئێستەیان نەئەهێنایەوە، کەواتە ئیزن خواستنیان بۆ گەڕانەوە لەبەر مەترسی ماڵ و خێزان نی یە بەڵکو لەبەر ناپاکی یانە و پێ یان ناخۆشە یارمەتی تۆ بدەن[1]. ئا ئاوا قورئان دەریان ئەخات و پەردەیان بەسەرەوە لائەبات. ئینجا لەکەداریان ئەکات بە بێ پەیمانی و هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی کە دابوویان بە خوا. ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَانُوا۟ عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ﴾ بێگومان ئەوانە لە پێش ئەم رووداوە پەیمانیان لەگەڵ خوا کرد ﴿لَا يُوَلُّونَ ٱلْأَدْبَـٰرَ﴾ کە پشت هەڵناکەن و راناکەن لە غەزا و جەنگ دا ﴿وَكَانَ عَهْدُ ٱللَّهِ مَسْـُٔولًا﴾ پەیمانێ درا بە خوا لێپرسراوە. کەواتە ئەوەی بەجێ ی نەهێنێ خۆی ئەخاتە مەترسی سزا و تۆڵەی خوا. (ئیبن و هشام) لە سیرەتەکەی دا ئەفەرموێ: ئەمانە تاقمی بنو حارثە بوون، کە لە رۆژی احددا ترسان و نیازیان کرد لەگەڵ تاقمی بنی سلمەدا بگەڕێنەوە، لەپاش ئەوە پەشیمان بوونەوە و پەیمانیان دا بە خوا کە ئیتر کاری وا نەکەن، لە رۆژی احددا خوا چارەسەری کردن، پاراستنی لە دوا رۆژ و تۆڵەی ئەوە. بەڵام بۆ ئەم رۆژە و لە پاش تێپەڕ کردنی ئەو ماوە درێژە بەسەری دا، ئەوا قورئان بەم توند و تیژی یە بەرەنگاریان ئەبێ و لەکەداریان ئەکات.

---

[1] ئەم ئایەتانە بە چەند جۆرێ تەفسیر کراوەتەوە، لە نێوان ئەو هەمووەدا باوەڕم بە دوانیان بەهێزتر بو: یەکەم ئەوەی لە تەفسیرەکەدا وتم. دووەم ئەمەیە: ئەگەر لە هەموو لایەکەوە هێرش بهێنرایەتە سەر مەدینە و جەنگ و کوشتاری راستەقینە بەرپا ببوایە، ئینجا داوای کوفرو جەنگ و کوشتاریان لێ بکرایە لەگەڵ تۆدا ئەی پێغەمبەر ئەوانە بە چەسپانی ئەفرین بۆی و لە ماڵەکانیان نەئەمانەوە بۆ پاراستنیان لە دەست درێژیی دوژمن مەگەر مانەوەیەکی کەم.

﴿قُلْ لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٦﴾ قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً﴾

ئینجا لەم کاتەدا کە ئەمەیان درا بە ناوچاودا فەرمان ئەدات کە ئەم دوو ئایەتەیان ئاراستە بکریْ بۆ ریْك و پیْك کردنی تیْگەیشتن و بیر و باوەریان، ئەفەرمویْ: ﴿قُلْ لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ﴾ بلْیْ پیْ یان راکردنتان لە جەنگ و خۆ دزینەوەتان لە بەرەنگاری و تیْهەلْچوون لەگەلْ دوژمن هەرگیز سوودتان پیْ ناگەیەنیْ و رزگارتان ناکات ئەگەر ئیْوە ئەتانەویْ بەو راکردنە خۆتان قوتار بکەن لە مردن یان لە کوژران. واتە خوا چی بریار دابیْ دیْتە ریْگاتان و بە هیچ کلۆجیْ خۆتان بۆ لانادریْ لیْ ی، بیْجگە لەوەش بیْگومان هەموو گیان لەبەریْ ئەبیْ نەمیْنیْ و هەموو کەس ماوەیەك دیاریی کراوە بۆ ژیانی کە ئەو ماوەیە دوایی هات ژیانی دوایی دیْت ئیتر بە کوشتن بیْت یان بە مردنی سەر جیْگا، ﴿وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ ئەگەر فەرز بکەین و وا دابنیْین کە ئەو راکردن و خۆ دزینەوە سوودی ببیْ و نەمان دوا بخات، یان بلْیْین: خوا ئەو دواخستنەی بریار دابیْت و بەستبیْتی بەو راکردنەوە، لەسەر هەرکام لەم دوو بارەیش هەر ئیْوە نازیْنریْن و دوا ناخریْن ماوەیەکی کەم نەبیْت. چونکە ماوەی ژیان هەرچەند بە دریْژ دابنریْ هەر کورتە، تەمەنیْ کە بە دەقیقە و چرکە کەم ببیْتەوە هەرچەند دریْژ بیْت هەر کەم و کورە، خوا لیْ خۆش بوو احمد شوقی شیرینی فەرمو:

دقات قلب المرء قائلة لە إن الحياة دقائق و ثواني

واتە لیْدانەکانی دلْی مرۆڤ پیْی ئەلْیْ کە ژیان چەند دەقیقە و سانیەکە.

﴿قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً﴾ بلْیْ پیْ یان: ئایا کیْ یە ئەو کەسە پەناتان ئەدات و ئەتانپاریْزیْ لە خوا ئەگەر خوا بیەویْ زیان و سزایەکتان دەربارە بکات؟ ئایا کیْ یە ئەوەی کە دووچاری زیان و خراپە بکات ئەگەر خوا بیەویْ بەزەیی و چاکەتان پیْ بگەیەنیْ؟ واتە هیچ کەس نی یە بەرگری زیان و سزای خوا بکات لە هیچ کەس، یان بەرگری خیْرو چاکەی خوا بکات لە هەرکەس خوا بیەویْ.

وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧﴾ ۞ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ لِإِخْوَٰنِهِمْ
هَلُمَّ إِلَيْنَا ۖ وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾

﴿وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا﴾ خەڵكی دەستیان ناكەوێ بۆ خۆیان بێگە لە خوا هیچ دۆستێ كە سوودیان پێ بگەیەنێ و هیچ یارمەتی دەرێ بەرگری زیانیان لێ بكات. كەواتە با خەڵكی مل كەچی و گوێ رایەڵیی بەجێ بێنن بۆ خوا، پەیمانی خوا ببەنە سەر لە خۆشی و ناخۆشی دا هەموو كارێكیان بگێڕنەوە بۆ لای خوا و حەواڵەی ئەوی بكەن. پشت هەر بەو ببەستن، ئینجا خوا خۆی چی ویست ئەیكات. ئینجا لەم باسەوە ئەڕوات بۆ باسی روون كردنەوەی زانین و ئاگاداری خوا بەو كەسانە كە هەرچۆنێ خۆیان تێكۆشان ناكەن لە رێگای خوادا هەروەها ئەبن بە كۆسپ و بەرگری كەر و بانگی خەڵكی ئەكەن بۆ واز هێنان لە تێكۆشان... شێوەیەكی دەروونی یان نەخشە ئەكێشێ كە زۆر نایابە و سەرنج راكێشە و لەگەڵ ئەوەدا وێنەیەكی راستە هۆی پێكەنین و لاقرتی كردنە بەو جۆرە كەسانە كە لەسەر رێبازی شەیتانن و پیشەی ئەو بەجێ ئەهێنن، كە ئەوانە نموونەیەكن لە هەموو چەرخ و چینێك دا هەن و پەیدا ئەبن، شێوەی ترسنۆكی و داچڵەكان و بێ ئارامی لەكاتی تەنگانەدا، بافیش كردن و دەم درێژیی لەكاتی خۆشی دا، چنگ گوشراوی و چاوبرسێتی، خۆ نەگرتن و بێ ئارامی لەكاتی گومانی روودانی هەر مەترسی یەك لە دوورەوە، ئەفەرموێ: ﴿قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ﴾ بێگومان خوا زانایە و ئاگادارە بەوانەتان كە سست كەری خەڵكین و دڵ سارد كەرەوەیانن لە پێغەمبەر و یارمەتی دانی، ﴿لِإِخْوَٰنِهِمْ﴾ ئەڵێن بە برادەرەكانیان: ﴿هَلُمَّ إِلَيْنَا﴾ وەرن بۆلای ئێمە، واتە كەنار گیر بن و خۆتان مەخەنە مەترسی و جەنگ و ئاژاوە، ﴿وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ ناچنە ناو جەنگ و جەنگ ناكەن مەگەر كات و ماوەیەكی كەم یان كەم جار، ئەویش كە ناچار بوونایە، چوونەكەشیان هەر بۆ ئەوە بوو موسڵمانان بیانبینن و كاتێ لێ یان بێ ئاگا نەبوون خۆیان ئەدزی یەوە و ئەگەڕانەوە بۆماڵی خۆیان.

أَشِحَّةً عَلَيۡكُمۡۚ فَإِذَا جَآءَ ٱلۡخَوۡفُ رَأَيۡتَهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ تَدُورُ أَعۡيُنُهُمۡ كَٱلَّذِي يُغۡشَىٰ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡمَوۡتِۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلۡخَوۡفُ سَلَقُوكُم بِأَلۡسِنَةٍ حِدَادٍ

**ئینجا باسی سیفەت و نیشانەی ئەو نموونە ئادەمی یە ئەکات:**

**١- ﴿أَشِحَّةً عَلَيۡكُمۡ﴾ ئەوانە چرووك و چنگ قوچراون لە ئاستی ئێوە ئەی کۆمەڵی موسڵمانان، نایانەوێ یارمەتی بدەن نە بە گیان و نە بە سامان و نە بە تێکۆشان و نە بە بەزەیی و هەستی پاك.**

**٢- ﴿فَإِذَا جَآءَ ٱلۡخَوۡفُ﴾ ئینجا کاتێ ترس و بیمی دوژمن بێت و بەرپا ببێ، جەنگ و هەڵمەتدانی دوژمن دەست پێ بکات ﴿رَأَيۡتَهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ﴾ ئەیانبینی سەرنجت ئەدەن بە جۆرێ ﴿تَدُورُ أَعۡيُنُهُمۡ﴾ چاویان ئەگەڕێ بەم لاو لادا، واتە ئەکەوێتە پتە پت و گلێنەکانیان ئەکەونە لەرزە و گەڕان بەم لاو لادا ﴿كَٱلَّذِي يُغۡشَىٰ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡمَوۡتِۖ﴾ بە وێنەی کەسێ کە بێ هۆشی هێنرابێ بەسەری دا لەبەر مردن و لە کاتی گیان کەنیشتا، واتە سەرنجت ئەدات بە وێنەی سەرنج دانی ئەو کەسە لەو کاتە سەختەدا کە سەرنج ئەدات بە ترس و لەرزو پەنا هێنانەوە، یان گلێنەی چاویان ئەگەڕێ بە وێنەی گەڕان و ئەم لاولای چاوی ئەو کەسە کەوا لە گیان کەنیشت دا.**

**بەڕاستی وێنە و شێوەیەکی ئێجگار سەیر و نایابە، کە ئەیهێنێتە بەرچاو بۆ ئەو تاقمە ناپاکە ترسنۆکە، خۆی گاڵتە و لاقرتی پێکردن و سووك و ریسوا کردنیانە.**

**٣- ﴿فَإِذَا ذَهَبَ ٱلۡخَوۡفُ﴾ ئینجا کاتێ بیم و ترس بڕوا و نەمێنێ و ئارام و خۆشی پەیدا ببێ ﴿سَلَقُوكُم بِأَلۡسِنَةٍ حِدَادٍ﴾ سزاتان ئەدەن بە قسە و زمانێکی تیژ و زمانتان لێ درێژ ئەکەن، واتە لەکاتی تەنگی دا بەو جۆرە بوون کە باس کران، لە خۆشی و ئارام دا لە کون دێنە دەرەوە و دەنگیان بەرز ئەبێتەوە و رەگی ملیان راست ئەبێتەوە و بافیش ئەکەنەخۆیان، ئەکەونەوەسف وسەنای خۆیان و باسی ئازایی و چالاکی خۆیان ئەکەن،**

أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُواْ فَأَحْبَطَ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٩﴾ يَحْسَبُونَ
ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُواْۖ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ يَوَدُّواْ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِي ٱلْأَعْرَابِ يَسْـَٔلُونَ عَنْ
أَنۢبَآئِكُمْۖ وَلَوْ كَانُواْ فِيكُم مَّا قَٰتَلُوٓاْ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢٠﴾

**﴿أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِۚ﴾ [1] لەکاتێك دا رژد و رەزیلن لەسەر چاکە، بەم رەنگە هیچ لە توانا و تێکۆشان و سامان و دارایی و شتی خۆیان بەخت ناکەن بۆ چاکە و لە رێگای چاکەدا، لەگەڵ ئەو هەموو کەشخە و قسەی زل و خود پەسەندی و دەم درێژیی یەدا. ئەم نموونەیە لە ئادەمی هەر هەن و نابڕێنەوە لە هەموو چەرخ و چینێك دا و ئەوانە چالاك و دەم بەرەڵا و دەرکەوتوون هەرکات ئارام و خۆشی ببێ، ترسنۆك و بێ دەنگ و شاراوەن کە بیم و ترس روو بدات. رژد و رەزیلن لە ئاستی چاکە و ئەهلی چاکە، بێجگە لە زمان درێژیی هیچی تریان لێ نایەت بۆ چاکە وچاکان، هۆی ئەو هەموو لاری و نالەباری یەیان ئەمەیە: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُواْ﴾ ئەوانە بڕوایان نەهێناوە، بەڕاستی شیرینی ئیمان و بڕوا تێکەڵی دڵیان نەبووە، دڵیان رێنموونی وەرنەگرتووە لەبەر رووناکی ئیمان و باوەڕە، بە رێگای ئیمان و باوەڕدا نەچوون، ﴿فَأَحْبَطَ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْۚ﴾ بەهۆی ئەوەوە خوا کردەوەکانی بەتاڵ کردنەوە و زایەی کردن و دەری خست کە وەرناگیرێن، چونکە لەبەر خوا نەیانکردوون، بەڵکو لەبەر رووپامایی خەڵك کردویانن. ﴿وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا﴾ ئەوەش ئاسانە لەسەر خوا هەموو کات، هیچ شتێك گران نی یە لەسەر خوا و هیچ ئەرکێکی نی یە و هەرچی خوا بیەوێ ئەبێ ببێ بە تەنیا خواهیش و مەیلی خوا، کەواتە ئەم جۆرە وشەیانە بە پێی بار و فامی ئێمەیە.**

**لە پێشەوە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەدا باسمان کرد کە کۆمەڵەکان بەو جۆرە بڵاوەیان کرد، بەڵام ناپاك و دڵنەخۆشەکان بەهۆی بیم و ترسی زۆرەوە ﴿يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُواْۖ﴾ گومانیان ئەبرد کە کۆمەڵەکان نەڕۆیشتوون بڵاوەیان لێ نەکردووە، ﴿وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ يَوَدُّواْ﴾ ئەگەر ئەو کۆمەڵانە جارێ تر بێنەوە ئەوانە پێ یان خۆشە و ئاوات ئەخوازن ﴿لَوْ أَنَّهُم**

---

[1] ئەم ئایەتە بە چەند جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە هەموو ئەگونجێن و چاکن.

بَادُونَ فِي ٱلْأَعْرَابِ﴾ كاشكێ ئەوان كۆچەر بوونایە لەناو عەرەبە كۆچەر و لادێی یەكان دا و خەڵكی مەدینە نەبوونایە و بە جۆرێ لە دوورو لە دەرەوە ﴿يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ﴾ پرسیار بكەن لە هەواڵ و بەسەرهاتتان، واتە لەبەر ترسنۆكی ئاوات ئەخوازن كە رۆژێ لە رۆژان لە مەدینەدا نەبوونایە و هاوبەشی مەدینەیی یان نەكردایە لە هیچ شتێك دا و ئاگادار نەبوونایە بە رووداو و بەسەرهاتی و لە دوورەوە وەكو غەریب و بێگانە پرسیار بكەن لە رووداوی!! ئەوانە لە ترسا گەڕانەوە بۆ ناو شاری مەدینە و نەیانتوانی لە خەندەق دا بن ﴿وَلَوْ كَانُوا۟ فِيكُم مَّا قَـٰتَلُوٓا۟ إِلَّا قَلِيلًا﴾ [1] ئەگەر لەناوتان دا بوونایە و نەشكەڕانایەتەوە بۆ مەدینە و جەنگ و كوشتار بەرپا ببوایە ئەوانە شەر و كوشتاریان نەئەكرد لەگەڵ ئەو كۆمەڵانەدا مەگەر كەمێ نەبێ، ئەویش لەبەر رووپامایی و مەترسی تانە و تەشەر.

لێرەدا دوایی هات نەخشە كێشانی شێوەی ئەو نموونە ناپاك و دڵنەخۆشە كە لەو چەرخەدا هەبوو لەناو گەل و كۆمەڵی موسڵمانانی تازە پێگەیشتووی مەدینە، هەروەها ئەو نموونە لەپاش ئەوان هەر بووە و هەیە و هەر ئەیشبێ لە هەموو چەرخ و چینێكی داهاتوودا بە وێنەی ئەو نیشانە و دروشمانەی كە باس كران... نەخشەی ئەو شێوە دوایی هات بە جۆرێ سووكی و ریسوایی و بێ نرخی ئەو تاقمە ترسنۆكەی روون كردەوە و لە دەروون دا و جێگریی كردن.

ئەوەبوو شێوەی ناشیرین و بێ نرخی ئەو تاقمە ناپاك و دڵنەخۆش و پڕو پاگەندەچیانە، بەرامبەر بەو تاقمە تاقمێ تر هەبوو جیاواز، ئەو هەموو سەختی و تەنگی و بیم و سام و ترسەی كە وڵاتەكەی داگیر كردبوو هیچ كاری نەكرد لە دڵ و دەروونیان، شێوەی شیرین و رووناكیان ئەدرەوشایەوە وەكو ئەستێرەی بەرەبەیان لەناو ئەو هەموو تەمو غەم و تاریكی یەدا، لەو بوومەلەرزە بەتینەدا لەخشەیان نەكرد، دڵ بەهێز و بە ئارام بوون بە خوای خۆیان، رازی بوون بە بڕیار و قەزا و قەدەری، دڵنیا بوون بە یارمەتی خوا.

---

[1] ئایا مەبەست بەو بوون و جەنگ نەكردنە بۆ جاری یەكەمە یان بۆ جاری دووەم ئەگەر روو بدات، هەردوو ئەگونجێ و بەهەردوو تەفسیر كراوەتەوە، بەڵام تەفسیرەكەم لەسەر باری یەكەم كردەوە و ئەمەم بەلاوە بەهێزتر بوو.

بۆ ئەم شێوە شیرینە دەست پێ ئەکات لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ سوێند بەخوا بۆ ئێوە هەمیشە هەیە لە پێغەمبەردا خو و رەوشت و خەسڵەتێکی شیرین کە شایانە پەیڕەوی بکەن. پێغەمبەر (ﷺ) پەیڕەوی کراوێکی شیرینە بۆ ئێوە ﴿لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ﴾ شیرینە بۆ کەسێ کە ئومێد و چاوەڕوانی پاداشتی خوای خۆی ئەکات و ناز و نیعمەتی رۆژی دوایی، ﴿وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا﴾ یاد و باسی خوای زۆر کردبێ، واتە با ئێوە پەیڕەوی پێغەمبەرتان بکردایە لەو بەسەرهاتە سەختەدا، هەروەها لە هەموو کارو کات و بەسەرهاتێکی وا پەیڕەوی ئەو بکەن.

لەگەڵ ئەو هەموو بیم و ترس و لەرزو تەنگی یەی وەکو هەوری رەش و تاریک دڵ و دەروون و هەستی داگیر کردبوو، لەگەڵ ئەوەدا پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) جێگای پەناو ئامان بوو بۆ موسڵمانان، سەرچاوەی باوەڕ و ئومێد و ئارام بوو بۆیان، بیر کردنەوە و لێك دانەوەی هەڵوێستی لەو رووداوە زۆر سەخت و گرنگەدا رێگا و رچە نەخشە ئەکێشێ بۆ سەرۆك و پێشەوای هەموو کۆمەڵ و بزووتنەوەکان لە جیهان دا، بە جوانی ئەزانم دەست نیشان کردن بە چەند وێنەیەك لە هەڵوێستەکانی لەو رووداوەدا.

ئەو پێغەمبەرە گەورەیە (ﷺ) لەگەڵ موسڵمانان دەستی کرد بە ئیش کردن لەو خەندەقەدا، بە زەنگن و پاچ خۆڵی هەڵئەکەند و بە خاکەناز خۆڵی دەرئەدا و بە سەبەتە خۆڵی هەڵئەگرت و تووڕی ئەدا، بە دەنگی بەرز ئاوازەی بۆ ئەسەندنەوە لە هەندێ گۆرانی سادە کە بۆ خۆشی هاوەڵەکانی لەکاتی ئیش کرن دا ئەیانوت بە جۆرە هەڵبەستراوێ کەناو ئەبرا بە (رجز): پیاوێك لە موسڵمانان کاتی خۆی ناوبرا بوو بە (جعیل) ئینجا پێغەمبەر(ﷺ)

پێی ئەو ناوەی پێ ناخۆش بوو لەبەر ئەوە گۆڕی بە (عمرُ) موسڵمانەکانیش لەو بارەیەوە بۆ خۆشی ئەم هەڵبەستەیان دانا و بە گۆرانی ئەیانوت:

سماه من بعد جعيل عمرا وكان للبائيس يوما ظهرا

ئینجا کاتێ ئەگەیشتنە وشەی (عمرا) و (ظهرا) پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) ئەو دوو وشەی ئەفەرمو بە دەنگی بەرز لەگەڵیان، الله الله لەو کاتە پیرۆزە!!

حەق وایە بیر بکەینەوە لەو کاتە کە موسڵمانان خەریکی ئیش و کار بن لە هەڵکەندنی ئەو خەندەقەدا و پێغەمبەریش (ﷺ) یەکێ بێت لەناویان دا و بە پاچ و زەنگن خۆڵ هەڵکەنێ و بە خاکەناز فڕێی بدات بە بەسەبەتە بە کۆڵ بیگوێزێتەوە لەناو لەغمەکە بۆ دەرەوە، ئەو گۆرانی یەیان لەگەڵ بڵێت و بۆیان بسێنێتەوە، ئینجا بیر بکەینەوە لەو هێز و توانا و خۆشی یەی کە ڕێژراوە بەسەر گیان و ڕۆح و هەستیان دا، ئەو ڕەزامەندی و دڵنیایی و شانازی یەی کە هەڵقوڵاوە لە ناوەڕۆکی دڵ و دەروونیان دا!

لەکاتی ئەو ئیش کردنەدا ڕۆحە بەرزەکەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) سەرکەوتن و زاڵ بوونی ئایین و ئوممەتەکەی لە دوورەوە چاو ئەکرد. بەچاوی سەریش بینی لە چەند بزیسکە و چەخماخەیەك دا کە پەیدا بوو لە بەردێکی گەورە کە خۆی بە زەنگن شکاندی، ئینجا ئەو باس و موژدەیەی دا بە گوێچکەی موسڵمانەکان دا، باوەڕی بەهێزو ئارام و دڵنیایی خستە ناویانەوە. کوڕی ئیسحاق ئەڵێ: لە سەلمانی فارسی یەو هەواڵم پێ درا کە ئەفەرموێ: لەلایەکەوە ئیشم ئەکرد لە خەندەقەکەدا ڕێم کەوت لە بەردێکی ڕەقی گەورە بۆم چار نەکرا، پێغەمبەر (ﷺ) لە نزیکمەوە بوو ئینجا کە یەکەم جار لێ ی دا بزیسکە و چەخماخەیەکی لێ پەیدا بوو، ئینجا جاری دووەم لێ ی دا چەخماخەیەکی تری لێ پەیدا بوو، ئینجا جاری سێ یەم لێ ی دا بزیسکە و چەخماخەیەکی تری لێ پەیدا بوو. سەلمان

ئەفەرموێ: وتم باوکو دایکم بە فیدات بێت ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە چی بوو من بینیم، زەنگنەکە بریقە و چەخماخەی دا کاتێ ئەتوەشاند؟ ئەویش فەرموی: ئایا تۆ ئەوەت بینی سەلمان؟ منیش وتم: بەڵێ. فەرموی: بە یەکەمیان خوا فەتحی یەمەنی بۆ کردم، بە دووەم شام، بە سێ یەم رۆژهەڵات. لە کتێبی (اسماع الأمتاع) دا ئەفەرموێ: ئەم رووداوە بوو عمر بینی و سەلمانیش حازر بوو – خوا لە هەردووکیان رازی بێت –.

ئینجا با بیر بکەینەوە لەو فەرمودەیە و کارکردنی لە دڵ و دەروون دا لەو کاتە سەختەدا، یان سەرنجێکی ئەو باوەڕە بەهێزە دامەزراوە بدەین لەم دوورەوە. هەروەها با چاوێکی دڵ بخەین لێرەوە بۆ ئەو شێوە شیرینە. شێوەی گەڕانەوەی (حذیفە) کە چوو بۆ هەواڵ زانینی دوژمن، سەرما زۆری پێ هێنا بوو، پێغەمبەر (ﷺ) وەستا بوو لە نوێژدا کەچی لە کاتی نوێژەکەی و خەریك بوونی بە خواپەرستی یەوە. نەگەڕا لە حذیفە بە سەرما و لەرزەوە بمێنێتەوە تا لە نوێژەکەی و خەریك بوونی و خواپەرستی یەوە. نەگەڕا لە حذیفە بە سەرما و لەرزەوە بمێنێتەوە تا لە نوێژەکەی ئەبێتەوە. بەڵکو پەلی گرت و خستیە نێوان هەردوو قاچی خۆی بەشێ لەوەی بە ملی دادا کە نوێژی لەسەر ئەکرد بۆ ئەمەی بەو سۆز و خۆشی یە گەرمی بکاتەوە. بەردەوام بوو لە نوێژەکەی دا تا دوایی هێنا، ئینجا حذیفە هەواڵەکەی پێگەیاند و ئەو موژدەیەی پێدا کە دڵی بەفەڕی لە پێش چوون و گەڕانەوەی حذیفە ئاشنا بوو پێی، حذیفەی نارد تا بەچاوی خۆی ببینێ. ئینجا باسی چالاکی و نەترسی و دامەزراوی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە شتێکە لە هەموو بەسەرهاتەکەدا روون و ئاشکرایە، پێویست ناکات بە گێڕانەوەی، چونکە بەناوبانگ و زانراوە، قورئان زۆر راست و شیرینی فەرمو: ﴿ لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ ﴾.

وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾

---

ئینجا دێته سەر باس و روون کردنەوەی شێوەی ئیمان و بڕوای بەهێزی دامەزراو و شێوەی شیرین و رووناکی موسڵمانان، لە بەرەنگاری و بە پیرەوە چوونی ئەو رووداوە ناهەموارە و ئەو سام و ترس و خەتەرە گەورەیە، ئەو خەتەرە سامناکەی کە دڵ و دەروونی باوەڕدارانی خستە لەرزە، کەچی هەر ئەو سام و بیم و لەرزەیان کرد بە هۆی ئارام و باوەڕی بەهێز و مل کەچی و موژدە بەخشی و دامەزراوی، ئەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ﴾ کاتێ باوەڕدارە راستەکان ئەو کۆمەڵ و حیزبانەیان بینی کە بە جارێ هاتوون و دەوریان داون ﴿قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ﴾ ئەم تەنگی و بەڵاو بەسەرهاتە شتێکە خوا و پێغەمبەری خوا بەڵێنیان پێ داین بە روودانی و ئینجا سەرکەوتن و زاڵ بوونمان، کەواتە ئەبێ ئەو سەرکەوتنە بێت و بەدی بێت. ﴿وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ﴾ خوا و پێغەمبەرەکەی راستیان کرد لە بەدی هاتنی سەرەتا و نیشانەی سەرکەوتنەکەدا، کەواتە ئەبێ ئەو سەرکەوتنەش بەدی بێت، دڵنیا بوون لە بەدی هاتنی، ﴿وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا﴾ ئەو تەنگی و رووداوە کە بینی یان زیاد تر بەتین تری کردن لەبارەی باوەڕ و مل کەچی یەوە بۆ خوا و بۆ فەرمانی خوا.

ئەو بیم و ترس و دڵتەنگی و داچڵەکانەی کە بەهۆی ئەو رووداوەوە بەرپا بوو لە رادەیەك دا بوو بە وێنەی بومەلەرزەیەکی سەخت و دڵ و دەروونی موسڵمانانی هێنایە لەرزە وەکو قورئان دەست نیشانی بۆ کرد. ئەو کۆمەڵە ئادەمی بوون، ئادەمیش تاقەت و تەوانایەکی تایبەتی هەیە، خوا داوایەکیان لێ ناکات لە سنووری توانایان بەدەر بێت. لەگەڵ ئەوەدا باوەڕیان هەبوو بەو موژدە گەورەیەی کە پێغەمبەر (ﷺ) پێ‌ی دان، ئەو موژدەیەی کە لە سەرکەوتنی ئەو رووداوە تێپەڕی کردو و چوو بۆ گرتنی شام و یەمەن و رۆژئاوا و رۆژهەڵات... لەگەڵ هەموو سام و بیم و ناڕەحەتی یەکە ئەوەندە بەتین و بەهێز بوو بێ

ئارامی کرد بوون و هەناسەی لێ چنی بوون. ئەو هەواڵە کە لە حذیفەوە گێڕامانەوە بەسە بۆ ڕوون کردنەوەی ڕادەی سەختی ی ئەو ڕووداوە، شتێکی ئاشکرایە کە لەم جیهانەدا وێنەی ئەو کۆمەڵە موسڵمانە هەڵنەکەوتووە لە ڕاستی و گوێ ڕایەڵی و فیداکاری دا، لەگەڵ ئەوەدا ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە (ﷺ) کە لەسەر وماڵیان خۆشەویست تر بوو داوا بکات و بفەرموێ: کێ ئەچێ هەواڵی ئەو لەشکرەم بۆ بێنێ من زامنی گەڕانەوەی دەکەم و لە بەهەشتیش دا هاوڕێم بێت؟ لەگەڵ ئەوەدا کەس نەچێ بەدەم داواکەیانەوە، هەتا بە تایبەتی ناوی حذیفەی برد ئیتر ئەویش هیچ چارەی نەما!! بێگومان شتی وا ناگونجێ و نابێ مەگەر کار بگاتە ئەوپەڕی پلە و ڕادە لە سەختی و سامناکی دا... بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو ناڕەحەتی و سەختی و سامناکی یەدا پەیوەندی و پەیوەستی دڵیان بە یادی خواوە نەپچڕاو مایەوە، ئەو باوەڕ و تێگەیشتنەی کە بوویان لەخشەی نەکرد و نەترازا، زانیان و دڵنیا بوون کە ئەم سەختی و ناڕەحەتی یە خۆشی و سەرکەوتنی بە دوادا دێت، چونکە ئەوانە بڕوای بەهێز و دامەزراویان بوو بە فەرمودەی خوا: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ﴾ هەروەها باوەڕی بەهێزیان هەبوو بە فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە لە پێشەوە ئەم هەواڵەی پێدان: ﴿سيشتد الأمر باجتماع الأحزاب عليكم، العاقبة لكم عليهم﴾، فەرموی: ﴿إنهم سائرون إليكم تسعا أو عشرا﴾ لەدوای نۆ یان دە ڕۆژ دوای هەواڵ دانەکە. جا لەبەر ئەوە لێ یان نەگۆڕا و سەریان لێ نەشێوا. وتیان ئەمە ئەوەیە کە خوا و پێغەمبەرەکەی بەڵێنی پێ داین... هتد. بێگومان ئەوانە ئادەمی بوون، نەیانەتوانی خۆیان ڕووت و ڕزگار بکەن لە هەستی ئادەمی و لە لاوازی ئادەمی. داوا نەکراوە لێ یان کە لە سنووری ئادەمێتی خۆیان دەرچن و تێپەڕ بکەن، خۆیان داڕنن لە ڕەوشتی سروشتی و ئادەمی، چونکە خوا بۆ ئەوەی دروست کردن کە بە ئادەمێتی بمێننەوە، نەک بگۆڕێن بە تیرەیەکی تر. نە مەلائیکە بن و نە جن و شەیاتین، نە گیان لەبەرێکی تر یان دارو بەرد.

ئەوانە لە تیرەی ئادەمی بوون بیم و ترس و داچڵەکان رووی تیٚ ئەکردن، تەنگەتاو ئەبوون بە شتی سەخت و بەتین، ئەکەوتنە لەرزە بەهۆی بەسەرهاتیٚکی خراپ کە لە سنوور تیٚپەری، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا بەسرابوون بەهۆی نەپچراوی بەهیٚز کە دڵیان ببەستیٚتەوە بە خواوە، بەرگری یان بکات لە کەوتن و هەڵخلیسکان، ئومیٚد و چاوەروانی خوایان تیا تازە بکاتەوە و بیانپاریٚزیٚ لە نائومیٚدی... بەهۆی ئەو دوو سیفەتەوە ئەوانە نموونەیەکی تاقانە بوون لە میٚژوو و تەمەنی ئادەمی دا ویٚنەیان نەناسراوە و نەبیستراوە.

ئیٚمەی موسڵمان پیٚویستە لەسەرمان کە ئەوە بزانین بۆ ئەمەی بگەین لەو نموونە تاقانە لە میٚژووی چەرخەکان دا، پیٚویستە بزانین و تیٚ بگەین کە ئەوانە ئادەمی بوون، خۆیان دانەرنی بوو لە سروشتی ئادەمی، بەو هیٚزو لاوازی و هەموو شتە تایبەتی یەکانی ئادەمی یەوە، هۆی جیاوازی یان ئەمە بوو کە لە ئادەمیٚتی دا گەیشتبوونە بەرزترین پۆپە کە ئامادە کراوە بۆ ئادەمی، لە پاریٚزگاری سیفەتە تایبەتی یەکانی ئادەمی لە زەوی دا و دەست گرتن بەهۆی بەهیٚزیی و نەپچراوی ئاسمانەوە. کاتیٚ بیٚ هیٚزو لاوازیمان بینی بە خۆمانەوە، یان بکەوینە داچڵەکان و لەرزەیەك یان بکەوینە تەنگی و تیژیی یەك، پیٚویستە لەسەرمان کە نائومیٚد نەبین لە خۆمان، سام وترس وامان لیٚ نەکات وا بزانین تیا چووین، یان ئیتر تازە دەست نادەین بۆ هیچ کاریٚکی گرنگ و گەورە و کەڵکمان پیٚوە نەماوە! بەڵکو پیٚویستە خۆمان لاواز و بیٚ هیٚز نەکەین و سوور نەبین لەسەر داماوی و بیٚ کەڵکی، چونکە ئەو جۆرە کەم و کوری و بەسەرهاتانە بەشیٚکە لە سروشتی ئادەمیٚتیمان، چاکتر لە ئیٚمە دووچاری ئەو جۆرە حاڵەتانە بووە،! ئیٚمەی هۆی نەپچراوی بەهیٚزمان هەیە کە لە ئاسمانەوە بۆمان هاتووەتە خوارەوە، پیٚویستە لەسەرمان دەستی پیٚوە بگرین تا خۆمانی پیٚ راست بکەینەوە لە هەموو کەوتن و پیٚ هەڵخلیسکانیٚ. باوەر بە خۆ و ئارام و دامەزراوی بهیٚنینەوە بۆ خۆمان، بەسەرهاتی سەخت و ناخۆش دابنیٚین بە سەرەتا و هۆی سەکەوتن، بەهۆی ئەوەوە دامەزراو و بە ئارام بین، چالاك و بەهیٚز ببین، ئەوەستین و بە ریٚگای راستی خۆمان دا برۆین.

﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ لِّيَجْزِىَ ٱللَّهُ ٱلصَّـٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٤﴾ وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا۟ خَيْرًا ۚ

---

ئا ئەمەیە ئەو هاوكێشی و هاوتایی و نەگۆڕاوی و نەدۆڕاوی یەی كە ئەو نموونە تاقانەی لەسەر داڕێژرا لەسەرەتای ئیسلامەوە. ئەو نموونە كە قورئان لە چەند شوێن دا وەسف و سەنایان ئەكات، یەكێ لەوانە ئەمەیە كە لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ﴾ لەناو باوەڕداران دا چەند پیاوێك هەن راستیان كرد لەوەی كە پەیمانیان دا بە خوا لەسەری، واتە ئەو پەیمانەی كە دایان بە خۆگری و دامەزراوی لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ)بە تێكۆشان و جەنگ و فیداكاری لە رێگای بەرز كردنەوەی ئایینی خوادا، ئەو پەیمانەیان بەدی هێنا. ﴿فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ﴾[1] ئینجا هینی وایان هەیە نەزری خۆی بەجێ هێنا و گیانی خۆی بەخت كرد، بەم رەنگە جەنگی كرد هەتا شەهید كرا، ﴿وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ﴾ هینی وایشیان هەیە چاوەڕوانە و بە تەمای گیان بەخت كردنە ﴿وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا﴾ هیچ جۆرە گۆڕاندن و تێك دانێكیان نەكردووە نە لە پەیمان و نە لە هیچ شتێكی ترا كە گۆڕاندنی رەوا نەبێ. ئەم تاقمە رێك و راستەی كە باسی فەرمو بەرامبەری ئەو تاقمەی كە لە پێشەوە باسی كردن و تانەی لێ دان بەوەی پەیمانیان نەبردە سەر و راستیان نەكرد، ئەم شێوە شیرینەی ئەم تاقمەی لێرەدا باس كرد و هێنای بۆ تەواو كردنی وێنە و شێوەی دوو رووییی و ناپاكی و دەستە پاچەیی و لاوازی و بێ پەیمانی ئەو تاقمەكەی تر، بۆ ئەمەی بەراورد و بەرامبەری كردنەكە تێرو تەواو بێت لە نێوان ئەو دوو تاقمەدا، ئەوەش زۆر بەكارە لەكاتی پێگەیاندن و پەروەردە كردن و ئامۆژگاری دا. ئیمامی ئەحمەد و موسلیم و تیرمزی و نەسائی و كۆمەڵێكی تر لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ئەگێڕنەوە كە فەرموی: ئەنەسی كوڕی نضر كە ماممە ئامادەی غەزای بەدر نەبوو بەهۆی ئەوەوە زۆر دڵگران بوو و وتی: یەكەم غەزایە كە

---

[1] وشەی ﴿نحب﴾ واتە نەزر مەبەست مردنە، چونكە ئەبێ ببێ وەكو نەزر كرابێ.

پێغەمبەر(ﷺ) کردی من ئامادەی نەبووم، ئەگەر لەمەودوا ئامادەی هەر غەزایە بووم خوا ئەبینێ چی ئەکەم، ئینجا ئامادەی غەزای احد بوو، ئینجا سەعدی کوڕی معاذ – خوا لێ یان رازی بێت – چوو بە پیری یەوە و پێ ی وت: بۆ کوێ ئەچیت؟ ئەویش فەرموی: هاوار بۆ بۆنی بەهەشت لەلای احدەوە هەستی پێ ئەکەم، ئینجا دەستی کرد بە جەنگ هەتا شەهید کرا، لەپاشان سەیریان کرد هەشتا و ئەوەندە زامی پێوە بوو، رُبیعی خوشکی بە سەرە پەنجەکانی دا ناسی یەوە، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە. زەمەخشەری لە (کشاف) دا ئەفەرموێ: چەند پیاوێك نەزریان کرد لەسەر خۆیان کە لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) بکەونە هەر غەزا و جەنگێ دامەزراو بن و جەنگ بکەن هەتا شەهید ئەکرێن. لەناو ئەوانەدا عثمان و طلحە و سعید و حمزە و مصعب هەبوون، ئینجا هۆی ئەو تاقی کردنەوە روون ئەکاتەوە، لەگەڵ دوا رۆژی ناڕاستی و بێ پەیمانی. ئەفەرموێ: ﴿لِّيَجۡزِيَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدۡقِهِمۡ وَيُعَذِّبَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ﴾ خوا ئەو بەسەرهات و تاقی کردنەوەی کرد تا پاك و پیس دەرکەوێ و کارو کردەوەی هەردوو تاقم روون و ئاشکرا ببێت و ئینجا خوا پاداشتی راستان بداتەوە بە هۆی راستی یەکەیانەوە، سزای ناپاك و دوو رووەکانیش بدات – ئەگەر ویستی – بەم رەنگە هەمیشەیی و بەردەوام بن لەسەر ناپاکی ﴿أَوۡ يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡ﴾ یان تۆبە و گەڕانەوەیان لێ وەرگرێ و سزایان نەدات، ئەگەر گەڕانەوە و تۆبەیان کرد. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ بێگومان خوا زۆر سڕەرەوەی گوناهو تاوان و لێ بوردوو و بە بەزەیی یە، هەرکەس بەڕاستی تۆبە و گەڕانەوەی ببێ بۆلای خوا ئەبوورێ لێ ی و بەزەیی دەربارە ئەکات بە پێ ی بەڵێنی خۆی.

ئینجا دوایی باس و بەسەرهاتەکە ئەهێنێ بە شتێکی زۆر گرنگ کە وتە و نیاز و گومانی باوەڕداران بە راست دەرئەکات، ون بوون و گومرایی و هەڵەی ناپاکەکان و پڕو پاگەندەکەران ئاشکرا ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِغَيۡظِهِمۡ﴾ ئەوانەی کە کافر بوون – واتە قریش و غطفان و کۆمەڵەکان – خوا گێڕاندنیەوە بە داخ و خەشمی بەتینی خۆیانەوە بۆ وڵات و شوێنی خۆیان، ﴿لَمۡ يَنَالُواْ خَيۡرٗا﴾ هیچ خێرو خۆشی و ئامانج و ئاواتێکیان دەست کەوت نەبوو، بەڵکو بە نائومێدی و سەر شۆڕی گەڕانەوە،

﴿وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ﴾ خـوا چارەسـەری بـاوەڕدارانی کـرد لـە جـەنگ و کوشـتار و پێویستی نەکردن بەوە، وەکو لە سەرەتای باسەکەوە باسمان کرد، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا﴾ هەمیشە خوا توانا و بەهێزە و زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و هیچ کەس ناتوانێ سەرپێچی بکات لە ویست و خواستی.

ئەم ڕووداوە گرنگە دەستی پێ کرد، بە ڕێگای خۆی دا ڕۆیشت، گەیشتە تەواو بوون و دواهاتن، جڵەوی کارەکەی لە دەستی قودرەتی خوادا بوو، خۆی چۆنی ویست وای کرد و وای گێڕا، قورئان ئەو شتە ڕاستەی ڕوون کردەوە، بەم ڕەنگە هەموو کاروباری ڕووداوەکە و دوا ڕۆژی لە ڕێوە لە خواوە نیشان دا، لەبەر ڕوون کردنەوەی ئەو شتە ڕاستە، جێگیر کردن و دامەزراندنی لە دڵ و دەروون دا، لەبەر ئاشکرا کردنی تێگەیشتن و بڕوای ڕێك و ڕاستی ئیسلامی. ژێر کەوتن و بەدبەختی و ڕۆژی ڕەش تەنها دووچاری جوولەکە سوێند خوارەکانیان بوو کە بریتی بوون لە (بني قريظه).

ئەم بەسەرهاتی ئەمانە پێویستی هەیە بە ئەندازەیە ڕوون کردنەوە و سەرگوزەشتەی جوولەکە لەگەڵ موسڵمانان دا:

جوولەکەی مەدینە کۆتایی نەمێنا لە پیلان و بەربەرەکانێ و ئاژاوە لە ئیسلام. لەکاتێ کە هاتە مەدینە مەگەر ماوەیەکی زۆر کەم لە سەرەتا و یەکەم جارەوە. پێغەمبەر (ﷺ) هەر لە یەکەم جارەوە پەیمانی (مهادنه) واز لە یەك هێنان و بەسەریەك دا نەچوونی لەگەڵ بەستن، لەو پەیمانەدا یارمەتی دان و پارێزگاری بۆ بڕیار دان بە مەرجێ غەدر نەکەن و بێ پەیمان نەبن، تاوان و خراپەکاری نەکەن. جاسوسی نەکەن و کۆمەکی دوژمنی ئیسلام نەکەن، دەست درێژیی نەکەن و یارمەتی دەست درێژیی کەر نەدەن. بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو هەستیان کرد بەوە کە ئەم ئایینە تازەیە زیانی ئەبێ بۆ ئەو ڕێز و نرخەی کە بوویان و بۆیان دامەزرا بوو بەهۆی ئەوەوە خاوەن کتێبی یەکەمن، بەو بۆنەیەوە لەناو بت پەرستەکانی مەدینەدا شان و شەرەفێکی گەورەیان هەبوو، هەروەها هەستیان کرد بە خەتەر و زیانی ئەو هۆنینەوە و یەکێتی یەی کە ئیسلام خستی یە ناو گەل، چونکە ئەوان لەوەوبەر بەربەرەکانی و دوژمنایەتی نێوان دوو تائیفەکەی مەدینە – ئەوس و خەزرەج – یان بە هەلێکی گرنگ

دائەنا بۆ خۆیان و بەهۆی ئەوەوە بو بوون بە دەم راستی مەدینە و قسە هەر قسەی ئەوان بوو. کەواتە کاتێ ئەوانە بوون بە یەك کۆمەك و یەکێتی تەواو کەوتە نێوانیان لە ژێر سەرکردایەتی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەیان دا (ﷺ) کاتێ ئەوە پەیدا بوو ئیتر جوولەکە پەکی پیلانی کەوت و ئەو ئاوە لێڵەی بە دەستەوە نەما کە راوە ماسی تیا بکات لە نێوان خەڵکی مەدینەدا!!

شتێ کە بە تەواو خستنیە مەترسی و پشتی شکاندن موسڵمان بوونی عبداللە ی کوڕی سەلام بوو کە زانای هەرە بەرزیان بوو، خوا نایە دڵی موسڵمان بوو بە هەموو خێزان و منداڵی یەوە، بەهۆی ئەوەوە بە هەموو هێزو توانا کەوتنە پیلانبازی دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ)، لەو رۆژ و کاتەدا ئاگری جەنگ و پیلانیان هەڵگیرسا و دەستی پێ کردبێ کۆژانەوە هەتا ئەمڕۆ و لەمەولایش، ئەوەی لە دەستیان بێت لە تاوان و خراپە بەکاریان هێنا و بەکاری ئەهێنن لەگەڵ ئیسلام و موسڵمانان دا.

لە یەکەم جارەوە دەستیان کرد بە جەنگی پڕوپاگەندە کە لەم چەرخەدا ناونراوە بە (حرب باردە)، لەو جەنگەدا چەند شێوەو رەوشتێکیان بەکار هێنا لەو شێوە و رەوشتە ناڕەوایانەی کە ناسراوە لە جوولەکەوە. خەریك بوون لە رێگای دوو دڵ کردن و دڵ کرمین خەڵکی لە راستی پێغەمبەرێتی پێغەمبەردا (ﷺ) رەخنە و لەکە گرتن لەم عەقیدە و ئایینە تازەیە، خەریك بوون لە رێگای شێواندن و نێوان تێك دانی موسڵمانان، جارێ لە نێوان ئەوس و خەزرەج دا، جارێ تر لە نێوان مەککەیی و مەدینەیی دا، خەریك بوون لە رێگای جاسوسی بەسەر موسڵمانانەوە بۆ دوژمنە بت پەرستەکانیان، لە رێگای پێك هێنانی چەند دۆست و برادەرێ لە ناپاك و دووڕووەکان. تا لە رێگای ئەوانەوە دووبەرەکی و ئاژاوە بنێتەوە لە نێوان موسڵمانان دا.. لە دوایی دا بە ئاشکرا خۆیان دەرخست و بێ شاردنەوە خەڵکیان هانداو هەڵ نا لە موسڵمانان، وەکو ئەوەی رووی دا لەم رووداوی جەنگی خەندەق دا.

گرنگ ترینی بەرە و تیرەکانی مەدینە سێ تیرە و بەرە بوون: بەنی قەینوقاع، بەنی نەضیر، بەنی قریظە، هەرکام لەم سیانە تاوانی تایبەتی هەیە لەگەڵ پێغەمبەر (ص) و لەگەڵ موسڵمانان.

یەکەم بەنی قەینوقاع کە چالاك تریان بوون، داخ و مەراقی سەرکەوتنی ئیسلام لە بەدردا دڵی داگیر کردبوون. مەترسی یان ئەکرد کە موسڵمانان زاڵ بن بە جۆرێ ئەمان نەتوانن بەرگری یان بکەن و لە روویان بوەستن، بەهۆی ئەوەوە دەستیان کرد بە هاندانی خەڵکی لێ یان و پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوە. ئیبن و هیشام لە سیرەتەکەی دا ئەگێڕێتەوە لە رێگای ئیبن و ئیسحاقەوە کار و بەسەرهاتی ئەم تیرەیە: ئەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) کۆی کردنەوە لە بازارەکەی خۆیان دا و ئینجا پێ ی فەرمون: ئەی گەل و کۆمەڵی جوولەکە، بترسن و خۆتان بپارێزن لەوەی لەلایەن خواوە سزا و تۆڵەیەکتان بێتە سەر بە وێنەی سزا و تۆڵەی قورەیش، موسڵمان بن، چونکە بێگومان ئێوە ئەزانن کە من پێغەمبەرێکی رەوانە کراوم، لە کتێبەکەتان و لە فەرمانی خو پێتان ئەوەتان بۆ هاتووە و پێ سپێرراوە، ئەوانیش وتیان: ئەی محمد بێگومان تۆ وا ئەزانی کە ئێمە گەل و نەتەوەی خۆتین بەوە هەڵخەڵەتێن کە تۆ تووشی گەلێ بوویت ئاگادار و زانا نەبوون بە جەنگ بەهۆی ئەوەوە هەلێکت بۆ هەڵکەوت لێ یانەوە، سوێند بەخوا ئەگەر ئێمە بجەنگین لەگەڵت ئەزانی کە ئێمە پیاوین و شتین.

ئیبن و هیشام ئەگێڕێتەوە لە رێگای عبدالله ی کوڕی جعفرەوە ئەڵێ: ژنێکی عەرەب شیر و ماست ئەهێنێ بیفرۆشێ لە بازاڕی بنی قینوقاع، لای زەرەنگەرێك دائەنیشێ ئەوانیش ئەیانەوێ کارێکی وا بکەن کە روو و دەم و چاوی دەرخات و ئەویش ملیان پێ نادات، ئینجا زەرەنگەرە جوولەکە کە چمکێکی سیپاڵەکەی بە دزی یەوە گرێ ئەدات بەلای پشتی یەوە، ئینجا کاتێ هەڵئەسێ گیانی دەرئەکەوێ و ئەوانیش دەست ئەکەن بە پێکەنین پێ ی، ئەویش هاوار ەئکات، لەپاشان پیاوێکی موسڵمان پەلامار ئەدات و زەرنگەرەکە ئەکوژێ. جوولەکەکانی تر موسڵمانەکە ئەکوژن، ئینجا کەس و کاری موسڵمانەکە هاوار ئەکەنە موسڵمانان دژی جوولەکەکان، بەهۆی ئەوەوە جەنگ و ئاژاوە بەرپا بوو لەنێوان ئەوان و بنی قینوقاع دا، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) چوار دەوری دان هەتا مل کەچ و بەرحوکمی بوون، ئینجا عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول کەوتە تکا کردن و وازی نەهێنا تا دەستی هەڵگرت لە کوشتنیان، عبدالله هەرچەند ناپاك بوو بەلام لەناو خەزرەجی یەکان دا هێشتا هەر رێزی هەبوو، بەهۆی ئەوەوە تکا و لاڵەکەی وەرگرت بە مەرجێ لە مەدینە دەرچن، ماڵ و سامانیشیان ببەن جگە لە چەك، بەو شێوە مەدینە رزگار بوو لەو تاقمە پیسە.

ئینجا دێتە سەر تاقم و بەرەی بەنی نضیر، ئەوانیش پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ ناویان لە ساڵی چواری کۆچی دا لەپاش غەزای ئوحود، داوای بەشداری لێ کردن لە خوێنی دوو کوژراودا بە پێی پەیمانێ کە هەبوو لە نێوان موسڵمانان و ئەو تاقمەدا، ئینجا کاتێ چووە ناویان بەخۆشی هاتن بە دەمی یەوە و وتیان: ئەی ئەبوالقاسم، کۆمەکت ئەکەین چۆن پێت خۆشە، ئینجا سەریان کرد بەناو یەك دا وتیان: هەلمان لەمە باشتر دەست ناکەوێ، پێغەمبەر(ﷺ) لەو کاتەدا لەپاڵ دیوارێ لە دیواری خانووەکانیان دا دائەنیشێ، پیلان دائەنێن کەیەکێ بچێتەسەر بانەکە و بەردێکی گەورەی بخات بەسەرداو رزگارمان بکات لێی.

ئینجا خەریك ئەبن ئەو کردەوە و پیلانە پیسە بەدی بهێنن، لەوێدا خوا ئەنێتە دڵی پێغەمبەر و ئاگاداری ئەکات لەو نیاز و پیلانە بەهۆی ئەوەوە هەڵئەسێ و ئەگەڕێتەوە بۆ مەدینە، فەرمان ئەدات بۆ ئامادەبوون بۆ جەنگ و کوشتاریان، ئەوانیش کە هەست ئەکەن بەوە ئەچنە ناو قەڵاکانیان و خۆیان محکەم ئەکەن، عبداللە ی کوڕی ئوبەی سفارش ئەکاتە لایان کە خۆتان بگرن و خۆتان مەدەن بەدەستەوە، بێگومان بن یارمەتیتان ئەدەین، ئەگەر جەنگتان لەگەڵ کرا لەگەڵتانین و جەنگ ئەکەین بۆتان، ئەگەر دەرکران لەگەڵتان دەرئەچین، بەڵام ئەو ناپاکانە وادەو پەیمانەکەی خۆیانیان نەبردە سەر، خوا ترسی خستە دڵی بەنی نەضیر بەهۆی ئەوەوە بێ جەنگ تەسلیم بوون، داوایان کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) رێگایان بدات دەرچن لە مەدینە، هەریەکە باری حوشترێ شت ببەن و چەکەکانیان بەجێ بێڵن، ئەویش فەرمووی باشە و بە گوێی کردن، ئەوانیش دەرچوون بۆ خەیبەر، هەندێکیان رۆیشتن بۆ شام، سەلامی کوڕی ئەبو الحقیق و کینانەی کوڕی رەبیع و حوبەی کوڕی اخطب کە لە پیاو ماقووڵەکانیان بوون چوون بۆ خەیبەر، ئەمانە کە لەو کەسانە بوون هانی قورەیش و غطفانیان دا لە رووداوی خندق دا.

ئێستا ئەوا دێینە سەر باسی بنی قریظە کە کۆمەکی بت پەرستەکانیان کرد و هانیان دان لەسەر موسڵمانەکان و پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوە بە بێ هیچ هۆیەك جگە لە سروشت پیستی جوولەکەیی خۆیان، ئەو پەیمان هەڵوەشاندنەوەی ئەوانە لەو کاتە سەختەدا زۆر کاریگەر و بەتین بوو لە دەروون دا لە پەلامار دان و هاتنەکەی قورەیش و غطفان. قورسی و سامناکی ئەو هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر (ﷺ) سەعدی کوڕی معاذ و سەعدی کوڕی عبادە و عبداللە ی کوڕی ئەبو رەواحە خەواتی کوڕی جوبەیری نارد و فەرمووی: بڕۆن بزانن راستە ئەم

هەواڵە کە پێمان گەیشتووە؟ ئەگەر راست بوو بەرێکی مەیلێن و مەیگێڕنەوە بەڵکو بە ئیشارەت من حاڵی بکەن با خەڵکی بیم و ترسیان تێ نەکەوێ. ئەگەر درۆیش بوو ئەوان هەر لەسەر پەیمانی خۆیان بوون ئەوە بە ئاشکرا لەناو خەڵك دا بیڵێن، دیارە ئەمە دەری ئەخات کە ئەو کردەوەی ئەوانە جێگای مەترسی بووە لە دەروونی خەڵك دا.

ئەو چوار کەسە – خوا لیّ یان رازی بێت – شەو چوون بۆناو بنی قریظە کە سەرنج ئەدەن هەواڵەکە پیس ترە لەوەی پێ یان گەیشتووە دەستیان کرد بە قسەی پیس و جوێن دان و وتیان: پێغەمبەر کێ یە؟ هیچ پەیمانێ لە نێوان ئێمە و محمددا نی یە؟ ئینجا کە ئەوەیان بیست گەڕانەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) بە ئیشارەت و نهێنی هەواڵەکەیان پێگەیاند، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: الله اكبر موژدە بێت ئەی کۆمەڵی موسڵمان.

ئیبن و ئیسحاق ئەفەرموێ: ئینجا لەوێدا بەڵاو بەسەرهاتەکە گەورە بوو، بیم و ترس بەتین تر بوو، دوژمن بۆیان هات لە لای ژوور و لای خواریانەوە، هەتا باوەڕداران هەموو گومانێکیان برد، ناپاکی دەرکەوت و سەری هەڵدا لەلایەن هەندێ لە ناپاکانەوە.. هتد.

کارەکە بەو جۆر بوو لەکاتی ئەو بەسەرهات و رووداوەدا.

ئینجا کاتێ خوا یارمەتی پێغەمبەری دا (ﷺ) دوژمنەکانی بە داخ و سەرشۆڕی یەوە گێڕایەوە بە بێ هیچ دەست کەوتێ، خوا بەرگری جەنگ و کوشتاری کرد لە باوەڕداران، پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) گەڕایەوە بۆ ناو مەدینە بە سەربەرزی و سەرکەوتوویی، خەڵکی کەوتنە ئارام و چەکیان لە خۆیان کردەوە، ئینجا لەکاتێك دا پێغەمبەر (ﷺ) خەریکی خۆ شۆرین بوو لە تەپ و تۆزی ئەو ماوەیە لەناکاودا جوبرەئیل – علیه السلام – دەرکەوت و وتی: ئەی پێغەمبەر ئایا چەکت دانا؟ ئەویش فەرموی: بەڵێ. جوبرەئیل فەرموی: بەڵام مەلائیکە هێشتا چەکیان دانەناوە، ئینجا فەرموی: خوا فەرمانت پێ ئەدات کە بڕۆیت بۆ سەر بەنی قریظە، کە چەند میلێ دوور بوون لە مەدینە و ئەو کاتە کاتی نوێژی عەسر بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: هیچ کەس لە ئێوە نوێژی عەسر نەکات لە بەنی قریظە دا نەبێ، ئینجا خەڵکی بەڕێکەوتن بەرە و بەنی قریظە، ئینجا هەندێ نوێژی لە رێگە کرد و وتی: پێغەمبەر (ﷺ) مەبەستی پەلە کردن بووە لە رێکەوتن و رۆیشتن دا، تاقمێ تر وتیان: نوێژەکەمان ناکەین لە بەنی قریظە نەبێ، ئینجا نارەزایی دەرنەبڕی لە هیچ کام. کۆمەڵی موسڵمانان بە رێکەوتن و پێغەمبەریش (ﷺ) بە دوایان دا هات، ئیبن و ئوم مەکتومی کرد بە

جێگە داری خۆی لە مەدینەدا، بەیداخی دا بە حەزرەتی عەلی - خوا لێ ی رازی بێت - ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) بەرەنگاریان وەستا و چوار دەوری گرتن ماوەی بیست و پێنج شەو، ئینجا کاتێ بار و حاڵەکەیان درێژەی کێشا ناچار بوون رازی بوون بە سەعدی کوڕی معاذ حەکەمیان بێت - خوای لێ رازی بێت - چونکە ئەو کۆمەڵە جوولەکە سوێند خواری گەل و کۆمەڵەکەی سەعد بوون و لایان وابوو چاکەیان دەربارە ئەکات هەرچۆنێ عبدالله ی کوڕی ئوبەی چاکەی کرد لەگەڵ بەنی قەینوقاع دا، نەیانزانی کە سەعد - خوای لێ رازی بێت - لە خەندەق دا تیرێك بەری شادەماری قۆڵی کەوتووە و خوێنی ناوەستێتەوە، بەهۆی ئەوەوە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو شوێنەی داخ کردووە بۆ وەستانەوەی خوێنەکەی و خێوەتێکی لە مزگەوت دا بۆ هەڵداوە بۆ ئەمەی زوو زوو سەری لێ بدات، سەعدیش نزای کردە لای خوا بەم نزایە: ئەی خوایە ئەگەر لە جەنگی قورەیش دا هیچت هێشتووەتەوە ئەوا بمهێڵە بۆی، ئەگەر جەنگت نەهێشتووەتەوە لە نێوان ئێمە و ئەوان دا ئەوا خوێنەکەی بەربدە و مەممرێنە هەتا چاوم روون ئەکەیتەوە و دڵخۆشم ئەکەیت لەبارەی بەنی قریظەوە، خوایش نزاکەی لێ وەرگرتووە، بڕیاری داوە لەسەریان کە بە خواهیش و ویست و مەیلی خۆیان بەر حوکمی سەعد بن و ئەو بکەن بە حەکەمی خۆیان.

ئینجا کە ئەوان ئەوەیان کرد پێغەمبەریش ناردی بە شوێن سەعددا لە مەدینە بێت بۆ ئەمەی لەبارەی بەنی قریظەوە بڕیار دەربکات، ئینجا کاتێك نزیك کەوتەوە - کە بارگەی بۆ دروست کرابوو بەسەر وڵاخەکەوە - کۆمەڵ و تاقمی ئەوس پەنایان پێ برد و کەوتنە خوار و ژووری، پێ یان ئەوت ئەی سەعد ئەوانە دۆستەکانتن، کەواتە چاکەیان دەربارە بکە و بڕیارێکی چاکیان بەسەردا بدە. دڵیان نەرم ئەکرد دەربارەیان و سۆز و بەزەیی یان هەڵئەگیرساند بۆیان، ئەویش بێ دەنگ بوو هیچ وەڵامی نەئەدانەوە، ئینجا کە زۆریان لەگەڵ وت - خوا لێ ی رازی بێت - فەرمووی بێگومان کاتی ئەوە هاتووە کە سەعد لە رێگای خوادا گوێ ی نەبێ لە لۆمە و تەشەری هیچ لۆمەکەر و تەشەر دەرێك، ئینجا بۆیان دەرکەوت کە بڕیاری نەمانیان ئەدات. ئینجا کاتێك نزیك کەوتەوە لەو خێوەتەی پێغەمبەری (ﷺ) تیا بوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەڵسن بەدەم گەورەکەتانەوە، موسڵمانەکانیش هەڵسان و چوون بە دەمیەوە و دایان بەزاند لەسەر وڵاخ و بارگەکە، ئەوەیشی فەرموو لەبەر نرخ پێدان و بە گەورەگرتن و رێز گرتنی لە شوێن و جێگای کاربەدەستی یەکەی دا، تا بڕیارەکەی بەهێز و

جێگیر تر بێت. ئینجا کاتێ دانیشت پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمو: ئەوانە تۆیان کردووە بە حەکەم و رازین بە بڕیاری تۆ دەربارەیان، کەواتە تۆیش بە مەیل و ئارەزووی خۆت بڕیار بدە دەربارەیان، ئەویش – خوای لێ رازی بێت – فەرمووی: بڕیاری من بەسەریان دا جێ ئەگرێ و بەدی دێت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ. ئینجا سەعد وتی: بەسەر هەرکەسێکیش لەم خێوەتەدایە؟ فەرمووی: بەڵێ. ئینجادەست نیشانی کردبۆئەوتەرەفەی پێغەمبەری تیابوو(ﷺ) بەڵام لەبەر شەرم و رێزگرتن رووی وەرگێرا لە پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: بەسەر هەرکەسێکیش لێرەدایە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ. ئیمەت سەعد – خوا لێ ی رازی بێت – فەرمووی: ئەوا من بڕیار ئەدەم ئەوانەیان پیاو و جەنگ کەرن بکوژرێن و خێزان و ماڵ و سامانیشیان بە دەست کەوت و غەنیمەت بگیرێت. پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: سوێند بەخوا بڕیارت دا بە بڕیارێ کە خوا بڕیاری پێ داوە لەلای سەرووی حەوت ئاسمانەوە.

ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا بە هەڵکەندنی چەند لەغمێكو هەڵكنران و هێنانیان و درا لە گەردنیان و لەو لەغمانەدا گۆڕ کران. ئەوانە حەوت سەد تا هەشت سەد ئەبوون، ئەوانەی باڵغ نەبوون لەگەڵ ئافرەت و ماڵ و سامان دا دەسگیر کران بۆ ئیسلام. یەکێ لەو کوژراوانە حویەی کوڕی اخطب بوو کە چووە ناو قەڵاكانیانەوە.

لەپاش ئەوە جوولەکە سەرشۆڕ بوون، جم و جوڵ و بزووتنەوەی ناپاکی لە مەدینەدا بێ هێز و لاواز بوو، ناپاکەکان سەریان شۆڕ کرد، بیم و ترسیان لێ نیشت لە زۆر کردەوەی لەوەوبەریان، دوا بەدوای ئەوە ئیتر بت پەرستەکان بیریان لەوە نەئەکردەوە بێنە سەر موسڵمانان و بەڵکو بە پێچەوانەوە موسڵمانەکان ئەچوونە سەر ئەوان و پەلاماریان ئەدان هەتا سەریان دەرچوو لە گرتن و فەتحی مەککە و تائیف. لەوانەیە بڵێن بزووتنەکانی جوولەکە و ناپاکەکان و بت پەرستەکان هەموو نوسرا بوون پێکەوەو پەیوەندی بەهێز بوو لە نێوانیان دا، دەرکردن و نەهێشتنی جوولەکە لە مەدینە ئەو پەیوەندی و پەیوەستی یەی پچڕی و کۆتایی پێ هێنا، بووبە هۆی پەیدا بوونی چەرخێکی تازە لە پێك هێنان و جێگیر بوون و دامەزرانی دەوڵەتی ئیسلام لە مەدینەدا.

وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴿٢٦﴾ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴿٢٧﴾

---

ئینجا با گویْ شل کەین بۆ ئەم دوو ئایەتە سەبارەت بەم جوولەکەی بەنی قریظە هاتە خوارەوە: ﴿وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ﴾ ئەوانەی کە لە ئەهلی کیتاب بوون – واتە جوولەکەی بەنی قریظە – پشتگیری قورەیش و غطفانیان کرد. خوا ئەوانەی هێنایە خوارەوە لە قەلاْکانیان ﴿وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ﴾ ترس و بیمی خستە دلْیانەوە بە جۆریْ مل کەچ بوون بە ئاسانی ئەو بڕیارەیان بەسەردا درا و جیْ بەجیْ کرا، ﴿فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا﴾ تاقمیْ ئەکوژن و تاقمیْ دیل ئەکەن و ئەیانگرن. ﴿وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ﴾ دای بە ئێوە بە کەلەپوور و کردنی بە خاوەنی راستەقینەی زەوی و زاریان و جیْ و شوێن و ماوایان و مالْ و دارایی و سامانیان. ﴿وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا﴾ خاك و زەوی یەك كە لەمەو بەر پیای دا نەڕۆیشتوون و پێتان پیا نەناوە، ئیتر ئەمە خاك و زەوی یەك بێت هینی بەنی قریظە بووبێت لە دەوری جیْ و شوێنەکەی خۆیان، یان خاکی خەیبەر بێت، یان هەر خاك و ولاْتیْ تر کە کەوتە ژێر دەستی موسلْمانان، یان هەر مەبەست خاك و زەوی یەکەی بنی قریظە بێت کە تیای دا بوون و مەبەست گرتنی بێت بە بیْ جەنگ و کوشتار، بەم رەنگە مەبەست بە پیا نان جەنگ و کوشتار بێت کە بەو مەبەستە بەکار ئەهێنریْ لە زمانی عەرەب دا.

﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا﴾ خوا هەمیشە توانا و دەسەلاْت دارە بەسەر هەموو شتێك دا. ئا بەم جۆرە ئەو رووداوە گرنگەی خستە بەرچاو بەو هەموو تەمیْ و یاسایەی کە هێنای بۆ دامەزراندن و راگیر کردنی لە دلْ و دەروونی کۆمەلْ و گەلی موسلْمانان دا و لە ژیانیان دا بە تێکڕایی و یەکسان. ئا ئاوا قورئان رووداوەکان ئەکات بە هۆی پێگەیاندن و پەروەردە کردن. پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایە کە سەری ئادمی بەرز کردەوە بە ناردنی ئەم قورئانە بۆ سەریان.

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلۡمُحۡسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٢٩﴾

لێرە بە دواوە تا سەری ئایەتی ٣٥ تایبەتی یە بە دایکەکانی ئیماندارانەوە، لە پێشەوە لەم سورەتەدا تێپەڕی کرد ناوبردنی حەرەمەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بە ﴿امهات المؤمنين﴾ دایکی ئیمانداران. بێگومان ئەو دایکێتی یە ئەرکی تایبەتی خۆی هەیە. گەیشتنیان بەو پلە و پایە بەرزە ئەرکی تایبەتی هەیە. رادە و پلەی بەرزیان کە دەست کەوتیان بووە بەهۆی پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەرکی تایبەتی خۆی هەیە. جا لەم چەند ئایەتەدا بەشێ لەو ئەرکانە باس ئەکات، هەروەها چەند ئاداب و رەوشتێ دائەنێ و باسی ئەکات کە خوای گەورە ویستی لەو ماڵ و خانەوادە پاك و بەفەڕەدا بەجێ بێن. لەسەر ئەو بنەڕەتە بەهێز و بەرزە دامەزرێت، ماڵ و خانەوادەکانی تر چاوی لێ بکەن و ئەو رێگا و رێبازە بدەنە بەر. ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر ﴿قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ﴾ بڵێ بە حەڵاڵ و هاوسەرەکانت: ﴿إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا﴾ ئەگەر ئێوە ژیانی دنیاتان ئەوێ بە خۆشی و نازو نیعمەتی فراوانەوە، داوای رابواردن و ئارایشی ئەکەن ئەوانە لای من دەستتان ناکەوێ ﴿فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ﴾ کەواتە وەرن موتعەی تەڵاقتان بدەمێ (واتە ئەو پۆشاك و پێ خەف و شتەی کە ئیسلام دایناوە بە پێی دەسەڵات بدرێ بە تەڵاق دراو بۆ دڵخۆش کردنی لەباتی زیانی تەڵاق دانەکەی). ﴿وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا﴾ بەرەڵاتان بکەم و تەڵاقتان بدەم بە بەرەڵا کردن و تەڵاق دانێکی جوان و رێك و رەوا بە بێ زیان. ﴿وَإِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ﴾ ئەگەر ئێوە خوا و پێغەمبەرەکەی و ماڵی رۆژی دواییتان دەوێ واتە بەهەشت ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلۡمُحۡسِنَٰتِ مِنكُنَّ

أَجۡرًا عَظِيمًا ﴾ ئەوە بێگومان خوا ئامادەی کردووە بۆ چاکە کەرانێ کە ئێوەن پاداشتێکی زۆر گەورە کە بۆمان هەموو ئەم جیهانە لە ئاستی چاو نادات و نرخی نی یە.[1]

پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) ژیان و گوزەرانێکی سووك و سەر و بەری هەڵبژارد بۆ خۆی و خێزانی، ئەوەش نەك لەبەر بێ دەستی و نەبوونی، چونکە ئەوە بوو ژیا هەتا وڵاتی دەوروبەری گیرا و تەخت کرا، سامان و دەست کەوت زۆر و فراوان بوو، ئەو کەسەیش لەوەو بەر هیچی نەبوو دەوڵەمەند بوو! لەگەڵ ئەوەدا وا ئەبوو دوو مانگ لەسەر یەك لە هیچ ماڵێکی پێغەمبەردا (ﷺ) ئاگر نەئەکرایەوە و خۆراك تەنها بریتی ئەبوو لە خورما و ئاو، لەگەڵ ئەو هەموو بەخشین و دیاریی و خێرو سەدەقەی کە ئەیڕشت بەسەر خەڵك دا، کەواتە ئەو گوزەران و ژیانە سووك و کەمە لەبەر نەبوونی نەبوو، بەڵکو ئەوەیە بە ئارەزووی خۆی هەڵبژارد لەبەر زاڵ بوون و بەرز بوونەوە بەسەر خۆشی و رابواردنی ژیانی ئەم جیهانە و چاوەڕوانی و ئارەزووی تەنها ئەوەی لای خوا ئامادە کراوە بۆی... پێغەمبەر (ﷺ) نە لەلایەن عەقیدە و باوەڕەوە و نە لەلایەن شەریعەتەکەیەوە داوا لێ کراو نەبوو کە بەو جۆرە خۆی و خێزانی گوزەران بکەن و بژین، چونکە هیچ شتێکی حەڵاڵ و پاك و خاوێن قەدەغە نەکرا بوو نە لە عەقیدە و باوەڕ و نە لە شەریعەتەکەی دا، خۆیشی قەدەغەی نەکردبوو لەسەر خۆی کاتێ دەستی کەوتایە بە بێ ئەرك و ناڕەحەتی و بهاتایە بەر دەستی بە تەقدیری خوا، نەك بە گرتن و بە ئارەزووی نەفس و بە دوادا گەڕانی، نە بە خۆ خەریك کردن و چوون بە قوتا بۆی، داوای نەکردووە لە ئوممەتەکەی کە بەو جۆرە بژین کە بۆ خۆی هەڵیبژارد مەگەر کەسێ خۆی ئارەزوو بکات، لەبەر بەرزبونەوە و زاڵ بوونی بەسەر خۆشی و رابواردنی نەفس دا، لەبەر بەرەڵا بوونی لە کۆت و زنجیری نەفس و ئارەزووەکانی نەفس بۆ سەربەستی و ئازادی تەواو لە ژێر دەستەیی نەفس و ئارەزووەکانی نەفس دا. بەڵام دایکی ئیمانداران

---

[1] تەفسیرەکە لەسەر ئەوەیە کە وشەی (من) لە (منکن) دا بۆ تەبینە، چونکە هەموو چاکن لە وتار و کرداریان دا، هەندێ وتویانە وشەی (من) بۆ (تبعیضة) واتە بۆ ئەوانەتان کە چاك کردارە. بەڵام ئەمە بە دوور دانراوە، هەروەها تەفسیرەکە لەسەر ئەوەیە کە رستەی (فإن) جواب و جەزایە، هەندێ ئەفەرمون: جواب و جەزاکە لابراوە و ئەم رستەیە دەلیلە. ئەمەش ئەگونجێ بەڵام ئەوەی تەفسیرەکە بێ ئەرك ترە.

ئافرەت بوون و لە تیرەی ئادەمی بوون، خاوەنی هەست و ئارەزووی ئادەمی یانە بوون، لەگەڵ ئەوەدا خاوەنی هونەر و ڕێزێکی تایبەتی بوون و نزیك بوون لەسەرچاوە پاك و خاوێن و بەرزەکانی پێغەمبەرێتی یەوە. لەگەڵ ئەوەدا ئارەزووی سروشتی بۆ خۆشی ژیان لە دەروونیان دا هەبووە. ئینجا کاتێ بینیان فراوانی دارایی و سامان لەپاش ئەوە خوا خێر و بێری ڕشت بەسەر پێغەمبەر و ئیمانداران دا هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) داوای نان و نەفەتە و ژیاندنیان لێ کرد بە وێنەی خەڵکی تر، بەڵام داواکەیان بۆ خۆشی و ڕەزامەندی وەرنەگیرا، بەڵکو بە بێزاری و ناڕەزایی، چونکە خۆی بۆ خۆی ئەیویست بەو شێوە بژی کە بۆ خۆی داناوە، بە بێ خەریك بوون بەو جۆرە شتانەوە هیچ جۆرە گوێ پێدانێك پێ ی، ئەیویست ژیانی خۆی و ژیانی ئەوانەی لە پەنای دا ئەژین لەسەر ئەو پۆپە هەرە بەرزە بێت و پاك و خاوێن لە تێکەڵی و تێوە تلانی ئەم جیهانە، نەك لەبارەی حەرامی و حەڵاڵی یەوە، بەڵکو لەبارەی خۆی ئازاد کردن و پچڕان لە هێزە ڕاکێشەرەکانی ئەم زەوی و جیهانە کەم نرخە! بێزاری و ناڕەزایی لەو داوایە گەیشتە ڕادەیە خۆی داشارد و کەنارگیر بوو لە موسڵمانەکان، ئەوەش زۆر بارێکی قورس و گران بوو لەسەر دڵی یارەکانی و لە هەموو شت سەخت تر بوو بەلایانەوە، ئەهاتن بچنە خزمەتی و کەچی ڕێگا نەئەدران. ئیمامی ئەحمەد هەواڵێ ئەهێنێ کە لە جابرەوە وەرگیراوە – خوای لێ ڕازی بێت – ئەڵێ: ئەبوبەکر – خوای لێ ڕازی بێت – هات و ئیزنی خواست بچێتە خزمەتی و خەڵکی لە قاپی یەکەی دا دانیشتبوون، پێغەمبەریش (ﷺ) دانیشتبوو، کەچی ئیزن نەدرا، لەپاشان عمر هات – خوای لێ ڕازی بێت – ئیزنی خواست و ئیزن نەدرا. ئینجا ئیزنی هەردووکیانی دا چوونە خزمەتی، پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبوو و حەرەمەکانی و هاوسەرەکانی بە چوار دەوری دا، پێغەمبەر (ص) بێ دەنگ بوو، ئینجا عمر ئەڵێ: قسەی لە خزمەت ئەکەم بەڵکو پێ بکەنێ. ئینجا ئەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا کاشکێ کچەکەی زەیدت ئەبینی – واتە خێزانەکەی – کە ئێستا داوای نان و نەفەقەی لێ ئەکردم و ئینجا منیش ملم بادا! پێغەمبەر (ﷺ) پێکەنی هەتا دانی دەرکەوت، فەرموی: ئەوانەی بە دەورم دا داوای نان و نەفەقەم لێ ئەکەن! ئینجا ئەبوبەکر هەڵئەسێ بۆ لێدانی عائشەی کچی. عمر هەڵئەسێ بۆ لێدانی حەفصەی کچی.

هەردوو ئەڵێن: داوای شتێ ئەکەن لە پێغەمبەر کە نیەتی؟! ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) بەرگری ئەبوبەکر و عمر ئەکات لە لێدانیان. ئەوانیش ئەڵێن: سوێند بە خوا لەپاش ئەم دانیشتنە داوای شتێ ناکەین کە لای نەبێ... جابر ئەڵێ: خوا ئەم ئایەتی دەست بژنەی هێنایە خوارەوە کە خەریکین بە تەفسیرەکەیەوە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) یەکەم جار لە عائشەوە دەست پێ ئەکات، ئەفەرموێ: شتێکت بۆ باس ئەکەم نامەوێ پەلەی تیا بکەیت هەتا پرسی باوك و دایکت ئەکەیت، ئینجا ئەم ئایەتەی بەسەردا ئەخوێنێتەوە. ئینجا عائشە – خوای لێ رازی بێت – ئەڵێ: ئایا لە تۆدا پرسی باوك و دایکم بکەم؟ نەخێر من خوا و پێغەمبەرم ئەوێ و ئەوان هەڵئەبژێرم. داوات لێ ئەکەم لای هیچ کام لە خێزانەکانت باسی ئەمەی من هەڵم بژارد بۆ خۆم نەکەیت.پێغەمبەریش (ﷺ) ئەفەرموێ: من خوا رەوانەی نەکردووم ناڕەحەتی و زەحمەت بەکار بێنم، بەڵکو رەوانەی کردووم کە خەڵکی فێر بکەم و رێگا ئاسان کەر بم. هەرکام لەوان پرسیارم لێ بکەن لەوەی تۆ هەڵت بژارد هەواڵی ئەدەمێ. لە بوخاری یەوە وێنەی بەشی دوایی ئەم حەدیسە هاتووە و هەیە.

قورئان هات بۆ ئەمەی مەبەست و ئامانجی بنەڕەتی ژیان روون بکاتەوە، ئەو شتانەی کە بە نرخن لای ئیسلام دیاریی یان بکات. هەموو ئەو مەبەست و شتە بە نرخانە ئەبێ لە یەکەم جارەوە لە ژیانی پاکی پێغەمبەر و ماڵ و خێزانی ئەودا بەدی بێن – صلی الله علیه وسلم و علی أهل بیته الکریم – لە شیرین ترین شێوە و تێر و تەواو ترین وێنەدا، چونکە ئەبێ ژیانی پاکی ئەو و ماڵ و خێزانە بەفەڕەکەی ئەو ببنە سەر مەشق و لەوانەوە رووناکی وەرگیرێ هەتا هەتایە.

ئەم دوو ئایەتە هاتنە خوارەوە رێگایان دیاریی کرد و حەرەمەکانی پێغەمبەریان سەربەست کرد کام لەم دوو رێگایە هەڵئەبژێرن بۆ خۆیان: ژیان ناز و نیعمەتی ئەم جیهانە، یان خوا و پێغەمبەرەکەی و ژیانی رۆژی دوایی، چونکە تەنیا دڵێ جێگای دوو جۆر باوەڕ و تێگەیشتنی جیاوازی تیا نابێتەوە، خوایش دوو دڵی نەداوە بە هیچ کەس، هەرکام لەو حەرەمانە خواو پێغەمبەر و رۆژی دوایی هەڵبژارد، وتی: سوێند بەخوا داوای هیچ شتێك ناکەم کە لای پێغەمبەر (ﷺ) دەست نەکەوێ. ئینجا قورئان هاتە خوارەوە بۆ ئەمەی

مەسەلەکە و مەبەستەکە بە تەواوی روون و دیاریی بکاتەوە. چونکە مەسەلە ئەوە نی یە شتی داوا کراو دەست کەویٚ لای پێغەمبەر (ﷺ) یان دەست نەکەویٚ. بەڵکو مەسەلە و مەبەستەکە هەڵبژاردنی خوا و پێغەمبەرە بە تەواوی، یان هەڵبژاردنی خۆشی وا رابواردنی ئەم جیهانە. ئیتر ئایا هەموو گەنج و گەوهەری ئەم زەوی و جیهانە لە ژێر دەستیان دا بێت یان ماڵەکانیان خاڵی خەوالاً بێت لە هەموو هۆی ژیان و گوزەران، ئەوانە هەموویان – سوپاس بۆ خوا – لە رادە و پلەیەکی ئەوەندە بەرز بوون کە شایان بوون لەگەڵ ماڵە بەرزەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) لە هەندیٚ ریوایەت دا هەیە کە پێغەمبەر (ص) دڵشاد و کەیف خۆش بوو بە هەڵبژاردنەکەیان. – خوا لیٚ یان رازی بێت –.

بەڕاستی چاك وایە هەندیٚ بوەستین لەبەردەم ئەم رووداوەدا و بیری لیٚ بکەینەوە لە هەندیٚ بار و ناوچەیەوە. بێگومان ئەم رووداو و ئایەتانە راو بیر و باوەڕی ئیسلام روون ئەکاتەوە لە بارەی ئەوەی بە مەبەست ئەگیریٚ و بە نرخ دار سەرنج ئەدریٚ لەم جیهان یان لەو جیهان، دڵی موسڵمانان دائەمەزرێنیٚ و ماوەی نادات ئەم لاو ئەو لا بکات و دوو دڵ بێت لەنێوان مەبەست و نرخ داری ئەم جیهان و ئەو جیهان، دڵ و دەروون پاك و خاوێن ئەکاتەوە لە هەموو پەیوەست و پەیوەندی یەك کە بەرگری بکات لە خۆ رووت کردن و لیٚ بڕان تەنها بۆ خوا، ئەمە لە بارێکەوە لە باریٚ ترەوە ئەم رووداوە شێوە راستەقینەکەی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) روون ئەکاتەوە، هەروەها ژیانی ئەوانەی لەگەڵ ئەو ژیان و ژیانیان بەسرا بوو بە ژیانی ئەوەوە، شیرین ترین شت ئەمەیە لەو ژیانەدا کە ژیانی ئادەمی بوو و ژیانی گەل و تاقمیٚ لە ئادەمی خۆیان دانەبڕینبوو لە ئادەمێتی و هەست و نیشانە و دروشمی ئادەمێتی، لەگەڵ ئەو هەموو پلە و پایە هەرە بەرزە کەس نەدیوەی کە پیٚی گەیشتن، لەگەڵ ئەو هەموو پاکی و خاوێنی و لیٚ بڕانەی کە بوویان بۆ خوا و خۆ داڕنین و خۆ رووت کردن لە غەیری خوا، لەگەڵ ئەوەدا هەست و ئارەزووی ئادەمییانە مرد بوو لە دەروونیان دا، بەڵکو بەرز بووبووە و پاك و خاوێن بوو لە هەموو چڵك و چەپەڵی و تێکەڵ بوون بە هەرشتێك کە ئادمی یانە بووبێت، ئینجا ئەو سروشتە ئادەمی یە شیرینەیان کە هەبوو و مایەوە تیایان دا، هیچ بەرگری نەئەکردن و دژی بەرز بوونەوەیان نەبوو بۆ پۆپەی هەرە بەرز و گەیشتنیان بە

ئەوپەڕی پلە و رادەی تێر و تەواوی یە کە لە چارە و توانای ئادەمی دا هەیە و بڕیار دراوە بۆی.

زۆرجار خەڵکی هەڵە ئەکەن شێوەیەکی ناڕاست، یان ناتەواو دائەنێن بۆ پێغەمبەر (ص) و بۆ هاوەڵەکانی – خوایان لێ رازی بێت – کە ئەیانەوێ رووتیان بکەن و دایانڕنن لە هەست و سۆز و ئارەزووی ئادەمی یانە، وا گومان ئەبەن کە بەوە رادە و پلەیان بەرز ئەکەنەوە و بە پاك و خاوێنی رایان ئەگرن!!

ئەو هەڵە کردنە شێوەیەکی ناڕاست و ناڕەوایان بۆ نەخشە ئەکێشێ، لە دڵ و دەروونی نەزان دا جێگیر ئەکات، شێوەیەکی داشاراو بە تەم و تەپ و تۆزی خەیاڵات کە نیشانە و دروشمی ئادەمی یانەی تیا روون نابێتەوە، جا بەهۆی ئەوەوە پەیوەندی و پەیوەستی ئادەمێتی ئەپچڕێ لە نێوان ئێمە و ئەوان دا، بە جۆرێ هەستیان پێ ئەکرێ کە ئەوانە دروست کراوێکی جیاوازن و لە جۆر و تیرەی ئێمە نین... مەلائیکەن یان تیرەیەکی ترن وێنەی مەلائیکە و رووتن لە هەست و سۆز و ئارەزووی ئادەمی!! لەگەڵ ئەوەدا ئەو شێوە خەیاڵی یە بێ لەکە و پاك و خاوێنە، بەڵام دووریان ئەخاتەوە لە دەوروبەری ئێمەی ئادەمی، لە سنوور و چوار چێوەی ئێمە دەریان ئەکات. کەواتە ئێمە ئەبێ نەتوانین چاویان لێ بکەین و پەیڕەوی یان بکەین. کەواتە ئەبێ ئەو رەوشتە پاکەی ئەوانە هیچ کار نەکات لە ئێمە، هەستمان ئەخاتە جۆش و بزووتنەوە بۆ شوێن کەوتن و پەیڕەوی ئەوان. ئەبێ لە باتی پەیڕەوی کردنیان هەر ئەمەمان بۆ بمێنێتەوە سەرسام و سەرگەردان بین تیایان دا و سەرمان لەکاری خوا سوڕبمێنێ کە شتی وەکو ئەوانەی دروست کردووە. بێگومان ئەویش هیچ بەرهەمێکی نابێ بە کردەوە لە ژیانی ئێمەدا. چونکە ئەو کاتە سەرنجی ئەوان وا ئادەین کە ئەوانیش ئادەمی یەکی راستەقینە بوون، ژیاون بەو هەست و سۆز و ئارەزووەی کە ئێمە تیا ئەژین بەڵام کە وا تێگەیشتین ئەوانیش وەکو ئێمە ئادەمی بوون و هەست و ئارەزووی ئادەمی یان بووە، بەڵام ئەوان پاك و خاوێنیان کردن لە هەموو چڵك و چەپەڵی یەکانی، ئەو کاتە ئەکەوینە بزووتنەوە و تێکۆشان بۆ لاسایی کردنەوەو پەیڕەوی کردنیان.

لێزانی و کاردروستی خوا روون و ئاشکرایە لەمەدا کە پێغەمبەرانی لە تیرەی ئادەمی هەڵبژارد و بڕیار دان، نەك لە مەلائیکە یان لە تیرەیەکی تری جیاواز لەتیرەی ئادەمی. بۆ ئەمەی پەیوەندی و پەیوەستی راستەقینە ببێ لە نێوان ژیانی ئەوان و ژیانی شوێن کەوتووەکانیان، تا شوێن کەوتووەکان هەست بکەن کە دڵ و دەروونی ئەوانیش هەست و سۆز و ئارەزووی ئادەمی یانەیان بووە، هەرچەند هینەکەی ئەوان بەرز و پاك و خاوێن بووە و ئەمان ناگەنە ئەوان، بەڵام نائومێد نابن و ئەکەونە لاسایی کردنەوەیان لاسایی و پەیڕەوی بچووك بۆ گەورە. لەم رووداوەدا ئەوەستین و بیر ئەکەینەوە لەو مەیل و ئارەزووە سروشتی یەی کە لە دەروونی حەرەمەکانی پێغەمبەردا بووە (ﷺ) سەبارەت بە خۆشی و ژیانی خۆشی ئەم جیهانە، هەرچۆنێ ئەوەستین بیر ئەکەینەوە لە شێوەی ژیانی ماڵی و ناوخۆی پێغەمبەر (ﷺ) و حەرەمەکانی – خوا لێ یان رازی بێت – ئەوانە حەرەم و هاوسەری بوون داوای نان و نەفەقەیان لێ کرد بە گوێرەی باوی خەڵکی تر و بە پێی سروشتی ئادەمی، بە هۆی ئەو داوایە دڵ ئازار بوو، بەڵام رەوای نەدا بۆ ئەبوبەکر و عمر بدەن لە کچەکانیان: عائشە و حەفص. لەسەر ئەو داوایە، چونکە مەسەلەکە مەسەلەی هەست و ئارەزووی ئادەمی یانەیە، بەرز و پاك و خاوێن ئەکرێن، بەڵام بەرگری ناکرێن و نابڕێنەوە بە خۆیان دا! کارەکە لەسەر ئەو بارە مایەوە هەتا ئەم دوو ئایەتە هاتنە خوارەوە و یەکێ لە دوو رێگای بۆ دانان کە بە ئارەزووی خۆیان هەرکام هەڵئەبژێرن بۆ خۆیان، ئینجا هەموو بە خۆشی و ئارەزوو خۆیان رێگا راستەکەیان دایە بەر. هەموو خوا و پێغەمبەر و رۆژی دوایی یان هەڵبژارد، بەهۆی ئەوەوە دڵی بەفەڕی پێغەمبەر (ﷺ) شادمان بوو بە بەرز بوونەوەی دڵ و دەروونی هاوسەرەکانی بۆ ئەو پۆپە و پلە بەرزە. لەپاش ئەوەی دایکەکانی ئیماندارانی سەربەست کرد بۆ هەڵبژاردنی هەرکام لەو دوو رێگای کە باس کران و ئەوانیش هەموو رێگا راستەکەیان هەڵبژارد، لەپاش ئەوە ئینجا ئامۆژگاری یان ئەکات و هەڕەشەی سەختیان لێ ئەکات بە دووقات کردنی سزایان ئەگەر گوناهو تاوانی خراپ بکەن. موژدەیشیان ئەداتێ بە دوو قات کردنی پاداشت لەسەر کردەوەی چاك و گوێ رایەڵی یان. واتە تۆڵە و پاداشتیان دوو قاتی خەڵکی ترە لەبەر پلە و پایەی بەرزیان و رێز و نزیکی یان لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)،

يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ﴿٣٠﴾

**ئەفەرموێ: ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ﴾ ئەی ژنەکانی پێغەمبەر ﴿مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ﴾ هەرکام لە ئێوە گوناهێکی گەورە بکات کە خراپی و ناشیرینی یەکەی ئاشکرا بێت وەکو سەرکێشی لە پێغەمبەر و ئازار دانی دڵی و هەر شتێکی تری وا ﴿يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِۚ﴾ سزای بۆ دووبارە ئەکرێتەوە بە دووقاتی خەڵکی تر، چونکە چاکە و بەهرەی تایبەتی خوا هەیە بەسەریانەوە، ئەوەتا کردنی بە هاوەڵ و حەلاڵ و هاوسەری گەورەترینی هەموو پێغەمبەران، لە رێز و شەرەف دا بڕیاری دان بە دایك بۆ هەموو ئیمانداران، کەواتە گوناهی ئەوان زۆر ناڕێك و ناشیرین ترە، گوناه تا ناشیرین تر بێت شایانترە بۆ تۆڵەی سەخت تر. بەندە تا نزیك تر بێت لە خواوە گوناهی گەورەتر و ناشیرین ترە، جا لەبەر ئەوەیە پێغەمبەران – درودی خوایان لەسەر بێت – بوون بە جێگای عیتاب و گلەیی خوا لەسەر بچووك ترین کردەوەی ناڕێك، ئیتر با بۆ خەڵکی تر ناڕێك نەبووبێ، بۆ ئەوان قەدەغە بووە و بە گوناه ناو براوە با بۆ خەڵکی تر ڕەوا تر بووبێ. کەواتە زۆر جێگای خۆیەتی و شایانە دووبارە کردنەوەی سزا و تۆڵە بۆ دایکی ئیمانداران ئەگەر گوناهی خراپیان بکردایە. ﴿وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا﴾ ئەو دوو قات کردنەوەی سزایە ئاسانە بۆ خوا، ئەو خوایەی کە لایەنگیر نی یە و هەموو کارو فرمانی بە جێ یە.**

**و صلى الله و سلم على سيدنا محمد و آله و صحبه و سلم**